پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی
٧٠

# فەرمودە قودسیەکان لە( صحیح الجامع الصغير ) دا


ئامادەکردنی
مرکز دراسات عربيه لتحقيق النصوص

لێکۆڵینەوەی فەرمودەکان
محمد ناصرالدين الالبانى

وەرگێڕان و لێکدانەوەی فەرمودەکان
هاوڕێ محمد ئەمین

# فەرمودە قودسیەکان

## لە( صحیح الجامع الصغیر ) دا


ئامادەکردنی

مرکز دراسات عربیه لتحقیق النصوص

وەرگێڕان و لێکدانەوەی فەرمودەکان

هاوڕێ حەمەئەمین

لێکۆڵینەوەی فەرمودەکان

محمد ناصر الدین الالبانی

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب :** فەرموودە قودسیەکان

**ئامادەکردنی :**مرکزدراسات عربیە لتحقیق النصوص

**وەرگێرانی :** هاورێ حەمەئەمین

**لێکۆڵینەوەی فەرموودەکان :** محمدناصرالدین الالبانی

**دیزاین :**ابراهیم معروف

**شوێنی چاپ :**دارالفکر – بیروت – لبنان

**تیراژ :** ٣٠٠٠ – ٢٠٠٨

**ژمارەی سپاردنی ( ٢٤٢٧ )ی ساڵی ٢٠٠٨ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە**

## پێشەکی وەرگێڕ:

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله منشرور انفسنا ومن سيئات اعمالنا، من يهده الله فلا مضل له،ومن يضلل فلا هادي له،واشهد ان لااله الاالله وحده لاشريك له واشهد ان محمد(ﷺ) عبده ورسوله ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾آل عمران: ١٠٢ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾النساء: ١) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب: ٧٠ - ٧١

بەدڵنیایی و بێ هیچ گومانێك دەڵێین ڕاستترین قسەو گوفتار فەرمودەی خوایە، وەباشترین ڕەوت ڕێبازهەڵگرتن و شوێن پێی محمد(ﷺ)، وەخراپترین کاریش کاری داهێنراوو هەڵبەستراوە لەئایندا، وەهەموو تازەداهێنراوێکیش لەئایندا بیدعەیە، وەهەمووبیدعەیەکیش سەر لێشێواوی و گومڕاییە، وەهەموو گومڕاییەکیش بۆئاگرە.

لەڕاستیدا یەکێك لەناوازەترین و دانسقەترین ئەوکتێبانەی کەفەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی تێداکۆکراوەتەوە بریتیەلەکتێبی (الجامع الصغیر)ی ئیمامی (السیوطي) – ڕەحمەتی خوای لێبێت – کەزیاتر لەچواردەهەزار فەرمووودەی لەخۆ گرتووە، بەڵام وەك زۆرینەی کتێبەکانی فەرمووودەی تر، ئەمکتێبە پێویستی بەپاڵفتەکردن (تخريج و تحقيق)ی فەرمودەکان هەبووە هەتالاوازەکانی لێپاڵوتەبکرێت و ئاشکرابکرێت، وەزانای پایە بەرزمامۆستا (ناصر الدين الألباني) – ڕەحمەتی خوای لێبێت – ئەمکارەی خستۆت ئەستۆی خۆی و بەباشترین شێوە پێی هەستاوە و زیاترلە هەشت هەزار فەرموودەی(صحيح) و (حسن) ی لێجیا کردۆتەوە لەژێرناوی (صحيح الجامع الصغير وزيادته) وە لاوازەکانیشی لەژێر ناوی (ضعيف الجامع الصغير) دا، کەدەتوانرێت بەیەکێك لەهەرەسەرچاوەنایابەکانی فەرمودەشیرینەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەژمار بکرێت.

وەمن خۆم زۆر لەمێژە شەیدای ئەوکتێبەناوازەیەی فەرمودەبووم و پڕبەدڵ ئاواتەخوازبوم کەخوێنەری موسڵمانی کورد پێی ئاشنا ببێت و بتوانم بەپشتیوانی خوایگەورەوەریبگێڕمە سەرزمانی کوردی، وەلەوکاتانەدابوو کە کاك بەرزانی کتێبخانەی

ڕۆشنبیر نوسخەیەکی ئەم کتێبەی کەئێستا وەرم گێڕاوەتەسەرزمانی کوردی خستیە بەردەمم کەبریتیە لەهەڵبژاردەی سەرجەم ئەو فەرمودەقودسیانەی کە لە(صحیح جامع الصغیر) دا هاتووە کەژمارەیان (١٢٨٧) فەرمودەیە و بەپێی بابەتەکان ڕێکخراون، کەئەمەش وادەکات سودێکی زیاتر بەخوێنەر بگەیەنێت، وەهانیدام بۆوەرگێڕنی بۆسەرزمانی کوردی، وەپێشنیارەکەی ئەو لەگەڵ حەزو ئاواتەکەی مندا یەکی دەگرتەووە کەدەمویست (صحیح جامع الصغیر) هەمووی وەرگێڕمەسەرزمانی کوردی، چونکە ئەمەش بەشێکە لەو، هەربۆیە ناوی خوام لێهێناو هەستام بەکارەکە، خوای گەورە بەکەرەمی خۆی لێمانی قەبوڵ بفەرموێت و بیکاتە توێشوی ڕۆژی قیامەتمان.

وەکاری من لەم کتێبەدا جگەلە وەرگێڕان، هەستاوم بەڕونکردنەوەی مانای هەندێ لەفەرمودەکان کەهەستم کردبێت ماناکەی ڕون و ئاشکرانییە، جاهەندێکیان کەزانیبێتم پێویست دەکات زیاتر ڕونم کردۆتەوە، وەهەندێکیشیان کەمتر.

وە هەرلەسەر شێوازی نوسخە عەرەبیەکەی کەلەلایەن لیژنەکەوە ئامادەکراوە و لەلایەن بلاوکراوەی (دار بیضون) بلاو کراوەتەوە ڕیزبەندی فەرمودەکانم هیچ نەگۆڕیوە و فەرمودە دوبارەکانم وەك خۆی داناوەتەوە و پێشی هەرفەرمودەیەك سەرچاوەکەی دیاری کراوە، دیاری کردنی هێمای تایبەت بۆهەرکتێبێکی فەرمودە هەروەك لەخوارەوە هاتووە( خ – بخاري، م – مسلم، د – أبي داود، ت – ترمذي،...) پاشانش ناوی ئەوە هاتووە کە فەرموودەکەی لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، وەلەکۆتایشیدا بەژمارەیك ئاماژە بۆپەراوێزەکە کراوە کە تیایداپلەی فەرمودەکە ( صحیح) یان (حسن) و ژمارەکەشی لە کتێبی (صحیح الجامع الصغیر)دادیاری کراوە. وەئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت و یارمەتیم بدات سەرجەم فەرودەکانی تری (صحیح الجامع الصغیر) وەردەگێڕمە سەرزمانی کوردی. وەهەرهەڵەیەك لێرەدا و لەهەرنوسراوێکی ترمدا بەدی بکرێت ئەوا لەخۆمەوەیە و ئەوەشی ڕاستە لەپەروەدگارمەوەیە.

وصلی اللە علي محمدالنبي الأمي وعلی آله وصحبه وسلم.

وەرگێڕ:

هاوڕێ محمد امین

هەینی ١٤/ شەعبان/ ١٤٢٨

# ((بەشی: ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە وسیفاتە بەرزەکانی))

## (١) (بێزراوترین ناو لە لای خوای گەورە)

**(١) (ق دت) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ أَخنَعُ اسْمٍ عندَ الله تعالى رجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاكِ، لا مالِكَ إلا الله ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٣٧) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فەوتێنەرترینی ناوەکان لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، پیاوێکە خۆی ناو نابێت پاشای پاشاکان، هیچ خاوەندارێك نییە جگە لە الله نەبێت).

**(٢) وفي لفظ أبي داود: قال رسول الله (ﷺ): ﴿أَخْرَجُ إسمٍ عندَ اللهِ يومَ القيامةِ رَجلٌ يُسمَى مَلِكَ الأملاكِ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٩٣) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ڕووگیرترین ناو لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، پیاوێکە پێی بوترێت پاشای پاشاکان).

**(٣) (حم م) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿أَغْيَظُ رَجُلٍ عَلَى اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَخْبَثُهُ وَأَغْيَظُهُ عَلَيْهِ رَجُلٌ كَانَ يُسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ لاَ مَلِكَ إِلاَّ اللَّهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٠٨١) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێزراوترین پیاو لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا کە لە هە موان پیستر و بێزراوتر بێت لە لای، پیاوێکە پێی بوترێت پاشای پاشاکان، هیچ پاشایەك نییە تەنها خوا نەبێت).

**(٤) (حم ق) عن أبي هريرة، (الحارث) عن ابن عباس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ على مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ مَلِكُ الأَمْلاكِ، لامَلِكَ إلا الله ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٩٨٨) في صحيح الجامع**

ابوهریرە و إبن عباس دەڵێن: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ڕق و تووڕەیی خوا لەسەر ئەو کەسە توند و ئەستورە کە لافی ئەوە لێ دەدات کە پاشای پاشاکانە، هیچ پاشایەك نیە تەنها الله نەبێت).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

ئەم فەرموودە پیرۆزانە هەموو ئەوە دەگەیەنن کە بێزراوترین وقێزەونترین ناو لە لای خوا کەسێکە کە خۆی ناو بنێت پاشای پاشاکان (شاهنشاه)، یان خەڵك ئەو ناوەی لێ بنێت و ئەویش پێی خۆش بێت و لێی بێ دەنگ بێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی توند بونی خەشم و قینی خوا لەسەری و دەبێتە مایەی فەوتانیشی لە قیامەتدا، چونکە هەر خوای گەورە پاشای هەموو جیهان وپاشای هەموو

پاشاکانە ، ئەو کەسەیش بە زەوت کردنی ئەو ناوە بۆخۆی سنوری خۆی بەزاندووە و شتێکی بۆ خۆی داگیر کردووە کە مافی ئەو نییە و تەنها تایبەتە بە خوای گەورەوە .

## ( ٢ ) ( پەردەی خوای گەورە )

**(٥) (حم ه إبن خزيمة حب ) عن صهيب، قال: تلا رسول الله (ﷺ) هذه الآية: ﴿ "لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ" ﴾ وقال:﴿"إذا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ وأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، نَادَى مُنَادٍ: يا أَهْلَ الجَنَّةِ إنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِداً يُرِيدُ أنْ يُنْجِزَكُمُوهُ. فَيَقولونَ: وَ ما هُوَ ؟ أَلَمْ يُثَقِّلِ اللهُ مَوازِينَنا و يُبَيِّضْ وُجُوهَنا وَ يُدْخِلنا الجَنَّةَ وَ يُنْجِنا مِنَ النَّارِ ؟ فَيَكْشِفُ الحِجاب فَيَنْظُرونَ إليه، فَوَاللهِ ما أَعْطاهُم اللهُ شَيئاً أَحَبَّ إليهِم مِنَ النَظَرِ إليهِ ولا أَقَرَّ لِأَعْيُنِهِم" ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٢١) في صحيح الجامع.**

صهيب دەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾ (ئەوانەی چاکەیان کردووە چاکەیان پاداشت دەدرێتەوە و زیاتریش ) ، ئینجا فەرمووی: ( کاتێك کە خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشت و خەڵکی ئاگریش چوونە ئاگر، بانگ بێژێك بانگ دەدات ، ئەی خەڵکی بەهەشت !ئێوە لە لایەن خواوە بەڵێنێکتان پێ دراوە دەیەوێت بۆتان بەجێ بگەیەنێت . ئەوانیش دەڵێن: ئەو بەڵێنە چی یە؟ ئەی ئەوە نییە خوای گەورە ترازووەکانمانی قورس کردووە و رووومانی سپی کردوەو خستوینیەتی یە بەهەشتەوە و لە ئاگریش رزگاری کردوین ؟ فەرمووی ! ئینجا پەردە لا دەبرێت و سەیری دەکەن . سوێند بێت بە خوا ، خوای گەورە هیچ شتێکی پی نەبەخشیوون کە هێندەی ئەو سەیرکردنەیان لە لا خۆش بێت (مەبەستی بینینی خوای گەورەو تەماشا کردنی ڕوی پیرۆزیەتی).

**(٦) (م ت) عن صهيب عن النبيّ(ﷺ) قال: ﴿ إذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ - قَالَ - يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا؟ أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٢٣) في صحيح الجامع**

صهيب دەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ( کاتێك کە خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە ، فەرمووی خوای تەبارەك و تەعالا دەفەرموێت: چ شتێکتان دەوێت بۆتان زیاد بکەم و بتاندەمێ ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی ڕومانت سپی نەکردوە ؟ ئەی نەتخستوینەتە بەهەشت و لە ئاگر رزگارت نەکردووین ؟ فەرمووی: ئینجا پەردە لا دەدرێت، ئیتر هیچ شتێکیان پێ نە بەخشراوە کە ئەوەندەی ئەو سەیرکردنەی خوای پەروەردگاریان پێ خۆش بێت ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

ئەو ووشەی ( زيادة ) يەی کە لە ئايەتە پيرۆزەکەدا هاتووە مەبەست پێی بينينی خوای گەورەيە ، واتە خوای گەورە زياتر لەو هەموو بەخشش و ڕۆزی يەی کە بەسەر خەڵکی بەهەشتدا دەيرێژێت ، پەردەش لا دەبات هەتا بەندە باوەڕ دارەکانی بتوانن لە بەهەشتدا خوای گەورەی خۆيان ببينن ، کە ئەوانيش هيچ بەخششێکيان لەلا هێندەی ئەو بينين و سەير کردنە خۆش نيە ، بە ڕاستی بەخششێکی بێ وێنەيە کە مرۆڤی ئيماندار بتوانێت خوای بەدیهێنەری خۆی ببينێت و گفت و گۆی ڕاستەو خۆی لەگەڵدا بکات . وە وادەردەکەوێت کە مەبەست لەو پەردەيەش پەردەی نور بێت هەروەك لە فەرمودەيەكدا لە(صحيح مسلم) دا هاتووە کە (ابو موسى) دەيگێڕێتەوە دەفەرموێت: (**حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ**)، واتە: ( پەردەکەی نورە ، ئەگەر لای بدات ئەوا پيرۆزيی و گەورەيی رووی ، هەموو دروست کراوەکانی خۆی دەسوتێنێت کە چاوی دەيگاتێ ).

(الطيبي) لە شەرحی ئەم فەرمودەيەی (ابو موسى) دا دەڵێ ! ئەوەی کە بۆمان روون بوەتەوە لە دەقەکانی قورئان وسوننەت ئەوە دەگەيەنن کە مەبەستی فەرموودەکە ئەوەيە کەئەگەر خوای گەورە ئەو پەردەی نورە لە ماڵی دنيا دا لابدات ئەوا هەموو مەخلوقات دەسوتێنێت نەك لە قيامەتدا ، چونکە ئەم بوونەوەرەی ئێستا بۆ لە ناو چون دروست بووە نەك بۆ مانەوە بە پێچەوانەی قيامەتەوە ، کە هەتا هەتاييە و لە ناو ناچێت .

## ( ٣ ) ( کاتێك کە خوای گەورە فەرمانێك دەردەکات)

**(٧) ( خ ت ه ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ: ﴿ إِذَا قَضَى اللَّهُ فِي السَّمَاءِ أَمْرًا ضَرَبَتْ الْمَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ كَأَنَّهَا سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ، قَالَ وَالشَّيَاطِينُ بَعْضُهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ ﴾.** (صحيح) ينظر حديث رقم ( ٧٣٤ ) في صحيح الجامع

(ابوهريرە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ئەگەر خوای گەورە فەرمانێکی فەرموو ئەوا فريشتەکان باڵيان شۆڕدەکەن لەمل کەچيدا بۆ فەرمايشتەکەی ، کە هەر دەڵێی زنجيری ئاسنە کە دەدرێت بە سە بەردی ساف و لوسدا ، هەر کاتێکيش کە ترسەکە دڵی بەردان ئەڵێن : ئەوە پەوەردگارتان چی فەرموو؟ ئەڵێن حەقی فەرموو، وە تەنها هەر خۆيەتی زاتی بەرزو گەورە ، فەرمووی: شەيتانەکانيش يەك بە سەر يەکدا کەوتوون).

**(٨) ( د ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا فَيُصْعَقُونَ فَلَا يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ حَتَّى إِذَا جَاءَهُمْ جِبْرِيلُ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ، قَالَ: فَيَقُولُونَ: يَا جِبْرِيلُ مَاذَا قَالَ رَبُّكَ فَيَقُولُ: الْحَقَّ، فَيَقُولُونَ: الْحَقَّ الْحَقَّ ﴾ .صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٤٣٦ ) في صحيح الجامع**

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ئەگەر خوای گەورە بە وەحی قسەی فەرموو، خەڵکی ئاسمان دەنگ و زرمە زرمێك دەبیستن هەر وەك و ئەوەی كە زنجیر بە سەر بەردی ساف و لوسدا رابكێشن، ئیتر دەتاسێن و لە هۆش خۆ دەچن ، وە بەو شێوەیە دەمێننەوە هەتا جبریل دێت بۆ لایان ، ئیتر كە جبریل هات دڵیان هێور دەبێتەوە ، فەرمووی پێی دەڵێن: ئەی جبریل ئەوە پەروەردگارت چی فەرموو ؟ ئەویش دەڵێت: حەقی فەرموو ئەوانیش دەڵێن: **الحق الحق**).

هەندێ لە زاناكان دەڵێن كە مانای فەرموودەكە ئەوەیە كە هەر كاتێك خوای گەورە قسەی كرد و وەحی فەرموو خەڵكی ئاسمانەكان لە ترس و هەیبەتدا دێنە لەرزە و وەك و بێ هۆشیان لێ دێت ، كاتێكیش كە دڵیان هێور دەبێتەوە لە یەكتر دەپرسن پەروەردگارتان چی فەرموو ؟ دەڵێن حەقی فەرموو واتە هەر فەرمایشتێكی فەرموو بێت حەق و راستە .

## ( ٤ ) ( هەڵگرانی عەرش )

**(٩) (د الضياء) عن جابر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ أُذِنَ لِي أَنْ أُحَدِّثَ عَنْ مَلَكٍ مِنْ مَلَائِكَةِ اللهِ مِنْ حَمَلَةِ الْعَرْشِ ،إِنَّ مَا بَيْنَ شَحْمَةِ أُذُنِهِ إِلَى عَاتِقِهِ مَسِيرَةُ سَبْعِمِائَةِ عَامٍ﴾**.(صحيح) ينظرحديث رقم (٨٥٤) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (رێگەم پێ دراوە كە باس لە فریشتەیەك لە فریشتەكانی خوای گەورە بكەم ، لە وانەی كە عەرشیان هەڵگرتووە ، تەنها لە نێوان نەرمەی گوێی و ئەستۆیدا حەوت سەد ساڵە رێیە) .

**(١٠) (ابو الشيخ في العظمة طس ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ أَذِنَ لِي أَنْ أُحَدِّثَ عَنْ دِيكٍ قَدْ مَرَقَتْ رِجْلاهُ الأرضَ وعُنُقُهُ مُثْنِيَةٌ تَحْتَ العَرْشِ وَ هُوَ يَقُولُ: سُبْحانَكَ ما أَعْظَمَكَ ! فَيَرُدُّ عَلَيْهِ: لا يَعْلَمُ ذلِكَ مَنْ حَلَفَ بِي كاذِباً ﴾**. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧١٤) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە رێگەی پێدام كە باس لە كەڵەشێرێك بكەم كە هەردوو قاچی لەو دیو زەوی یەوە هاتوەتە دەرەوە و ملیشی لەژێر عەرشدا چەماوەتەوە و دەڵێ: ( پاكی و بێ عەیبی هەر بۆتۆ چەندە گەورەیت )! خوای گەورەش وەڵامی دەداتەوە ! (ئەوەی سوێند بەمن بە درۆ دەخوات ئەو راستی یە نازانێت كە من چەندە گەورەم ).

### رونكردنەوەی فەرمودەكان :

ئەو كەڵەشێرەی كە لە فەرمودەكەدا باسی كراوە مەبەست پێی كەڵەشێری راستی نیە بەڵكو فەرمودەكە باس لە فریشتەیەك دەكات كە خوای گەورە لە شێوەی كەڵەشێردا دروستی كردووە ، وە هێندە قەبارەی گەورەیە كە پێكانی لە زەویدا چەقیوە و لەو دیوەوە هاتۆتە دەرەوە و ملیشی لە ژێر عەرشی پەروەردگاردا چەماوەتەوە ، وە دەیدەنی هەموو كاتێكیشی ئەوەیە كە زیكر و تەسبیحاتی

پەروەرگارەکەی دەکات و دەڵێ: ( پاکی و بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە چەندە گەورەیت): خوای گەورەش بەوە وەڵامی دەداتەوە (کە ئەو کەسەی سوێند بەمن دەخوات بە درۆ، ئەو راستی یە نازانێت کە من چەندە گەورەم ، و توانا و دەستەڵاتم چەندە زۆر و فراوانە ، چونکە هەرکەسێك ئەو راستی یە بزانێت هەرگیز ناوێرێت سوێند بەمن بخوات بەدرۆ). کە ئەمەش رادەی غەفڵەت و بێ ئاگایی و نەناسینی خوا لە مرۆڤدا پیشان دەدات.

## ( ٥ ) ( ئەوانەی کە دەیانەوێت نموونەی دروست کراوەکانی خوا دروست بکەن )

**( ١١ ) ( حم ق ن ) عن عائشة قالت: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ يا عائشة أَشَدُّ النَّاسِ عَذاباً عِنْدَ اللهِ يَومَ القيامةِ الذينَ يُضاهُونَ بِخَلْقِ اللهِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٩٩٧) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائشە ، ئەو کەسانەی کە توندترین سزا دەدرێن لەلایەن خواوە لە رۆژی قیامەتدا ،ئەوانەن کە بیانەوێت وەك دروست کراوەکانی خوا دروست بکەن و لاسایی بکەنەوە ).

**( ١٢ ) ( الطيالسي الضياء ) عن أسامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قاتَلَ اللهُ قَوماً يُصَوِّرونَ ما لا يَخلُقُون ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٢٩١) في صحيح الجامع**

اسامە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ( نەفرەتی خوا لە کەسانێك بێت کە وێنەی شتانێك دەکێشن کەپێیان بەدی ناهێنرێت ).

**( ١٣ ) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ خَلقاً كَخَلقِي؟ فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً، أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً، أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً ﴾. (حسن) ينظر حديث رقم (٤٣٣٢) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێت: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە دەچێت بەدی هێنراوێك دروست دەکات وەك بەدی هێنراوەکانی من ؟ دەبا بتوانن مێرووله‌یەك دروست بکەن ، یان دەنکە تۆوێك دروست بکەن ، یان با بتوانن دەنکە جۆیەك دروست بکەن ).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان:

لە شەرحی ئەم فەرموودانە زانایان دەفەرمون: مەبەست پێی ئەوکەسانە یە کە دەیانەوێت لاسایی خوا بکەنەوە لە رێی وێنە کێشانەوە ، ئەویش بەوەی کە وێنەی گیانلەبەران دروست دەکەن ،جا هەرکەسێك وێنەی گیانلەبەرێك بکێشیت (جا ئەو گیانلەبەرە مرۆڤ بێت یان ئاژەڵ) بەو مەبەستەی کە بپەرسترێت ، یان مەبەستی پێ لاسایی کردنەوەی خوا بێت لە دروست کردندا ، وە باوەڕی بەوە هەبێت

، ئەوا پێی کافر دەبێت وە توندترین سزاشی لە سەر دەدرێت ، وە ئەگەر مەبەستیشی پیێ پەرستن و لاسایی کردنەوە نەبێت ئەوا هەر پێی فاسق دەبێت ،چونکە وێنە کێشانی گیان لەبەران لە تاوانە گەورەکانە ، هەر چەندە وێنەکەش لەسەر جل و بەرگ یان فەرش یان پارە یان قاپ و دەفتەر یان دیوار بکێشرێت . بەڵام وێنە کێشانی شتی بێ گیان حەرام نییە وەك چیا و روبار و دار و گوڵ و خۆر و مانگ ، هەروەها وێنە کێشانی شتێکیش کەبوونی نەبێت ئەویش هەر حەرام نییە وەك ئەسپی باڵدار یان مرۆڤی باڵدار ، هەروەها بوکی منداڵان کە کچان یاری پیێ دەکەن ئەویش حەرام نییە .

## ( ٦ ) ( جگە لە خوا هەمووی بەتاڵە )

**( ١٤ ) ( م ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَشْعَرُ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَتْ بِهَا الْعَرَبُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: ألا كُلّ شَيءٍ ما خَلاَ اللهَ بَاطِلُ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٠٠٤ ) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: (باشترین وتە شیعر کە عەرەب وتویەتی ، وتەکەی (لبید)ە کە دەڵێ: بەڕاستی هەموو شتێك جگە لە خوا بە تاڵە ).

**( ١٥ ) ( ق ه ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشاعر كَلِمَةُ لَبِيد: ألا كُلّ شَيءٍ ما خَلاَ اللهَ بَاطِلُ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٠١٣ ) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ( راسترین وتە کەشاعیر وتویەتی ، وتەکەی (لبید)ە کە دەڵێ: بەڕاستی هەموو شتێك جگە لە خوا بە تاڵە ).

### ڕوون کردنەوەی فەرموودەکان:

ئاینی ئیسلام رێگەی بە شیعر ووتن داوەو قەدەغەی نەکردووە ، بە مەرجێك زیادە رۆیی و جوێن دان و درۆ و پیاهەڵدانی لە رادەبەدەر و شتی ناشەرعی تێدا نەبێت ، چونکە شیعریش وەك هەر قسەیەکی تر قسەیە ، جا چاکی چاکە و خراپیشی خراپە . وە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی سێ شاعیری تایبەتی هەبووە . وە ئەو شیعرەش کە لە فەرمودەکاندا هاتووە ئەوا نیوەی دێرە شێعرێکە ، وە دێرەکە بە تەواوی بەم جۆرەیە:

( **ألا كُلُّ شئٍ ما خلا الله باطل وكلُّ نعيمٍ لا محالةَ زائلُ** ) ، واتە: بەڕاستی هەموو شتێك جگە لە خوا بەتاڵە، وە هەموو نیعمەتێکیش گومانی تێدا نییە کە نامێنێت ، وە ماناکەشی نزیکە لەو ئایەتە قورئانی یە پیرۆزەی کە دەفەرموێت: ( **كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ** )، واتە: (هەمووشتێك لە ناو دەچێت و دەفەوتێت جگە لە رووی خوا نەبێت ). وە هەر لەبەر ئەوەیشە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە راسترین قسەی عەرەبی لە قەڵەم داوە ، چونکە قورئانی پیرۆز و عەقڵی مرۆڤیش دەیسەلمێنن و گەواهی لە سەر راستییەکەی دەدەن.

## ( ٧ ) ( خوای گەورە نەرم و نیانە )

(١٦) ( د حم ) عن أبي رمثة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنْتَ رَفِيقٌ واللهُ الطَّبِيبُ ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (١٤٨١) في صحيح الجامع

ابو رمثة دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تۆ کەسێکی نەرم و نیانیت ، بەڵام بە راستی هەر خوا پزیشك و شیفادەرە ).

(١٧) ( حم ق ت هـ )عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا عَائِشَةُ! إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّه ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٧٩١٩) في صحيح الجامع

واتە ئەی عائشە: (خوا نەرم ونیانە و حەزی بە نەرم و نیانییە لە هەموو کارێکدا).

(١٨) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ وَمَا لاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ ﴾صحيح ينظرحديث رقم (٧٩٢٠) في صحيح الجامع

واتە: (خوا نەرم و نیانە و حەزی بە نەرمی و نیانیشە ، وە ئەوەی کە لە پاداشتی نەرم و نیانیدا دەیبەخشێت، نە لەپاداشتی توندوتیژی ونە لە پاداشتی هیچ شتێکی تردا نایبەخشێت).

## ڕونکردنەوەی فەرمودەکان :

ابي رمثة دەیگێڕیتەوە دەڵێ لەگەڵ باوکمدا سەردانی پێغەمبەرمان(ﷺ) کرد ، باوکم چاوی بەنیشانەکەی پشتی پێغەمبەر(ﷺ) کەوت ، وتی رێگەم بدە بۆت چارەسەر بکەم من پزیشکم. ئەویش پێی فەرموو تۆ پیاوێکی دڵ نەرم و بەسۆزیت ، بەڵام پزیشك تەنها هەر خوایە . دیارە کە باوکی(أبي رمثة) نیشانەکەی پشتی پێغەمبەر(ﷺ) کە هێمای پێغەمبەرایەتییە ، وای زانیوە دومەڵ و نەخۆشییە ، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بەشێوەیەك وەڵامی دەداتەوە کە باس و مەسەلەکەی پێ دەگۆڕێت و دەیەوێت تێی بگەیەنێت کە نیشانەکەی پشتی پێویستی بە چارەسەر نییە ، بەڵکو قسەکەی ئەو پێویستی بە چارەسەرە کە خۆی بە شیفادەر لە قەڵەم دەدات ، وە تێی دەگەیەنێت کە تۆ تەنها سۆز و نەرمی بەرامبەر بە نەخۆشەکە دەردەبڕیت و هەر ئەوەندەت لە تواناداییە ، بەڵام چارەسەرەکە تەنها لای خوایە و هەر ئەو پزیشکە و شیفادەرە .

## ( ٨ ) ( -السلام- ناوێکی پیرۆزی خوایە )

(١٩) ( عق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ السَّلاَمَ إِسْمٌ مِنْ أسماءِ اللهِ تَعالى فَأَفْشُوهُ بَيْنَكُم ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (١٦٣٨) في صحيح الجامع

أبوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (-السلام- یەکێکە لە ناوەکانی خوای گەورە ئێوەش لە نێوان خۆتاندا پەخش و بڵاوی بکەنەوە ).

( ٢٠ ) ( خد ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ السَلامَ إسمٌ مِن أسماءِ الله تَعالى وُضِعَ في الأرْضِ فَأفْشُوا السَلامَ بَيْنَكُم ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٦٣٩ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (–السلام– ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە لە زەویدا دانراوە، ئێوەش سەلام لە نێوان خۆتاندا بڵاو بکەنەوە و پەخشی بکەن ).

( ٢١ ) ( البزار هب ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ السَّلامَ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ الله وَضَعَهُ اللهُ في الأرْضِ، فَأَفْشُوه بَيْنَكُمْ، فَإنَّ الرَّجُلَ الْمُسْلِمَ إذا مَرَّ بِقَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ فَرَدُّوا عَلَيْه كَانَ لَهُ عَلَيْهِمْ فَضْلُ دَرَجَةٍ بِتَذْكِيرِه إيَّاهُمُ السَّلامَ، فَإنْ لَمْ يَرُدُّوا عَلَيْه رَدَّ عَلَيْه مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُمْ وَأَطْيَبُ ﴾. ( حسن ) ينظر حديث رقم ( ٣٦٨٣ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (–السلام– ناوێکە لە ناوەکانی خوا ، خوا لە زەویدا دایناوە، ئێوەش لە نێو خۆتاندا بڵاوی بکەنەوە و ئاشکرای بکەن ، ئەوەتا ئەگەر پیاوێکی موسڵمان بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕێت و سەلامیان لێ بکات و ئەوانیش وەڵامی بدەنەوە ، ئەوا ئەم فەزڵی پلەیەکی هەیە بەسەر ئەواندا بەوەی کە سەلامی بیر خستونەتەوە ، ئەگەر وەڵامیشیان نەدایەوە ، ئەوا کەسانێکی لەوان باشتر و پاك تر وەڵامی سەلامەکەی دەدەنەوە).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان:

(السلام) یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە و مانای ئاشتی و ئاشت بوونەوە و ژیانی ئاشتەوایەتی دەگەیەنێت ، وەخوای گەورە ئەم ناوە پیرۆزەی خۆی لە زەویدا داناوە هەتا پەیڕەوانی ئاینی ئیسلام لە نێو خۆیاندا بەکاری بهێنن و ببێتە مایەی ئاشتی و ئارامی و خۆشەویستی و تەبایی لە نێوانیان ، وە بیکەنە سڵاوی نێوانیان و ببێتە هێمایەك بۆ لەیەکتر دڵنیا بوون و ئەمین بوون.

## ( ٩ ) ( وەسوەسەی شەیتان )

( ٢٢ )(د) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ):﴿ يُوشِكُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ ، حَتَّى يقول قائلُهم: هذا اللهُ خَلَقَ الْخَلْقَ ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟ فَإذا قَالُوا ذَلِكَ فَقُولُوا "اللهُ أَحَدٌ اللهُ الصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ" ثُمَّ لْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِه ثَلاثًا وَلْيَسْتَعِذْ مِنَ الشَّيْطَانِ ﴾.(صحيح) ينظر حديث رقم ( ٨١٦٧ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نزیك بوەتەوە وهێندەی نەماوە وای لێ بێت خەڵك پرسیار بکەن و یەکێکیان بڵێت: ئەوە خوایە مەخلوقاتی دروست کردووە ، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ .جا ئەگەر وایان ووت ئێوەش بڵێن﴿ ٱللَّهُ أَحَدٌ ، ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ،

﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴾ ، واته: (خوا يەكە ، تاك وتەنيايە ،هەموو نيازمەندان روولەو دەكەن بۆ جێبەجێ بوونی نیازەکانیان وئەویش نیازی بە کەس نییە، کەسی لێ نەبوە، وەلە کەسیش نەبووە، وە هیچ هاوتاو هاوشانێکیشی نییە)، ئنجا با سێ جار تف بکاتە لای چەپی و پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان).

(٢٣) (م د) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يُقَالَ : هَذَا خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ،فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَلْيَقُلْ : آمَنْتُ بِاللَّهِ و رسولهِ ﴾.(حسن) ينظر حديث رقم (٧٦٩٢) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بەردەوام خەڵك پرسیار دەکەن هەتا وای لێدێت دەوترێت:ئەوە خوا مەخلوقاتی دروست کردوە ، ئەی کێ خوای دروست کردووە ؟جا هەر کەسێك شتێکی لەو بابەتە بیست با بڵێ: باوەڕم هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکەی).

(٢٤) (خ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَنْ يَبْرَحَ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يَقُولُوا هَذَا اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٢١٧) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: (خەڵك دەست هەڵناگرن لەوەی کە بپرسن: ئەوە خوا بەدی هێنەری هەموو شتێکە ، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ ).

(٢٥) (حم م) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ يَزَالُونَ يَقُولُونَ : مَاكَذَا مَا كَذَا حَتَّى يَقُولُوا : هَذَا اللَّهُ خَلَقَ الْخَلْقَ فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣١٨) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە فەرموی: ئومەتەکەت بەردەوام دەڵێن ئەوە چی یە؟ ئەوە چۆنە ؟ هەتا دەگەنە ئەوەی کە دەڵێن: ئەوە خوا مەخلوقاتی دروست کردووە ، ئەی کێ خوای دروست کردووە ).

(٢٦)(حم) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ):﴿ إِنَّ أَحَدَكُمْ يَأْتِيهِ الشَّيْطَانُ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَكَ ؟ فَيَقُولُ :اللَّهُ. فَيَقُولُ: فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ، فَإِنَّ ذَلِكَ يُذْهِبُ عَنْهُ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٥٤٢) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەندێ جار شەیتان دێتە لای یەکێکتان و دەڵێ: کێ دروستی کردویت ؟ ئەویش دەڵێ:الله ،ئەویش پێی ئەڵێت ئەی کێ (الله) ی دروست کردووە ؟جا هەرکامێکتان هەستی بەوە کرد با بڵێت: -باوەڕم هەیە بە خوا و پێغەمبەرەکەی- چونکە ئەوە ئەو وەسوەسەیەی لە کۆڵ دەکاتەوە ).

(٢٧) (ابن أبي الدنيا في مكايد الشيطان) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الشَيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُم فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَكَ ؟ فَيَقُولُ: الله، فَيَقُولُ: فَمَنْ خَلَقَ الله؟ فَإذا وَجَدَ أَحَدُكُمْ ذلِكَ فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ وَ رُسُلِه فَإنَّ ذلِكَ يُذْهَبُ عَنْهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٦٥٧) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( جاری وا هەیە شەیتان دێتە لای یەکێکتان و پێی دەڵێ: کێ دروستی کردویت ؟ ئەویش دەڵێ : **الله** ، ئەویش پێی ئەڵێت: ئەی کێ **الله** ی دروست کردووە؟ جا ئەگەر یەکێکتان هەستی بەوە کرد با بڵێت: -باوەڕم هەیە بە خواو پێغەمبەرەکانی- چونکە ئەوە ئەو وەسوەسەیەی لێ دور دەخاتەوە).

(٢٨) (طب) عن إبن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ؟ فَيَقُولُ: اللَّهُ، فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ الأَرْضَ؟ فَيَقُولُ: اللَّهُ، فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ فَإذا وَجَدَ ذلِكَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرَسُولِه ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٦٥٦) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ( هەندێ جار شەیتان دێتە لای یەکێکتان پێی دەڵێ: کێ ئاسمانی دروست کردووە ؟ ئەویش دەڵێ : **الله** ، ئینجا پێی دەڵێ: ئەی کێ زەوی دروست کردووە؟ ئەویش دەڵێ :**الله** ، ئینجا دەڵێ: ئەی کێ **الله** ی دروست کردووە ؟ جا هەر کامێکتان هەستی بەوە کرد با بڵێت: باوەڕم هێنا بە خواو بەپێغەمبەرەکانی).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

مانای فەرموودەکان روون و ئاشکرایە وە پێغەمبەر(ﷺ) پێمان دەڵێ کە ئەو جۆرە پرسیار وخەتەرانەی کە بەدڵی مرۆڤدا دێت هیچ نی یە تەنها وەسوەسەی شەیتان نەبێت وە ڕێگای دەرباز بونیشی لەو وەسەوەسەیە پیشان داوین کە ئەویش ووتنی ( **آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرَسُولِه**) و پەناگرتن بەخوایە لەشەڕی شەیتان. ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: یەکێك لە فێڵ و تەڵەکەبازی شەیتان ئەوەیە کە هانی خەڵکی عەوام و کەم زانست دەدات کە بیر لە زاتی خوا و سیفاتەکانی بکاتەوە لە هەندێ ڕووەوە کە عەقڵی نایبڕێت و گومانی لە ئایینەکەیدا بۆ دروست دەکات، یان خەیاڵی وای لەسەر زاتی خوا بۆ دروست دەبێت کە پێی کافر دەبێت کەچی بە بۆچونی خۆی زۆر دڵخۆشەو بە خۆی دەنازێت کە هێندە زیرەك وبیر تیژە کە توانیویەتی بگاتە ئەو پلەیە لە ناسینی خوا، وە بێ عەقڵ ترین کەس ئەوانەن کە لە هەموو کەس زیاتر بە عەقڵی خۆیان دەنازن و لێی رازین، وە عاقڵ ترین کەسیش ئەوانەن کە لە هەموو کەس زیاتر ڕەخنە لە خۆیان و بۆچونەکانی خۆیان دەگرن و هەمیشە پرسیار لە زاناکان دەکەن بۆ تێگەیشتن لە ڕاستی یەکان. وە ئەو کەسانەی کە دو چاری ئەو وەسوەسانە دەبن خەڵکی نەزان و عەوامن نەك کەسانی زانا و تێگەیشتوو هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێ یان ناڵێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو وەسوەسەیە بچن لێکۆڵینەوەی زیاتر بکەن بەڵکو دەیانگێڕێتەوە بۆ تازە کردنەوەی باوەڕیان بەخوا و بە

پێغەمبەرەکەی، وە کاری توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بۆ زاناکان بە جێ دەهێڵێت چونکە کەسی عەوام ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات هێشتا تاوانی کەمترە لەوەی کە لە خۆیەوە بەنەزانین و نەفامی قسە لەسەر زاتی خوا بکات چونکە ئەمە یان دەبێتە هۆی کافر بوونی. کەسی زانا و عاقڵیش بەهۆی عەقڵ و زانستەکەیەوە ئەو راستی یە باش دەزانێت کە خوا نابێت دروست کراو بێت هە تا بڵێین کێ دروستی کردوە وە شتی دروست کراو هەرگیز نابێت بە خوا. وە ئەم پرسیارە خۆی لە خۆیدا هەڵەیە و تەنها وەسوەسەی شەیتانە.

## ( ١٠ ) ( دڵەکان لە نێوان دوو پە نجە لە پە نجەکانی خوای گەورەدان )

**( ٢٩ ) ( ت ) قيلَ لأمّ سَلمَة: يَا أمّ المُؤمنِينَ مَا كَانَ أكثرُ دُعَاء رَسُول الله(ﷺ) إذا كَانَ عندَك ؟ قَالَتْ : كَانَ أكْثرُ دُعَائه ( يَا مُقلّبَ القُلُوب ثبّتْ قَلبِي عَلى دِينِكَ ). قَالَتْ: قُلتُ يَا رَسُولَ الله مَا لأكثر دُعَائكَ يَا مُقلّبَ القُلُوب ثبّتْ قَلبِي عَلَى دِينِكَ قَالَ:﴿ يَا أمّ سَلمَةَ إنّهُ لَيْسَ آدَمِيٌّ إلاّ وَقَلبُهُ بَيْنَ أصْبُعَيْنِ مِنْ أصَابِعِ الله فَمَنْ شَاءَ أقَامَ وَمَنْ شَاءَ أزَاغَ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٧٨٥١ ) في صحيح الجامع**

بە ام سلمة ی خێزانی پێغەمبەریان (ﷺ) ووت: ئەی دایکی موسڵمانان کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتە لای تۆ زیاتر چ دوعایەکی دەکرد ؟ وتی: زیاتر دوعای ئەو بریتی بوو لە ( **يَا مُقلّبَ القُلُوب ثبّتْ قَلبِي عَلَى دِينِكَ** ) واتە ( ئەی وەرگێڕی دڵان دڵم لەسەر ئاینەکەت چەسپاو و دامەزراو بکە . وتی منیش پێم ووت : ئەی پێغەمبەری خوا زۆر دەتبینم ئەم دوعایە دەکەیت ( **يَا مُقلّبَ القُلُوب ثبّتْ قَلبِي عَلَى دِينِكَ** ) ئەویش فەرمووی: ئەی (أم سلمة) هیچ ئادەمییەك نییە ئیلا دڵی وا لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوادا ، جا ئەگەر ویستی لەسەر هەکەسێك بوو ئەوا دامەزراوی دەکات ، و هەرکەسێکیشی ویست ئەوا گومرای دەکات ).

**( ٣٠ ) ( هم ت ك ) عَنْ أنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله(ﷺ) يُكثرُ أنْ يَقُولَ: ﴿ يَا مُقلّبَ القُلُوب ثبّتْ قَلبِي عَلَى دِينِكَ ﴾ . فَقُلْتُ يَا رَسُولَ الله آمَنّا بِكَ وَبِمَا جِئْتَ بِهِ فَهَلْ تَخَافُ عَلَيْنَا قَالَ: ﴿نَعَمْ إنّ القُلُوبَ بَيْنَ أصْبُعَيْنِ مِنْ أصَابِعِ الله يُقَلّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٦٨٥ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)زۆرەی جار دەیفەروو: (ئەی وەرگێڕی دڵان دڵم لەسەر ئاینەکەت دامەزراو بکەیت، منیش پێم ووت ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕمان بە خۆت کردووە و بەو قورئانەی کە هێناویشتە، جا هێشتا هەر ترست هەیە لەسەرمان ؟ فەرمووی: بەڵێ ، چونکە بەڕاستی دڵەکان وان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوادا، چۆنی بووێت ئاوا هەڵیدەسوڕێنێت ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان :

ئەو دوو فەرموودە پیرۆزە هانمان دەدەن و بێدارمان دەکەنەوە کە موسڵمان نابێت لە مەکری خوا ئەمین بێت و وا بزانێت لەبەر ئەوەی کە ئێستا موسڵمانە و خوا دەناسێت ئیتر هەتا هەتایە هەروا دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ)کاتێك (أنس) پرسیاری لێ دەکات و دەڵێ باوەڕمان بە خۆت و بەوەی لەلای خواوە هێناوتە کردووە، جا هێشتا هەر ترست هەیە لەسەرمان ؟ لەوەڵامدا پێی دەفەرمووێت: بەڵێ ، چونکە ئەو لە هەموو کەس باشتر دەزانێت کە ئاڕاستەی دڵەکان بەدەستی خوایە و ئەویش چۆنی بوێت ئاوا دەیسوڕێنێت ، مرۆڤیش تا ئەو ساتە وەختەی کە تیا دەمرێت نازانێت دڵی روو لە کوێ دەکات ، بۆیە پێویستە لە خوا بپاڕێینەوە کە دڵمان لەسەر ئاینەکەی و بەندایەتی کردن بۆی دامەزراو بکات ، نەك وەك هەندێ کەس کە پشتی لێداوەتەوە و غافڵ لەمەکری خوا سوێندت بۆ دەخوا دەڵێ من بە نەعلی پێمەوە دەچمە بەهەشت ، یان دەڵێ جا من نەچمە بەهەشت کێ دەچێتە بەهەشت ، چەندین کەسمان بینی لێرە موسڵمانی نوێژکەر و قورئان خوێن و تەنانەت خەڵکیشی بانگەواز دەکرد بۆ ڕێگای خوا ، بەڵام هەر ئەوەندە سەردانی وڵاتێکتی ئەوروپایی کرد ئێستا –پەنا بەخوا دەگرم– هەر گاڵتەی بە دین و ئیسلامەتی دێت ، جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموومان زیاتر خوای ناسیوە ، هەر لەبەر ئەوەشە کە لە هەموومان زیاتر لە خوا ترساوە.

هەروەها دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە ئەو دڵەی لە فەرموودەکاندا ناوی هاتووە مەبەس پێی ئەو پارچە گۆشتە نیە کە وا لە سنگی مرۆڤدا و لە سنگی هەموو گیانلەبەرێکی تریشدا هەیە ، بەڵکو ئەو دڵە بەشێکە لەو ڕۆحەی کە خوای گەورە بەجەستەی مرۆڤیدا کرددووە، جا چۆن هەموو جەستەیەك لە دڵ و مێشك و چاو و گوێ و ... پێك دێت بەهەمان شێوەش بۆ هەر یەکێك لەو ئەندامانەی جەستە بەشێك لە ڕۆح پێوەی پەیوەستە، وە ئەو دڵەی کە فەرمودەکان و زۆربەی ئایەتە قورئانیەکان مەبەستیانە ئەو بەشە ڕۆحیە کە پەیوەستە بەدڵی جەستەمانەوە ،وە زۆربەی کاتیش بە (فؤاد) ناوی دەبات(وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ خوای گەورەش خۆی لە هەموو کەس زاناترە.

## ( ١١ ) ( پەیمان وەرگرتن لەنەوەی ئادەم )

**( ٣١ ) (حم ن ك هق في الأسماء) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ أَخَذَ الْمِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنَعْمَانَ - يَعْنِي عَرَفَةَ - فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا فَنَثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِّ ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قِبَلاً قَالَ : "أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى" ).** (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٠١) في صحيح الجامع

ابن عباس دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە ڕۆژی عەرەفە لە (نەعمان)دا پەیمانی لە پشتی ئادەم وەرگرتووە، وە چ نەوەیەك کە لە پشتی ئادەم دەکەوێتەوە دەری هێناون و لە نێوان هەردوو دەستیدا وەك مێروولەی ورد هەڵی ڕشتوون و پەرش و بڵاوی کردونەتەوە، پاشان قسەی

پێش وەختی لەگەڵدا کردوون و پێی ووتون: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾ واتە :( ئایا من پەروەرگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش ووتیان: بەڵێ).

(٣٢) (البزار طب هق ) عن هشام بن حكيم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ أَخَذَ ذُرِّيَّةَ آدَمَ مِنْ ظَهْرِهِ، ثُمَّ أَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ؟ قَالُوا: بَلَى، ثُمَّ أَفَاضَ بهم في كفّيه، فَقَالَ: هَؤُلَاءِ فِي الْجَنَّةِ وَهَؤُلَاءِ فِي النَّارِ، أَمَا أَهْلُ الْجَنَّةِ فَمُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَأَمَّا أَهْلُ النَّارِ فَمُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٠٢) في صحيح الجامع

هشامی کوڕی حەکیم دەڵێ : پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە نەوەی ئادەمی لە پشتی ئادەم وەرگرتوە و پاشان ( شایەتی پێ داون لەسەر خۆیان کە ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش ووتویانە: بەڵێ ) پاشان هەڵی رشتوونەتە هەردوو لەپی دەستیەوە و فەرموویەتی: ئەوانە بۆ بەهەشت و ئەوانەش بۆ ئاگر، جا خەڵکی بەهەشت رەخسێنراون بۆ ئەوەی کارو کردەوەی خەڵکی بەهەشەت بکەن، وە خەڵکی ئاگریش رەخسێنراون بۆ ئەوەی کارو کردەوەی خەڵکی ئاگر بکەن ).

## (١٢) ( خوای گەورە ویستی لەسەر هەر شتێك بێت دەیکا ت )

(٣٣) (م) عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ(ﷺ) قَالَ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَرَادَ رَحْمَةَ أُمَّةٍ مِنْ عِبَادِهِ قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا فَجَعَلَهُ لَهَا فَرَطًا وَسَلَفًا بَيْنَ يَدَيْهَا ، وَإِذَا أَرَادَ هَلَكَةَ أُمَّةٍ عَذَّبَهَا وَنَبِيُّهَا حَيٌّ ، فَأَهْلَكَهَا وَهُوَ يَنْظُرُ ، فَأَقَرَّ عَيْنَهُ بِهَلَكَتِهَا حِينَ كَذَّبُوهُ وَعَصَوْا أَمْرَهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٠٧) في صحيح الجامع

ابو موسی دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە ویستی رەحم بە ئومەتێك بکات لە بەندەکانی خۆی ئەوا لە پێش ئەواندا گیانی پێغەمبەرەکەیان دەکێشێت هەتا بیکاتە رێخۆشکەر و پێشەنگێك لەبەر دەمیاندا، وە ئەگەر ویستیشی ئومەتێك لەناو بەرێت ئەوا هێشتا پێغەمبەرەکەیان زیندووە کە ئەشکەنجەیان دەدات هەتا پێغەمبەرەکە بیانبینێت کە چۆن لەناویان دەبات، هەتا چاورۆشن بێت بە لە ناو چونیان کاتێك کە بە درۆیان خستۆتەوە و لە فەرمانی دەرچوون.

## (١٣) ( خوای گەورە جوانە و حەزی بە جوانیشە )

(٣٤) (م ت) عن إبن مسعود (طب) عن أبي أمامة (ك ) عن إبن عمر(إبن عساكر) عن جابروعن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ، قَالَ رَجُلٌ إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٤١) في صحيح الجامع

هەر یەك لە ابن مسعود و ابوامامە و جابر و ابن عمر بە جیا دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( هەر کەسێ هێندەی تۆزقاڵە گەردێك فیز و خۆ بەگەورە زانین لە دڵیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە)، پیاوێك وتی: ئەی باشە پیاو حەز دەکات جلەکانی جوان بێت و پێڵاوەکەی جوان بێت، ئەویش فەرمووی: (خوا خۆی جوانە و حەزیشی لە جوانی یە، فیز و خۆ بەگەورە زانین بریتی یە لە رق لێ بوونی حەق و بەسوك سەیرکردنی خەڵك ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرمووودە پیرۆزە چەند راستییەکمان بۆ روون دەکاتەوە:

١- مرۆڤی لوت بەرز و پۆز لێدەر و خۆ بەگەورە زان ، ئەگەر تۆبە لەو حاڵەی نەکات چاوی بە بەهەشت ناکەوێت.

٢- حەز کردن لە جلوبەرگی جوان و کەلوپەلی جوان و خۆ جوان کردن ئەگەر بەمەبەستی خۆ هەڵکێشان بەسەر خەڵکیدا نەبێت ، ئەوا کارێکی دروستە و ناچێتە بابی خۆ بەزل زانینەوە.

٣- خوای پەروەردگارمان خۆی زاتێکی جوانە و حەزیشی بە جوانی یە، دیارە ئەو خوایەی کە بتوانێت ئەو هەموو جوانی یە بە بوونەوەر ببەخشێت دەبێت جوانی یەکەی خۆیشی بێ رادە و بێ سنور بێت.

٤- پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە ڕونی و بە گشت گیری پێناسەی (تکبر) فیز و لوت بەرزیمان بۆ دەکات کە بریتی یە لەوەی رقت لە حەق بێت و حەقت پێ قبوڵ نەبێت، وە بەشێوەیەکی سوك و کەم سەیری خەڵك بکەیت وخۆت لەوان بە زل تر و گەورەتر بزانیت. بەڵێ ئەمە ئەو خۆ بەزڵ زانینە یە کە ئەگەر هێندەی مسقاڵێکی لە دڵی مرۆڤدا بێت ئەوا بەهەشتی لێ حەرام دەکات.

## ( ١٤ ) ( دەربارەی دروست کردنی ئادەم )

(٣٥) (حم د ت ك هق ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الأَرْضِ، فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الأَرْضِ، فَجَاءَ مِنْهُمُ الأَحْمَرُ وَالأَبْيَضُ وَالأَسْوَدُ وَبَيْنَ ذَلِكَ وَالسَّهْلُ وَالْحَزْنُ وَالْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَبَيْنَ ذَلِكَ ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٥٩) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە ئادەمی دروست کردووە لە مشتێك خۆڵ کە لەهەموو زەوی یەوە وەری گرتووە، هەر بۆیە نەوەو وەچەکانی ئادەمیش بەپێی ئەو زەوی یەی کە لێی دروست بوون هاتوون وپەیدا بوون، تیایاندایە سورە و هەیانە سپییە و هەیانە رەشەو هەشیانە لەو نێوەندەدایە، هەروەها تیایاندایە نەرم و نیان و لەسەر خۆیە و هەشیانە توڕە و توند و تیژە و هەیانە پیس و خراپە و هەشیانە پاك و باشە و هەشیانە لەو نێوەندەدایە).

## ( ١٥ ) ( ئەو فەرموودانەی كە باس لە رەحمەتی خوا دەكەن )

(٣٦) ( م )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعَالَى: سَبَقَتْ رَحْمَتِي غَضَبِي ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٤٣٢١ ) في صحيح الجامع

ابوهريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە فەرموویەتی: رەحمەتم پێش غەزەب و توڕەبونم كەوتووە ).

(٣٧) ( ت ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ حِينَ خَلَقَ الْخَلْقَ كَتَبَ بِيَدِهِ عَلَى نَفْسِهِ إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٧٥٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( كاتێك كە خوا مەخلوقاتی دروست كردووە، بەدەستی خۆی لەسەر خۆی نوسیویەتی كە رەحمەتم زاڵ دەبێت بەسەر غەزەب و توڕەبونمدا ) .

(٣٨) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ لَو يَعْلَمُ الْمُؤمِنُ مَا عِنْدَ اللهِ مِنَ العُقُوبَةِ مَا طَمَعَ فِي الجَنَّةِ أَحَدٌ، وَلَو يَعْلَمُ الكافِرُ مَا عِنْدَ اللهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنَطَ مِنَ الجَنَّةِ أَحَدٌ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٧٦٣ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر مرۆڤی بڕوادار دەیزانی خوا سزای چۆنی لایە، كەس تەمای چونە بەهەشتی نەدەبوو، وە ئەگەر كافریش دەیزانی چ رەحمەتێك لای خوایە، كەس لە بەهەشت بێ ئومێد نەدەبوو).

(٣٩) ( ت ه )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَمَّا خَلَقَ الْخَلْقَ كَتَبَ بِيَدِهِ عَلَى نَفْسِهِ إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٨٠٣ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ( خوای گەورە كاتێك كە مەخلوقاتی دروست كردووە بە دەستی خۆی لەسەر خۆی نوسیوە، كە رەحمەتم زاڵ دەبێت بەسەر غەزەب و توڕەیمدا ).

(٤٠) ( ق )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ جَعَلَ اللهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزءٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَ تِسْعِينَ جُزءاً وَ أَنْزَلَ فِي الأَرضِ جُزءاً واحِداً فَمِنْ ذَلِكَ الجُزءِ تَتَرَاحَمُ الخَلْقُ حَتَى تَرفَعَ الفَرَسُ حَافِرَها عَنْ وَلَدِها خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٠٩٤ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوا رەحمەتی كردووە بەسەد بەشەوە، نەوەدو نۆ بەشیانی لە لای خۆی گل داوەتەوە، وە یەك بەشیانی دابەزاندۆتە سەر زەوی، جالەو تاكە بەشەیە كە مەخلوقات لە نێوان خۆیاندا رەحم بە یەكتری دەكەن هەتا ئەسپ پێی لە بەچكەكەی بەرز دەكاتەوە لە ترسی ئەوەی بەری نەكەوێت و ئازاری نەدات).

(٤١) ( حم )عن إبن عباس قال : قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَجَاءَ اللَّهُ تَعَالَى بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ لِيَغْفِرَ لَهُمْ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٢٩٨ ) في صحيح الجامع

ابن عباس دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئێوە تاوانتان نەکردایە ئەوا خوای گەورە کۆمەڵێکی دەهێنا کە تاوان بکەن هەتا لێیان خۆش بێت).

**(٤٢) (طب،البزار) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الرَّحْمَةُ عِنْدَ الله مِائَةُ جُزءٍ فَقَسَمَ بَيْنَ الخَلائِقِ جُزءاً وَأَخَّرَ تِسْعاً وَتِسْعينَ إلى يَومِ القِيامَةِ ﴾.** (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٥٤٩) في صحيح الجامع .

ابن عباس دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( رەحمەت لەلای خوا سەد بەشە، بەشێکیانی لە نێوان هەموو مەخلوقاتدا دابەش کردووە، وە نەوەدوو نۆیشی دوا خستووە بۆڕۆژی قیامەت).

**(٤٣) (البزار) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَو تَعْلَمُونَ قَدَرَ رَحْمَةِ الله لَإتَّكَلْتُمْ عَلَيْهَا ﴾.** (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٢٥٤) في صحيح الجامع .

ابوسعید دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر دەتانزانی رەحمەتی خوا تاچ رادەیەکە، ئەوا بە ئومێدی ئەو رەحمەتە پاڵتان لێ دەدایەوە ).

**(٤٤) (طب ابن عساكر)عن معاوية بن حيدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ خَلَقَ مِائَةَ رَحْمَةٍ ،فَبَثَّ بَيْنَ خَلْقِهِ رَحْمَةً واحِدَةً، فَهُمْ يَتَراحَمُونَ بِهَا، وادَّخَرَ عِنْدَهُ لِأولِيائِهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ ﴾.** (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٦٦) في صحيح الجامع.

معاویەی کوڕی حیدە دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوا سەد رەحمەتی دروست کردووە، یەك رەحمەتیانی لە نێوان دروست کراوەکانیدا بڵاوکرۆدۆتەوە، و هەموویان بەو دانەیە رەحم بە یەکتر دەکەن لە نێوان خۆیاندا، وە نەوەدو نۆ بەشیشی لە لای خۆی هەڵگرتووە بۆ دۆستەکانی ).

**(٤٥) (حم م)عن سلمان (حم ه)عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ مِائَةَ رَحْمَةٍ فَجَعَلَ فِى الأَرْضِ مِنْهَا رَحْمَةً فَبِهَا تَعْطِفُ الْوَالِدَةُ عَلَى وَلَدِهَا وَالْبَهَائِمُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ وَالطَّيْرُ وَأَخَّرَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَكْمَلَهَا اللَّهُ بِهَذِهِ الرَّحْمَةِ ﴾.** (صحيح) ينظر حديث رقم (١٧٦٧) في صحيح الجامع

سلمان و ابوسعید دەڵێن پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( ئەو رۆژەی خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، سەد رەحمەتیشی دروست کرد، یەك رەحمەتیانی لە زەویدا دانا ،ئیتر بەو تاکە رەحمەتەیە کە دایك سۆزو بەزەیی هەیە بە سەر منداڵیدا ،گیان لەبەران و باڵندەش بە سەر یەکتردا، وە نەوەد و نۆ بەشیشی دوا خستوە بۆ رۆژی قیامەت ،جا کە بوو بەڕۆژی قیامەت ،خوای گەورە بەو رەحمەتە نەوەد و نۆ بەشەکەی تر پڕدەکاتەوە و تەواوی دەکات).

**(٤٦) (إبن السني ك) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ لَيَعْجَبُ مِنَ العَبْدِ إذا قَالَ: لا إلهَ إلا أنتَ إنِّي قَدْ ظَلَمْتُ نَفسِي فَاغفِرْ لِي ذُنُوبِي إنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنتَ قَالَ: عَبْدِي عَرَفَ أنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ وَ يُعاقِب ﴾.** (صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٢١) في صحيح الجامع

علی دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە پێی خۆشە و بە ناوازە سەیری بەندە دەكات ئەگەر وتی : ( لا إلهَ إلا أنتَ إنّي قَدْ ظَلَمْتُ نَفسي فَاغفِرْ لِي ذُنُوبِي إنَّهُ لا يَغفِرُ الذُنُوبَ إلا أنتَ ) واتە: (هیچ خوایەك نییە تەنها تۆ نەبێت، بە راستی منیش ستەمم لەخۆم كردووە، لە تاوانەكانم خۆش بە، هیچ كەسێك نییە لە تاوانەكان ببورێت تەنها تۆ نەبێت). ئەویش دەفەرموێت: بەندەكەم زانی كە پەروەردگارێكی هەیە دەبورێت و سزاش دەدات).

( ٤٧ ) ( حم م ت ) عَنْ أَبِي أَيُوبَ الأَنْصَارِيّ أَنَّهُ قَالَ حِينَ حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قَدْ كُنْتُ كَتَمْتُ عَنكُمْ شَيْئاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ( ﷺ ) يَقُولُ:﴿ لَوْلاَ أَنَّكُمْ تُذْنِبُونَ لَخَلَقَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى خَلْقاً يُذْنِبُونَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ ﴾.
( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٣٠٥ ) في صحيح الجامع

ابو ایوب لەسەرەمەرگدا وتویەتی: شتێكم لێ شاردونەتەوە كە لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە، لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (ئەگەر ئێوە تاوانتان نەكردایە ،خوای گەورە خەڵكانێكی دروست دەكرد كە تاوانیان بكردایە هەتا لێیان خۆش بێت ).

## ڕونكردنەوەی فەرمودەكان :

دوای ئەم كۆمەڵە فەرمووده پیرۆزەی كە باس لە ڕەحمەتی خوا دەكەن پێویستە تیشك بخەینە سەر چەند خاڵێكی گرنگ:

١- خوای گەورە ڕەحمەتیشی هەیە و غەزەبیشی هەیە ، بەڵام ڕەحمەتەكەی زیاترە و زاڵە بەسەر غەزەب و توڕەبونیدا.

٢- ئەو تاكە بەشە ڕەحمەتەی كەلەسەد بەشەكە دایبەزاندۆتە سەر زەوی ، ڕەحمەتێكی گشتییە كافر و موسڵمان و هەموو گیانلەبەرانیش دەگرێتەوە لەسەر زەویدا، بەڵام ئەو نەوەد و نۆ بەشەی كە هەڵی گرتووە بۆ قیامەت كافر و بێ باوەڕان و ئەوانەی شەریك و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار داوە ناگرێتەوە ئەگەر پێش مردنیان لە دنیادا تۆبەی تەواویان لێ نەكرد بێت، وە تایبەتە بە موسڵمان و باوەڕ داران و دۆستانی خواوە .(إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا )١٨/النساء.

٣- خوای گەورە پێی خۆشە كە بەندەكانی تۆبە لە تاوانەكانیان بكەن و پەشیمانیی دەربڕن وداوای ڕەحمەت و لێخۆش بوون لە پەروەردگاری خۆیان بكەن . وە هەركەس بەڕاستی و لە ناخی دڵەوە لە خوا بپاڕێتەوە و بڵێت:(ئەی پەروەردگاری من : هیچ خوایەك نییە تەنها تۆ نەبێت ، من تاوانم كردوە و زوڵمم لە خۆم كردووە ، لێم خۆش بە ، كەس لە تاوان نابورێت تەنها تۆ نەبێت )ئەوا خوای گەورە بە ڕادەیەك ئەو نزاو پاڕانەوەیەی پێ خۆشە كە ئەو بەندەیەی خۆی بە بەندەیەكی ناوازە و جێی سەر سوڕمان دەزانێت و خۆی وەڵامی دەداتەوە ودەفەرموێت: ئەو بەندەیەم ئەو ڕاستییەی زانیوە كە پەروەردگارێكی هەیە دەبەخشێت و سزاش دەدات.

٤- ئەو فەرموودانەی كە باس لەوە دەكەن ئەگەر ئێمە گوناهو تاوانمان نەكردایە ئەوا خوای گەورە كۆمەڵێكی تری دروست دەكرد كەتاوان بكەن هەتا لێیان خۆش بێت، دەبێت واتێ نەگەین

کەخوای گەورە حەز دەکات بەندەکانی تاوان بکەن یان هانیان بدات بۆ تاوان کردن ،بەڵکو مەبەستی پێ ئەوەیە کە ئەگەر مرۆڤ لە سروشتی دروست کردنیاندا وەك و فریشتەکان وا بونایە کەهەرگیز تاوان و بێ فەرمانی خوا ناکەن ،ئەواخوای کار بەجێ کۆمەڵێ مەخلوقی تری دروست دەکرد کە لە سروشتیاندا مەیلەی تاوان و خراپە کارییان تیابێت پاشان بە هەمان شێوە فەرمانی پێ دەکردن کە خۆیان لەو تاوان و خراپە کاریانە بپارێزن، وە رێگەی تۆبە کردنیشی پێ دەناساندن هەتا لێیان خۆش بێت و ببورێت بۆ ئەوەی بە بەندەکانی خۆی بسەلمێنێت کەخوای گەورە لێبوردەیە و خاوەنی رەحمەتە، وە هەتا زیاتر لەماناى ناوە پیرۆزەکانی خوا تێبگەین ( الغفور ،الرحيم ،العفو، غافر الذنب ،قابل التوب... ) بۆیە هەموو نەوەی ئادەم گرفتاری تاوان و گوناه دەبێت ، بەڵام گرنگ لەوەدایە کەتۆبەی لێ بکات و پەشیمان بێتەوە و داوای لێبوردن لە خوا بکات ، هەروەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الخَطَّائِينَ التَّوابونَ).

## ( ١٦ ) ( خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە )

( ٤٨ ) ( خ في خلق أفعال العباد ك هق في الأسماء )عن حذيفة قال: قال رسول الله(ﷺ):

﴿ إنَّ اللهَ تَعَالَى صانِعُ كُلِّ صانِعٍ وَ صَنْعَتِهِ ﴾ ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٧٧٧ ) في صحيح الجامع

حذيفة دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دروستکار و بەدیهێنەری هەموو دروست کەرێك و دروست کراوەکەشیەتی).

## ( ١٧ ) ( حیکمەت لە دروست کردنی شەیتان )

( ٤٩ ) ( حل )عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ لَو شَاءَ أَنْ لاَ يُعْصَى مَا خَلَقَ إبْلِيسَ ﴾ ( حسن ) ينظر حديث رقم ( ١٨١٢ ) في صحيح الجامع

ابن عمر دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوا بیویستایە سەر پێچی لە فەرمانی نەکرێت ، ئەوا شەیتانی دروست نەدەکرد).

## ( ١٨ ) ( خوای گەورە چاکە کارە )

( ٥٠ ) ( عد )عن سمرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعَالَى مُحْسِنٌ فَأَحْسِنُوا ﴾ ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٨٢٣ ) في صحيح الجامع

سمرە دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە چاکەکارە ، ئێوەیش چاکە بکەن) .

تێبێنی/چاکە کردن لەم فەرمودەیەدا مەبەست پێی یارمەتی دانی خەڵك و چاکە کردنە لە گەڵیاندا.

## ( ١٩ ) ( خوا خۆی دادوەرە )

( ٥١ ) ( د ن ك حب ) عَنْ هَانِئِ بنُ يَزِيد: أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّه( ﷺ ) مَعَ قَوْمِه سَمِعَهُمْ يَكْنُونَهُ بِأَبِي الْحَكَمِ، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّه( ﷺ ) فَقَالَ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ ؟ ﴾ ، فَقَالَ: إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ، فَرَضِيَ كِلاَ الْفَرِيقَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه( ﷺ ): ﴿ مَا أَحْسَنَ هَذَا فَمَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ؟ ﴾ . قَالَ: لِي شُرَيْحٌ وَمُسْلِمٌ وَعَبْدُ اللَّه، قَالَ: ﴿ فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ ؟ ﴾ . قُلْتُ: شُرَيْحٌ، قَالَ: ﴿ فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٨٤٥ ) في صحيح الجامع

هانی کوڕی یزید دەڵێ: کاتێك كە لە گەڵ عەشرەتەکەیدا بەوەفد هاتونەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، گوێی لێیان دەبێت کە بە (ابو الحكم) واتە (باوکی دادوەر)بانگی دەکەن ، پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی دەکات و دەفەرموێت: خوا خۆی دادوەرە و حوکمیش هەر بۆ ئەوە ،ئەوە بۆچی بە (ابا الحكم) بانگت دەکەن ؟ ئەویش وتی: لەبەر ئەوەی کە عەشرەتەکەم هەر کاتێك ناکۆکییان ببوایە لە سەر شتێك دەهاتنە لای من کە دادوەرییان لەنێواندا بکەم، منیش دادوەرییەکەم بۆ دەکردن ،ئیتر هەر دوو لایەنەکە ڕازی دەبوون. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئای کارێکی چەند باشت کردووە ،ئەی باشە چەند کوڕت هەیە ؟وتی: (شريح )م هەیەو (مسلم )و (عبدالله ).فەرمووی: کامیان گەورەکەیانە؟ وتم:(شريح ).فەرمووی: کەواتە تۆ (باوکی شريح)یت .

تێبینی/کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) نازناوی کابراکەی گۆڕی لە باوکی (دادوەر)ەوە بۆ باوکی(شريح)چونکە دادوەر (الحَكَم )ناوی خوایە جوان نییە بوترێت (باوکی دادوەر).

## ( ٢٠ ) ( رزق و رۆزی تەنها بە دەستی خوایە )

( ٥٢ ) ( حم د ت هـ حب هت ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: غَلاَ السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّه( ﷺ ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه( ﷺ ) لو سَعَّرْتَ فقال :﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْخَالِقُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ الْمُسَعِّرُ ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللَّهَ وَلاَ يَطْلُبُنِي أَحَدٌ بِمَظْلَمَةٍ ظَلَمْتُهَا إِيَّاهُ فِي دَمٍ وَلاَ مَالٍ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ١٨٤٦ ) في صحيح الجامع

انس ی کوڕی مالك دەڵێ: ( گرانیەك لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ڕویدا، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بکرایە نرخت لەسەر کالاَ و شت وەك بۆ دابنایانیە ،ئەویش فەرمووی:(خوای گەورە خۆی خوڵقێنەرو ڕۆزی دەرو نرخ دانەرە، دەیگرێتەوە و فراوانی دەکات، وە من ئومێدەوارم کە بە خوای خۆم بگەم و کەسێکتان نەبێت کەداوای مافێکم لێ بکات لە خوێن و لە ماڵ، کەمن ستەمێکم تیایدا لێکردبێت ) .

## ڕونکردنەوەی فەرمودەکە :

پێغەمبەر(ﷺ) لەم فەرمودەیەدا پێمان دەڵێ کەڕزق و ڕۆزی تەنها بە دەست خوایە ئەگەر ویستی فراوانی دەکات، وئەگەر ویستیشی دەیگرێتەوە و کەمی دەکاتەوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە نرخی کاڵاو شت و مەك بەرز بێت یان نزم بێت کەواتە خوای گەورە خۆی نرخ دانەرە و مەسەلەکە بە دەست مرۆڤ نییە، وەلە فەرمودەکەشەوە هەست بەوە دەکرێت کە پێغەمبەر(ﷺ) هاندەری بازاڕی ئازادە (السوق الحر) نەك بەزۆر چەسپاندنی نرخ لەسەر کاڵاو شت و مەك .وەفەرمودەکە وا دەگەیەنێت کەبە زۆر چەسپاندنی نرخ حەرامە و بە ستەمی لە قەڵەم داوە ،وە هەردوو ئیمامی (مالك)و(شافعی)یش بە حەرامیان لە قەڵەم داوە بەڵام (ابن العربی المالکی ) پێی وایە کە جائیزە نرخ لە سەر کاڵاو شتومەك پچەسپێنرێت لە کاتێکدا کە بارودۆخەکە زۆر نالەبار بێت و کەسانێکی نەفس نزمیش بیانەوێت بە چاو چنۆکی خۆیان بارو دۆخەکە بقۆزنەوە وشت لەسەر خەڵك گران بکەن و ماڵی خەڵك بە ناحەق بخۆن، ئەو کاتە نرخ چەسپاندن جائیزە بە مەرجێك بە شێوازێك بێت کە ستەمی تێدا لە کەس نەکرێت .

## ( ٢١ ) ( خوای گەورە بێزار نابێت )

(٥٣) (البزار) عن أبي هريرة قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ لا يَمَلُّ حَتى تَمَلّوا﴾. (صحيح)
ينظر حديث رقم (١٨٥٩) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوا بێزار نابێت هەتا خۆتان بێزار دەبن).

تێبینی/ مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە خوای گەورە بێزار نابێت لەوەی داوای لێبکەن و لێی بپاڕێنەوە و عیبادەتی زۆری بۆ بکەن، مەگەر خۆتان بێزار و بێ تاقەت بن .

## ( ٢٢ ) ( خوای گەورە ناخەوێت )

(٥٤) (م هـ) عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ إنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَنَامُ ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ ، حِجَابُهُ النُّورُ ، لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ ﴾. (صحيح)
ينظر حديث رقم (١٨٦٠) في صحيح الجامع

ابو موسی دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوا ناخەوێت و بۆ ئەو نابێت و شیاو نییە کە بخەوێت، تەرازوی عەدل نزم دەکات و بەرزی دەکاتەوە، کاری شەو بۆلای ئەو بەرز دەکرێتەوە لە پێش کاری ڕۆژدا، وە کاری ڕۆژیش لە پێش کاری شەودا، پەردەی ئەو نورە، ئەگەر لای بەرێت ئەوا پیرۆزیی و گەورەیی ڕووی هەموو دروست کراوەکانی خۆی دەسوتێنێت کە چاوی دەیگاتێ ).

## ( ٢٣ ) ( یەکێکی تر لە سیفاتەکانی خوای گەورە )

(٥٥) ( حم م ) عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ(ﷺ) قال: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٧١) في صحيح الجامع

ابو موسی دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە بەشەو دەستی رادەخات بۆ ئەوەی گوناهکاری ڕۆژ تۆبە بکات ، هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت).

تێبینی/ واتە هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵدێت و دەرگای تۆبە بەیەکجاری دادەخرێت، بەردەوام بەشەو و بەڕۆژ خوای بەخشندە دەرگای تۆبە و پەشیمانی بۆ بەندەکانی خۆی والآ کردووە کە تۆبە بکەن و پەشیمان ببنەوە و دەست لە تاوان هەڵگرن بۆ ئەوەی لێیان خۆش بێت و قەڵەمی لێبوردن بەسەر تاوانەکانیاندا بهێنێت.

## ( ٢٤ ) ( ڕوخسەتی خوای گەورە بۆ بەندەکانی )

(٥٦) ( حم هق ) عن ابن عمر ( طب ) عن ابن عباس وعن ابن مسعود قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ ﴾(صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٨٥) في صحيح الجامع

ابن عمر و ابن عباس و ابن مسعود دەڵێن کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە پێی خۆشە کەئەو روخسەت وئاسانکاریانەی رێگەی پێداوە، وەربگیرێن و کاریان پێبکرێت هەروەك چۆن پێی خۆشە کەکار بەو فەرزانەی کە واجبی کردوون بکرێت).

(٥٧) ( حم حب هب ) عن ابن عمر قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) : ﴿ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٨٦) في صحيح الجامع

ابن عمر دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە پێی خۆشە کەئەو روخسەت وئاسانکاریانەی کە رێگەی پێداوە وەربگیرێن و کاریان پێ بکرێت ،هەروەك چۆن پێی ناخۆشە کەتاوان و بێ فەرمانی خوا ئەنجام بدرێت).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان :

(ڕوخسەتی خوا) مەبەست پێی ئەو رێگە پێدان و ئاسانکاریانەیە کە لە شەرعدا خوای گەورە بە بەندەکانی خۆی بەخشیوە، هەتا باری سەرشانیان سوك بێت و دوچاری زەحمەت و هیلاکی نەبن، وەك کورت کردنەوەی نوێژ لە کاتی سەفەردا یان (تیەمم)کردن لە کاتی بێئاویدا، یان نەگرتنی ڕۆژوی فەرز لە کاتی نەخۆشی و سەفەردا و دواخستنی بۆ کاتێکی تر و.......هتد.

وە فەرمودەکان ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە کە خوای گەورە ئەوەی پێخۆشە کە بەندەکانی ، ئەو روخسەت و ئاسانکاریانە وەربگرن و کاریان پێ بکەن ، نەك وەك و هەندێ کەس کەبە هەڵە تێ

گەیشتووە وا دەزانێت کە گرتنی لایەنە توندەکە و کارنەکردن بە روخسەتەکان لای خوا پەسەندترە ،بەمەش خۆیان دووچاری هیلاکی و زەحمەت دەکەن و هەندێ جاریش بەو هۆیەوە توشی تاوان و گوناه دەبن، بۆ نمونە جاری وا هەیە موسافیرێك ئامادە نییە لە کاتی سەفەرەکەیدا نوێژەکەی (قصر) یان (جمع) بکات و دەڵێ هەریەکەیان وەکو خۆیو لە کاتی خۆیدا دەکەم ئەوە باشترە و خێرترە ، دواتریش لە سەفەرەکەدا بوار نابێت کە جارێکی ترلابدات و نوێژەکەی لە کاتی خۆیدا بکات بەمەش نوێژە فەرزەکەی دەچێت و لە جیاتی ئەوەی خێر دەست خۆی بخات توشی تاوان و گوناهیش دەبێت.،بۆیە خوای گەورە چەندەی پێ خۆشە کە بێ فەرمانی ئەو نەکەین و فەرزەکانی بەجێ بگەیەنین، هێندەشی پێی خۆشە کە روخسەتەکانی وەر بگرین و کاریان پێبکەن .

## ( ٢٥ ) ( خوای گەورە -غیرة- ی هەیە )

(٥٨) (حم ق ت )عن أَبوهُرَيْرَةَ قال: أَنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) قَالَ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَغَارُ وَإِنَّ الْمُؤْمِنَ يَغَارُ وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ عَلَيْهِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٥٩) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە غیرە دەکات و باوەڕداریش غیرە دەکات ، وە غیرەکردنی خوای گەورە لەوەدایە کەمرۆڤی باوەڕدار کارێك بکات کە خوا لە سەری حەرام کردبێت).

(٥٩) (حم د ن حب) عَنْ جَابِرِ بن عَتِيك قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ إِنَّ مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمِنَ الْخُيَلاَءِ مَا يُحِبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِى يُحِبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَالْغَيْرَةُ فِى الرِّيبَةِ وَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِى يُبْغِضُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَالْغَيْرَةُ فِى غَيْرِ رِيبَةٍ وَالاِخْتِيَالُ الَّذِى يُحِبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ اخْتِيَالُ الرَّجُلِ بِنَفْسِهِ عِنْدَ الْقِتَالِ وَعِنْدَ الصَّدَقَةِ وَالاِخْتِيَالُ الَّذِى يُبْغِضُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْخُيَلاَءُ فِى الْبَاطِلِ﴾(حسن) ينظر حديث رقم (٢٢٢١) في صحيح الجامع

جابری کوڕی عتیك دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: غیرە جۆری وای هەیە کە خوای گەورە پێی خۆشە و جۆریشی هەیە کەخوای گەورە پێی ناخۆشە و رقی لێیەتی ، وە خۆهەڵکیشانیش جۆری وای هەیە کەخوای گەورە پێی خۆشە وە جۆریشی هەیە کە خوای گەورە پێی ناخۆشە ، جا ئەو غیرەیەی کە خوای گەورە پێی خۆشە غیرە کردنە لەو شتانەی کە دەبنە جێی گومان و دو دڵی، بەڵام ئەو غیرەیەی کە خوا پێی ناخۆشە ورقی لێیەتی غیرە کردنە بە بێ بوونی هیچ هۆکارێکی گومان و دودڵی، وە ئەو خۆهەڵکیشانەی کە خوای گەورە پێی خۆشە ئەوەیە کە پیاو لە کاتی شەڕو روبەڕو بونەوەدا خۆی هەڵکێشێت وە لە کاتی خێر کردن و بەخششدا ،وە ئەو خۆ هەڵکێشانەشی کەخوای گەورە پێی ناخۆشە و رقی لێیەتی خۆ هەڵکیشانی پیاوە لە دەست درێژی و فەخرکردندا .

(٦٠) (هم ق )عن أسماء بنت أبي بكرقالت: ﴿ لاشَيءَ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ تَعالَى ﴾. (حسن) ينظر حديث رقم (٧٤٨٩) في صحيح الجامع

اسمائی کچی ابوبکر دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: هیچ شتێك هێندەی خوا ی گەورە غیرەی نییە.

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

١- ووشەی (غیرە) لە زمانی کوردیدا بە مانای (لێ زۆم بوون و ڕەشك لێکردن) دێت ،هەر وەك لە فەرهەنگی (شیرین)دا هاتووە، بەڵام من هەر وشەی (غیرە)م وەك خۆی بەکار هێنایەوە، چونکە لە ناو خەڵکیدا هەر زیاتر وشەی (غیرە) عەرەبیەکەی بەکار دەهێنن.

٢- خوای گەورە (غیرە)ی هەیە بەڵکو هیچ کەسێك هێندەی خوا غیرەی نییە، بەڵام غیرەی خوا غیرەیەکە کە تایبەتە بە خۆیەوە و لە غەیرەی مرۆڤ ناچێت ،وە (غیرە)کەشی لە کاتێکدا یە کە ئەو سنورەی کە دایناوە بۆ کارە حەرام و قەدەغە کراوەکان لە لایەن مرۆڤەوە بە تایبەت مرۆڤی بڕوادارەوە ببەزێنرێت. بۆیە ئەگەر (غیرە)کە بەرامبەر کاری خراپ و گوماناوی بێت ئەوا خوای گەورە پێی خۆشە ، بەڵام ئەگەر (غیرە)کە لەسەر شتێك بێت کە حەرام نەبێت و ڕێگە پێدراوبێت ئەوا (غیرە)کە لە جێی خۆیدا نییە و دەبێت بە دڵ پیسی خوای گەورەش پێی ناخۆش دەبێت و رقی لێی دەبێتەوە. بەواتایەکی تر خوای گەورە دەیەوێت کە ئێمە لە بەرامبەر کاری حەرام و نابەجێ دڵگوشراو و نیگەران ببین نەك لە بەرامبەر کاری شیا و ڕێگە پێ دراودا.

٣- خوای گەورە رقی لە خۆ هەڵکێشان و خۆ فش کردنەوەیە، بەڵام لە کاتی شەڕ و ڕوو بەڕوونەوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا ڕێگەی پێ داوە و بەڵکو پێشی خۆشە چونکە هۆیەکە بۆ ترساندنی کافران و روخاندنی وورەیان.

## ( ٢٦ ) ( خۆ هەڵقورتان لە کاری خوا )

(٦١)(م) عَنْ جُنْدَبِ البِجْلِي أَنَّ رَسُولَ اللَّه(ﷺ) قال: ﴿ أَنَّ رَجُلاً قَالَ وَاللَّه لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلاَنٍ ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنْ لاَ أَغْفِرَ لِفُلاَنٍ فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٠٧٥) في صحيح الجامع

جندب البجلی دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( پیاوێك وتی: سوێند بێت بە خوا ، خوا لە فلاّن کەس خۆش نابێت، خوای گەورەش فەرمووی: ئەو کەسە کێیە وا خوایەتی بەسەر منەوە دەکات کە من لە فلاّن کەس خۆش نابم ؟دەی ئەوا من لەو فلاّن کەسە خۆش بووم و هەموو خێر و چاکەکەی تۆشم بەتاڵ کردەوە ).

(٦٢)(طب) عَنْ جُنْدَبِ البِجْلِي أَنَّ رَسُولَ اللَّه(ﷺ) قال:﴿ قَالَ رَجُلٌ: لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلاَنٍ ! فَأَوْحَى اللَّهُ تَعَالَى الى نَبِيَّ مِنَ الأنبِياء: إنَّها خَطِيئَةٌ فَلِيَسْتَقْبِلِ العَمَلَ ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣٤٥) في صحيح الجامع

جندب البجلی دەڵیٚ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( پیاوێك وتی: خوا لە فلأن كەس خۆش نابێت ! خوای گەورەش وەحی نارد بۆ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەكان كە بەو پیاوە بڵێت: بە ووتنی ئەو قسەیە تاوانی كردووە باسەرلە نوێ كار و عیبادەتی دەست پیٚ بكاتەوە ).

## ڕوونكردنەوەی فەرموودەكان:

ئەم دوو فەرموودە پیرۆزە ئەوەمان پیٚ رادەگەیەنن كە بە هیچ جۆرێك جائیز نییە كەسێك لە خۆیەوە سوێند بخوات كە گوایا فلأن كەس بە هەشتییە یان جەهەنەمییە، یان خوای گەورە لە فلأن خۆش دەبێت و لە فلأن خۆش نابێت، چونكە ئەوە خوا پەنامان بدات وەك ئەوە وایە كە خوایەتی بكرێت بەسەر خواوە، وە دەست تێوەردانە لە كاری خواو دەبێتە هۆی بەتاڵبونەوەی كردەوە چاكەكان.

## ( ٢٧ ) ( خوای گەورە بیٚ ئەنداز دەوڵەمەندە )

(٦٣) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَمِينُ اللَّهِ مَلأَى لاَ يَغِيضُهَا شَيْءٌ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ، وَبِيَدِهِ الأُخْرَى الْمِيزَانُ، يَرْفَعُ الْقِسْطَ وَ يَخْفِضُ، قَالَ: أَرَأَيْتَ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْقُصْ مِمَّا فِي يَدَيْهِ شَيْئاً ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٢٧٧ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵیٚ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( دەستەڕاستی خوا پڕە، بە هیچ شتێك لیٚی كەم نابێتەوە، بەشەو وبەڕۆژ لیٚی دەڕژێت، وە ترازوو و پێوانەش بە دەستەكەی تریەوەیەتی، كێشانەی عەدل بەرز دەكاتەوە و نزمی دەكاتەوە ، ئینجا فەرمووی: ئایا دەزانیت كە لەو كاتەوەی خوا ئاسمانەكان و زەوی دروست كرووە چەندەی سەرف كردوە و بەخشیوە؟ ئەوە هیچ شتێكی كەم نەكردۆتەوە لەوەی كەلە هەردوو دەستیدایە).

## ( ٢٨ ) ( خوا بەخشش مەندە )

(٦٤) ( طب ) عَنْ مُعَاوِيَةَ بن أَبِي سُفْيَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ(ﷺ): ﴿ إِنَّمَا أَنَا مُبَلِّغٌ وَاللَّهُ يَهْدِي، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللَّهُ يُعْطِي ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٣٤٤ ) في صحيح الجامع

معاویە دەڵیٚ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (من تەنها راگەیەنەرم و خوای گەورە خۆی هیدایەتدەرو و ڕێنومایی كارە، وە من تەنها دابەش كردنم لەسەرە و خوا خۆی بەخشش مەندە و ڕۆزی دەدات ).

## ( ٢٩ ) ( بير كردنەوە لە نيعمەتەكانى خواى گەورە )

(٦٥) ( أبوالشيخ طس عد هب ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَفَكَّرُوا فِي آلاءِ اللهِ وَ لا تَفَكَّرُوا في اللهِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٩٧٣ ) في صحيح الجامع

ابن عمر دەڵێ پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: ( بير لە نيعمەت و بەخششەكانى خوا بكەنەوە، و بير لە خوا خۆى مەكەنەوە ).

(٦٦) ( حل ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَفَكَّرُوا فِي خَلْقِ اللهِ وَلا تَفَكَّرُوا فِي اللهِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٩٧٣ ) في صحيح الجامع

ابن عباس دەڵێ پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: ( بير لە دروست كراوەكانى خوا بكەنەوە و بير لە خوا خۆى مەكەنەوە ).

**تێبينى:** مرۆڤ هەتا زياتر لە دروست كراوەكانى خوا وورد ببێتەوە و بيريان لێ بكاتەوە، زياتر گەورەيى و دەسەلاّت و حيكمەت و زانايەتى خواى بۆ دەردەكەوێت و باشتر خواى خۆى دەناسێت، بەلاّم بيركرنەوە لە زاتى خوا مرۆڤ توشى سەر لێشواوى دەكات و دەرگاى هەزار و يەك پرسيارى لێ دەكاتەوە كە هەرگيز بەوەلاّمەكانيان ناگات، چونكە مێشكى مرۆڤ لە دنيادا تواناى تێگەيشتن و لێكدانەوەى ياسا ماديیەكان و دروست كراوەكانى خواى هەيە، بەلاّم هەرگيز تواناى تێگەيشتن لە زاتى خواى نييە و ئەو هێز و دەستەلاّتەى پێ نەبەخشراوە كە بگاتە ئەو رادەيە لە تێگەيشتن، هەروەك چۆن -دوور لە شوبهاندن- مرۆڤ دەتوانێت بەهۆى رووناكى و تيشكى خۆرەوە بە چاوەكانى خۆى جوانى بونەوەر ببينێت، بەلاّم ئەگەر ويستى بەو چاوانە سەيرى خۆرەكە خۆى بكات ئەوا ئەگەر زوو چاوى وەرنەگێرێت توشى كوێرى دەبێت.

## ( ٣٠ ) ( ئەوانەى لە قيامەتدا خواى گەورە لێيان زويرە )

(٦٧) ( طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَةٌ لا يَقْبَلُ اللهُ مِنْهُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفَاً وَلا عَدْلاً، عَاقٌ وَ مَنَّان وَ مُكَذِّبٌ بِالقَدَرِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٠٦٤ ) في صحيح الجامع

ابى امامە دەڵێ پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى : ( سێ جۆر كەس خواى گەورە رۆژى قيامەت نەسوننەت و نە فەرزيان لێ قبوڵ ناكات: ئازار دەرى دايك وباوك، ومنەت كار ،وئەوەى قەدەرى پێ درۆيە

**تێبينى:** ووشەى (صرف) دەتوانين بڵێين مەبەست پێى هەموو كارێكى خێر و سوونەتە جگە لە نەزرەكان يان مەبەست پێى تۆبەكردنە يان هەر كارێكى چاكەيە كە بتوانێت لە رۆژى قيامەتدا خۆى پێ لە عەزاب قوتار بكات. ووشەى (عدل)يش مەبەست پێى ئەو كارە فەرزانەيە كە خواى گەورە لەسەر مرۆڤى واجب كردووە. وە مەبەستى فەرموودەكە ئەوەيە كە هەر كەسێك يەكێك لەو سێ تاوانەى هەبێت

و لەپێش مردندا تۆبەی لێ نەکردبێت لە رۆژی قیامەت هیچ جۆرێ لە کارە چاکەکانی سوودی پێ ناگەیەنێت.

## ( ٣١ ) ( پێنج شت هەن خوای گەورە نەبێت کەس نایزانێت )

(٦٨) ( حم الروياني ) عن بريدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَمْسٌ لايَعْلَمُهُنَّ إلا الله: " إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ" ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٥٥) في صحيح الجامع

بريده دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : ( پێنج شت هەن خوا نەبێت کەس نایانزانێت: (خوای گەورە زانیاری هەستانی قیامەتی لەلایە، وە لێزمە باران دەبارێنێت، وە دەزانێت کەچی لە رەحمی ئافرتاندایە، وە هیچ نەفسێك نازانێت کەسبەینێ چی دەست دەخات و چی بەسەر دێت، وە هیچ نەفسێکیش نازانێت کە لە چی خاك و زەوی یەکدا دەمرێت، خوای گەورە هەر خۆی زاناو خەبەردارە ).

(٦٩) ( حم خ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ تَعَالَى: لاَ يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ تَعَالَى وَلاَ يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي الأَرْحَامِ إِلاَّ اللَّهُ تَعَالَى، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ اللَّهُ تَعَالَى، وَلاَ تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِلاَّ اللَّهُ تَعَالَى، وَلا يَدْرِي أَحَدٌ مَتَى يَجِيءُ الْمَطَرُ إِلاَّ اللَّهُ تَعَالَى ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٨٨٤) في صحيح الجامع

ابن عمر دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : ( کلیلەکانی غەیب پێنجن خوای گەورە نەبێت کەس نایانزانێت، کەس نازانێت لە سبەینێدا چی روودەدات تەنها خوای گەورە نەبێت، وە کەسیش نازانێت کە رەحمی ئافرەتان چی تێدا دەبێت تەنها خوای گەورە نەبێت، وە کەسیش نازانێت کەی قیامەت هەڵدەستێت تەنها خوای گەورە نەبێت، وە هیچ نەفسێکیش نازانێت لە چ خاك و زەوییەکدا دەمرێت تەنها خوای گەورە نەبێت، وە کەسیش نازانێت کەی باران دێت تەنها خوای گەورە نەبێت ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

ئەو پێنج شتەی کە خوای گەورە نەبێت کەس نایانزانێت کە لەو دوو فەرموودە پیرۆزەدا باسیان لێوە کراوە هەمان ئەو پێنج شتەن کە لە ئایەتی (٣٤)ی کۆتایی سورەتی لوقماندا هاتوون، بەڵکو فەرمودەکەی یەکەمیان هەر دەقی ئایەتەکەی نەقڵ کردووە، وە ئەو پێنج شتە لە خەزنەی غەیبی خوادان و کلیلی قفڵەکانیشیان تەنهالای خوای گەورە خۆیەتی، وە مەبەستیش لەوەی کەکەس نایانزانێت تەنها خوا نەبێت ئەوەیە کە وردەکاری ئەو پێنج شتە خوا نەبێت کەس نایانزانێت:

یەکەم/ کاتی هەستانی قیامەت تایبەتە بە خواوە و ئەو نەبێت کەس نایزانێت، هەرچەندە لە فەرمودە پیرۆزەکاندا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چەندین نیشانەی بۆ باس کردووین کە هەتا ئەوانە روو نەدەن و نەیەنە دی قیامەت هەڵناسێت کە ئێمە دەتوانین بزانین لە رێی ئەو نیشانانەوە قیامەت هەتا

چەند لێمان نزیك بوەتەوە، بەلاّم دەست نیشان کردنی کاتی هەستانەکەی تەنها خوا نەبێت کەس نایزانێت.

**دووەم/** باران بارین، ئێمە لەڕێگەی مانگی دەستکرد و دەست نیشان کردنی ڕێڕەوی با و پلەی گەرماوە دەتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە پەڵە هەورەکان روو دەکەنە کویٚ و باران بارین لە کویٚ وە نزیکە، بەلاّم ئەمە تەنها وەك و ئەوە وایە کە زەلامێك چوبێتە سەر دارێکی بەرز و بڕوانێتە ڕێی کاروانچیان بەمەش دەتوانێت کە بەچەند ساتێك لە پێش ئەوانەی کە لە خوارەوەن و لەسەر دارەکەنین هەواڵی گەیشتی کاروانەکە بزانێت و رای بگەیەنێت، دەنا دروست کردنی ئەو ئاوەی کە دەبێت بە هەڵم و کۆبوونەوەی هەڵمەکان هەتا دەبن بە پەڵە هەورو دروست کردنی ئەو بایەی کە ئەو پەڵە هەورانە دەگوازێتە و سەر لەنویٚ کردنەوەی ئەو پەڵە هەورانە بەباران و دابەشکردنی بەسەر زەویدا بەڕادەی دیاریکراو ... هتد) ئەمانە خوای گەورە نەبێت کەس نایانزانێت.

**سێیەم/** تەنها خوای گەورە دەزانێت چی لەڕەحمی ئافرەتاندا هەیە، ئەمەش لەوانەیە هەندێك کەس پرسیار بکات و بڵێت: ئەی ئێستا ئەوەنیە لە ڕێگەی سۆنەر و ئامێری پزیشکی یەوە دەتوانرێت بزانرێت ئەو منداڵەی کەلە سکی ئافرەتدایە کوڕە یان کچە! بەڵیٚ راستە ئەمڕۆ دەتوانرێت بە هۆی ئەو ئامێرانەوە لە دوای چەند مانگێك بزانرێت کە ئایا منداڵەکە کوڕە یان کچە، بەلاّم خوای گەورە تەنها مەبەستی پیٚ رەگەزی منداڵەکە نیە، بەڵکو خوای گەورە لە پێش دروست بوونی منداڵەکەشدا دەزانێت کە ئەو منداڵەی بەویستی ئەو دروست دەبێت کوڕ دەبێت یان کچ دەبێت، خوای گەورە دەزانێت ئەو منداڵانەی کەلە رەحمی ئافرەتاندایە کەی دروست دەبن وە چۆن دروست دەبن، تاکە یان دوانە و سیانە و زیاتر دەبن، شێوەو روخسارییان چۆن دەبێت، ساغ و تەواو دەبن یان سەقەت و کەم ئەندام دەبن، هەر لە رەحمی دایکیاندا کە خوای گەورە دەزانێت تەمەنیان لە ژیاندا چەند دەبێت، رزق و رۆزییان چەند و چۆن دەبێت، مرۆڤی چاك و بڕواداریان لیٚ دەر دەچێت یان خراپ و بیٚ باوەڕ دەبن، ئەمانە و بە ملیۆنەها زانستی تری لەو بابەتانە سەبارەت بەو منداڵەی کەلە رەحمی دایکیدایە تەنها خوای گەورە خۆی دەیزانێت و کەسی تر دەرك بەو هەموو زانیاریانە ناکات.

**چوارەم/** تەنها خوای گەورە دەزانێت کە هەر یەك لە بەندەکانی خۆی لەسبەینێدا چی دەست دەخات و چی بەسەر دێت و رووداوو بەسەر هاتی رۆژی داهاتووی چی دەبێت وە هیچ کەسێك لە توانای دا نی یە کە ئەو زانیارییانە لە ئەمڕۆدا دەست بخات و ئاشکرای بکات.

**پێنجەم/** هیچ کەسێکیش نازانێت لە چ خاك و زەوییەکدا دەمرێت و کۆتایی یەکەی لە کویٚ دا دەبێت و کویٚی دەبێت بە نسیب، زانینی ئەوە تایبەتە بە خواوە و هیچ کەس نایزانێت.

## ( ٣٢ ) ( خوا سەروەر و گەورەی هەمووانە )

**(٧٠)** **(حم د)** عن عبد الله بن الشخير قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **السيّدُ الله** ﴾.(صحيح) ينظر حديث رقم (٣٧٠٠) في صحيح الجامع

لە عبدالله ی کوڕی شەخیرەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( سەروەر و گەورە هەر خوایە ).

## ڕوونکردنەوەی فەرمودەکە :

هۆی ووتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو فەرمودەیە ئەوە بوو کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی ووت: تۆ گەورە و سەرداری قوڕەیشیت. ئەویش فەرمووی: (گەورە هەر خوایە). کابراش وتی: تۆ لە هەموویان دەستەڵاتت گەورەترە و قسەشت لەسەروو قسەی هەموو قوڕەیشەوەیە. پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی: ئەی خەڵکینە پێشتر چیتان ووتوە هەروا بڵێن و شەیتان فریوتان نەدات، من بەندەی خوا و نێردراوی خوام.

ووشەی (سید) لە زمانی عەرەبیدا بە سەرۆك و گەورە دەوترێت وە ئەو ووشەیە لە قورئان و لە فەرمودەشدا بۆ غەیری خوا بەکار هاتووە، ئەوەتا خوای گەورە لە ستایشی (یحیی) پێغەمبەردا دەفەرمووێت﴿ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا ﴾ وە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەربارەی خۆی لەڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت ( انا سَيِّدُ وِلْدِ آدَمَ يَومَ القِيامَةِ وَلافَخْرُ ) واتە من سەردار و گەورەی هەموو نەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا و فەخریش ناکەم. بەڵام دیارە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی ناخۆش بووە کە لە دونیادا هاوەڵەکانی بە (سَيِّد) بانگی بکەن بەڵکو گەورەیی و ڕێزی زیاتری لەوەدا بینیوە کە بەبەندەی خوا و پێغەمبەری خوا بانگ بکرێت. وە هەروەك و (ئیمامی النووی) دەفەرموێت کە نەهی کردن لە بەکارهێنانی ووشەی (سَيِّد) لە کاتێکدایە کە بۆ مەبەستی زل کردن و پیشاندانی گەورەیی بێت، بەڵام ئەگەر تەنها بۆ ناساندن و پێناسەکردنی کەسێك بێت کەسەرۆك و لێپرسراوی کۆمەڵێکە ئەوا جائیزە و ڕێگەی پێ دراوە.

## ( ٣٣ ) ( کەسێك بیەوێت ململانێی خوای گەورە بکات لە سیفاتەکانیدا )

**(٧١)** (طس) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ اللهَ تَعَالى يَقُولُ: إنّ العِزّ إزارِي وَ الكِبْرِياءُ رِدائِي فَمَنْ نازَعَني فِيهِما عَذّبْتُهُ ﴾.(صحيح) ينظر حديث رقم (١٩٠٨) في صحيح الجامع

علی دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت:شکۆمەندی پۆشاکی منە و خۆبە زل گرتنیش عەبا و بەرگی منە ،جا هەر کەسێك ململانێی من بکات تیایاندا ئەشکەنجەی دەدەم).

**(٧٢)** (ك) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قالَ اللهُ تَعالَى: الكِبْرِياءُ رِدائِي فَمَنْ نازَعَني فِي رِدائِي قَصَمْتُهُ ﴾. (حسن) ينظر حديث رقم (٤٣٠٩) في صحيح الجامع

ابو هریرە دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوایگەورە دەفەرموێت: خۆ بەزل گرتن عەبا و بەرگی منە، جا هەرکەسێك ململانێی من بکات لە سەری ئەوا دەیشکێنم و دەیفەوتێنم).

(٧٣) (حم د هـ ) عن أبي هريرة (هـ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللّهُ تَعالَى: الكِبْرِياءُ رِدائِي والعَظَمَةُ إزارِي فَمَنْ نازَعَنِي واحِدًا مِنْهُما قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣١١) في صحيح الجامع

ابوهريره و إبن عباس دەڵێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (خوای گەورە فەرموویەتی: خۆ بەزل گرتن عەبا و بەرگی منە و گەورەییش پۆشاکی منە ،جا هەرکەسێك ململانێی من بکات لە سەریان فرێی دەدەمە ناو ئاگرەوە).

(٧٤) (سمويه) عن أبي سعيد و أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللّهُ تَعالَى: الكِبْرِياءُ رِدائِي و العِزُّ إزارِي فَمَنْ نازَعَنِي فِي شَيءٍ مِنْهُما عَذَّبْتُهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣١٠) في صحيح الجامع

ابو سعيد و ابو هريره دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی:(خوای گەورە فەرموویەتی: خۆ بەزل گرتن عەبا و بەرگی منە، گەورەییش پۆشاکی منە، جا هەر کەسێك ململانێی من بکات لە شتێك لەودوانەدا، ئەوا ئەشکەنجەی دەدەم)

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان:

ئەو فەرمودە پیرۆزانە ئەوە دەگەیەنن کە شکۆمەندی و گەورەیی و خۆ بەزل گرتن سیفاتی خوایە و هەر شایەنی ئەوە، هەرکەسێکیش بیەوێت یەکێك لەو سیفەتانەی کە تایبەتە بە خواوە بۆ خۆی زەوت بکات ئەوا خۆی دووچاری سزاو ئازار و دۆزەخ و فەوتان دەکات. سەیرە کەسێك بزانێت لە مشتێك خۆڵ دروست بووە دەشبێتەوە بە مشتێك خۆڵ، کەسێك بزانێت کەناو سکی پڕە لە پیسایی، کەسێك بزانێت کە لەگەڵ مردنی دا ئەگەر بەپەلە نەیشارنەوە بۆگەنی جەستەی هەموو چوار دەوری هەراسان دەکات، کەسێك بزانێت بە ئازارێکی کەم هاوار و ناڵەی لێ بەرز دەبێتەوە و بە نەخۆشی و لەرز و تایەکی کەم بێ هۆش دەبێت و وورێنە دەکات، دەبێت ئەم کەسە چ سەر لێشێواوی و گومڕاییەك بێت کەوای لێ بکات فیزو کەشخەیەتی بەسەر بەندەکانی خوادا لێ بدات و خۆی لێ بگۆڕێت و وا بزانێت خەڵك لە قوڕ دروست بوون وئەویش لە ئاڵتون، یان خۆی لەوە بە گەورەتر و زاناتر بزانێت کە گوێ بۆ فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرکەی رابگرێت، یاساو بەرنامەی خوای پێ دواکەتن و کۆنەپەرستی بێت، بیرو فکرە پڕو پوچەکانی خۆیشی پێ چاکسازی و پێشکەوتن بێت، بەڕاستی ئەو جۆرە کەسانە شەڕیان لە گەڵ خوای گەورەدا ڕاگەیاندوە، هەر کەسێکیش ئەوە حاڵی بێت دەبێت دڵنیا بێت کە بەشی ئەولای خوا پشت شکان و دۆزەخ و ریسوایی هەتا هەتاییە .

## (٣٤) (خوا هەریەکەو تەنیایە)

(٧٥) (حم خ ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللّهُ تَعالَى: شَتَمَنِي ابْنُ آدَمَ وَما يَنْبَغي لَهُ أَنْ يَشْتِمَني وَ كَذَّبَنِي وَ مَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يُكَذِّبَنِي أمّا شَتْمُهُ إيّايَ فَقَولُهُ: إنَّ لي وَلَدًا وَ أَنَا اللّهُ الأَحَدُ الصَّمَدُ لَمْ أَلِدْ وَ لَمْ أُولَدْ وَ لَمْ يَكُنْ لِي كُفْوًا أَحَدٌ وَ أَمَّا تَكْذِيبُهُ إيَّايَ فَقَوْلُهُ:

**لَيْسَ يُعِيدُنِي كَمَا بَدَأَنِي وَ لَيْسَ أَوَلُ الخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إعَادَتِه ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣٢٣) في صحيح الجامع**

أبو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە فەرمویەتی: بەنی ئادەم جوێنی پێ دام و بۆ ئەویش نەهاتووە کە جوێن بە من بدات، وە بە درۆم دەخاتەوە و بۆ ئەویش نەهاتووە کەمن بە درۆ بخاتەوە، جوێن دانەکەشی بە من ئەوە یە کە دەڵێ: گوایە من کوڕم هەیە، منیش خوای تاك وتەنیام و هەموو نیازمەندان روو لە من دەکەن بۆ جێ بەجێ بوونی نیازەکانیان و منیش نیازم بە کەس نیە، کەسم لێ نەبووە و لە کەسیش نەبووم، هیچ هاوتاو هاوشانێکم نەبووەو نییە. وە درۆ خستنەوەکەشی بۆ من ئەوەیە کە دەڵێ: خوا نامگەڕێنێتەوە و زیندووم ناکاتەوە بەو جۆرەی کە یەکەم جار دروستی کردووم، منیش دروست کردنی یەکەم جاریم لا ئاساتر نەبووە لە سەر لە نوێ گێڕانەوەی و زیندوو کردنەوەی ).

**(٧٦) (خ) عن إبن عباس قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعَالَى: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَ لَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلكَ وَ شَتَمَنِي وَ لَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلكَ فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَزَعَمَ أَنِّي لا أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كَمَا كَانَ وَ أَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: لِي وَلَدٌ فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَو وَلَداً ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣٢٧) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە فەرموویەتی: بەنی ئادەم بە درۆم دەخاتەوە و بۆ ئەویش نەهاتووە وا بکات، وە جوێنی پێ داوم و بۆ ئەویش نەهاتووە وا بکات، بەدرۆ خستنەوە کەشی بۆ من ئەوەیە کە لافی ئەوە لێدەدات کە من ناتوانم جارێکی تر زیندووی بکەمەوە، وە جوێنەکەشی بەمن ئەوەیە کە دەڵێ من کوڕم هەیە، پاکی و گەورەیی و بێ عەیبیش بۆ منە لەوەی کە هاوسەر یان کوڕم هەبێت ).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان:

بەڵێ ئەو کەسەی کە زیندوو بوونەوە بە درۆ دەزانێت زمان حاڵی ئەوەیە کە خوا بەدرۆ دەخاتەوە، وە بڕیاردانی کوڕیش بۆ خوا جوێندانە بە خوا( گەورەیی و پاکی هەر بۆ خوا ) چونکە بوونی کوڕ مانای بوونی هاوسەرە و مانای بوونی دایك و باوك و مانای بوونی منداڵ و مانای بوونی هاوتا و شەریکە بۆ خوای تاك و تەنیا و بێ شەریك. ئەوەی کە من لێرەدا دەمەوێت ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کە بڕیار دانی کوڕ بۆ خوا لە ئاینە تەحریف کراوەکانی وەك مەسیحی و یەهودیدا کارێکی ئاساییە لەلایان، بەڵام ئەوەی کە جێی داخ و مەخابنە ئەوەیە کە کەسانێك خۆیان بە موسڵمان لە قەڵەم دەدەن و لەنەوەی موسڵمانانن کەچی بێ ئاگا لەوەی کە ئەو کارە کوفرە و جوێن دانە بە خوا یان دەزانن و بە ئەنقەست ئەو کوفرە گەورەیە دەڵێن و دوبارەی دەکەنەوە ( خوا پەنامان بدات )، بەتایبەتی لە کاتی هەڵچون و توڕە بوندا، بگرە هەندێك لەسەر لێشێواوان بەتایبەت لە ریزی گەنج و هەرزەکارەکاندا بە حسابی خۆیان سوعبەت و گاڵتە لەگەڵ یەکتر دەکەن بەوەی کە بە (کوڕی خوا) یەکتر بانگ دەکەن، بێ ئاگا لەوەی کە ووتنی ئەو ووشە کوفرە ، جوێن دانە بە خوا و هەموو کاری خێرو چاکەیان بەتاڵ دەکاتەوە و

له بازنەی ئیمان و ئیسلامەتیان دەباتەوە دەرەوە، وە نازانن کە بە دەربڕینی ئەو ووشە کوفرە-کە لای ئەوان زۆر سادەیە- زەوی و ئاسمانەکان لە ترسی خوا دەکەونە لەرزە، ئەوەتا خوای گەورە لە سورەتی ( مریم ) دا دەفەرمویت: "وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا (٨٨) لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا (٨٩) تَكَادُ السَّمَوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنْشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا (٩٠) أَنْ دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا (٩١) وَمَا يَنْبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا (٩٢) إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا (٩٣) لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا (٩٤) وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا (٩٥) ".

واتە: ( ئەوانە ئەڵێن خوا کوڕی بۆ خۆی داناوە، بەڕاستی ناماقوڵییان کرد، ئاسمانەکان لەتاو ئەو قسەیە خەریکن پارچە پارچە دەبن و زەوی وەختە شەق ببێت و چیاکانیش هارە بکەن و بڕوخێن، کە دەڵێن خوا کوڕی هەیە، بۆ خوا شیاو نیە و نەهاتووە کە کوڕی هەبێت، هەرچی ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەموویان بەبەندایەتی دێنە بەردەمی خوا ، هەمووشیانی سەرژمێر کردوە و یەك بەیەك بژاردونی، وە هەمووشیان بەتاکە کەسی لە ڕۆژی قیامەتدا دەچنەوە بەردەمی خوا ). سەبارەت بەوانەشی کە دەڵێن مردوو زیندو نابێتەوە، خوای گەورە یەك بەڵگەی زۆر روون و ئاشکرایان وە بیر دەهێنێتەوە کە هەر کەسێك مەبەستی حەقیقەت و راستی بێت قەناعەتی پێدەکات و ملی بۆ کەچ دەکات، ئەویش ئەو حەقیقەتە حاشا هەڵنەگرەیە کە: خوایەك بتوانێت یەکەم جار لە نەبوو دروستمان بکات بۆ ناتوانێت جارێکی تریش دروستمان بکاتەوە؟ خۆ جاری دووەم لە جاری یەکەم گران تر و زەحمەت تر نابێت، وە شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە دروست کردنی شتێك بۆ جاری دووەم زۆر ئاسانترە لە دروستکردنی یەکەم جاری.

خوای گەورە لە سورەتی (إسراء)دا دەفەرموێت: " وَقَالُوا أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا وَرُفَاتًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا (٤٩) قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا (٥٠) أَوْ خَلْقًا مِمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ فَسَيَقُولُونَ مَنْ يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَى هُوَ قُلْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَرِيبًا (٥١)"

( ئەوانە دەڵێن: باشە ئەگەر ئێمە بووینە ئێسك و پروسك، ئایا بەڕاستی جارێکی تر ئێمە زیندوو دەبینەوە و سەر لەنوێ دروست دەکرێینەوە؟ تۆش پێیان بڵێ (ئەی محمد): یەڵای دەکرد بەرد و ئاسن دەبوون ، یان هەر مەخلوقێکی تر کە بەلای ئێوەوە زل و گەورەیە، ئەوجا دەڵێن باشە کێیە ئەوەی کە سەر لە نوێ دەمانگێڕێتەوە و زیندومان دەکاتەوە؟، تۆش پێیان بڵێ ئەوەی کە یەکەم جار لە نەبوون دروستی کردون و هێناونیەتیە بوون، ئینجا سەری خۆیان شۆڕ دەکەن و دەڵێن: دەی باشە ئەوە کەی روودەدات ؟ تۆش بڵێ: بەڵکو نزیك بێت و هێندەی نەمابێت ).

## ( ٣٥ ) ( خوا لێ بوردەیە )

(٧٧) ( طب ك ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: ﴿ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: مَنْ عَلِمَ أَنِّي ذُو قُدْرَةٍ عَلَى مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ غَفَرْتُ لَهُ، وَلا أُبَالِي مَا لَمْ يُشْرِكْ بِي شَيْئًا ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم (٤٣٣٠) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە فەرموویەتی: هەر کەسێك زانی کە من خاوەن توانام بەسەر لێبوردنی تاوانەکاندا، ئەوا لێی دەبورم و گوێ نادەمێ، بەمەرجێ هیچ شەریك و هاوتایەکم بۆ بڕیار نەدات).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکە :

**یەکەم/** گەورەترین تاوان ئەوەیە کەسێك وابزانێت کە ڕەحمەت و بەخشندەیی و لێبوردنی خوا بەشی ئەو ناکات یان ئەو ناگرێتەوە یان وا بزانێت کە تاوانەکانی لەوە گەورەتر و زیاترن کە ڕەحمەتی خوا بەشیان بکات.

**دووەم/** هەر کەسێك لە دوای تاوان کردن ئەگەر هەستی کرد و زانی کە پەروەردگارێکی هەیە دەتوانێت لە تاوانەکانی ببورێت و قەڵەمی عەفویان بەسەردا بهێنێت خوای گەورە دەفەرموێت من لێی خۆش دەبم و گوێ نادەمێ کە تاوانەکانی چەندە زۆر و گەورەن بەمەرجێك ئەو کەسە لە حاڵێکدا نەبێت کە شەریك و هاوتا بۆخوا بڕیار بدات.

**سێیەم/** هەست کردن بە لێبوردەیی و بەزەیی بێ پایانی خوا زۆر گرنگە، جارێکیان ( سفیان الثوري ) کە یەکێکە لە (تابعی)یە خواناسەکان نەخۆش دەکەوێت یەکێك لە هاوەڵەکانی بەناوی (حماد بن سلمه ) کە ئەویش خواناسێکی ناودارە سەردانی دەکات، سوفیان بەدەم گریانەوە دەڵێ: تۆ بڵێی خوای گەورە لە کەسێکی وەك من خۆش بێت ؟ ئەویش پێی دەڵێ: سوێندبێت بە خوا ئەگەر بدرێتە دەست خۆم کە هەڵبژێرم کامیان لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکات خوای گەورە یان دایك و باوکم ئەوا بێ هیچ دوو دڵییەك خوای گەورە هەڵدەبژێرم چونکە ئەو لەدایکم و باوکم بۆ من بەڕەحم ترە.

## ( ٣٦ ) ( شیاو نی یە جوێن بە زەمانە و سەردەم بوترێت )

(٧٨) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنَّ اللهَ هُوَ الدَّهْرُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٧٧٦٨) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( باکەستان نەڵێت: ئای لە غەدری زەمانە، چونکە ئەو دەهرو زەمانەیەی کە ئێوە گلەیی لێ دەکەن خوداوەند خۆیەتی ).

(٧٩) (حم ق د ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): ﴿ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ بِيَدِي الأَمْرُ أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣٤٢) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە فەرموویەتی: بەنی ئادەم جوێن بە دەهرو زەمانە دەدات کەمن پێم ناخۆشە، دەهر و زەمانە منم، کارەکە بەدەستی منە، من شەو ڕۆژ بەسەر یەکدا ئاڵوگۆڕدەکەم ).

( ٨٠ ) ( م ) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ﴿ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْذِينِى ابْنُ آدَمَ يَقُولُ يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ. فَلاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ. فَإِنِّى أَنَا الدَّهْرُ أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٤٣٤٤ ) في صحيح الجامع

(خوای گەورە فەرموویەتی: بەنی ئادەم ئازارم دەدات دەڵێ: ئای لە جەوری زەمانە، با کەستان نەڵێت ئای لە جەوری زەمانە، چونکە دەهر و زەمانە هەر منم، من شەوەکەی و ڕۆژەکەی بەسەر یەکدا ئاڵو گۆڕ دەکەم، ئەگەر ویستیشم دەیانگێڕمەوە لای خۆم ).

**تێبینی** / مەبەستی فەرموودەکان ئەوەیەکە خوای گەورە کارو باری زەمانە هەڵدەسوڕێنێت و ڕووداوەکانی دەڕەخسێنێت، جا کەسێك گلەیی بەختی خۆی لەزەمانە بکات و جوێنی پێ بدات، وەك ئەوە وایە جوێنی بەخوا دابێت چونکە هەمووی بە فەرمانی خوای گەورە خۆیەتی، نەك بە فەرمانی دەهر و زەمانە، جا گلەیی کردن لە سەردەم و زەمانە گلەیی کردنە لە زاتی خوا.

## ( ٣٧ ) ( لە نێوان خوا و بەندەکانیدا )

( ٨١ ) ( م ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا عِبَادِى إِنِّى حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِى وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِى أَهْدِكُمْ يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِى أُطْعِمْكُمْ يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِى أَكْسُكُمْ يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِى أَغْفِرْ لَكُمْ يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّى فَتَضُرُّونِى وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِى فَتَنْفَعُونِى يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِى مُلْكِى شَيْئًا يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِى شَيْئًا يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِى صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِى فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِى إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ يَا عِبَادِى إِنَّمَا هِىَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٤٣٤٥ ) في صحيح الجامع

ابي ذر دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەی بەندەکانم ! من زوڵم و ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردووە وە لە نێوان ئێوەشدا حەرامم کردووە، ئیتر ئێوەش زوڵم لە یەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانم ! ئێوەن کەبەشەو و بەڕۆژ هەڵە و تاوان دەکەن، وە هەر منیشم کە لەتاوانەکان خۆش دەبم و گوێ نادەمێ،

ئەی بەندەکانم ! هەمووتان گومڕاو سەرلێشێواون، ئەوەتان نەبێت کە من ڕێنومایی بکەم، جا داوای ڕێنومایم لێ بکەن با ڕێنومایتان بکەم. ئەی بەندەکانم ! هەمووتان برسین ئەوەتان نەبێت کە من خۆراکی پێ بدەم، جا داوای خۆراك و ڕۆزیم لێ بکەن با پێتان ببخەشم، ئەی بەندەکانم ! هەمووتان رووتن ئەوەتان نەبێت کە من داپۆشراوی بکەم، جا داوای بەرگ و پۆشاکم لێ بکەن با داپۆشراوتان بکەم، ئەی بەندەکانم ! ئەگەر ئەوەڵتان و ئاخیرتان، و ئینسانتان جنۆکەتان لەسەر دڵی خراپترین پیاوتان بن، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکاتەوە، ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوەڵتان و ئاخیرتان و ئینسانتان و جنۆکەتان لەسەر دڵی لە خواترسترین پیاوتان بن، ئەوە هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم ! ئەگەر ئەوەڵتان و ئاخیرتان و ئینسانتان و جنۆکەتان لەیەك شوێندا بن و داوام لێ بکەن، وە هەریەکەتان داواکاریەکەی خۆی پێببەخشم، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکاتەوە هێندە نەبێت کە دەرزی یەکی درومان یەك جار لە ئاوی دەریا هەڵکێشرێت، ئەی بەندەکان ! هەر کارو کردەوەکانی خۆتانە و من لەسەرتانی تۆمار دەکەم، جار هەر کەسێك باشی هاتەڕێ با سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکات، وە هەر کەسێکیش شتێکی تری هاتەڕێ بالۆمەی کەس نەکات خۆی نەبێت ).

## ( ٣٨ ) ( ئەگەر بەندەکان تاوان و گوناهیان نەکردایە )

**(٨٢) ( ك ) عن إبن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَو أَنَّ العِبَادَ لَمْ يَذْنِبُوا لَخَلَقَ اللهُ خَلْقاً يُذْنِبُونَ ثُمَّ يَسْتَغْفِرُونَ ثُمَّ يَغْفِرُ لَهُمْ وَهُوَ الغَفُورُ الرَّحِيمِ ﴾ . ( حسن ) ينظر حديث رقم ( ٥٢٤٣ ) في صحيح الجامع**

ابن عمرو دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر بەندەکان تاوانیان نەکردایە، خوا کەسانێکی تری دروست دەکرد کە تاوان بکەن وپاشان تۆبەی لێ بکەن و داوای لێبوردنی لەسەر بکەن و ئینجا ئەویش لێیان خۆش بێت، وە هەر خۆیشی لێبوردە و دلۆڤانە ).

## ( ٣٩ ) ( خوای گەورەمان وەك و خۆی نەناسیوە )

**(٨٣) ( حم تخ طب ) عَنْ عُتْبَةَ بْنِ عَبْد قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّه(ﷺ) قَالَ: ﴿ لَوْ أَنَّ رَجُلاً يُجَرُّ عَلَى وَجْهِه مِنْ يَوْمِ وُلِدَ إِلَى يَوْمِ يَمُوتُ هَرَماً فِي مَرْضَاةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَحَقَّرَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٢٤٩ ) في صحيح الجامع**

( ئەگەر پیاوێك هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونیەوە لەسەر دەم و چاو رابکێشرێت ( واتە کەم ئەندام و سەقەت بێت ) هەتا ئەو ڕۆژەی کە پیر دەبێت و دەمرێت هەر لە رەزا مەندی خوادا بەسەری بەرێت، هێشتا لە ڕۆژی قیامەتدا بەکەم و بێ ئەرزشی دەزانێت ).

### ڕونکردنەوەی فەرموودەکە :

واته كاتێك له قیامەتدا ئەو هەمو پاداشت و ڕەزامەندییەی خوا دەبینێت ئەگەر هەموو تەمەنیشی بەو حاڵە پڕ ئازار و مەینەتی یەوە بەسەر بردبێت و سوپاسی خوایشی لەسەر كردبێت هێشتا لەلای كەم و بێ نرخە لە چاو پاداشتی بێ پایانی خوادا.

## ( ٤٠ ) ( ستایش و پاساو )

( ٨٤ ) ( طب )عَنِ الأَسْوَدِ بنِ سَرِيعٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَلا أَحَدٌ أَكْثَرَ مَعَاذِيرَ مِنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴾. ( حسن ) ينظر حديث رقم ( ٥٣٦٩ ) في صحيح الجامع

اسود ی كوڕی سريع دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ كەس هێندەی خوا مەدح و ستایشی پێ خۆش نیە، وە هیچ كەسیش هێندەی خوا پاساو و پۆزشی بەندەكانی قبوڵ ناكات ).

### ڕونكردنەوەی فەرمودەكە:

هیچ كەس هێندەی خوای گەورە شیاوی ستایش كردن نییە وە هیچ كەسیش هێندەی خوای گەورە پێی خۆش نییە كە بەندەكانی ستایشی بكەن، هەر لە بەر ئەوەش پاداشتی گەورە و بێ پایانی داناوە بۆ ئەو بەندانەی كە بە بەردەوامی و بە جوانترین شێوە سوپاس و مەدح و ستایشی خوا دەكەن لەسەر ئەو هەموو فەزڵ و بەخشش و ڕۆزییەی كە بە سەریاندا دەیرژێنێت (وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا) (وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ).هەروەها لە فەرمودەكەدا ئەوەش هاتووە كەخوای گەورە لە هەموو كەس زیاتر پاساو هێنانەوە (عُذر)لە بەندەكانی خۆی قبوڵ دەكات، وە كۆبۆنەوەی ئەو دوو سیفەتەش لە خوای گەورەدا (پێخۆش بوونی ستایش و وەرگرتنی پاساو )لوتكەی بەرزێتی و كەماڵە بۆ خوای گەورە كە بە هیچ جۆرێك مەبەستی نی یە و نایەوێت سزاو و ئازاری بەندەكانی خۆی بدات بەڵكو لە پاساوێك دەگەڕێت یان لە بیانویەك دەگەڕێت كە بیكاتە هۆكار بۆ لێخوش بوونی بەندەكانی.

## ( ٤١ ) ( خوای بە ئارام )

( ٨٥ ) ( ق ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَيْسَ أَحَدٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذىً سَمِعَهُ مِنَ اللهِ تَعَالَى إِنَّهُمْ لَيَدْعُونَ لَهُ وَلَداً وَ يَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَاداً وَ هُوَ مَعَ ذٰلِكَ يُعَافِيهِمْ وَ يَرْزُقُهُم ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٣٧٠ ) في صحيح الجامع

ابوموسی دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ كەسێك هێندەی خوای گەورە بەئارام نییە لە ئاستی ئەو ئازار و خراپانەی كە دەیبیستێت، ئەوەتا پێی ئەڵێن كوڕی هەیە و هاوتا و هاوشێوەی بۆ بڕیار دەدەن ،كەچی ئەو لەگەڵ ئەوەشدا لەش ساغیان دەكات و ڕزق و ڕۆزیشیان دەداتێ).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکە :

یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە (صبور)ە کە ئەویش مانای ئارام گرتنێکی زۆر دەبەخشێت، وە هەروەك لەفەرمودەکەدا هاتووە هیچ کەس هێندەی خوای گەورە بە ئارام نییە، مامۆستایەك لە پۆلی وانە ووتنەوەدا هەر جارێك یان دووجار ئارام دەگرێت بەرامبەر قوتابی یەك کە سەر پێچی بکات، پێش ئەوەی سزای بدات، تەنانەت باوکیش ئەگەر چەند جارێك کوڕەکەی سەرپێچی بکات لێی قبوڵ ناکات و سزای دەدات، بەڵام ئێمە دەبینین کە مرۆڤەکان بەردەوام لەم جیهانەدا هەموو جۆرە گوناهو تاوانێك و کارێکی ناڕەوا ئەنجام دەدەن، هەر لەکوفر و جوێندان بەخوا و دەرچون لە فەرمانەکانی و دژایەتی کردنی پێغەمبەرەکانی و کوشتن و دزی و داوێن پیسی و ئازاردانی خەڵك و هەزارەها جۆر تاوانی تر، خوای گەورەش ئاگاداری هەموویەتی و هەموویشی دەبیستێت و دەبینێت، بەڵام ئارام دەگرێت و لێی دەوەستێت ،کەس نی یە لە ئێمە کە ڕۆژانە چەندین گوناهو تاوانی گەورە و بچوك، نهینی و ئاشکرا ئەنجام نەدەین، کە ئەگەر بەرامبەر بە مرۆڤێکی وەك و خۆمان بمانکردایە هەرگیز لێی قبوڵ نەدەکردین، بەڵام خوای گەورە هەر ئاراممان لە سەر دەگرێت، بەم ڕۆژگارە بۆگەنی تاوان و خراپەکاری مرۆڤەکان بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە کەچی لە بەرامبەریشدا خوای گەورە نەك هەر ئارام دەگرێت بەڵکو بەردەوامیش رزق و ڕۆزی و بەخششەکانی ئەو بەرسەرماندا دەبارێت.

بەڕاستی هیچ مەخلوقێك هێندەی ئەم مرۆڤە سپڵە و بەدنمەك و لەخۆبایی نیە ، کە جوێن بە خوا دەداو پیٚ دەکەنێت، کە تاوان ئەنجام دەدات و خۆی هەڵدەکێشێت، کە دژایەتی بەرنامە و فەرمانی خوا دەکات و زۆریش لە خۆی ڕازییە، وە هیچ کەسیش هێندەی خوای گەورە لەبەرامبەر ئەو هەموو سەر پێچی و لاسارییە خاوەن سەبر و بەئارام نی یە.

## ( ٤٢ ) ( سەبارەت بە باران )

(٨٦) ( م ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ(ﷺ) قَالَ: ﴿ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ بَرَكَةٍ إِلاَّ أَصْبَحَ فَرِيقٌ مِنَ النَّاسِ بِهَا كَافِرِينَ يُنْزِلُ اللَّهُ الْغَيْثَ فَيَقُولُونَ الْكَوْكَبُ كَذَا وَكَذَا ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٥٦١) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە هیچ بەرەکەتێکی لە ئاسمانەوە دانەبەزاندووە ئیلا کۆمەڵێك لە خەڵکی پیٚ کافر بووە، خوا باران دەبارێنێت کە چی دەڵێن: بەهۆی فلاٚن ئەستێرە و فیسار ئەستێرەوە ).

(٨٧) ( حم ق د ن هـ ) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ عَلَى أَثَرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ قَالَ ﴿ هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ﴾. قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ ﴿ أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ وَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي مُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ ﴾.
(صحيح) ينظر حديث رقم (٧٠٢٨) في صحيح الجامع

زەیدی کوڕی خالید دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردین لە ( حدیبیە ) پاش ئەوەی کە شەو بارانێکی زۆر باری، کاتێك لە نوێژەکەی تەواو بوو رووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ( ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرموو ؟ ووتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. فەرمووی: خوا فەرمووی: ئەوا بەندەکانم هەندێکیان بوون بە باوەڕدار و هەندێکیشیان بوون بەبێ باوەڕ، ئەوەی کە ووتی بەهۆی فەزڵ و رەحمەتی خواوە بارانمان بەسەردا باری، ئەوا باوەڕی بەمنەو باوەڕی بە ئەستێرەکان نیە، بەڵام ئەوەی کە وتی: بەهۆی فلآن ئەستێرە و فیسار ئەستێرە بارانمان بەسەردا باری ئەوە باوەڕی بە من نییە و باوەڕی بە ئەستێرەکانە ).

## ڕونکردنەوی فەرموودەکان :

کەسانێك هەن کە بەردەوام هەوڵ دەدەن هەرچی گۆڕانکاری و روداوێك لە بونەوەردا روو دەدات بیگەڕێننەوە بۆ هۆکاری سروشتی و مادی، وە بەهەر شێوەیەك بێت دەیانەوێت کە ناوی خوا و دەستی خوا لە مەسەلەکان بەرنە دەرەوە، جارێك بەناوی سروشتەوە، و جارێك بەناوی رێکەوتەوە و، جارێك بەناوی زانست و یاسا مادییەکانەوە، وە مەبەستیانە کە هەموو شتێك لە روانگە مادییەکانی خۆیانەوە لێك بدەنەوە. ئێمەی موسڵمان و باوەڕداریش لە هەموو کەس باشتر دەزانین کە ئەم بوونەوەرە بەهەموو وردەکارییەکانی یەوە لەسەر کۆمەڵێك یاسا و بنەمای چەسپا و دەڕوات بەڕێوە، وە هەموو گۆڕانکاری و رووداوێك کە لە سنوری مادەدا روو دەدات هۆکار و لێکدانەوەی زانستیانەی خۆی هەیە، بەڵام ئێمە بە پێچەوانەی ئەوانەوە دەڵێین کە سەرجەم ئەو یاسا ماددی و سروشتیانەی کە بوونەوەری لەسەر دەچن بەڕێ وە و سەرجەم ئەو گۆڕانکاری و رووداوانەش کە لە سنوری مادەدا روو دەدەن، بە خودی ماددەکە خۆشی یەوە، هەمووی خوای گەورە دروستی کردون و بەفەرمانی ئەو داڕێژراون و بە وویستی ئەویش روودەدەن و بە ئەنجام دەگەن.

باران و بەفر بارین، زەمین لەرزە و گڕکان، هەڵکردنی باو هەستانی لافاو، هەڵچون و داچونی دەریاکان، ژیان و مردن، هاتوچۆی ئەستێرەکان...هتد هەمووی بە فەرمانی خوا و لەسەر وویستی خوا و بەپێی ئەو یاسایانەی کە خوای گەورە دایڕشتوون روو دەدەن و دەچن بەڕێوە، ئەوەی ئەم راستیە بسەلمێنێت و باوەڕی پێی هەبێت ئەوا وەك لە فەرمودە پیرۆزەکە دا هاتووە باوەڕی بە خواو بە توانا و دەستەڵاتی خوا هەیە نەك بە توانا و دەستەڵاتی ئەستێرە و سروشت و ماددە، وە ئەو کەسەشی وابزانێت ماددە و سروشت و بونەوەر خۆ بەخۆ کارەکان رێك دەخەن و خۆیان یاسا بۆ خۆیان دادەڕێژن و گۆڕانکاری و روداوەکان هەڕەمەکین و دەستی خوایان تێدا نی یە، ئەوا باوەڕی بە ئەستێرە وسروشت هەیە و باوەڕی بە خوا نی یە.

## ( ٤٣ ) ( تەسبیحاتی خوا )

(٨٨) ( ابن السني حل ) عن عمرو بن عبسة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ما تَستَقِل الشَمسُ فَيَبْقى شَيءٌ مِن خَلقِ الله إلا سَبَّحَ اللهَ بِحَمْدِه إلا مَا كانَ مِن الشَياطين و أَغبياءِ بَني آدَمَ ﴾. (حسن) ينظر حديث رقم (٥٥٩٩) في صحيح الجامع

عمرو ی کوڕی عبسه دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : ( هەرکاتێك كە خۆر هەڵدێت و بەرز دەبێتەوە، هیچ شتێك لە دروست کراوەکانی خوا نامێنێت کە تەسبیحات و سوپاسی خوا نەکات ، جگە لە شەیتانەکان و بێ ئەقڵ و نەفامەکان لە نەوەی ئادەم ).

## ( ٤٤ ) ( فەزڵی لا اله الا الله )

(٨٩) ( ت ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ قَالَ رَسُولُ الله(ﷺ): ﴿ مَا قَالَ عَبْدٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ قَطُّ مُخْلِصًا إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ حَتَّى تُفْضِيَ إِلَى الْعَرْشِ مَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ ﴾. (صحيح)انظر حديث رقم (٥٦٤٨) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (هەر جارێك بەندەیەك بە دڵسۆزی وتبێتی: لا اله الا الله، ئەوا بێ گومان دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە هەتا دەگاتە لای عەرش، بە مەرجێك خۆی بەدوور گرتبێت لە تاوانە گەورەکان ).

## ( ٤٥ ) ( غیره دوو جۆره )

(٩٠) (ه) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ الله(ﷺ): ﴿ مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللَّهُ وَمِنْهَا مَا يَكْرَهُ اللَّهُ فَأَمَّا مَا يُحِبُّ فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ وَأَمَّا مَا يَكْرَهُ فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٨٨٧) غي صحيح الجامع

ابوهريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەندێ جۆری غیره هەیە خوا پێی خۆشە و هەندێکیشی خوا پێی ناخۆشە و رقی لێیەتی، جا ئەو غیرەیەی کە خوای گەورە پێی خۆشە، غیره کردنە لەو شتانەی کە دەبنە جێی گومان و دوو دڵی، بەڵام ئەوەی کە خوا پێی ناخۆشە و رقی لێ یەتی غیره کردنە بە بێ هیچ هۆیەك کە ببێتە مایەی گومان و دوو دڵی ).

(٩١) (حم ق ت) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاَ أَحَدَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ فَلِذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ وَلِذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ، وَلاَ أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنَ اللَّه مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ أَنْزَلَ الكِتَابَ وَ أَرْسَلَ الرُّسُلَ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٧١٥١) فى صحيح الجامع

إبن مسعود دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:( هیچ کەسێك هێندەی خوا غیرەی نی یە، هەر لەبەر ئەوەش کاری داوێن پیسی حەرام کردووە ،چ بە ئاشکرا بکرێت یان بە نهێنی، وە هیچ کەسیش هێندەی خوا مەدح و ستایشی پێ خۆش نی یە، وە هەر لەبەر ئەوەش مەدحی خۆی کردووە، وە هیچ کەسیش هێندەی خوا پاسا و پۆزشی ( العذر) ی پێی خۆش نی یە، وە هەر لەبەر ئەوەش کتێبی دابەزاندووە و پێغەمبەرانیشی ناردووە ) .

## ( ٤٦ ) ( "بـــــــا" نێردراوی خوای گەورەیە )

(٩٢) ( حم هـ ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): ﴿ لاَ تَسُبُّوا الرِّيحَ فَإِنَّهَا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ وَالْعَذَابِ وَلَكِنْ سَلُوا اللَّهَ مِنْ خَيْرِهَا وَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٧٣١٦ ) في صحيح الجامع

ابوهريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( جوێن بە – با– مەدەن، چونکە لە نێردراوەکانی خوای گەورەیە، رەحمەت لەگەڵ خۆی دەهێنێت و عەزابیش دەهێنێت، بەلأم ئێوە داوای سود و خێرەکەی لە خوا بکەن و پەناش بە خوا بگرن لە زەرەر و زیانەکەی ) .

(٩٣) ( ن ك ) عن أبَيّ قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاَ تَسُبُّوا الرِّيحَ فَإِنَّهَا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ و سَلُوا اللَّهَ خَيْرَهَا وَ خَيْرَ مَا فِيها وَ خَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا وَ شَرِّ مَا فِيها وَ شَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٧٣١٧ ) في صحيح الجامع

أُبَيّ دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (جوێن بە – با– مەدەن چونکە لە نێردراوەکانی خوایە، وە داوا لە خوا بکەن کە لە سودەکەی و سودی ئەوەی کە تیایەتی و سوود و خێری ئەوەشی کە پێی نێردراوە پێتانی ببەخشێت، وە پەناش بە خوا بگرن لە زەرەرو زیانەکەی و زەرەرو زیانی ئەوەی کە تیایەتی و زەرەر و زیانی ئەوەشی کە پێی نێردراوە ).

## ( ٤٧ ) ( ما شاء الله )

(٩٤) ( حم د ن ) عَنْ حُذَيْفَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ﴿ لاَ تَقُولُوا مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ فُلاَنٌ وَلَكِنْ قُولُوا مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ شَاءَ فُلاَنٌ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٧٤٠٦ ) في صحيح الجامع

حذيفة دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( مەڵێن ئەوەی کە خوا بیەوێت و فلأنەکەس بیەوێت، بەڵکو بڵێن: ئەوەی کە خوابیەوێت پاشان فلأنەکەس بیەوێت ).

**تێبینی/** ئەمە شێوازێکە لە ئەدەبی جوان کە پێغەمبەر(ﷺ) فێری موسڵمانانی دەکات، چونکە وشەی ( و ) بۆ کۆکردنەوە و هاوبەشی کردنە، بۆیە جوان نییە ناوی کەس بکەین بە هاوبەشی ناوی خوا لە وویست و ئیرادەدا بەلأم ئەگەر بڵێین (ئەوەی کە خوای گەورە دەیەوێت پاشان فلأن کەس ) ئەمەیان ئەوە دەگەیەنێت کە ناوی فلأن کەس لە خوارو ناوی خوای گەورەوەیەوە ، وە ویستی لە خوار

ویستی خوای گەورەوەیە، بەمەش ناوی خوای گەورە بەرز رادەگیرێت و کەس ناکرێتە هاوبەش و شەریکی وویست و ئیرادەی.

## ( ٤٨ ) ( دەربارەی شەرم کردن )

(٩٥) ( حم ن حب ه ) عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ لاَ يَسْتَحِي اللَّهُ مِنَ الْحَقِّ، لاَ يَسْتَحِي اللَّهُ مِنَ الْحَقِّ، لاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٧٧١١) في صحيح الجامع

خزيمة ی کوڕی ثابت دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوا شەرم لە حەق ناکات، خوا شەرم لە حەق ناکات، لە دواوە مەچنە لای ئافرەت).

## ( ٤٩ ) ( یەکێکی تر لە سیفەتەکانی خوای گەورە )

(٩٦) ( حم ق ت ه ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ قَالَ لِي: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيك ). وقال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَمِينُ اللَّهِ مَلأَى لاَ يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَمِينِهِ - قَالَ - وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَبِيَدِهِ الأُخْرَى الْقَبْضُ يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٨٠٦٦) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە پێی فەرمووم: تۆ سەرف بکە و ببەخشە، منیش بۆت سەرف دەکەم و پێت دەبەخشم ) هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (دەستی راستی خوا پڕە، بەخششی شەو و ڕۆژ لێی کەم ناکاتەوە، دەزانن لەو کاتەوەی کە ئاسمان و زەوی دروست کردووە چەندی سەرف کردووە و بەخشیوە ، ئەوە هەر هەمووی ، لەوەی لە دەستی راستی خوادایە هیچی کەم نەکردۆتەوە ). فەرمووی: ( عەرشەکەشی بەسەر ئاوەوەیە، وە بە دەستەکەی تریشی ترازوی گرتووە، بەرزی دەکاتەوە و نزم و نەویشی دەکاتەوە ).

## ( ٥٠ ) ( لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان پێچراونەتەوە بە دەستی راستی خواوە )

(٩٧) ( م د ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَطْوِي اللَّهُ السَّمَوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ؟ ثُمَّ يَطْوِي الأَرَضِينَ ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ ﴾. قَالَ ابْنُ الْعَلاَءِ: بِيَدِهِ الأُخْرَى، ﴿ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ؟ ﴾.

(صحيح) ينظر حديث رقم (٨١٠١) في صحيح الجامع

( ڕۆژی قیامەت خوا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە، پاشان بەدەستی ڕاستی دەیانگرێت، پاشان دەفەرمووێت: منم پادشا، زۆرداران لە کوێن ؟ خۆ بەزل زانەکان لە کوێن ؟ پاشان زەویەکان دەپێچێتەوە، پاشان دەیانگرێت)، ابن العلا (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی فەرمودەکە) ووتی: بە دەستەکەی تری، پاشان دەفەرمووێت: (منم پادشا، زۆرداران لەکوێن ؟ خۆبەزل زانەکان لەکوێن ؟ ).

## ( ٥١ ) ( دەربارەی دابەزینی خوای گەورە بۆ ئاسمانی دونیا )

**(٩٨)** ( م ت ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ﴿ **يَنْزِلُ اللَّهُ تَعَالَى إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَمْضِي ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ فَيَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ فَلاَ يَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُضِيءَ الْفَجْرُ** ﴾. ( حسن ) ينظر حديث رقم ( ٨١٦٥ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی:( هەموو شەوێك خوای گەورە دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا کاتێك کە سێ یەکی یەکەم لە شەو تێ دەپەڕێت و دەفەرموێت: منم پادشا، منم پادشا، کێیە ئەوەی بانگم دەکات هەتا وەڵامی بدەمەوە ؟ کێیە ئەوەی داوام لێ دەکات هەتا بیدەمێ ؟ کێیە ئەوەی داوای لێبوردنم لێ دەکات هەتا لێی ببورم ؟ ئەمە ئاوا بەردەوام دەبێت هەتا ڕووناکی بەیان هەڵدێت ).

**(٩٩)** ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **يَنْزِلُ اللَّهُ فِى السَّمَاءِ الدُّنْيَا لِشَطْرِ اللَّيْلِ أَوْ لِثُلُثِ اللَّيْلِ الآخِرِ فَيَقُولُ مَنْ يَدْعُونِى فَأَسْتَجِيبَ لَهُ أَوْ يَسْأَلُنِى فَأُعْطِيَهُ. ثُمَّ يَقُولُ مَنْ يُقْرِضُ غَيْرَ عَدِيمٍ وَلاَ ظَلُومٍ** ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٨١٦٦ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا لە نیوەی شەودا، یان لەسێ یەکی کۆتایی شەودا دەفەرموێت: کێ بانگم دەکات وەڵامی بدەمەوە یان داوام لێ بکات هەتا بیدەمێ، پاشان دەفەرموێت: کێ قەرز دەدات بە یەکێك کە نە نەدارە و نە ستەمکارە ).

**(١٠٠)** ( حم ن ) عن جبير بن مطعم قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **يَنْزِلُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِى كُلِّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ هَلْ مِنْ سَائِلٍ فَأُعْطِيَهُ هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ فَأَغْفِرَ لَهُ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ** ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٨١٦٧ ) في صحيح الجامع

جبیر ی کوڕی مطعم دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوا لە هەموو شەوێکدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و دەفەرمووێت: کەس هەیە داواکاری هەبێت هەتا پێی بدەم ؟ کەس هەیە داوای لێبوردن بکات هەتا لێی ببورم ؟ کەس هەیە تۆبەکار بێت هەتا تۆبەی لێ وەرگرم ؟ هەتا بەیان هەڵدێت ).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان:

ئەو فەرموودە پیرۆزانەی کەباس لە هەندێك لە سیفاتەکانی خوای گەورە دەکەن کە لە قورئانی پیرۆزیشدا بە هەمان شێوە هاتوون وەك بوونی دەست یان دەستی ڕاستی خوا و یان بوونی چاو یان پەنجە یان دابەزینی خوا بۆ ئاسمانی دونیا و ... هتد، پێویستە کە بە هەڵە لێ یان تێ نەگەین چونکە هەر لە کۆنەوە کەسانێکی زۆر قسە و باسیان لەسەر ئەم سیفەتانەی خوا کردووە و، کەسانێکی زۆریش لەوانە بەهۆی دەمارگیری و نەزانین و لێکدانەوەی نادروستەوە گومڕاو سەرلێشێواو بوون، هەندێکیان پێیان وایە کە بوونی دەست و چاو و پەنجە و دابەزینی خوا بۆ ئاسمانی دونیا تەنها مەبەست پێی لایەنە مەجازییەکەیەتی و لەڕاستیدا وا نیە و بەڵکو مەبەست پێی توانا وقودرەتی خوایە، وە کۆمەڵێکی تریش لە کاردانەوەی ئەماندا خراپتر ڕۆچون و پێیان وایە کە خوای گەورە وەك و مرۆڤ دەستی هەیە و چاوی هەیە و دابەزینیشی بۆ ئاسمانی دونیا هەروەك ئەو دابەزینەیە کە ئێمە دەیزانین کە کەسێك لە شوێنێکی بەرزەوە دێتە خوارەوە بۆ شوێنێکی نزم، بەمەش خوای گەورە بە دروست کراوەکانی دەشوبهێنن و جەستەیەکی بۆ بڕیار دەدەن وەك و جەستەی مرۆڤ (سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا )٤٣/الإسراء، بەڵام تێگەیشتنی ڕاست و دروستی فەرمودەکان هەر ئەو تێگەیشتنەیە کە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و شوێن کەوتوەکانیان ( التابعین )و زانا متمانە پێ کراوەکانی ئەم ئوممەتە و جەماوەری موسڵمانان لە ئەهلی سونەت و جەماعەتی لەسەرە کە ئەویش باوەڕ کردنە بە ئایەت و فەرموودەکان وەك و خۆی دوور لەکار خستن (تعطیل) و دوور لە شوبهاندنیش (تشبیه)، واتە کاتێك کە فەرموودەکان دەڵێ خوای گەورە دەستی هەیە ئێمە دەڵێین بەڵێ مادەم خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم وایان فەرمووە ئێمە وەك و خۆی باوەڕمان پێیەتی. بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ شێواز و چۆنیەتی یەك بۆ ئەو دەستە دابنێین، بەڵکو دەڵێین: دەستی خوا دەستێکە کە لایق بە خوا خۆیەتی و تەنها شیاوی ئەوە و لە دەستی هیچ کام لە دروست کراوەکانی ناچێت.

وە کاتێك کە فەرموودەکان دەڵێن خوای گەورە لە سێیەکی کۆتایی شەودا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، ئێمەش دەڵێین بەڵی وەك و خۆی باوەڕمان پێیەتی بەبێ ئەوەی هیچ شێواز و چۆنیەتییەك بۆ ئەو دابەزینە بڕیار بدەین، بەڵکو دەڵێین کە دابەزینی خوا بۆ ئاسمانی دونیا دابەزینێکە کە لایق بە خوا خۆیەتی و تەنها شیاوی ئەوە، نەك دابەزینێك وەك دابەزینی دروست کراوەکانی کە جوڵان و پێوانە و گواستنەوەی لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر تێدایە، چونکە خوای باڵا دەست زۆر لەوە گەورەتر و بەرزترە کە سیفاتەکانی وەك و سیفاتی دروست کراوەکانی وابێ، هەروەك و چۆن کە زاتی خواش بێ نموونەیە و لە هیچ کام لە دروست کراوەکانی ناچێت ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ ١١/الشوری.

## ( بەشی : سەرەتای دروست کردن )

### ( ١ ) ( قەڵەم یەکەم دروست کراوی خوایە )

( ١٠١ ) ( ت ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ فَقَالَ اكْتُبْ. فَقَالَ مَا أَكْتُبُ قَالَ اكْتُبِ الْقَدَرَ مَا كَانَ وَمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى الأَبَدِ** ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٠١٧) في صحيح الجامع

عبادە ی کوڕی الصامت دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( یەکەم شت کە خوا دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە، وتی: چی بنوسم ؟ فەرمووی: قەدەر بنووسە، ئەوەی کە بووە و ئەوەی کە دەبێت بۆ هەتا هەتا ).

( ١٠٢ ) ( د ) قَالَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ لاِبْنِهِ يَا بُنَىَّ إِنَّكَ لَنْ تَجِدَ طَعْمَ حَقِيقَةِ الإِيمَانِ حَتَّى تَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ **إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ فَقَالَ لَهُ اكْتُبْ. قَالَ رَبِّ وَمَاذَا أَكْتُبُ قَالَ اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ** ﴾. يَا بُنَىَّ إِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ﴿ **مَنْ مَاتَ عَلَى غَيْرِ هَذَا فَلَيْسَ مِنِّى** ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٠١٨) في صحيح الجامع

عبادەی کوڕی صامت بە کوڕەکەی دەڵێ: ئەی کوڕی خۆم تۆ چێژ لە راستی ئیمان وەرناگریت هەتا نەزانیت ئەوەی کە توشت بووە و هاتۆتەڕێت نەدەکرا کە هەڵەت بکات و نەیەتە رێت، وە ئەوەشی کە نەهاتۆتە رێت نەدەکرا کە بێتە رێت، لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە، ووتی: ئەی پەروەردگارم چی بنوسم ؟ فەرمووی: بنوسە پێوانە و کێشانەی هەموو شتێك هەتا قیامەت هەڵدەستێت ). ئەی کوڕی خۆم، لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( هەر کەسێك لەسەر غەیری ئەم بیرو باوەڕە بمرێت لە من نی یە ).

( ١٠٣ ) ( حل هق ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ أَوَّلَ شَيْءٍ خَلَقَهُ اللهُ الْقَلَمَ فَأَمَرَهُ فَكَتَبَ كُلَّ شَيْءٍ يَكُونُ** ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٠١٦) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد قەڵەم بوو، فەرمانی پێ کرد، ئەویش هەموو شتێکی نووسی کە دەبێت و روودەدات ).

### ( ٢ ) ( چارەنوسی مرۆڤ لە سکی دایکیدا دەنوسرێت )

( ١٠٤ ) ( حم ق ) عن انس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكاً فَيَقُولُ أَىْ رَبِّ نُطْفَةٌ أَىْ رَبِّ عَلَقَةٌ أَىْ رَبِّ مُضْغَةٌ فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَقْضِىَ خَلْقَهَا قَالَ يَقُولُ أَىْ رَبِّ ذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى شَقِىٌّ أَوْ سَعِيدٌ فَمَا الرِّزْقُ فَمَا الأَجَلُ قَالَ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِى بَطْنِ أُمِّهِ** ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٣٧) في صحيح الجامع

انس دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە فریشتەیەکی تەرخان کردووە. تایبەتە بە رەحمی ئافرەت، ئەڵێت ئەی پەروەردگارم نوتفەیە ( تۆوە )، ئەی پەروەردگارم پارچە خوێنێکی مەیوە، ئەی پەروەردگارم گۆشت پارەیە، جا کە خوا ویستی فەرمانی خوڵقاندنی بدات ، فەرمووی: فریشتەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم نێر بێت یان مێ ؟ ئەهلی دۆزەخ بێت یان بەهەشت ؟ ئەی بەشە رزقەکەی چەند بێت ؟ ئەی ئەجەلەکەی کەی بێت؟ ئیتر بەو جۆرە لە سکی دایکیدا هەموو شتێکی لەسەر دەنوسێت ).

(١٠٥) (حم م) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدِ الغِفَارِيِّ قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَيَقُولُ يَارَبِّ مَاذَا أَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى فَيَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَيَكْتُبَانِ فَيُكْتَبُ عَمَلُهُ وَأَثَرُهُ وَمُصِيبَتُهُ وَرِزْقُهُ ثُمَّ تُطْوَى الصَّحِيفَةُ فَلاَ يُزَادُ عَلَى مَا فِيهَا وَلاَ يُنْقَصُ ﴾ . (صحيح) ينظر حديث رقم (٨٠٧٥) في صحيح الجامع

حذيفة ی کوڕی اسيد الغفاری دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( فریشتەکە دەچێتە لای نوتفەکە پاش ئەوەی کە لەڕەحمدا جێگیر دەبێت بە چل شەو و دەڵێ : ئەی پەروەردگارم ! چی بنوسم ؟ دۆزەخی یان بەهەشتی ؟ نێر یان مێ ؟ ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت و ئەوانیش دەنوسن ، کارو کردەوەکانی وپاشماوە و وەچەکانی وڕزق و ڕۆژی یەکەی و ئەجەلەکەشی دەنوسرێت ، پاشان لاپەڕەکە دەپێچرێتەوە ، نە بۆی زیاد دەکرێت و نەڵێ ی کەم دەکرێت ) .

## ( ٣ ) ( قۆناغەکانی دروت کردنی ئینسان )

(١٠٦) ( م )عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدِ الغِفَارِيِّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) بِأُذُنَيَّ هَاتَيْنِ يَقُولُ: ﴿ إِنَّ النُّطْفَةَ تَقَعُ فِي الرَّحِمِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ يَتَصَوَّرُ عَلَيْهَا الْمَلَكُ ﴾. قَالَ زُهَيْرٌ حَسِبْتُهُ قَالَ الَّذِي يَخْلُقُهَا، ﴿ فَيَقُولُ يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى فَيَجْعَلُهُ اللَّهُ ذَكَرًا أَوْ أُنْثَى ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ أَسَوِيٌّ أَوْ غَيْرُ سَوِيٍّ فَيَجْعَلُهُ اللَّهُ سَوِيًّا أَوْ غَيْرَ سَوِيٍّ ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ مَا رِزْقُهُ مَا أَجَلُهُ مَا خُلُقُهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ اللَّهُ شَقِيًّا أَوْ سَعِيدًا ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٩٨٤) في صحيح الجامع

( حذيفە ی کوڕي اسيدی غە فاری) دەڵێ: بەم دوو گوێیەی خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ( نوتفە کەدەکەوێتە رەحمەوە چل شەو دەمێنێتەوە، پاشان فریشتەکە دادەبەزێت و دێتە لای ) زهیر کە یەکێکە لەوانەی فەرموودەکە گێڕێتەوە وتی: وا لێی تێ گەیشتم کە وتی: ئەو فریشتەیەی کە دروستی دەکات. ( ئینجا فریشتەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم نێر بێت یان مێ ؟ خواش دەیکات بە نێر یان بەمێ، پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ساغ و دروست بێت یان سەقەت وکەم ئەندام ؟ خواش یان ساغی دەکات یان کەم ئەندام ؟ پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگارم رزقی چەند بێت ؟ ئەجەلی چەند بێت ؟ خووڕەوشتی چۆن بێت ؟ پاشان خوا یان دەیکات بە کەسێکی خراپ و دۆزەخی یان بە کەسێکی باش و بەهەشتی ).

## ( ٤ ) ( بەندەكان لەسەر یەكتا پەرستی خوای گەورە دروست كراون )

(١٠٧) ( حم م ) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمُجَاشِعِىِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ فِى خُطْبَتِهِ: ﴿ أَلاَ إِنَّ رَبِّى أَمَرَنِى أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا عَلَّمَنِى يَوْمِى هَذَا كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْدًا حَلاَلٌ وَإِنِّى خَلَقْتُ عِبَادِى حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِى مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَانًا وَإِنَّ اللَّهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ إِلاَّ بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَقَالَ إِنَّمَا بَعَثْتُكَ لأَبْتَلِيَكَ وَأَبْتَلِىَ بِكَ وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَابًا لاَ يَغْسِلُهُ الْمَاءُ تَقْرَؤُهُ نَائِمًا وَيَقْظَانَ وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِى أَنْ أُحَرِّقَ قُرَيْشًا فَقُلْتُ رَبِّ إِذًا يَثْلَغُوا رَأْسِى فَيَدَعُوهُ خُبْزَةً قَالَ اسْتَخْرِجْهُمْ كَمَا اسْتَخْرَجُوكَ وَاغْزُهُمْ نُغْزِكَ وَأَنْفِقْ فَسَنُنْفِقَ عَلَيْكَ وَابْعَثْ جَيْشًا نَبْعَثْ خَمْسَةً مِثْلَهُ وَقَاتِلْ بِمَنْ أَطَاعَكَ مَنْ عَصَاكَ. قَالَ وَأَهْلُ الْجَنَّةِ ثَلاَثَةٌ ذُو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ وَرَجُلٌ رَحِيمٌ رَقِيقُ الْقَلْبِ لِكُلِّ ذِى قُرْبَى وَمُسْلِمٍ وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ - قَالَ - وَأَهْلُ النَّارِ خَمْسَةٌ الضَّعِيفُ الَّذِى لاَ زَبْرَ لَهُ الَّذِينَ هُمْ فِيكُمْ تَبَعًا لاَ يَتْبَعُونَ أَهْلاً وَلاَ مَالاً وَالْخَائِنُ الَّذِى لاَ يَخْفَى لَهُ طَمَعٌ وَإِنْ دَقَّ إِلاَّ خَانَهُ وَرَجُلٌ لاَ يُصْبِحُ وَلاَ يُمْسِى إِلاَّ وَهُوَ يُخَادِعُكَ عَنْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ ﴾. وَذَكَرَ الْبُخْلَ أَوِ الْكَذِبَ ( وَالشِّنْظِيرُ الْفَحَّاشُ ).

( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٦٣٥ ) في صحيح الجامع

عیاض ی كوڕی حمار المجاشعي دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێكیان لە ووتارەكەیدا فەرمووی: ( پەروەردگارم فەرمانی پێ كردم ئەوەی كە ئەمڕۆ فێری كردووم و ئێوە نایزانن فێرتانی بكەم، هەر ماڵ و پارەیەك كە داومە بە بەندەیەك حەڵاڵە، وە من بەندەكانم هەموو لەسەر فیترەت و یەكتاپەرستی دروست كردووە، وە شەیتانەكان هاتوون و فریویان داون لە ئاینەكەیان، وە ئەوەی كە من بۆم حەڵاڵ كرد بوون، ئەو لەسەری حەرام كردن، وە فەرمانی پێ كردن كە شتانێك بكەن بە هاوتا و شەریكی من كە من هیچ توانا و دەستەڵاتێكم پێ نەبەخشیون. وە خوداوەند سەیری خەڵكی زەوی كرد رقی لە هەر هەموویان بووەوە بەعەرەب و عەجەمیانەوە، جگە لە پاشماوەیەك نەبێت لە ئەهلی كیتاب، وە پێی فەرمووم: من تۆم بۆیە ناردووە هەتا تاقیت بكەمەوە و خەڵكیش بە تۆ تاقی بكەمەوە، وە كتێبێكم بەسەردا دابەزاندوویت كە ئاو نایشۆرێتەوە، لەكاتی خەوو بە ئاگابونیشدا دەیخوێنیتەوە. وە خوای گەورە فەرمانی پێ كردم كەقوڕەیش بسوتێنم، منیش ووتم: دەی پەروەردگارم كەواتە سەرم دەشكێنن و وەك و نان كەرتی دەكەن. فەرمووی: دەی چۆن تۆیان كردە دەرەوە تۆش ئاوا دەربەدەریان بكە، وە تۆ هێرش بكەرە سەریان وئێمەش هاوكار و یارمەتی دەرت دەبین، وە لەو پێناوەدا خەرجی و سەرف بكە، ئێمەش خەرجی و سەرفت دەدەینێ، وە تۆ لەشكرێك بنێرە سەریان ئێمەش پێنجی وەك و ئەوەی تۆ دەنێرینە سەریان. وە بەوانەی كە گوێڕایەڵیت دەكەن شەڕ و كوشتاری ئەوانە بكە كە لە فەرمانت دەردەچن. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەهلی بەهەشت سێ جۆرن: خاوەن دەستەڵاتێكی داد پەروەری خێرەومەندی تەوفیق دراو، وە پیاوێكی بەخشندەی دڵ نەرم بۆ هەموو خزمێك و موسڵمانێك، وەدەست پاكێكی خۆگرەوە لەحەرام كە خاوەنی منداڵە. ئینجا فەرمووی: وە ئەهلی ئاگریش پێنجن: كەسی لاواز و بێ

ئەمەك كە عەقڵ و فامی نیە، ئەوانەی كە هەمیشە لەناوتاندا شوێن كەوتەو پاشگرن و شوێن كەس و كار و ماڵ ناكەون، وە ئەو خیانەتكارەی كە تەماعەكەی شاراوە نیە و لە هەموو شتێكدا هەر خیانەت دەكات، وە پیاوێك بەیانی و ئێوارە بەردەوام لە هەوڵی هەڵخەتاندنت دایە لە خێزان و ماڵ و سامانتدا )، پاشان ئاماژەی بە پیسكەیەتی و درۆ كردن كرد و هەروەها باسی مرۆڤی( بەدڕەوشتی داوێن پیسی )ی كرد.

## ڕوونكردنەوەی فەرموودەكە :

**یەكەم**/ عەرەبەكان لەسەردەمی نەفامیدا ( پێش ئیسلام ) هەندێك داب و خوو نەریتیان هەبوو كەلە هیچ ئاینێكی ئاسمانییەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، یەكێك لەو داب و نەریتانە ئەوە بوو كە كۆمەڵێك شتیان لە خۆیان حەرام كردبوو بە هۆی هەندێك بیر و بۆچوونی پڕ و پوچەوە كە شەیتان خستبوویە مێشكیانەوە، بۆ نموونە حوشتر كە هەر لە كۆنەوە گۆشتی خوراوە و سودی لێ وەرگیراوە، بەڵام عەرەبە بێ باوەڕەكان هەر لە خۆیانەوە چوار جۆر لە حوشتریان لەسەر خۆیان حەرام كرد بوو كە گۆشتەكەیان نەدەخواردو سودیان لێ وەرنەدەگرت، ئەوچوار جۆرەش بریتی بوون لە: ( بحيرة) واتە ووشترێك كە پێنج جار زابێت و كەرەتی پێنجەم بەچكەیەكی نێری بوو بێت، ئیتر گوێ یان دەقڵاشتەوە و بەرەڵایان دەكرد، هەروەها ( سائبة ) واتە وشترێك كە دە یان دوانزە جار بەمێ زابێت ) هەروەها ( وصيلة ) واتە وشترێك كە دوو زگ مێ زابێت، هەروەها ( حام ) واتە ووشترە نێرێك كە بۆ ئاوس كرنی مێكان دە جار كەڵكیان لێ وەرگرتبێت، وە عەرەبەكان دەیانووت ئەم چوار جۆرە خوا حەرامی كردووە لەسەرمان، بەڵام خوای گەورە هەم لەقورئاندا بە درۆیان دەخاتەوە ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ ١٠٣/المائدة.

وە هەم لەم فەرمودە قودسی یە پیرۆزەدا لە ڕێی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە موسڵمانان ڕادەگەیەنێت كە خوای گەورە ڕزقی حەڵاڵی داونەتێ بەڵام شەیتان ئەو خەڵكەی فریوداوە و حەڵاڵەكەی خوای گەورەی لێ حەرام كردوون، وە فەرمانی پێ كردوون كە شتانێك بكەن بە هاوتا و شەریكی خوای گەورە كە هیچ دەستەڵاتێكیان نی یە و ناتوانن سود و قازانج نەبەخۆیان نە بە خەڵك بگەیەنن، ئەمەش بەتایبەت لە قوربانی كردن و خێر كردندا ڕوودەدات، كەشەیتان ئەو خەڵكە وا فریو دەدات، لە كاتی خێرو قوربانیدا لە گەڵ ناوی خوادا ناوی كەسانی مردوو یان ناوی شێخ و مشایەخ یان ناوی تاغوت و بتەكان بهێنن و بەمەش دەیانكەن بە شەریكی خواو و لە بری ئەوەی خێریان دەست بكەوێت دوچاری خەشم و قینی خوای گەورە دەبن.

**دووەم** / پێغەمبەر(ﷺ) كە دەفەرموێت خوا سەیری زەوی كردووە ڕقی لە هەموو خەڵكەكەی بۆتەوە بە عەرەب و عەجەمەوە، جگە لە پاشماوەیەكی ئەهلی كتاب ئەوە مەبەست لێی پێش هاتنی ئیسلامە، بۆیە بەدوایدا دەفەرموێت (وە من تۆم بۆیە ناردووە هەتا تاقیت بكەمەوە و خەڵكیش بەتۆ تاقی بكەمەوە و كتێبم بەسەردا دابەزاندویت).واتە ئەو خەڵكەی پێش ئیسلام هەموو بت پەرست و

موشريك و خوا نەناس بوون بە عەرەب و عەجەمیەوە بۆیە خوا رقی لێیان بۆتەوە، وە تاك تاكەیەك لە ئەهلی كیتاب نەبێت كەس لە سەر زەویدا خوای تاك وتەنیای نەناسیوە.

**سێیەم/** مەبەستی فەرموودەكە لەوەی كە كتێبێكم بە سەردا دابەزاندویت (واتە قورئانی پیرۆز) كەئاو نایشۆرێتەوە، ئەوەیە كە ئەو قورئانە خەڵكی لە بەری دەكەن لەمێشك و دڵیاندا دەیپارێزن و نافەوتێت و لە ناو ناچێت، وە مەبەستیش لەوەی كە لەكاتی خەوو بەئاگابونیشدا دەیخوێنێتەوە ئەوەیە كە خوای گەورە ئاسانی كردووە و موسڵمان دەتوانێت لە هەموو كاتێكدا بیخوێنێتەوە و سودی لێ وەربگرێت.

**چوارەم/** خوای گەورە بە پێغەمبەری(ﷺ) راگەیاندووە كەدەبێت ئیسلام و موسڵمانان سەر بەرز و شكۆمەندبن، وە ستەم و دەست درێژی لە بێ باوەڕان قبوڵ نەكەن، وە فەرمانی پێ دەكات كە رووبەڕویان بێتەوە و هێز و لەشكر لە دژیان بەكار بهێنێت وە بەڵێنی پشتیوانی و كۆمەكیشی پێ دەدات.

## ( ٥ ) ( ئەو رۆژەی كە ئادەمی تێدا دروست كراوە )

**(١٠٨) ( حم ه )عَنْ أَبِى لُبَابَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُنْذِرِ قَالَ قَالَ النَّبِىُّ ( ﷺ ): ﴿ إِنَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ سَيِّدُ الأَيَّامِ وَأَعْظَمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَهُوَ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ يَوْمِ الأَضْحَى وَيَوْمِ الْفِطْرِ فِيهِ خَمْسُ خِلاَلٍ خَلَقَ اللَّهُ فِيهِ آدَمَ وَأَهْبَطَ اللَّهُ فِيهِ آدَمَ إِلَى الأَرْضِ وَفِيهِ تَوَفَّى اللَّهُ آدَمَ وَفِيهِ سَاعَةٌ لاَ يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا الْعَبْدُ شَيْئًا إِلاَّ أَعْطَاهُ مَا لَمْ يَسْأَلْ حَرَامًا وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ مَا مِنْ مَلَكٍ مُقَرَّبٍ وَلاَ سَمَاءٍ وَلاَ أَرْضٍ وَلاَ رِيَاحٍ وَلاَ جِبَالٍ وَلاَ بَحْرٍ إِلاَّ وَهُنَّ يُشْفِقْنَ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ أَنْ تَقُومَ فِيهِ السَّاعَةُ ﴾. (حسن) ينظر حديث رقم (٢٢٧٩) في صحيح الجامع**

ابی لبابە ی كوڕی عبد المنذر دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( رۆژی هەینی سەرداری رۆژەكانە و لە هەموشیان گەورەترە لای خوا، وە گەورەترە لای خوا لە رۆژی جەژنی قوربان و رۆژی جەژنی رەمەزانیش، وە پێنج تایبەتمەندی هەیە: خوا ئادەمی تێدا دروست كردووە، وە ئادەمیشی تێدا دا بەزاندۆتە سەر زەوی، وە خوا گیانی ئادەمیشی تێدا كێشاوە، وە ساتەوەختێكی تێدایە هەر بەندەیەك داوای هەرشتێك لە خوا بكات لەو ساتەدا دەیداتێ بەمەرجێك داوای شتێكی حەرام نەكات، وە قیامەتیش هەر لەو رۆژەدا هەڵدەستێت، وە نە هیچ فریشتەیەكی پایەدارو نە ئاسمان و نە زەوی و نە با و نە چیا و نە دەریا نییە ئیلا ترسی لەڕۆژی هەینی هەیە كە قیامەتی تیا هەستێت ).

## ( ٦ ) ( باسی دروست کردنی ئادەم سەلامی خوای لیٚ بیٚت )

( ١٠٩ ) ( م ) عن أبي هريرة: قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ آدَمَ عَلَى صُورَتِه طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا فَلَمَّا خَلَقَهُ قَالَ اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ النَّفَرِ وَهُمْ نَفَرٌ مِنَ الْمَلَائِكَةِ جُلُوسٌ فَاسْتَمِعْ مَا يُجِيبُونَكَ فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ قَالَ فَذَهَبَ فَقَالَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ فَقَالُوا السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ - قَالَ - فَزَادُوهُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ - قَالَ - فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا فَلَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الآنَ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابو هريرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( خوای گەورە ئادەمی لەسەر ئەو شێوەیە دروست کردووە کە لەسەری بوە، درێژی یەکەی شەست باڵ بووە، کاتێك کە دروستی کرد پێی فەرموو: بڕۆ سەلام لەو کۆمەڵە بکە، کۆمەڵێك لە فریشتەکان کە دانیشتبوون، وە گوێ بگرە بزانە چۆن وەڵامی سڵاوەکەت دەدەنەوە، ئیتر ئەوە سڵاوی خۆت و سڵاوی نەوەکانت دەبێت. فەرمووی: ئەویش ڕۆشت و وتی: السلام عليكم، ئەوانیش وتیان: السلام عليك ورحمه الله. فەرمووی فریشتەکان (ورحمه الله ) یان بۆ زیاد کرد، فەرمووی: هەر کەسێك کە دەچێتە بەهەشت لە سەر شێوەی ئادەم دەچێت، درێژی یەکەی شەست باڵ دەبێت، وە لەو کاتەوە هەتا ئێستا بەردەوام خەڵك بەرەو بچوك بوونەوە دەڕۆن و قەبارەیان کەمتر دەبێتەوە).

( ١١٠ ) ( البزار ) عن حذيفة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلُّكُم بَنو آدمَ وَ آدَمُ خُلِقَ مِنْ تُراب ، لَيَنْتَهِيَنَّ قَومٌ يَفْتَخِرونَ بِآبَائِهِم أَو لَيَكونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللهِ مِنَ الجُعْلَانِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٤٥٦٨ ) في صحيح الجامع

حذيفة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( هەمووتان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵ دروست کراوە، جا کەسانێك دەست هەڵدەگرن لە خۆ هەڵکێشان بە باو و باپیرانیان، یان لای خوا لە قالونچە سوك و کەم تر دەبن) .

( ١١١ ) ( ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مَسَحَ ظَهْرَهُ فَسَقَطَ مِنْ ظَهْرِه كُلُّ نَسَمَةٍ هُوَ خَالِقُهَا مِنْ ذُرِّيَّتِه إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَجَعَلَ بَيْنَ عَيْنَىْ كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ وَبِيصًا مِنْ نُورٍ ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى آدَمَ فَقَالَ أَىْ رَبِّ مَنْ هَؤُلَاءِ قَالَ هَؤُلَاءِ ذُرِّيَّتُكَ فَرَأَى رَجُلاً مِنْهُمْ فَأَعْجَبَهُ وَبِيصُ مَا بَيْنَ عَيْنَيْهِ فَقَالَ أَىْ رَبِّ مَنْ هَذَا فَقَالَ هَذَا رَجُلٌ مِنْ آخِرِ الأُمَمِ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ يُقَالُ لَهُ دَاوُدُ. فَقَالَ رَبِّ كَمْ جَعَلْتَ عُمْرَهُ قَالَ سِتِّينَ سَنَةً قَالَ أَىْ رَبِّ زِدْهُ مِنْ عُمْرِى أَرْبَعِينَ سَنَةً. فَلَمَّا انْقَضَى عُمْرُ آدَمَ جَاءَهُ مَلَكُ الْمَوْتِ فَقَالَ أَوَلَمْ يَبْقَ مِنْ عُمْرِى أَرْبَعُونَ سَنَةً قَالَ أَوَلَمْ تُعْطِهَا ابْنَكَ دَاوُدَ قَالَ فَجحد آدَمُ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ وَنَسِىَ آدَمُ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ وَخَطِئَ آدَمُ فَخَطِئَتْ ذُرِّيَّتُهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٢٠٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( کاتێك کە خوا ئادەمی دروست کرد، دەستی بە پشتیدا هێنا، ئیتر هەرچی ڕۆح لەبەر هەیە کە خوا دروستی کردووە لە نەوەی ئادەم هەتا ڕۆژی قیامەت هەمووی لە پشتی کەوتە خوارەوە، وە تروسکەیەك لە روناکی خستە نێو چاوانی هەموو یەکێکیانەوە، پاشان پیشانی ئادەمی دان، ئەویش وتی: ئەی پەروەردگارم ئەمانە کێن ؟ فەرمووی: ئەوانە نەوەکانی تۆن، ئەویش لەناویاندا پیاوێکی بینی بە تروسکەکەی نێو چاوی سەرسام بوو، وتی: ئەی پەروەردگارم ئەمە کێ یە ؟ خواش فەرمووی: ئەمە پیاوێکە لە کۆتایی ئومەتەکانە لە نەوەی تۆ پیێ ی دەڵێن داود، وتی: ئەی پەروەردگارم تەمەنیت چەند بۆ داناوە ؟ فەرمووی: شەست ساڵ، وتی: ئەی پەروەردگارم چل ساڵ لە تەمەنی منی بۆ بخەرە سەر، جا کاتێك کە تەمەنی ئادەم تەواو بوو فریشتەی مردن هاتە لای، ئادەمیش وتی: ئەی هێشتا چل ساڵ لە تەمەنم نەماوە ؟ ئەویش پێی ووت: ئەی ئەوە نەبوو بەخشیت بە داودی کوڕت)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئادەم نکوڵی کرد نەوەکەیشی بە دوایدا نکوڵیان کرد ،وە ئادەم لەبیری چووەوە نەوەکەشی بەدوایدا لەبیریان چووەوە، وە ئادەم هەڵەی کرد نەوەکەیشی بەدوایدا هەڵەیان کرد ).

(١١٢) ( ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ وَنَفَخَ فِيهِ الرُّوحَ عَطَسَ فَقَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ فَحَمِدَ اللَّهَ بِإِذْنِهِ فَقَالَ لَهُ رَبُّهُ يَرْحَمُكَ اللَّهُ يَا آدَمُ اذْهَبْ إِلَى أُولَئِكَ الْمَلاَئِكَةِ إِلَى مَلإٍ مِنْهُمْ جُلُوسٍ فَقُلِ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. قَالُوا وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. ثُمَّ رَجَعَ إِلَى رَبِّهِ فَقَالَ إِنَّ هَذِهِ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ بَنِيكَ بَيْنَهُمْ. فَقَالَ اللَّهُ لَهُ وَيَدَاهُ مَقْبُوضَتَانِ اخْتَرْ أَيَّهُمَا شِئْتَ قَالَ اخْتَرْتُ يَمِينَ رَبِّى وَكِلْتَا يَدَىْ رَبِّى يَمِينٌ مُبَارَكَةٌ. ثُمَّ بَسَطَهَا فَإِذَا فِيهَا آدَمُ وَذُرِّيَّتُهُ فَقَالَ أَىْ رَبِّ مَا هَؤُلاَءِ فَقَالَ هَؤُلاَءِ ذُرِّيَّتُكَ فَإِذَا كُلُّ إِنْسَانٍ مَكْتُوبٌ عُمْرُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ فَإِذَا فِيهِمْ رَجُلٌ أَضْوَؤُهُمْ أَوْ مِنْ أَضْوَئِهِمْ. قَالَ يَا رَبِّ مَنْ هَذَا قَالَ هَذَا ابْنُكَ دَاوُدُ قَدْ كَتَبْتُ لَهُ عُمْرَ أَرْبَعِينَ سَنَةً. قَالَ يَا رَبِّ زِدْهُ فِى عُمْرِهِ. قَالَ ذَاكَ الَّذِى كَتَبْتُ لَهُ. قَالَ أَىْ رَبِّ فَإِنِّى قَدْ جَعَلْتُ لَهُ مِنْ عُمْرِى سِتِّينَ سَنَةً قَالَ أَنْتَ وَذَاكَ. قَالَ ثُمَّ أُسْكِنَ الْجَنَّةَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أُهْبِطَ مِنْهَا فَكَانَ آدَمُ يَعُدُّ لِنَفْسِهِ. قَالَ فَأَتَاهُ مَلَكُ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُ آدَمُ قَدْ عَجِلْتَ قَدْ كُتِبَ لِى أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ بَلَى وَلَكِنَّكَ جَعَلْتَ لاِبْنِكَ دَاوُدَ سِتِّينَ سَنَةً فَجَحَدَ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ وَنَسِىَ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ. قَالَ فَمِنْ يَوْمِئِذٍ أُمِرَ بِالْكِتَابِ وَالشُّهُودِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٢٠٨ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( کاتێك کە خوا ئادەمی دروست کرد و ڕۆحی کرد بەبەردا، ئادەم پژمی و ووتی: الحمد لله ، بە وویستی خوا سوپاسی خوای کرد، پەروەردگاریشی پێی فەرموو ئادەم خوا رەحمت پیێ بکات، ئەی ئادەم بڕۆ بۆ لای ئەو کۆمەڵە فریشتەیە– کۆمەڵێك بوون لە فریشتەکان دانیشتبوون – و بڵێ السلام علیکم، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە ووتیان: وعلیك السلام ورحمه الله. پاشان ئادەم گەڕایەوە لای پەروەردگاری، ئەویش پێی فەرموو: ئەوە سڵاوی خۆت و سڵاوی نەوەکانت دەبێت لە نێوان خۆیاندا، ئینجا خوای گەورە هەردوو دەست نوقاندبوو (داخستبوو) وە بە ئادەمی فەرموو: بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە، ئەویش وتی: دەستی ڕاستی پەروەردگارم

هەڵبژارد وە هەردوو دەستەكەی پەروەردگاریشم هەر راستە و پیرۆزە، پاشان دەستی كردەوە بینی ئادەم و نەوەكانی تێدا بوو ئەویش وتی: ئەی پەروەردگارم ئەوانە چین ؟ فەرمووی: ئەوانە نەوەكانتن، وە بینی كە هەموو ئینسانێك تەمەنەكەی خۆی لە نێو چاوانیدا نوسرابوو، وە لە ناویاندا پیاوێكی بینی كە زۆر نورانی بوو وتی: ئەی پەروەردگارم ئەمە كێ یە ؟ فەرمووی: ئەوە داودی كوڕتە و چل ساڵ تەمەنیشم بۆ نوسیوە، وتی: ئەی پەروەردگارم تەمەنی بۆ زیاد بكە، فەرمووی: هەر ئەوەندەی بۆ نوسراوە، وتی: ئەی پەروەردگارم من ئەوا شەست ساڵ لە تەمەنی خۆمی دەدەمێ، فەرمووی: با ئەوە بۆ تۆ بێت. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پاشان لە بەهەشت نیشتەجێ كرا ئەوەندەی كە خوا ویستی، پاشان لەوێ دابەزێنرا، وە ئادەم تەمەنی خۆی دەبژارد و حسابی دەكرد، فەرمووی: ئینجا فریشتەی گیان كێشان هاتە لای، ئادەمیش پێی ووت: ئەوە پەلەت كردووە من هەزار ساڵم بۆ نوسراوە، وتی: بەڵێ بەڵام تۆ شەست ساڵیت داوە بە داودی كوڕت. ئیتر ئادەم نكوڵی كرد نەوەكانیشی نكوڵی یان كرد وە ئادەم لە بیری چووەوە نەوەكانیشی بە دوایدا لەبیریان چوو، فەرمووی: ئیتر لەو رۆژەوە فەرمان كرا كەشت بنوسرێت و شایەت هەبێت ).

(١١٣) ( حم م ) عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) قَالَ: ﴿ لَمَّا صَوَّرَ اللَّهُ آدَمَ فِى الْجَنَّةِ تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَتْرُكَهُ فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ يَنْظُرُ مَا هُوَ فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقًا لاَ يَتَمَالَكُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٢١٠ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( كاتێك كە خوا وێنەی ئادەمی كێشا لە بەهەشتدا، بەجێی هێشت ئەوەندەی كە خۆی ویستی لەسەر بوو بەجێی بهێڵێت، ئیبلیسیش هەر دەورو خولی دەداو بەدەوریدا دەسوڕایەوە هەتا ببینێت ئەمە چی یە ؟ كاتێك كە بینی ناوەكەی بۆشە ، زانی كەدروست كردنێكی وا دروست كراوە كە خۆی ناگرێت ).

(١١٤) ( حب ك ) عن انس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ لَمَّا نُفِخَ فِي آدَمَ الروحَ مَارَتْ وَ طَارَتْ فَصَارَتْ فِي رَأسِهِ فَعَطَسَ فَقَالَ: الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمِيْنَ فَقَالَ اللهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٢١٦ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( كاتێك كە ئادەم رۆحی بە بەردا كرا، رۆحەكە بە جەستەیدا سوڕایەوە و هاتو چۆی كرد و چووە ناو سەریەوە، ئەویش پژمی و وتی: -الحمد لله رب العالمين - سوپاس بۆ خوا پەروەردگاری جیهانەكان خواش فەرمووی: - يرحمك الله- خوا رەحمت پێ بكات ).

(١١٥) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ (ﷺ) قَالَ: ﴿ لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَفْتَخِرُونَ بِآبَائِهِمُ الَّذِينَ مَاتُوا إِنَّمَا هُمْ فَحْمُ جَهَنَّمَ أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللَّهِ مِنَ الْجُعَلِ الَّذِى يُدَهْدِهُ الْخِرَاءَ بِأَنْفِهِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ إِنَّمَا هُوَ مُؤْمِنٌ تَقِىٌّ وَفَاجِرٌ شَقِىٌّ النَّاسُ كُلُّهُمْ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَابٍ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٥٤٨١ ) في صحيح الجامع

ابوهریره دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( کەسانێك دەست هەڵدەگرن لە خۆ هەڵکێشان بە باو و باپیرانیانەوە کە مردوون کە هیچیش نین جگە لە خەڵوزی دۆزەخ نەبێت، یان لای خوا لەو قالونچەیە سوکتر و کەمتر دەبن کە بە لوتی خۆی پیسایی خڕ دەکاتەوە، وە خوای گەورە فیز و دەمار گیری و خۆهەڵکێشان بە باو و باپیرانی سەردەمی نەفامیی لەسەر لابردوون و نەیهێشتووە، ئیتر ئەو خەڵکە یەکێك لە دووشتن: یان ئیمانداریکی لە خوا ترس ، وەیان خراپەکارێکی لە خوا عاسی، ئەو خەڵکە هەموویان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵ دروست کراوە ).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکان :

(ا) (خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ) واتە خوای گەورە ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردووە. زاناکان دەفەرموون لەسەر شێوەی خۆی دروستی کردووە ، مەبەست پێی ئەوەیە کە لەسەر شێوەی ئادەم خۆی دروست بووە هاتۆتە بوون، بە واتایەکی تر، ئادەم هەر یەکەم جار کە دروست بوە لەسەر ئەو شێوەیە بووە کە بالآی شەست باڵ درێژ بووە و مرۆڤێکی تەواو و کامڵ بووە نەك وەك باقی مرۆڤ کە لەسەرەتادا دروست دەبێت نوتفەیەکە و پاشان دەبێت بە (علقة) و پاشان دەبێت بە(مضغة) و پاشان لە ناوسکی دایك دا پێکهاتەی لەشی تەواو دەبێت و گیانی بەبەردا دەکرێت و پاشان دێتە دنیاوە و لەسەرەتادا منداڵێکی ساوایە و شیر دەخوات و پاشتر گەورە دەبێت و دەبێتە هەرزەکار و پاشان گەنج و پاشان پیر و بەم جۆرە قۆناغ بە قۆناغ دەگۆڕێت و لەهەر قۆناغێکیشدا شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام ئادەم هەر لەیەکەم جاری دروست بوونی یەوە لەسەر ئەو شێوەیە خوای گەورە دروستی کردووە بەبێ گۆڕانکاری و تێپەڕبوون بەو قۆناغانەدان.

(ب) ئەو ئادەمەی کە باوە گەورەی هەموو مرۆڤایەتییە و قورئان و فەرموودەکان بەسەر هاتەکەیمان بۆ دەگێڕنەوە، ئادەمێکە کە خوای گەورە راستە و خۆ لە گڵ و خۆڵ دروستی کردووە و لە هیچ دایك و باوکێك نەکەوتۆتەوە، بەڵکو هەر لەسەرتای دروست بونی یەوە خوای گەورە بە مرۆڤێکی کامڵ دروستی کردووە و ئەقڵ و تێ گەیشتنی پێ بەخشیوە و توانای قسە کردن و ژماردن و ئازادی هەڵبژاردنی پێ داوە و پاشانیش لە بەهەشتدا نیشتەجێ کراوە و دوا تریش هێنراوەتە سەر زەوی و گرۆهی مرۆڤایەتی لی کەوتۆتەوە، وە ئەو ئادەمە بالآی شەست باڵ بەرز بووە و تەمەنیشی ٩٤٠ یان ٩٦٠ ساڵ ژیاوە، وە لەو کاتەوە هەتا ئێستا مرۆڤ رۆژ لە دوای رۆژ هەم بالأو قەلأفەتیان کەمتر و بچوکتر دەبێتەوە، وە هەم تەمەنیشیان کورتتر دەبێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە مادییەکان پروپاگەندەی بۆ دەکەن کە گوایا مرۆڤی ئەمڕۆ لە مەیمون و سەگسار کەوتونەتەوە و مرۆڤ لەسەرەتادا ئاژەڵێکی نەفام بووە و بە تێپەڕ بوونی کات فامی کردۆتەوە وعەقڵی پەیدا کردوە و فێری قسە کردن و پێکەوە ژیان بووە. بەڵێ پێ دەچێت خوای گەورە لە پێش دروست کردنی ئادەمدا چەند جۆرە مەخلوقاتێکی جۆراو جۆری لەسەر زەویدا دروست کرد بێت کە تاڕادەیەك فام و تێگەیشتنیان هەبوو بێت و یان توانای قسەکردن و بە

کۆمەڵ ژیانیان هەبوبێت وەك و توخمی نیاندەرتاڵ کە زاناکان دەڵێن بەهاتنی مرۆڤی نوێ ئەو توخمە فەوتاوە و نەماوە بەڵام قورئانەکەی خوای گەورە و فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو راستی یەمان بۆ دوپات دەکەنەوە کە ئەم مرۆڤەی ئەمڕۆ هەیە لە هیچ کام لەو توخمانەی پێشتر نەکەوتۆتەوە و وەچەی ئەوان نییەو رەگەز و توخمێکی جیاوازە و سەرەتای دروست بونەکەشی لەسەر زەویدا نەبووە بەڵکو لە شوێنێکی تر بووە کە پێی دەوترێت بەهەشت ، وە لەوێ وە ئەم مرۆڤە دابەزێنراوەتە سەر زەوی و زەوی ئاوەدان کردۆتەوە وە ئەم راستییەش لە لایەن زانایانی (کرۆمۆسۆم و جین ) ەکانەوە سەلمێنراوە و دەڵێن کە پێکهاتەی جینی مرۆڤ زۆر جیاوەزە لەگەڵ پێکهاتەی جینی سەرجەم رەگەز و توخمەکانی تر لەگیانلەبەران، وە هەرگیز پێکهاتەی جینەکانی مرۆڤ ئەوە ناسەلمێنن کە ئەو توخمەی ئێستا پێی دەوترێت مرۆڤی نوێ لە هیچ کام لە توخم و رەگەزەکانی ترەوە سەرچاوەی گرتبێت، لەوەش گرنگتر و سەرسوڕهێنەرتر کە واقی سەرجەم زانایانی انثروبولوجیا ( زانستی رەگەز و توخم) ی وڕماندووە ئەو تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوە زانسی یە بوو کە کۆمەڵێك لە زاناکانی ( جین و کرۆمۆسۆمەکان ) پێکەوە لەیەك کاتدا لە چەند زانکۆیەکی ئەوروپاو ئەمریکا دا پێی هەستان، ئەویش بەوەرگرتنی نموونە لە کرۆمۆسۆمی مرۆڤ لە هەموو شوێنە جیاجیاکانی زەوی و بە هەموو جۆرەکانیانەوە ( سپی پێستەکان – رەش پێستەکان –خەڵکانی چین و یابان – ئاسیکیمۆکان، هندی یە سورەکان ....) بۆ ئەوەی لە رێگەی هێڵکاری جینەکانیانەوە تەمەنی سەرهەڵدانی ئەم توخمەی کە پێی دەوترێت مرۆڤ دیاری بکەن و بزانن سەرەتای دەست پێ کردنەکەی لە کەیدا بووە، وە لەبەر ئەوەی کە ئەنجامێکی سەر سوڕهێنەی لێ دەردەچوو کە ئەوان چاوەڕوانیان نەدەکرد، چەند جارێك تاقی کردنەکەیان دوبارە دەکردەوە، وە لە چەند شوێنی جیاوازدا بەڵام هەرهەمان ئەنجام دەردەچوو کە ئەویش ئەوە بوو:

١– ئەو توخمەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت مرۆڤ لەسەر زەویدا، بە هەموو رەگەزەکانییەوە لە یەك بەرەبابەوە رەچەڵەکیان گرتووە.

٢– بە هیچ شێوەیەك ناگونجێت کە مرۆڤ درێژکراوەی هیچ کام لە توخمی گیانلەبەرەکانی تری سەر زەوی بێت.

٣– بەهیچ جۆرێك ناگونجێت کەتەمەنی سەر هەڵدانی ئەو توخمەی کەپێ ی دەڵێن مرۆڤ لەسەد هەزار ساڵ زیاتر بێت بەڵکو کەمتریشە .

کە ئەم راستی یانەش هەموو ئەو درۆ شاخدارانە ئاشکرا دەکات کە زیاتر لەسەدەیەك خەڵکی پێ فریو دەدەن کە گوایا چەند ملیون ساڵێکە مرۆڤ وورده ووردە لە مەیمونەوە (تطور)ی کردووە تا گەیشتوەتە مرۆڤی ئەمڕۆ وە ئەم ئەنجامە نوێیەی زانایانی بواری جینەکان پێی گەیشتوون، پێ دەچێت کە هێندە جێ ی متمانە بێت، کە وای کردووە زانکۆی بەناوبانگی ویلایەتی (إلینوی) ئەمریکا بڕیار بدات، ئەم دەرەنجامە زانستییە نوێیە لە خوێندنگاکەیاندا بخرێتە جێ ی بیردۆزە کۆنەکەی داروین و خوێندکارانی ئەو زانکۆیە لەسەر ئەم بیردۆزە نوێیە کار بکەن، وە گومانمان نییە و دڵنیاشین لەوەی کە رۆژانی داهاتوو زیاتر راستی هەواڵەکانی قورئان و فەرمودەکان دەسەلمێنن.

(ج) هەر ئەو روداو و بەسەرهاتانەی کەلەم کۆمەڵە فەرمودەدا هاتوون هەموویان دەچنە ریزی ئەو هەواڵە غەیبیانەوە کە خوای گەورە لە ریّ ی پێغەمبەکەیەوە پیّ ی راگەیاندوین. وە دەبێت وەك و خۆیان باوەڕیان پیّ بکەین و لێکدانەوەی دوور لە واقعیان بۆ نەکەین.

بۆ نمونە کاتێك کە خوای گەورە دەستی بە پشتی ئادەمدا هێناوە و هەموو نەوەکانی لیّ خستۆتە خوارەوە، پاشان خوای گەورە هەردوو دەستی خۆی بە نوقاوی (داخراوی) پیشانی ئادەم دەدات و پیّ ی دەفەرموێت بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە، پاشان خوای گەورە لە دەستی راستی خۆیدا ئادەم و هەموو نەوەی ئادەم پیشانی ئادەم دەدات، وە هەریەکیش لەنەوەی ئادەم تەمەنی خۆی لە نێو چاوانیدا نوسراوە، ئەم روداوانە هەموو لە پێش ئەوەی کە ئادەم بخرێتە بەهەشتەوە رووی داوە وەك لە فەرمودەی ژمارە (١١٢) دا هاتووە کە لە دوای ئەم روداوانە دەفەرموێت ( قم اسکن الجنة ). کەواتە هەر لەو کاتەوە ئادەم پیّ ی راگەیندراوە کە دێتە سەر زەوی و نەوە و وەچەکانی خۆیشی پیشان دراوە و پاشانیش پەیمان نامەی گشتی یان لیّ وەرگیراوە و شایەتی پیّ داون لەسەر خۆیان کە ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم، ئەوانیش ووتویانە بەڵێ ) هەروەك لە فەرموودەی ژمارە (٣١و ٣٢) هاتبوو، بەڵام هەر وەك لە فەرمودەکاندا هاتووە ئادەم ئەمانەی لەبیر کرد بۆیە نەوەکانیشی بە دوایدا لەبیریان کردووە، وە ئادەم نکوڵی کرد بۆیە نەوەکانیشی بە دوایدا نکوڵی لەو راستیانە دەکەن، خوای گەورەش خۆی لە هەموو کەس زاناترە.

## ( ٧ )( ئەوانەی کە خوای گەورە رووی وەرگێڕاون )

**(١١٦) ( حم م ) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إنّ اللّهَ لَمْ يَجْعَلْ لِمَسْخٍ نَسْلاً وَلاَ عَقِبًا وَقَدْ كَانَتِ الْقِرَدَةُ وَالْخَنَازِيرُ قَبْلَ ذَلِكَ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (١٨٠٧) في صحيح الجامع**

إبن مسعود دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (خوای گەورە ئەگەر رووی کەسێکی وەرگێڕابێت نەیهێشتووە نەوە و وەچەی لیّ بکەوێتەوە، مەیمون و بەرازیش لە پێش ئەوەدا هەر هەبوون ).

تێبینی/ هۆی ووتنی ئەم فەرمودەیە ئەوە بوو پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە ئایا راستە ئەڵێن مەیمون و بەراز لە پێشدا مرۆڤ بوون بەڵام خوای گەورە رووی وەرگێڕاون. ئەویش لە وەڵامدا ئەو ڕاستی یەی بۆ روون کردەوە کە ئەگەر خوای گەورە رووی هەر کەسێك وەرگێڕێت نایەڵێ هیچ وەچەیەکی لیّ بکەوێتەوە ،وە مەیمون و بەرازیش لە پێش دروست کردنی توخمی مرۆڤدا ئەوان هەر هەبون .

## ( ٨ )( دا بەشکردنی خەڵك بۆ چاك و خراپ )

**(١١٧) ( حم طب بزار إبن عساكر ) عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ عَنِ النَّبِىِّ (ﷺ) قَالَ: ﴿خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ حِينَ خَلَقَهُ فَضَرَبَ كَتِفَهُ الْيُمْنَى فَأَخْرَجَ ذُرِّيَّةً بَيْضَاءَ كَأَنَّهُمُ الذَّرُّ وَضَرَبَ كَتِفَهُ الْيُسْرَى فَأَخْرَجَ ذُرِّيَّةً سَوْدَاءَ كَأَنَّهُمُ الْحُمَمُ فَقَالَ لِلَّذِي فِى يَمِينِهِ إِلَى الْجَنَّةِ وَلاَ أُبَالِي وَقَالَ لِلَّذِي فِى كَفِّهِ الْيُسْرَى إِلَى النَّارِ وَلاَ أُبَالِي﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٤) في صحيح الجامع**

ابو الدرداء دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ( خوا ئادەمی دروست کرد، پاشان کێشای بە شانی راستیدا و نەوەیەکی سپی لێ دەرهێنا کە وەك مێرووڵەی سپی وابوون ، وە کێشای بەشانی چەپیدا و نەوەیەکی رەشی لێ دەرهێنا کە وەك و خەڵوز وابوون. فەرمووی: ئەوانە بۆ بەهەشت و باکم نی یە، وە ئەوانە بۆ ئاگر و باکم نی یە ).

(١١٨) ( **عن طب** ) **عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ( ﷺ ): ( خَلَقَ اللَّهُ يَحْيَى بنَ زَكَرِيَّا فِي بَطْنِ أُمِّهِ مُؤْمِنًا، وَخَلَقَ فِرْعَوْنَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ كَافِرًا )**. .( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٧ ) في صحيح الجامع

## ( ٩ ) ( خوای گەورە پێکهاتەکانی زەوی یەك لە دوای یەك دروست کردوون )

(١١٩) ( **حم م** ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ( ﷺ ): ﴿ **خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الأَحَدِ وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الاثْنَيْنِ وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الأَرْبِعَاءِ وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ وَخَلَقَ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فِي آخِرِ الْخَلْقِ وَفِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إِلَى اللَّيْلِ** ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٥ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( خوای گەورە لە رۆژی شەممەدا خاکی دروست کرد، وە لە رۆژی یەکشەمەدا چیاکانی تێدا دروست کرد. وە دارو درەختی لە رۆژی دوو شەمەدا دروست کرد، وە ناخۆشیی (لە ریوایەتێکی تردا تاریکی ) لە رۆژی سێ شەممەدا دروست کرد، وە رووناکی لە رۆژی چوار شەممەدا دروست کرد، وە لە رۆژی پێنج شەممەدا گیان لەبەرانی تێدا بلأوکردەوە، وە ئادەمی – سەلامی لەسەر بێت– دروست کرد لە پاش عەسری رۆژی هەینی، لە پاش هەموو دروست کراوەکانی تر لە ئاخر سەعاتەکانی رۆژی هەینی دا، لە نێوان عەسردا تا شەو ).

## لێکدانەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرموودە پیرۆزە دەتوانین بە دوو شێوە لێك بدەینەوە، شێوەی یەکەمیان مانا سادە و رواڵەتی یەکەیەتی کە خوای گەورە لە هەر رۆژێك لە رۆژەکانی هەفتەدا بەشێك لە دروست کراوەکانی خۆی لەسەر زەویدا دروست کردووە و لە رۆژی شەممەوە دەستی پێ کردووە و لە ئێوارەی هەینی دا کۆتایی هاتووە. بەلأم لێکدانەوەی دووەم لێکدانەوەیەکی قووڵ و زانستی یانەیە بۆ فەرموودەکە ، وەپێش ئەوەی بچینە ناو لێکدانەوەی دووەمەوە پێم باشە ئاورێك بەلای زانستی هاوچەرخدا بدەینەوە و بزانین چۆن باسی دروست بوونی گۆی زەویمان بۆ دەکات.

( زاناکان پێ یان وایە کەتەمەنی گۆی زەوی نزیکەی چوار هەزار ملیۆن ساڵە، دەڵێن لە پێشدا تۆ پەڵێك ئاگری شل بووە لە چەشنی ئەو ئاگرەی کە ئێستا لە ناو جەرگەی زەویدایە و جار جار لە گرکانەکانەوە دەیبینین دێتە دەرەوە، وە لە پێکهاتەکەیدا برێکی زۆر هایدرۆجین و ئۆکسجین هەبووە کە

بە هۆی گەرما و پەستانی زەوی خۆیەوە کارلێکیان کردوە و ئاویان پێك هێناوە و ئاوەکەش بەهۆی گەرمی زەوی یەوە بووە بەهەڵم و هەڵمەکەش بە رادەیەك زۆر بووە کە بە ئەستوری سەدان کیلۆمەتر بە ئاسمانی دەوری زەویدا ئۆقرەی گرتووە پاشان زەوی وورده وورده بەرەو سارد بوونەوە رۆشتوە و هەڵمەکەش بووەتە باران و دابەزیوەتە سەر زەوی ئەمەش وای کردوە کە زووتر روکەشی گۆی زەوی سارد بێتەوە و بەم جۆرە سەر رووی زەوی هەمووی بووە بە ئاوو دەریایەکی یەك پارچە، وە پاش ئەوە کەم کەم ووشکایی و خاك لەناو دەریاکەوە سەری هەڵداوە و سەرەتا بەشێوەی دورگەی بچوك بچوك بووە و پاشان زیادی کردووە هەتا روبەرێکی بەرفراوان لە خاك و ووشکایی دروست بووە و کیشوەرەکانی لێ پێك هاتووە وە ئەو خاکەی کە دروست بوو بەردەوام لە رۆچوندا بوو هەتا چیاکان دروست بوون، وە بە دروست بوونی چیاکان خاکی سەر رووی زەوی چەسپانێکی زیاتری بەخۆیەوە بینی کە وای لێ کرد شیاو بێت و لەبار بێت بۆ زیندەگی گیان لەبەران، وە لە سەرەتادا ژیان لەسەر رووی زەوی تەنها روەکیی بوو کە لەقەوزەوە دەستی پێ کرد و سەرتاپای وشکانی گرتەوە و پاشان گژو گیاو جۆرەکانی تری رووەك پەیدا بوو تا گەیشتە دارو درەختی چڕ و بەرز، وەتا ئەم کاتانەش خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا تەواو جێگیر نەبوو بوو بەڵکو بە خێرایی یەکی زۆر دەسوڕایەوە وە چینەکانی هەواش بەم شێوازەی ئێستایان تەواو بە دەوری زەویدا ئۆقرەیان نەگرتبوو وە گڕکانی زۆر و بەردەوام لەسەر گۆی زەوی رووی دەدا، کە ئەمانەش تا رادەیەك لێڵی و تاریکی یان بە ئاسمانی زەوی بەخشیبوو، بەڵام داپۆشینی زەوی بە رووەك وورده وورده وای کرد کە لە رێ ی کرداری (رۆشنە پێکهاتنەوە) ئۆکسجینێکی زۆر لە هەوادا دروست ببێت و پاشان بە تێپەڕ بوونی دەیان ملیۆن ساڵ چینەکانی هەوا بە دەوری زەویدا شێوەی چەسپاوی خۆیان وەرگرت و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە تیشکی خۆر لە هەوادا پەرش ببێت و روی زەوی رووناك ببێتەوە وسوڕانەوەی زەویش بە دەوری خۆیدا خێرایی‌یەکی چەسپاوی وەرگرت و بەمەش شەو و رۆژ لەسەر زەویدا پەیدا بوو وە ئەویش شێوازێکی چەسپاوی وەرگرت، ئیتر بە تەواوەتی زەوی شیاو و رەخساو بوو بۆ دروست بوونی گیان لەبەران وە بە درێژایی سەدان ملیۆن ساڵ گیانلەبەران بە هەموو جۆرە جیاوازەکانییەوە سەر زەوی یان ئاوەدان کردبۆوە، پاش ئەم هەموو گۆڕانکاری و روداوانە وەپاش تێپەڕبوونی چوار ملیار ساڵ ئنجا مرۆڤ لەسەر زەویدا سەری هەڵدا و دروست بوو کە هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە ).

ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی قۆناغەکانی ساز بوونی زەوی و دروست بوونی ژیان لەسەری لە روانگەی زانستی نوێ وە.

جا ئەگەر ئێستا بگەڕێنەوە خزمەت فەرمودەکە و بەم چاوە زانستی یە نوێ یە سەیری بکەین و خوێندنەوەیەکی هاو چەرخانەی بۆ ئەنجام بدەین دەتوانین بڵێین کە پێغەمبەر ﷺ بە وورد ترین شێوە باسی قۆناغەکانی دروست بوونی لەسەر زەویدا بۆ کردوین کە بێ هیچ جیاوازی یەك لەگەڵ زانستی هاوچەرخدا یەکدەگرێتەوە، وە تەنها جیاوازی یەك کە لە مەسەلەکەدا هەبێت ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ قسەی بۆ کەسانێك کردووە کە لە پێش هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەو بەردا ژیاون وە بە زمانی خۆیان قسەی بۆ کردوون ، بۆیە قۆناغەکانی دروست بوونی لەسەر زەویدا بەسەر رۆژەکانی هەفتەدا بۆ دابەش

کردوون هەتا لێ ی تێبگەن ( نحن معاشر الانبياء أُمِرْنا أن نُكَلِّمَ الناسَ على قدر عُقولِهم). واتە ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێ کراوە کە قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەین بەو رادەیەی کە عەقڵیان وەری دەگرێت ).

دەنا هەرکەس لە فەرمودەکە ورد بێتەوە دەبینێت کەلە فەرمودەکەدا هاتووە کە خوای گەورە لە چوار شەمەدا رووناکی بەزەوی بەخشیوە دەی ئەگەر پێشی ئەوە رووناکی نەبووبێت کەواتە شەو ورۆژیش نەبووە و کەواتە رۆژانی هەفتەش نەبوون ئەی ئیتر چۆن لە پێش ئەوەدا باسی شەممە و یەك شەمە و دوو شەم دەکات، بەلاّم نەخێر مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەکەدا ئەو رۆژانی هەفتەیە نەبووە کە خەڵك پێ ی ئاشنایە، بەڵکو کورتەی مانای فەرمودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر تەمەنی زەوی بکەین بە حەوت قۆناغەوە یاخود تەمەنی زەوی بە هەفتەیەك بشوبهێنین ئەوا لە قۆناغی یەکەم یان لە رۆژی یەکەمدا ووشکایی دروست بووە پاشانیش قۆناغەکانی تر لە رۆژەکانی تردا بە دوایدا، وە ئەوەش بەرنامەیەکی زانستیم وە بیر دەهێنێتەوە کە لەسەرەتای کردنەوەی کەناڵی تەلەفزیۆنی (الحرة) دا پێشکەش کراو تازەترین بۆچونی زاناکانی لە خۆ گرتبوو سەبارەت بە چۆنیەتی دروست بوونی زەوی و ئەو قۆناغانەی کە پیایدا تێ پەڕیوە، وە بەرنامەکە تەمەنی گۆی زەوی شوبهاندبوو بە ٢٤ کاتژمێر، وە قۆناغەکانی دروست بوونیشی لەسەر زەوی بە پێ ی ئەو ٢٤ کاتژمێرە دابەشکردبوو کە دروست بوونی مرۆڤ تیایدا دەکەوتە چرکەکانی کۆتاییەوە، هەروەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) خوڵقاندنی ئادەمی خستۆتە ساتە وەختەکانی کۆتایی هەفتەوە پێش ئاوابوونی خۆری رۆژی هەینی، وە من پێم وایە کە ئەمە لێکدانەوەی راست و دروستی فەرمودەکەیە، وە بەهەمان شێوەیش دەتوانین کە لەو ئایەتە قورئانی یە پیرۆزانەش تێ بگەین کە باس لە دروست کردنی زەوی و ئاسمانەکان دەکەن لە شەش رۆژدا کە مەبەست پێ یان شەش قۆناغە کە ماوەی هەر قۆناغێکیان خوا نەبێت کەس نایزانێت – نەك شەش رۆژ لە رۆژەکانی سەر زەوی خۆمان، چونکە لە پێش دروست کردنی زەوی و ئاسمانەکاندا شەو و رۆژ هەر نەبووە، هەتا ئێمە بە شەو و رۆژی خۆمان بیان پێوین، خوای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە.

## ( ١٠ )( بەش بەش کردنی ڕحمەت )

(١٢٠) ( م ت ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) :﴿خَلَقَ اللَّهُ مِائَةَ رَحْمَةٍ فَوَضَعَ رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ خَلْقِهِ يَتَرَاحَمُونَ بِهَا وَعِنْدَ اللَّهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ رَحْمَةً﴾ .(صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٦) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : (خوای گەورە سەد ڕەحمەتی دروست کردووە ،یەك ڕحمەتیانی لە نێوان دروست کراوەکانیدا دانا هەتا ڕحمی پێ بە یەکتر بکەن ، وەنەوەدو نۆ بەشیشی لای خوای گەورە خۆیەتی ).

## ( ١١ ) ( فریشتەی هەورە بروسکە )

**(١٢١) ( ت ) عن ابن عباس قال قال رسول الله (ﷺ): ﴿الرَعْدُ مَلَكٌ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ مُوَكَّلٌ بِالسَّحَابِ مَعَهُ مَخَارِيقُ مِنْ نَارٍ يَسُوقُ بِهَا السَّحَابَ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ﴾** .(حسن) ينظر حديث رقم (٣٥٥٣) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:( هەورە بروسکە فریشتەیەکە لە فریشتەکان ، هەوری پێ سپێردراوە ،قامچی ئاگرینی پێیە ، هەوری پێ لێ دەخوڕێت بەرەو هەر شوێنێك کە خوای گەورە بیبەوێت ) .

## ( ١٢ ) ( - با - لە ڕحمەتی خوایەوە )

**(١٢٢) ( خد ك ) عن أبي هريرة قال قال رسول الله(ﷺ):﴿ الرِّيحُ مِنْ رَوحِ اللهِ تَعَالَى تَأْتِي بِالرَحْمَةِ وَتَأْتِي بِالعَذابِ فَإذا رَأَيْتُمُوها فَلا تَسُبُّوها واسأَلُوا اللهَ خَيْرَهَا وَاسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا ﴾**. .(صحيح) ينظر حديث رقم (٣٥٦٤) في صحيح الجامع

ابوهريرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:( -با- لە ڕەحمی خوای گەورەوەیە ،ڕەحمەت دێنێ و ئەشکەنجەش دێنێ ، جا کە بینیتان جوێنی پێ مەدەن ،وە داوای خێرەکەی لە خوا بکەن وە پەناش بە خوا بگرن لە خراپەو زیانی ) .

## ( ١٣ ) ( ئەو چارەنوسەی کە پێشتر بڕاوەتەوە )

**(١٢٣) ( طب ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ):﴿ فَرَغَ اللهُ إلى كُلِ عَبْدٍ مِنْ خَمْسٍ: مِنْ عَمَلِهِ وَ أَجَلِهِ وَ رِزْقِهِ وَ أَثَرِهِ وَ مَضْجَعِهِ ﴾** .(صحيح) ينظر حديث رقم (٤٢٠٢) في صحيح الجامع

أبي الدرداء دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( خوا بۆ هەموو بەندەیەك پێنج شتی بڕاندۆتەوە: کارو کردەوەکانی و ئەجەلەکەی و رزقەکەی و نەوە و پاشماوەکەی و شوێنی مردنەکەی ).

**(١٢٤) ( حم طب ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ فَرَغَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ إلى كُلِ عَبْدٍ مِنْ خَمْسٍ: مِنْ أَجَلِهِ وَ رِزْقِهِ وَ أَثَرِهِ وَ مَضْجَعِهِ وَ شَقِيٍ أَوْ سَعِيدٍ ﴾**.(صحيح) ينظر حديث رقم (٤٢٠١) في صحيح الجامع

أبي الدرداء دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( خوا بۆ هەر بەندەیەك پێنج شتی بڕاندۆتەوە، ئەجەلەکەی و رزقەکەی و ئەوەی لە پاش خۆی بەجێ ی دەهێڵێت و شوێنی بەخاك سپاردنەکەی وە خراپ و و لەخواعاسی یە یان چاك و خواناسە ).

(١٢٥) (إبن عساكر ) عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَرَغَ اللّٰه مِنْ أرْبَعٍ: مِنَ الخُلُقِ وَ الخَلْقِ وَ الرِّزقِ وَ الأجَلِ ﴾.(صحيح) ينظر حديث رقم (٤٢٠٣) في صحيح الجامع

انس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ( خوا چوار شتی براندۆتەوە: خووڕەوشت و شێوە و روخسار و رزق و ئەجەل).

(١٢٦) (طب) عن إبن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَرَغَ اللّهُ من المَقادِيرِ وَ أُمورِ الدُنيا قَبْلَ أن يَخلقَ السَّمواتِ وَ الأرض بِخَمْسِين ألفَ سَنَة ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٢٠٤) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ( خوا كێشانە و پێوانە و كاروباری دونیای براندۆتەوە پێش ئەوەی كە ئاسمانەكان و زەوی دروست بكات بە پەنجا هەزار ساڵ ).

(١٢٧) (حم ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَدَّرَ اللّهُ المَقادِيرَ قَبْلَ أنْ يَخْلُقَ السَّمواتِ وَ الأرَضِينَ بِخَمسِينَ ألفَ سَنَة ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٣٨٠) في صحيح الجامع

ابوهريرة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ( خوا بڕیاری لەسەر هەموو كێشانە و پێوانەكان داوە پێش ئەوەی ئاسمانەكان و زەوی یەكان دروست بكات بە پەنجا هەزار ساڵ ).

(١٢٨) (م) عن إبن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَتَبَ اللّهُ تَعالى مَقادِيرَ الخَلائِقِ قَبْلَ أنْ يَخْلُقَ السَّمواتِ وَ الأرْض بِخَمْسِينَ ألفَ سَنَة وَ عَرْشُهُ على الماءِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٤٧٤) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ( خوای گەورە كێشانەو پێوانەی هەموو دروست كراوەكانی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەكان و زەوی دروست بكات بە پەنجا هەزار ساڵ، وە عەرشەكەشی لەسەر ئاو بوو).

## ( ١٤ ) ( رەوشتەكانی خوا هەمووی جوانە )

(١٢٩) ( هم طب ) عن الشريد بن سويد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلُّ خُلُقِ اللهِ تَعالى حَسَن ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٤٥٢٢) في صحيح الجامع

شریدی كوڕی سوید دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:( هەموو رەوشتەكانی خوای گەورە باش و جوانە

## ( ١٥ ) ( دروست كردنی بەهەشت و دۆزەخ )

(١٣٠) (هم ٣ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ لَمَّا خَلَقَ اللّهُ الجَنَّةَ وَ النَّارَ أرْسَلَ جِبْرِيلَ إلى الجَنَة، فَقالَ انْظُرْ إلَيها وَ إلى ما أعْدَدْتُ لأهْلِها فيهَا، قالَ فَجاءَها وَنَظَرَ إلَيْهَا وَإلى ما أعَدَّ اللّهُ لأهْلِها فيها، قالَ فَرَجَعَ إلَيْه، قالَ فَوعِزَّتِكَ لا يَسْمَعُ بِهَا أحَدٌ إلا

دَخَلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالْمَكارِه. فَقَالَ ارْجِعْ إِلَيْهَا فَانْظُرْ إِلَيْها وَإِلى ماأَعْدَدْتُ لأَهْلِها فيها، قَالَ فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَإِذا هِيَ قَدْ حَفَّتْ بِالْمَكارِه، فَرَجَعَ إِلَيْه، فَقالَ وَعِزَّتِك لَقَدْ خِفْتُ أَنْ لا يَدْخُلَها أَحَدٌ. قَالَ اذْهَبْ إِلى النَّار فَانْظُرْ إِلَيْهَا وَ إِلى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا، فَإِذا هِيَ يَرْكَبُ بَعْضُهَا بَعْضاً فَرَجَعَ إِلَيْه، فَقَال وَ عِزَّتِكَ لايَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدْخُلُهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالشَّهَوات، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا فَرَجَعَ إِلَيْهَا، فَقَال: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لا يَنْجُوَ مِنْهَا أَحَدٌ إِلَّا دَخَلَهَا ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٢١٠) في صحيح الجامع

ابوهريرة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( کاتێك کە خوا بەهەشت و ئاگری دروست کرد ،جبرائیلی نارد بۆ بەهەشت، پێی فەرموو سەیری بکە و تەماشاش بکە کە چیم بۆ خەڵکەکەی تێدا داناوە، فەرمووی: ئەویش هات بۆ بەهەشت و سەیری کرد و بینی کە خوا چی بۆ خەڵکەکەی تێدا داناوە، فەرمووی ئینجا گەڕایەوە لای خوا و وتی، سوێند بێت بە عیزەتی تۆ هەر کەسێك هەواڵی ئەو بەهەشتە ببیستێ هەر تێی دەچێت، ئینجا خوا فەرمانی کرد چوار دەوری بە ئازار و ناخۆشی تەنرا، ئینجا فەرمووی ئا بگەڕێرەوە بۆ لای و ئەمجارە سەیری بکە و سەیریشی بکە چیم بۆ ئەهلەکەی داناوە تیایدا، فەرمووی ئەویش گەڕایەوە بۆلای و بینی کە دەوری بە ئازار و ناخۆشی تەنراوە، ئینجا گەڕایەوە لای خوا و وتی: سوێند بێت بە عیزەتی تۆ ترسام کە کەس نەتوانێت تێی بچێت. فەرمووی دەبڕۆ بۆ لای ئاگر و سەیری بکە و سەیریش بکە چیم ئامادە کردووە بۆ خەڵکەکەی تیایدا، کە بینی سەیری کرد ئاگرەکەی سواری یەکتر دەبێت، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای خوا و وتی سوێن بێت بە عیزەتت هەر کەسێك بیبیستێت تێی ناچێت، ئینجا خوا فەرمانی کرد چوار دەوری بە ئارەزوو رابواردن تەنرا، ئینجا فەرموی ئێستا بگەڕێرەوە بۆ لای، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای، وتی: سوێند بێت بە عیزەتت ترسام کە کەس نەتوانێت رزگاری بێت لێی و هەرتێی بچێت ).

## ( ١٦ ) ( ئەو کتێبەی کە نوسراوە و لەسەر عەرش دانراوە )

(١٣١) (هم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَمَّا قَضَى اللهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتابِهِ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ: إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٢١٤) في صحيح الجامع

ابوهريرة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( کاتێك کە خوا مەخلوقاتی دروست کرد، لە کتێبەکەی خۆیدا نوسیویەتی و ئەوەتا لە لای خۆی لەسەر عەرش: من رەحمەتەکەم زاڵ بووە بەسەر تورەیی یەکەمدا ).

## ( ١٧ ) ( ڕۆژی قیامەت مرۆڤ لە ئێسکی کلێنچکەی دروست دەکرێتەوە )

(١٣٢) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ مَابَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ، قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْماً؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْراً؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ (( ثُمَّ يُنْزِلَ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ )) قَالَ: وَلَيْسَ مِنْ الإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْماً وَاحِداً وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٥٥٨٥) في صحيح الجامع

ابوهریرة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( لە نێوانی هەردوو جاری فوو کردن بە کەڕەناکەدا چلە، ووتیان ئەی ( أبا هريره ) چل ڕۆژ ؟ وتی: نازانم، ووتیان چل مانگ ؟ وتی: نازانم، ووتیان چل ساڵ ؟ وتی: نازانم (( پاشان خوا ئاوێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت هەروەك چۆن پاقلە دەڕوێت ئاوا دەڕوێنەوە )) ئینجا وتی: (( هیچ شتێکیش لە مرۆڤ نامێنێت هەمووی دەڕزێت و لەناو دەچێت، تەنها یەك ئێسك نەبێت کە ئەویش کلێنچکە، وە هەر لەویشەوە ئەو خەڵکە لە ڕۆژی قیامەتدا دروست دەکرێنەوە).

## ( ١٨ ) ( ئەهلی بەهەشت و ئەهلی ئاگر)

(١٣٣) ( حم م د ه ) عن عائشة قالت: دعى رسول الله(ﷺ) الى جنازة غلام من الانصار. فقلت: يا رسول الله(ﷺ)! طوبى لهذا، عصفور من عصافير الجنة لم يعمل السوء ولم يدركه. قال: ﴿ أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ؟ إِنَّ اللهُ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلابِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلابِ آبَائِهِمْ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

عائشة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بانگهێشت کرا بۆ جەنازەی مێرد منداڵێك لە ئەنسارەکان، منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو منداڵە بەختی خۆی، چۆلەکەیەکە لە چۆلەکەکانی بەهەشت، خراپەی نەکردووە و تەمەنی پێ ڕانەگەیشتووە، فەرمووی: (ئەی ئەگەر وا نەبوو عائشە ؟ خوا خەڵکێکی بۆ بەهەشت دروست کردووە کە ئەهلی ئەوێن، هێشتا لە پشتی باوانیاندا بوون کە بۆ ئەوێی دروست کردوون، وە خەڵکێکیشی بۆ ئاگر دروست کردووە کە ئەهلی ئەوێن، هێشتا لە پشتی باوانیاندا بوون کە بۆ ئەوێی دروست کردوون ).

**تێبینی/** مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەکەدا ئەوە نەبووە کە ئەو منداڵە دۆزەخییە، یان ناچێتە بەهەشت بەڵکو دەیەوێت ئەو ڕاستییەمان پێ بڵێت کە کەس بۆی نی یە لە خۆیەوە بڕیار بدات کە فلان کەس دەچێتە بەهەشتەوە و فلانیش بۆ دۆزەخ چونکە ئەوە تایبەتە بە خواوە و هەر لە پێش دروست کردنی مرۆڤدا خوای گەورە خەڵکی بەهەشت و دۆزەخی جیا کردۆتەوە ،و ئەویش نەبێت کەس ناتوانێت لە خۆوە بڕیار بدات بزانێت کێ بەهەشتی یە و کێش ئەهلی دۆزەخە.

## ( ١٩ ) ( ئەو پەیمانەی خوا لەنەوەی ئادەمی وەرگرتووە )

(١٣٤) ( حم ق ) عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُقَال لِلرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَ كُنْتَ مُفْتَدِياً بِهِ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ. فَيَقُولُ اللهُ: كَذَبْتَ قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ ذَلِكَ، قَدْ أَخَذْتُ عَلَيْكَ فِي ظَهْرِ آدَمَ أَنْ لا تُشْرِكْ بِي شَيْئاً فَأَبَيْتَ إِلا أَنْ تُشْرِكَ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٢٣ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( رۆژی قیامەت بە پیاو دەوترێت لە ئەهلی ئاگر:- پێت وایە ئەگەر هەرچی لەسەر زەویدا بوو هی تۆ بوایە ئایا ئەتبەخشی بۆ ئەوەی رزگارت بێت ؟ ئەویش ئەڵێ: بەڵێ ؟ خوای گەورەش دەفەرموێت: درۆت کرد، زۆر لەوە کەمتر و ئاسانترم لێ داواکردیت، من پەیمانم لێ وەرگرتیت لە پشتی ئادەمدا کە هاوتاو شەریکم بۆ بڕیار نەدەیت، کەچی تۆ هەر سور بویت لەسەر ئەوەی کە شەریکم بۆ بڕیار بدەیت ).

# ( بەشی نییەت )

## ( ١ ) كارت بۆ هەر كەس كردووە داوای پاداشت لەو بكە

(١٣٥) ( إبن سعد ) عن أبي سعد بن أبي فضالة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِذا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ نَادى مُنَادٍ: مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لِغَيْرِ الله فَلْيَطْلُبْ ثَوابَهُ مِمَنْ عَمِلَهُ لَهُ ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

ابي سعد بن ابي فضالة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( ئەگەر رۆژی قیامەت هات بانگدەرێك بانگ دەكات: هەر كەسێك كارێكی كردووە بۆ غەیری خوا ،با داوای پاداشتەكەی لەو كەسە بكات كە كارەكەی بۆ كردووە).

## ( ٢ ) ( شیركی بچوك "ریایی" )

(١٣٦) ( حم )عن محمود بن لبيد قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِنَّ أَخوفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكَ الأَصْغَرالرِّياء، يَقُولُ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ إِذا جَزى النَّاس بِأَعْمالِهِمْ: إِذْهَبوا إِلىَ الَّذِينَ كُنْتُمْ تُراءون فِي الدُنْيَا فانْظُروا هَلْ تَجِدونَ عِنْدَهُمْ جَزاء ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

محمود بن لبيد دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:( من لە هیچ شتێك ترسم نییە لە سەرتان هێندەی ترسم نەبێت لە شیركی بچوك ،ریایی ،خوا دەفەرموێت لە رۆژی قیامەتدا كاتێك كە خەڵك پاداشتی كردەوەكانی خۆیان درایەوە: برۆن بۆ لای ئەوانەی كە لە دونیادا ریاییتان بۆ دەكردن، سەیربكەن بزانن هیچ پاداشتێكتان لەلایان دەست دەكەوێت).

## ( ٣ ) ( هەموو كەسێك لە قیامەتدا لە سەر نیەتی خۆی زیندوو دەكرێتەوە )

(١٣٧) ( هب )عن عائشة قالت: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى إِذا أَنْزَلَ سَطْوَاتَه عَلى أَهْلِ نِقْمَتِه فَوافَتْ آجَالُ قَوْمٍ صَالِحِين فَأهْلَكُوا بِهِلاكِهِمْ ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلى نِيَاتِهِمْ وَ أَعْمَالِهِمْ ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع.

عائشە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ( خوای گەورە ئەگەر زەبر و تۆڵەی خۆی دابەزاند بەسەر كەسانێك كە خەشم و قینی لێ گرتبوون ،وە هاوكاتیش بوو لەگەڵ هاتنی ئەجەلی كۆمەڵێك خەڵكی باشدا ،وە ئەمانیش بە تیا چونی ئەوان تیا چوون ،ئەوا لە پاشدا لە سەر نیەت و كردەوەكانی خۆیان حەشردەكرێن).

### ڕونکردنەوەی فەرمودەکە :

جاری واهەیە کە خوای گەورە غەزەب لە کۆمەڵێك دەگرێت بە هۆی بەدڕەفتاری و لە خوا عاسی بونیانەوە،وەزبرو تۆڵەی خۆی دادەبەزێنێت بە سەر یاندا و لەناویان دەبات ،وە کەسانێکی تریش لە گەڵیاندا لە ناودەبات کە ئەوان باش بوون و خراپ نەبوون ،بەڵکو خوای گەورە وای نوسیوە کە ئەجەلیان هاوکات بێت و بەیەك تیا بچن ،بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت کەئەمانە حسابیان جیا دەبێت لە لای خوای گەورە لەگەڵ کۆمەڵەکەی تردا، وە هەریەکەیان لە سەر نیەتی خۆی خوای گەورە زیندویان دەکاتەوە.

## ( ٤ ) ( پاداشت لەسەر نیەتە )

(١٣٨) ( مالك حم د، ه جب ك ) عن جابر بن عتيك قال: قال رسول الله( ﷺ ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ تَعالى قَدْ أَوْقَعَ أَجْرَه علىَ قَدْرِ نيَـتِه ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

جابری کوڕی عتیك دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:(خوای گەورە پاداشتەکەی بۆ خستۆوە بە پێی نیەتەکەی خۆی).

تێبینی/ ئەم فەرمودەیە لەسەر عبدالله ی کوڕی ثابت هاتووە کاتێك کە خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی لە گەڵ پێغەمبەر ( ﷺ ) دا بەڕێ کەوێت بۆ غەزا کردن ،بەڵام پێش دەرچوون وەفاتی کرد، پێغەمبەریش( ﷺ ) لە دەر حەقیدا فەرمووی:(خوای گەورە پاداشتەکەی بۆ خستۆوە بە پێ نیەتەکەی خۆی).

## ( ٥ ) ( مەرجی قبوڵ کردنی کردەوەکان ):

(١٣٩) ( ن ) عن ابي امامة قال: قال رسول الله( ﷺ ): ﴿ إِنَّ اللَّهَ تَعَالىَ لا يَقْـبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلَّـا مَـا كَانَ لهُ خَالِصاً وَ أُبْتُـغِيَ بِهِ وَ جْـهَـه ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابي امامة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە هیچ لە کردەوەکان قبوڵ ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە بێ خەوش و دڵسۆزانە بۆ خوا بووە و مەبەستیش پێی تەنها رووی پەروەردگار بووە).

تێبینی / ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر( ﷺ ) لە وەڵامی پرسیارێکدا هاتووە کە ابو امامە لێی کرد و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر پیاوێك غەزای کرد مەبەستی دەست کەوت و پەیدا کردنی ناوبانگ بوو ئایا چی بۆ دەنوسرێت؟ ئەویش فەرمووی: هیچ شتێك ،(ابو امامە ) سێ جار پرسیارەکەی دووبارە کردەوە ،ئەویش هەرسێ جارەکە لە وەڵامدا هەر دەیفەرموو هیچ شتێك پاشان ئەو فەرموودەیەی ووت.

## ( ٦ ) ( خوای گەورە سەیری دڵەکان دەکات )

(١٤٠) ( م ٥ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ لايَنْظُرُ إلىَ صُوَرِكُمْ وَ أَمْوالِكُمْ، وَلَكِنْ إنَّما يَنْظُرُ إلىَ قُلُوبِكُمْ وَأعْمالِكُمْ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٢٢٣ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( خوا سەیری وێنە و روخسار و ماڵ و سامانتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵەکانتان و کردەوەکانتان دەکات).

## ( ٧ ) ( هەموو کارێك بە نییەتە )

(١٤١) ( ق ٤ ) عن عمر بن الخطاب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّما الأعْمَالُ بِالنِّيَّات وَ إنَّما لِكُلِ إمْرِءٍ مَا نَوى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلى اللهِ وَرَسُولِه فَهِجْرَتُهُ إلىَ اللهِ وَرَسُولِه، وَ مَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلى دُنْيا يُصِيبُها أَوْ إمرأةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إلى مَاهَاجَرَ إلَيْهِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٢٢٣ ) في صحيح الجامع

عمری کوڕی خطاب دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( بەڕاستی کردەوەکان بە پێی نیەتەکانن، وە هەمووکەسێك هەر ئەوەندەی پێ دەبڕێت کە لە نیەتی دا بووە، جا هەرکەسێك کۆچ کردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بوو بێت، ئەوە کۆچەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بووە، وە هەرکەسێکیش کۆچ کردنەکەی بۆ ماڵێکی دونیا بووە کە دەستی بکەوێت یان بۆ ئافرەتێك بووە کە مارەی بکات، ئەوا کۆچەکەی هەر بۆ ئەو شتە بووە کە لە پێناویدا کۆچی کردووە ) .

(١٤٢) ( حم دن ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَوَضَأَفَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ راحَ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلُّوا، أَعْطَاهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ صَلَّاهَا وَ حَضَرَهَا، لايَنْقُصُ ذلِكَ مِنْ أَجْرِهِمْ ( أُجُورِهِمْ ) شَيْئاً ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٢٢٣ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەرکەسێك دەست نوێژ بگرێت، دەست نوێژێکی باش و چاك ، پاشان بڕوات بۆ مزگەوت ببینێت خەڵکەکە لە نوێژی جەماعەت تەواو بوو بن ، خوای گەورە هێندەی پاداشتی ئەوانەی دەداتێ کە نوێژەکەیان کردووە و ئامادەی بوون ، بەبێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی نوێژ خوێنەکانی تر کەم ببێتەوە ).

## ( ٨ ) ( نییەتی قەرز دانەوە )

(١٤٣) ( هم ك ) عن عائشة قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَامِنْ عَبْدٍ كَانَتْ لَهُ نِيةٌ فِي أَداءِ دَيْنِه ، إلا كَانَ لَهُ مِنْ اللهِ عَوْن ﴾.( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٢٢٣ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرمووی: ( هەر بەندەیەك نییەتی هەبوو بێت کە قەرزەکەی سەری بداتەوە، بێ گومان لە لایەن خواوە هاوکاری دەکرێت ).

## ( ٩ ) ( هەركەسێك خۆی هەڵكێشێت خوا ئابڕوی دەبات )

(١٤٤) ( هم م ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّـهُ بِـهِ وَمَـنْ رَاءَى رَاءَى اللَّهُ بِهِ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەركەسێك خۆی هەڵكێشێت و خۆی بنوێنێت، خوا ئابڕوی دەبات ،وە هەركەسێكیش ریایی بكات، خوا ئاشكرای دەكات و ریا بازییەكەی دەردەخات).

(١٤٥) ( حم خ ه ) عن جندب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿مَنْ يُـسَمِّعْ يُـسَمِّعِ اللَّـهُ بِـهِ وَمَنْ يُـرَاءِ يُرَاءِ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ شَاقَ شَقَّ اللَّهُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

جندب دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەركەسێك خۆی بنوێنێت خوا ئابڕوی دەبات، وە هەركەسێكیش ریایی بكات، خوا هەڵی دەماڵێت و ئاشكرای دەكات، وە هەركەسێكیش لاساری و پێچەوانەی فەرمانی خوا بكات، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا باری سەری قورس و گران دەكات ).

(١٤٦) ( حم ت ه ) عن ابي سعيد: ﴿مَنْ يُرَاءِ يُرَاءِ اللَّهُ بِهِ مَنْ يُسَمِّعْ يُسَمِّعِ اللَّـهُ بِـهِ﴾.(صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع.

ابي سعيد دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( ئەو كەسەی ریایی بكات، خوا دەریدەخات و ئاشكرای دەكات، ئەو كەسەشی كە خۆی هەڵكێشێت و خۆی بنوێنێت خوا ئابڕوی دەبات ).

## ڕونكردنەوەی فەرمودەكان:

ئەم فەرمودە پیرۆزانەی پێشوو گرنگی و بایەخی ( نیەت) لەكاری موسڵماندا روون دەكەنەوە، وە ئەو راستی یەشمان بۆ ئاشكرا دەكەن كە خوای گەورە پاداشت لەسەر نیەت دەداتەوە و كارو كردەوەكانیشمان لە تەرازوی خوادا بەپێی نیەتەكانمان پێوانە دەكرێت. هەر لەبەر ئەوەشە كە خوای گەورە سەیری دڵی بەندەكان دەكات ،چونكە نیەت لە دڵدایە ، وە نییەتیش لە ئیمان و بیر و باوەڕەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆیە هەموو خراپییەك لە نیەت دا، ئەوا ڕەنگدانەوەی خراپی و خوار و خێچی بیر و باوەڕی خاوەنەكەیەتی.

هەروەها ڕیا بازی و خۆ نواندن و خۆ هەڵكێشان، رادەی لاوازی لە ئیمان و باوەڕی خاوەنەكەیدا ئاشكرا دەكات، چونكە ئەگەر كەسێك مەبەست و نیەتی تەنها خوای گەورە بێت حەز ناكات خەڵكی تر ئاگاداری عیبادەت و كردەوە چاكەكانی بن ،چونكە ئەو بۆ ئەوانی نەكردووە و تەنها مەبەستی پێ خوا بووە. خوای گەورەش هیچ عیبادەت و چاكەیەك لەكەس قبوڵ ناكات ئەگەر دڵسۆزانە و بێ خەوش بۆ ئەو نەكرابێت و بەڵكو مەبەست و نیاز و نییەتی تری تێكەڵ بووبێت.

# بابەت: ( عیلم و زانست )

## ( ١ ) ( فەزڵی داواکردنی زانیاری )

(١٤٧) ( هب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ أَوْحى إلَيَّ: أَنَّهُ مَنْ سَلَكَ مَسْلَكاً في طَلَبِ الْعِلْمِ سهلتُ لَهُ طَريقَ الْجَنَّةِ، وَ مَنْ سَلَبْتُ كَريمَتَهُ أَثَبْتُهُ عَلَيْها الْجَنَّةَ: وَ فَضلٌ في عِلْمٍ خَيرٌ مِنْ فَضلٍ في عِبادةٍ، وَ مِلاكُ الدِّينِ الْوَرَعُ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( خوا وەحی بۆ ناردووم: کە هەرکەسێك ڕێگەیەك بگرێتە بەر بۆ داوا کردن و فێر بوونی زانیاری، ئەوا ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکەم، وە ئەو کەسەشی کە دوو چاوەکەیم لێ سەندبێت، لە پاداشتیاندا بەهەشتی دەدەمێ، وە خێر و فەزڵێك کە لە زانیاری دایە باشترە لە خێرو فەزڵێك کە لە عیبادەتدایە، وە جڵەو گرتنی ئاینیش بریتی یە لە خۆگرتنەوە لە گوناهو تاوان ).

(١٤٨) ( د ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) : ﴿ ما مِنْ رَجُلٍ يَسْلُكُ طَرِيقاً يَطْلُبُ فيهِ عِلْماً، إلَّا سَهَّلَ اللهُ لَهُ طَرِيْقاً إلىَ الْجَنَّةِ، وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبِهِ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابوهريره دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەر پیاوێك ڕێگایەك بگرێتە بەر کە داوای زانیارییەکی تێدا بکات، بێ گومان بەو کارەی، خوای گەورە ڕێگایەکی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەکات، ئەو کەسەیشی کە کردەوەکانی خۆی دوایان خستبێت، ئەوا ناو و شۆرەتی باو و باپیرانی ناتوانن پێشی بخەن ).

(١٤٩) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ يَسْلُكُ طَرِيقًا يَطْلُبُ فيهِ عِلْماً إلَّا سَهَلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقاً إلى الْجَنَّةِ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابوهريره دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر داوای فێر بوونی زانیاری تێدا بکات، بێ گومان خوای گەورەش ڕێگایەکی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەکات ).

(١٥٠) ( طس ) عن عائشة قالت: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ ما خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْتِهِ يَطْلُبُ عِلْماً إلَّا سَهَّلَ اللهُ لَهُ طَريقاً إلى الْجَنَّةِ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرپیاوێك لە ماڵی خۆی بچێتە دەرەوە داوای زانیاری بکات و بەدوایدا بگەڕێت ،ئەوا خوای گەورە ڕێگەیەکی بۆ ئاسان دەکات بۆ بەهەشت ).

(١٥١) ( حم ٤ حب ) عن كثير بن قيس قال: كنت جالسا مع ابى الدرداء فى مسجد دمشق فجاءه رجل فقال: يا ابا الدرداء اني جئتك من مدينة الرسول(ﷺ) لحديث بلغني انك تحدثه عن رسول الله(ﷺ)، ما جئت لحاجة. قال: فاني سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَنْ سَلَكَ طَرِيْقاً يَطْلُبُ فيه عِلْماً سَلَكَ اللهُ بِهِ طَرِيقاً مِنْ طُرُقِ الْجَنَّةِ، وإنَّ الْمَلائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَها رضاً لِطالبِ الْعلم، وإنَّ الْعالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ

في السَّموات وَالأرضِ وَالحِيتانُ في جَوْفِ الماءِ، وَ إنَّ فَضْلَ العَالِمِ على العَابِدِ كَفَضْلِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ عَلى سائرِ الكَواكِبِ، وَ إنَّ العُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأنْبِياءِ، وَ إنَّ الأنْبِياءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِيناراً وَلا دِرهَماً، وإنَّمَا وَرَّثُوا العِلْمَ فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍ وافِرٍ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( كثيري كوڕی قيس) دەڵێ: لەگەڵ ( أبي الدرداء ) لە مزگەوتەكەی (دمشق ) دانيشتبووم، پياوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی ( أبا الدرداء ) من لەشارەكەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووم بۆ لات تەنها لەبەر فەرموودەيەك كە پێم گەيشتووە تۆ لە پێغەمبەروە(ﷺ) دەيگێڕيتەوە، بۆ هيچ مەبەست و كارێكی تر نەهاتووم. ئەويش ووتی : لە پێغەمبەرم(ﷺ) بيستووە دەيفەرموو: هەر كەسێك ڕێگايەك بگرێتە بەر ،داوای زانياری تێدا بكات خوای گەورەش ڕێگايەك لە ڕێگاكانی بەهەشتی پێ دەگرێتە بەر ،وە فريشتەكان باڵەكانيان نەوی دەكەن بۆ ڕەزامەندی تەلەبەی عيلم ،وە كەسی زانا ،هەموو ئەوانەی كە لە ئاسمانەكان و زەويدا هەن و ماسی يەكانيش لە قوڵايی ئاودا داوای ليبوردنی لە خوا بۆ دەكەن، وە فەزڵی كەسێكی زانا بە سەر كەسێكی عيبادەت كاردا، وەك فەزڵی مانگی چواردە وايە بەسەر ئەستێرەكانی تردا، وەزاناكان ميراتگری پێغەمبەرەكانن ،وە پێغەمبەرەكانيش نە دينار و نە درهەميان بە ميراتی بە جێ نەهێشتووە ،بەڵكو زانياری وزانستيان بە ميرات بە جێ هێشتووە،جا هەر كەسێك ئەو ميراتی يە وەرگرێت ،ئەوا بەختە بەشێكی زۆری وەرگرتووە).

(١٥٢) (حم ٤ ك )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿مَن سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلْجَمَ يَوْمَ القِيامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نارٍ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

ابوهريرە دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( هەركەسێك پرسياری زانيارييەكی لێ بكرێت و بيشارێتەوە، ڕۆژی قيامەت لغاو دەكرێت بە لغاوێك لە ئاگر ).

## (٢) ( سەرزەنشتی ئەو كەسەی زانياری دەشارێتەوە )

(١٥٣) (طب عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿أَيُّمَا رَجُلٍ آتاهُ اللهُ عِلْماً فَكَتَمَهُ، أَلْجَمَهُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ بِلِجامٍ مِنْ نارٍ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

إبن مسعود دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :( هەر پياوێك خوا زانيارييەكی بداتێ و ئەويش بيشارێتەوە، خوای گەورە لە ڕۆژی قيامەتدا بە لغاوێك لە ئاگر لغاوی دەكات ).

## ڕونكردنەوەی فەرمودەكە :

ئەو زانياری يەی كە لە فەرمودەكەدا هاتووە هەموو ئەو جۆرە زانياری يانە دەگرێتەوە كە سود بەمرۆڤ دەگەيەنن، بەتايبەت زانياری سەبارەت بە ئاين و حوكمەكانی شەرع، وە ئەو هەڕەشەيەش كەلە

فەرموودەکەدا هاتووە هەڕەشەیەکی زۆر توندە، بەتایبەت ئەگەر ئەو زانیاری شاردنەوەیە بۆ مەبەستێکی پیس و خراپ بێت، وەکو ئەو زانایانەی کە زمانی خۆیان لاڵ دەکەن لە ووتنی حەق و راستی ، لە پێناو رازی کردنی دەستەلاَتدارێکدا یان بۆ بەدەست هێنانی سوودێکی دونیایی، حەرامیان بۆ حەلاَڵ دەکەن و راستی یەکان ئاوەژوو دەکەن و فەتوای ناحەق و ناڕەوایان بۆ دەدەن، ئەوانە لە پێش هەموو کەسێکدا ئەم فەرمودە پیرۆزە دەیانگرێتەوە.

## ( ٣ ) ( پێکهاتە و مەعدەنی خەڵك )

(١٥٤) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ، فَخِيارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيارُهُمْ فِي الإِسْلامِ إِذَا فَقِهُوا، وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ فِي هَذَا الأَمْرِ، أَكْرَهُهُمْ لَهُ، قَبْلَ أَنْ يَقَعَ فِيهِ، وَتَجِدُونَ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هَؤُلاءِ بِوَجْهٍ وَ هَؤُلاءِ بِوَجْهٍ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

ابوهريرە دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( ئەو خەڵکە دەبینن پێکهاتەو توخمی جیاوازن، جا باشترینیان لەسەردەمی نەفامیدا باشترینیانن لە ئیسلامەتی دا بەمەرجێك تێگەیشتن و زانیاری لەسەر ئاینەکە پەیدا بکەن، وە دەبینن کە لە باشترین خەڵکەکان لەم کارەدا، کەسێکە کاتی خۆی پێش ئەوەی بێتە ناو ئیسلامەوە لە هەموویان زیاتر رقی لێی بوو، وە دەبینن کە لە خراپترین خەڵکەکانیش کەسی دوو رووە، ئەوەی کە بەڕوویەکەوە دێت بۆ لای ئەمان و بەڕوویەکی تریشەوە بۆلای ئەوان).

## ( ٤ ) ( رێز و پلەی کەسی زانا )

(١٥٣) ( طب الضياء ) عن ابي امامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جحرها وَ حَتَّى الْحُوتَ فِي الْبَحْرِ لَيُصَلُّونَ عَلى مُعَلِّمِ النَّاسِ الخير ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

ابي امامة دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( بەڕاستی خواو فریشتەکانی، تەنانەت مێروولە لەکونی خۆیدا، و تەنانەت ماسیش لە دەریادا ، داوای خێر و رەحمەت بۆ ئەو کەسە دەکەن کە خەڵك فێری خێر و چاکە دەکات ).

(١٥٤) ( ت ) عن ابي امامة قال: ذكر لرسول الله(ﷺ) رجلان: احدهما عابد والاخر عالم، فقال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): إِنَّ اللهَ وَ مَلائِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِينَ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

ابي امامـة دەڵـێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی : (باسـی دوو پیـاو کـرا بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ): یـەکێکیان عیبـادەت کـار و ئـەوی تریشیان زانـا. پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: فـەزڵ و پلـەی زانـا بەسـەر عیبادەتکاردا وەك و فەزڵ و پلەی من وایە بەسەر نزمترین کەسی ئێوەدا، پاشان فەرمووی: خوای گەورە و فریشتەکانی و ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی یەکان و تەنانەت مێروولەش لە کونی خۆیدا و تەنانەت ماسیش داوای رەحمەت و لێخۆش بوون بۆ ئەو کەسە دەکەن کە خەڵك فێری خێر و چاکە دەکات ).

## ( ٥ ) ( دەربارەی چیرۆکی موسا و خضر سەلامی خوایان لەسەربێت )

(١٥٥) ( م ) عن أبيّ بن كعب قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ إِنَّهُ بَيْنَمَا مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ فِى قَوْمِهِ يُذَكِّرُهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ وَأَيَّامُ اللَّهِ نَعْمَاؤُهُ وَبَلاَؤُهُ إِذْ قَالَ مَا أَعْلَمُ فِى الأَرْضِ رَجُلاً خَيْرًا أَوْ أَعْلَمَ مِنِّى. قَالَ : فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ إِنِّى أَعْلَمُ بِالْخَيْرِ مِنْهُ أَوْ عِنْدَ مَنْ هُوَ إِنَّ فِى الأَرْضِ رَجُلاً هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ يَا رَبِّ فَدُلَّنِى عَلَيْهِ. قَالَ فَقِيلَ لَهُ تَزَوَّدْ حُوتًا مَالِحًا فَإِنَّهُ حَيْثُ تَفْقِدُ الْحُوتَ. قَالَ فَانْطَلَقَ هُوَ وَفَتَاهُ حَتَّى انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَعُمِّىَ عَلَيْهِ فَانْطَلَقَ وَتَرَكَ فَتَاهُ فَاضْطَرَبَ الْحُوتُ فِى الْمَاءِ فَجَعَلَ لاَ يَلْتَئِمُ عَلَيْهِ صَارَ مِثْلَ الْكُوَّةِ قَالَ فَقَالَ فَتَاهُ أَلاَ أَلْحَقُ نَبِىَّ اللَّهِ فَأُخْبِرَهُ قَالَ فَنُسِّىَ. فَلَمَّا تَجَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا. قَالَ وَلَمْ يُصِبْهُمْ نَصَبٌ حَتَّى تَجَاوَزَا. قَالَ فَتَذَكَّرَ قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِى الْبَحْرِ عَجَبًا. قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِى. فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا فَأَرَاهُ مَكَانَ الْحُوتِ قَالَ هَا هُنَا وُصِفَ لِى. قَالَ فَذَهَبَ يَلْتَمِسُ فَإِذَا هُوَ بِالْخَضِرِ مُسَجًّى ثَوْبًا مُسْتَلْقِيًا عَلَى الْقَفَا أَوْ قَالَ عَلَى حَلاَوَةِ الْقَفَا قَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَكَشَفَ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ قَالَ وَعَلَيْكُمُ السَّلاَمُ مَنْ أَنْتَ قَالَ أَنَا مُوسَى. قَالَ وَمَنْ مُوسَى قَالَ مُوسَى بَنِى إِسْرَائِيلَ. قَالَ مَجِىءٌ مَا جَاءَ بِكَ قَالَ جِئْتُ لِتُعَلِّمَنِى مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا. قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا. شَىْءٌ أُمِرْتُ بِهِ أَنْ أَفْعَلَهُ إِذَا رَأَيْتَهُ لَمْ تَصْبِرْ. قَالَ سَتَجِدُنِى إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلاَ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا. قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِى فَلاَ تَسْأَلْنِى عَنْ شَىْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا. فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِى السَّفِينَةِ خَرَقَهَا. قَالَ انْتَحَى عَلَيْهَا. قَالَ لَهُ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا. قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا قَالَ لاَ تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلاَ تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا. فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غِلْمَانًا يَلْعَبُونَ. قَالَ فَانْطَلَقَ إِلَى أَحَدِهِمْ بَادِىَ الرَّأْىِ فَقَتَلَهُ فَذُعِرَ عِنْدَهَا مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ ذَعْرَةً مُنْكَرَةً. قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَاكِيَةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عِنْدَ هَذَا الْمَكَانِ ‹ رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى مُوسَى لَوْلاَ أَنَّهُ عَجَّلَ لَرَأَى الْعَجَبَ وَلَكِنَّهُ أَخَذَتْهُ مِنْ صَاحِبِهِ ذَمَامَةٌ. قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَىْءٍ بَعْدَهَا فَلاَ تُصَاحِبْنِى قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّى عُذْرًا. وَلَوْ صَبَرَ لَرَأَى الْعَجَبَ - قَالَ وَكَانَ إِذَا ذَكَرَ أَحَدًا مِنَ الأَنْبِيَاءِ بَدَأَ بِنَفْسِهِ ( رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى أَخِى كَذَا رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْنَا )

**فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ لِئَامًا فَطَافَا فِي الْمَجَالِسِ فَاسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ. قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا. قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ وَأَخَذَ بِثَوْبِهِ. قَالَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ إِلَى آخِرِ الآيَةِ. فَإِذَا جَاءَ الَّذِي يُسَخِّرُهَا وَجَدَهَا مُنْخَرِقَةً فَتَجَاوَزَهَا فَأَصْلَحُوهَا بِخَشَبَةٍ وَأَمَّا الْغُلَامُ فَطُبِعَ يَوْمَ طُبِعَ كَافِرًا وَكَانَ أَبَوَاهُ قَدْ عَطَفَا عَلَيْهِ فَلَوْ أَنَّهُ أَدْرَكَ أَرْهَقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا فَأَرَدْنَا أَنْ يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا. وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنْزَهُمَا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً﴾** . **(صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع**

**أُبيٍّ بن كعب دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ( جارێك لە جاران كە موسا سەلامی لەسەر بێت لەناو قەومەكەی خۆیدا بوو رۆژانی خوای بیر دەخستنەوە رۆژانی خواش بریتییە لە نیعمەتەكانی و بەلاَو تاقی كردنەوەكانی، ووتی: كەس نازانم لەسەر زەویدا پیاوێك لە من باشتر یان لە من زاناتر بێت، پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمووی: خوای گەورەش وەحی بۆ نارد كە من باشتر دەزانم خێر لە كوێدایە یان لای كێ یە، لە زەویدا پیاوێك هەیە لە تۆ زاناترە. وتی: ئەی پەروەردگارم ئەو كەسەم نیشان بدە. پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمووی: ئینجا پێ ی ووترا: ماسی یەكی ئاوی سوێر ( ماسی دەریا) لەگەڵ خۆت هەڵبگرە و بەرێ بكەوە، ئەو كەسە لەو شوێنەدایە كە ماسی یەكەت تیایدا لێ وون دەبێت. فەرمووی: ئینجا خۆی و گەنجەكەی بەردەستی بەرێ كەوتن هەتا گەیشتنە لای بەردەكە، لەوێدا رێگەی لێ تێك چوو، خۆی رۆشت و گەنجەكەی بەردەستی بەجێ هێشت، ماسی یەكەش خۆی لە دەستی كوڕەكە هەڵبزۆقاند و خۆی خستە ناو ئاوەكەوە، كوڕەكەش هەرچەند هەوڵی دا نەیتوانی لە ئاوەكەدا بیگرێتەوە تا تەواو لە ئاوەكەدا دیار نەماو بزر بوو. فەرمووی: كوڕەكەش ووتی: هیچ نەبێت با بەپێغەمبەری خوا بگەمەوە و پێ ی بڵێم كە ماسی یەكە لەدەست چوو ! فەرمووی: كەچی لەبیری كرد. كاتێك كە لەو شوێنە تێ پەڕین بە كوڕەكەی بەردەستی ووت: لەو سەفەرە زۆر شەكەت بووین خواردنەكە بێنە با بیخۆین، فەرمووی: هەتا لە شوێنەكەش تێنەپەڕین شەكەت و هیلاك نەبوون. فەرمووی: ئینجا كوڕەكە بیری كەوتەوە و وتی: دەزانیت ئەو كاتەی كەلە پەنا بەردەكەدا حەساینەوە ماسی یەكەم لەبیر كرد، دیارەشەیتان نەیهێشت وەبیرم بێتەوە، ماسی یەكەش وەك شتێكی سەیر و سەمەرە رێگەی دەریاكەی گرتە بەر و بزر بوو.**

**موساش وتی: ئێمە هەر ئەوەمان دەویست، ئیتر بە شوێنی خۆیاندا بەچاوگێڕان گەڕانەوە، ئەویش شوێنی ماسی یەكەی پیشان دا، وتی: ئەمە ئەو شوێنەیە كە بۆم وەسف كراوە. فەرمووی: ئینجا رۆشت و چاوی گێڕا، كە بینی ئەوا (خضر) پۆشاكێكی راخستووە و لەسەر پشت لێی راكشاوە، یان فەرمووی لەسەر گازەرەی پشت راكشابوو. موسا ووتی: السلام علیكم، ئەویش پۆشاكەكەی لەسەر دەم و چاوی لابرد و وتی: و علیكم السلام، تۆ كێیت ؟ وتی: من موسام، وتی: موسا كێ یە ؟ وتی: موسای بەنی**

**ئیسرائیل وتی: هاتویت چی تۆی هێناوه ؟ وتی: هاتووم لەو زانستەی فێرکراوی منیش هەندێك فێر بکەیت. وتی: ئاخر تۆ ناتوانیت لەگەڵ مندا دەربەریت و ئارام بگریت، نەخوازە کارێکیش کە تۆ هیچ ئاگاداری یەکت لە بارەیەوە نی یە چۆن دەتوانیت ئارامی لەسەر بگریت ! ئەو شتەی کە من فەرمانم پێ کراوە بیکەم ئەگەر تۆ بیبینیت خۆتت بۆ راناگیرێت. ئەویش وتی: ئەگەر خوا حەزکا بەخۆڕاگرم دەبینیت و هیچ بێ فەرمانی یەکت ناکەم. وتی: دەی ئەگەر شوێنم کەوتیت ئەوا پرسیاری هیچ شتێکم لێ نەکەیت هەتا بۆ خۆم دەربارەی باست بۆ دەکەم. ئینجا بەڕێ کەوتن هەتا کاتێك هەردووکیان سواری کەشتی یەك بون کونی تێ کرد، ووتی: بەسەر کونەکەدا بچەمێرەوە با دەرنەکەوێت، موساش سەلامی لەسەر بێت پێ ی ووت: ئەوە بۆیە کونت کرد بۆ ئەوەی خەڵکەکەی لە ئاودا نقوم بکەی، کارێکی ناشیرینت کرد وتی: ئێ دەی پێم نەووتیت تۆ ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆت راگریت. ووتی: لێم مەگرە کە لە بیرم چوو کارەکەشم بە سەخت و گران لەسەر مەگرە. ئینجا هەردووك بە رێ کەوتنەوە هەتا تووشی چەند مێرد منداڵێك بوون کە یاری یان دەکرد فەرمووی: بەرەو یەکێکیان رۆشت کە دیار بوو سەر گەورەی منداڵەکان بوو بە قسەیان دەکردو کوشتی ، ئیتر موسا سەلامی لەسەر بێت بەوە لەوێدا تۆقی تۆقینێکی زۆر خراپ و وتی: ئەوە چۆن ئەو گیانە پاکەت کوشت بەبێ ئەوەی کەسی کوشتبێت، بە راستی کارێکی زۆر نا بەجێت کرد. ئیتر پێغەمبەر ﷺ کە گەیشتە ئەم شوێنە لە باسەکەیدا فەرمووی: رەحمەتی خوا لەسەر ئێمە و لەسەر موساش بێت، ئەگەر ئاوا پەلەی نەکردایە شتی سەرسوڕهێنەری دەبینی. بەڵام ئیتر سەرزەنشت کردنی هاوەڵەکەی تەنگی پێ هەڵچنی بۆیە ووتی: ئەگەر پاش ئەمجارە هیچ شتێکم لە تۆ پرسی هاوڕێ یەتیم مەکەو هیچ گلەیشت لێ ناکەم. ئەگەر ئارامی بگرتایە شتی سەرسوڕهێنەری دەبینی).**

**(أبي کوڕی کعب) کە فەرمودەکە دەگێڕێتەوە ووتی پێغەمبەر(ﷺ) هەروابوو کاتێك کە باسی یەکێك لە پێغەمبەرەکانی کردایە بە خۆی دەستی پێ دەکرد دەیفەرموو:( رەحمەتی خوا لەسەر ئێمە و لەسەر فلانی براشم بێت، رەحمەتی خوامان لەسەر بێت).**

**پاشان هەردوکیان بەڕێ کەوتنەوە، هەتا گەیشتنە لای خەڵکی شارێك کە زۆر پیسکەو چروك بوون، بەسەر چەندین کۆمەڵیاندا سوڕانەوە داوای خواردنیان لێ دەکردن، کەسیان ئامادە نەبوون میوانداری یان بکەن، دیوارێکیان لەوێ چاو پێ کەوت خەریك بوو بەلادا دەهات، ئەویش راستی کردەوە . ووتی: ئەگەر بتویستایە کرێ ی ئەم کارەت وەردەگرت. ووتی: ئیتر ئەمە لێك جیابوونەوەی من و تۆیە، وە جلەکەی بەری گرت و وتی: وا ئێستا لێکدانەوەی ئەو روداوانەت بۆ باس دەکەم کە نەتدەتوانی ئارامیان لەسەر بگریت. کەشتی یەکە هی کۆمەڵە هەژارێك بوو کە لە دەریادا کاریان دەکرد وویستم عەیبداری بکەم چونکە پاشایەك هەبوو پاپۆڕەکانی بە سوغرە دەگرت، جا هەرکاتێك فەمانداری سوغرە گرتنەکە هات دەبینێت کە کونە لێ ی تێ دەپەڕێت و نایگرێت، دواتریش خۆیان بە پارچە تەختەیەك چاکی دەکەنەوە. کوڕە منداڵەکەش هەر لە رۆژی خوڵقاندنیەوە بە کافری خوڵقابوو، وە دایك و باوکیشی زۆر نازیان دەکێشا، جا ئەگەر گەورە ببوایە و پێ بگەیشتایە بە ستەم و کوفر دەردەدار و سەغڵەتی دەکردن و لەڕێ ی راست وەری دەگێڕان ، ئێمەش وویستمان کە پەروەردگاری دایك و باوکی رۆڵەیەکی لەو**

باشتر و بەڕەحمتریان پێ ببەخشێت، دیوارەکەش هی دوو منداڵی هەتیو بوو لە شارەکەدا و کەلە ژێریدا گەنجینەیەکی ئەوانی تێدا بوو باوکیشیان پیاو چاك بوو، پەروەدگارت ویستی ئەم دوو گەنجە پێ بگەن و گەنجینەکەی خۆیان دەربهێنن کە ئەمە بەزەیی و رەحمەتێك بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە، وە من هیچم لە خۆمەوە نەکردووە، ئەمەش لێکدانەوەی ئەو رووداوانە بوو کە تۆ نەت توانی ئارامیان لەسەر بگریت).

## ( ٦ ) ( بیستنی هەواڵ وەك بینینەکەی نی یە )

(١٥٦) ( حم طس ك ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَيْسَ الْخَبَرُ كَالْمُعَايَنَةِ : إنَّ اللهَ تَعَالَى أَخْبَرَ مُوسَى بِمَا صَنَعَ قَوْمُهُ فِي الْعِجْلِ فَلَمْ يُلْقِ الألْـوَاحَ فَلَمَّـا عَـايَنَ مَاصَنَـعُوا أَلْقَـى الألْـوَاحَ فَانْكَـسَرَتْ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( بیستنی هەواڵ وەك و بینینەکەی نییە: ئەوەتا کاتێك کە خوای گەورە هەواڵی دا بە موسا کە قەومەکەی چییان کردووە لە گوێرەکەکە و چۆن دەیپەرستن لەوحەکانی دەستی فڕێ نەدا، بەڵام کە بەچاوی خۆی بینی چییان کردووە لەوحەکانی فڕێ داو شکا ).

## ( ٧ ) ( کۆبوونەوە بۆ فێربوونی زانیاری )

(١٥٧) ( د ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا اجْتَمَعَ قَـوْمٌ فِـي بَيْـتٍ مِـنْ بُيُـوتِ اللهِ يَتْلُـونَ كِتَـابَ اللهِ وَ يَتَدارَسُـونَهُ بَيْـنَهُمْ إلَّانَزَلَـتْ عَلَيْـهِمُ الـسَّكِينَةُ وَ غَـشِيَتْهُمْ الرَّحْمَـةُ وَحَفَّتْـهُمُ الْمَلائِكَةُ وَذَكَرَهُم اللهُ فِـيمَنْ عِنْدَهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەر کۆمەڵێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆ ببنەوە قورئانەکەی خوای تێدا بخوێنن و لە نێوان خۆیاندا دیراسەتی بکەن ئەوا هێوری و ئارامی دادەبەزێت بە سەریاندا و رەحمەت دایان دەپۆشی و فریشتەکانیش دەوریان دەدەن و خوای گەورەشی باسیان دەکات و ناویان دەهێنێت بۆ ئەوانەی کەلای خۆین ).

(١٥٨) ( ت ه ) عن أبي هريرة وابي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَـا جَلَـسَ قَـوْمٌ مَجْـلِساً لَـمْ يَذْكُرُوا اللهَ تَعَالَى فِيهِ وَ لَمْ يُصَلُّوا عَلىَ نَبِيِّـهِمْ فِـيهِ إلَّـا كَانَ عَلَيْـهِمْ تِـرَةً، فَإنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ، وَإنْ شَـاءَ غَفَرَلَهُمْ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە و ابوسعید دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەرکۆمەڵێك دانیشتنێك دابنیشن ناوی خوای گەورەی تێدا نەبەن و درودی تێدا نەنێرن بۆ پێغەمبەرەکەیان ،ئەوا دەبێتە نەگبەتی بەسەریانەوە، جا ئەگەر خوا ویستی سزایان دەدات، ئەگەر ویستیشی لێیان دەبورێت ).

(١٥٩) ( حب ) عن ابى سعيد وأبي هريرة معا قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاجَلَسَ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلائِكَةَ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةَ وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

ابوسعيد وابوهريره پێكەوه دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەر كۆمەڵێك دابنیشن زیكر و یادی خوای گەوره بكەن، ئەوا فریشتەكان دەوریان دەدەن و رەحمەت دایان دەپۆشێ و هێوری و ئارامیش دادەبەزێت بەسەریاندا و خوای گەورەش لای نزیكەكانی خۆی باسیان دەكات ).

(١٦٠) ( حم الضياء ) عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاجَلَسَ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ تَعَالَى إِلَّا نَادَاهُمْ مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: قُومُوا مَغْفُوراً لَكُمْ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( هەر كۆمەڵێك دابنیشن زیكرو یادی خوای گەوره بكەن، ئەوا بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بانگیان دەكات، هەستن خوا لێتان خۆش بووه ).

(١٦١) ( طب هب الضياء ) عن سهل بن حنظلة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاجَلَسَ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ تَعَالَى فَيَقُومُونَ حَتَّى يُقَالُ لَهُمْ: قُومُوا قَدْ غَفَرَ اللهُ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَبُدِّلَتْ سَيِّئَاتُكُمْ حَسَنَات ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

سهل ی كوڕی حنظلة دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر كۆمەڵێك دابنیشن زیكرو یادی خوای گەوره بكەن ئەوا لەگەڵ هەستانیاندا پێیان دەوترێت: هەستن ئەوا خوا لەتاوانەكانتان بوراوه و گوناهوكاره خراپەكانیشتان بۆ گۆڕاوه بەخێر و چاكه ).

(١٦٢) ( ت ه ) عن أبى هريرة وأبى سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لايَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ تَعَالَى إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلائِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَذَكَرَهُمُ اللهُ تَعَالَى فِيمَنْ عِنْدَهُ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( هەركۆمەڵێك دابنیشن زیكرو یادی خوای گەوره بكەن، ئەوا فریشتەكان دەوریان دەدەن و رەحمەت دایان دەپۆشێت وهێوری و ئارامیشیان بەسەردا دادەبەزێت و خوای گەورەیش لای نزیكەكانی خۆی باسیان دەكات).

## ( ٨ ) ئەو كەسەی زانیاری بۆ غەیری خوای گەوره فێربێت

(١٦٣) ( ه ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ لِيُبَاهِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ وَيُجَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، وَيَصْرِفُ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ، أَدْخَلَهُ اللهُ جَهَنَّمَ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

(هەركەسێك بەو مەبەستە فێری زانیاری بێت كە لەبەرامبەر زاناكاندا خۆی دەربخات و دەمە دەمەی لەگەڵ نەزانەكاندا پێ بكات و روی خەڵكی پێ بكاتە خۆی، ئەوا خوای گەوره دەیخاتە دۆزەخەوه )

(١٦٤) ( حم د ه ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَعَلَّمَ عِلْماً مما يُبْتَغى بِهِ وَجْهَ اللهِ لايَتَعَلَّمَهُ إلّا لِيُصيبَ بِهِ عَرَضاً مِنَ الدُّنْيالَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾يعنى ريحها. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك زانستێك فێر بێت لەو زانستانەی کە مەبەست پێیان ڕەزامەندی خوایە: تەنها بۆ ئەوە هەوڵی فێر بونی بدات کە دەستکەوتێکی دونیایی پیێ دەست بخات، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆنی بەهەشت ناکات )

(١٦٥) ( ت ) عن كعب بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ لِيُبَاهِي بِهِ الْعُلَماءَ وَ يُجارِي بِهِ السُّفَهاءَ وَيُصَرِّفَ بِهِ وجُوهُ النَّاسِ إِلَيْهِ، أَدْخَلَهُ اللهُ جَهَنَّمَ ﴾ ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك بەو مەبەستە فێری زانیاری بێت کە لە بەرامبەر زاناکاندا خۆی دەربخات و دەمە دەمەی لەگەڵ نەزانەکاندا پیێ بکات و ڕوی خەڵکی پیێ بکاتە خۆی، ئەوا خوا دەیخاتە دۆزەخەوە ).

(١٦٦) ( حم ٤ ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ من سُئِلَ عَن عِلمٍ فَكَتَمَهُ ،أُلجِمَ يَومَ القِيامَةِ بِلِجامٍ مِن نارٍ ﴾ . ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك پرسیاری لێبکرێت دەربارەی زانیارییەك و ئەویش بیشارێتەوە ، ئەوا بە لغاوێکی ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا لغاو دەکرێت ) .

## ( ٩ ) ( فەزیلەتی تێگەیشتن لە ئایندا )

(١٦٧) ( حم ق ) عن معاوية ( حم ت ) عن إبن عباس ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ﴾ ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

واتە: ( هەرکەسێك خوا نیازی چاکی پیێ ی هەبێت تێگەیشتووی دەکات لە ئاین ) .

(١٦٨) ( حم ق ) عن معاوية قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنا قَاسِمٌ وَيُعْطِي اللهُ وَلَنْ تَزالَ هَذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللهِ لايَضُرُّهُمْ مَنْ خالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ عَزَّوَجَلَّ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

واتە: ( هەرکەسێك خوا نیازی چاکەی پیێی هەبێت تێگەیشتووی دەکات لە ئایین، وە من تەنها دابەش کردنم لە سەرەو خوا خۆی دەتانداتێ، وە ئەم ئوممەتە بەردەوام لەسەر فەرمانی خوا ڕاگیر دەبێت . ناحەزانیان ناتوانن زەرەریان پیێ بگەیەنن هەتا فەرمانی خوا ی گەورە دێت) – واتە هەتا قیامەت هەڵدەستێت – .

## ( ١٠ ) ( هاندان بۆ فێر بوونی زانست و فێرکردنی )

(١٦٩) ( ت الضياء ) عن زيد بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ نَظَرَ اللهُ أَمْرِءاً سَمِعَ منَّا حَديثاً فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ، فَرُبَّ حَامِل فِقْه إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ، وَرُبَّ حَامِل فِقْه لَيْسَ بِفَقِيه ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٢٢٣) في صحيح الجامع

( خوا ڕوی كەسێك گەش و سپی بكات كە فەرموودەیەكمان لێ دەبیستێت لەبەری دەكات هەتا دەیگەیەنێت، چونكە لەوانەیە كەسێك زانستێك بگەیەنێت بەكەسێكی تر كە لە خۆی زاناتر بێت، وە لەوانەیە كە سێك هەڵگری فیقهو زانیاری یەك بێت بەڵام خۆی زانا نەبێت و نەتوانێت لێ ی تێبگات ).

(١٧٠) ( حم ت حب ) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ نَضَّرَ اللهُ أَمْرِءاً سَمِعَ مِنَّا شَيْئاً فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ فَرُبَّ مُبَلِّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( خوا كەسێك ڕوو سپی بكات كە شتێكمان لێدەبیستێت، چۆنی بیستووە ئاوا دەیگەیەنێت، جاری وا هەیە ئەو كەسەی كە بۆی دەگێڕدرێتەوە باشتر لێ ی تێ دەگات لەو كەسەی كە بە گوێ ی خۆی بیستویەتی ).

(١٧١) ( حم ه ) عن انس قال رسول الله(ﷺ): ﴿ نَضَّرَ اللهُ امرء سَمِعَ مَقَالَتِي فَوَعَاهَا وَأَدَّاهَا كَمَا سَمِعَهَا، فَرُبَّ حَامِلَ فِقْهٍ غَيْرَ فَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِل فِقْه إِلىَ مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( خوا كەسێك ڕوو سپی بكات كە قسەكەی منی بیستووە و لێی تێ گەیشتووە و چۆنیشی بیستوە ئاوا بە خەڵكی تری گەیاندووە، چونكە لەوانەیە كەسێك فیقهو زانیاری یەكی پێ بێت كە خۆی لێی تێ نەگات، وە لەوانەشە كەسێك زانستێك بگەیەنێت بە كەسێكی تر كە لە خۆی زاناتر بێت وباشتر لێی تێبگات ).

## ( ١١ ) ( ئاشكرا نەكردنی هەندێك زانیاری لەبەر بەرژەوەندی )

(١٧٢) ( حم ق ) عن انس: معاذ بن جبل رديفه على الرحل، قال ( يا معاذ ) قال: ﴿ لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَ سَعْدَيْكَ ﴾ ، قال: ( يا معاذ )، قال: ﴿ لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَ سَعْدَيْكَ ﴾ قال: ( يا معاذ )، قال: ﴿ لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَ سَعْدَيْكَ ﴾ قال: ﴿ مَامِنْ عَبْدٍ يَشْهَدُ اَنَّ لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ ﴾ ، قال: يارسول الله! أفلا أخبر بها الناس فيستبشروا؟ قال: ( إِذَا يَتَّكِلُوا ) فأخبر بها معاذ عند موته تأثما. (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٢٢٣) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: ( معاذ ی كوڕی جبل ) لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێكەوە سواری وڵاخێك ببوون، فەرمووی: ( ئەی معاذ ) ئەویش وتی: ئەی گیان قوربانتم ،پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ئەی معاذ) ئەویش وتی: ئەی گیان قوربانتم، پێغەمبەری خوا، دیسانەوە فەرموویەوە: (ئەی معاذ) ئەویش وتییەوە: ئەی گیان قوربانتم پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ( هیچ بەندەیەك نی یە شایەتی ئەوە بدات كە هیچ

خوایەك نییە تەنها زاتی (الله) نەبێت، وە موحەمەدیش بەندەو نێردراوی خوایە، ئیلا خوای گەورە حەرامی دەكات لەسەر ئاگر).

ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەی بەخەڵكی نەڵێم هەتا شادمان بن ؟ فەرموی: ( دەی ئاخر پشت بەوە دەبەستن وپاڵی لێ دەدەنەوە )، ئینجا (معاذ) لەكاتی مردنیدا فەرمودەكەی گێڕایەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك گوناهبار بێت ئەگەر نەیگێڕێتەوە.

## ( ١٢ ) ( كەسی خاوەن بیدعە )

(١٧٣) (إبن فيل طس هب الصياء ) عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ احْتَجَرَ التَّوْبَةَ عَلَى كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم ( ٢٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( خوای گەورە تۆبەی قەدەغەكردووە لەسەر هەموو خاوەن بیدعەیەك ).

## ڕوونكردنەوەی فەرموودەكە :

(بیدعە) بەهەموو شتێكی تازە داهێنراو دەوترێت لە ئایندا كەلەشەرعدا بنەمایەكی نەبێت، وە مەبەست بە خاوەن بیدعەش لە فەرمودەكەدا كەسێكە كە بیر و باوەڕ و عەقیدەیەكی هەبێت لەسەر زاتی خوا و سیفاتەكانی و كردارەكانی كە پێچەوانەی ئەو حەق و ڕاستی یانە بێت كە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، واتە بیر و بۆچونێكی بیدعەو داهێنراو بێت، وە مەبەستیش بەقەدەغەكردنی تۆبە لەسەری ئەوەیە كە خوای گەورە ڕێنمویای و هیدایەتی نادات كە تۆبە بكات و لە تاوانەكانی پەشیمان بێتەوە هەتا دەست لە بیدعەكەی هەڵنەگرێت.

## (( بەشی: پەیوەست بوون بە قورئان و سوننەتەوە ))

### (١) (دەست گرتن بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە)

(١٧٤) ( ت ) عن زيد بن ارقم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمْ مَا إِنْ تَمَسَّكْتُمْ بِهِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدِي أَحَدُهُمَا أَعْظَمُ مِنَ الآخَرِ كِتَابُ اللهِ حَبْلٌ مَمْدُودٌ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ وَ عِتْرَتِي أَهْلُ بَيْتِي وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ فَانْظُرُوا كَيْفَ تَخْلُفُونِي فِيهِمَا ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( من دوو شتتان لەناودا بەجی دەهێڵم ئەگەر توند دەستیان پێوە بگرن ئەوا لە دوای من گومڕا و سەر لێشێواو نابن، یەکێکیان گەورەترە لەوی تریان، قورئانەکەی خوا کە پەتێکی درێژ کراوەیە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، وە کەس و کارەکەم ئەهلی ماڵەکەم، وە ئەو دوانە لەیەك دانابڕێن هەتا دێنە لام لەسەر حەوزەکە، جا سەیر بکەن بزانن چۆن لە دوای من مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن ).

(١٧٥) ( حم عبد بن حميد م ) عن زيد بن ارقم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَمَّابَعْدُ، أَلا أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ، وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ: أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ. فَخُذُوا بِكِتَابِ اللهِ وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ﴾ فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللهِ وَ رَغَّبَ فِيهِ ثُمَّ قَالَ: ﴿ وَأَهْلُ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي﴾، فَقَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: وَمَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ؟ يَازَيْدُ أَلَيْسَ نِسَاءُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ؟ قَالَ: لَيْسَ نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ. وَلَكِنْ أَهْلُ بَيْتِهِ مَنْ حُرِّمَ الصَّدَقَةَ بَعْدَهُ. قَالَ: وَ مَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُمْ آلُ عَلِيٍّ، وَ آلُ عَقِيلٍ، وَ آلُ جَعْفَرٍ وَ آلُ عَبَّاسٍ. قَالَ: كُلُّ هَؤُلاءِ حُرِّمَ الصَّدَقَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( لە پاش سوپاس و ستایشی خوا، ئەوا ئەی خەڵکینە من هەرمرۆڤێکم نزیکە کە نێردراوی پەروەردگارم بێت و منیش وەڵامی بدەمەوە و جێتان بهێڵم، وە من دوو شتی قورس و گرانبەها لەناوتاندا جێ دەهێڵم: یەکەمیان قورئانەکەی خوایە هیدایەت و روناکی تێدایە، جا کتێبەکەی خوا بگرن و دەستی لێ قایم و توند بکەن، ئینجا زۆر هانی رێز گرتنی قورئانی داو، پاشان فەرمووی: ( وە ئەهلی ماڵەکەی من، خواتان وە بیر دەهێنمەوە سەبارەت بە ئەهلی ماڵەکەم، خواتان وە بیر دەهێنمەوە سەبارەت بە ئەهلی ماڵەکەم، خواتان وە بیر دەهێنمەوە سەبارەت بە ئەهلی ماڵەکەم، ( حصین) یش وتی: ئەهلی ماڵەکەی کێن ؟ ئەی زەید ئەیا ژنەکانی لە ئەهلی ماڵەکەی نین ؟ زەیدیش -کە گێڕەرەوەی فەرموودەکەیە- وتی: ژنەکانی لە ئەهلی ماڵەکەی نین، بەڵکو بەڵکو ئەهلی ماڵەکەی لەوانەن کە خێریان پێ ناشێت لە دوای خۆی، وتی: دەی ئەوانە کێن ؟ وتی: نەوەی علی و نەوەی عەقیل و نەوەی جەعفەر و نەوەی عەباس وتی: هەموو ئەوانە خێر و سەدەقەیان لێ حەرام کراوە ؟ وتی: بەڵێ ).

(١٧٦) ( حم طب ) عن زيد بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنِّي تَارِكٌ فِيكُمْ خَلِيفَتَيْنِ: كتَابَ الله حَبْلٌ مَمْدُودٌ مَابَيْنَ السَّمَاءِ وَالأرْضِ وَ عِتْرَتِي أَهْلُ بَيْتِي وَ إنَّهَا لَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدا عَلَيَّ الْحَوْضَ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( من دوو جێنشینم له ناوتاندا به جێ هێشتووه، قورئانەکەی خوا پەتێکی درێژەوه بووه لەنێوان ئاسمان و زەویدا، وه کەس و کارەکەم ئەهلی ماڵەکەم، وه ئەو دوانه لێك جیانابنەوه هەتا دێنەلام لەسەر حەوزەکە).

(١٧٧) ( ت ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّهَا النَّاس قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا إنْ أَخَذْتُمْ بِهِ لَنْ تَضِلُّوا: كتَابَ اللهِ وَ عِتْرَتِي أَهْلَ بَيْتِي ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( ئەی خەڵکینه دووشتم لەناوتاندا بەجێ هێشتووه ئەگەر دەستیان پێوه بگرن گومڕا نابن: کتێبەکەی خواو کەس وکارەکەم ئەهلی ماڵەکەم).

(١٧٨) ( ابو بكر الشافعي في الغيلانيات ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَلَفْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي وَ لَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدا عَلَى الْحَوْضِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

(دوو شتم له دوای خۆم تێدا بەجێ هێشتوون له دوای ئەو دووانەوه ئیتر گومڕا نابن: کتێبەکەی خوا و سوننەتەکەی من ،وه ئەو دوانەش لێك جیا نابنەوه هەتا دێنه لام لەسەر حەوزەکە).

(١٧٩) ( ش إبن جرير ) عن ابى سعيد قال:قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كتَابُ اللهِ هُوَ حَبْلُ اللهِ الْمَمْدُودِ مِنَ السَّمَاءِ إلَى الأرْضِ ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

(کتێبەکەی خوا پەتی خوایه که لەئاسمانەوه درێژبۆتەوه بۆ زەوی ).

## ( ٢ ) ( ڕێزگرتن له سوننەتی پێغەمبەر ﷺ )

(١٨٠) ( ت ) عن المقدام بن معد يكرب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ألاهَلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الْحَدِيثُ عَنِّي وَ هُوَ عَلَى أَرِيكَته، فَيَقُولُ بَيْنَنَا وَ بَيْنَكُمْ كتَابُ الله، فَمَا وَجَدْنَا فِيه حَلالاً اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَ مَاوَجَدْنَا فِيهِ حَراماً حَرَّمْنَاهُ، وَ إنَّ مَاحَرَّمَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) كَمَا حَرَّمَ الله ﴾. ( صحيح ) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

(ئەوه لەوانەیه پیاوی وا هەبێت فەرمودەی منی پێ بگات ،جەنابیشی لەسەر بالیفی نەرم شانی دادابێت و بڵێت، لەنیوان ئێمەو ئێوەدا هەر کتێبەکەی خوا هەیه ،جا ئەوەی که بینیمان تیایدا حەڵاڵ کرابوو ئێمەش به حەڵاڵی دەزانین وه هەرچی یەکیشمان تێدا بینی حەرام کرابوو و ئێمەش به حەرامی دەزانین ،جا باش بزانن هەر شتێکیش پێغەمبەری ـ خوا(ﷺ) حەرامی کردبێت هەروەك ئەوه وایه کەخوا حەرامی کردبێت).

## ڕونكردنەوەی فەرمودەكە :

مەبەستی فەرمودەكە ئەوەیە كە كەسانی وا پەیدا دەبن فەرمودەی پێغەمبەریان ﷺ پێ دەگات كەچی پشت گوێی دەخەن و دەڵێن ئێمە تەنها كار بە قورئان دەكەین، وە دەڵێن ئێمە تەنها حەڵاڵ و حەرامی ناو قورئان بە حەڵاڵ و حەرام دەزانین ،جا پێغەمبەر(ﷺ) بەرپەچی ئەو جۆرە كەسانە دەداتەوەوە و دەفەرموێت كە هەر شتێكیش من حەرامم كردبێت هەروەك ئەوە وایە كە خوای گەورە حەرامی كردبێت . بەڵێ لە هەموو سەردەمانێكدا كەسانێكی وا پەیدا بوون كەوویستویانە بەبیانوی جۆراوجۆر ، سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووودەشیرینەكانی وەلا بنێن و كاریان پێ نەكەن،كە ئەمەش سەرلێشێواوی یەك و گومڕایی یەكی زۆر گەورەیە و ئاكامی گەلێك خەتەرناكی لێ دەكەوێتەوە ،ئاشكراترین بیانوی ئەو جۆرە كەسانەش ئەوەیە- بە تایبەتی لەمڕۆدا كە هەندیك لەو جۆرە كەسانە پەیدا بوون و بانگەشە بۆ ئەو بیروبۆچونە بەتاڵە دەكەن- ،كە گوایا قورئان هەموو شتێكی تێدایە و ئێمە پێویستمان بە هیچی ترنییە ،وە دەڵێن كە گوایە ئەو فەرمودانە نەتوانراوە وەك و خۆی بگێڕدرێتەوە و دەستكاری كراون و زیاد و كەمیان بۆ كراوە وە ئێمە دڵنیا نین لەوەی كە ئەمانە فەرمودەی پێغەمبەربن ، بەم كارەشیان هەم لە دەقەكانی قورئان لادەدن و هەم سوكایەتیش بە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و شوێن كەوتوكانیان و زانا گەورەكانی ئیسلام و گێڕەرەوە و تۆماركاری فەرمودەكان دەكەن ،چونكە قسەكانیان ئەوە دەگەیەنێت كە لە ناو هەموو ئەمانەدا، چەند پیاوێكی وایان تێدا نەبووە كە بتوانن چەند فەرمودەیەك وەكو خۆی بە راستی و دروستی بگەیەنن .

ئەم جۆرە بیر و بۆچونەش پێم وایە یەكێك لە دوو شت دەسەلمێنێت، یەكەمیان ئەوەیە كە خاوەنەكانیان بۆ بەدی هێنانی نیاز و مەبەستێكی گوماناوی دەیانەوێت نیوەی حوكمەكانی شەریعەت لە ئیسلامدا لەكار بخەن كە خۆی لە سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) دەبینێتەوە، بەمەش ئەوەی كە لەگەڵ قورئاندا پێیان ناكرێت -كە لە لایەن خوای گەورەوە پارێزراوە- دەیانەوێت لەگەڵ سوننەتەكەی پێغەمبەردا(ﷺ) بیكەن .

دووەمیشیان ئەوەیە كە ئەو كەسانە بەهۆی نەفامی و نەزانینیانەوە ئەو بیر بۆچونەیان هەڵگرتووە، دەنا ئەگەر ئەوان لە قورئان تێ بگەیشتنایە دەبوایە بیانزانیایە كە خودی قورئان خۆی فەرمان بە موسڵمانان دەكات كە شوێن پێغەمبەر(ﷺ) بكەون و گوێ رایەڵی فەرمانەكانی بن و بیكەنە پێشەنگ بۆ خۆیان، ئەوانەی كە دەڵێن ئێمە تەنها كار بەحەڵاڵ و حەرامی قورئان دەكەین و پێویستمان بە فەرمودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) نییە، ئەوانە راست ناكەن و خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە چونكە خودی قورئان كە ئەوان دەڵێن ئێمە تەنها كار بەو دەكەین بەدەقی رون و ئاشكرا مافی حەڵاڵ كردن و حەرام كردنی داوە بە پێغەمبەرەكەی خوا، ئەوەتا لە سورەتی (اعراف) دا خوای گەورە دەفەرموێت: ( ﴿قَالُوٓاْ بَلَىٰ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ....﴾) ١٥٧/اعراف . واتە: ( ئەوانەی كە دەكەونە

شوێن ئەم پێغەمبەرەی کە نێردراوی خوایە و خوێندەواریی نازانێت و لە تەورات و ئینجیلیشدا ناوی نوسراوە، فەرمانی چاکەیان پێ دەکات و ناهێڵی خراپە بکەن، وە شتە پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و شتە پیسەکانیشیان لەسەر حەرام دەکات ....).

جا نازانم ئەگەر لە رێی فەرمودە و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆیەوە نەبێت ئەی ئێمە چۆن بزانین پێغەمبەر(ﷺ) چی حەڵاڵ کردوە و چیشی حەرام کردووە ، وە ئەو هەموو ئایەتانەی کە فەرمان بەشوێن کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) و گوێ رایەڵی فەرمانەکانی و کردنی بە پێشەنگی خۆمان دەکات چۆن جێ بەجێ بکەین و کاریان پێ بکەین ئەگەر ئێمە سوونەت رەت بکەینەوە:

(يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَـٰلَكُمْ) محمد/٣٣

(وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ) النور/٥٤.

(وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ). الحشر/٧.

(قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) آل عمران/٣١

(فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ) النور/٦٣

(لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ) الاحزاب/٢١

(وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) النحل/٤٤.

وە ئەوانەشی کە دەڵێن ئێمە گومانمان هەیە لەوەی کەفەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) راست و دروست بە دەستمان گەیشتبن، یان دەڵێن فەرمودەی هەڵبەستراویان تێکەڵ بووە و ناتوانرێت لێك جیا بکرێنەوە، بەڕاستی ئەو کەسانە تەنها لە بیانو دەگەڕێن بۆ وەلانانی فەرمودەکان و کارپێ نەکردنیان، بیانوەکەشیان زۆر لاواز و نابەجێ یە، چونکە ئەگەر کەسێك کەمترین زانیاری دەربارەی زانستەکانی فەرمودە هەبێت یان رۆژێك لە رۆژان چاوی بە یەکێك لەو کتێبانەدا خشاندبێت کە باس لە (علم الرجال) (علم الجرح والتعديل) (الأسانيد والمتون) (علم مصطلحات الحديث ) دەکەن هەڵبەتە ئەو راستی یەی بۆ دەردەکەوێت کە ئەو ئەرك و رەنج و ماندوو بوونەی بە درێژایی مێژوی ئیسلام لەلایەن زانا بەڕێز و لە خۆبوردوەکانەوە بۆ پاراستنی فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دراوە و ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی کە داویانە لە پێناو پاك و سەلامەت گەیاندنی فەرمودەکاندا و هەروەها ناسین و هەڵسەنگاندنی راوی یەکان و مەرجەکانی وەرگرتنی فەرمودە لێ یان و بەراورد کردنی (اسانيد) ەکانی بەیەکتر و بەراوردکردنی دەقی فەرمودەکانیش بە دەقەکانی قورئان و پاشانیش بژارکردن و دەست نیشان کردنی فەرمودە هەڵبەستراوەکان و جیا کردنەوەی یان لە فەرمودە راستەکان، ئەوا هەرگیز گومانی لەو جۆرەی بۆ دروست نەدەبوو وە دڵنیاش دەبوو لەوەی کە قسەو سەرگوزەشتەی هیچ مرۆڤێك بەدرێژایی مێژوو

نەتوانراوە وەك و سیرەت و سوننەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بپارێزرێت و وەك و خۆی بێ هیچ زیادوکەمێك و دەستکارییەکی ناحەزان بمێنێتەوە.

## ( ٣ ) ( حەڵاڵ و حەرام ئاشکران )

(١٨١) (ق ٤ ) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الحَلالُ بَيِّنٌ وَالحَرامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لايَعْلَمُهَا كَثيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ،إسْتَبْرَأَ لدينه وَعِرْضه، وَمَنْ وَقَعَ في الشُّبُهَاتِ، وَقَعَ في الحَرَامِ ،كَالرَّاعي حَوْلَ الحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فيْه، أَلا وَ إنَّ لكُلِّ مَلك حمىً، أَلَا وَ إنَّ حمَى الله مَحَارِمُهُ، أَلا وَإنَّ في الجَسَد مُضْغَةً، إذا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، أَلا وَ هِيَ القَلْبُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

( حەڵاڵ ئاشکرایە و حەرامیش ئاشکرایە، وە لەنێوانیشیاندا هەندێك شتی لێکچوی تێدایە کە زۆربەی خەڵك نایانزانێت، جا هەرکەسێك خۆی لە شتە گوماناوی یەکان بپارێزێت ئەوا دین و ناموسی خۆی پاك راگرتووە، وە هەرکەسێکیش بکەوێتە ئەو شتە گوماناویانەوە ئەوا کەوتۆتە حەرامەوە، هەروەکو شوان لە دەوری کێڵگەی پەرژین کراو وەختەیە تێی بکەوێت، جا هەموو پاشایەك کێڵگەی پەرژین کراوی خۆی هەیە وەکێڵگەی پەرژین کراوی خواش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردووە، وە لەناو جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر ساغ و دروست بوو ئەوا هەموو جەستەش پێوەی ساغ و دروست دەبێت، وە ئەگەر خراپیش بوو جەستە هەمووی بە جارێك لەگەڵیدا خراپ دەبێت، ئەو پارچە گۆشتەش بریتی یە لە دڵ) .

## ( ٤ ) ( لەکاتی ترساندا )

(١٨٢) ( ن ) عن ثوبان: ﴿ كَانَ إذا رَاعَهُ شَيْءٌ قَالَ: اللهُ اللهُ رَبِّي لا شَرِيكَ لَهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع

( پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر لە شتێ بسڵەمیایەتەوە یان بترسایە دەیفەرموو الله الله پەروەردگارمە، هیچ شەریك و هاوتای نی یە ).

## (( بەشی: باوەڕ – ئیمان ))

## (١) (باوەڕ بەقەزاو قەدەر)

(١٨٣) ( حم ق د ق ه ) عن أبی هریرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إحْتَجَّ آدَمُ وَ مُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: يَاآدَمُ أَنْتَ أَبُونَا، خَيَّبْتَنَا وَ أَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ. فَقَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلامِهِ وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ فَقَالَ النَّبِيُّ(ﷺ): ( فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٢٣٣) في صحيح الجامع

( ئادەم و موسی بەڵگە و گازیندەیان لەسەر یەکتر هێنایەوە، موسا وتی: ئەی ئادەم تۆ باوکمانی، نابوتت کردین و لەبەهەشت دەرت هێنایین، ئادەمیش پێی ووت: تۆ موسایت، خوا تایبەت هەڵیبژاردویت کە قسەت لەگەڵدا بکات، وە بەدەستی خۆیشی نوسراوی بۆ نوسیویت، لەسەر کارێك لۆمەم دەکەیت، کە خوا لەسەری تەقدیری کردووم ،پێشی ئەوەی دروستم بکات بە چل ساڵ ؟ ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیتر ئادەم موسای بەڵگە بڕاو کرد، ئیتر ئادەم موسای بەڵگە بڕاو کرد).

## (٢) (دەربارەی مونافیق )

(١٨٤) ( ت ن )عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ، إِنِّي قَدْ خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، قَدْ قِيلَ لِي (إسْتَغْفِرْلَهُمْ أَوْلا تَسْتَغْفِرْلَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْلَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَاللهُ لَهُمْ) لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي لَوْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ غَفَرَلَهُ لَزِدْتُ. قَالَ: ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهِ وَ مَشَى مَعَهُ، فَقَامَ عَلَى قَبْرِهِ حَتَّى فُرِغَ مِنْهُ ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٢٢٣٣) في صحيح الجامع

( وازم لێ بێنە ئەی عومەر، من ڕێگەم پێ دراوە کە هەڵبژێرم ،منیش هەڵمبژارد، پێم ووترا : ﴿بۆیان بپاڕێیتەوە یان بۆیان نەپاڕێیتەوە، ئەگەر حەفتا جاریش بۆیان بپاڕێیتەوە و داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت خوای گەورە هەر لێیان خۆش نابێت ﴾ ئەگەر بمزانیبایە لە حەفتا جارەکە زیاتر داوای لێبوردنم بۆ بکردایە خوا لێ دەبوری ئەوا دەمکرد). عومەر دەڵێ: پاشان نوێژی لەسەر کرد و لەگەڵ جەنازەکەیدا ڕۆشت وە لەسەر گۆڕەکەی هەستا هەتا لە ناشتنی بوونەوە.

### ڕونکردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرمودەیە باس لە (عبد الله کوڕی أبي سلول) دەکات کەسەرکردەی مونافیق و دووڕوەکان ،بوو کە دوای ئەوەی مرد، پێغەمبەر (ﷺ)ویستی دوعای خێر و داوای لێ بوردنی لە خوا بۆ بکات، عومەریش پێی ووت ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە سەرۆکی مونافیقەکانە و خوای گەورەش دەرحەق

خـۆی و تاقمەکـەی دەفـەرموێت ئەگـەر حـەفتا جاریش داوای لێبوردنیـان بـۆ بکـەیت خـوا لێیـان خـۆش نابێت، ئەویش ئەم فەرمودەیەی فەرموو، بەڵام دواتـریش ئایـەتی قورئـان هاتـە خـوارەوە کـە بەتـەواوەتی لەسەر پێغەمبەری قەدەغەکرد کە داوای لێبوردن بۆ ئەو مونافیق و دوو روانە بکات چونکە ئەوان بە دڵ کافر بوون و تەنها بەڕواڵەت موسڵمان بوون.

## ( ٣ ) ( بـاش ئیسلام بـوون )

(١٨٥) ( مالك ن هب ) عن ابی سعید قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِذا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلامُهُ كَتَبَ اللهُ لَهُ كُلَّ حَسَنَةٍ كَانَ أَسْلَفَهَا وَمُحِيَتْ عَنْهُ كُلُّ سَيِّئَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا، ثُمَّ كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ الْقِصَاصُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبعمِائَةِ ضِعْفٍ وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللهُ عَنْهَا ﴾ . ( صحیح ) ینظر حدیث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( ئەگـەر بەندەیـەك موسـڵمان بـوو، ئیـسلامەتی یەکەیـشی بـاش بـوو، ئـەوا خـوای گـەورە هـەموو چاکەیەکی بۆ دەنوسێت کە لە پێشتریشدا کردوویەتی، وە هەموو خراپەیەکیشی لەسـەر دەسـڕێتەوە کـە پێشتر توخنی کەوتوە و، ئیتر دوای ئەوە سەربەسەر دەبێت چاکەکردن بـە دەهێندەیـە هـەتا حـەوت سـەد قات، وە خراپەش بە هێندەی خۆی مەگەر خوای گەورە لێ ی ببورێت ).

(١٨٦) ( خ ن ) عن ابی سعید قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إِذَا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ كُلَّ حَسَنَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا وَمُحِيَتْ عَنْهُ كُلُّ سَيِّئَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا ثُمَّ كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ الْقِصَاصُ الْحَسَنَةُ بِعَشْرَةِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلاَّ أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهَا﴾ . ( صحیح ) ینظر حدیث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( ئەگـەر بەندەیـەك موسـڵمان بـوو، ئیسلامەتییەکەیـشی بـاش بـوو، ئـەوا خـوای گـەورە هـەموو چاکەیەکی بۆ دەنوسێت کە لە پێشتردا کردوویـەتی، ئیتر هـەموو کردەوەیـەك دوای ئـەوە سـەر بەسـەرە ، چاکەکردن بە دە هێندەی خۆی هـەتا حـەوت سـەد قات، وە خراپـەیش بـە هێنـدەی خـۆی مەگـەر خـوای گەورە لێی ببورێت ).

## ( ٤ ) ( بـاشتریـنی بڕواداران )

(١٨٧) ( طب ) عن إبن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَفْضَلُ الْمُؤْمِنِيْنَ إِسْلاماً مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ وَأَفْضَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيْمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً وَأَفْضَلُ الْمُهَاجِرِينَ مَنْ هَجَرَ مَانَهَى اللهُ تَعَالَى عَنْهُ وَ أَفْضَلُ الْجِهَادِ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي ذَاتِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴾ . ( صحیح ) ینظر حدیث رقم ( ٣٢٣٣ ) في صحيح الجامع

( باشترینی بڕواداران لە ئیسلامەتییەکەیدا ئەو کەسەیە کە موسڵمانانی تر لە زمان و دەستی پارێزراوبن، وە باشترینی بڕواداران لە بڕوادارییەکەیدا ئەو کەسەیە کە لە هەمووان ڕەوشتی باش و جوانترە، وە باشترینی کۆچ کردوەکانیش ئەو کەسەیە کە کۆچ لەو شتانە بکات کە خوای گەورە نەهی لیٚ کردوون و دەستیان لیٚ هەڵبگرێت، وە باشترینی هەوڵ و تێکۆشانیش ئەو کەسەیە کە بەربەرەکانی نەفسی خۆی دەکات لە پێناو خوای گەورەدا ).

## ( ٥ ) ( فەزیلەتی ئیسلام )

**(١٨٨) ( ن هب الصیاء ) عن ابی قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنْتَسَبَ رَجُلانِ عَلَى عَهْدِ مُوسَى، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: أَنَا فُلانٌ إبْنُ فُلانٍ حَتَّى عَدَّ تِسْعَةً فَمَنْ أَنْتَ لا أُمَّ لَكَ؟ قَالَ: أَنَا فُلانٌ إبنُ فُلانٍ إبْنُ الإسْلام. فَأَوْحَى اللهَ إلَى مُوسَى أَنْ قُلْ لِهَذَيْنِ الْمُنْتَسِبَيْنِ: أَمَّا أَنْتَ أَيُّهَا الْمُنْتَسِب إلَى تِسْعَةٍ فِي النَّار فَأَنْتَ عَاشِرُهُمْ، وَ أَمَّا أَنْتَ أَيُّهَا الْمُنْتَسِبُ إلَى إثْنَيْنِ فِي الْجَنَّةِ فَأَنْتَ ثَالِثُهُمَا فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحیح) ینظر حدیث رقم (٣٢٣٣) في صحیح الجامع**

( دوو پیاو لە سەردەمی موسادا باسی ڕەچەڵەکی خۆیان کرد، یەکێکیان ووتی: من فلأنی کوڕی فلأنم –هەتا نۆ پشتی خۆی ژمارد– ئەی تۆ کێیت ناکەس بەچە ؟ ئەویش ووتی: منیش فلأنی کوڕی فلأنی کوڕی ئەو ئیسلامەم. خوای گەورەش وەحی بۆ موسا نارد کە بەو دوانە بڵیٚ: تۆ ئەی ئەو کەسەی کە ڕەچەڵەکت هەتا نۆ پشت لە ئاگردان ئەوا تۆ دەیەمیانی لە ئاگردا. وە تۆش ئەی ئەوەی کە ڕەچەڵەکت هەتا دوان لە بەهەشتدان ئەوا تۆ سیٚ هەمیانی لە بەهەشتدا ).

## ( ٦ ) ( ڕاست گۆیی سەرفرازی یە )

**(١٨٩) ( ق ) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إلَى الْبِرِّ، وَإنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرجُلُ يَصْدُقُ وَ يَتَحَرَى الصِّدْقَ حَتَى يُكْتَبَ عِنْدَ الله صِدِّيقاً، وَ إيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إلَى الْفُجُور، وَإنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إلَى النَّار، وَمَا يَزَالُ الْعَبْدَ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَى الْكَذِبَ حَتَى يُكْتَبُ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً ﴾. (صحیح) ینظر حدیث رقم (٣٢٣٣) في صحیح الجامع**

( ڕاستگۆیی بگرن، چونکە ڕاستگۆیی ڕێنوماییتان دەکات بۆ چاکە، وە چاکەش ڕێنوماییتان دەکات بۆ بەهەشت، وە بەردەوام پیاو ڕاست دەڵیٚ و هەوڵی ڕاستگۆیی دەدات هەتا لەلای خوا بە ڕاستگۆ دەنوسرێت، وە نەچن بەلای درۆدا، چونکە درۆ کردن ڕێنوماییتان دەکات بۆ خراپەکاری، وە خراپەرکاریش ڕێنوماییتان دەکات بۆ ئاگر، وە بەردەوام بەندە درۆ دەکات و هەوڵی درۆ کردن دەدات هەتا لەلای خوا بە درۆزن دەنوسرێت ).

## ( ٧ ) ( تاوانكردن دڵ رش دەكاتەوە )

(١٩٠) ( حم ت ن ه حب ك هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إنَّ الْعَبْدَ إذا أخْطَأَ خَطِيئةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِه نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ ( كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ) ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

( بەندە ئەگەر هەڵەیەکی (گوناهێکی) کرد خاڵێکی رەش لە دڵی دەدرێت، جا ئەگەر وازی هێنا و داوای لێبوردنی کرد و تۆبەی کرد خاڵەکە دەسڕدرێتەوە و دڵی روون دەبێتەوە، وە ئەگەر گەڕایەوە سەرتاوانەکە ئەوا خاڵە رەشەکە بۆی زیاد دەکرێت هەتا دڵی دادەپۆشێت، ئەویش ئەو ژەنگەیە کە خوا باسی کردووە (كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ)المطففين/١٤ واتە ( نەخێر بەڵکو ئەوانە ژەنگی کارەکانی خۆیان بۆتە توێژێك بەسەر دڵیانەوە ).

## ڕونكردنەوەی فەرمودەكە :

ئەم فەرمودە پیرۆزە گرنگی تۆبەکردن و پەشیمان بونەوەمان بۆ رون دەکاتەوە لە دوای هەموو گوناهو تاوانێك کە لە دەستمان دەردەچێت، مرۆڤ هەمووی هەڵە و تاوان دەکات بەڵام گرنگ ئەوەیە کە مرۆڤەکە سور نەبێت لەسەر ئەو تاوان و گوناهە بەڵکو بە دوای هەموو گوناهێکدا تۆبە بکات یان لانی کەم چاکەیەکی وای بەدوادا بکات کە لە ئاستی گوناهەکەدا بێت کە کردوویەتی بەمەش دەتوانین پارێزگاری لە دڵەکانمان بکەین کە بەسپێتی بمێنێتەوە و ژەنگ و چڵکی تاوان داینەپۆشێت و تەواو رەشی نەکاتەوە، چونکە خوا پەنامان بدات هەر دڵێك کە تەواو رەش بووە وە و سپێتی تێدا نەما ئەوا قفڵی لێ دەدرێت و مۆر دەکرێت و رەحمەتە جارێکی تر خوای گەورە هیدایەتی بدات بۆ تۆبە کردن.

## ( ٨ ) ( نیاز و ختورەکانی دڵ )

(١٩١) ( ه هق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَجاوَزَ لأُمَتي عَمَّا تُوَسْوِسُ بِهِ صُدُورِهِمْ مَالَمْ تَعْمَل أَوْ تَتَكَلَّمْ بِهِ وَ مَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

(خوای گەورە بۆ ئوممەتەکەم لەوە بوراوە کە لە سنگیاندا ختورە دەکات ، بە مەرجێك کاری پێ نەکەن و بە قسە نەیدرکێنن ، هەروەها لەوەش بوراوە کە بە زۆر ناچار بکرێن بیکەن ).

(١٩٢) (ق ٤) عن أبي هريرة ( طب ) عن عمر ان بن حصين قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعَالَى تَجَاوَزَ لأُمَتي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَالَمْ تَتَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

واتە: ( خوای گەورە بۆ ئومەتەکەم لەوە بوراوە کە لە دڵی خۆیاندا دەیڵێن بەمەرجێك بە قسە نەیدرکێنن، یان کاری پێ نەکەن ).

**(١٩٣) ( حم خ ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَجَاوَزَ اللهُ لأُمَّتِي مَاحَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا ، مَالَمْ تَتَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ بِه ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە لەوە بوراوە بۆ ئوممەتەکەم کە لە دڵی خۆیاندا دەیڵێن، بەمەرجێك بە قسە نەری درکێنن، یان کاری پێ نەکەن ).

# ( ٩ ) ( بڕیاری چاکەکردن و بڕیاری خراپەکردن )

**(١٩٤) ( ق )عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئاتِ، ثُمَّ بَيَّنَ ذلكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إلى سَبْعمائَةِ ضِعْفٍ إلى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَإنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَ إِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا، كَتَبَهَا اللهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً، وَلا يَهْلِكُ عَلَى اللهِ إلَّا هَالِكٌ ﴾ (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٣٣) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە کارە چاکەکان و کارە خراپەکانی هەردووك نوسیوە و ،پاشانیش رونی کردونەتەوە و ئاشکرای کردوون ، جا هەر کەسێك ویستی چاکەیەك بکات و نەیکرد ئەوا خوای گەورە بە چاکەیەکی تەواو لای خۆی بۆ ی دەنوسێت، وە ئەگەر ویستی بیکات و کردیشی، ئەوا خوای گەورە لەلای خۆی بە دە چاکە هەتا حەوت سەد قات هەتا چەندین قاتی زۆر بۆی دەنوسێت، وە ئەگەر ویستی خراپەیەك بکات و نەیکرد، ئەوا خوای گەورە بە چاکەیەکی تەواو لای خۆی بۆی دەنوسێت، وە ئەگەر ویستی بیکات و کردیشی ئەوا خوای گەورە بەیەك خراپە دەینوسێت،وە کەس لەسەر خوای گەورە تیا ناچێت مەگەر کەسێك هەر خۆی فەوتاوو و لەناوچوو بێت).

## (١٠) ( پتەوترین هەنگڵی ئیسلام )

**(١٩٥) ( حم ش هب ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ أَوْثَقَ عُرَى الإِسْلامِ: أَنْ تُحِبَّ فِي اللهِ وَتَبْغَضَ فِي اللهِ ﴾ .** (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

( پتەوترین هەنگڵێکی ئیسلام ئەوەیە: کە لەبەر خوا خۆشەویستی بکەیت، و رق لێ بوونەوەشت هەر لەبەرخوا بێت ).

**(١٩٦) (طب) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَوْثَقُ عُرَى الإِيْمَان: أَلْمُوالاةُ فِي اللهِ وَ الْمُعَاداةُ فِي اللهِ وَالْحبُّ فِي اللهِ وَ الْبُغْضُ فِي الله عَزَّوَجَلَّ ﴾ .** (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

(پتەوترین هەنگڵێکی باوەڕ ئەوەیە: دۆستایەتی لەبەر خوا بکەیت و دوژمنایەتیش لە پێناو خوادا بکەیت، و خۆشەویستیت لەبەر خوا بێت و رق لێبوونەوەشت لە پێناو خوای گەورەدابێت ).

## (١١) ( بەشەکانی باوەڕ)

**(١٩٧) (ت) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلإِيْمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ بَاباً، فَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ وَأَرْفَعُهَا قَوْلُ لا إِلهَ إِلَّا الله ﴾ .** (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع.

( ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشە، نزم ترینیان لابردنی شتی ئازاردەرە لەسەر رێگا بەرزترینشیان وتنی (لا اله الا الله) یە ).

**(١٩٨) (م د ن هـ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلإِيْمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُون، أَوْ بِضْعٌ وَ ستُّونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لا إِلهَ إِلَّا الله وَ أَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيْمَانِ ﴾ .** (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

( ئیمان حەفتاو ئەوەندە یان شەست و ئەوەندە بەشە، باشترینیان وتنی (لا اله الا الله) یە، و نزمترینیشیان لادانی ئازارە لەسەر رێگا، و شەرمیش بەشێکە لە ئیمان ).

## ( ١٢ ) ( لادانی ئازار لەسەر ڕێ ی موسڵمانان )

(١٩٩) (مالك حم ق ن ) عن أبی هریرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي الطَّرِيقِ إِذْ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

واته: ( له کاتێکدا که پیاوێك به ڕێگادا دەڕۆیشت چڵە دڕکێکی بینی، ئەویش لەسەر ڕێگاکە لای برد و دوری خستەوە، خوای گەورەش له سوپاسی ئەو کارەیدا لێ ی خۆش بوو).

(٢٠٠) ( طس ) عن ابی الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَخْرَجَ مِنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ شَيْئاً يُؤْذِيهِمْ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهِ حَسَنَةً، وَمَنْ كُتِبَ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةٌ أَدْخَلَهُ بِهَا الْجَنَّةَ ﴾. (صحيح) ينظر حديث رقم (٣٢٢٣) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك شتێك لەسەر ڕێگای موسڵمانان لا بدات که ئازاریان بدات، خوای گەورە بەو کارە چاکەیەکی بۆ دەنوسێت، وە ئەو کەسەی کە خوا لای خۆی چاکەی بۆ بنوسێت، بەو چاکەیە دەیخاتە بەهەشتەوە ).

## ( ١٣ ) ( چێژی باوەڕ )

(٢٠١) ( د ) عن عبد الله بن معاوية الغاضری قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثٌ مَنْ فَعَلَهُنَّ فَقَدْ طَعِمَ طَعْمَ الإِيمَانِ: مَنْ عَبَدَ اللهَ وَحْدَهُ وَ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلَّا الله، وَ أَعْطَى زَكَاةَ مَالِهِ طَيِّبَةً بِهَا نَفْسُهُ رَافِدَةً عَلَيه كُلَّ عَامٍ، وَلا يُعْطِي الْهَرِمَةَ وَلا الدَّرِنَةَ وَلا الْمَرِيضَةَ وَلا الشَّرَطَ اللَّئِيمَةَ، وَلَكِنْ مِنْ وَسَطِ أَمْوَالِكُمْ، فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَسْأَلْكُمْ خَيْرَهُ وَلا يَأْمُرُكُمْ بِشَرِّهِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم ( ٣٠٢٥ ) في صحيح الجامع

( سێ شت هەن هەر کەسێك بیانکات ئەوا بە تەواوەتی چێژی ئیمانی چەشتووە، هەرکەسێك تەنها خوا بپەرستێت وە شایەتی بدات کە هیچ خوایەك نی یە تەنها ( الله) نەبێت، وە بەدڵ پێخۆش بوونەوە هەموو ساڵێك زەکاتی ماڵەکەی بدات، نە ئاژەڵی پیر و نەگەڕ و نە نەخۆش و نەگەندە و بێ کەڵك بۆ زەکات نەدات، بەڵکو لە ناوەندی ماڵەکەی، چونکە خوای گەورە داوای لێ نەکردوون باشەکانی هەڵبژێرن و فەرمانیشتان پێ ناکات خراپەکانی هەڵبژێرن ).

(٢٠٢) ( حم ق ت ن ه ) عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ طَعْمَ الإِيمَانِ: مَنْ كَانَ يُحِبَّ الْمَرْءَ لايُحِبُّهُ إِلا للهِ، وَ مَنْ كَانَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ كَانَ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَرْجِعَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللهُ مِنْهُ ﴾. اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٠٤١) في صحيح الجامع

( سیٚ شت هەن لە هەرکەسێکدا هەبن ئەوا چێژی ئیمانی چەشتووە: ئەو کەسەی کە ئەگەر کەسێکی خۆش ویست لەبەر هیچ شتێك خۆشی نەوێت تەنها لەبەر خوا نەبێت، وە ئەو کەسەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی لەلا خۆشەویستر بێت لە هەموو شتێکی تری جگە لەوان، وە ئەو کەسەشی کە فڕیٚ بدرێتە ناو ئاگرەوە خۆشتر بێت لە لای لەوەی کە بگەرێتەوە بۆ بیٚ باوەڕی، پاش ئەوەی کە خوای گەورە رزگاری کردووە لێی ) .

# ( ١٤ ) ( پایەکانی ئیسلام )

(٢٠٣) ( حم ت ك ه هب ) عن معاذ زاد ( طب هب ) قلت: يا رسول الله(ﷺ) اخبرني بعمل يدخلني الجنة و يباعدني من النار، قال: ﴿ لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ وَ إِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ. ثُمَّ قَالَ: أَلا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِيءُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِيءُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ تَلا ﴿ تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ ﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿ يَعْمَلُونَ ﴾ ثُمَّ قَالَ: أَلا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)قَالَ: رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ، وَعَمُودُهُ وَ ذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ، ثُمَّ قَالَ: أَلا أُخْبِرُكَ بِمِلاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ)! فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ ثُمَّ قَالَ: كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا، قُلْتُ: يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ) وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فَقَالَ : ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥١٣٥) في صحيح الجامع

(معاذ) دەڵیٚ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کارێکم پیٚ بڵیٚ کە بمخاتە بەهەشتەوە و لە ئاگرم دوور بخاتەوە، فەرمووی: ( بە راستی پرسیاری شتێکی گەورەت کرد، وە ئاسانیشە لەسەر هەر کەسێك کە خوای گەورە لەسەری ئاسانی بکات: خوای گەورە بپەرستیت و هیچ شەریکێکی بۆ بڕیار نەدەیت، وە نوێژ راگیراو بکەیت، وە زەکات بدەیت، وە رەمەزان بە رۆژو بیت، و حەجی ماڵی خوا بکەیت ) پاشان فەرمووی: ( ئەی دەرگاکانی خێر و چاکەت نیشان بدەم ؟ رۆژوگرتن قەڵغانە، سەدەقەو ماڵ بەخشینیش تاوان دەکوژێنێتەوە هەروەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، وە ئەو نوێژەش کە پیاو لە قوڵایی شەودا دەیکات ). پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە – تتجافى جنوبهم عن المضاجع – هەتا گەیشتە –يعملون– پاشان فەرمووی: ( ئەی سەری ئەم کارە و قەدەکەی و چڵە پۆ پەکەیت پیٚ نیشان بدەم ؟ ) ووتم: بەڵیٚ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: ( سەری کارەکە ئیسلامە، وە قەدەکەشی نوێژە، وە چڵە پۆپەکەشی جیهاد کردنە ). پاشان فەرمووی: ( ئەی پێت بڵێم چۆن دەبیتە خاوەنداری هەموو ئەوانە ؟) ووتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش زمانی خۆی گرت و پاشان فەرمووی: (ئا ئەمەی خۆت بگرە و بیپارێزە ) منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەو قسانە کە ئێمە دەیکەین خوا لێمان دەگرێت ؟ ئەویش فەرمووی: ( ئەی دایکت رۆڵە رۆت بۆ بکات، بۆچی ئەوەی کە ئەو خەڵکە بە دەمدا فڕیٚ دەداتە ناو ئاگرەوە هەر دروێنەی زمانەکانیان نی یە ؟) .

# ( ١٥ ) ( چاودێری کردنی دڵ و ئەندامەکان )

**( ٢٠٤ ) ( حم ت ) عن أبی هريرة: قُلْنا يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ): ما لَنا إذا كُنا عِنْدَكَ رَقَّتْ قُلُوبُنا وَ زَهَدْنا فِي الدُّنْيَا وَكُنَا مِنْ أَهْلِ الآخِرَة، فإذا خَرَجْنا مِنْ عِنْدِكَ فَآنَسْنا أَهالِيْنَا وَ شَمَمْنَا الأوْلادَ أنْكَرْنَا أنْفُسَنا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ لَوْ أَنَّكُمْ تَكُونُونَ إذاخَرَجْتُمْ مِنْ عِنْدِي كُنْتُمْ عَلَى حَالِكُمْ ذَلِكَ لَزارَتْكُمْ الْمَلائِكَةُ فِي بُيُوتِكُمْ، وَلَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَجَاءَ اللهُ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ كَي يُذْنِبُوا فَيَغْفِرَ لَهُمْ ﴾ ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) مِمَّ خُلِقَ الخَلْقُ؟ قَالَ: ﴿ مِنَ الْمَاءِ ﴾ . قُلْنَا الجَنَّةُ مَا بِناؤُهَا؟ قَالَ: ﴿ لَبِنَةٌ مِنْ فِضَةٍ وَ لَبِنَةٌ مِن ذَهَب، وَمِلاطُهَا الْمِسْكُ الأذْفَرُ وَحَصْبَاؤُهَا اللُؤْلُؤُ وَاليَاقُوتُ وَتُرْبَتُهَا الزَّعْفَرانُ، مَنْ يَدْخُلُهَا يَنْعَمُ لا يَبْأَسْ، وَيَخْلُدُ لايَمُوتُ، وَلا تَبْلَى ثِيَابُهُمْ وَلا يَفْنَى شَبَابُهُمْ. ثُمَّ قَالَ: ثَلاثٌ لاتُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ: الإمَامُ العَادِلُ، وَالصَّائِمُ حِيْنَ يُفْطِرُ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ يَرْفَعُهَا فَوْقَ الغَمَامِ وَتُفَتَّحُ لَهَا أَبْوابَ السَّماءِ، وَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّوَجَلَّ: وَعِزَّتِي لأنْصُرَنَّكَ وَلَوْ بَعْدَ حِيْنٍ ﴾ . اللفظ للترمذی .( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٥٢٤٩ ) في صحيح الجامع**

( ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): ئەوە بۆچی کاتێك کە ئێمە لای تۆ دەبین دڵەکانمان نەرم دەبن و خۆشیمان لە دونیا نایەت و دەبینە خەڵکی ئەو دونیا، کەچی هەر ئەوەندی لای تۆ هاتینە دەر و ئولفەتمان بە خێزانەکانمانەوە گرت و بۆنی منداڵەکانمان کرد، خۆمان لێ دەگۆڕێت ؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: ( ئێوە ئەگەر ئەو کاتەی کەلەلای من دەچنە دەرەوە لەسەر هەمان حاڵ و شێوەی لای من بمانایەتەوە ئەوا فریشتەکان لە ماڵەکانی خۆتاندا سەردانیان دەکردن، وە ئەگەر گوناهیشتان نەکردایە، خوای گەورە کەسانێکی نوێ ی دەهێنا بۆ ئەوەی تاوان بکەن هەتا لێیان خۆش بێت ).

دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا مەخلوقات لە چی دروست کراوە ؟ فەرمووی: ( لە ئاو ). ووتمان ئەی بەهەشت بە چ شتێك بونیات نراوە ؟ فەرمووی: ( خشتێك لە زیوو و خشتێك لە ئاڵتون، وە سواغ دانی دیواریشی بە میسکی بۆنداره وە زیخ و چەوەکەیشی یاقوت و مرواری یە، وە خۆڵ وگڵەکەیشی زەعفەرانە، هەرکەسێك تێ ی بچێت خۆشحاڵ دەبێت و زویر نابێت، وە هەردەژی و نامرێت، وە پۆشاکەکانی بەریان ناڕزێت و گەنجێتی یان لەناو ناچێت)، پاشان فەرمووی: ( سێ کەس دوعا و نزایان ڕەت ناکرێتەوە: پێشەوای دادپەروەر، وە ڕۆژووەوان هەتا ڕۆژووەکەی دەشکێنێت ،وە نزای ستەم لێکراو بەرزی دەکاتەوە بۆ سەر و هەورەکان وە دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکاتەوە، وە پەروەردگاری گەورە دەفەرموێت ( سوێند بە بەرزی و شکۆمەندیم هەر دەبێت سەرت بخەم ئەگەر پاش هەینێکی تریش بێت ).

## (١٦) ( پشت بەستن بە خوا )

(٢٠٥) ( حم ت هـ ك ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِه لَرُزِقْتُمْ كَمَا تُرْزَقُ الطَّيْرُ، تَغْدُو خِمَاصاً وَتَرُوحُ بِطَاناً ﴾.(صحيح) أنظر حديث رقم (٥٢٥٣) في صحيح الجامع

( ئەگەر ئێوە پشت بەستنێکی تەواو پشتان بەخوا ببەستایە، هەر وەك چۆن باڵندە رزق دەدرێت ئێوەش ئاوا رزقتان دەدرا، سبەینان بە برسێتی دەچێتە دەرەوە و ئێوارانیش بە تێری دەگەڕێتەوە ).

### ڕونکردنەوەی فەرموودەکە:

ئەم فەرمودە پیرۆزە هانی پشت بەستن بە خوای گەورەمان دەدات، پشت بەستنێك کە حەقی تەواوی خۆی پیْ درابێت، بەڵام ئەوەی پێویستە لێرەدا روون بکرێتەوە بریتی یە لە جیاوازی کردن لە نێوا پشت بەستن بە خوا ( توکل ) وە لە نێوان تەمبەڵی و بیْ دەستەڵاتی و زغەلەیدا، چونکە کار نەکردن و پاڵدانەوە لەماڵەوە بە ئومێدی دابەزینی رزق لە ئاسمانەوە، ئەمە نەپشت بەستنە بە خواو نە ئاکار و ڕێبازی پێغەمبەران و خواناسانیشە، چونکە هەروەك لە فەرمودەکەشدا دەردەکەوێت کە باڵندەکان لە هێلانەکانی خۆیاندا دانانیشن هەتا رزقیان بۆ دێت بەڵکو دەچنە دەرەوە و دەگەڕێن ئینجا خوای گەورە لەو دەشت و چۆڵەدا رزقیان دەدات، مرۆڤیش دەبێت بجوڵێت و هەوڵ بدات و بکۆشێت ئینجا پشت بە خوای گەورە ببەستێت و بزانێت ئەو رزقەی کە خوای گەورە بۆی داناوە کەسی تر نایخوات، کەواتە پشت بەستن بە خوای گەورە بەو مانایەیە کە هەڵپە و دڵە راوکیْ و چاو چنۆکی و نا ئومێدیی ، بەرۆك و وێزەی کەسی موسڵمان و باوەڕدار نەگرێت و سەری دونیا لە خۆی نەهێنێتەوە یەك و دڵنیابێت لەوەی کە خوای گەورە خۆی رۆزی دەرەو و رزقەکەی ئەو بە دەست کەس نی یە تەنها پەروەردگار خۆی نەبێت.

## (١٧) ( باوەڕهێنا بە قەدەر چاك و خراپی )

(٢٠٦) ( حم ) عن زيد بن ثابت ( حم د هـ حب طب ) عن أبي بن كعب و زيد بن ثابت و حذيفة و إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿لَوْ أَنَّ الله تَعَالَى عذَّبَ أَهْلَ سَماواته وَأَهْلَ أَرْضه لعَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالم لَهُمْ، وَلَو رَحِمَهُمْ كَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْراً لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ، وَلَوْ أَنْفَقْتَ مِثْلَ أُحُد ذَهباً فِي سَبِيلِ الله تَعالَى ما قَبِلَهُ الله تَعالَى مِنْكَ حَتَى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ وَتَعْلَمَ أَنَّ ما أَصابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَلَوْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هذا لَدَخَلْتَ النَّار ﴾(صحيح) أنظر حديث رقم (٥٢٤٣) في صحيح الجامع

أُبي بن كعب و زيد بن ثابت و حذيفة و إبن مسعود دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر بهاتایەت و خوای گەورە هەموو ئەهلی ئاسمانەکان و ئەهلی زەوی ئەشکەنجە بدایە، ئەشکەنجەی دەدان و زاڵمیش نەدەبوو بەرامبەریان، ئەگەر رەحمیشی پێی بکردنایە ئەوا رەحمەتەکە ی ئەو باشتر بوو بۆیان لە کردەوەکانی خۆیان، وە ئەگەر هێندەی کێوی ( أحد) یش ئاڵتون لە پێناوی خوای گەورەدا سەرف بکەیت، خوای گەورە لێتی قبوڵ ناکات هەتا باوەڕ بە قەدەر دەهێنیت، و بزانیت ئەوەی کە توشت دەبێت هەرگیز نەدەبوو توشت نەبێت، وە ئەوەشی کە توشت نەبوویێ هەرگیز نەدەبوو کە توشت ببێت، وە ئەگەر لەسەر هەر بیر و باوەڕێکی تر غەیری ئەوە بمریت ئەوا دەچیتە ئاگرەوە ).

**(٢٠٧) ( حم ت ك ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ) ﴿ يَا غُلامُ! إنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: إحْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، إحْفَظِ اللهَ تَجِدهُ تُجَاهَكَ، إذا سَأَلْتَ فَسْأَلِ اللهَ، وَإذا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَأعلمْ أنَّ الأمَةَ لَو إجْتَمَعُوا عَلَى أنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَ إنِ اجْتَمَعُوا عَلَى أنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأقْلامُ وَجُفَّتِ الصُّحُفُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٧٩٥٠ ) في صحيح الجامع**

( ئەی گەنج: من چەند وشەیەکت فێر دەکەم: خوات لەیاد بێت، خوایش تۆی لەیاد دەبێت و دەتپارێزێت، خوات لە یاد بێت، دەبینیت ئەویش هەمیشە لەگەڵتدایە، وە ئەگەر داوای شتێکت کرد ئەوا داوا لە خوا بکە، وە ئەگەر هانات بۆ یەکێك برد ئەوا هانا بۆ خوا بەرە، وە بشزانە، ئەگەر میللەت هەمووی کۆبوونەوە کە سودێکت پێ بگەیەنن، سوودت پێ ناگەیەنن مەگەر بەشتێك نەبێت کە خوا خۆی بۆی نوسیویت، وە ئەگەر کۆشببنەوە لەسەر ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن. زیانت پێ ناگەیەنن مەگەر بەشتێك نەبێت کە خوا خۆی لەسەری نوسیویت، پێنوسەکان هەڵگیراون و لاپەڕەکانیشی وشك بوونەتەوە ).

**(٢٠٨) ( حم م هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إلَى اللهِ تَعَالَى مِنْ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ، إحْرَصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَلا تَعْجَزَنَّ، وَإنْ أصَابَكَ شَيْءٌ فَلا تَقُلْ: لَوْ أنِّي فَعَلْتُ كَذا كَانَ كَذا وَ كَذا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَّرَ اللهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإنَّ ( لَوْ ) تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٦٦٣٣ ) في صحيح الجامع**

( باوەڕ داری بەهێز باشتر و خۆشەویست ترە لای خوای گەورە لە باوەڕ داری لاواز و بێ هێز، وە هەر دوکیشیان هەرباشن، هەوڵی شتێك بدە کە سودت پێ بگەیەنێت، وە هانا بۆ خوا بەرەو دەستەوسان مەبە، وە ئەگەر توشی شتێك بوویت مەڵێ: ئەگەر من وام بکردایە ئەوا ئەوە و ئەوە دەبوو، بەڵکو بڵێ: خوا تەقدیری کردووە و ئەوەیشی وویستی لەسەر بێت دەیکات، چونکە ووشەی( ئەگەر ) کاری شەیتان دەکاتەوە ).

## ( ١٨ ) ( بەڵاو نەخۆشی گوناهەکان هەڵدەوەرێنن )

**(٢٠٩) ( ت ) عن ابی سعید قـال: قـال رسـول الله(ﷺ): ﴿ مـامنْ شَـيْء يُـصِيبُ الْمُـؤْمنَ مـنْ نَـصبٍ وَلاحزنٍ وَلاوصبٍ حَتَّى الهمُّ يَهُـمُّهُ إِلَّا يُكَـفِّرُ اللهُ بِه عَنْهُ سَيِّآته﴾ (صحيح) أنظر حـديث رقـم (٥٧٢٤) في صحيح الجامع**

( هەر شتێك کە دوو چاری باوەڕدار دەبێت لە هیلاکی و دڵ تەنگی و ئازار و نەخۆشـی ،و تەنانـەت خەمێکیش کە دەیخوات ئەوا خوای گەورە تاوان و خراپەی پێ لەسەری دەسڕێتەوە)

**(٢١٠) ( ق ) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامنْ مُسْلمٍ يُـصِيبُهُ أَذى مـنْ مـرَضٍ فَمـا سـواهُ، إِلَّا حـطَّ الله بِه سـيِّئاته كَمَا تَحُطُّ الشَّـجرَةُ وَرَقَهَا ﴾ (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٧٦١) في صحيح الجامع**

( هـەر موسـڵمانێك دوچـاری ئازارێـك ببێـت لـە نەخۆشـی و هـەر شـتێکی تـر، ئـەوا خـوای گـەورە تاوانەکانی پێی هەڵدەوەرێنێت، هەروەك چۆن گەڵای دار هەڵدەوەرێت ).

## ( ١٩ )( ئاكامی سەرپێچی كردن لە فەرمانەكانی خوا )

(٢١١) ( حم د ه حب ) عن جرير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مامِنْ رَجُلٍ يَكُونُ فِي قَوْمٍ يَعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعاصِي يَقْدِرُونَ عَلىَ أَنْ يُغَيِّروا عَلَيْهِ فَلا يُغَيِّروا إِلَّا أَصابَهُمُ اللهُ بِعِقَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَمُوتُوا ﴾ . بلفظ لأبي داود. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٧٤٨) في صحيح الجامع

( هەر پیاوێك لەناو كۆمەڵێكدا كاری خراپە بكات، ئەوانیش بتوانن ئەو رەفتارەی پێ بگۆڕن بەڵام پێ ی نەگۆڕن، ئەوا هەر لە پێش مردنیاندا خوای گەورە توشی سزا و تۆڵەیان دەكات).

## ( ٢٠ ) ( بەدەنگەوە چوونی خوا و پێغەمبەر )

(٢١٢) ( حم ت ك ) عن أبى هريرة أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) مَرَّ بِهِ وَ هُوَ يُصَلِّي فَدَعَاهُ، قَالَ: فَصَلَّيْتُ ثُمَّ أَتَيْتُهُ، قَالَ: فَقَالَ: ﴿ مَامَنَعَكَ أَنْ تُجِيبَنِي؟ ﴾ قَالَ : كُنْتُ أُصَلِّي، قَالَ: ﴿أَلَمْ يَقُلْ اللهُ تَعَالَى: - يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لله وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحيِيكُمْ - لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ - شَكَّ خَالِدٌ- قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ﴾ ، قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله قَوْلَكَ: قَالَ: ﴿الْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِينَ، هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي الَّتِي أُوتِيتُ وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ ﴾. اللفظ لابى داود. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٨٠٤) في صحيح الجامع

( ابو هريره ) نوێژی دەكرد، لەو كاتەدا پێغەمبەریش ﷺ بەلای دا تێپەڕی و بانگی كرد، وتی:منیش نوێژەكەم كرد و پاشان چوومە خزمەتی ئەویش فەرمووی: ( ئەوە چی وای لێ كردیت وەڵامم نەدەیتەوە ؟) ووتم: نوێژم دەكرد، فەرمووی: ( ئەی خوای گەورە نەیفەرمووە (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ) واتە:( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە وەڵامی خواو پێغەمبەر بدەنەوە ئەگەر بانگی كردن بۆ كارێك دەتانژێنێتەوە). دەبا گەورەترین سورەتت لە قورئان فێر بكەم ، پێش ئەوەی لە مزگەوت بچمە دەرەوە، دەڵێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر قسەكەی خۆت، فەرمووی: (ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ – ئەو سورەتە حەوت ئایەتی یەیە كە هەمووی ستایشی خوایە، كە پێم دراوە لەگەڵ قورئانی گەورەدا ).

## ( ٢١ ) ( نموونەی باوەڕدار )

(٢١٣) ( ق ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ، تَفِيئُهَا الرِّيحُ، تَصْرَعُهَا مَرَّةً وَتَعْدِلُهَا أُخْرَى، حَتَّى تَهِيجَ، وَمَثَلُ الْكَافِرِ كَمَثَلِ الأَرْزَةِ الْمُجْذِيَةِ عَلَى

أَصْلَهَا، حَتَّى يَكُونَ إِنْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِدَةً ﴾. اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٨٢٧) في صحيح الجامع

( نموونەی باوەڕدار وەك نموونەی لاسکە روەکێکی ناسکە، کە با دەیشەنێنێتەوە، جارێك دەیخات و جارێکی تریش راستی دەکاتەوە هەتا هەڵدەچێت و پیٚ دەگات، وە نمونەی بیٚ باوەڕیش وەك نمونەی دار (ارز)ێکی گیر و چەقیوە، هیچ شتێك نایشەنێتەوە. هەتا ئەو کاتەی کە کەوتن و لە رەگ دەرهاتنی یەك جار دەبێت ).

## رونکردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە باوەڕدار بە زۆری توشی ناخۆشی و ئازار دەبێت لە لەش و ماڵ و کەس و کار و ژیانیدا، بەوەش گوناهی هەڵدەوەرێت و پلەی بەرز دەبێتەوە، بەڵام بیٚ باوەڕ کەمتر لە ژیاندا ناخۆشی بەسەر دێت چونکە بیٚ باوەڕ خوا دنیای پیٚ داوە و قیامەتی لیٚ سەندوٚتەوە، وە ئەگەر ناخۆشی یەکیشی بەسەر هات هیچ لە گوناهەکانی پیٚ ناسڕدرێتەوە وە داری (ارز) دارێکی قەد ئەستور و درێژە زیاتر لە سوریا و لبنان و فلسطین هەیە.

## ( ٢٢ ) ( زیناکردن ئیمان ناهێڵێت )

( ٢١٤) ( طب ) عن شريك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ زَنَى خَرَجَ مِنْهُ الإِيْمَانَ فَإِنْ تَابَ تَابَ اللهُ عَلَيْهِ ﴾ .(صحيح) أنظر حديث رقم (٦٢٦٢) في صحيح الجامع

( ئەو کەسەی زینا بکات ئیمانەکەی لیٚ دەچێتە دەرەوە، جا ئەگەر تۆبەی کرد، ئەوا خوای گەورە تۆبەکەی لیٚ قبوڵ دەکات ).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی فەرمودەکە ئەوەیە کە ئەو کەسەی زینا دەکات لە کاتی ئەنجام دانی ئەو کارە قێزەونەدا ئیمان لە دڵی دا نامێنێت و دەردەچێت، چونکە ئەگەر باوەڕ لە دڵیدا هەبوایە و بیزانیایە خوایەکی هەیە و سەیری دەکات و ئاگای لیٚ یەتی کاری وای نەدەکرد، هەروەها ئەوەی زینا دەکات ئەگەر بزانیٚ کەسێك کە هەندیٚ شەرمی لێبکات یان رێزی لیٚ بگرێت وەك باوك یان برا گەورە یان مامۆستا ... تەماشای دەکات و چاوی لیٚ یەتی، ئەوا خۆی دەگرێت و تاوانەکە ناکات جا ئیتر لەبەر شەرم بێت یان لەبەر ترس بێت، بەڵام ئەو کەسەشی کە زینا دەکات و پیٚ ی وایە کەس چاوی لیٚی نییە، یان ئەوەیە باوەڕی نی یە کە خوایەکی هەیە وئاگاداریەتی و دەیبینێت، یان ئەوەیە ئەگەر باوەڕیشی هەبێت بەو خوایە بەڵام

نەشەرمی لێ دەکات و نە لێشی دەترسێت، بەوەش ئیمان و باوەڕەکەی دڵی دەچێتە دەرەوە، چونکە ئەو کەسەی کە هێندەی لە پۆلیسێك دەترسێت و شەرمی لێ دەکات، هێندە لە خوا نەترسێت و شەرمی لێ نەکات ئیتر کوانێ ئیمان و باوەڕەکەی، بەڵام سوپاس بۆ خوا وەك لە فەرمودەکەدا هاتووە خوای گەورە بەخشندە و خاوەن بەزەیی یە وە دەرگای تۆبەی خستۆتە سەر پشت و بەردەوام کراوەیە، جا هەر کەس پەشیمان بێتەوە وداوای لێبوردن لە پەروەردگاری خۆی بکات ئەوا خوا لێ ی خۆش دەبێت و باوەڕیش دەگەڕێتەوە بۆ دڵی.

## ( ٢٣ ) ( باوەڕ بە ووتنی شایە تمان دەچەسپێت )

(٢١٥) ( حم م ) عن والد ابی مالك الاشجعی قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَالَ لا إِلهَ إِلَّا الله، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ الله، حُرِّمَ مَالُهُ وَدَمُهُ وَحِسَابُهُ عَلَى الله ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦٤٣٧) في صحيح الجامع

( هەر کەسێك وتی: لا اله الا الله، وە هەموو ئەو شتانەش کە لە غەیری خوا دەپەرسترێن بە درۆی زانی، ئەوا ماڵ و خوێنی حەرام ( پارێزراو ) دەبێت،، لێپرسینەوەیشی لەسەر خوایە).

## ( ٢٤ ) ( غیرەی باوەڕدار )

(٢١٦) ( م ) عن أبی هریرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلْمُؤْمِنُ يَغَارُ. وَاللهُ أَشَدُّ غَيْراً ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦٦٥٠) في صحيح الجامع

( باوەڕدار غیرە دەکات، خوای گەورەش لە هەموان غیرەی زیاترە) .

(٢١٧) ( م ) عن جندب ( الطيالسی البزار) عن اسامة بن زيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا أُسَامَةُ! كَيْفَ تَصْنَعُ بِ ( لا إِلهَ إِلَّا الله ) إِذَا جَاءَتْ يَوْمُ الْقِيَامَةِ؟ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٧٨٤٥) في صحيح الجامع

( ئەی ئوسامە! ئەی چی لەگەڵ -لا اله الا الله- دەکەیت ئەگەر رۆژی قیامەت هات ).

**تێبینی/** لە یەکێك لە غەزاکاندا ئوسامە روو بە رووی کافرێك بووە وە توانی بیدات بە زەوی دا بەڵام پێش ئەوەی بیکوژێت کافرەکە ووتی -لا اله الا الله- بەڵام ئوسامە هەر کوشتی، وە دوایی کە بۆ پێغەمبەریان گێڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر نیگەران بوو وە سەرزەنشتی ئوسامەی کرد، هەرچەندە ئوسامە وتی: ئەو لە ترسی گیانی خۆی وای ووتوە نەك بەڕاستی قەناعەتی پێ ی هەبووبێت، ئەویش

فەرمووی خۆتۆ دڵیت شەق نەکردووە تا بزانیت بە راستی بووە یان نا، پاشان فەرمووی: (ئاخر ئەی ئوسامە رۆژی قیامەت چی لەگەڵ ئەو (لااله الا الله) یە دەکەیت.

## ( ٢٥ ) ( مافی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە )

(٢١٨) ( حم ق ت هـ ) عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا مَعَاذْ هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلىَ الْعِبَادِ، وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللهِ؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّ حَقُّ اللهِ عَلى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَحَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللهِ، إِذا فَعَلُوا ذٰلِكَ أَنْ لايُعَذِّبَهُمْ ﴾ اللفظ لإبن ماجة.
( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٧٩٦٧ ) في صحيح الجامع

( ئەی معاذ ئایا دەزانیت مافی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە چی یە ومافی بەندەکانیش بەسەر خواوە چی یە؟) ووتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرموی: (مافی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە ئەوەیە کەبیپەرستن و هیچ شەریکێکی بۆ بڕیار نەدەن، وە مافی بەندەکانیش بەسەر خواوە ئەگەر وایان کرد ئەوەیە کە سزا و ئەشکەنجەیان نەدات ).

# ( بەشی: ئەو فەرموودانەی دەربارەی قورئانن )

## ( ١ ) ( گەورەیی و ڕێزی قورئان خوێندن )

**(٢١٩) ( طب ) عن جبير بن مطعم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَبْشِروا فَإِنَّ هَذا القُرْآنَ طَرَفُهُ بِيَدِ اللهِ وَطَرَفُهُ بِأَيْدِيكُمْ فَتَمَسَّكُوا بِهِ فَإِنَّكُمْ لَنْ تَهْلِكُوا وَلَنْ تضلُّوا بَعْدَهُ أَبَداً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٣٤ ) في صحيح الجامع**

( مژدەتان لێ بێت، ئەم قورئانە جەمسەرێکی بەدەستی خواوەیە و جەمسەرێکیش بەدەستی ئێوەوەیە، جا توند دەستی پێوە بگرن، چونکە لە دوای قورئان ئیتر ئێوە هەرگیز نافەوتێن و گومڕا نابن).

**(٢٢٠) ( حم م ت ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ احْشِدُوا فَأَني سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ القُرْآنِ، قَالَ فَحَشَدَ مَنْ حَشَدَ ثُمَّ خَرجَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) فَقَرَأَ: قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ، ثُمَّ دَخَلَ فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) فَإِنِّي سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ القُرْآنِ، إِنِّي لأَرَىَ هَذا خَبَرٌ جَاءَهُ مِنَ السَّماءِ، ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللهِ(ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي قُلْتُ سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ القُرْآنِ أَلا وَإِنَّهَا تُعْدَلُ بِثُلُثِ القُرْآنِ ﴾ . اللفظ الترمذى. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ١٩٧ ) في صحيح الجامع**

( کۆ ببنەوە، وا من سێ یەکی قورئانتان بەسەردا دەخوێنمەوە)، وتی ئیتر ئەوەی کە کۆبوەوە کۆبوەوە پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دەر و سورەتی ( قل هو الله احد ) ی خوێندەوە پاشان چووە ژورەوە، ئێمەش بەیەکترمان ووت خۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: من سێ یەکی قورئانتان بەسەردا دەخوێنمەوە، من وا دەبینم کە ئەوە هەواڵێك بێت لە ئاسمانەوە بۆی هاتبێت. پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دەرەوە و فەرمووی: من پێم ووتن ئێستا سێ یەکی قورئانتان بەسەردا دەخوێنم، جا ئەوە بەرامبەر بە سێ یەکی قورئانە ).

## ( ٢ ) ( گەورەترین ناوی خوا )

**(٢٢١) ( حم د ت هـ ) عن اسماء بنت يزيد قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِسْمُ اللهِ الأَعْظَمِ فِي هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾، وَ فَاتِحَةُ سُورَةِ آلِ عِمْرانَ: ﴿ الم اللهُ لا إِلَهَ إِلاهُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ . الفظ لابى داود. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٩٨٠ ) في صحيح الجامع**

( ناوە هەرە گەورەکەی خوا لەم دوو ئایەتەدایە ((وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ )) واتە -خواکەتان خوایەکی تاك و تەنیایە هیچ خوایەك نی یە تەنها ئەو نەبێت میهرەبان و دلۆڤانە )

ومسەرەتای سورەتی (آل عمران ) یش (الٓمٓ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ ) واتە (( ئەلف لام میم، جگە لە زاتی الله هیچ خوایەکی تر نی یە، هەردەم زیندەوە و بە هەموو شت رادەگات )).

(٢٢٢) ( هـ طب ك ) عن ابی امامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِسْمُ اللهِ الأَعْظَمُ، الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، فِي سُوَرٍ ثَلاثٍ: الْبَقَرَةِ وَ آلِ عِمْرانَ وَ طَـه ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٩٧٩) في صحيح الجامع

( ناوە هەرگەورەکەی خوا، ئەوەی کە ئەگەر بانگ بکرێت پێ ی وەڵام دەداتەوە، لە سێ سورەتدا هەیە: البقره و ال عمران و طه ).

## (٣) ( پەیوەست بوون بە قورئانەوە )

(٢٢٣) ( طب ) عن عوف بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَطِيعُونِي مَا كُنْتُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ وَعَلَيْكُمْ بِكِتَابِ اللهِ أَحِلُّوا حَلالَهُ وَحَرِّمُوا حَرَامَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (١٠٣٤) في صحيح الجامع

( گوێ رایەڵیم بکەن تا ئەو کاتەی لە نێوانتاندا دەمێنمەوە، وە پەیوەست بن بە کتێبەکەی خواوە ، حەڵاڵی حەڵاڵ بکەن و حەرامیشی حەرام بکەن).

## (٤) ( ڕوباری کەوسەر )

(٢٢٤) ( م د ن ) عن أنس: قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللهِ(ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، إِذْ أَغْفَى إِغْفَاءَةً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّماً فَقُلْنَا: مَا أَضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ)؟ قَالَ: ﴿ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفاً سُورَةٌ ﴾، فَقَرَأَ: ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ. فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ. إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ ﴾، ثُمَّ قَالَ: ﴿ أَتَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟ ﴾، فَقُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ(ﷺ): ﴿ فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، هُوَ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، فَيُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ، فَأَقُولُ: رَبِّ إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: مَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَتْ بَعْدَكَ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (١٤٩٨) في صحيح الجامع

( ڕۆژێکیان لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) لەناوماندا بوو، وە نەوزێك بردی یەوە، پاشان بەزەردەخەنەیەکەوە سەری بەرز کردەوە، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی وای لێکردویت پێبکەنیت ؟ فەرمووی: (هەر ئێستا سورەتێکم بەسەردا دابەزی، ئینجا خوێندیەوە: ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَالْأَبْتَرُ (٣)﴾ (بەناوی خوای میهرەبان و دلۆڤان ئێمە کەوسەرمان پێبەخشیویت، تۆش نوێژ بۆ پەروەردگارت بکە و قوربانی بۆ بکە، ئەو کەسەی ناتۆرە لە تۆ دادەهینێت خۆی وەجاخ کوێرە) ، پاشان فەرمووی: (ئایا دەزانن کەوسەر چی یە ؟

ووتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرمووی: ئەوە روبارێکە کە پەروەردگاری بەرزو شکۆمەندم پەیمانی پێ داوم خێرو فەڕێکی زۆری لەسەر ئامادە کراوە، بریتی یە لە حەوزێك ( دەریاچەیەك ) ئومەتەکەی من لە رۆژی قیامەتدا دێنە سەری، پێ خۆرەوەکانی بە ژمارەی ئەستێرەکانە. بەندەی وا هەیە لە ئومەتەکەم کە لێ ی وەلا دەنرێت و دوور دەخرێتەوە، منیش دەڵێم: پەروەردگارم ئەوە لە ئوممەتی منە ، ئەویش دەفەرموێت: تۆ نازانیت لە دوای تۆ چی یان کردووە ).

## ( ٥ ) ( فەزڵی کۆتایی سورەتی البقرە )

**(٢٢٥)( ت ن ك ) عن النعمان بن بشير: قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ كَتَبَ كِتَاباً قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوات وَالأَرْض بِأَلْفَي عَام أَنْزَلَ مِنْهُ آيَتَيْنِ خَتَمَ بِهَا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، وَلا يُقْرَآنِ فِي دَارٍ ثَلاثَ لَيَالٍ فَيَقْرَبُهَا شَيْطَانٌ ﴾ . اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ١٧٩٩ ) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە نوسراوێکی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان وزەوی دروست بکات بە دوو هەزار ساڵ، دوو ئایەتی لێ ناردۆتە خوارەوە کۆتایی سورەتی ( البقرة ) ی پێ هێناوە، وە لەهەر ماڵێکدا ئەو دوو ئایەتە سێ شەو بخوێنرێن شەیتان نزیکی ناکەوێت ).

## ( ٦ ) ( رێزی قورئان لە لای پەروەردگار )

**(٢٢٦)( م هـ ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِيْنَ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ١٨٩٦ ) في صحيح الجامع**

واتە: ( خوای گەورە بەم قورئانە کۆمەڵانێك بەرز دەکاتەوە و کۆمەڵانێکی تریشی پێ نزم و سوك دەکات ).

## ( ٧ ) ( دۆستە تایبەتەکانی خوای گەورە )

**(٢٢٧)( حم ن ه ك ) عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ﴾ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هُمْ قَالَ : ﴿ هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٢١٦٥ ) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە دۆستانێکی هەیە لە خەڵك. ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟فەرمووی: ئەوانە ئەهلی قورئانن، دۆستی خوان و تایبەتی کردون بە خزمەتی خۆی ).

**(٢٢٨)( ابو القاسم بن حيدر فى مشيخته ) عن على قال: قال رسول الله(ﷺ):﴿ أَهْلُ الْقُرْآنِ أَهْلُ اللهِ وَخَاصَّتُهُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٢٥٢٧ ) في صحيح الجامع**

( ئەهلی قورئان دۆستی خوان و تایبەتی کردوون بە خزمەتی خۆی ).

**تێبینی/** مەبەست لە ئەهلی قورئان ئەو کەسانەن کە هەڵگری قورئانن ،و لەبەریان کردووە و کاری پیٚ دەکەن و تەمەنیان لە خزمەتی قورئان و گەیاندی بە خەڵکدا سەرف دەکەن.

## ( ٨ ) ( فەزڵی فێربوونی قورئانی پیرۆز )

**(٢٢٩) ( حم ت ن )عن ابی ایول قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيَعْجَزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ مَنْ قَرَأَ: اللهُ الْواحِدُ الصَّمَدُ فَقَدْ قَرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ﴾ اللفظ للترمذى .(صحيح) أنظر حديث رقم (٢٦٥٧) في صحيح الجامع**

( کەستان هەیە نەتوانێت لەشەوێکدا سیٚ یەکی قورئان بخوێنێت ؟ هەرکەس ( الله الواحد الصمد ) بخوێنێت ئەوا سیٚ یەکی قورئانی خوێندەوە ؟ )

**تێبینی/** واتە سورەتی (قل هو الله احد) بخوێنێت .

**(٢٣٠) ( حم م ) عن ابی الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أيَعْجَزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالُوا: وَ كَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: ﴿ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ ﴾، يَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ﴾ وفى رواية عندم مسلم: ﴿ إنَّ الله جَزَّأَ الْقُرْآنَ ثَلاثَةَ أَجْزاءٍ، فَجَعَلَ ﴿ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ ﴾ جُزْءاً مِنْ أَجْزاءِ الْقُرْآنِ ﴾ (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٦٦٣) في صحيح الجامع**

( کەستان هەیە نەتوانێت لە شەوێکدا سیٚ یەکی قورئان بخوێنێت ؟ ووتیان: جا چۆن سیٚ یەکی قورئان دەخوێنێت ؟ فەرمووی ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾، بەرامبەر سیٚ یەکی قورئانە ). وە لە ریوایەتێکدا لای ئیمام مسلم: ( خوای گەورە قورئانی دابەش کردووە بۆ سیٚ بەش، وە ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾، ی کردووە بە بەشێك لە بەشەکانی قورئان ).

**(٢٣١) ( حم م د )عن عقبة بن عامر: خَرَجَ عَلَيْنا رَسُولُ الله(ﷺ) وَنَحْنُ فِي الصَفَّةِ فَقالَ: ﴿ أَيُّكُمْ يُحِبُ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ الْعَقِيقِ فَيَأْخُذُ نَاقَتَيْنِ كُومَاوَيْنِ زَهْراوَيْنِ بِغَيْرِ إِثْمٍ بِالله وَلا قَطْعِ رَحِمٍ؟ قَالُوا: كُلُنَا يَارَسُولَ الله، قَالَ: فَلأَنَّ يَغْدُو أَحَدُكُمْ كُلَّ يَوْمٍ إلىَ الْمَسْجِدِ فَيَتَعَلَّمَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ الله خَيْراً لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ، وَ إِنْ ثَلاثٌ فَثَلاثٌ مِثْلَ أَعْدادِ هِنَّ مِنَ الإِبِلِ ﴾ (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٦٩١) في صحيح الجامع**

( پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆلامان ئێمە لە ( صَفَّه )دا بوین و فەرمووی: ( کیٚ لە ئێوە حەز دەکات سبەینیٚ بچێت بۆ شیوی ( بطحان) یان (عەقیق) و دوو ووشتری گەورە و قەڵەو و سپی بەرێت

بەبیٚ ئەوەی لای خوا گوناه بێت و دڵی کەسیشت لیٚ نەیەشێت ؟) ووتیان: هەمووما ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: (دەی هەریەکێك لە ئێوە هەموو ڕۆژێك سبەینان بچێت بۆ مزگەوت و دوو ئایەت لە قورئان فێر بێت چاکترە بۆی لە دوو ووشتر وە ئەگەر سیانیش فێر بێت ئەوا لە سیٚ ووشتر باشترە).

## ڕونکردنەوەی فەرموودەکە :

(الصفه) شوێنێك بوو لای مزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەژار و نەدار و کەسانی بیٚ جیٚ و ریٚ تیایدا کۆ دەبونە. (بطحان ) و (العقیق) دوو شیو بوون لە دەرەوەی شاری مەدینە.

ئاشکرایە کە بەنرخترین ماڵ و سامانی ئەو سەردەمە بەتایبەت بە نیسبەت ئەو هەژارانەوە کە نانی ووشکیان بەزەحمەت دەست دەکەوت بیخۆن بریتی بووە لە ووشترێکی قەڵەو وجوان کە ئەو پەڕی ئاوات و خەونیان بووە و بەسەرمایەیەکی گەورەیان زانیوە، هەر بۆیە پێغەمبەری ئازیزیش(ﷺ) ووشتریان بە نموونە بۆ دەهێنێتەوە و پیٚ یان دەڵیٚ کە فێربوونی دوو ئایەتی قورئان لە دەست خستنی دوو وشتر باشترە و سیانیش لە سیان باشترە چونکە ئەو پەڕی ئاواتی ئەو هەژارانە لە دونیادا لە دەست کەوتنی چەند وشترێك زیاتر نەبووە، دەنا لە راستیدا فێر بوونی تەنها یەك ئایەت لە قورئانی پیرۆز لە دونیا و هەرچی یەکی تێدایە سوود مەندترە و پاداشتی زیاترە لای خوای گەورە، وە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە نەبووە کە نرخی هەر ئایەتێکی قورئان بەرامبەر بە حوشترێك دابنێت، بەڵکو دەیەوێت بەو شێوازە جوانەی خۆی و بەزمان حاڵی ئەوان دڵنەوایی یان بکات و هانیان بدات زەخیرە و تێشوو بۆ قیامەتی خۆیان بخەن و ماڵی دونیا نەکەن بە خەمی گەورەیان، چونکە ماڵی دونیا بڕاوەیە و وپاداشتی خواش بیٚ ئەنداز و نەبڕاوەیە.

## ( ٩ ) ( بەسەر کردنەوەی قورئـان )

**(٢٣٢) ( حم ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَعَلَّمُوا كِتَابَ اللهِ وَتَعَاهَدُوهُ وَتَغَنَّوا بِهِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَلُّتاً مِنَ الْمَخَاضِ فِي الْعَقْلِ ﴾.** (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٩٦١) في صحيح الجامع

( فێری کتێبەکەی خوا بن و بەسەری بکەنەوە و بە دەنگی خۆش بیڕازێننەوە، وە سوێند بێت بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ئەو قورئانە لە حوشتری دوو گیان کە بەستراوەتەوە زووتر دەرباز دەبێت و دەڕوات ).

## ڕونکردنەوەی فەرمودەکە :

مەبەستی فەرمودەکە ئەوەیە کە قورئان ئەگەر بەردەوام بەسەرنەکرێتەوە و نەوترێتەوە ئەوا زۆر بەخێرایی لەبیر دەچێتەوە و لەدەست دەردەچێت، نمونەشی بۆ ئەوە بە حوشترێکی دوو گیان هێناوەتەوە کە بەستراوەتەوە و پاشان لە پەتەکەی خۆی بەردەبێت، ئیتر هەر مل دەنێت و دەڕوات بە رادەیەك کە زۆر زەحمەتە خاوەنەکەی بتوانێت بیدۆزێتەوە و بیگرێتەوە.

**(٢٣٣) ( حم ق د ) عن عائشة قالت: أنّ النبيّ(ﷺ) سَمِعَ رَجُلاً يَقْرأ مِنَ اللّيلِ فَقَالَ(ﷺ): ﴿ يَرْحَمُهُ اللهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذا وَكَذا، آيَةً كُنْتُ أَسْقَطْتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذا وَ كَذا ﴾ (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٥٩٧) في صحيح الجامع**

عائشەی دایکی موسڵمانان دەڵێ: کە پێغەمبەر(ﷺ) گوێ ی لە پیاوێك بوو لە شەودا قورئانی دەخوێند. فەرمووی: ( ئەی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەوە و ئەوەی وە بیر هێنامەوە، ئایەتێك بوو لە سورەتی ئەوە و ئەوە پەڕاندبووم).

## ( ١٠ ) ( حەڵاڵ و حەرام لە قورئاندایە )

**(٢٣٤) ( ت هـ ك ) عن سلمان: سُئِلَ رَسُولُ الله(ﷺ) عَنِ السَّمَنِ وَالْجُبْنِ وَالْفِراءِ؟ قَالَ: ﴿ اَلْحَلالُ مَا أَحَلَّ اللهُ فِي كِتَابِهِ، وَالْحَرامُ مَاحَرَّمَ اللهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَاسَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَفَا عَنْهُ ﴾ (صحيح) أنظر حديث رقم (٣١٩٣) في صحيح الجامع**

پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی رۆن کەرە وپەنیر و فرۆ. ئەویش فەرمووی: ( حەڵاڵ ئەوەیە کە خوا لە قورئانەکەیدا حەڵاڵی کردووە، وە حەرامیش ئەوەیە کە خوا لە قورئانەکەیدا حەرامی کردووە، وە ئەوەیش کە لێ ی بێ دەنگ بووە ئەوا مانای ئەوەیە کە چاو پۆشی لێکردووە و لێ ی بوراوە

## ( ١١ ) ( لێکدانەوەی سورەتی ( النصر ) )

**(٢٣٥) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَبَّرَنِي رَبِّي إِنِّي سَأَرَى عَلاَمَةً فِي أُمَّتِي، فَإذا رَأَيْتُهَا أَكْثَرْتُ مِنْ قَوْلِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ أَسْتَغْفِرُ اللهَ وَ أَتُوبُ إِلَيْهِ. فَقَدْ رَأَيْتُهَا: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾، فَتْحُ مَكَّةَ: ﴿وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ، فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٢٠٨) في صحيح الجامع**

( پەروەردگارم هەواڵی پێ دام کە من نیشانەیەك لە ئومەتەکەمدا دەبینم، جا ئەگەر بینیم ئەوا زۆر دەڵێم سبحان الله و بحمده – پاکی و گەورەیی بۆ خوا و سوپاسیش بۆ ئەو -- استغفر الله واتوب اليه – داوای لێبوردن لەخوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای ،جا وا من نیشانەکەم بینی

(إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ) واته ئەگەر سەرکەوتنی خوا هات لەگەڵ فەتح کردندا – کە ئەویش فەتحی مەکە بوو (إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ). واتە – وە ئەو خەڵکەت بینی پۆل پۆل دێنە ناو ئاینی خواوە، ئەوا تۆش تاریف و شوکری پەروەردگارت بکەو داوای لێبوردنی لێ بکە، ئەو هەمیشە تۆبەی تۆبەکاران قبولْ دەکات ).

## ( ١٢ ) ( فەزڵی سورەتی ( قل هو الله )

(٢٣٦) ( مالك حم خ دن ) عن ابی سعید( خ ) عن قتادة بن النعمان( م ) عن ابی الدرداء( ت هـ ) عن أبی هریرة( ن ) عن ابی ایوب( حم هـ ) عن ابی مسعود الانصاری( طب ) عن إبن مسعود و معاذ ( حم ) عن ام كلثوم بنت عقبة( البزار ) عن جابر( ابو عبيد ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾، تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ﴾ . (صحيح) أنظر حديث رقم (٤٣٨٨) في صحيح الجامع

ابوسعید و قتادة ی کوڕی النعمان و ابوالدرداء و أبوهریرة و ابوایوب و ابومسعودالانصاری و إبن مسعود و معاذ و ام كلثوم ی کچی عقبة و جابر و إبن عباس لە هەموو ئەمانەوە گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ) بەرامبەر سێ یەکی قورئانە ).

(٢٣٧) ( طب ) عن إبن عم قال: قال رسول الله(ﷺ) ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾، تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، تَعْدِلُ رُبْعَ الْقُرْآنِ ﴾ . (صحيح) أنظر حديث رقم (٤٤٠٤) في صحيح الجامع

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾بەرامبەر سێ یەکی قورئانە،وە﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾بەرامبەر چوار یەکی قورئانە

(٢٣٨) (٣) عن عبد الله بن خبيب قال: خرجنا فی لیلة مطر وظلمة شديدة نطلب النبي(ﷺ) ليصلي لنا فادركناه فقال(ﷺ): ﴿ قُلْ ﴾ ، فلم أقل شيئاً ، ثم قال(ﷺ): ﴿ قُلْ ﴾ ، فلم أقل شيئاً: ﴿ ثُمَّ قَالَ: قُلْ ﴾ ، فقلت: يا رسول الله(ﷺ) ما أقول؟ قال(ﷺ): ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَ الْمُعَوِّذَتَيْنِ، حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَكْفِيكَ مِنْ كُلِ شَيْءٍ﴾ .(صحيح) أنظر حديث رقم (٤٤٠٥) في صحيح الجامع

( عبدالله ی کوڕی خبیب ) دەڵێ: لە شەوێکی باراناوی و زۆر تاریکدا چووینە دەرەوە بە دوای پێغەمبەردا(ﷺ) هەتا نوێژمان بۆ بکات پاشان پێ ی گەیشتین و فەرمووی: ( بڵێ ) منیش هیچم نەووت، پاشان فەرمووی: (بڵێ) منیش هیچم نەووت ، پاشان فەرمووی: (بڵێ) ، منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی بڵێم ؟ فەرمووی: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ لەگەڵ ﴿الْمُعَوِّذَتَيْنِ ﴾، واتە: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ وَقُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾، کاتی ئێواران و کاتی بەیانیان سێ جاربیانخوێنە ئیتر بۆ هەموو شتێك بەستە ).

(٢٣٩) ( ن ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ياعُقْبَةَ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ مَا تعوذ بِمِثْلِهِنَّ أَحَدٌ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٧٩٤٧) في صحيح الجامع

( ئەی عقبة ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ هیچ کەس بە هیچ شتێك پەنای بە خوا نەگرتووە، کە بە نموونەی ئەو سێ سورەتە بێت ).

## (١٣) ( فەزڵی -قل اعوذ برب الفلق- )

(٢٤٠) ( ن ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَنْ تَقْرَأَ شَيْئاً أَبْلَغُ عِنْدَ اللهِ مِنْ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٢١٦) في صحيح الجامع

( هەرگیز شتێك ناخوێنیتەوە کە لای خوا کاریگەر تر بێت لە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾.

## (١٤) ( پاراستنی خوای گەورە بۆ قورئانی پیرۆز )

(٢٤١) ( هب ) عن عصمة بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ جمعَ الْقُرآنَ فِي إِهَابٍ مَا أَحْرَقَهُ اللهُ بِالنَّارِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٦٢٥) في صحيح الجامع

( ئەگەر قورئان لە پێستەیەکدا کۆ بکرێتەوە، خوای گەورە بە ئاگر نایسوتێت )

## (١٥) ( ڕازاندنەوەی قورئان بەدەنگی خۆش )

(٢٤٢) ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاأَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ مَاأَذِنَ لِنَبِيَ حَسَنَ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالْقُرآنِ يَجْهَرُ بِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٥٢١) في صحيح الجامع

( خوای گەورە بیستنی هیچ شتێکی پێ خۆش نی یە هێندەی بیستنی پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش کە بەدەنگێکی خۆش و جوانەوە بە ئاشکرا قورئان دەخوێنێت ).

**تێبینی/** خوێندنەوەی قورئان بەدەنگی خۆش ئەوە نی یە کە بە ئاوازی گۆرانیەکان بووترێت بەڵکو بریتی یە لە خوێندنەوەی قورئان بە زەلیلی و مل کەچی و هاتنە دەرەوەی لە قوڕگێکی پڕ گریان ،و ئاوێتە بوونی ئایەتە پیرۆزەکانی لەگەڵ هەست و سۆزی پڕ لە ئیمانی خوێنەرەکەیەوە.

## ( ١٥ ) ( فەزڵی سورەتی الفاتحه )

(٢٤٣) ( ت ن ) عن ابی قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا أَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ فِي التَوْراة وَلا فِي الإِنْجِيلِ مِثْلَ أُمِّ الْقُرآنِ وَهِىَ السَّبْعُ الْمَثانِي، وَهِيَ مَقْسُومَةٌ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي وَ لِعَبْدِي مَا سَأَلَ ﴾.
( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٥٥٥٩ ) في صحيح الجامع

( خوای گەورە نە لە تەورات و نە لە ئینجیلیشدا نمونەی دایکی قورئان ( سورەتی فاتیحە ) ی دانە بەزاندووە، وە بریتی یە لە حەوت ئایەت کە هەمووی ستایشی پەروەردگارە، ئەویش دەفەرموێت، ئەوە لە نێوان خۆم و لە نێوان بەندەکەمدا دابەشکراوە، وە هەرچی یەکیش کە بەندەکەم داوای کردووە دەیدەمی ).

## ( ١٦ ) ( کرێ وەرگرتن لەسەر فێرکردنی قورئان )

(٢٤٤) ( حل هق ) عن ابی الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَخَذَ عَلَى تَعْلِيمِ الْقُرآنِ قَوْساً قَلَّدَهُ اللهُ مَكَانَهَا قَوْساً مِن نَارِ جَهَنَّمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٥٩٨١ ) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك لەسەر فێرکردنی قورئان تەنها کەوانێك وەربگرێت، ئەوا خوای گەورە لە جێگەی ئەوەدا لە ڕۆژی قیامەتدا کەوانێك لە ئاگری دۆزەخی بەگەردندا دەکات ).

## ( ١٧ ) ( ئەدەبی قورئان خوێندن )

(٢٤٥) ( ت ) عن إبن عمران قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَرَأَ الْقَرْآنَ فَلْيَسْأَلِ اللهَ بِهِ ، فَإِنَّهُ سَيَجِيءُ أَقْوامٌ يَقْرَأُونَ الْقُرْآنَ يَسْأَلُونَ بِهِ النَّاسَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٦٤٦٦ ) في صحيح الجامع

( ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت با داوای پێ لە خوای گەورە بکات، چونکە خەڵکانێك دێن و پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن بۆ ئەوەی داوای کرێ و بەرامبەری پێ لە خەڵك بکەن).

## ( ١٨ ) ( فەزڵی خوێندنەوەی یەك پیت لە قورئان )

(٢٤٦) ( تخ ت ك ) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَرَأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَ الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لا أَقُولُ ( آلم ) حَرْفٌ، وَلَكِنْ ( الف ) حَرْفٌ وَ( لام ) حَرْفٌ وَ ( ميم ) حَرْفٌ ﴾. اللفظ للترمذى. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٦٤٦٧ ) في صحيح الجامع

(هەرکەسێك پیتێك لە کتێبەکەی خوای گەورە بخوێنێت ئەوا چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، چاکەش بە دەبەرامبەرە، ناڵێم (الم) پیتێکە، بەڵکو ئەلف پیتێکە و لام پیتێکە و میمیش پیتێکە ).

(٢٤٧) ( حم ن الضياء ) عن أبي: ﴿ مَنْ قَرَأَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ فَكَأَنَّمَا قَرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ﴾.
( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٦٤٦٩ ) في صحيح الجامع

واته: ( هەركەسێك﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێت وەك وئەوە وایە كە سێ یەكی قورئانی خوێندبێت

## ( ١٩ ) ( ئاوات خواستن بە كەسێك كە خوای گەورە قورئانی پێ بەخشیوە )

(٢٤٨) ( حم ق ت هـ ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاحَسَدَ إِلَّا فِي إِثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ أَتَاهُ اللهُ مَالاً فَهُوَ يُنْفِقُ مِنْهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَ رَجُلٌ أَتَاهُ اللهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَ آنَاءَ النَّهَارِ ﴾. اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٧٤٨٠ ) في صحيح الجامع

( حەسودیی رێگەی پێ نەدراوە تەنها لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێك خوای گەورە ماڵ و سامانێكی داوەتێ، ئەویش بە درێژایی شەو و رۆژ دەیبەخشێتەوە و سەرفی دەكات، وە پیاوێك خوای گەورە قورئانی داوەتێ، ئەویش بەردەوام بەشە و و بە رۆژ دەیخوێنێت و نوێژی پێوە دەكات ).

(٢٤٩) ( حم خ ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاحَسَدَ إِلَّا فِي إِثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَ آنَاءَ النَّهَارِ فَسَمِعَهُ جَارٌ لَهُ فَقَالَ: لَيْتَنِي أُوتِيْتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلْ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَهُوَ يَهْلِكُهُ فِي الْحَقِّ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَيْتَنِي أُوتِيْتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٧٤٨٨ ) في صحيح الجامع

( حەسودیی رێگەی پێ نەدراوە تەنها لە دوو شتدا نەبیت، پیاوێك خوای گەورە قورئانی فێر كردووە، ئەویش لە هەموو ساتەكانی شەو و رۆژدا دەیخوێنێتەوە، دراوسێ یەكیشی گوێ ی لێ دەبێت و دەڵێ: خۆزگە ئەوەی بە فلأن كەس دراوە بە منیش بدرایە هەتا منیش وەك و ئەوم بكردایە. وە پیاوێك خوای گەورە ماڵ و سامانێكی پێ بەخشیوە و ئەویش لە رێ ی حەقدا خەرجی دەكات، پیاوێكی تریش دەیبینێت و دەڵێ: خۆزگە منیش وەك و فلأن كەسم پێ بدرایە هەتا منیش وەك و ئەوم بكردایە ).

# ( بەشی: خاوێنی و خۆ پاك راگرتن )

## ( ١ ) ( پاك و خاوێنی واجبە )

**(٢٥٠) ( م هـ ) عن إبن عمر ( هـ ) عن أنس و أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تُقْبَلُ صَلاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلا صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ ﴾. اللفظ من حديث اين عمر رواية الترمذى. (صحيح) أنظر حديث رقم (٧٧٤٥) في صحيح الجامع**

( نوێژ بەبێ پاك بوون قبول ناكرێت، خێر و سەدەقەش لە پارەی (غلول) قبولْ ناكرێت) .

**تێبینی/** ( غلول ) بريتی يە لە گزی كردن لە غەنيمەتی جهاد.

**(٢٥١) ( حم د ن هـ حب ) عن والد أبي المليح قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنَّ اللهَ لا تُقْبَلُ صَلاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ ولا صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (١٨٥٥) في صحيح الجامع**

(خوای گەورە نوێژ بەبێ پاك بوون وەرناگرێت، وە خێر و سەدەقەش لە پارەی (غلول) وەرناگرێت )

**(٢٥٢) ( ق د ت ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ لا يَقْبَلُ صَلاةَ أَحَدِكُمْ إِذا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَأَ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٧٧٣٣) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە نوێژی يەكێك لە ئێوە وەرناگرێت ئەگەر پاشەڕۆيەكی لێوە دەرچوو هەتا دەست نوێژ دەگرێتەوە ).

## ( ٢ ) ( بوونی پەردە پۆش لەكاتی خۆشتندا )

**(٢٥٣) ( حم دن ) عن يعلى بن أمية: أنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) رأىَ رَجُلاً يَغْتَسِلُ بالْبَرازِ بِلا إزارٍ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَحَمِدَ اللهَ وَ أَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ﴿ إِنَّ اللهَ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَياءَ وَالسَّتْرَ، فَإِذا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (١٧٥٦) في صحيح الجامع**

( پێغەمەری خوا(ﷺ) پياوێكی بينی لە دەشتێكی بەرەڵادا بەبێ پەشتەماڵ خۆی دەشۆری، ئەويش چووە سەر مينبەر و سوپاسی خوای كرد و ستايشی لەسەردا، پاشان فەرمووی: ( خوای گەورە زۆر بەشەرم و زۆر عەيب پۆشە و شەرم و عەيب پۆشينی پێ خۆشە، جا ئەگەر كەسێكتان خۆی شت با خۆی پەردە پۆش بكات ).

## ( ٣ ) ( بێ نوێژیی ئافرەت )

(٢٥٤) ( حم م د ) عن جابر: ﴿عَنْ جَابِرٍ قَالَ أَقْبَلْنَا مُهِلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالْحَجِّ مُفْرَدًا وَأَقْبَلَتْ عَائِشَةُ مُهِلَّةً بِعُمْرَةٍ حَتَّى إِذَا كَانَتْ بِسَرِفَ عَرَكَتْ حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا طُفْنَا بِالْكَعْبَةِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)أَنْ يَحِلَّ مِنَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْىٌ قَالَ فَقُلْنَا حِلُّ مَاذَا فَقَالَ: ﴿الْحِلُّ كُلُّهُ﴾ . فَوَاقَعْنَا النِّسَاءَ وَتَطَيَّبْنَا بِالطِّيبِ وَلَبِسْنَا ثِيَابَنَا وَلَيْسَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ أَرْبَعُ لَيَالٍ ثُمَّ أَهْلَلْنَا يَوْمَ التَّرْوِيَةِ ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَلَى عَائِشَةَ فَوَجَدَهَا تَبْكِى فَقَالَ: ﴿ مَا شَأْنُكِ﴾ قَالَتْ شَأْنِى أَنِّى قَدْ حِضْتُ وَقَدْ حَلَّ النَّاسُ وَلَمْ أَحْلِلْ وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ وَالنَّاسُ يَذْهَبُونَ إِلَى الْحَجِّ الآنَ. فَقَالَ: ﴿ إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاغْتَسِلِى ثُمَّ أَهِلِّى بِالْحَجِّ ﴾. فَفَعَلَتْ. وَوَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ حَتَّى إِذَا طَهُرَتْ طَافَتْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ثُمَّ قَالَ ﴿ قَدْ حَلَلْتِ مِنْ حَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ جَمِيعًا ﴾. قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَجِدُ فِى نَفْسِى أَنِّى لَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ حِينَ حَجَجْتُ.قَالَ ﴿ فَاذْهَبْ بِهَا يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ ﴾. وَذَلِكَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ .﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٢٥٤) في صحيح الجامع

( هاتين به تەلبیەکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا بەنیەتی حەج بەئیفراد، وە عائیشەش بە تەلبیەکردن بە نییەتەی عومرە هات، هەتا کاتێك گەیشتە ( سَرِف ) کەوتە بێ نوێژی یەوە، هەتا کاتێك گەیشتین و تەوافمان بە دەوری کەعبەدا کرد و سەفا و مەروەمان کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێ کردین کە هەر کەسێك حەیوانی سەر برینی پێ نی یە با حەڵاڵ کردن(تحلیل) بکات و ئیحرامەکەی دانێت، دەڵێ: ئێمەش ووتمان حەڵاڵ کردنی چی ؟فەرمووی: حەڵاڵ کردنی هەمووی ( واتە تحلیلی گەورە )، ئینجا ئێمەش چوینە لای ئافرەتەکانمان و خۆمان بۆن خۆش کرد و جلەکانمان لەبەر کرد و تەنها چوار شەویشمان بۆ عەرەفە مابوو، پاشان لە رۆژی ( تەرویە ) دا تەلبیەکردنمان ئەنجام دا، پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە ژورەوە بۆ لای عائیشە کە بینی دەگریا. فەرمووی ئەوە چیتە ؟ ئەویش وتی: چۆن چیمە. من وا کەوتومەتە بێ نوێژی یەوە و خەڵکیش وا (تەحلیل ) یان کردوە و من ( تەحلیل) م نەکردووە و تەوافیشم نەکردووە بەدەوری کەعبەدا و ئەوا ئێستاش خەڵك دەچن بۆ حەج. فەرمووی: ئەوە شتێکە کە خوای گەورە لەسەر کچانی ئادەم نوسیویەتی، برۆ خۆت بشۆ و پاشان تەلیە بە حەج بکە، ئەویش وای کرد و لە هەموو مەوقیفەکاندا ئامادە بوو هەتا کاتێك کە پاك بوەوە تەوافی بە دەوری کەعبەدا کرد و سەفا و مەروەشی ئەنجام دا، پاشان فەرمووی: ئێسا ئەوا لە حەجەکەشت و عومرەکەشت تەحلیل بووی. ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هێشتا دڵ گرانم لەوەی کە لەکاتی حەج کردنەکەمدا تەوافی کەعبەم نەکرد. فەرمووی: دەباشە ( عبد الرحمن ) کەبرای عائیشەیە بیبە لە (تنعیم ) ەوە عومرەی پێ بکە، ئەوەش لە شەوی بەردهاویشتندا بوو واتە لە شەوی رەجمی شەیتان دا بوو ).

# ( ٤ ) ( فەزڵی دەست نوێژ )

(٢٥٥) ( حم م ) عن عمرو بن عبسة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿مَا مِنْكُمْ رَجُلٌ يُقَرِّبُ وَضُوءَهُ فَيَتَمَضْمَضُ وَيَسْتَنْشِقُ فَيَنْتَثِرُ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا وَجْهِهِ وَفِيهِ وَخَيَاشِيمِهِ ثُمَّ إِذَا غَسَلَ وَجْهَهُ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا وَجْهِهِ مِنْ أَطْرَافِ لِحْيَتِهِ مَعَ الْمَاءِ ثُمَّ يَغْسِلُ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا يَدَيْهِ مِنْ أَنَامِلِهِ مَعَ الْمَاءِ ثُمَّ يَمْسَحُ رَأْسَهُ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا رَأْسِهِ مِنْ أَطْرَافِ شَعْرِهِ مَعَ الْمَاءِ ثُمَّ يَغْسِلُ قَدَمَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا رِجْلَيْهِ مِنْ أَنَامِلِهِ مَعَ الْمَاءِ فَإِنْ هُوَ قَامَ فَصَلَّى فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَمَجَّدَهُ بِالَّذِي هُوَ لَهُ أَهْلٌ وَفَرَّغَ قَلْبَهُ لِلَّهِ إِلاَّ انْصَرَفَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ﴾ .

فَحَدَّثَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ بِهَذَا الْحَدِيثِ أَبَا أُمَامَةَ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ لَهُ أَبُو أُمَامَةَ يَا عَمْرُو بْنَ عَبَسَةَ انْظُرْ مَا تَقُولُ فِى مَقَامٍ وَاحِدٍ يُعْطَى هَذَا الرَّجُلُ فَقَالَ عَمْرٌو يَا أَبَا أُمَامَةَ لَقَدْ كَبِرَتْ سِنِّى وَرَقَّ عَظْمِى وَاقْتَرَبَ أَجَلِى وَمَا بِى حَاجَةٌ أَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ وَلاَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ لَوْ لَمْ أَسْمَعْهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)إِلاَّ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا - حَتَّى عَدَّ سَبْعَ مَرَّاتٍ - مَا حَدَّثْتُ بِهِ أَبَدًا وَلَكِنِّى سَمِعْتُهُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٥٨٠١ ) في صحيح الجامع

( هەر پیاوێك لە ئێوە هەستێت دەستنوێژەكەی بگرێت و ئاو لە دەمی رابدات و ئاو بە لوتی هەڵمژێت و فمی بكاتەوە، ئەوا تاوانەكانی دەم وچاوی و دەمی و لوتی هەڵدەوەرێنە خوارەوە، پاشان ئەگەر دەم و چاوی شۆرد بەو شێوازەی كە خوا فەرمانی پێ كردووە، ئەوا تاوانەكانی دەم وچاوی لە لێواری ریشی یەوە لەگەڵ ئاوەكەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە پاشان هەردوو دەستی دەشوات هەتا ئەنیشكەكانی، ئەوا تاوانەكانی كە هەردوو دەستی لە پەنجەكانی یەوە لەگەڵ ئاوەكەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە پاشان هەردوو پێكانی دەشوات هەتا پاژنەكانی، ئەوا تاوانەكانی هەردوو پێ ی لە پەنجەكانیەوە لەگەڵ ئاوەكەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە، پاشان سەری دەسرێت، ئەوا تاوانەكانی سەری لە لێواری قژی یەوە لەگەڵ ئاوەكەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە، جا ئەگەر هەستا ونوێژی كرد و سوپاسی خوای كرد وستایشی لەسەردا، وە بە جۆرێك تاریفی كرد كەشایەنی ئەو بێت، وە دڵی بەتاڵ و خاڵی كردەوە بۆ خوا، ئەوا لە تاوانەكانی دەچێتە دەرەوە هەروەك ئەو رۆژەی كە لەدایك بووە ).

جا ( عمرو كوڕی عبسە ) كە گێڕەرەوەی ئەم فەرمودیە، فەرمودەكەی بۆ ( ابا امامة )ی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) گێرایەوە، (ابا امامة) ش پێ ی ووت: ئەی عەمری كوڕی عەبسە ووریابە بزانە چی دەڵێیت، لەیەك شوێندا ئەو پیاوە ئەو هەموو بەخششەی پێ دەدرێت ؟ عەمریش وتی: ئەی (ابا امامة) من وا تەمەنم گەورە بووە و ئێسكەكانم ناسك بونەتەوە و ئەجەلیشم نزیك بوەتەوە و پێویستم بەوە نی یە كە درۆ بەدەم خوا و پێغەمبەری خواوە بكەم، ئەگەر ئەم فەرمودەیەم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها جارێك یان دوان یان سیان ( هەتا حەوت جاری ژمارد) نە بیستایە، ئەوا هەرگیز نەمدەگێڕایەوە، بەڵام من لەوە زیاتر لێم بیستووە.

(٢٥٦) ( د هق ) عن سعيد بن المسيب قال: حَضَرَ رَجُلاً مِنَ الأنصارِ المَوتُ فقال: إني مُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً مَا أحَدِّثُكُمُوهُ إلَّا احتِساباً. سَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ إذا تَوَضَّأَ أحدُكُمْ فَأحْسَنَ الوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إلى الصَّلاة، لَمْ يَرفَعْ قَدَمَهُ اليُمْنَى إلَّا كَتَبَ اللهُ عزَّوَجلَّ لَهُ حَسَنَةً، ولَمْ يَضَعْ قَدَمَهُ اليُسْرَى إلَّا حَطَّ اللهُ عَزَّوَجلَّ عَنْهُ سَيِّئَةً، فَلْيُقَرِّبْ أحدُكُمْ أوْ لِيُبْعِدْ. فَإنْ أتَى المَسْجِدَ فَصَلَّى فِي جَمَاعَةٍ غُفِرَ لَهُ فَإنْ أتَى المَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوا بَعْضاً وَبَقَى بَعْضٌ صَلَّى مَا أدْرَكَ وَ أتَمَّ مَا بَقِيَ، كَانَ كَذلِكَ. فَإنْ أتَى المَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوا فَأتَمَّ الصَّلاةَ، كَانَ كَذلِكَ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٤٤٠) في صحيح الجامع

( پیاوێك له ئەنسارەكان كەوتە سەرەمەرگەوە، وتی: من فەرمودەیەكتان بۆ دەگێڕمەوە، لەبەر هیچ شتێك بۆتان ناگێڕمەوە تەنها بە ئومێدی پاداشتەكەی نەبێت. گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: ( ئەگەر یەكێكتان دەست نوێژ بگرێت دەست نوێژێكی باش پاشان بڕواتە دەرەوە بۆ نوێژ، ئەوا لەگەڵ بەرز كردنەوەی پێی راستیدا خوای گەورە چاكەیەكی بۆ دەنوسێت، وە لەگەڵ دانانی پیێ ی چەپیدا خوای گەورە خراپەیەكی لێ هەڵدەوەرێنێت، جا ئەگەر هاتە مزگەوت و نوێژەكەی بەجەماعەت كرد خوا لێ ی دەبورێت، وە ئەگەر هاتە مزگەوت و نوێژە جەماعەتەكە هەندێكی لی كرابوو وە هەندێكی مابوو، ئەویش ئەوەی فریای كەوت لەگەڵ جەماعەتەكە كردی و ئەوی تریشی تەواو كرد، ئەویش بەهەمان شێوە خوا لێ ی دەبورێت، وە ئەگەر هاتە مزگەوتەكەو ئەوان نوێژەكەیان كردبوو ئەمیش نوێژەكەی تەواو كرد، ئەوا ئەویش بەهەمان شێوە خوا لێ ی دەبورێت ).

(٢٥٧) ( حم ٤ حب ) عن اى بكر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنْباً، فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ إلَّا غَفَرَ اللهُ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ هَذهِ الآيَةَ: ﴿ وَالَّذِينَ إذا فَعَلُوا فَاحِشَةً أوْ ظَلَمُوا أنْفُسَهُمْ ... إلَى آخِرِ الآيَةِ ﴾. اللفظ لابى داود. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٧٣٦) في صحيح الجامع

( هەر بەندەیەك تاوانێك بكات، ئینجا تارەت و دەست نوێژێكی باش بگرێت، پاشان هەستێت دوو ركات نوێژ بكات پاشان داوای لێبوردن لە خوا بكات ئەوا بێ گومان خوا لێی خۆش دەبێت. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( والذين اذا فعلوا فاحشةً او ظلموا انفسهم ... هەتا كۆتایی ئایەتەكە ).

(٢٥٨) ( د ن هـ ك ) عن رفاعة بن رافع قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّهَا لاتَتِمُّ صَلاةُ أحَدِكُمْ حَتَّى يَسْبَغَ الوُضُوءَ كَمَا أمَرَهُ اللهُ تَعالَى، فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إلَى المِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحُ بِرَأسِهِ وَرِجْلَيْهِ إلَى الكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ اللهَ عَزَّوَجلَّ وَ يَحْمَدُهُ، ثُمَّ يَقْرَأُ مِنَ القُرْآنِ مَا أُذِنَ لَهُ فِيهِ وَتَيَسَّرَ ﴾، فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ حَمَادٍ قَالَ: ﴿ ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَسْجُدُ فَيُمَكِّنَ وَجْهَهُ ﴾، قَالَ هَمَامٌ وَرُبَمَا قَالَ: ﴿ جَبْهَتَهُ مِنَ الأرْضِ، حَتَّى تَطْمَئِنَ مَفَاصِلَهُ وَتَسْتَرْخِي، ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَسْتَوِي قَاعِداً عَلَى مَقْعَدِهِ وَيُقِيمُ صُلْبَهُ ﴾ فَوَصَفَ الصَّلاةَ هَكَذا أرْبَعَ رَكَعَاتٍ حَتى فَرَغَ ، ﴿ لا تَتِمُّ صَلاةُ أحَدِكُمْ حَتَّى يَفْعَلَ ذلِكَ ﴾. اللفظ لابى داود. (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٤١٨) في صحيح الجامع

( نوێژی هیچ کەسێك لە ئێوە تەواو نابێت هەتا دەست نوێژێك دەشوات کە هەموو ئەندامەکانی بگرێتەوە بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە، دەم وچاوی و هەردوو دەستی هەتا ئەنیشکەکانی دەشوات و دەستی تەڕ بەسەریدا دەهێنێت و هەردوو پێ ی هەتا پاژنەکانی دەشوات، پاشان بە - الله اکبر - نوێژەکەی دادەبەستێت و بە - ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ - سوپاسی خوا دەکات و، پاشان هێندەی کە پێی بڕەخسێت و بتوانێت قورئان بخوێنێت ) ئینجا بەهەمان شێوەی فەرمودەکەی (حماد) باسی کرد فەرمووی: (پاشان –الله اکبر– دەڵێ و دەچێتە سوجدەوە و دەم وچاوی) لە فەرمودەکەی ( همام ) دا دەڵێ پێم وایە فەرمووی : (نێو چاوانی تەواو دەخاتە سەر زەوی هەتا هەموو ماسولکەکانی هێور دەبنەوە و خاو دەبنەوە، پاشان ( الله اکبر) دەڵێ و ڕاست دەبێتەوە بە دانیشتنەوە، وە پشتی ڕاست دەکاتەوە ئینجا بەو شێوەیە وەسفی نوێژەکەی کرد هەر چوار ڕکاتەکە هەتا لێ دەبێتەوە، وە نوێژی هیچ کەسێکتان تەواو نابێت هەتا ئەوە دەکات ).

**(٢٥٩) ( مالك حم م ت ن ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلا أَدُلُكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا وَ يَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟﴾ قَالُوا: بَلَىَ يَارَسُولَ الله، قَالَ: ﴿إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ وَ كَثْرَةُ الْخُطَا إِلىَ الْمَسَاجِدِ، وَ إِنْتِظَارِ الصَّلاةِ بَعْدَ الصَّلاةِ فَذَلِكُمْ الرِّبَاطُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٢٦١٤ ) في صحيح الجامع**

( ئەریّ نیشانتان بدەم چ شتێك خوای گەورە تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە و پلەکانی پێ بەرز دەکاتەوە ؟) ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ( دەست نوێژ گرتنی تەواو لەسەر ناخۆشی، وە زۆر هەنگاو هەڵگرتن بەرەو مزگەوتەکان، وە چاوەڕوان کردنی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەوەتان سەنگەر گرتنە ).

**(٢٦٠) ( حم ) عن ابى امامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّمَا رَجُلٌ قَامَ إِلىَ وُضُوئِهِ يُرِيدُ الصَّلاةَ ثُمَّ غَسَلَ كَفَّيْهِ نَزَلَتْ خَطِيئَتُهُ مِنْ كَفَّيْهِ مَعَ أَوَّلْ قَطرَةٍ فَإِذا غَسَلَ يَدَيْهِ إِلىَ الْمِرْفَقَيْنِ وَرِجْلَيْهِ إِلىَ الْكَعْبَيْنِ سَلَمَ مِنْ كُلِّ ذَنْبٍ هُوَ لَهُ وَ مِنْ كُلِّ خَطِيئَةٍ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُهُ فَإِذا قَامَ إِلىَ الصَّلاةِ رَفَعَهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ بِهَا دَرَجَةً وَإِنْ قَعَدَ قَعَدَ سَالِماً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٢٧٢٢ ) في صحيح الجامع**

( هەر پیاوێك هەستێت بۆ دەست نوێژەکەی بەمەستی نوێژ کردن پاشان هەردوو دەستی بشوات ئەوا تاوانەکەی لە هەردوو دەستی لەگەڵ یەکەم دڵۆپە ئاودا دەکەوێتە خوارەوە، جا ئەگەر دەم و چاوی شت تاوانەکەی لە گوێ و چاوی لەگەڵ یەکەم دڵۆپە ئاودا دەکەوێتە خوارەوە، ئینجا ئەگەر دەستەکانی هەتا هەردوو ئەنیشکی شت و هەردوو پێکەیشی هەتا پاژنەکانی ئەوا لە هەموو گوناهێك کە کردوویەتی و لە هەموو تاوانێك پاك دەبێتەوە، هەر وەك ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بووە، جا ئەگەر هەستا بۆ نوێژەکەی خوای گەورە پلەیەکی پێ بەرز دەکاتەوە، وە ئەگەر داشنیشت ئەوا بە پاکی دادەنیشێت ).

(٢٦١) ( م ) عن عثمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ مُسْلِمٍ يَتَطَهَّرُ، فَيُتِمَّ الطَّهُورَ الَّذِي كَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ، فَيُصَلِّي هَذِهِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، إِلَّا كَانَتْ كَفَّارَاتٍ لِمَا بَيْنَهَا ﴾ . (صحيح) انظر حديث رقم ( ٥٧٥٤ ) في صحيح الجامع

( هەر موسڵمانێك خۆی پاك بكاتەوە ن خۆ پاك كردنەوەكەیشی تەوا و بیٚ كەم وكوڕی بێت بەو شێوەیەی كە خوای گەورە لەسەری نوسیوە، ئینجا ئەو پێنج نوێژە بكات، ئەوا دەبێتە كەفارەتی تاوانەكانی نێوانیان ).

(٢٦٢) ( م ن هـ ) عن عثمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَتَمَّ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ فَالصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ ﴾ . ( صحيح ) انظر حديث رقم ( ٥٩٤٥ ) في صحيح الجامع

( هەركەسێك دەست نوێژەكەی تەواو بیٚ كەم وكوڕی بێت بەو شێوەیەی كە خوای گەورە فەرمانی پیٚ كردووە، ئەوا پێنج فەرزە نوێژەكە دەبنە كەفارەتی تاوانەكانی نێوانیان ).

## ( ٥ ) ( فەزڵی دوو ركات نوێژ پاش دەست نوێژ )

(٢٦٣) ( حم د ك ) عن زيد بن خالد الجهني قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَوَضَأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ صَلَى رَكْعَتَيْنِ لايَسْهُو فِيهِمَا غُفِرَ لَهُ مَاتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ﴾ . (صحيح) انظر حديث رقم ( ٦١٦٣ ) في صحيح الجامع

( هەركەسێك دەست نوێژ بگرێت دەست نوێژێكی باش، پاشان دوو ركات نوێژ بكات كە تیایاندا خەیاڵی نەڕوات، ئەوا هەموو تاوانێك كە پێشتر كردوویەتی خوا لیٚ ی خۆش دەبێت).

# (( بەشی: نوێژ ))

## (١) ( پاراستنی پێنج فەرزە نوێژەکان )

**(٢٦٤) ( الطيالسي محمد بن نصر فى كتاب الصلاة طب الضياء في المختارة ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَتَانِي جِبْرِيلُ مِنْ عِنْدِ اللهِ تَبَارَكَ وَ تَعَالَىٰ فَقَالَ: يَامُحَمَّدْ إِنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ يَقُولُ: إِنِّي قَدْ فَرَضْتُ عَلَىٰ أُمَّتِكَ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، فَمَنْ وافَىٰ بِهِنَّ عَلَىٰ وُضُوئِهِنَّ وَمُوَاقِيْتِهِنَّ وَرُكُوعِهِنَّ وَسُجُودِهِنَّ كَانَ لَهُ عِنْدِي بِهِنَّ عَهْدٌ أَنْ أُدْخِلَهُ بِهِنَّ الْجَنَّةَ وَ مَنْ لَقِيَنِي قَدْ إِنْتَقَصَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَلَيْسَ لَهُ عِنْدِي عَهْدٌ إِنْ شِئْتُ عَذَّبْتُهُ وَ إِنْ شِئْتُ رَحِمْتُهُ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٧٧) في صحيح الجامع**

( جبریل هاتە لام لە لای خوای گەورەوە وتی: ئەی محمد خوای گەورە دەفەرموێت: من ئەوا پێنج نوێژم لەسەر ئوومەتەکەت فەرز کردووە، جا هەر کەسێك تەواو بیانهێنێت بە دەست نوێژەکانیانەوە و لە کاتەکانی خۆیاندا و بە رکوع و سوجدەکانیانەوە، ئەوا بەو نوێژانە لای من پەیمانێکی هەیە کە لە پاداشتیانە بیخەمە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێکیش بێتەوە لام و شتێك کەم و کوڕی تێدا کردبن، ئەوا هیچ بەڵێن و پەیمانێکی لای من نی یە، ئەگەر بمەوێت ئەشکەنجەی دەدەم و ئەگەر بشمەوێت لێ ی خۆش دەبم ).

**(٢٦٥) ( د هق ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَمْسُ صَلَوَاتٍ إِفْتَرَضَهُنَّ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ، مَنْ أَحْسَنَ وُضُوئَهُنَّ وَصَلَّاهُنَّ لِوَقْتِهِنَّ وَأَتَمَّ رُكُوعَهُنَّ وَ خُشُوعَهُنَّ كَانَ لَهُ عَلَىٰ اللهِ عَهْداً أَنْ يَغْفِرَ لَهُ، وَ مَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَلَيْسَ لَهُ عَلَىٰ اللهِ عَهْدٌ إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ وَ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٢٤٠) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە پێنج نوێژی فەرز کردووە، هەرکەسێك دەست نوێژەکانیان باش بگرێت و لەکاتەکانی خۆیاندا بیانکات و رکوع و خشوعەکەیان تەواو بکات ئەوا پەیمانێکی هەیە لای خوا کە لێ ی خۆش ببێت، وە ئەو کەسەیشی کە وانەکات ئەوا هیچ پەیمانێکی لای خوا نی یە، ئەگەر بیەوێت لێ ی دەبورێت و ئەگەر بیشیەوێت ئەشکەنجەی دەدات ).

**(٢٦٦) ( مالك حم د ن هـ حب ك ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ عَلَى الْعِبَادِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّعْ مِنْهُنَّ شَيْئاً إِسْتِخْفَافاً بِحَقِّهِنَّ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَ مَنْ لَمْ يَأْتِ بِهِنَّ فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَ إِن شَاءَ أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٢٤٢) في صحيح الجامع**

( پێنج نوێژن ئەوانەی کە خوای گەورە لەسەر بەندەکانی نوسیووە، هەر کەسێك بیانهێنێت هیچ شتێکی لێیان نەفەوتاندبێت بە هۆی گوێ پێنەدان و بەهەند نەگرتنیان، ئەوا لای خوای گەورە بەڵێن و پەیمانێکی دەبێت کە بیخاتە بەهەشتەوە، وە ئەو کەسەیشی کە نەیانهێنێت ئەوا لای خوا هیچ بەڵێن و پەیمانێکی نی یە، ئەگەر بیەوێت ئەشکەنجەی دەدات و ئەگەریش بیەوێت دەیخاتە بەهەشتەوە ).

(٢٦٧) ( **هم ن ك هب** ) عن عائشة ( **ع** ) عن إبن مسعود ( **طب** ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ثَلاثٌ أَحْلِفُ عَلَيْهِنَّ: لايَجْعَلُ اللهُ تَعَالى مَنْ لَهُ سَهْمٌ فِي الإسْلام كَمَنْ لاسَهْمَ لَهُ ، وَأَسْهُمُ الإسْلام ثَلاثَةٌ: الصَّلاةُ وَ الصَّوْمُ وَالزَّكاةُ ، وَلايَتَوَلَّى اللهُ عَبْداً فِي الدُّنْيَا فَيُوَلِّيه غَيْرَهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ، وَلايُحِبُ رَجُلٌ قَوْماً إِلَّا جَعَلَهُ اللهُ مَعَهُمْ، وَالرَّابِعَةُ لَوْحَلَفْتُ عَلَيْهَا رَجَوْتُ أَنْ لاآثَمْ: لايَسْتُرُ اللهُ عَبْداً فِي الدُّنْيَا إِلَّا سَتَرَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٣٠١٤ ) في صحيح الجامع

( سێ شت هەن سوێندیان لەسەر دەخۆم: خوای گەورە ئەو کەسەی کە بەشی هەیە لە ئیسلامدا وەك ئەو کەسەی لێ ناکات کەبەشی نی یە، بەش بوونیش لە ئیسلامدا سێ شتن: نوێژ و ڕۆژو وزەکات، وە خوای گەورە دۆستایەتی و پشتویانی لە بەندەیەك ناکات لە دونیادا، وە لە ڕۆژی قیامەتدا وازی لێ بهێنێت و بیداتە دەست یەکێکی تر، وە هەرپیاوێك کۆمەڵێکی خۆش بوێت ئەوا خوای گەورە دەیخاتە گەڵ ئەوان ،وە چوارەمیش ئەگەر سوێندی لەسەر بخۆم ئومێدم وایە کە گوناهبار نەبم خوای گەورە هەر بەندەیەك لە دونیادا (سەتر) پەردەپۆش بکات، ئەوا لە قیامەتیشدا هەر بۆی دەپۆشێت ).

## ڕونکردنەوی فەرمودەکە :

لەم فەرمودە پیرۆزەدا پێغەمبەر(ﷺ) پێمان دەڵێ کە سێ شت هەن هیچ گومانێکیان تێدا نییە و دەتوانم سوێند لەسەر ڕاستی هاتنەدی یان بخۆم ئەو سێ شتەش:

**یەکەم:** ئەو کەسەی کە پابەندە بە بنەماکانی ئیسلامەوە و فەرزەکانی خوای گەورە لە نوێژ و ڕۆژ و زەکات جێ بەجێ دەکات، هەرگیز خوای گەورە نایخاتە ڕیزی کەسانی سەرپێچی کەر و دور لە ئیسلامەوە کە هیچ پابەند بونێکیان بە فەرزەکانەوە نی یە، واتە جۆری یەکەم ڕێز و پلەی تایبەتی خۆیان لە لای خوای گەورە هەیە و جیاوازن لە جۆری دووەم کە دوو چاری سزا و خەشمی خوا دەبن.

**دووەم:** ئەو کەسەی کە لە دونیادا خوای گەورە ڕێنومایی کردبێت و پاراستبێتی و دەست گیرۆیی کردبێت بۆ ڕێگەی ڕاست ئەوا لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەست بەرداری نابێت و دەیپارێزێت و هەروەك چۆن لێرە دۆست و پشتیوانی بووە لەوێش هەروا دەبێت.

**سێ یەم:** لە دونیادا کێت خۆش بوێت لە قیامەتیشدا هەر لەگەڵ ئەو دەبیت، کە بەڕاستی ئەم خاڵەیان مژدەیەکی گەورەیە و لە هەمان کاتیشدا هەڕەشەیەکی گەورەیە، بۆیە موسڵمان دەبێت لە دونیادا زۆر وورد بین و بەرچاو ڕۆشن بێت، دەبێت بزانێت ئەوانەی کە ئەم خۆشی دەوێن کێن ؟ ئالودە

و خولیای کیّ یه؟، شویّن کەوتوی کیّ یه؟ ئەوانەی ئەم خۆشی دەویّن و تیّکەڵیانە بەرنامە و ریّبازیان چی یە ؟، ئایا دۆستی خوا و پیّغەمبەر و ئیسلامن یان پیّچەوانەیانن و دژایەتی یان دەکەن ؟، چونکە لە قیامەتدا ئەوان لە کویّ بن تۆش لەویّ دەبیت، جا ئیتر ئەوەی کە ﹾ خۆشت دەویّت ( کەسیّك بیّت ،یان قەوم و عەشرەتیّك بیّت، یان زانا و پیّشەوایەك بیّت، یان مۆسیقاژەن و گۆرانی بیّژیّك بیّت، یان طاغوتیّك بیّت، یان حزب و ریّکخراویّکی سیاسی بیّت ) ئەمانە هیچی فەرق ناکات.

**چوارەم :** پاش ئەوەی کە پیّغەمبەر(ﷺ) سویّند لەسەر ئەو سیّ شتەی پیّشەوە دەخوات ئینجا دەفەرمویّت شتیّکی تریش هەیە ئەگەر ئەویش بخەمە ریزی ئەو سیانەوە و وەك ئەوانی تر سویّندی لەسەر بخۆم، هیوام وایە کە پیّکابیّتم و لەسەری گوناهبار نەبم، کە ئەویش ئەوەیە هەر کەسیّك لە دونیادا خوای گەورە تاوانەکانی بۆ بپۆشیّت و لای خەڵك ئابڕوی نەبات، واتە تاوانەکەی تەنها لە نیّوان خۆی و خوادا بیّت وخەڵك پیّ ی نەزانیّت و خۆشی لەناو خەڵکدا باسی نەکات و خۆی پیّوە هەڵنەکیّشیّت، ئەوا خوای بەخشندە مادەم لە دونیادا بۆی پۆشیوە و ئابڕوی نەبردووە، لە قیامەتیشدا ئەو پەردەیە لەسەر بەندەکەی خۆی هەڵنامالیّت و لەویّش بۆی دەپۆشیّت و لیّ ی خۆش دەبیّت، چونکە هەروەك لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرمویّت خوای گەورە زۆر لەوە بەرەحمترە کە لە دونیادا بۆی بپۆشیّت ولە قیامەتدا ئابڕوی بەریّت.

# ( ٢ ) ( فەزڵی بانگ دان )

**(٢٦٨) ( هم د ن ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَعْجَبُ رَبُّكَ عَزَّوَجَلَّ مِنْ راعِي غَنَم في رَأسِ شَظِيَةٍ بِجَبَلٍ يُؤَذِّنُ للصَّلاةِ وَيُصَلِّي فَيَقُولُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: أُنْظُروا إلىَ عَبْدِي هَذا يُؤَذِّنُ وَ يُقِيْمُ الصَّلاةَ يَخَافُ مِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَ أَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ ﴾ (صحيح) أنظر حديث رقم (٨١٠١) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە سەیری لیّ دیّت لە شوانیّکی مەڕ و ماڵات لەسەر لوتە بەردی چیایەك بانگ دەدات بۆ نویّژ و نویّژەکەی دەکات، خوای گەورە دەفەرمویّت: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن بانگ دەدات و قامەت بۆ نویّژ دەکات، لە من دەترسیّت، ئەوا منیش لەو بەندەیەم خۆش بووم و خستمە بەهەشتەوە ).

**(٢٦٨) ( حم خ د ن ) عن أبي قتادة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ قَبَضَ أَرْواحَكُمْ حَيْثُ شَاءَ وَرَدَّهَا حَيْثُ شَاءَ، قُمْ فَأَذِّنْ بِالصَّلاةِ﴾، فَقامُوا فَتَطَهَّروا، حَتَّى إذا إرْتَفَعَتِ الشَّمْسُ قَامَ النَّبِيُّ(ﷺ) فَصَلىَ بِالنَّاسِ . (صحيح) أنظر حديث رقم (١٧٨٣) في صحيح الجامع**

( خوای گەورە کە ویستی رۆحەکانتانی کیّشا و کەویستیشی گەڕاندی یەوە، هەستە بانگ بدە بۆ نویّژەکە، ئەوانیش هەستان و خۆیان پاك کردەوە، هەتا کاتیّك کە خۆرەکە بەرز بوەوە، پیّغەمبەر(ﷺ) هەستا پیّش نویّژی بۆ خەڵکەکە کرد).

**تێبینی** / هۆی ووتنی ئەم فەرمودەیە ئەوە بوو کە لە یەکێك لە غەزاکاندا کاتێك کە دەگەڕانەوە بەهۆی ماندوو بونی زۆرەوە پاش ئەوەی شەو لە دەشتێکدا خەوتبوون، کەسیان لە کاتی خۆیدا بۆ نوێژی بەیانی بە ئاگا نەهاتن هەتا ئەو کاتەی کە گەرمای خۆرەکە لە پشتیانی دا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەم روداوە بە ویستی خوای گەورە بوە و هەر کاتێك و لە هەرشوێنێکدا کە بیبەوێت رۆحمان دەکێشێت و کە وییستیشی دەیگەڕێنێتەوە، وە مەبەستیشی لە رۆح کێشان لێرەدا خەو لێکەوتنیان و بە ئاگا هاتنەوەیانە، چونکە خەو برای مردنە، پاشان فەرمانی دا کە بانگ بدەن و نوێژەکەیان بکەن. هەروەها ئەم فەرمووده پیرۆزە حوکمێکی شەرعی گرنگیشی تێدایە ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك خەبەری نەبوەوە بۆ نوێژکردن، ئەوا لەگەڵ بەئاگا هاتنی دەبێت نوێژەکەی بکات.

## ( ٣ ) ( وەڵام دانەوەی بانگ بێژ )

**(٢٦٩)( حم م ٤ ) عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ):** ﴿ مَنْ قَالَ حِيْنَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ وَ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَ بِمُحَمَّدٍ( ﷺ) رَسُولاً، وَ بَالإِسْلامِ دِيْناً، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ ﴾ . وَفِي رِوايَةٍ: ﴿ مَنْ قَالَ حِيْنَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ، وَ أَنَا أَشْهَدُ ﴾ .اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ٦٤١٣ ) في صحيح الجامع

( هەر کەسێك بڵێت کاتێك کە گوێ ی لە بانگ بێژ دەبێت ﴿ شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نی یە تەنها زاتی (الله) نەبێت هاوتاو شەریکی نی یە، وە ( محمد) یش بەندە و نێردراوی خوایە، رازیم کە ( الله) پەروەردگارم بێت، و ( محمد) یش(ﷺ) پێغەمبەرم بێت، وە ئیسلامیش ئاینم بێت ﴾ ئەوا خوای گەورە لە گوناهی دەبورێت ).

## ( ٤ ) ( شوێنی نوێژکردن )

**(٢٧٠)( إبن عساكر ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ):** ﴿ إِنَّ اللهَ بَعَثَنِي إِلى كُلِّ أَحْمَرٍ وَ أَسْوَدٍ وَ نُصِرتُ بِالرّعْبِ، وَ أُحِلَّ لِي الْمَغْنَمُ وَ جُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً وَ أُعْطِيْتُ الشَّفَاعَةَ لِلْمُذْنِبِينَ مِنْ أُمَّتِي يَوْمُ الْقِيَامَةِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ١٧٢٨ ) في صحيح الجامع

( خوای گەورە ناردومی بۆ هەموو سور و رەشێك، وە سەرکەوتوی کردووم بە ترساندن، وە دەستکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە، وەزەویم بۆ کراوە بە شوێنی نوێژ و پاکژکەرەوە، وە شەفاعەتیشم پێ دراوە بۆ تاوانباران لە ئومەتەکەم لە رۆژی قیامەتدا )

## ( ٥ ) ( ڕێگە نەدان بە دروست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕی مردوو )

**(٢٧١) ( حم ق ن ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ أُولئكَ إذا كَانَ فيْهِمْ الرَّجُل الصَّالِحُ فَماتَ بَنَوا علىَ قَبْرِهِ مَسْجِداً وَصَوَّرُوا تِيكَ الصُّوَر، أُولئكَ شِرارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَة ﴾.** اللفظ للنسائى. (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٠١٠) في صحيح الجامع

( ئەوانە ئەگەر پیاوێکی باشیان لە ناودا بوایە و بمردایە، پەرستگایەکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکرد، وە ئەو وێنانەشیان تێدا دەنەخشاند، ئەوانە خراپترینی خەڵکن لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ).

**(٢٧٢) ( م ) عن جندب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّي أَبْرَأُ إلىَ الله أَنْ يَكُونَ لي منْكُمْ خَليلٌ، فَإنَّ اللهَ تَعَالىَ قَدْ اَتَخَذَني خَليْلاً كَما اتَّخَذَ إبْراهيْمَ خَليْلاً، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخذاً منْ أُمَّتي خَليلاً لاتَّخَذْتُ أَبابَكْرٍ خَليلاً، أَلاَ وَإنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخذُونَ قُبُورَ أَنْبِيائهِمْ وَ صَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ، أَلا فَلا تَتَّخِذوا الْقُبُورَ مَساجِدَ، إنّي أَنْهاكُمْ عَنْ ذلكَ ﴾.** (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٤٢٧) في صحيح الجامع

( من لە لای خوا بەرائەتی خۆم دەدەم لەوەی کە کەسم لە ئێوە کردبێت بە هەڵبژاردە و دۆستی خۆم، چونکە خوای گەورە منی کردووە بە هەڵبژاردە و دۆستی خۆی، هەروەك چۆن ئیبراهیمیشی کردووە بە هەڵبژاردە و دۆستی خۆی، وە ئەگەر من کەسێکم لە ئومەتەکەی خۆم بکردایە بە هەڵبژاردە و دۆست، ئەوا ئەبو بکەرم دەکردە هەڵبژاردە و دۆست، جا ئەوانەی کەلە پێش ئێوەدا بوون گۆڕی پێغەمبەر و پیاو چاکەکانیان دەکردە مزگەوت، جا ئێوە نەکەن گۆڕەکان بکەنە مزگەوت، من پێتان دەڵێم کاری وا نەکەن ).

**(٢٧٣) ( ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارىَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ ﴾.** (صحيح) أنظر حديث رقم (٥١٠٥) في صحيح الجامع

( نەفەرەتی خوا لە جولەکە و گاورەکان بێت، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت ).

**(٢٧٤) ( ق د ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَاتَلَ اللهُ اليَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيائِهِمْ مَسَاجِدَ ﴾.** (صحيح) أنظر حديث رقم (٤٢٦٨) في صحيح الجامع

( خوا جولەکە لەناوبەرێت، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت ).

**(٢٧٥) ( حم ) عن اسامة بن زيد ( حم ق ن ٩ ﴾عن عائشة و إبن عباس معاً ( م ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارىَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ ﴾.** (صحيح) أنظر حديث رقم (٥١٠٧) في صحيح الجامع

( نەفرەتی خوا لە جولەکە و گاورەکان بێت گۆڕی پێغەمبەرکانیان کردووە بە پەرستگا).

## رونكردنەوەی فەرمودەكان:

**ئەم فەرموده پیرۆزانه چەند راستی یەكمان بۆ روون دەكەنەوە:**

یەكێك لە كارە خراپەكانی جولەكە و گاورەكان دروست كردنی كڵێسە و پەرستگاكانیانە لە سەر گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاكەكانیان، بەم كارەیشیان شیاوی نەفرەتی خوا بوون.

پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاشكرا ئومەتەكەی خۆی ئاگادار دەكاتەوە كە چاو لە جولەكە و گاورەكان نەكەن و مزگەوتەكانیان لەسەر گۆڕی پیاوچاكان دروست نەكەن، بۆ ئەوەی وەكو ئەوان بەر نەفرەتی خوا نەكەون.

هۆكاری نەهی كردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە دروست كردنی مزگەوت لەسەر گۆڕی پیاو چاكان رون و ئاشكرایە، ئەویش ئەوەیە كە ئوممەتەكەی وەك و جولەكە و گاورەكان نەكەونە داوی گۆڕ پەرستی یەوە و بەدەردی ئەوان نەچن، هەرچەندە بە داخەوە لەزۆربەی جیهانی ئیسلامیدا موسڵمانان گرفتاری ئەو هەڵەیە بوون و لە فەرمانی پێغەمبەرەكەیان دەرچوون، ئاكامەكەیشی ئەوەیە كە خەڵكانێكی زۆر بەردەوام تەواف بە دەوری ئەو گۆڕانەدا دەكەن و نەزر و پاڕانەوەكانیشیان ئاراستەی ئەو گۆڕانە دەكەن، بەمەش مزگەوتەكان لە جیاتی ئەوەی ببنە جێگا وشوێنی یەكتاپەرستی خوای گەورە،كەچی بوونەتە گۆڕەپانی شیرك و بڕیاردانی هاوتا بۆ خوا (وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا).

## (٦) (فەزڵی چونە دەرەوە بەرەو مزگەوت)

(٢٧٦) (حل) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ثَلاثَـةٌ فِي ضَمانِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ: رَجُلٌ خَرَجَ إِلَى مَسْجِدٍ مِنْ مَسَاجِدِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ وَ رَجُلٌ خَرَجَ غَازِياً فِي سَبِيلِ اللهِ تَعَالَى، وَرَجُلٌ خَرَجَ حَاجاً** ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٠٥٠) في صحيح الجامع

(سێ كەس لە زەمانەتی خوای گەورەدان: پیاوێك بڕواتە دەرەوە بۆ مزگەوتێك لە مزگەوتەكانی خوای گەورە، وە پیاوێك بڕواتە دەرەوە بۆ غەزا كردن لە پێناوی خوای گەورە دا، وە پیاوێكیش بڕواتە دەرەوە بۆ حەج كردن).

(٢٧٧) (هـ ك) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَا تَوَطَّنَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ الـمَسَاجِدَ للصَّلاةِ وَالذِّكْرِ إِلَّا تَبَشْبَشَ اللهُ لَهُ مِنْ حِينِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ كَما يَتَبَشْبَشُ أَهْلُ الْغائِبِ بِغائِبِهِمْ إِذا قَدِمَ عَلَيْهِمْ** ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٥٦٠٠) في صحيح الجامع

(هەرپیاوێكی موسڵمان ئالودەی مزگەوتەكان بێت بۆ نوێژ و زیكر، ئەوا خوای گەورە رووخۆشی خۆی بۆ دەنوێنێت لەو كاتەوەی كە لەماڵەكەی دەچێتە دەرەوە، هەروەك و چۆن كەس و كاری كەسێكی دووره وولات روو خۆشی خۆیان بۆ ئەو كەسە دەنوێنن كاتێك كە دەگەڕێتەوە بۆ لایان).

## ( ٧ ) ( ئەو کەسەی سیر و پیازی خواردوە با نزیکی مزگەوت ئەبێتەوە )

(٢٧٨) ( حم م ) عن ابى سعيد: لَمْ نَعْدُ أَنْ فُتِحَتْ خَيْبَرُ، فَوَقَعْنا، أَصْحابَ رَسُولِ الله(ﷺ)، في تِلْكَ البَقْلَةِ، الثُّومِ، وَالنَّاسُ جِياعٌ، فَأَكَلْنا مِنْها أَكْلاً شَدِيداً، ثُمَّ رُحْنا إلى المَسْجِدِ، فَوَجَدَ رَسُولُ الله(ﷺ) الرِّيحَ، فَقالَ: ﴿ مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ الْخَبِيثَةِ شَيْئاً فَلا يَقْرَبْنا في الْمَسْجِدِ ﴾، فَقالَ النّاسُ: حُرِّمَتْ، فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ(ﷺ) فَقالَ: ﴿ أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَيْسَ بِي تَحْرِيمُ ما أَحَلَّ اللهُ لِي، وَلَكِنَّها شَجَرَةٌ أَكْرَهُ رِيحَها ﴾.اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦٠٨٣) في صحيح الجامع

( ئەبو سەعید دەڵێ: هەرئەوەندەی کە خەیبەر فەتح کرا ئێمەش هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتینە ناو پەڵەشینکایی یەك کە سیر بوو، خەڵکەکەش برسیان بوو، ئیتر خواردنێکی زۆرمان لێ خوارد، پاشان چوین بۆ مزگەوت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەستی بە بۆنەکە کردو فەرمووی: ( هەرکەسێك شتێکی لەو دارە پیسە خواردووە با نزیکمان نەکەوێتەوە لە مزگەوتدا ) خەڵکەکەش ووتیان: حەرام کرا، حەرام کرا. ئینجا ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: ( ئەی خەڵکینە من نامەوێت ئەوەی کەخوا بۆی حەڵاڵ کردووم حەرامی بکەم، بەلأم ئەوە دارێکە رقم لە بۆنەکەیەتی ).

## ( ٨ ) ( فەزڵی دروست کردنی مزگەوت )

(٢٧٩) ( هـ ) عن على قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ بَنَى لله مَسْجِداً بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦١٢٦) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکات، خوای گەورە لە بەهەشتدا ماڵێکی بۆ دروست دەکات).

(٢٨٠) ( هـ ) عن جابر قال:قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ بَنَى لله مَسْجِداً وَلَوْ كَمَفْحَصِ قَطاةٍ أَوْ أَصْغَرَ، بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦١٢٧) في صحيح الجامع

واتە: ( هەرکەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکات ئەگەر هێندەی هێلانەی قەتێ یەك یان بچوکتریش بێت، خوا لە بەهەشتدا ماڵێکی بۆ دروست دەکات ).

(٢٨١) ( هم ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ بَنَى لله مَسْجِداً وَلَوْ كَمَفْحَصِ قَطاةٍ لِبَيْضِها بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦١٢٨) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکات ئەگەر هێندەی هێلانە قەتێ یەکیش بێت بۆ هێلکەکانی، خوا ماڵێکی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات ).

(٢٨٢) ( هم ن ) عن عمرو بن عبسة ( هـ ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ بَنَى مَسْجِداً للهِ يُذْكَرُ اللهَ فِيهِ بَنَى اللهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم ( ٦٨٢٩ ) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بكات زیكری خوای تێدا بكرێت، ئەوا خوای گەورە نمونەیەكەی ئەوەی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكات ).

(٢٨٣) ( حم ق ت هـ ) عن عثمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ بَنَى مَسْجِداً يُبْتَغَى بِهِ وَجْهِ للهِ، بَنَى اللهَ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٦٨٣٠) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك مزگەوتێك دروست بكات مەبەستی پێ ی خوای گەورە بێت، ئەوا خوای گەورە نموونەیەكی ئەوەی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەكات ).

## ( ٩ ) ( فەزڵی ڕۆشتن بەرەو مزگەوت بۆ نوێژكردن )

(٢٨٤) ( حم م ن ) عن عثمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَوَضَّأَ للصَّلاةِ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ ثُمَّ مَشَى إِلَى الصَّلاةِ الْمَكْتُوبَةِ فَصَلَّاهَا مَعَ النَّاسِ أَوْ مَعَ الْجَمَاعَةِ أَوْ فِي الْمَسْجِدِ غَفَرَ اللهُ لَهُ ذُنُوبَهُ ﴾. اللفظ للنسائى .(صحيح) أنظر حديث رقم (٦١٦٥) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك دەست نوێژ بگرێت بۆ نوێژ دەست نوێژێكی تەواو، پاشان بڕوات بۆ نوێژە فەرزەكەی، لەگەڵ خەڵكدا بیكات یان لەگەڵ جەماعەتدا یان لە مزگەوتدا، ئەوا خوای گەورە دەبورێت لە تاوانەكانی ).

(٢٨٥) ( حم ق ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ وَرَاحَ أَعَدَّ اللهُ لَهُ نُزُلاً مِنَ الْجَنَّةِ كُلَّمَا غَدَا وَرَاحَ ﴾. اللفظ للنسائى .(صحيح) أنظر حديث رقم (٦٣٩٨) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك سبەینان و ئێواران بێت و بڕوات بۆ مزگەوت، خوای گەورە جێگەیەكی بۆ ئامادە دەكات لە بەهەشتدا لەگەڵ هەموو هاتن و ڕۆشتنێكیدا ).

## ( ١٠ ) ( خۆشەویست ترین جێگا لەلای خوای گەورە )

(٢٨٦) ( م ) عن أبى هريرة ( حم ك ) عن جبير بن مطعم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الْبِلادِ إِلَى اللهِ مَسَاجِدُهَا، وَ أَبْغَضُ الْبِلادِ إِلَى اللهِ أَسْوَاقُهَا ﴾. اللفظ للنسائى .(صحيح) أنظر حديث رقم (١٦٧) في صحيح الجامع

( خۆشەویست ترین شوێن و جێگا لە شارەكاندا لە لای خوا مزگەوتەكانیەتی، وە بێزراوترین شوێن و جێگا لە شارەكاندا لە لای خوا بازاڕەكانی یەتی ).

## ( ١١ ) ( داپۆشینی عەورەت )

(٢٨٧) ( حم ع ك هق ) عن بهز بن حكيم عن ابيه عن جده قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إحْفَظْ عَوْرَتَكَ إلَّا مِنْ زَوْجَتِكَ أَوْ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ﴾، فَقَالَ: الرَّجُلُ يَكُونُ مَعَ الرَّجُلِ؟ قَالَ: ﴿ إنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لا يَرَاهَا أَحَدٌ فَافْعَلْ﴾، قُلْتُ: فالرَّجُلُ يَكُونُ خَالِياً، قَالَ: ﴿ فَاللهُ أَحَقُّ أَنْ يُسْتَحْيَا مِنْهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٢٠٣) في صحيح الجامع

( عەورەتت بپارێزە تەنها لە خێزانت نەبێت یان کەنیزەیەك کە موڵکی خۆت بێت ). وتی: ئەی: ئەگەر پیاو هەر پیاوی لا بوو ؟ فەرمووی ( ئەگەر توانیت ئەوا کارێکی وا بکە کە کەس نەیبینێت ) ووتم: ئەی ئەگەر پیاو هەر بەتەنیا خۆی بوو ؟ فەرمووی ( دەی خوا لە هەموو کەس شایستە ترە کە شەرمی لێ بکرێت ).

## ( ١٢ ) ( رێگە نەدان بە شۆڕکردنەوەی جل و پۆشاك )

(٢٨٨) ( حم ن ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ لا يَنْظُرُ إلىَ مُسْبِلِ إزارِهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (١٨٦٣) في صحيح الجامع

( خوای گەورە سەیری کەسێك ناکات کە جلەکەی شۆڕ کردبێتەوە ).

(٢٨٩) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعَالىَ لا يَنْظُرُ إلىَ مَنْ يَجُرُّ إزارَهُ بَطَراً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (١٨٦٤) في صحيح الجامع

( خوای گەورە سەیری ئەو کەسە ناکات کە بۆ فیز و لوت بەرزی پۆشاکەکەی بەری بە دوای خۆیدا رادەکێشێت).

(٢٩٠) ( د ) عن إبن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَسْبَلَ إزارَهُ فِي صَلاتِهِ خُيَلاءَ فَلَيْسَ مِنَ اللهِ فِي حِلٍ وَلاحَرامٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٦٠١٠) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك بۆ خۆ هەڵکێشان پۆشاکەکەی بەری لە نوێژەکەیدا شۆڕ کردەوە ئەوا هیچی بەسەر حەڵاڵ و حەرامی خواوە نەماوە ).

(٢٩١) ( مالك حم د هـ حب هق ) عن العلاء بن عبدالرحمن، عن ابيه، قال: قُلْتُ لأَبِي سَعِيد: هَلْ سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) شَيْئاً فِي الإزارِ؟ قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ إزْرَةُ الْمُؤْمِنِ إلىَ أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، لاجُنَاحَ عَلَيْهِ مَابَيْنَهُ وَ بَيْنَ الْكَعْبَيْنِ، وَمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ فِي النَّارِ﴾ يَقُولُ ثَلاثاً : ﴿لايَنْظُرُ اللهُ إلىَ مَنْ جَرَّ إزارَهُ بَطَراً ﴾. اللفظ لإبن ماجة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٩٢١) في صحيح الجامع

( عەلائی کوڕی عبد الرحمن لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێ لە ( ابو سعید )م پرسی: ئایا هیچ شتێکێت لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە دەربارەی پۆشاك ! وتی: بەڵێ گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( پۆشاکی ئیماندار تا ناوەڕاستی دوو لاقی یەتی، قەیدیشی نی یە لە نێوان ئەوە و لە نێوان هەردوو

پاژنەپێ دا، وە هەرچی لە خوار دوو پاژنە پێ وە بێت لە ئاگردایە ) سێ جاری وتەوە (خوا سەیری کەسێك ناکات کە پۆشاکەکەی بەری بۆ فیز و لوت بەرزی بە دوای خۆیدا رابکێشێت).

(٢٩٢) ( م ن هـ ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ جَرَّ ثَـوْبَهُ أَوْ قَـالَ إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثَـوْبَهُ مِنَ الخَيْلاءِ لَمْ يَنْظُرِ اللهُ إِلَيْهِ يَومَ القِيَامَةِ ﴾ . اللفظ للنسائي. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٦٩٣) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك بۆ فیز و خۆ هەڵکێشان پۆشاکی بەری بە دوای خۆیدا راکێشێت، خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا سەیری ناکات ).

(٢٩٣) ( د ك ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لايَقْبَلُ اللهُ صَلاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧٤٦) في صحيح الجامع

( خوای گەورە نوێژی ئافرەتێك کە کەوتبێتە عوزرەوە، وەرناگرێت بەبێ سەرپۆش).

## رونکردنەوەی فەرمودەکان :

١. هەر پۆشاکێك کە موسڵمان لەبەری دەکات ( شەرواڵ، پانتۆڵ، دسداشە، کەواو سەڵتە، عەبا، ... هتد ) نابێت لە پاژنەی پێ درێژ تر بێت، وە هەموو زیادەیەك لە خوار پاژنە پێ وە لە ئاگردایە.
٢. ئەگەر زیادە رۆیی لە درێژکردنی بەرگ و پۆشاکدا لە خوار پاژنەپێ وە و راکێشانی بە زەویدا، بۆ فیز و لوت بەرزی و خۆ هەڵکێشان و بە خۆنازین بێت ئەوا تاوانەکە زۆر گەورە دەبێت و خاوەنەکەی هیچی بەسەر حەڵاڵ و حەرامی خواوە نامێنێت و لە رۆژی قیامەتیشدا خوای گەورە سەیری خاوەنەکەی ناکات وسوك و ریسوای دەکات .
٣. دیاری کردنی سنوری پاژنە پێ بۆ پۆشاك تایبەتە بە پیاوەوە، بەڵام ئافرەت دەتوانێت پۆشاکەکەی لە پاژنەی پێی زیاتر شۆڕ بکاتەوە بەمەرجێك ئەویش زیادە رەوی تیادا نەکات و بۆ فیز نەبێت.
٤. ئافرەت کە تەمەنی گەیشتە ئەو رادەیەی کە بکەوێتە عوزری شەرعی یەوە ( واتە بکەوێتە حەیزەوە ) پێویستە خۆی داپۆشێت و سەرپۆش بکات بۆ نوێژەکانی، ئەگەر نا قبوڵ نابێت.

## (١٣) ( رێك وەستان و ریز بوون بۆ نوێژی جەماعەت )

(٢٩٤) ( حم د طب ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَقِيمُوا الصُّفُوفَ وَحاذُوا بَيْنَ المَناكِبِ وَسُدُّوا الخَلَلَ، ولِينُوا بِأَيْدِي إِخْوانِكُم﴾ لَمْ يَقُلْ عِيسَى بِأَيْدِي إِخْوانِكُمْ ﴿وَلا تَذَروا فُرُجاتٍ لِلشَّيْطانِ، وَ مَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفاًّ قَطَعَهُ اللهُ ﴾ . اللفظ لابى داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (١١٨٧) في صحيح الجامع

( ریزەکانتان ڕێك ڕابگرن و شانەکانتان لەگەڵ یەك بەرامبەر بکەن وبۆشایی نێوانتان پڕ بکەنەوە، شل بن بەدەست براکانتانەوە و جێگایان بکەنەوە و بۆشایی بۆ شەیتان بە جێ مەهێڵن ،وە هەر کەسێك ریزێك بگەیەنێت و تەواوی بکات خواش دەیگەیەنێت، وە هەرکەسێك ریزێك بقرتێنێت، خوا دەیقرتێنێت ).

**تێبینی /** ( شل بن بەدەست براکانتانەوە ) مەبەستی پێ ئەوەیە ئەگەر موسڵمانێك دەستی خستە سەر شانت هەتا لە ریزەکەدا جێگای بکەیتەوە ئەوا خۆت رەق مەکەو کەمێك بجوڵێ با جێگای ئەویش ببێتەوە لە ریزەکەدا.

هەروەها ( هەرکەسێك ریزێك بگەیەنێت خواش دەیگەیەنێت ) مەبەستی پێ ئەوەیە هەر موسڵمانێك ریزێکی نوێژ کە پچڕاوەو بۆشایی تێدایە پڕی کاتەوەو بەیەکی بگەیەنێت ئەوا خوای گەورەش دەیگەیەنێت بە رەحمەتی خۆی و خێری بۆ دەنوسێت وپلەی بەرز دەکاتەوە. هەروەها ( هەرکەسێك ریزەکە بقرتێنێت خواش دەیقرتێنێت ) مەبەستی پێ ئەوەیە کەسێك بۆشایی لە ریزەکاندا دروست بکات، یان نەچێتە پاڵ ریزەکەو ریزی جەماعەتەکە لەت بکات و تێکی بدات، ئەوا خوای گەورەش رەحمەتی خۆی لێ دەقرتێنێت و دا بڕاوی دەکات لە خێر و بەخششی خۆی.

**(٢٩٥)** ( د ) عن النعمان بن بشير: ﴿ أَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) عَلَى النَّاسِ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ -ثَلاثاً-، واللهِ لَتُقِيمُنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ ﴾. قَالَ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَلْزَقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ وَرُكْبَتَهُ بِرُكْبَةِ صَاحِبِهِ وَكَعْبَهُ بِكَعْبِهِ . اللفظ لابى داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (١١٩١) في صحيح الجامع

(پێغەمبەری خوا(ﷺ) رووی کردە ئەو خەڵکە ( لەکاتی نوێژ دابەستندا ) و فەرمووی: ریزەکانتان رێك راگرن -سێ جار-، سوێند بێت بەخوا ریزەکانتان رێك رادەگرن یان خوای گەورە دڵەکانتان لە ئاستی یەك دەگۆڕێت). وتی: ئیتر دەمبینی پیاو شانی دەلکاند بەشانی هاوڕێ کەیەوە و ئەژنۆی بە ئەژنۆی هاوڕێ کەیەوە وپاژنە پێ ی بە پاژنە پێ یەوە .

**(٢٩٦)** ( حم طب ) عن النعما بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ فِي صَلاتِكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٦٥) في صحيح الجامع

( ریزەکانی خۆتان لە نوێژەکەتاندا رێك دەخەن یان خوای گەورە دڵەکانتان لەگەڵ یەك دەگۆڕێت ) .

**(٢٩٧)** ( هـ ) عن النعما بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ سَوُّوا صُفُوفَكُم أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٦٢١) في صحيح الجامع

( ریزەکانتان رێك بکەن ئەگینا خوای گەورە رووتان لە ئاستی یەك وەردەگێرێت ).

**(٢٩٨)** ( حم د هـ ك ) عن البراء ( هـ ) عن عبد الرحمن بن عوف ( طب ) عن النعمان بن بشير البزار عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الأَوَّلِ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٣٩) في صحيح الجامع

خوای گەورە و فریشتەکانی ئەوا لەسەر ریزی یەکەم ...ەن ).

(٢٩٩) ( حم طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ) : ﴿ إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى الصَّفِّ الأوَّلِ، سَوّوا صُفوفَكُمْ وَحاذوا بَيْنَ مَناكِبِكُمْ، وَلينُوا في أيْدي إخْوانِكُمْ وَسُدُّوا الخَلَلَ فَإنَّ الشَّيْطانَ يَدْخُلُ فيمَا بَيْنَكُمْ مِثْلَ الحَذْفِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٤٠) في صحيح الجامع

( خوای گەورە و فریشتەکانی سەڵەوات لەسەر ریزی یەکەم دەدەن، ریزەکانتان رێك بکەن، وە شانەکانتان جوت بکەن وە شل بن بەدەست براکانتانەوە وە بۆشاییەکانی نێوانتان پڕ بکەنەوە، چونکە شەیتان وەك و بەرخۆلە دەچێتە نێوانتانەوە ).

(٣٠٠) ( حم ن الضياء ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على الصَّفِّ المُقَدَّمِ، وَالمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ بِمَدِّ صَوْتِهِ وَ يُصَدِّقُهُ مَنْ سَمِعَهُ مِنْ رَطْبٍ وَ يابِسٍ وَلَهُ مِثْلُ أجْرِ مَنْ صَلَّى مَعَهُ ﴾. اللفظ للنسائى. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٤١) في صحيح الجامع

(خواو فریشتەکانی سەڵەوات لەسەر ریزی پێشەوە دەدەن، بانگدەریش بە درێژایی دەنگەکەی خوا لێی دەبورێت، وە هەموو تەڕ و ووشکێك کە گوێی لەو بانگە دەبێت بەڵێ ی بۆ دەکات و وەڵامی دەداتەوە، وە هێندەی هەرکەسێك کە نوێژی لەگەڵدا کردووە پاداشتی بۆ دەنوسرێت ).

(٣٠١) ( ن ) عن البراء بن عازب رضى الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلىَ الصُّفُوفِ المُقَدَّمَةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٤٢) في صحيح الجامع

( خواو فریشتەکانی سەڵەوات لەسەر ریزەکانی پێشەوە دەدەن ).

(٣٠٢) ( ق د ت ) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عِبادَ اللهِ لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وجُوهِكُمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٩٦٩) في صحيح الجامع

(ئەی بەندەکانی خوا ریزەکانی خۆتان رێك دەخەن ، یان خوای گەورە رووتان لە ئاستی یەك وەردەگێرێت).

(٣٠٣) ( ن ) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَتُقِيمُنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وجُوهِكُمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٧٠) في صحيح الجامع

( ریزەکانتان رێك رادەگرن یان خوای گەورە روتان لە ئاستی یەك وەردەگێرێت ).

(٣٠٤) ( د ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿لايَزالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ عَنِ الصَّفِّ الأوَّلِ حَتّى يُؤَخِّرَهُمُ اللهُ فِي النَّارِ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٦٩٦) في صحيح الجامع (حم هـ حب ك)عن عائشة

( کەسانێك بەردەوام لە ریزی یەکەم دوا دەکەون، هەتا خوای گەورە لە ئاگردا دوایان دەخات).

(٣٠٥) ( ن ك ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ وَصَلَ صَفّاً وَصَلَهُ اللهُ ، وَمَنْ قَطَعَ صَفّاً قَطَعَهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٨٦) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك ریزێك بگەیەنێت و پڕی بکاتەوە. خوای گەورەش دەیگەیەنێت. وە هەرکەسێك ریزێك بقرتێنێت خوای گەورەش دەیقرتێنێت ).

**تێبینی/** پێم وایە ئەم فەرموودە پیرۆزانە هێندە ماناکەیان روون و ئاشکرایە کە پێویست بە روونکردنەوە و شەرحی زیاتر ناکەن. تەنها ئەوەندە دەڵێم خۆزگە مامۆستا ئاییینیە بەڕێزەکان ئەم فەرموودانەیان بۆ ئەهلی جەماعەت لە مزگەوتەکاندا دەخوێندەوە. بۆ ئەوەی لەوە زیاتر ریزەکانی جەماعەت خوار و خێچ و شل و شێواو نەبوونایە. و دڵەکانیشمان لە ئاستی یەکتر نەگۆڕایە و رووومان لە یەکتر وەرنەگێڕایە

## ( ١٤ ) ( دەربارەی تف کردن لە نوێژ دا )

**(٣٠٦) ( حم خ ) عن ابی هریرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا قامَ أحَدُكُمْ إلى الصَّلاة فَلا يَبْزَقْ أمامَهُ فَإنَّما يُناجِي اللهَ تَبارَك وَ تَعالىٰ مادامَ في مُصَلّاهُ ولاعَنْ يمينِه فَإنّ عَنْ يَمينِه مَلَكاً ، وليَبْصُق عَنْ يَسارِه أوْ تَحْتَ قَدَمِه فَيَدْفِنُها ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٧١٥ ) في صحيح الجامع**

واتە: (ئەگەر یەکێکتان هەستا بۆ نوێژ با تف نەکاتە بەردەمی خۆی . چونکە ئەو موناجات و پاڕانەوەی خوای گەورە دەکات مادەم لـ شوێنی نوێژکردنکەیدایە. وە با تفیش نەکاتە لای راستی . چونکە فریشتەیەك لای راستی یەبی، وە با تفەکە بکاتە لای چەپی یان ژێر پێ ی و بیکا بەژێر خۆڵەوە )

**(٣٠٧) ( مالك ق ن ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا كانَ أحدُكُمْ يُصَلّي فَلا يَبْصُقْ قِبَلَ وَجْهِه ، فَإنَّ اللهَ قِبَلَ وَجْهِه إذا صَلّىٰ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٥٣ ) في صحيح الجامع**

( ئەگەر یەکێکتان نوێژی دەکرد با نف نەکاتە بەردەمی خۆی. چونکە خوای گەورە بەرەو روویەتی کاتێك کە نوێژ دەکات ).

**(٣٠٨) ( حم خ د هـ ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ أحدَكُمْ إذا كانَ في الصلاة فإن الله قِبَلَ وجْهِه، فَلا يَتَنَخَّمَنَّ أحَدٌ مِنْكُمْ قِبَلَ وَجْهِه في الصَّلاة ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٥٤٠ ) في صحيح الجامع**

( هەریەکێکتان ئەگەر لە نوێژدا بوو ئەوا خوای گەورە بەرەو روویەتی. جا کەستان تف و بەڵغەم فڕێ نەداتە بەردەمی خۆی لەنوێژدا ).

## ( ١٥ ) ( فەزڵی نوێژی جەماعەت )

**(٣٠٩)( طب هق )عن قبات بن اشيم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ صلاةُ رَجُلَيْن يؤمُّ أحدُهُما صاحِبَهُ أزكى عنْدالله منْ صلاة أرْبَعَةٍ تَتْرىَ، وَ صلاةُ أرْبَعَةٍ يَؤمُّهُم أحَدُهُمْ أزكى عنْدَالله مِنْ صَلاةِ ثَمانيَةٍ**

تترى، وصَلاةُ ثَمانيةٍ يؤمُهمْ أحدُهمْ أزكى عندَالله منْ صلاة مائة تترى ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٨٢٣) في صحيح الجامع

(نوێژی دووپیاو که یەکێکیان پێش نوێژیی بۆ هاوڕێکەی بکات لەلای خوا پاكو باشتره لەنوێژی چوار کەس کە هەر یەکەیان بۆخۆی بیکات، وە نوێژی چوارکەس کە یەکێکیان پێش نوێژییان بۆ بکات لەلای خوا پاكو باشتره لە نوێژی هەشت کەس کە هەریەکەیان بەجیا بۆ خۆی بیکات، وە نوێژی هەشت کەس کە یەکێکیان پێش نوێژییان بۆ بکات لەلای خوا پاكو باشتره لە نوێژی سەد کەس کە هەریەکەیان بەجیا بۆخۆی بیکات).

(٣١٠) (حم)عن ابن عمر قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ ليَعْجبُ منْ الصَّلاة في الجمعِ ﴾ (حسن) أنظر حيث رقم (١٨٢٠) في صحيح الجامع

(خوای گەورە نوێژی بەکۆمەڵی پێ سەیرو ناوازەیە).

(٣١١) (حم ق د هـ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ صلاةُ الرَّجل في جماعة تَزِيْدُ علَى صَلاته في بَيْته وَصَلاته في سُوقه خمْساً و عشْرينَ درجةً، و ذلكَ بأنَّ أحدكُمْ إذا توضَّأَ فأَحْسَنَ الوُضُوءَ وَ أتَى المَسْجدَ لايُريدُ إلا الصَّلاةَ وَلايَنْهزُهُ. يَعْني إلَّا الصَّلاةَ. ثُمَّ لمْ يخطُ خُطوَةً إلَّا رُفعَ لهُ بهَا دَرجَةٌ وحُطَّ بهَا عَنْهُ خَطيئَةٌ حَتَّى يَدْخُلَ المَسْجد، فإذا دخَلَ المَسْجد كان في صَلاة ماكَانَتْ الصَّلاةُ هيَ تَحْبِسُهُ، والمَلائكَةُ يُصلُّون على أحَدكُمْ مادام في مَجْلسه الَّذي صلَّى فيه. يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ اغْفرْلَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْه مالمْ يُؤذِ فيه أوْ يُحدثْ فيه ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٣٧٨٢) في صحيح الجامع

(نوێژی پیاو لە جەماعەتدا خێری زیاترە لە نوێژەکەی لە ماڵی خۆیدا یان لە دوکانو بازاڕەکەیدا بە بیستو پێنج پلە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە یەکێك لە ئێوە کاتێك کە دەست نوێژی گرت، دەست نوێژێکی باش، وە هات بۆ مزگەوت وە هیچ مەبەستێکی نەبوو تەنها نوێژ کردن نەبێت وە هیچ شتێك پاڵنەرو هاندەری نەبووە تەنها نوێژەکە نەبێت. پاشان هەر هەنگاوێك کە دەینێت پلەیەکی بۆ پێ بەرز دەکرێتەوە. وە تاوانێکیشی بۆ پێ هەڵدەوەرێت هەتا دەچێتە مزگەوتەکەوە، جا ئەگەر چووە ناو مزگەوتەکە ئەوا ئیتر لە نوێژدایە مادەم لە پێناو نوێژکردندا لە مزگەوتەکەدا ماوەتەوە. وە فریشتەکانیش سەلەوات لەسەر هەریەکێکتان دەدەن مادەم لەو مەجلیسەیدا ماوەتەوە کە نوێژەکەی تیادا کردووە، دەڵێن: خوایە لێی ببورە، خودایە بیبەخشە، خودایە تۆبەی لێ وەربگرە، بە مەرجێك ئازاری کەسی تێدا نەدات یان دەست نوێژەکەی بەتاڵ نەکاتەوە).

## ( ١٦ ) ( نوێژکردن له پاش ئیمامه‌وه )

(٣١٢) ( حم م د ن هـ ) عن ابی سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَقَدَّمُوا فأْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ وَلايَزالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ حتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٩٧٦ ) في صحيح الجامع

(وه‌رنه پێش، له دوای منه‌وه نوێژه‌که‌تان بکه‌ن، با ئه‌وانه‌ی له‌پاش ئێوه‌شن له دواتانه‌وه نوێژه‌که‌یان بکه‌ن‌و ئێوه بکه‌نه ئیمام،وه که‌سانێك به‌رده‌وام هه‌ر دوا ده‌که‌ون هه‌تا خوای گه‌وره ده‌یانخاته دواوه).

(٣١٣) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ما يَأْمَنُ الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ فِي صَلاتِهِ قَبْلَ الإِمَامِ، أَنْ يُحَوِّلَ اللهُ صُورَتَهُ فِي صُورَةِ حِمَارٍ؟! ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨٠٩ ) في صحيح الجامع

(ئایا ئه‌و که‌سه‌ی که له نوێژدا له پێش ئیمامه‌که‌وه سه‌ری به‌رز ده‌کاته‌وه ناترسێت که خوا شێوه‌ی بگۆڕێت به‌شێوه‌ی که‌ر؟!).

(٣١٤) ( ق ٤ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أما يَخْشَى الذي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الإمام يُحَوِّلَ الله رأسَهُ رأس حِمَارٍ ﴾. اللحفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٣٤١ ) في صحيح الجامع

(باشه ئه‌و که‌سه‌ی که له پێش ئیمامدا سه‌ری به‌رز ده‌کاته‌وه ناترسێت که‌خوا سه‌ری بگۆڕێت به‌سه‌ری که‌ر).

## ( ١٧ ) ( دڵ په‌یوه‌ست بوون به خواوه له‌کاتی نوێژدا)

(٣١٥) ( هـ )عن حذيفة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ الرَّجُلَ إِذا دَخَلَ فِي صَلاتِهِ أَقْبَلَ اللهُ عَلَيْهِ بِوَجْهِهِ فَلا يَنْصَرِفُ عَنْهُ حَتَّى يَنْقَلِبَ أَوْ يُحْدِثَ حَدَثَ سُوءٍ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٦١٤ ) في صحيح الجامع

(پیاو که ده‌ستی کرد به‌نوێژکردن خوای گه‌وره ڕووی تێده‌کات‌و ڕوویشی لێ وه‌رناچه‌رخێنێت هه‌تا مه‌گه‌ر ده‌ست له نوێژکردنه‌که هه‌ڵگرێت یان کارێکی خراپ ئه‌نجام بدات).

## ( ١٨ ) ( فه‌زڵی خوێندنی سوره‌تی الفاتحه )

(٣١٦) ( ح م ٤ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالى: قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْنِي وَ بَيْنَ عَبْدِي نِصفَيْنِ، فَنِصفُهَا لِي وَ نِصفُهَا لِعَبْدِي وَ لِعَبْدِي مَاسَأَلَ. يَقْرَأُ الْعَبْدُ فَيَقُولُ الْحَمْدُلله رَبِّ الْعَالَمِينَ. فَيَقُولُ اللهُ تَبارَكَ وَ تَعَالى: حَمِدَنِي عَبْدِي، فَيَقُولُ:

الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، فَيَقُولُ اللهُ أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، فَيَقُولُ: مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ، فَيَقُولُ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وَهذا لِي، وَبَيْنِي وَ بَيْنَ عَبْدِي إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَ إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ، وَآخِرُ السُّورَةِ لِعَبْدِي وَلِعَبْدِي مَاسَأَلَ، يَقُولُ: اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضَّالِّينَ﴾. اللفظ للترمذي (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٢٥) في صحيح الجامع

(خوای گەورە فەرمویەتی: نوێژم دابەش کردووە لە نێوان خۆم‌و بەندەکەمدا بۆ دوو کەرت،نیوەی بو من‌و نیوەیشی بۆ بەندەکەم وە بەندەکەم ئەوەی داوای کردووە دەیدەمێ، بەندە دەیخوێنێتەوە دەڵێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ -سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان-﴾ خوای گەورەش دەفەرموێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، ئینجا دەڵێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ - خوای بەخشندەو میهرەبان- ﴾خوایش دەفەرموێت بەندەم ستایشی لەسەردام ئنجا، دەڵێ: ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ - خاوەنداری رۆژی قیامەت-﴾ ئەویش دەفەرموێت: بەندەکەم شکۆمەندیی بۆ من بڕیاردا، وە ئەوەندەی بۆ منە، وەلە نێوان من‌و لە نێوان بەندەکەمدا ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ - هەر تۆدەپەرستین‌و هاناش هەر بۆ تۆ دەبەین-﴾ وە کۆتایی سورەتەکەش بۆ بەندەکەم، وە بەندەکەم ئەوەی داوای کردووە دەیدەمێ دەڵێ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ - ڕێنومایمان بکە بۆ ڕێگەی راست، ڕێگەی ئەوانەی کە ڕۆژی خۆتت بەسەردا ڕشتون،نەك ڕێگەی ئەوانەی کە غەزەبیان لێ گیراوەو نەك ڕێگەی ئەوانەش کە سەرلێشێواوو گومڕا بوون﴾ ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرمووده پیرۆزە فەزڵ‌و گەورەیی سورەتی (الفاتحة)مان بۆ دەردەخات وە چۆن کاتێك کە بەندەیەکی خوا لەنوێژەکەیدا دەیخوێنێت خوای گەورە ئایەت بە ئایەتی وەڵام دەداتەوە.وە ئەم سورەتە گەورەترین سورەتی قورئانەو هیچ نوێژێکیش بەبێ خوێندنی ئەم سورەتە دروست نی یە، وە سورەتەکە لە حەوت ئایەت پێك دێت، وە هەر وەك لە فەرمودەکەدا هاتووە خوای گەورە سورەتەکەی دابەش کردووە بۆ دووبەش کە بەشی یەکەم لەسێ ئایەتی سەرەتای سورەتەکە پێك دێت وە بەشی دووەمیش لە سێ ئایەتی کۆتایی سورەتەکە پێك دێت، وە لە نێوان هەردوو بەشەکەشدائایەتی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ هەیە.

جا بەشی یەکەمیان سێ ئایەتە تایبەتە بە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەوە، وە ئایەتی چوارەمیش پەیوەندی نێوان خوای گەورەو بەندەکەی خۆی دەردەخات کە پەیوەندی بەندایەتی و پاڕانەوەیە لە خوای گەورە، ئینجا بەشی دووەمی سورەتەکە دێت کە بریتی‌یە لە نزاو پاڕانەوەی ئەو بەندەیە لە پەروەدگاری خۆی، کە خوای گەورە لە وەڵامیدا دەفەرموێت ئەوەی بەندەکەم داوای کرد دەیدەمێ،کە دوعاو پاڕانەوەکەش بریتی‌یە لە داوای ڕینومایی کردن بۆ ڕێگەی ڕاست،ڕێگەی ئەو پیاو

چاکانەی کە خوای گەورە نیعمەتو ڕۆزی خۆی بەسەردا ڕشتون، کە ئەوانیش بریتین لە پێغەمبەرانو دۆستانی خواو شەهیدەکانو پیاوچاکان، هەروەك لە سورەتی (النساء)دا هاتووە ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾النساء/٦٩ . نەك ڕێگەی ئەوانەی کە غەزەبیان لێ گیراوەو نەك ڕێگەی ئەوانەش کە سەرلێشێواو وگومڕابوون).

## (١٩) ( خوێندنەوەی قورئان لەسەر حەوت پیت )

(٣١٧) (م د ن ) عن ابي بن كعب: أنّ النبيّ(ﷺ) كان عندَ أضاة بني غفار فأتاهُ جبريلُ فقالَ: ﴿ إنّ اللهَ يأمُرك أنْ تُقرِيءَ أمّتَكَ على حرْف، قالَ أسألُ الله مُعافاتَهُ وَ مغفرَتَهُ إنّ أمّتي لا تُطيقُ ذلك، ثُمَّ أتاهُ ثانيةً فذكَرَ نحْوَ هذا حتّى بَلَغَ سبْعةَ أحْرُف، قالَ إنّ اللهَ يأمُرُكَ أنْ تُقرِىءَ أمّتكَ على سبْعَةِ أحْرُف فأيّما حَرْف قرءوا عليْه فقدْ أصابُوا ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥) في صحيح الجامع

(پێغەمبەر(ﷺ) لەلای جۆگە ئاوەکەی (بني غفار) بوو جبریل هات بۆلای و پێی ووت: خوا فەرمانت پێدەکات کە لەسەر یەك پیت (یەك شێوان) قورئان بە ئومەتەکەت بخوێنیتەوە،ئەویش فەرمووی: داوای سەلامەتیو لێبوردن لە خوا دەکەم، بەراستی ئومەتەکەی من بەرگەی ئەوە ناگرێت،پاشان جارێکی تر هاتەوە بۆلای و ئەویش هەر هەمان شتی دەوتەوە هەتا گەیشتە حەوت پیت(شێوان) ووتی: خوای گەورە فەرمانت پێدەکات کە لەسەر حەوت پیت (شێوان) قورئان بە ئومەتەکەت بخوێنیتەوە، جا لەسەر هەر پیتێکیان (شێوازێکیان) بیخوێننەوە هەر دروستەو پێکاویانە)

## (٢٠) ( خوێندنەوەی ئەو ئایەتانەیکە باسی ڕەحمەت یان عەزابیان تێدایە )

(٣١٨) ( هم م ٤ ) عن حذيفة: ﴿ كانَ إذا مَرّ بآيَةِ خوف تَعَوّذ وَ إذا مرّ بآيَة رحْمَة سأَلَ وَ إذا مرّ بآيَة فيها تَنْزِيهُ الله سَبّحَ ﴾ . اللفظ لابي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٧٣٧) في صحيح الجامع ومابين القوسين ضعيف عند الألباني أنظر ضعيف الجامع حديث رقم (٤٤١٧)

(هەر کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بیگەیشتایەتە ئایەتێك کە ترسی تێدا بێت پەنای بە خوا دەگرت، وە ئەگەر بگەیشتایە بە ئایەتێکی ڕەحمەت ئەوا داوای لە خوا دەکردو دەپاڕایەوە، وە ئەگەر بگەیشتایە ئایەتێك کە وەسفی گەورەییو پاکی خوای تێدا بێت ﴿سبحان الله ﴾ی دەکرد).

## ( ٢١ ) ( دەربارەی نوێژی هەینی ) ( فەزڵی نوێژی هەینی )

(٣١٨) (م ن هـ)عن حذيفة و أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أضَلَّ اللهُ عَنِ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا، فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ، و كَانَ للنصارى يومُ الأحد، فجاء الله بنا، فَهَدانا اللهُ ليومِ الجُمُعَةِ، فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَ السَّبْتَ وَالأحدَ، و كذلك هُمْ تَبَعٌ لَنَايَوْمَ الْقِيَامَةِ، نَحْنُ الآخرون مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الْمَقْضِي لَهُمْ قَبْلَ الْخَلائِقِ ﴾ اللفظ المسلم من حديث حزيفة. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٠١٧) في صحيح الجامع

(خوای گەورە ئەوانەی پێش ئێمەی بێ ئاگادارکردبوو لە رۆژی هەینی، ئەوەبوو رۆژی شەممە بۆ جولەکە بوو، وە گاورەکانیش رۆژی یەکشەمەیان بۆ بوو، وەخوای گەورە ئێمەی رێنومایی کرد بۆ رۆژی هەینی، ئەوە بوو کردی بە هەینی و شەممەو یەك شەممە، وە بە هەمان شێوەش ئەوان هەر پاشكۆی ئێمەن لە رۆژی قیامەتدا، ئێمە کۆتاییەکانین لە خەڵکی دونیا، وە یەکەمەکانین لە رۆژی قیامەتدا،کەلە پێش هەموو خەڵکانی ترەوە قەزاوەتیان دەکرێت).

(٣١٩) (هب) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَفْضَلُ الأَيَّامِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٧٢) في صحيح الجامع

(باشترین و بەڕێزترین رۆژەکان لەلای خوا رۆژی هەینی یە).

(٣٢٠) (ك هب) عن ابى موسى قال: رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله يَبْعَثُ الأَيَّامَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى هَيْئَتِهَا ،وَ يَبْعَثُ الْجُمُعَةَ زهراء مُنِيرةً لأَهْلِهَا فَيَحُفُّونَ بها كَالعَروسِ تُهْدَى إلى كَرِيمِها تُضِيءُ لَهُمْ يَمْشُونَ فِي ضَوْئِهَا أَلْوانُهُمْ كَالثَّلْجِ بياضاً، رِيَاحُهم تَسْطَعُ كَالْمِسْكِ يَخُوضُونَ فِي جِبَالِ الكافورِ يَنْظُر إِلَيْهِمُ الثَّقَلانِ ما يطرفُون تَعجُباً حَتَّى يَدْخُلُوا الْجَنَّةَ لايُخَالِطُهُمْ أَحَدٌ إِلَّا الْمُؤذِنُونَ الْمُحْتَسِبُونَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٧٢) في صحيح الجامع

( خوای گەورە رۆژەکان زیندوو دەکاتەوە لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر شێوازی خۆیان، وە هەینی زیندوو دەکاتەوە گەشو روناك بۆ ئەهلەکەی، ئەوانیش دەوری دەدەن هەروەك ئەو بوکەی کە بۆ زاوا دەبرێت دەدرەوشێتەوە بۆیان، ئەوانیش لەبەر تیشكو روناکیەکیدا دەڕۆن، رەنگیان وەك بەفر سپییە بۆنیان وەك مبسك بڵاو دەبێتەوە، خۆیان لە چیاکانی کافور وەردەدەن، سەرجەم ئینسانو جنۆکە سەیریان دەکات، لەسەرسوڕماندا چاویان لێ ناتروکێنن هەتا دەچنە بەهەشتەوە، وە کەسی تریش تێکەڵیان نابێت تەنها ئەو بانگ دەرانە نەبێت کە لە رێی خواو بەبێ کرێ بانگیان داوە).

**تێبینی/** مەبەست لە ئەهلی جومعەیە .

(٣٢١) (مالك هم م ن هـ) عن أبي هريرة: أنَ رسُول الله(ﷺ) ذكر يوْم الجُمعة، فقال: ﴿ فِيهِ سَاعَةٌ لايُوافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ،وَهُوَ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللهَ شَيْئاً، إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ ﴾ و اللفظ المسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢١٢٠) في صحيح الجامع

( پێغەمبەر(ﷺ) باسی رۆژی هەینی کرد فەرمووی: ساتە وەختێکی تێدایە، هەر بەندەیەکی موسڵمان بۆی رێکەوێت لەو کاتەدا نوێژ بکات، داوای هەرچییەك لە خوا بکات خوا پێی دەبەخشێت

**(٣٢٢) ( هم د ن هـ حب ك ) عن أوس بن أوس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ منْ أَفْضَلِ أَيَّامكُمْ يوْمَ الْجُمُعَة، فَأَكْثِروا علَي منَ الصَّلاة فيه، فَإنَّ صَلاتَـكُمْ معْروضَةٌ علَيَّ ﴾، فقالوا يَارسُول الله! وكيْف تُعْرَض صَلاتُنا علَيْك وقَدْ أَرمْتَ؟ قَال: يقُولْ: بليت، قال: ﴿ إنَّ الله حرم علَى الأَرْضِ أَجْساد الأَنْبِياء ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢١٢ ) في صحيح الجامع**

( رۆژی هەینی لەباشترینی رۆژەکانتانە، جا ئێوەش سەڵەواتی زۆرم تیایدا لەسەر بدەن، چونکە سەڵەواتەکانتانم بۆ نمایش دەکرێت)، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا چۆن سەڵەواتەکانمانت بۆ نمایش دەکرێت لەکاتێکدا کە تۆ پوکاویتەوە؟ -مەبەستیان ئەوە بوو کە لە دوای وەفاتی دەبێتەوە بە خۆڵ- ئەویش فەرمووی: (خوای گەورە جەستەی پێغەمبەرانی حەرام کردووە کە زەوی بیانڕزێنێت).

**(٣٢٣) ( مالك الشافعي ) عن عبيد بن السباق مرسلا ( هـ ) عنه عن إبن عباس: أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ يامَعْشَر الْمُسْلمين، هَذا يوْمٌ جعَلَهُ اللهُ تَعَالَى عيداً للْمُسْلمينَ، فَاغْتَسلوا، و منْ كَانَ عنْدَهُ طيبٌ فَلا يضرُّهُ أَن يمس منْه عَلَيْكُمْ بِالسِّواك ﴾ اللفظ لمالك. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٥٨ ) في صحيح الجامع**

(ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئەمە رۆژێکە خوای گەورە کردوویەتی بە جەژن بۆ موسڵمانان، جا خۆتانی تێدا بشۆن، وە هەر کەسێکیش بۆنی خۆشی هەبوو، ئەوا هیچ زەرەر نادات ئەگەر لەو بۆنە خۆشە لەخۆی بدات، وە سیواکیش بەکار بهێنن).

## (٢٢) (رۆژو لە رۆژی هەینیدا )

**(٣٢٤) ( ع حب ) عن ابي سعيد قال: رسول الله(ﷺ): ﴿ خَمْسٌ منْ عَمَلَهُنَّ في يوْم كَتَبَهُ اللهُ منْ أَهْلِ الْجـنَّة، منْ صام يوْم الْجُمُعَة وراح إلى الْجُـمُعَة وعادَ مريضاً وَشَهد جَنَازَةً و أَعْتَقَ رَقَبَةً ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٤٣ ) في صحيح الجامع**

( پێنج شت هەر کەس بیانکات لە رۆژێکدا خوای گەورە لە ئەهلی بە هەشت دەینوسێت: هەرکەسێك رۆژی هەینی بەڕۆژو بێت، بڕوات بۆ نوێژی جومعە، وە سەردانی نەخۆشێك بکات و ئامادەی بە خاك سپاردنی جەنازەیەك بێت و گەردنێکیش ئازادبکات لە کۆیلەیەتی).

## ( ٢٣ ) ( فەزڵی دوعاکردن لە ڕۆژی هەینیدا )

( ٣٢٥ ) ( مالك حم ٣ حب ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيه الشَمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيْه خُلِقَ آدمُ وَفِيْه أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَ فِيْه أُهْبِطَ مِنْهَا، وَفِيه سَاعَةٌ لايُوافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يُصَلِّي فَيَسْأَلُ اللهَ فِيْهَا شَيْئاً إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَاهُ** ﴾ اللفظ للترمذي ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٧٠ ) في صحيح الجامع

( باشترین ڕۆژ کە خوری تێدا هەڵهاتووە ڕۆژی هەینییە، تیایدا ئادەم دروست کرا. وەتیایدا خرایە بەهەشتەوەو وە تیایدا لێی دابەزێنرا. وە ساتە وەختێکی تێدایە هەر بەندەیەکی موسوڵمان بۆی ڕێبکەوێت نوێژی تێدا بکاتو داوای هەرشتێکی تێدا لە خوا بکات، ئەوا ئەو شتەی پێ دەبەخشێتو دەیداتێ )

## ( ٢٤ ) ( فەوتاندنی نوێژی جومعە )

( ٣٢٦ ) ( حم م ن هـ ) عن إبن عباس و إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمْ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ على قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِن الْغَافِلِينَ** ﴾ اللفظ لمسلم من حديث إبن عمر و ابي هريرة ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٤٦٦ ) في صحيح الجامع

(کەسانێك واز دەهێنن لە فەوتاندنی جومعەکان، یان ئەوەتا خوا مۆر لە دڵەکانیان دەدات،پاشان دەچنە ڕیزی بێ ئاگاو غافڵەکانەوە).

( ٣٢٧ ) ( حم ك ) عن ابي قتادة ( حم ن هـ ك ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاثَ مَراتٍ مُتَوالِياتٍ مِنْ غَيْرِ ضَرورةٍ طَبَعَ اللهُ عَلىَ قَلْبِه** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٣٢ ) في صحيح الجامع

( هەرکەسێك سێجار لەسەریەك نوێژی جومعە تەرك بكات بەبێ هۆیەکی زەروری پێویست. ئەوا خوای گەورە مۆر لە دڵی دەدات).

( ٣٢٨ ) ( ٤ حم ك ) عن ابي الجعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاثَ مَراتٍ تَهاوناً بِهَا طَبَعَ اللهُ عَلى قَلْبِه** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٤٠ ) في صحيح الجامع

(هەرکەسێك سێجار نوێژی هەینی تەرك بكات بەهۆی گوێ پێنەدانەوە. خوا مۆر لە دڵی دەدات.

## ( ٢٥ ) ( خۆشتن لە ڕۆژی هەینی دا )

( ٣٢٩ ) ( هم هـ )عن ابي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَة فَأَحْسَنَ الْغُسْلَ وَتَطَهَّرَ فَأَحْسَنَ الطُّهُورَ، وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيابِه، وَمَسَّ مَاكَتَبَ اللهُ لَهُ مِن طِيبٍ**

**أَوْدَهْنِ أَهْلِه. ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ، فَلَمْ يَلْغِ وَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ إثْنَيْنِ غَفَرَ اللهُ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى﴾** . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٦١ ) في صحيح الجامع

( هەركەسێك ڕۆژی هەینی خۆی بشوات خۆشتنێكی باش، وە دەست نوێژ بگرێت دەست نوێژێكی باش وە لە باشترینی جلەكانی لەبەر بكات، وەئەوەی كە خوا داویەتی لە بۆنی خۆش یان ڕۆنی خێزانەكەی لەخۆ بدات، پاشان بێتە مزگەوتو قسەی زیاد نەكاتو دوكەس لێك جیا نەكاتەوە. ئەوا خوای گەورە لەنێوانی ئەو هەینی بۆ هەینییەكەی تر لێی دەبورێت).

## ( ٢٦ ) ( تایبە تمەندێتی ڕۆژی هەینی لەلای موسڵمانان )

( ٣٣٠ ) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): **﴿نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا وَأُوتِيْنَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ. وَهَذَا الْيَوْمُ الَّذِي كَتَبَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ عَلَيهِمْ فَاخْتَلَفُوا فِيهِ فَهَدَانَا اللهُ عَزَّوَجَلَّ لَهُ﴾**، يعني يوم الجُمُعَة، **﴿فَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ الْيَهُودُ غَداً وَالنَّصَارَى بَعْدَغَدٍ﴾** . اللفظ للنسائي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٦٤٥ ) في صحيح الجامع

(ئێمە كۆتایی‌یە پێشكەوتووەكانین، تەنها ئەوەندەیە كە ئەوان لە پێش ئێمەدا كتێبیان پێ دراوەو ئێمە لە پاش ئەوان پێمان دراوە، وە ئەو ڕۆژەش كە خوای گەورە لەسەریانی نوسیوە ئەوان ناكۆك بوون لەسەری‌و خوای گەورەش ئێمەی ڕێنومایی كرد بۆی)، مەبەستی پێ ڕۆژی هەینییە ،( ئیتر ئەو خەڵكە تیایدا بوونە پاشكۆی ئێمە، جولەكەكان سبەینێ‌و گاورەكانیش دوای سبەینێ).

### ڕونكردنەوەی فەرمودەكان:

١- باشترینی ڕۆژەكان لەلای خوا ڕۆژی هەینییە.

٢- ڕۆژی هەینی جەژنی موسڵمانانە.

٣- ڕۆژی هەینی ساتەوەختێكی تێدایە هەركەسێك لەوكاتەدا بۆی هەڵكەوێت نوێژی تێدا بكاتو داوای هەر شتێك لە خوا بكات دەیداتێ.

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ساتەوەختەی دیاری نەكردووە بۆ ئەوەی موسڵمان هەموو ساتەكانی ڕۆژی هەینی بەكار بهێنێتو سودیان لێ وەربگرێتو دوعاو عیبادەتی زیاتریان تێدا بكات، هەروەها بۆ ئەوەی كەسانێكیش بۆ مەبەستی خراپ ئەو ساتەوەختە بەكارنەهێنن.

٤- یەكێكی تر لە تایبەتمەندیەكانی ڕۆژی هەینی ئەوەیە كە هەر موسوڵمانێك لە هەر شوێنێكی دونیادا لەو ڕۆژەدا سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بدات ئەوا ڕاستەوخۆ ئەو سەڵەواتە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) عەرز دەكرێتو ئەویش وەڵامی دەداتەوە، بۆیە پێویستە موسڵمانان لەو ڕۆژەدا كە باشترینی ڕۆژەكانە، سەڵەواتی زۆرو پێ پایان لەسەر باشترینی پێغەمبەران بدەنو ئەو ڕۆژە تایبەتمەند بكەن بەو كارە پیرۆزە.

٥- ڕۆژی هەینی بەهرەیەکە خوای گەورە داویەتی بە ئوممەتی ئیسلام، بەمەش جولەکەو گاورەکان بوونە پاشکۆی موسڵمانان چونکە شەممەو یەك شەممە کە تایبەتن بە جولەکەو گاورەوە بە دەوای هەینیدا دێن، هەروەها لە ڕۆژی هەینیدا فوو دەکرێت بە کەڕەناداو قیامەت هەڵدەسێت،وە ئومەتی ئیسلام کەلە تەرتیبی دونیادا کۆتایی میللەتانە، لە ڕۆژی قیامەتدا لە پێش هەموو میللەتانی ترەوە حەشر دەکرێن و قەزاوەتیان دەکرێت و بەڕێ دەکرێن.

٦- نوێژی هەینی (جومعە) فەرزی عەینەو هەرکەسێك سێ نوێژی جومعە لەسەریەك بە ئەنقەستو بەبێ عوزرێکی شەرعی بفەوتێنێت ئەوا دەچێتە ریزی بێ ئاگاکانەوەو خوای گەورە مۆری نیفاق لە دڵی دەدات، خوا پەنامان بدات.

٧- خۆشتن و دەست نوێژگرتن لە ماڵەوە و، لەبەرکردنی جلی جوان و بەکارهێنانی بۆنی خۆش و ڕۆنی قژ و، زوو چوون بۆ مزگەوت هەتا زوو جێگەی خۆت بگریت و نەبیتە مایەی ئازاردانی خەڵك و لێکدابڕینی دوو موسوڵمان لە یەکترو تێکدانی سەفەکان، هەروەها قسە نەکردن بە هیچ جۆرێك لەکاتی ووتاردا، ئەمانە هەر هەمووی لەئاداب و سوننەتەکانی جومعەن و هەر موسڵمانێك ئەنجامیان بدات ئەوا ئەو نوێژی جومعەیە خوای گەورە دەیکاتە کەفارەتی گوناهو تاوانەکانی لەو هەفتەیەوە بۆ هەفتەکەی تر.

٨- موسڵمان دەبێت هەوڵ بدات سەرتاپای ڕۆژی هەینی بکاتە ڕۆژی عیبادەت و ئەنجامدانی کاری خێر، لە ڕۆژو گرتن و بەسەرکردنەوەی نەخۆش و شوێن کەوتنی جەنازەو دەست گیرۆیی کردنی نەداران و سەڵەوات دانی زۆر لەسەر پێغەمبەر(ﷺ).

## (٢٧) (سوجدە بردن بۆ خوای گەورە)

(٣٣١) (**هب طب الضياء**) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مامنْ عَبْد يَسْجُدُ لله سجْدَةً إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا حَسنَةً وَحطَّ عَنْهُ بِهَا سَيِئَةً وَرَفَعَ لَهُ بِهَا دَرجَةً، فَاسْتَكْثِروا منَ السُجُود** ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٤١) في صحيح الجامع

(هەر بەندەیەك، یەك سوجدە بۆ خوا بەرێت، ئەوا خوا چاکەیەکی بۆ پێ دەنوسێت و، خراپەیەکیشی بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت و پلەیەکیشی بۆ پێ بەرز دەکاتەوە، جا سوجدە زۆر بەرن).

(٣٣٢) (**حم ع حب طب**) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إعْلَمْ أنَّكَ لاتَسْجُدُ لله سَجْدَةً إلا رَفَعَ اللهُ لكَ بِها درجَةً وَحطَّ عَنْكَ بِها خَطيئَةً** ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٠٦٩) في صحيح الجامع

(بزانە، هەر سوجدەیەك کە تۆ بۆ خوای دەبەیت، خوای گەورە پلەیەکت بۆ پێ بەرز دەکاتەوە. وە گوناهێکیشت بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت).

(٣٣٣) (البزار) عن إبن مسعود: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أقْرَبُ مَايَكُونُ الْعَبْدُ مِنَ الله وَهُوَ سَاجِدٌ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١١٧٤) في صحيح الجامع

(بەندە نزیك ترین حاڵەتی لە خواوە ئەو كاتەیە كە لە سوجدەدایە)

(٣٣٤) (هـ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَأْكُلُ النَّارُ ابْنَ آدَمَ إلَّا أَثَرَ السُّجُود، حَرَّمَ الله عَزَّوَجَلَّ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُود ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٨٧٥) في صحيح لجامع

(ئاگر هەموو جەستەی مرۆڤ دەخوات تەنها شوێنەواری سوجدە نەبێت، خوای گەورە لەسەر ئاگری دۆزەخی حەرام كردووە كە شوێنەواری سوجدە بخوات).

(٣٣٥) (إبن سعد حم) عن أبي فاطمة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أكْثِر مِنَ السُّجُود فَإنَّهُ لَيسَ مِنْ مُسْلِمٍ يَسْجُدُ لله تَعالَىٰ سَجْدَةً إلَّا رَفَعَهُ الله بِهَا دَرَجَةً فِي الْجَنَّةِ وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٢٠٤) في صحيح الجامع

(زۆر سوجدە بەرە، چونكە هەر موسڵمانێك سوجدەیەك بۆ خوا بەرێت، خوا پلەیەكی بۆ پێ لە بەهەشتدا بەرز دەكاتەوە، وە تاوانێكیشی بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت).

(٣٣٦) (حم م ت ن هـ) عن ثوباز و أبي درداءقال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لله، فَإنَّكَ لاتَسْجُدُ لله سَجْدَةً إلَّا رَفَعَكَ الله بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً ﴾. (صحيح أنظر حيث رقم (٤٠٤٥) في صحيح الجامع

(سوحدەی زۆر بەرە بۆ خوا، چونكە هەر سوجدەیەك كە بۆ خوا ببیەیت خوا پلەیەكت بۆ پێ بەرز دەكاتەوە وە تاوانێكت بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت)

(٣٣٧) (حم ت ن حب) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لله سَجْدَةً إلَّا رَفَعَهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً ﴾، قَالَ مَعْدانُ: ثُمَّ لَقِيتُ أبا الدَرْداءِ فَسَأَلْتُهُ عماسَأَلْتُ عَنْهُ ثَوْبَانَ فَقَالَ لِي: عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ فَإنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُول: ﴿ مَامِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لله سَجْدَةً إلَّارَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً ﴾. اللفظ للنسائي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٤٠) في صحيح الجامع

(هەر بەندەیەك سوجدەیەك بۆ خوا بەرێت، ئەوا خوای گەورە پلەیەكی بۆ پێ بەرز دەكاتەوە، وە تاوانێكی بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت)، (معدان) كە یەكێكە لە گێڕەرەوەكانی فەرمودەكە دەڵێ پاشان (ابا الدرداء)م بینی هەمان پرسیارم لێكرد كە لە (ثوبان)م كرد بوو ئەویش پێی ووتم: سوجدەی زۆر بەرە، چونكە من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: هەر بەندەیەك سوجدەیەك بۆ خوا بەرێت، خوا پلەیەكی بۆ پێ بەرز دەكاتەوە، وە تاوانێكیشی بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت).

## ڕوونکردنەوەی فەرمودەکان :

١. سوجدە بردن بۆ خوا یەکێکە لە گەورەترین ئەو هۆکارانەی کە بەندە لە پەروەردگاری خۆی نزیک دەکاتەوە بە جۆرێ کە هیچ کاتێك بەندە هێندەی ساتی سوجدە بردن لە خوای خۆیەوە نزیك نابێت هەر وەك لەو فەرمودەیەی پێشەوەدا هاتبوو کە إبن مسعود دەیگێڕێتەوە کە : (بەندە نزیك ترین حاڵەتی لە خواوە ئەو کاتەیە کە لە سوجدەدایە). کە ئەمەش باشترین فرسەت و ساتە وەختە هەتا بەندە تیایدا نزاو پاڕانەوەکانی ئاڕاستەی پەروەردگاری خۆی بکات .

٢. هەموو سوجدەیەك کە بە پاکی بۆ خوای گەورە ببرێت چاکەی بۆ بەندە پێ دەنوسرێت و تاوانی بۆ پێ هەڵدەوەرێت و پلەی لە بەهەشتدا بۆ پێ بەرز دەبێتەوە .

٣. ڕێزی ئەو سوجدە بردنە لای خوا هێندە گەورەیە کە خوای گەورە لەسەر ئاگری دۆزەخی حەرام کردووە کە شوێنەواری سوجدە بسوتێنێت . واتە ئەو کەسەی کە لە دونیادا سوجدەی بۆ خوا بردبێت ، ئەگەر لە قیامەتدا بە هۆی تاوانەکانیشیەوە بچێتە دۆزەخەوە ،بەڵام خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی و لەبەر ڕێزی سوجدەکانی، ئەو شوێنەواری سوجدانەی کە لەبەر خوای گەورە لە دونیادا خۆڵی وەرداوە ،ڕێگە نادات بە ئاگری دۆزەخ کە بیسوتێنێت

٤. سوجدە بردن جوانترین ڕەمزو هێمای بەندایەتی کردنە بۆ پەروەدگار ،کە مانای ئەوپەڕی مل کەچی وتەسلیم بوونە بە کاری خوا . وە نیشانەی خۆ داڕنینە لە هەموو فیزو دەعیەو بە خۆ نازین و لووت بەرزییەك .

## ( ٢٨ ) ( نوێژە فەرزەکان )

(٣٣٨) ( طس ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ افْتَرضَ عَلَى الْعِبَادِ خَمْسَ صَلَواتٍ فِي كُلِ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٢٢) في صحيح الجامع

(خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەر بەندەکانی فەرزکردووە لە هەمووشەوو رۆژێکدا).

## ( ٢٩ ) ( ئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتی خۆیدا )

(٣٣٩) ( حم ق د ن ) عن عبدالله بن مسعود قال: سَأَلتُ رَسُولَ الله(ﷺ) أيُّ العَمَلِ أَحبُّ إلى الله عَزَّوَجَلَّ؟ قَالَ: ﴿ إقَامُ الصَّلاة لوَقـتها و برَ الْوالِدَيْنِ وَ الْجهَادُ في سَبيل الله عزَّوَجَلَّ ﴾. اللفظ للنسائي. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٦٤) في صحيح الجامع

پرسیارم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ): چ کارێك لە هەموو کارەکانی تر خۆشەویسترە لای خوای گەورە؟ فەرمووی: (ڕاگرتنی نوێژ لەکاتی خۆیداو چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوکداو جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورەدا).

## ( ٣٠ ) ( فەزڵی نوێژی بەیانی )

(٣٤٠) ( ت ) عن أبي هريرة قال:قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّه، فلا تُخْفِروا الله في ذمَّته ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٣٥ ) في صحيح الجامع

(هەرکەسێك بەیانی نوێژەکەی کرد ئەوە ئیتر لە زەمانەتو پەنای خوادایە، جا ئەو زەمانەتو پەنایەی خوا مەبەزێنن).

(٣٤٠) ( حم م ت ) عن جنب البجلي قال: رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللهِ، فَلا تُخْفِروا الله فِي ذِمَّتِه ﴾.اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٣٨ ) في صحيح الجامع

واتە: (هەرکەسێك نوێژەکەی بەیانی کرد، ئەوە ئیتر لە زەمانەتو پەنای خوادایە، جا ئەو زەمانەتو پەنایەی خوا مەبەزێنن).

(٣٤١) ( هـ ) عن سمرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَلَّى الْفَجْر فَهُوَ فِي ذِمَّةِ الله، فَلا يَطْلُبَنَّكُمُ اللهُ بِشَيْءٍ مِنْ ذِمَّتِه ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٣٩ ) في صحيح الجامع

(هەرکەسێك نوێژی بەیانی کرد ئەوە ئیتر لە پەنای خوادایەو پارێزراوی ئەوە، جا کارێکی وا نەکەن کە خوا ببێتە داواکار لەسەرتان بەوەی کە شتێکتان لە پەنادانەکەی خوا شکاندووە).

### ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان :

مەبەستی فەرموودە پیرۆزەکان ئەوەیە، کە هەر کەسێك نوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا کرد، ئەو کەسە ئیتر لە زەمانەتو پەنای خوادایەو پارێزراوی ئەوە، دیارە هەر کەسێکیش لە پەنای خوادا بێتو خوا بیپارێزێت، ئەوا بۆ کەس نییە دەست درێژی بکاتە سەریو ئازاری بدات، چونکە بەو کارەی دوچاری شەڕو ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ خوادا دەبێت. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوە کە خۆمان بپارێزین لە ڕووبەڕووبونەوە یان ئازاردانی موسڵمانێك کە نوێژی بەیانی کردبێت. چونکە بەو کارەمان زەمانەتو پەنای خوا کە بەو کەسەی داوە دەبەزێنینو بەمەش دوچاری لێپرسینەوەو تۆڵەی خوا دەبین.

## ( ٣١ ) ( فەزڵی نوێژی بەیانی لە ڕۆژی هەینی دا )

(٣٤٢) ( حل هب ) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَفْضَلُ الصَّلَوات عِنْدَ الله صَلاةَ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَة فِي جَمَاعَةٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١١٩ ) في صحيح الجامع

(باشترینی نوێژەکان لەلای خوا نوێژی بەیانییە لە ڕۆژی هەینیدا کە بە جەماعەت بکرێت).

## ( ٣٢ ) ( چوار ركعەت نوێژ لە سەرەتای رۆژدا )

**(٣٤٣) ( حم ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ يَقُولُ: يا ابنَ آدَمَ اكفِنِي أوَّلَ النَّهارِ أَرْبَعَ رَكَعاتٍ أَكْفِكَ بِهِنَّ آخِرَ يَوْمِكَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩١٣ ) في صحيح الجامع**

(خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەنی ئادەم لە سەرەتای رۆژدا چوار ركعەت نوێژم بۆ تەرخان بكە. ئیتر هەتا كۆتایی ئەو رۆژە دەتپارێزم پێیان)

**(٣٤٤) ( حم ) عن ابي مرة الطائفي ( ت ) عن ابي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالىَ: يَاابنَ آدَمَ! صَلِّ لي أَرْبَعَ رَكَعاتٍ مِنْ أَوَّلِ النَّهارِ أَكْفِكَ آخِرَهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٣٨ ) في صحيح الجامع**

(خوای گەورە فەرموویەتی:ئەی بەنی ئادەم. لە سەرەتای رۆژدا چوار ركعەت نوێژم بۆ بكە. ئیتر باقی رۆژەكەت لەسەر منو دەتپارێزم).

**(٣٤٥) ( حم د ) عن نعيم بن همام ( طب ) عن النواس: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ يَا ابْنَ آدَمْ لاتُعْجِزْنِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعاتٍ فِي أَوَّلِ نَهارِكَ أَكْفِكَ آخِرَهُ ﴾ اللفظ لابي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٤١ ) في صحيح الجامع**

(خوای گەورە دەفەرموێت ئەی بەنی ئادەم دەستەوسان مەبە كە لە سەرەتای رۆژەكەتدا چوار ركعەت نوێژم بۆ بكەی، ئیتر باقی رۆژەكەت لەسەر منو دەتپارێزم).

**تێبینی/** هەر دووك زانای گەورە (ابن تيمية وابن القيم) پێیان وایە كە ئەو چوار ركعەت نوێژە مەبەست پێیان دوو ركعەت نوێژی بەیانی و دوو ركعەت سوننەتەكەیەتی. بەڵام هەندێكی تر لە زانایان پێیان وایە كە مەبەست پێیان چوار ركعەت سوننەتی (الضحى)یە واتە چێشتەنگاو. بەڵگەشیان ئەو فەرمودەیە كە لە (العيلانيات) دا بەرز كراوەتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) كە دەفەرموێت (ما من عبدٍ صلى الضحى ثم لم يتركها الا عرجت الى الله تعالى و قالت يارب إن فلاناً حفظني فأحفظه و إن تركها قالت يارب ان فلانا ضَّيعني فضيِّعه).

(هەر بەندەیەك نوێژی چێشتەنگاو بكاتو پاشان تەركی نەكات ، ئەوا نوێژەكە بەرز دەبێتەوە بۆلای خوای گەورەو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم فلانەكەس پاراستومی تۆش بیپارێزە.وە ئەگەر تەركیشی كرد دەڵێ ئەی پەروەردگارم فلانەكەس فەوتاندمی تۆش بیفەوتێنە).

## ( ٣٣ ) ( نوێژی ناوەراست نوێژی عەسر )

(٣٤٦) ( حم ق ٤ ) عن علي ( م هـ ) عن إبن مسعود: أنّ رسول الله(ﷺ)قال: يوم الخندق: ﴿ **حَبَسُونا عَنْ صَلاةِ الْوُسْطى، صلاة الْعصْر، ملأَاللَّهُ بُيُوتَـهُمْ وَ قُبُورَهُمْ نـاراً** ﴾. اللفظ لابي داود من حديث علي رضي الله عنه. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨٨٤ ) في صحيح الجامع

واته: (پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی شەڕی (الخندق) دا فەرمووی: نەیانهێشت نوێژەکەی ناوەڕاست، نوێژەکەی عەسر بکەین، خواماڵەکانیان و گۆڕەکانیان پڕ بکات لە ئاگر).

## ( ٣٤ ) (فەزڵی نوێژی عیشاو بەیانی )

(٣٤٧) ( حم د ن هـ حب ك ) عن ابي بن كعب قال: صَلّى بِنَا رَسُولُ اللهِ(ﷺ) يَوماً الصُّبْحَ فَقَالَ: ﴿**أَشاهِدٌ فُلانٌ؟ قَالُوا: لا، قَالَ: أَشاهد فُلان؟ قَالُوا: لا. قَالَ: إنَّ هَاتَيْنِ الصَّلاتَيْنِ أَثْـقَلُ الصَّلَواتِ عَلى الْمُنافِقِينَ،ولَو تَعْلَمُون مافيهِمَا لأَ تَيْـتُمُوهُما وَلَوْ جَـثوا عَلى الرُّكَبِ، وَ إنَّ الصَّفَّ الأَوَّلَ عَلى مثْل صف الملائكَة، ولَوْ علمْتُمْ مَافَضِيلَتُهُ لابْتَدَرْتُمُوهُ، وَ إنَّ صَلاةَ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكى مِنْ صلاته وحدهُ، وَصلاتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكى مِنْ صلاته مَعَ الرَّجُلِ، وَما كَثُـرَ فَهُوَ أَحَبُّ إلى الله عَزّوجَلّ** ﴾. اللفظ لابي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٢٢٤٢ ) في صحيح الجامع

(رۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردین فەرمووی: فلان کەس ئامادەیە؟ ووتیان:نەخێر. فەرمووی: ئەی فلان کەس ئامادەیە؟ ووتیان: نەخێر، فەرمووی: ئەم دوو نوێژە -مەبەستی نوێژی عیشاو بەیانییە- قورسترینی نوێژەکانن لەسەر مونافیقەکان، وە ئەگەر دەتانزانی چ خێرێکیان تێدایە ئەوا خۆتان دەگەیاندێ ئەگەر بەچۆکدا لەسەر ئەژنۆش بوایە، وە ڕیزی یەکەمیش لەسەر شێوازی ڕیزی فریشتەکانە،وە ئەگەر دەتانزانی چ فەزڵێکی تێدایە ئەوا پێش برکێتان بۆ دەکرد، وە نوێژی پیاوێك لەگەڵ پیاوێکدا خێرترە لە نوێژەکەی بە تەنیا، وە نوێژەکەی لەگەڵ دوو پیاودا خێرترە لە نوێژەکەی لەگەڵ پیاودا، وە هەتا زیاتر بن ئەوا لای خوای گەورە خۆشەویسترە).

## ( ٣٥ ) ( فەزڵی نوێژکردن لە سێیەکی کۆتایی شەودا )

(٣٤٨) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إذا مَضى شَطْرُ اللَّيْلِ، أَوْ ثُـلُثـاهُ، يَنْزِلُ اللهُ تَبارَكَ وَ تَعالى إلىَ السَّماءِ الدُّنْيا، فَيَقُولُ: هل مِنْ سائِلٍ يُعْطى، هَلْ مِنْ داعٍ**

يُسْتَجَابُ لَهُ، هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ يُغْفَرُ لَهُ حَتَّى يَنْفَجِر الصُّبْحُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٢) في صحيح الجامع

(ئەگەر نیوەی شەو تێپەڕی، یان لە سێ بەش دووبەشی تێپەڕی، خوای گەورەو بالادەست دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، دەفەرموێت:ئایا کەس هەیە داوا بکات هەتا پێی بدرێت؟ ئایا کەس هەیە بپاڕێتەوە هەتا وەلام بدرێتەوە؟،ئایا کەس هەیە داوای لێبوورن بکات هەتا ببووردرێت؟، ئیتر ئەمە وا دەبێت هەتا ئەو کاتەی کە بەیان هەڵدێت).

## ( ٣٦ ) ( قسەنەکردن لەکاتی نوێژدا )

(٣٤٩) ( ن ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله عزَّوَجَلَّ يعْني أَحْدَثَ في الصَّلاة أنْ لا تَكَلَّمُوا إلَّا بِذكْرِ الله وما يَنْبَغِي لَكُمْ،و أنْ تَقُومُوا لله قَانتِينَ ﴾ ( أنظر حيث رقم (١٧٠٠) في صحيح الجامع

(خوای گەورە فەرمانی تازەی داوە کە نابێت‌و بۆتان نییە لە نوێژدا جگە لە زیکری خوا هیچ قسەیەکی تر بکەن، وە دەبێت بە ملکەچی بۆ خوا بوەستن).

(٣٥٠) ( حم د ن هق ) عن عبدالله قال: كُنَّا نُسَلِّمُ في الصَّلاة و نأمُر بحاجَتنا، فقدمتُ على رسول الله(ﷺ) وهو يُصَلِّي، فسَلَّمْتُ عليه فَلَمْ يردَّ عَلَيَّ السَّلام، فَأخَذَني مَا قَدُم وماحدثَ، فَلَمَّا قضى رسُولُ الله(ﷺ) الصَّلاةَ قَالَ: ﴿ إنَّ الله عزَّوَجَلَّ يُحْدثُ منْ أَمْرِه مايَشاءُ، و إنَّ الله تَعالى قَدْ أَحْدَثَ منْ أَمْرِه أن لاتَكَلَّمُوا في الصَّلاة، فَرَدَّ عَلَيَّ السَّلام ﴾ اللفظ لابي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٩٢) في صحيح الجامع

(ئێمە پێشتر لە نوێژدا سەلاممان لە یەکتر دەکردو قسەی پێویستمان دەکرد،جامنیش هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو نوێژی دەکرد، منیش سەلامم لێ کرد، بەلام ئەو وەلامی سەلامەکەمی نەدایەوە، منیش لەتاودا ئەوەی هەبوو نەبوو هات بە خەیاڵمدا، ئینجا کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی:( خوای گەورە هەر شتێکی تازەی بوێت بڕیاری لەسەر دەدات، وە ئەوە خوای گەورە فەرمانی تازەی داوە کە لە نوێژدا قسە مەکەن، ئینجا وەلامی سەلامەکەی دامەوە)

## ( ٣٧ ) ( جوڵان لە نوێژدا بۆ حاڵەتی پێویست )

(٣٥١) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ عفْريتاً منَ الْجنِّ جَعَل يفْتكُ عَلَي الْبَارحَةَ، ليَقْطَع عَلَي الصَّلاةَ، و إنَّ الله أَمْكَنَني منْهُ فَذَعَتُّهُ، فَلَقَدْ هَممْتُ أنْ أَرْبطَهُ إلى جَنْبِ ساريَة منْ سواري الْمسْجد، حَتَّى تُصْبحُوا وتَنْظُرون إليْه أجْمَعُونَ

( أَوَكُلَكُمْ ) ثُـمَّ ذَكَرْتُ أَخِي سُلَيْمَانَ ( رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكاً لايَنْبَغِي لأحدٍ مِنْ بَعْدِي ) فَرَدَّهُ اللهُ خَاسِئاً ﴾. اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢١١١ ) في صحيح الجامع

(دێوێكی جنۆكه دوێنی هەر هەوڵی دەدا پەلامارم بدات. بۆ ئەوەی نوێژەكەم پێ ببڕێت، وە خوای گەورە زاڵی كردم بەسەریدا ،منیش توند رامپسكاند، وە هات بەدڵمدا كه بەكۆڵەكەیەك لە كۆڵەكەكانی مزگەوتەوە بیبەستمەوە هەتا بەڕۆژی روناك هەمووتان سەیری بكەن. بەڵام دوایی قسەكەی (سلێمان)ی برام بیر كەوتەوە كه وتویەتی: پەروەردگارم لێم ببورەو موڵكێكم پێ ببەخشە كه بۆ كەسی تر لە دوای منەوە نەبێت). ئیتر خوای گەورە بەڕیسوایی دێوەكەی گەڕانەوە).

## ( ٣٨ ) ( التحيات- و شايه تمان )

( ٣٥٢ ) ( حم ق ) عن ابن مسعود : كُنَا إذا جلَسنا مع رسول الله(ﷺ) في الصَلاة قُلنا : السَّلامُ على الله قبلَ عباده، السَّلامُ عَلىَ فُلانٍ و فُلانٍ. فقالَ رسُولُ الله(ﷺ): ﴿ لا تَقُولوا السَّلامُ عَلىَ الله، فَإِنَّ اللهَ هُوَ السَّلامُ، وَلكنْ إِذا جَلَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: التَّحِيَاتُ لله وَالصَّلواتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَ بَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنا وَ عَلىَ عِبادِ الله الصَّالحِينَ، فَإِنَّكُمْ إِذا قُـلْتُمْ ذَلكَ أَصَابَ كُلَّ عَبْدٍ صَالحٍ في السَّماءِ وَالأَرض أَوْ بَيْنَ السَّماءِ وَالأَرْضِ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُـمَّ لِيَتَخَيَّرْ أَحَدُكُمْ مِنْ الدُّعاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْه فَـيَدْعُوهُ﴾. واللفظ لابي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٤٧ ) في صحيح الجامع

(ابن مسعود) دەڵێ: ئێمە كاتێك كه لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) لە نوێژدا دادەنیشتین دەمانووت: سەلام لە خوا بێت پێش بەندەكانی، سەلام لە فلان‌و فلان بێت. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (مەڵێن سەلام لە خوا بێت، چونكه خوای خۆی (السلام)ە. بەڵام ئەگەر یەكێكتان دانیشت _واته لە نوێژدا_ با بڵێت: (التَّحِيَاتُ لله وَالصَّلواتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ ورَحْمَةُ الله وَ بَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنا وَ على عباد الله الصَّالحِينَ).

واته: هەموو سڵاوو سەڵەوات‌و پاكی یەكان بۆ زاتی الله، سەلامت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ رەحمەت‌و بەرەكاتی خوا، سەلام لە ئێمەو لە هەموو بەندە چاكەكانی خوا بێت -جا ئەگەر ئێوە واتان ووت ئیتر ئەوە هەموو بەندەیەكی باش لە زەوی‌و ئاسماندا دەگرێتەوە،ئینجا بڵێت:- أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ ورَسُولُهُ - شایەتی دەدەم كه هیچ خوایەك نییە جگە لە زاتی الله وە شایەتی دەدەم كه محمد بەندەو نێردراوی خوایە ئیتر پاش ئەوە هەریەكەتان چ دوعاو نزایەكی بەدڵە با بۆخۆی هەڵیبژێرێت‌و بیكات).

## ( ٣٩ ) ( زيكرو تەسبيحاتی پاش نوێژ )

**(٣٥٣) (ت ن حب) عن جويرية بنت الحارث: أنَّ النبيَّ(ﷺ) مرَّ عَلَيها وهي في مَسجدِها، ثُمَّ مرَّ النبيَّ(ﷺ) بها قريباً منْ نصف النَهار فَقالَ لَها: ﴿ مازلْتِ علىَ حالك؟ ﴾ قالَتْ: نَعَمْ، فَقال: ﴿ ألا أُعَلِّمُكَ كلمات تـقُولينها؟ سُبْحَانَ الله عَدَدَ خَلْقه، سُبْحَانَ الله عَدَدَ خَلْقه، سُبْحَانَ الله عَدَدَ خَلْقه، سُبْحَانَ الله رِضَى نَفْسه، سُبْحَانَ الله رضَى نَفْسه، سُبْحَانَ الله رضَى نَفْسه، سُبْحَانَ الله زِنَةَ عَرْشـه، سُبْحَانَ الله زِنَةَ عَرْشـه، سُبْحَانَ الله زِنَةَ عَرْشـه، سُبْحَانَ الله مدادَ كَلمَاته، سُبْحَانَ الله مدادَ كَلمَاته، سُبْحَانَ الله مدادَ كَلمَاته ﴾. واللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٦٢٣) في صحيح الجامع**

جويريه ی کچی الحارث كه خێزانی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) بوو ده‌ڵێ كه پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) سه‌ری لێ دا ئه‌میش له شوێنی نوێژه‌كه‌یدا بوو، پاشان نزیك نیوه‌ڕۆ جارێكی تر سه‌ردانی كرده‌وه‌و پێی فه‌رموو: ئه‌وه هێشتا له‌وكاته‌وه له‌سه‌ر حاڵی خۆتی؟ ووتی: به‌ڵێ، ئه‌ویش فه‌رمووی: (حه‌ز ده‌كه‌یت چه‌ند ووشه‌یه‌كت فێر بكه‌م بیڵێیته‌وه: سبحان الله به ژماره‌ی دروست كراوه‌كانی، سبحان الله به ژماره‌ی دروستكراوه‌كانی، سبحان الله به ژماره‌ی دروست كراوه‌كانی، سبحان الله تا خۆی رازی ده‌بێت، سبحان الله هه‌تا خۆی رازی ده‌بێت، سبحان الله هه‌تا خۆی رازی ده‌بێت، سبحان الله هێنده‌ی كێشی عه‌رشه‌كه‌ی، سبحان الله هێنده‌ی كێشی عه‌رشه‌كه‌ی، سبحان الله هێنده‌ی كێشی عه‌رشه‌كه‌ی، سبحان الله هێنده‌ی مه‌ره‌كه‌بی ووشه‌كانی، سبحان الله هێنده‌ی مه‌ره‌كه‌بی ووشه‌كانی سبحان الله هێنده‌ی مه‌ره‌كه‌بی ووشه‌كانی).

## ( ٤٠ ) ( هه‌ركه‌سێك نوێژێكی له‌بیر چوو یان خه‌به‌ری نه‌بووه‌وه )

**(٣٥٤) (م د ن هـ) عن أبي هريرة: قَالَ(ﷺ): ﴿ مَنْ نَسي الصَّلاةَ فَلْيُصَلِّها إذا ذَكَرَها فَإنَّ الله قَالَ: ﴿ أَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي ﴾ ﴾. و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٦٦) في صحيح الجامع**

واته: (هه‌ر كه‌سێك نوێژێكی له‌بیر چوو، با كه‌بیری كه‌وته‌وه بیكات).

## ( ٤١ ) ( دوعای نوێژه بارانه )

**(٣٥٥) (د ك) عن عائشة: ﴿ إنَكُمْ شَكَوْتُمْ جدْبَ ديارِكُمْ وَ اسْتيخارَ الْمطَرِ عَنْ إبَانِ زَمَانه عنْكُمْ وَ قدْ أَمَركُم اللهُ عَزَّوَجلَّ وَ وَعدَكُمْ أنْ يَسْتَجيب لكُمْ، ثُـمَّ قَال: ﴿ الْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمينَ الرَّحْمنِ الرَّحيم مَالك يَوْم الدِّين، لا إلهَ إلَّا اللهُ يَفْعَلُ ما يُريدُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ اللهُ لا إلهَ إلَّا أَنْتَ الْغَنيُّ وَ نَحْنُ الْفُقَراءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنَا قُوَّةً وَ بَلاغاً ﴾. واللفظ لأبي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٣١٠) في صحيح الجامع**

(ئێوه سكالآی ووشكه سالّی ئاواییەكانتانو دواكەوتنی باران لەكاتی خۆی دەكەن، خوای گەورەش فەرمانی پێكردوون كه لێی بپاڕێنەوه وه بەڵێنیشی پێ داون كه وەڵامتان بداتەوه، پاشان فەرمووی: سوپاس بۆ زاتی (الله) پەروەردگاری جیهانەكان، بەخشندەی میهرەبان،پاشاو خاوەنداری رۆژی قیامەت، هیچ خوایەك نییه تەنها (الله) نەبێت، ئەوەی بیەوێت دەیكات، ئەی زاتی (الله) تۆ ئەو (الله) یەی كه هیچ خوایەكی تر نییه جگه له تۆی دەوڵەمەند نەبێتو ئێمەش فەقیرو هەژارین، بارانی بەلێزمەی خۆت بباریێنی بەسەرماندا وه ئەوەشی كه باراندوته بیكەره مایەی هێز بۆمانو گەیشتن به مەرامەكانمان).

# ( ٤٢ ) ( نوێژی خۆ گیران )

(٣٥٦) ( ن ) عن النعمان بن بشير عن النبي(ﷺ): ﴿ أَنَّهُ خَرَجَ يَوماً مُستَعجِلاً إلىَ الْمَسْجِد وَقَدْ إنْكَسَفَت الشَّمْسُ فَصَلىَ حَتَّى انْجَلَتْ ثُمَّ قَالَ: إنَّ أَهْلَ الجاهلية كَانوا يَقُولُونَ إنَّ الشَّمْسَ وَ الْقَمَرَ لايَنْخَسِفَانِ إلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ مِنْ عُظَمَاء أَهْلِ الأَرْضِ وَ إنَّ الشَّمْسَ وَ الْقَمَرَ لا يَنْخَسِفانِ لِمَوْتِ أحد وَ لالحَيَاتِه وَ لَكِنَّهُما خَلِيقَتَانِ مِنْ خَلْقَتِه يُحْدِثُ الله فِي خَلْقِه مَا شَاءَ فَأَيُّهُمَا انْخَسَفَ فَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِي أَوْ يُحْدِثَ اللهُ أَمْراً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٢٥) في صحيح الجامع

واته: (ڕۆژێكیان پێغەمبەر(ﷺ) بەپەله چووه دەرەوه بۆ مزگەوت، خۆر گیرا بوو، ئەویش دەستی كرد به نوێژكردن هەتا خۆرەكه بەربوو، پاشان فەرمووی:(ئەوه خەڵكانی سەردەمی نەفامی دەیانووت كه خۆرو مانگ ناگیرێت تەنها بۆ مردنی گەورەیەك له پیاوه گەورەكانی خەڵكی سەر زەوی نەبێت، جا بزانن كه رۆژو مانگ نه بۆ مردنی هیچ كەسێك دەگیرێنو نه بۆ ژیانیشی، بەڵكو ئەو دووانه دوو دروست كراون له دروست كراوەكانی خوا، خوایش چی لا مەبەست بێت دەیهێنێت بەسەر دروست كراوەكانیدا، جا هەركامێكیان گیران ئێوه دەست بكەن به نوێژكردن هەتا بەر دەبێت، یان خوای گەوره كارێكی تازەی بەسەر دێنێت).

(٣٥٧) (م عن جابر: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلىَ عَهْدِ رَسُولِ الله(ﷺ) فِي يَومٍ شَدِيدِ الْحَرِّ فَصَلَّى رَسُولُ الله(ﷺ) بِأَصْحَابِه، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، حَتَّى جَعَلُوا يَخِرُّونَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ نَحْوَ مِنْ ذَاك، فَكَانَتْ أَرْبَعَ رَكَعَات وَ أَرْبَعَ سَجَدات، ثُمَّ قَالَ: ﴿ إنَّهُ عَرَضَ عَلَيَّ كُلَّ شَيْءٍ تُولَجُونَهُ، فَعُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ، حَتَّى لَوْتَنَاوَلْتُ مِنْهَا قِطفاً أَخَذْتُهُ ) أوْ قَالَ: (- تَنَاوَلْتُ مِنْهَا قِطفاً- فَقَصُرَتْ يَدِي عَنْهُ، وَ عُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ، فَرَأَيْتُ فِيهَا امْرَأَةً مِنْ بَنِي إسْرائِيلَ تُعَذَّبُ فِي هِرَّةٍ لَهَا، رَبَطَتْهَا فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَ لَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ، وَ رَأَيْتُ فِيهَا أَبَاثُمَامَةَ عَمْرو بْنَ مَالِك يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، وَ إنَّهُمْ كَانوا يَقُولُونَ: إنَّ الشَّمْسَ وَ الْقَمَرَ

لايَخْسِفانِ إلَّا لِمَوتِ عَظِيمٍ، وَ إنَّهُما آيَتانِ مِنْ آياتِ اللهِ يُرِيكُمُوهُما ،فَإذا انْكَسَفا فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِي ﴾. واللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٣٨٨ ) في صحيح الجامع

دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا خۆرگیرا، پێغەمبەریش(ﷺ) نوێژی بە هاوەڵەکانی کرد، وەستانەکەی لەنوێژەکەدا درێژ کردەوە، هەتا وایان لێ هات دەکەوتن، پاشان ڕکوعی برد ئەویشی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوەئەویشی درێژ کردەوە، پاشان جارێکی تر چووەوە ڕکوعو درێژی کردەوەو پاشان سەری بەرز کردەوەو درێژی کردەوەو هەمان شێوەی دووبارە کردەوە، بەوەش نوێژەکە چوار ڕکعەتو چوار سوجدەی تێدابوو، پاشان فەرمووی: هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە پیای دەچن‌و تێیەڕ دەبن نیشانم درا، جا بەهەشتم پیشان درا تەنانەت ئەگەر دەستم بردایە گۆڵێکم لێربکردایەتەوە دەمبرد، بەڵام دەستم لێ گێڕایەوە، وەئاگریشم نیشان درا وە ئافرەتێکم تێدا بینی لە بەنی ئیسرائیل لەپشیلەیەکی ئەشکەنجە دەدرا، بەستبویەوەو خواردنی نەدابوویە، وە ڕێگەیشی نەدابوو کە لە جانەوەری زەوی بخوات، وەك (ابا ثمامة عمروی کوڕی مالك)م بینی ڕێخۆڵەی خۆی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا لە ئاگردا، وە ئەوانە دەیانووت خۆر و مانگ ناگیرێن تەنها بۆ مردنی پیاوێکی گەورە نەبێت، بەڵام خۆرو مانگ دوو بەڵگەو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا پیشانتان دەدات، ئەگەر گیران ئەوا نوێژ بکەن هەتا بەر دەبێ‌و ڕۆشن دەبێتەوە.

## ( ٤٣ ) ( نوێژی جەژن )

( ٣٥٨) ( ن )عن أنس بن مالك قال: كَانَ لأَهْلِ الْجاهلِيةِ يوْمانِ في كُلِّ سَنةٍ يلْعَبُون فِيهِما فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيّ(ﷺ) الْمَدِينَةَ قَالَ: ﴿ كَانَ لَكُمْ يَوْمَانِ تَلْعَبُونَ فِيهِمَا وَ قَدْ أَبْدَلَكُمُ اللهُ بِهِمَا خَيْراً مِنْهُمَا: يَوْمُ الْفِطْرِ وَ يَوْمُ الأَضْحَى ﴾. واللفظ للنسائي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٤٥٩ ) في صحيح الجامع

(انس کوڕی مالك) دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامی دوو ڕۆژیان هەبوو لە هەموو ساڵێکدا یارییان تێدا دەکرد، جا کاتێك پێغەمبەر ﷺ هات بۆ شاری مەدینە فەرمووی: ( ئێوە دووڕۆژتان هەبوو یاری و گەمەتان تێدا دەکردو ئەوا خوای گەورە بۆی گۆڕین بە باشتر لەو دوو ڕۆژە، ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان‌و ڕۆژی جەژنی قوربان).

( ٣٥٩ ) ( هق ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ يَوْمانِ يَلْعَبُونَ فِيهِما فِي الْجَاهِلِيَةِ وَ إنَّ اللهَ تَعالىَ قَدْ أَبْدَلَكُمْ بِهِمَا خَيْراً مِنْهُمَا يَوْمُ الْفِطْرِ وَ يَوْمُ النَّحْرِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٨٠ ) في صحيح الجامع

(هاتم بۆ مەدینەو خەڵکی مەدینە دوو ڕۆژیان هەبوو یاری‌و گەمەیان تێدا دەکرد لە سەردەمی نەفامیدا، وە ئەوە خوای گەورە بۆی گۆڕین بە باشتر لەو دوو ڕۆژە، ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان‌و ڕۆژی جەژنی قوربان).

## ( ٤٤ ) ( رۆژانی التشريق: رۆژانی دووەم و سێهەم و چوارەمی جەژنی قوربان )

( ٣٦٠ ) ( د ) عن نبيشة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إنَّا كُنَّا نَهَيْنَاكُمْ عَنْ لُحُومِهَا أَنْ تَأْكُلُوهَا فَوْقَ ثَلَاثٍ لِكَيْ تَسَعَكُمْ فَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالسَّعَةِ فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَاتَّجِرُوا أَلَا وَإِنَّ هَذِهِ الأَيَّامَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ﴾. واللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٨٤ ) في صحيح الجامع

(ئێمە پێشتر لێمان قەدەغە کرد بوون کە نابێت لەسەرو ئەو سێ ڕۆژەوە گۆشتی قوربانی بخۆن، بۆ ئەوەی بەشتان بکات، جا ئەوا خوا ڕزقی فراوانی بۆ هێناوین، ئیتر بخۆن و هەڵیشگرن و بازرگانیش بکەن، جا ئیتر ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو زیکری خوای گەورەن).

(٣٦١) ( حم م ن هـ ) عن نيشةقال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنِّي كُنْتُ نُهِيتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِي فَوْقَ ثَلَاثٍ كَيْمَا تَسَعَكُم فَقَدْ جَاءَ اللهُ بِالْخَيْرِ فَكُلُوا وَ تَصَدَّقُوا وَادَّخِرُوا إنَّ هَذِهِ الأَيَامَ أَيَامُ أَكْلٍ وَ شُرْبٍ وَ ذِكْرِ اللهِ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٧٣ ) في صحيح الجامع

(من پێشتر نەهیم لێکردبوون کە گۆشتی قوربانی لەسەروو سێ ڕۆژەوە نابێت بخورێت، بۆ ئەوەی لەو ماوەدا بەرهەمووتان بکەوێت و بەشتان بکات، جا ئێستا خوای گەورە خێرو بەرەکەتی زۆری ڕشتووە بەسەرماندا، ئێوەش بخۆن و لێ ی بکەن بەخێرو لێشی هەڵگرن، ئیتر ئەم ڕۆژانە: ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو زیکری خوان).

## ( ٤٥ ) ( نوێژی وەتر )

(٣٦٢) ( ابن نصر ) عن ابي هريرة وعن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالَى وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٢٩ ) في صحيح الجامع

(خوای گەورە تاکەو تاکی پێخۆشە).

(٣٦٣) ( ع ) عن ابن مسعودقال رسول الله(ﷺ): ﴿إنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ ، فَإِذَا اسْتَجْمَرْتَ فَأَوْتِرْ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٣٠ ) في صحيح الجامع

(خوای گەورە تاکەو تاکی پێ خۆشە، جا ئەگەر بە بەرد خۆت پاك کردەوە بە ژمارەی تاك بیکە).

**تێبینی/** واتە لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندندا ئەگەر بە بەرد خۆتت پاك کردەوە ، با ژمارەی بەردەکان تاك بێت .

(٣٦٤) ( ت ) عن علي ( هـ ) عن إبن مسعودقال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعَالَى وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ فَأَوْتِروا يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٣١ ) في صحيح الجامع

(خوای‌گەورە تاکەو تاکی خۆش دەوێت ، ئێوەش ئەی ئەهلی قورئان نوێژی وەتر بکەن کە تاکە).

**(٣٦٥) (د ن هـ ك) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا أَهْلَ الْقُرْآن أَوْتِروا فَإِنَّ الله وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ ﴾. واللفظ لأبي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٥٥) في صحيح الجامع**

(ئەی ئەهلی قورئان نوێژی وەتر بکەن چونکە خوای گەورە تاکەو تاکی پێ خۆشە).

**(٣٦٦) ( حم ) عن ابن عمروقال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ زادكُمْ صَلاةً فَحافِظُوا عَلَيْهَا وَهِيَ الْوِتْرَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٧٢) في صحيح الجامع**

(خوای گەورە نوێژێکی بۆ زیاد کردوون ئێوەش بیپارێزن ومەیفەوتێنن،ئەویش نوێژی وەترە).

# ( بەشی :نوێژە سوننەتەکان )

## ( ١ ) ( فەزڵی شەونوێژ )

(٣٦٧) ( حم م ) عن جابربن عبدالله رضي الله عنهما قال: سمعت النبي(ﷺ) يقول: ﴿ إنَّ في اللَّيْلِ لَساعَةً لايُوافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ الله تَعالى فِيهَا خَيْراً مِنْ الدُّنْيا وَالآخِرَةِ إلَّا أعْطاهُ إيَّاهُ وَ ذلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ ﴾. واللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢١٣٠ ) في صحيح الجامع

جابری کوڕی عبدالله ڕەزای خوا لە هەردووکیان بێت دەڵێ کە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: (لە شەودا ساتەوەختێك هەیە هەر پیاوێکی موسڵمان بۆی ڕێکەوت داوای هەر خێرو چاکەیەکی دونیاو قیامەت لە خوای گەورە بکات، ئە ، خوا پێی دەبەخشێت، ئەوەش هەموو شەوێکە).

(٣٦٨) ( عبد بن حميد الضياء ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ جَعَلَ اللهُ عَلَيْكُمْ صَلاةَ قَوْمٍ أبْرارٍ يَقُومُونَ اللَّيْلَ وَ يَصُومُونَ النَّهارَ لَيْسُوا بِأثَمَةٍ وَلافُجَّارٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٩٦ ) في صحيح الجامع

(خوای گەورە نوێژێکی لەسەر د. ون کە هی ک سانێکی پاك و لە خواترسن، لەشەودا بۆ نوێژ کردن هەڵدەستن و بەڕۆژیش بەڕۆژو دەبن ـەگوناهکارن و د. تاوانکارن).

(٣٦٩) ( حم د ن حب ك ) عن أبي هريرة قا.: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأيْقَظَ امْرَأتَهُ فَصَلَّتْ فَإنْ أبَتْ نَضَحَ في وَجْهِهَا الْماءَ، رَحِمَ الله امْرَأةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ و أيْقَظَتْ زَوْجَهَا فَصَلَّى فَإنْ أبَى نَضَحَتْ في وَجْهِهِ الْماءَ ﴾. واللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٤٩٣ ) في صحيح الجامع

(ڕەحمەتی خوا لە پیاوێ بێت لە شەودا هەستاوەو نوێژی کردووەو خێزانەکەیشی خەبەر کردۆتەوەو ئەویش نوێژی کر ووە،ئەگەر هەر هەڵنەستا ئاو بپرژێنێت بەدەم و چاویدا، ڕەحمەتی خواش لە ئافرەتێك بێت لە شەودا هەڵسێت نوێژ بکات و مێردەکەشی بەئاگا بهێنێت، وئەگەر هەڵنەستا ئەوا ئاو بەدەم و چاویدا بپرژێنێت).

## ( ٢ ) ( بەردەوام بوون لەسەر کردنی سوننەتەکان )

(٣٧٠) ( حم د ن ) عن عائشة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ أكْلِفُوا مِنَ الْعَمَلِ ماتُطيقُونَ، فَإنَّ الله لايَمَلَّ حَتَّى تَمَلُّوا، فإنَّ أحَبَّ الْعَمَلِ إلى الله تَعالى أدْوَمَهُ وَ إنْ قَلَّ ﴾، وَكانَ إذا عَمِلَ عَمَلاً أثْبَتَهُ. واللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٢٢٨ ) في صحيح الجامع

(هێنده کار بخەنە سەرشانی خۆتان کە لە تواناتاندا بێت، چونکە خوا بێزار نابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن، چونکە خۆشەویسترین کارەکان لەلای خوای گەورە بەردەوامترینیانە هەرچەندە کەمیش بێت) جا عادەتی پێغەمبەر(ﷺ) وا بوو کە ئەگەر کارێکی بکردایە ئیتر دەیچەسپاندو بەردەوام دەبوو لەسەری.

**(٣٧١) ( خ ن هـ ) عن عائشة قالت: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ الله(ﷺ) وَعِنْدِي امْرَأَةٌ، فَقَالَ: ﴿ من هذه؟ ﴾، فقُلْتُ: امْرَأَةٌ لاتَنامُ تُصَلِّي. قَالَ(ﷺ): ﴿ عَلَيْكُمْ مِنَ الْعَمَلِ مَاتُطِيقُونَ، فَوالله لايَمَلُّ اللهُ حَتَّى تَمَلُّوا﴾، وكان أحبَّ الدين إليه مَاداوم عَلَيْهِ صاحبُهُ . واللفظ لمسلم. من حديث عائشة رضي الله عنها. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦١٩ ) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆلاەو منیش ئافرەتێکی ترم لەلابوو، فەرمووی: (ئەمە کێیە؟) منیش ووتم: ئافرەتێکە ناخەوێت هەر نوێژ دەکات فەرمووی: ( هێندە کار بکەن کە لە تواناتاندایە، چونکە سوێند بێت بەخوا، خوا بێزار نابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن).وە ئەو باشترین دینداری کردن لەلای ئەوە بوو کە خاوەنەکەی بەردەوام بێت لە سەری .

**(٣٧٢) ( ق ) عن عائشة أنها قالت: كَانَ لِرَسُولِ الله(ﷺ) حَصِيرٌ، وَكَانَ يُحَجِّرُهُ مِنَ اللَّيْلِ فَيُصَلِّي فِيهِ، فَجَعَلَ النَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاتِهِ، وَيَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ، فَثَابُوا ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَالَ: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ مِنَ الأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللهَ لايَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا وَ إِنَّ أَحَبَّ الأَعْمَالِ إِلَى الله مَادُووِمَ عَلَيْهِ وَإِنْ قَلَّ ﴾. واللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٧٨ ) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) حەسیرێکی هەبوو، جا بەشەو قەدی دەکردو نوێژی لەسەر دەکرد، خەڵکەکەش وایان لێ هاتبوو بە نوێژەکەی ئەو نوێژیان دەکرد، وە بەرۆژیش حەسیرەکەی رادەخست، ئیتر شەوێکیان کە خەڵکەکە بە ئاگا هاتن پێی فەرموون: (ئەی خەڵکینە هێندە لە کارەکان بکەن کە لە تواناتاندایە، چونکە خوا بێزار نابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن، وەخۆشەویسترینی کارەکانیش لەلای خوا ئەوەیە کە لەسەری بەردەوام بیت ئەگەر کەمیش بێت).

**(٣٧٣) ( م ) عن أم حبيبة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ تَوَضَأَ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ ثُمَّ صَلَّى لله فِي كُلِّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوعاً غَيْرَ فَرِيضَةٍ إِلَّا بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٣٤ ) في صحيح الجامع**

(هەر بەندەیەکی موسڵمان دەست نوێژ بشوات دەست نوێژێکی تەواو پاشان لە هەموو رۆژێکدا دوانزە رکعەت نوێژی سوننەتی جگە لە فەرزەکان بکات، ئەوا خوای گەورەماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات).

**(٣٧٤) ( ت ن هـ ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ: أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا وَ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ وَ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ وَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ ﴾. واللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٩٠٩ ) في صحيح الجامع**

(هەرکەسێك بەردەوام بیت لەسەر دوانزە رکعەت نوێژی سوننەت ئەوا خوا ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات : چوار رکعەت پێش نیوەڕۆ وە دوو رکعەت لە پاشیەوە، وە دووە رکعەت پاش نوێژی ئێوارە، وە دوو رکعەتیش پاش نوێژی عیشا، وە دوو رکعەتیش پێش نوێژی بەیانی).

**(٣٧٥) ( ق ) عن عائشةقالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلىَ اللهِ أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ ﴾ واللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦٣ ) في صحيح الجامع**

(خۆشەویسترینی کارەکان لەلای خوای گەورە بەردەوامترینیانە ئەگەر کەمیشس بێت).

**(٣٧٦) ( طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خُذُوا مِنَ الْعِبادَةِ مَاتُطِيقُونَ فَإِنَّ اللهَ لا يَسأَم حَتّى تَسأَمُوا ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢١١ ) في صحيح الجامع**

(هێندە لە عیبادەت وەرگرن کە لە تواناتاندایە چونکە خوا بێزار نابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن).

**(٣٧٧) ( ق ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ فَإِنَّ اللهَ لايَمل حَتّى تَمَلُّوا ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢١٧ ) في صحيح الجامع**

(هێندە لەکار وەرگرن کە لە تواناتاندایە چونکە خوا بێزار نابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان :

ئەم کۆمەڵە فەرمووده پیرۆزانە ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە کە خوای گەورە وای پێ خۆشە ئەگەر بەندەی موسڵمان بەندایەتی بۆ خوا ئەنجام دا ئەوا بەردەوام بێت لەسەری و لێی دانەبڕێت هەرچەندە ئەوعیبادەتە یان ئەو کارە خێرە کەمیش بێت ، واتە کەمی بەردەوام لای خوا خۆشەویست ترە لە زۆری پچڕاو، هەروەها فەرمودە پیرۆزەکان ئەوەشمان بۆ روون دەکەنەوە کە باش نییە موسڵمان ئەرکێکی وا بخاتە سەرشانی خۆی کە لە توانایدا نەبێت، چونکە زۆر جار ئەوە کاردانەوەیەکی خراپی دەبێت لەسەر موسڵمان، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە تازە تۆبەیان کردەووەو بەرەو ئیسلام گەڕاونەتەوە، شەیتان کە شکست دەخوات لەوەدا کە رێی تۆبەیان لێ بگرێت، ئەمجارە هەوڵ دەدات بەجۆرێکی تر فریویان بدات، ئەویش بەوەی هانیان دەدات عیبادەتی زۆر لەنوێژو رۆژو و سوننەتەکان بکەن، پێیان دەڵێ کە نوێژی زۆر یان رۆژوی زۆرتان فەوتاوەو دەبێت بە پەلە پری بکەنەوە بە جۆرێك ئەو کەسە هێشتا رانەهاتووە لەسەر ئەنجام دانی فەرزەکان بەڵام شەیتان هەرهانی دەدات بۆ کردنی سوننەتی زۆریش، وە بەم شێوەیەش کابرا هەر تاماوەیەکی دیاری کراو بر دەکاتو پاش ئەوە دەڕوخێتو، لە زۆربەی کاتدا نەك هەر سوننەتەکان بەڵکو فەرزەکانیش تەرك دەکاتو دەڵێ بەخوا ئەمە لەتوانای مندا نییەو بە من ناکرێت. بەمەش شەیتان گوڵی خۆی دەکات و ئاواتەکەی دێتە دی چونکە کەسێك کە تەواو رانەهاتبێت نوێژە فەرزەکان لەکاتی خۆیداو بە جەماعەت بکات زەحمەتە بتوانێت شەو نوێژ بکات یان کەسێك رۆژوی رەمەزانی بە زەحمەت بۆ بگیرێت نابێت یەکسەر هەڵپەی رۆژوی شەشەڵانو دووشەممان و پێنج شەممانی هەموو هەفتەیەك بدات. چونکە دوایی کە هیلاکی کرد لێیان وەڕز دەبێتو بەیەك جار هەموویان تەرك دەکات. بەڵام رێگەی راستو دروست لەم بوارەدا ئەوەیە کە موسڵمان هەنگاو هەنگاوو

قۆناغ بە قۆناغ هەوڵ بدات کاری خێری زیاترو سوننەتی زیاتر ئەنجام بدات هەتا لەسەری رابێتو بەردەوام بێت لەسەری، بۆ ئەوەی لێیان بێزار نەبێتو وورد وورد زیاتریان بکات، نەك لێ بچێتەوەو تەرکیان بکات.

## ( ٣ ) ( نوێژی سوننەت باشتر وایە لە ماڵەوە بکرێت )

(٣٧٨) ( حم م هـ ) عن جابر ( الدارقطني في الأفراد ) عن أنس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إذا قضى أحَدُكُمْ الصَّلاةَ في مسْجِده، فَلْيَـجْعَلْ لبَيْته نَصيباً منْ صَلاته فَإنَّ اللهَ تَعَالى جَاعلٌ في بَيْته منْ صلاته خَيْراً ﴾. واللفظ لمسلم. من حديث جابر. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٣١) في صحيح الجامع

(ئەگەر یەکێکتان نوێژەکەی لە مزگەوتدا کرد، با هەندێکیش لە نوێژەکەی بۆ ماڵەوە دابنێت، چونکە خوای گەورە بەو نوێژەی خێر دەخاتە ماڵەکەیەوە).

(٣٧٩) ( حم ع ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إذا قَضَى أَحَدُكُمْ صَلاتَهُ في الْمَسْجِد ثُمَّ رَجَعَ إلىَ بَيْته فَلْيُصلِّ في بَيْته رَكْعَتَيْنِ وَ لْيَجْعَلْ لبَيْته نَصيباً منْ صلاته فَإنَّ الله جَاعلٌ في بَيْته منْ صَلاته خَيْراً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٣٣) في صحيح الجامع

(ئەگەر یەکێکتان نوێژەکەی لە مزگەوتدا کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، با لە ماڵەکەشیدا دوو رکعەت نوێژ بکات، وە بابەشێك لە نوێژەکەیشی بۆ ماڵەوە دابنێت، چونکە خوای گەورە بەو نوێژەی خێر دەخاتە ماڵەکەیەوە).

## ( ٤ ) ( چوار رکعەت نوێژی سوننەت لە پێش عەسردا )

(٣٨٠) ( د ت حب ) عن ابن عمر عن النبي (ﷺ) قال: ﴿ رحمَ الله إمْرأً صَلَّىَ قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعاً ﴾. واللفظ للترمذي. (حسن) أنظر حيث رقم (٣٤٩٢) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (رەحمەتی خوا لە کەسێك بێت کە لە پێش عەسردا چوار رکعەت بکات).

### ڕونکردنەوەی فەرموودەکە:

لەمانای ئەم فەرموودەیەدا ابن قدامە دەڵێ: ئەمە هاندانە بۆ کردنی ئەو چوار رکعەتە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیخستۆتە ریزی سوننەتە راتبەکان، بە بەڵگەی ئەوەی کە إبن عمر خۆی کە گێڕەرەوەی فەرمودەکەیە بەردەوام ئەو چوار رکعەتە سوننەتەی پێش نوێژی عەسری نەکردووە.

ئیمامی غەزالیش دەڵێ بە دڵنیایی کردنی ئەو نوێژانە کارێکی خوازراوو شیرینە بەئومێدی ئەوەی بەر دوعاکەی پێغەمبەر(ﷺ) بکەوین، کە گومان لەوەدا نییە دوعای ئەو گیرایە.

## ( ٥ ) ( سوننەتەکان دەبنە مایەی زیاتر نزیك بوونەوە لە خوا )

(٣٨١) ( خ ) عن انس أبي هريرة ( هب ) عن سلمان، عن أبي هريرةرضي الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ الله عزَّوَجَلَّ: أنا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأنَا مَعَهُ إذا ذكَرَنِي، فَإنْ ذَكَرَنِي في نَفْسِه ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ وَ إِن اقْتَرَبَ إِلَيَّ شِبْراً اقْتَرَبْتُ إِلَيْه ذِراعاً، وَ إنْ اقْتَرَبَ إِلَيَّ ذِراعاً اقْتَرَبْتُ إِلَيْه بَاعاً، وَإنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً ﴾. واللفظ للترمذي من حديث أبي هريرة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٠٣ ) في صحيح الجامع

(خوای گەورە دەفەرموێت: من لە ئاست گومانی بەندەکەمدام پێم، وە من لە گەڵیدام کاتێك کە زیکرم دەکات و ناوم دەبات، جا ئەگەر لە نەفسی خۆیدا یادی کردم و ناوی هێنام ئەوا منیش لە نەفسی خۆمدا زیکری دەکەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵە خەڵکێکدا ناوی هێنام و زیکری کردم، ئەوا منیش لە ناو کۆمەڵەیەکی باشتردا زیکری دەکەم و ناوی دەهێنم، وە ئەگەر بستێك لێم نزیك بوەوە، باوەشێك لێی نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بە رۆیشتن بەرەو من هات، من بە راکردن بەرەو ئەو دەڕۆم).

## ( ٦ ) ( ئەو کەسەی بەسەر ویردەکەیدا خەوی لێ دەکەوێت )

(٣٨٢) ( د ن ) عن عائشة: ﴿ مَامِنْ إمْرِءٍ يَكُونُ لَهُ صَلاةٌ بِاللَّيْلِ يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ إلَّا كَتَبَ اللهُ تَعَالَى لَهُ أجْرُ صَلاتِه وَ كَانَ نَوْمُهُ عَلَيْه صَدَقَةً ﴾. واللفظ لأبي داود. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٩٠ ) في صحيح الجامع

(هەر کەسێك نوێژی هەبێت کە لە شەودا بیکات و بەڵام خەو زۆری بۆ بێنێت و بنوێت ئەوا خێر و پاداشتی نوێژەکەی بۆ دەنوسرێت و نوستنەکەشی بەسەر نوێژەکەدا بۆی دەبێتە سەدەقەو چاکە ).

(٣٨٣) ( م ) عن عمر بن الخطاب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِه أوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاةِ الْفَجْرِ وَصَلاةِ الظُّهْرِ كَتَبَ اللهُ لَهُ كَأنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ ﴾. واللفظ للنسائي من حديث عمر بن الخطاب. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٦٠ ) في صحيح الجامع

(هەر کەسێك پێش خوێندنی ویردەکەی یان بەشێك لە ویردەکەی خەوی لێ بکەوێت، دواتر لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا بیخوێنێت وا بۆی دەنوسرێت هەر وەك ئەوەی کە لە شەوەوە خوێندبێتی)

**تێبینی :** مەبەست لە(ویرد) ئەو زیکر و دوعا و نوێژ و قورئان خوێندنانەیە کە کەسێك بڕیار دەدات بەردەوام لە شەودا یان لە ڕۆژدا بیان خوێنێت و پابەند بێت پێیانەوە.

## ( ٧ ) ( فەزڵی بەردەوام بوون لەسەر کردنی دوانزە رکعەت نوێژی سوننەت لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا )

**(٣٨٤) ( حم م د ن هـ ) عن أم حبيبة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَلَّىَ فِي يَوْمٍ وَ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوّعاً بُنِىَ اللهُ لَهُ بِهِنَّ بَيْتٌ فِي الْجَنَّـةِ ﴾ .واللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٥٩ ) في صحيح الجامع**

(هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا دوانزە رکعەت نوێژی سوننەت بکات، ئەواماڵێکیان لە بەهەشتدا بۆ ئەو کەسە پێ دروست دەکرێت).تێبینی: لە فەرمودەکاندا کە دەڵێ لە ڕۆژێکدا مەبەست پێی شەو و ڕۆژێکە هەروەك لە هەمان فەرموودەدا هاتووە کە لای ئیمام الترمذی هاتووە کە چوار رکعەت لە پێش نیوەڕۆدایە و دوانیش لە دوای نیوەڕۆدایە دوو رکعەتیش پاش نوێژی شێوانەو دوانیش پاش نوێژی عیشایە و دوو رکعەتیش پێش نوێژی بەیانیە.

## ( ٨ ) ( فەزڵی سوننەتەکانی نوێژی نیوەڕۆ )

**(٣٨٥) ( حم ت ن هـ ﴾ عن أم حبيبة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَلَّىَ قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعاً وَ بَعْدَهَا أَرْبَعاً حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ ﴾ . واللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٦٠ ) في صحيح الجامع**

(هەر کەسێك لەپێش نیوەڕۆدا چوار رکعەت و لە پاشیدا چوار رکعەت سوننەت بکات ئەوا خوای گەورە لەسەر ئاگر حەرامی دەکات).

**(٣٨٦) ( هـ ع حب ) عن جابر بن عبد الله، قال: مَرَّ رَسُولَ الله(ﷺ) على رجُلٍ يُصَلّي على صخرةٍ فأتى نَاحِيَةَ مَكّةَ فَمَكَثَ مَلِيّاً، ثُمَّ انْصرف فَوَجَدَ الرَّجُلَ يُصَلّي عَلَي حاله فَقَامَ فَجَمَعَ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ﴿ أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالْقَصْدِ – ثَلاثاً – فَإِنَّ اللهَ تَعَالَىَ لايَمَلُّ حَتَّىَ تَمَلُّوا ﴾ . واللفظ لإبن ماجة. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٤٤ ) في صحيح الجامع**

واتە: (پێغەمبەر(ﷺ) بە لای پیاوێکدا تێپەری کە لە سەر بەردێك نوێژی دەکرد، ئینجا هاتە ناوچەیەکی دەورو بەری (مەککە) و ماوەیەك مایەوە، پاشان گەڕایەوە، کە بینی پیاوەکە بە هەمان شێوە

هەر نوێژ دەکات، ئەویش هەستا و هەردوو دەستی کۆ کردەوە و پاشان فەرمووی ئەی خەڵکینە میان ڕەوبن – سێ جار– چونکە خوای گورە بێزار نابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن ).

**(٣٨٧) ( طب ) عن عمران بن حصين قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَلَيْكُمَ من الأعْمَالِ بِما تُطيْقُونَ فَإِنَّ اللهَ لايَمَلُ حَتَّى تَمَلُّوا ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٠٧٧ ) في صحيح الجامع**

واتە :(واتە لە کارەکان هێندە بکەن کە لە تواناتانایە چونکە خوای گەورە بێزارنابێت هەتا ئێوە بێزار دەبن).

# ( بەشی: سەفەر کردن )

## (١) ( ئادابەکانی سەفەر )

(٣٨٨) ( م ) عن جابر: سرنا مَعَ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) في غزوَة بطن بواط، وهو يطلُبُ المَجدِيَّ بنَ عمرو الجهني وكانَ الناضِحُ يعقُبُهُ منا الخمسةُ والستةُ والسبعةُ، فدارتْ عُقبَةُ رجل من الأنصار على ناضح لهُ فأناخهُ فركبهُ ثُمَّ بعثَهُ فتلدَّنَ عليه بعضَ التلدُّنِ فقالَ لهُ: شأْ لعنكَ اللهُ، فقال رسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ مَنْ هَذااللاعِنُ بعيرَهُ ؟﴾، قال: أنا يا رسُولَ اللهِ، قال: ﴿انزِلْ عنهُ فلا تَصحَبْنا بملعُونٍ، لاتَدعُوا على أنفُسكُمْ ولاتَدعُوا على أولادكُمْ، ولا تَدعُوا على أموالكُمْ، لاتُوافقُوا منَ اللهِ ساعةً يُسأَلُ فيها عطاءً فيَستَجيبُ لَكُمْ﴾. واللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٥٠٠) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: لە غەزای(بطن بُواط) لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بەڕێ کەوتین وە هەر وڵاخێك کە پێمان بوو بە نۆرە پێنج و شەش و حەوت سواری دەبووین. ئینجا پیاوێك لە ئەنصارەکان نۆرەی هاتە سەر کە سواری حوشترەکەی بێت. ئەویش حوشترەکەی هێنایە سەر چۆك و سواری بوو. پاشان هەڵیساند و حوشترەکە کەمێك خۆی گیر کرد و لێی عاسی بوو. کابراش پێی وت هەستە لەعنەتی خوات لێبێت. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە کێیە لەعنەت لە حوشترەکەی دەکات؟) ووتی: منم ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: (دابەزە لە سەری و هاوڕێیەتیمان مەکە بە شتێك کە نەفرەتی لێ کرابێت، دوعا لە خۆتان مەکەن وە دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن وە دوعا لە ماڵ و سامانتان مەکەن. نەبادا لای خوا ڕێکەوتی ساتە وەختێك بکات کە داوای بەخششی تێدا لێ بکرێت و، ئەویش لێتان قبوڵ بکات)

(٣٨٩) ( طب ) عن معدان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ رفيقٌ يُحبُّ الرِّفقَ، ويرضاهُ، ويُعينُ عليهِ ما لا يُعينُ على العُنفِ، فإذا ركبْتُمْ هذه الدَّوابَّ العُجْمَ، فأنزِلُوها منازِلَها، فإنْ أجدبَتِ الأرضُ، فانجُوا عليها، فإنَّ الأرضَ تُطوَى باللَّيلِ ما لا تُطوَى بالنَّهارِ، وإيَّاكُمْ والتَّعريسَ بالطَّريقِ، فإنَّهُ طريقُ الدَّوابِّ ومأوَى الحيَّاتِ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٧٠) في صحيح الجامع

واتە: (خوای گەورە نەرم و نیانە و حەزی لە نەرم و نیانییە. پێی رازییە و، ئەو دەست گیرۆییەی لە سەر ئەو دەیدات، لەسەر توندو تیژی نایدات، لە بەر ئەوە ئەگەر سواری ئەو ووڵاخە بێ زمانانە بوون بە پێی ناست و توانای خۆیان ئەرکیان بخەنە سەر. وە کە کەوتنە وشکە زەوی و بێ تەڕو توشی، ئەوا پێیان بێ هەڵگرن و خێراکەن چونکە زەوی بە شەو زیاتر دەچێتە یەك و دەبردرێت وەك ئەوەی لە ڕۆژدا دەبڕدرێت. وە نەکەن لە شەوی درەنگدا لادەن و دابەزن بۆ حەوانەوە و خەوتن لە ڕێگەدا چونکە ئەوە ڕێگەی وڵاخ و ئاژەڵەو جێگەی مار و مێرووە).

## ( ٢ ) ( روخسەتی خوا بۆ موسافیر )

(٣٩٠) ( حم ٤ ) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالى وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلاةِ، وَ عَنِ الحَامِلِ وَ الْمُرْضِعِ الصَّوْمَ أَوْالصِّيامَ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (١٨٣٥) في صحيح الجامع

(خوای گەورە رۆژو گرتن و بەشێك لە نوێژی لەسەر موسافیر خستووە و لاداوە، وە لە سەر ئافرەتی دووگیان یان شیردەر رۆژوی خستووە و لاداوە).

(٣٩١) ( ن حب ) عن جابربن عبدالله: أنَّ رَسُولَ الله(ﷺ) مَرَّ بِرَجُلٍ فِي ظِلِّ شَجرةٍ يُرَشُّ عَلَيْهِ الْمَاءُ، قَالَ: ﴿ مَابَالُ صَاحِبِكُمْ هَذا؟ ﴾ قَالُوا يَارَسُولَ الله(ﷺ) صَائِمٌ، قَالَ: ﴿ إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ وَعَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ الله الَّتِي رَخَّصَ لَكُمْ فَـأَقْبَلُوهَا ﴾. واللفظ للنسائي. (حسن) أنظر حيث رقم (٥٣٩٢) في صحيح الجامع

(پێغەمبەر(ﷺ) بە لای پیاوێکدا تێ پەڕی کە لە سێبەری دارێکدا ئاویان پێدا دەپرژاند. فەرمووی: (ئەوە ئەو هاوڕێیەتان چی‌یەتی؟) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بەرۆژوە. فەرمووی: (ئەوە خێر و چاکە نییە کە ئێوە لە سەفەردا بەرۆژو بن، وە کار بەو روخسەتە بکەن کە خوا پێی داون و قبوڵی بکەن).

# ( بەشی : مردنی منداڵان )

## ( ١ ) ( پاداشتی ئەوانەی منداڵیان دەمرێت و لەبەر خوا ئارام دەگرن )

**(٣٩٢) ( حم خد م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ صِغَارُهُمْ دَعَامِيصُ الْجَنَّةَ يَتَلَقَّى أَحَدُهُمْ أَبَاهُ – أَوْقَالَ أَبَوَيْهِ – فَيَأْخُذُ بِثَوْبِهِ – أَوْقَالَ بِيدِهِ – كَمَا آخُذُ أَنَا بِصَنْفَهِ ثَوْبِكَ هَذَا، فَلا يَنْتَهِي حَتَّى يُدْخِلَهُ اللهُ وَ أَبَاهُ الْجَنَّةَ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٧٦٢ ) في صحيح الجامع**

(منداڵەکانیان سەرەمێکوتەکانی بەهەشتن، هەر یەکەیان کە دەگات بە باوکی- یان فەرمووی بە دایك و باوکی – جلەکەی دەگرێت. یان فەرمووی هەر وەك چۆن بە دەستم لێواری ئەم کراسەتم گرتووە، ئیتر دەست هەڵناگرێت – یان فەرمووی : ئیتر واز ناهێنێت، هەتا خوای گەورە خۆی و باوکی دەخاتە بەهەشتەوە).

**(٣٩٣) ( خ ن ) عن أنس( خ ) عن أبي هريرة وأبي سعيد: ﴿ مَامِنَ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٨١ ) في صحيح الجامع**

(ئا لە ناو ئەو خەڵکەدا هەر موسڵمانێك سیان لە منداڵی بمرێت کە باڵغ نەبوبن. ئەوا خوا دەیخاتە بەهەشتەوە بە فەزڵی رەحمەتی خۆی بۆ ئەو منداڵانە).

**(٣٩٤) ( حم خ ن ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ مُسْلِمٍ يَتوفى لَهُ ثَلاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ ﴾ . واللفظ للنسائي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٠٨ ) في صحيح الجامع**

واتە:(هەر موسڵمانێك سیان لە منداڵی بمرێت کە باڵغ نەبووبن ئەوا خوا دەیخاتە بەهەشتەوە، بە فەزڵی رەحمەتی خۆی بۆیان )

**(٣٩٥) ( هـ ) عن أنس: ﴿ مَامِنْ مُسْلِمَيْنِ يُتوفى لَهُمَا ثَلاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُمَا اللهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٧٣ ) في صحيح الجامع**

(هەر دایك و باوکێکی موسڵمان سیان لە منداڵانی بمرێت کە باڵغ نەبووبن، ئەوا خوا هەردووکیان دەخاتە بەهەشتەوە بە فەزڵی رەحمەتی خۆی بۆ منداڵەکان).

**(٣٩٦) ( حم ن ) عن أبي هريرة عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَمُوتُ بَيْنَهُمَا ثَلاثَةُ أَوْلادٍ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُمَا اللهُ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمُ الْجَنَّةَ قَالَ: يُقَالُ لَهُمْ: ادْخُلُوا الْجَنَّةَ،**

فَيَقُولُونَ: حَتَّى يَدْخُلَ آبَاؤُنَا، فَيُقَالُ: ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَ آبَاؤُكُمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٧٦) في صحيح الجامع

(هەر دایك و باوكێكی موسڵمان سێ منداڵ لە نێوانیاندا بمرێت كە نەگەیشتبنە تەمەنی باڵغ بوون، ئەوا خوا دەیانخاتە بەهەشتەوە بە فەزڵی ڕەحمەتی خۆی بۆ منداڵەكان)، فەرمووی: ( بە منداڵەكان دەوترێت بچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش دەڵێن: هەتا دایك و باوكەكەمان دەچنە ژوور ئینجا دەچین، ئیتر پێیان دەوترێت: دە بچنە بەهەشتەوە خۆتان و دایك و باوكەكانیشتان).

(٣٩٧) ( حم ن حب ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ مُسْلِمَيْنِ يَمُوتُ بَيْنَهُمَا ثَلاثَةُ أولادٍ لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ إِلَّا غَفَرَ اللهُ لهُما بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٨٠) في صحيح الجامع

(هەر دایك و باوكێكی موسڵمان لە نێوانیاندا سێ منداڵ بمرێت كە هێشتا باڵغ نەبووبن، ئەوا خوا لە هەردووكیان دەبوورێت. بە فەزڵی ڕەحمەتی خۆی بۆ منداڵەكان)

(٣٩٨) ( طب ) عن واثلة: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ دَفَنَ ثَلاثَةً مِنَ الْوَلَدِ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ النَّارَ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٦٢٣١) في صحيح الجامع

(ئەو كەسەی كە سێ منداڵی بنێژرێت،ئەوا خوای گەورە لەسەر ئاگر حەرامی دەكات).

## ڕوونكردنەوەی فەرموودەكان :

وشەی(دعامیص)كۆی(دعموص)ە بە مانای كرمێكی بچوك دێت كە ڕەنگێكی مەیلەو ڕەشی هەیە لە ئاوی وەستاو و زۆنگاوەكاندا هەیە و زۆر بە خێرایی دەجوڵێت عەرەب ئێستا پێی دەڵێن (بلعوط)وە لە كوردەواری خۆشماندا پێی دەڵێن (سەرەمێكوتە) هەروەها دەتوانرێت بەمانای ماسی وردی بچوكیش بهێنرێت كە هەمیشە بە خێرایی لە ئاودا دەجوڵێت و خۆی ڕاناگرێت، وە هەندێ جار ووشەی دعموص بۆ پیاوێك بەكار دەهێنرێت كە بەردەوام سەردانی پاشاكان دەكات و دەچێتە ژوورەوە و دێتە دەرەوە، لە لایان ئازادە لە هاتووچۆ كردنداو، پێویست بە ڕوخسەت ناكات.

مەبەست لە فەرموودەكەش بۆ منداڵانی موسڵمان كە لە پێش باڵغ بووندا مردون، ئەوەیە كە ئەو منداڵانە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیار و لێپێچینەوەیان لەسەر نییەو لەو ڕۆژەدا ئازادن و بەئارەزوی خۆیان دێن و دەڕۆن و دەسوڕێنەوە و، پاشانیش خوای گەورە بە فەزڵی ڕەحمەتی خۆی كارێكی وا دەكات كە ئەو منداڵانە دایك و باوكی خۆیان لە بیر بێت و بیان ناسنەوەو لە كاتێكدا كە پێیان دەووترێت ئادەی منداڵینە بچنە بەهەشتەوە، ئەوان پێ داگرن بڵێن هەتا دایك و باوكمان لەگەڵدا نەیەنە بەهەشت ئێمەش ناچین، خوای گەورەش بە ڕەحم و فەزڵی خۆی نازێكی وایان دەدات كە داواكارییەكەیان بۆ جێبەجێ دەكات و پێیان دەوترێت دەباشە پەلی دایك و باوكیشتان بگرن و بیانبەنە بەهەشتەوە، بەڕاستی ئەمەش هەر لە ڕەحمەتی بێپایانی خوا دەوەشێتەوە.

## ( ٢ ) ( حوكمی مندالأنی غەیرە موسڵمان )

(٣٩٩) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْمِلَّة فَأَبَواهُ يُهَوِّدانه وَيُنَصِّرانه و يُشرِّكانه، قِيْلَ: فَمَنْ هَلَكَ قَبْلَ ذلكَ؟ قَالَ: اللّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ بِهِ ﴾.
( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٥٦ ) في صحيح الجامع

(هەموو لە دایك بوویەك كە لە دایك دەبێت لەسەر فیترەت و باوەڕداریی لە دایك دەبێت، جا دایك و باوكی دەیكەنە جوولەكە و دەیكەنە گاور و دەیكەنە موشریك. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی كەسێك لە پێش ئەوەدا مردبێت؟ فەرمووی: خوا خۆی زاناترە ئەگەر ببونایە كار رەفتاریان چۆن دەبوو).

## ( ٣ ) ( ئەو ئافرەتانەی سەردانی گۆرستان دەكەن )

(٤٠٠) ( حم هـ ك ) عن حسان بن ثابت ( حم ت هـ ) عن أبي هريرة أنّ رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ لَعنَ اللّهُ زَوّارَاتُ الْقُبُورِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١٠٨ ) في صحيح الجامع

(نەفرەت لەو ئافرەتانەی زۆر سەردانی گۆڕستان دەكەن).

# ( بەشی : فەرموودەکانی زەکات )

## ( ١ ) ( زەکات فەرزی خوایە )

**( ٤٠١ ) ( ت ) عن ابن مسعود: يَبْلُغ بِه النَبيَ(ﷺ) قال: ﴿مَا مِنْ رَجُلٍ لاَ يُؤَدّي زَكَاةَ مَالِه إلاَّ جَعَل اللّهُ يَوْمَ الْقِيَامَة فِي عُنُقِه شُجَاعًا﴾ . ثُمّ قَرَأَ عَلَيْنَا مِصْدَاقَهُ مِن كِتَاب اللّه عزّ وجلّ ( لاَ تَحْسَبَنّ الّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِنْ فَضْلِه ) الآيَةَ. وَقَالَ مَرّةً قَرَأَ رَسُولُ اللّه (ﷺ) مِصْدَاقَهُ ( سَيُطَوّقُونَ مَا بَخِلُوا بِه يَوْمَ الْقِيَامَةِ ) ﴿وَمَن اقْتَطَعَ مَالَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ بِيَمِينٍ لَقِيَ اللّهَ وَهُوَ عَلَيْه غَضْبَانُ﴾ . ثُمّ قَرَأَ رَسُولُ اللّه (ﷺ)مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللّه ( إنّ الّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّه ) الآيَةَ. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٧١٨ ) في صحيح الجامع**

(ت)(ابن مسعود) دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر پیاوێك زەکاتی ماڵەکەی نەدات خوا لە رۆژی قیامەتدا مارێکی گەورە دەخاتە گەردنی)، پاشان سەلمێنەری ئەم راستییەی لە قورئانەکەی خوای گەورەدا بۆ خوێندینەوە: (وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ....)وە جارێکی تر فەرمووی: کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سەلماندنی ئەم راستیە ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندینەوە (سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ....)واتە :(ئەوەی کە رەزیلییان تێدا دەکرد، لە قیامەتدا لە گەردنیان دەئاڵێت)، ( وە هەرکەسێك بە سوێند خواردن ماڵی برا موسڵمانەکەی دابڕێت، ئەوا کاتێك کە بە خوا دەگاتەوە خوا لێی تورەیە)، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) سەلمێنەری ئەم راستییەی لە کتێبەکەی خوا بۆ خوێندینەوە(إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ .... ) }

**( ٤٠٢ ) ( ق ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله( ﷺ ) لمعاذ حين بعثه الى اليمن: ﴿ إنّكَ تَأْتِي قَوْماً أَهْلَ كِتَابٍ فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إلى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لا إله إلّا الله و أَنّ مُحَمّداً رَسُولُ الله فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنّ الله قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ في يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذلك فَأَخْبِرْهُمْ أَنّ اللهَ عزّوجلّ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدّ عَلَى فُقَرائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذلك فَاتّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٩٦ ) في صحيح الجامع**

(ق) (إبن عباس) دەڵێ: کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) (معاذ)ی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: (ئەوا تۆ بۆ لای میللەتێك دەچیت کە خاوەن کتێبی ئاسمانی بوون ، جا ئەگەر چویتە لایان ئەوا بانگەوازیان بکە بۆ شایەتمان هێنان کە هیچ خوایەك نییە جگە لە زاتی الله، وە کە محمدیش نێردراو و پێغەمبەری خوایە، جا ئەگەر لەمەدا گوێڕایەڵییان کردیت، ئەوا پێیان بڵێ کە خوای گەورە پێنج نوێژی لە شەو و رۆژێکدا لەسەر فەرز کردون، جا ئەگەر لەمەشدا گوێڕایەڵییان کردیت، ئەوا پێیان بڵێ کە خوای گەورە ماڵ

بەخشینێکی لەسەر فەرز کردون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێت بە هەژارەکانیان، جا نەگەر ئەمەشیان بە قسە کردیت ئەوا خۆت بپارێزە لە دوعا و نزای ستەم لێکراو).

(٤٠٣) ( حم م ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مانقصتْ صدَقَةٌ منْ مَالٍ، و ما زاد اللهُ رَجُلاً بِعفْوٍ إلاعزّاً وَمَا تَواضَعَ أحدٌ لله إلّا رَفَعهُ الله ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٨٠٦) في صحيح الجامع

(هم م ت) ابو هريرةدەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:( هیچ صەدەقە و بەخشینێك لە ماڵ کەم ناکاتەوە، وە هەر پیاوێك لێبوردەییەك بنوێنێت ئەوا خوا سەربەرزیی و عیزەتی بۆ پێ زیاد دەکات، وە هەر کەسێکیش ملکەچی بۆ خوا بنوێنێت ئەوا خوا بەرزی دەکاتەوە پێی).

## ( ٢ ) ( فەزلی سەدەقە و ماڵ بەخشین )

(٤٠٤) ( ت ) عنْ عديّ بْن حاتمٍ قَالَ أتيْتُ رَسُول الله (ﷺ) وَهُوَ جَالسٌ في المَسْجد فقَال القَوْمُ هذَا عديُّ بْنُ حَاتمٍ. وجئتُ بغيْر أمانٍ ولا كتَابٍ فَلَمَّا دَفعتُ إليْه أخذَ بيدي وَقَدْ كَان قَالَ قَبْلَ ذلك: ﴿إنّي لأرْجُو أنْ يجْعلَ اللّهُ يَدَهُ في يدي﴾ قَال فقَام بي فَلَقيَتْهُ امْرأةٌ وصَبيٌّ معهَا. فقَالا إنَّ لنَا إلَيْكَ حاجَةً فقَام معهُمَا حتَّى قَضى حاجتَهُمَا ثُمَّ أخذ بيَدي حتَّى أتَى بي دارَهُ فَألْقَتْ لَهُ الْوَليدَةُ وسادةً فجَلس عليْهَا وجَلسْتُ بيْنَ يدَيْه فحَمدَ الله وأثنَى عليْه ثُمَّ قَال: ﴿مَا يُفرُّكَ أنْ تَقُولَ لاَ إلَهَ إلاَّ اللّهُ فَهَلْ تَعْلَمُ منْ إله سوَى الله ﴾. قَال: قُلْتُ لا. قَال: ثُمَّ تَكَلَّم ساعةً ثُمَّ قَال: ﴿إنَّمَا تَفرُّ أنْ تَقُولَ اللّهُ أكْبَرُ وَتعْلَمُ أنَّ شيْئًا أكْبرُ منَ الله﴾ . قَال: قُلْتُ لا، قَال: ﴿فإنَّ اليَهُودَ مَغْضُوبٌ عليْهمْ وَإنَّ النَّصَارَى ضُلاَّلٌ ﴾. قَال: قُلْتُ فإنّي جئتُ مُسْلمًا. قَال: فرأيْتُ وجْهَهُ تَبسَّطَ فرَحًا قَال ثُمَّ أمَر بي فأُنْزلْتُ عنْد رجُلٍ من الأنْصار جعَلْتُ أغْشَاهُ آتيه طَرَفي النَّهَار، قَال: فَبيْنَا أنَا عنْدَهُ عشيَّةً إذْ جاءَه قَوْمٌ في ثيَابٍ من الصُّوف منْ هَذه النِّمَار قَال فصَلَّى وقَام فحَثَّ عَليْهمْ ثُمَّ قَال : ﴿وَلَوْ صَاعٌ وَلَوْ بنصْف صاعٍ وَلَوْ بقَبْضَةٍ وَلَوْ ببعْض قَبْضَةٍ يَقي أحَدَكُمْ وَجْهَهُ حَرَّ جهَنَّم أو النَّار وَلَوْ بتَمْرَةٍ وَلَوْ بشقّ تَمْرَةٍ فَإنَّ أحَدَكُمْ لاَقي اللّه وَقَائلٌ لَهُ مَا أقُولُ لَكُمْ ألَمْ أجْعلْ لَكَ سَمْعًا وَبصرًا؟ فَيقُولُ: بَلَى. فَيقُولُ ألَمْ أجْعلْ لَكَ مَالاً وَوَلَدًا؟ فَيقُولُ: بَلَى. فَيقُولُ أيْنَ مَا قَدَّمْتَ لنَفْسكَ؟ فَيَنْظُرُ قُدَّامَهُ وَبَعْدَهُ وَعَنْ يَمينه وَعَنْ شمَاله ثُمَّ لاَ يَجدُ شيْئًا يَقي به وَجْهَهُ حَرَّ جهَنَّم ، ليَقِ أحَدُكُمْ وَجْهَهُ النَّارَ وَلَوْ بشقّ تَمْرَةٍ فَإنْ لَمْ يَجدْ فَبكَلمَةٍ طَيّبَةٍ فَإنّي لاَ أخَافُ عَلَيْكُمُ الْفَاقَةَ فَإنَّ اللّهَ نَاصرُكُمْ وَمُعْطيكُمْ حَتَّى تَسيرَ الظَّعينَةُ فيمَا بَيْنَ يَثْربَ وَالْحيرَة أكْثَرُ مَا تَخَافُ عَلَى مَطيَّتهَا السَّرَقَ ﴾. قَال فجَعلْتُ أقُولُ في نَفْسي فأيْنَ لُصُوصُ طَيّئٍ. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٤٤) في صحيح الجامع

(ت) (عدي كوڕی حاتم) دەڵێ: هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا کە ئەو لە مزگەوتەکە دانیشتبوو، خەڵکەکەش ووتیان: ئەوە عدي كوڕی حاتمە، منیش بەبێ ئەمان وەرگرتن و بێ هیچ نامەیەك هاتبووم، جا کە بردمیانە بەردەمی دەستی گرتم، پێشتریش لە پێش ئەمەدا فەرموو بووی:

(من ئومێدم وایە کە خوا دەستی بخاتە دەستمەوە) ووتی: ئینجا هەڵی ستاندم و لە رێگە ژنێکی پێگەیشت کە کوڕیکی لەگەڵدا بوو، پێیان وت: ئێمە کارێکمان پێتە، ئەویش لەگەڵیاندا وەستا هەتا کارەکەی بۆ جێبەجێ کردن، پاشان دەستی گرتمەوە هەتا بردمی بۆ ماڵەکەی خۆی، خزمەت کارەکە راخەرێکی بۆ دانا ئەویش لەسەری دانیشت و منیش لەبەر دەستیدا دانیشتم، ئینجا سوپاسی خوای کرد و ستایشی لەسەردا، پاشان فەرمووی:(چ شتێك هەڵتدەنێت ئەگەر بڵێیت (لا اله الا الله) ئایا تۆ پێت وایە کە لە زاتی الله هیچ خوایەکی تر هەبێت؟)ووتم: نەخێر ،ووتی پاشان ماوەیەك قسەی بۆ کردم و ئینجا فەرمووی: ئەی لەوە هەڵدێیت کە بڵێیت (الله أکبر )، بۆ تۆ پێت وایە شتێك هەبێت لە الله گەورەتر بێت؟)ووتم: نەخێر فەرمووی: (دەی جولەکە غەزەبیان لێگیراوە و گاورەکانیش تەواو سەر لێشێواون ) دەڵێ: ووتم: دەی ئەوا من یەکتا پەرستی موسڵمانم. دەڵێ: ئینجا بینیم دەم و چاوی لە خۆشیدا گەشایەوە. دەڵێ: پاشان فەرمانی بۆ دام کە لە لای پیاوێك لە ئەنصارەکان دابنرێم، منیش ڕۆژانە بەیانی و ئێوارە دەچوومە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: جا ئێوارەیەکیان کە من لە خزمەتیدا بووم کۆمەڵێك هاتنە لای کەبەرگی خوری بەڵەك بەڵەکیان لەبەردا بوو، دەڵێ: ئەویش نوێژەکەی کرد و هەستا کەوتە هاندانیان بۆخێروچاکە ، پاشان فەرمووی: (ئەگەر بە لەگەنێك بێت یان نیو لەگەنیش بیت ،ئەگەر بە مشتێکیش بێت یان لە مشتێك کەمتریش بێت،با هەر یەکەتان رووی خۆی بپارێزێت لە گەرمای دۆزەخ و ئاگر، تەنانەت بە دەنکە خورمایەکیش بێت یان  بە لەتی دەنکە خورمایەك، چونکە هەر یەکەتان دەگاتەوە بە خوای گەورە، ئەویش ئەوەتان پێدەڵێ کە من پێتان دەڵێم: دەفەرمووێت: ئەریَ باشە بیستنم پیَ نەبەخشیبوویت ؟ ئەی بینینم نەدابوویتیَ؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، ئینجا پێی دەفەرمووێ: ئەی ماڵ و منداڵم نەدابوویتیَ ؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، ئینجا دەفەرمووێت: دەی کوا بزانم چیت بۆ خۆت پێش خستووە؟ ئەویش سەیری پێش و پاش و لای راست و لای چەپی دەکات، پاشان هیچ شتێکی دەست ناکەوێت کە دەم و چاوی خۆی لە گەرمای دۆزەخ پیَ بپارێزێت، دە با هەر یەکەتان رووی خۆی لە ئاگر بپارێزێت ئەگەر بە لەتی دەنکە خورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەوەیشی دەست نەکەوت با بە وشەیەکی باش خۆی لیَ بپارێزێت، بەراستی من ترسی هەژاری و نەبوونیتان لیَ ناکەم، چونکە خوداوەند خۆی سەرتان دەخات و ڕۆزیتان پیَ دەبەخشێت هەتا وای لیَ دێت ئافرەت لە کەژاوەدا لە نێوان(یثرب)و(حيرة)دا یان زیاتریش سەفەر دەکات و دەڕوات، ترسی نییە کە وولاخ و حوشترەکەی بدزرێت لە لایەن دز و چەتە و ریَ گرەوە) دەڵێ منیش لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەی دەبێت دز و چەتەکانی خێڵی (طيّ) ئەو کاتە لە کویَ بن؟.

**(٤٠٥) ( خ ) عن عدي بن حاتم قال: قال رسول الله(ﷺ): «أَمَا قَطعُ السَبيل فإنَهُ لا يأتي علَيْك إلاَ قليلٌ حتَى تخرُجَ العيرُ إلى مكَة بغيْر خفير ، وأَمَا العيْلةُ فإنَ السَاعةَ لا تَقُومُ حتَى يطُوف أَحدُكُمْ بصدقَته لا يَجدُ منْ يقْبلُها منهُ ، ثُمَ ليقفنَ أَحدُكمْ بيْنَ يدى الله ليْس بيْنَهُ وبيْنهُ حجابٌ ولا تُرجُمانٌ يتَرْجمُ لهُ ، ثُمَ ليقُولنَ لهُ أَلمْ أُوتك مالاً فليقُولنَ بَلى . ثُمَ ليَقُولنَ أَلمْ أُرسل إليك رسُولا فَلَيقُولنَ بَلى . فينْظُرُ عنْ يمينه فلا يرى إلاَ النَار ، ثُمَ ينْظُرُ عنْ شماله فلا يرى إلاَ النَار ، فليتَقينَ**

أحَدُكُمْ النَّارَ وَلَوْ بِشقِّ تَمْرَةٍ ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكلمةٍ طَيِّبَةٍ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (١٣٦٢) في صحيح الجامع

(خ)(عدي كوڕى حاتم) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە چەتەیەتی و ڕێگریی فەرمووی: (ئەوە هەر ماوەیەکی کەمی ماوە، دەبینیت وای لێدێت کاروان دەچێتە دەرەوە بۆ مەککە بە بێ پاسەوان، وە سەبارەت بە هەژاری و نەداریش، ئەوا قیامەت هەڵناسێت هەتا وای لێدێت کە یەکێکتان بە پارەیخێر و سەدەقەکەیەوە دەسوڕێتەوە کەسی دەست ناکەوێت لێی قبوڵ بکات و وەریبگرێت، لە پاشانیشدا هەر یەکێکتان لە بەردەم خوادا دەوەستێت، هیچ پەردەیەك نییە لە نێوان ئەو و خوادا، وە هیچ تەرجومانێکیش نییە کە بۆی تەرجومە بکات، پاشان پێی ئەڵێت: ئەرێ ماڵ و سامانم نەدابوویتی؟ ئەویش دەڵێ بەڵێ. پاشان دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەر و نێردراوم بۆ نەناردیت؟ ئەویش دەڵێ بەڵێ، ئینجا سەیری لای ڕاستی خۆی دەکات، جگە لە ئاگر هیچی تر نابینێت، پاشان سەیری لای چەپی خۆی دەکات، لە ئاگر زیاتر هیچی تر نابینێت، جا با هەر یەکەتان خۆی لەو ئاگرە بپارێزێت ئەگەر بە لەتی دەنکە خورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەوەشی دەست نەکەوت با تەنانەت بە قسەیەکی باشیش بێت ).

(٤٠٦) ( م ن ) عَنْ أَسْماءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّها جَائَتِ النَّبِي(ﷺ) فَقالَتْ: يَانَبِيَّ اللهِ لَيْسَ لِي شَيْءٌ إِلَّا مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ زُبَيْرُ، فَهَلْ عَلَيَّ جُناحٌ أَنْ أَرْضَخَ مِمَا يُدْخِلُ عَلَيَّ؟ فَقَالَ: ﴿ ارضَخِي مَا اسْتَطَعْتَ وَلا تُوعِيَ فَيُوعِيَ اللهُ عَلَيْكَ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٩٠٠) في صحيح الجامع

اسماء کچی ابوبکر دەگێڕێتەوە کە هاتۆتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هیچم نییە تەنها ئەوە نەبێت کە (زوبەیر) –واتە مێردەکەی– بۆمی دەهێنێتەوە، جا ئایا گوناهم لەسەر نابێت ئەگەر کەمێك لەوەی کە زوبەیر بۆمی دەهێنێتەوە ببەخشم؟ ئەویش فەرمووی: (لێی ببەخشە هێندەی کە لە توانانتدایە، وە ڕەزیل و کەم بەخش مەبە، با خواش بەخششی خۆی کەم نەکاتەوە بە سەرتدا).

(٤٠٧) ( حم ق ) عن أسماء بنت أبي بكرقالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنْفِقِي ولاتُحْصِي فَيُحْصِي اللهُ عَلَيْكِ، وَلاتُوعِي فَيُوعِيَ اللهُ عَلَيْكِ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (١٥١٣) في صحيح الجامع

(حم ق) اسماء کچی ابوبکردەڵێ کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(ببەخشە و خەرجی بکە و مەیژمێرە با خوا لەسەرتی ئەژمار نەکات، وە ڕەزیلی و پیسکەیی تێدامەکە با خواش بەخششی خۆی کەم نەکاتەوە بە سەرتدا).

(٤٠٨) ( خ ) عن أسماء بنت أبي بكر قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَلا تُوعِي فَيُوعِيَ اللهُ عَلَيْكِ ارْضَخِي مَااسْتَطَعْتَ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٤٦٥) في صحيح الجامع

اسماء کچی ابوبکر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ڕەزیلی و پیسکەیی مەکە، با خوا بەخششی خۆی کەم نەکاتەوە بە سەرتا، هێندەی لە توانانتدایە ببەخشە).

(٤٠٩)( حم ق هـ ) عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاحسد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله مالاً فسلطه على هلكته في الحق، و رجل آتاه الله الحكمة فهو يقضي بها و يعلمها ﴾

( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٤٨٧ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (حەسودی دروست نییە تەنها لە دوو شتدا نەبێت، پیاوێك خوا ماڵ و سامانێکی داوەتێ و زاڵیشی کردووە بەسەر خەرج کردن و پەرش کردنیدا لە ڕێی حەقدا، وە پیاوێکیش خوا زانست و حیکمەتی پێ بەخشیوە، ئەویش کاری پێ دەکات و فێری خەڵکی دەکات).

(٤١٠)( حم د ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ياعائشة لاتحصي فيحصي الله عليك ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٩٣١ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائشە ئەوەی دەیبەخشیت ئەژمار و حیسابی مەکە باخوای گەورەش بەخشش و ڕۆزی خۆیت لەسەر ئەژمار نەکات).

(٤١١)( حم حب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إن الله ليربي لأحدكم التمرة و اللقمة كمايربي لأحدكم فلوه أو فصيله حتى تكون مثل أحد ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨١٥ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە بۆ هەریەکەتان ئەو دەنکە خورماو پارووەی کە بەخشیویەتی، زیاد و گەورەتری دەکات، هەروەك چۆن بەچکە ماین(جوانو)و بەچکە حوشتر بۆ هەر یەکەتان گەورە دەکات و نەشونمای پێ دەکات، هەتا وای لێ دێت هێندەی کێوی (احد)ی بۆ لێ دەکات).

(٤١٢)( حم ت ) عن أبو كبشة الأنماري أنه سمع رسول الله(ﷺ): ﴿ثلاثة أقسم عليهن وأحدثكم حديثا فاحفظوه﴾. قال : ﴿ما نقص مال عبد من صدقة ولا ظلم عبد مظلمة فصبر عليها إلا زاده الله عزا ولا فتح عبد باب مسألة إلا فتح الله عليه باب فقر﴾ أو كلمة نحوها وأحدثكم حديثا فاحفظوه قال : ﴿إنما الدنيا لأربعة نفر عبد رزقه الله مالا وعلما فهو يتقي فيه ربه ويصل فيه رحمه ويعلم لله فيه حقا فهذا بأفضل المنازل وعبد رزقه الله علما ولم يرزقه مالا فهو صادق النية يقول لو أن لي مالا لعملت بعمل فلان فهو بنيته فأجرهما سواء وعبد رزقه الله مالا ولم يرزقه علما فهو يخبط في ماله بغير علم لا يتقي فيه ربه ولا يصل فيه رحمه ولا يعلم لله فيه حقا فهذا بأخبث المنازل وعبد لم يرزقه الله مالا ولا علما فهو يقول لو أن لي مالا لعملت فيه بعمل فلان فهو بنيته فوزرهما سواء﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٢١ ) في صحيح الجامع

(ابو كبشة الأنماری) دەڵێ: کە لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستوە دەیفەرموو: (سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم ،وە قسەیەکیشتان بۆ دەکەم ئێوەش لەبەری بکەن و بیپارێزن)، فەرمووی: (ماڵ و سامانی هیچ

بەندەیەك بە سەدەقە و خێر لێ كردن كەم نابێتەوە، وە هەر بەندەیەكیش زوڵمێكی لێ بكرێت و ئەویش نارامی لەسەر بگرێت ئەواخوا زیاتر ئەو بەندەیە شكۆمەند و سەربەرز دەكات، وە هەر بەندەیەكیش دەرگای دەرۆزە و سوالْ كردن لە خۆی بكاتەوە ئەوا خوا دەرگای هەژاری بە سەردا دەكاتەوە) – یان وشەیەكی فەرموو لەو بابەتە– وە قسەیەكیشتان بۆ دەكەم لەبەری بكەن و بیپارێزن فەرمووی: (ئەم دنیایە تەنها بۆ چوار كەسە، بەندەیەك خوا ماڵ و سامان و زانیاریشی داوە پێی(مەبەست پێی زانیاری شەرعییە)ئەویش تەقوای خوادەكات و سیلەی رەحمی خۆی پێ بەجێ دەهێنێت، وە دەزانێت كە ماف و حەقی خوای تێدایە، جا ئەوە باشترینی پلە و پایەكانی هەیە، وە بەندەیەكیش خوای گەورە زانیاری پێ بەخشیوە بەلاْم ماڵ و سامانی پێ نەبەخشیوە، ئەویش نیەتی راست و پاكە و دەڵێ: ئەگەر ماڵ و سامانم هەبوایە منیش وەكو فلاْن كەس لە خێر و چاكەدا بەكارم دەهێنا و كارم پێ دەكرد، ئەویش خوا نییەتی خۆی لەگەڵدا دەكات و لە ئەجر و پاداشتیشدا هەردووكیان وەكو یەك وان، وە بەندەیەكیش خوا ماڵ و سامانی داوەتێ بەلاْم زانیاری پێ نەبەخشیوە، ئەویش بە بێ زانیاری ملی لە ماڵ و سامانەكەی خۆی ناوە و نە پارێزكاریی و ترسی پەروەردگاری خۆی تیادا دەكات و نە سیلەی رەحمی پێ دەگەیەنێت، وە حەقی خوای تێدا نازانێت و ناپارێزێت ،ئەمیش لە پیسترین و خراپ ترین پلەكاندایە، وە بەندەیەكیش خوا نە ماڵ و سامان ونەزانستی نەاوەتێ ئەویش دەڵێ: ئەگەر سەروەت و سامانم هەبوایە ئەوا منیش وەك فلاْنە كەس بەكارم دەهێنا و كەیف و رابواردن و كەشخەییم پێ دەكرد ئەویش خوا بە نیەتی خۆی لەگەڵدا دەكات و هەردووكیان لە گوناهو تاواندا یەكسانن).

(٤١٣) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغضب ) عن عبدالرحمن بن عوف قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ثلاثٌ أقسمُ عليهنَّ: مَانَقَص مَالٌ قطّ منْ صدقَةٍ فتصدّقُوا ولا عفَا رجُلٌ عنْ مظْلمَةٍ ظُلمهَا إلّا زادَهُ اللهُ تعالى بِهَا عزّاً فاعفُوا يَزدكُمُ اللهُ عزّاً ولاَ فتَحَ رجُلٌ على نفْسه بَابَ مسألَةٍ يَسألُ النّاس إلّا فتَحَ اللهُ عَليْه بَابَ فقْر** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٢٤ ) في صحيح الجامع

عبدالرحمن ی كوڕی عوف دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم: ( هەرگیز ماڵ و سامان بە سەدەقە و خێر لێكردن كەم نابێتەوە، جا ئیتر خێر بكەن و ماڵ ببەخشن. وە هەر پیاوێك ببورێت لە زوڵم و ستەمێك كە لێی كراوە ئەوا خوای گەورە بەوە زیاتر بەرز و شكۆمەندی دەكات، وە هەر پیاوێكیش دەرگای دۆزەخ لەسەر خۆی بكاتەوە و سوالْ لە خەڵك بكات ئەوا خوای گەورە دەرگای هەژاری لەسەر دەكاتەوە).

(٤١٤) ( حم ق ) عن أبي هريرة يَبلغُ بِه النبي(ﷺ) قال: ﴿ **قَالَ اللهُ عزّوجَلّ: يا ابْنَ آدمَ أنْفقْ أُنْفقْ عَلَيْكَ** ﴾ صحيح مسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣١٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم تۆ خەرج بكە و ببەخشە، منیش خەرجیت دەدەمێ و پێت دەبەخشم).

(٤١٥) ( هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله تعالى إذا أنْعم على عبْدِ نعْمةً يُحبُّ أنْ يرى أثـرَ النّعْمةَ عليْه وَ يكْرهُ البؤْس و التّباؤُس، و يبْغضُ السّائلَ المُلحفَ وَ يُحبُّ الحيي العفيفَ المُتعففْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧١١ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە ئەگەر نیعمەت و ڕۆزییەکی ڕشت بە سەر بەندەیەکی خۆی دا، حەز دەکات و پێی خۆشە کە شوێنەواری نیعمەتەکەی پێوە دیار بێت، وە داماویی و خۆ داماو کردنی پێ ناخۆشە، ڕقی لە سواڵکەری منجڕە، وە کەسی شەرمنی نەفس پاکی خۆپاك ڕاگری خۆش دەوێت).

(٤١٦) ( ت ) عن أبي هريرة يقول: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تعالى يقْبلُ الصّدقةَ و يأخُذُها بيمينه فيُربّيها لأحدكُمْ كما يُربّي أحدُكُمْ مُهْرهُ، حتّى أنّ اللّقْمةَ لتصيرُ مثْلَ أُحُد ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٠٢ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوا ماڵ بەخشین و سەدەقەتان لێ قبوڵ دەکات، وە بە دەستی ڕاستی وەری دەگرێت، ئینجا زیادی دەکات و نەشونمای پێ دەکات بۆ هەر یەکەتان هەر وەك چۆن یەکێك لە ئێوە جوانوەکەی(بێچوی ماینەکەی)خۆی پەروەردە دەکات و گەورەی دەکات، تەنانەت پاروە نانێك هێندەی کێوی (أُحد)ی لێ دەکات).

(٤١٧) ( ت ن هـ ) عن أبي هريرة يقول: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ماتصدّقَ أحدٌ بصدقةٍ منْ طيّبٍ - ولا يقْبلُ الله إلّا الطّيّبَ - إلّا أخذَها الرّحْمنُ بيمينه و إنْ كانتْ تمْرةً فتربُو في كفّ الرّحْمن حتّى تكُونَ أعْظمَ منَ الجبل كما يُربّي أحدُكُمْ فلُوهُ أوْ فصيلهُ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٩٩ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر یەکێك سەدەقەیەك ببەخشێت لە ماڵێکی پاك و حەلاڵ -خوای گەورەش ئەوەی پاك نەبێت قبوڵی ناکات- ئەوا خوای میهرەبان و گەورە بە ڕاستەی خۆی وەری دەگرێت و، ئەگەر تەنانەت دەنکە خورمایەکیش بێت ئەوا لە دەستی خوای میهرەباندا گەشە دەکات و زیاد دەکات هەتا وای لێدێت لە چیایەك گەورەتر دەبێت، هەروەك چۆن یەکێکتان بێچووە ماینەکەی(جوانوەکەی یان بەچکە حوشترەکەی پەروەردە دەکات و گەورەی دەکات).

## ( ٣ ) ( دڵ نەوایی کراوەکان ( المؤلفة قلوبهم ) )

(٤١٨) ( ق د ) عامرُ بْنُ سعْدِ بْنِ أبي وقّاصٍ عنْ أبيه سعْدٍ: ﴿ أنّ رسُول الله(ﷺ) أعْطى رهْطاً، وسعْدٌ جالسٌ فيهمْ. قال سعْدٌ: فترك رسُولُ الله(ﷺ) منْهُمْ منْ لمْ يُعْطه وهُو أعْجبُهُمْ إليّ، فقُلْتُ: يارسُول الله(ﷺ)! مالكَ عنْ فُلانٍ؟ فوالله إنّي لأراهُ مُؤْمناً. فقال رسُولُ الله(ﷺ): " أوْ مُسْلماً ". قال: فسكتُّ قليْلاً. ثُمّ غلبني ماأعْلمُ منْهُ. فقُلْتُ: يارسُول الله(ﷺ)! مالكَ عنْ فُلانٍ، فوالله إنّي

**لأراهُ مُؤْمِناً، فَقَال: " أوْ مُسْلِماً "، قَال: فسكَتُّ قليلاً، ثُمَّ غلبني ما عَلِمْتُ مِنْهُ، فَقُلْتُ: يارَسُول الله(ﷺ)! مالك مِنْ فُلان، فَوَالله إنِّي لأراهُ مُؤْمِناً، فَقَال رَسُول الله(ﷺ): " أَوْ مُسْلِماً "، إنِّي لأُعْطِي الرَّجُل وغَيْرُهُ أحبَّ إليَّ مِنْهُ خَشْيَةَ أنْ يُكَبَّ في النَّار علي وجْهه ﴾. صحيح مسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٠٥) في صحيح الجامع**

عامری کوڕی سعدی کوڕی ابی وقاص له سەعدی باوکییەوه دەگێڕێتەوه که: ( پێغەمبەر(ﷺ) هەندێك بەخششی دا به کۆمەڵێك، وه سەعدیش له ناویاندا دانیشتبوو، جا پێغەمبەر(ﷺ) هەندێکیانی پەڕاندو بەشی نەدان، که تیایاندا بوو لای من له هەموویان پەسەندتر بوو منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوه چیت هەیه لەسەر فلأنه کەس ؟ خۆ سوێند بێ به خوا من به کەسێکی باوەڕداری دەبینم، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: (یان موسڵمانێکی تر) ووتی: منیش کەمێك بێ دەنگ بووم، پاشان ناسراویم بۆ کابراکه زاڵ بووەوه به سەرمدا و ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوه چیت هەیه لەسەر فلأن کەس؟ خۆ سوێند بێت به خوا من به باوەڕداری دەبینم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (یان موسڵمانێکی تر) دەڵێ: منیش کەمێك بێدەنگ بووم پاشان ناسراوییەکەم بۆی زاڵبوو بەسەرمدا، دیسان ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوه چیت هەیه لەسەر فلأن کەس؟ خۆ سوێند بێت به خوا من به ئیمانداری دەبینم، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی:(یان موسڵمانێکی تر، بەراستی من بەخشش دەدەمه پیاوێك و بەلأم یەکێکی ترم لا خۆشەویستره لەو، له ترسی ئەوەی که نەوەکو به سەر دەم و چاوی‌دا، فڕێ بدرێته ناو ئاگرەوه).

**(٤١٩) ( خ ) عن عمرو بن تغلب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَمَّا بَعْدُ فَوَالله إنِّي لأُعْطِي الرَّجُل و أدَعُ الرَّجُل و الَّذِي أدَعُ أحبُّ إليَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي و لَكِنِّي أُعْطِي أقْواماً لما أرَى في قُلُوبِهِمْ مِنَ الْجزَعِ و الهلعِ و أَكِلُ أقْواماً إلى مَا جَعَلَ الله في قُلُوبِهِمْ مِن الغنى و الْخَيْرُ مِنْهُمْ عمرو بن تغلب ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٣٥٨) في صحيح الجامع**

عمروی کوڕی تغلب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (پاش سوپاس و ستایشی خوا، سوێند بێت به خوا من بەخشش دەدەمه پیاوێك وه پیاوێکی تر نایدەمێ، وه ئەوەی که نایدەمێ لام خۆشەویستره لەوەی که ئەیدەمێ. بەلأم کەسانێك بەخششیان دەدەمێ لەبەر ئەوەی لاوازیی و دڵەڕاوکێ له دڵەکانیاندا دەبینم، وه کەسانێك بەجێ دەهێڵم بۆ ئەو دەوڵەمەندی و خێرەی که خوا خستوویەتی یه دڵەکانیانەوه که یەکێك لەوانه(عمرو ی کوڕی تغلب)ه).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

ئەو دوو فەرمووده پیرۆزه هۆکارەکەیان ئەوه بوو که پێغەمبەر(ﷺ) هەندێك پاره هێنرایه بەردەستی ئەویش دابەشی کرد به سەر موسڵمانەکاندا بەلأم دای به هەندێکیان و نەیدا به هەندێکی تر، پاشان پێی گەیشتەوه ئەوانەی پێان نەدراوه گلەییان کردووه، ئینجا پێغەمبەریش(ﷺ) موسڵمانەکانی کۆکردەوه و بۆی روون کردنەوه که هۆکاری ئەو هەڵوێستەی له بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان بووه،

لەبەر ئەوەی کە ئەو کەسانەی بەخششیان پێ دراوە کەسانێك بوون کە تازە هاتونەتە ناو ئیسلامەوە و هێشتا لاوازی ئیمان و هەڵپەی دونیا دڵەکانیانی بەرنەداوە، ئەمیش لە ڕێگەی ئەو بەخششەوە زیاتر دلیان بەرەو ئیسلام رادەکێشێت و پەیوەستیان دەکات بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە، هەر بۆیە زۆر بە راشکاوانە پێیان دەڵێ کە ئەو کەسانەی بەشیان نەدراوە لەبەر ئەوە بووە کە دڵنیا بووە لە پتەویی باوەڕیان و دەوڵەمەندی دڵەکانیان، هەر بۆیەش لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستر و بەڕێزترن لەوانەی کە پارەوماڵەکەیان بەش دراوە.

وە لە فەرموودەی یەکەمدا کاتێك کە سعدی کوڕی ابي وقاص سێ جار لە پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە دەکاتەوە کە بۆچی بەشی (عمرو ی کوڕی تغلب)ی نەداوە کە پیاوێکی زۆر ئیماندارە. پێغەمبەر(ﷺ) گومان و سەرسوڕمانەکەی (سعد) بەوە دەڕەوێنێتەوە کە ئەو گومانی نییە لە ئیمانی (عمرو ی کوڕی تغلب) بەڵکو زیاتریش خۆشی دەوێت لەوانەی کە پارە و ماڵەکەی بەسەردا دابەش کردوون. بەڵام ئەو دەیەوێت دڵی تازە موسڵمانەکان زیاتر بەرەو ئیسلام رابکێشێت و دەست گیرۆیی و دڵنەواییان بکات هەتا زیاتر شیرینی ئیسلام بچێتە دڵیانەوە، هەر بۆیەش هەرسێ جارەکە بەوە وەڵامی (سعد) دەداتەوە کە ئەو بەشە بدات بە یەکێك لە تازە موسڵمانەکان باشترە.

## ( ٤ ) ( خێر و سەدەقە بە پێغەمبەر و ئال و بەیتی ناشێت )

**(٤٢٠) ( طب ) عن عبدالمطلب بن ربيعة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ أبىَ ذٰلكَ لَكُمْ وَ رَسُولَهُ أنْ يَجْعَلَ لَكُمْ أوْساخَ أيْدِي النَّاس ﴾ . ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ١٦٩٧ ) في صحيح الجامع**

عبدالمطلب کوڕی ربيعة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە ڕێگەی نەداوە بەوە بۆ ئێوە و پێغەمبەرەکەیشی کە چڵك و پیسیەکانی دەستی خەڵکتان پێبدات).

**(٤٢١) ( ابن سعد ) عن الحسن بن علي عن الحسن بن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلي الصَّدَقَةَ وَ عَلىَ أهْلِ بَيْتِي ﴾ . ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ١٧٥٠ ) في صحيح الجامع**

حسن ی کوڕی علی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە خێر و سەدەقەی لەسەر من و لەسەر ئەهلی ماڵەکەم حەرام کردووە).

## ( ٥ ) ( فەزڵی بەخشش مەندی )

**(٤٢٢) ( ابن عساكر الضياء ) عن سعد بن أبي وقاص قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ كَرِيمٌ يحِبُّ الكُرَماءَ جواد يُحبُ الجُودَةَ، يحبُ مَعَالي الأخْلاقِ وَ يَكْرَهُ سَفَاسِفَها ﴾ ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ١٨٠٠ ) في صحيح الجامع**

سعدی کوڕی ابي وقاص دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە بەخشش مەندەو بەخششمەندانی خۆش دەوێت و خێرەومەندە و خێرەومەندانی خۆش دەوێت، حەزی لە رەوشتە بەرزەکانەو رقی لە رەوشتە نزمەکان دەبێتەوە).

## ( ٦ ) ( سواڵكەری منجڕ )

(٤٢٣) ( حل ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَ الله تعالى يَبْغَضُ السّائِلَ المُلحِفَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٧٦ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە رقی لە سواڵكەری منجڕە).

### روونكردنەوەی فەرموودەكە :

مەبەستی فەرموودەكە ئەو سواڵكەرانەیەكە بەرچاو تەنگن و هەر داوای زیاتر دەكەن و خەڵكی سوێند دەدەن بە خوای گەورە كە بەشیان بدەن.

## ( ٧ ) ( سەدەقەی خوای گەورە بە سەر بەندەكانیدا )

(٤٢٤) ( ق ٤ ) يعلي بن امية قال: قُلْتُ لعُمر بن الخطَاب: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾، فَقَدْ أمنَ النَاسُ فقالَ عُمَرُ رضي الله عنْهُ: عجبتُ ممّا عجبت منْهُ فسألتُ رسُول الله(ﷺ) عنْ ذلك فقال: ﴿ صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَـتَهُ ﴾ واللفظ للنسائي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٧٥٧ ) في صحيح الجامع

يعلی كوڕی امية دەڵێ: بە عومەری كوڕی خەتابم ووت: ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، واتە: (هیچ گوناهێكتان لەسەر نییە كە نوێژەكانتان قەسر بكەن و كورتی بكەنەوە ئەگەر ترستان هەبوو كە بێباوەڕان زەفەرتان پێ بەرن )، ئەی خۆ ئێستا ترسی كافرەكانیان نەماوە؟ عومەریش رەزای خوای لێ بێت ووتی: منیش وەك تۆ سەرم سوڕمابوو لەو ئایەتە بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد دەربارەی، ئەویش فەرمووی: (ئەوە سەدەقەیەكی خوایە كە پێی بەخشیون، ئێوەش سەدەقەكەی قبوڵ بكەن).

### روون كردنەوەی فەرموودەكە :

مەبەستی فەرمایشتەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیە كە كورتكردنەوەی نوێژ (واتە قەسر كردن) لە كاتی ترسدا یان لە كاتی سەفەردا سەدەقەیەكی گەورەی خوایە بۆ بەندە موسڵمانەكانی چونكە كارئاسانی و لادانی زەحمەتی تێدایە لە سەر موسڵمانان، وە خوای گەورە پێی خۆشە سەدەقەكەی قبوڵ بكرێت هەر وەك چۆن پێی خۆشە فەرزەكانی جێبەجێ بكرێن.

## ( ٨ ) ( سەدەقە دەبێت لە دەستکەوتی پاك و حەڵاڵ بێت )

**(٤٢٥) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ وَلا يَقْبَلُ الله إِلَّا الْطَيِّبَ فَإِنَّ الله يَتَقَبَلُها بِيَمِينِهِ ثُمَّ يُرَبِّيهَالصاحِبِهَا كَما يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَهُ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٤٥ ) في صحيح الجامع**

(هەر کەسێك کە خێر و سەدەقەیەك بکات بە هێندەی دەنکە خورمایەك بە دەستکەوتی حەڵاڵ، کە خوای گەورەش پاك و حەڵاڵ نەبێت وەری ناگرێت،ئەوا نەشونمای بۆ خاوەنەکەی پێ دەکات و پەروەردەی دەکات، هەر وەك چۆن یەکێك لە ئێوە جوانوەکەی(بێچوە ماینەکەی)خۆی پەروەردە دەکات، هەتا هێندەی کێوێکی لێ دێت)

## ( ٩ ) ( دەربارەی دواخستنی سەدەقە و ماڵ بەخشین بۆ کاتی سەرە مەرگ )

**(٤٢٦) ( حم هـ ك ) عن بسر بن جحاش قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ الله تعالى: يَا ابْنَ آدمَ! أَنَّى تُعجِزُنِي وَقَد خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذا؟ حَتَّى إذا سَوَّيْتُكَ وَ عَدَلْتُكَ مَشَيْتَ بَيْنَ بُرْدَيْنِ وَ لِلأَرْضِ مِنْكَ وَئِيد فَجَمَعْتَ وَ مَنَعْتَ حَتَّى إذا بَلَغْتَ التَّراقِي قُلْتَ: أَتَصَدقُ و أَنَّى أَوانَ الصَّدَقَةِ؟! ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨١٤٣ ) في صحيح الجامع**

بسری کوڕی جحاش دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت:ئەی بەنی ئادەم تۆ چۆن دەتوانیت من دەستەوسان بکەیت، لە کاتێکدا تۆ دەزانیت من لە چی دروستم کردویت؟ هەتا کاتێك کە تەواو رێك و پێکم کردیت بە جوتێك پۆشاکی بەرتەوە دەڕۆیت و زەوی لە ژێرت جیرەی دێت و هەتا توانیت ماڵ و دنیات کۆکردەوە و بەشی کەست لێ نەدا، هەتا کاتێك کە رۆحەکەت گەیشتە قوڕقوڕاگەت دەڵێیت: خێر و سەدەقە دەکەم، جا تازە ئیتر کەی کاتی خێر و سەدەقە ماوە؟!).

## ( ١٠ ) ( دەربارەی دەرۆزە و سواڵکردن بە بێ پێویست بوون )

**(٤٢٧) ( هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا فَتَحَ رَجُلٌ بابَ عَطِيةٍ بِصَدَقَةٍ أَوْ صِلَةٍ إِلَّا زَادَهُ الله تَعالَى بِهَا كَثْرةً وَمَافَتَحَ رَجُلٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ يُرِيدُ بِها كَثْرَةً إِلَّا زَادَهُ اللهُ تَعالَى بِهَا قِلَّةً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٤٤ ) في صحيح الجامع**

أبو هريرة دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر پیاوێك دەرگای بەخشین بکاتەوە بە سەدەقەیەك بێت یان بە سیلەیەکی رەحم بێت ئەوا خوای گەورە بەو کارەی هەر زیاتری دەداتێ، وە هەر پیاوێکیش دەرگای سواڵ و دەرۆزە بکاتەوە بە مەبەستی زیاتر کۆکردنەوەی ماڵ و پارە بێت ئەوا خوای گەورە بەو کارەی هەر کەمتری دەداتێ).

# ( بەشی : رۆژوو گرتن )

## ( ١ ) ( بينينی مانگ )

**(٤٢٨) ( ك ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ جَعَلَ اللهُ الأَهِلَةَ مَواقيتَ لِلنَاسِ فَصُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَ أَفْطِروا لِرُؤْيَتِهِ فَإنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَعدوا ثَلاثِيْنَ يَوْمًا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٧٥ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: (خوای گەورە مانگی يەك شەوەی كردۆتە كاتژمێر بۆ خەڵك جا ئێوە بە بينينی دەست بكەن بە رۆژو گرتن، وە بە بينينيشی دەست لە رۆژو گرتن هەڵگرن و بيشكێنن، وە ئەگەر هەور و تەميش بەری لێ گرتبوون، ئەوا سی رۆژ بژمێرن).

## رونكردنەوەی فەرموودەكە :

بە پێی ئەم فەرموودە پيرۆزە، خوای گەورە هەڵهاتنی مانگی يەك شەوەی كردۆتە هۆكارێك بۆ موسڵمانان كە لە رێيەوە كاتەكانی پێ ئەژمار بكەن و بيپێون، ئەو قاعيدە شەرعيەشی بۆ موسڵمانان چەسپاندووە كە رۆژوی مانگی رەمەزان لەگەڵ بينينی مانگ لە شەوی يەكەمی‌دا دەست پێ دەكات، وە كۆتايی هێنانيش بە رۆژوی ئەو مانگە پيرۆزە بە سەرلەنوێ بينينی مانگ دەبێت لە شەوی يەكەمی مانگی( شوال)دا، كە بە بينينی ئيتر دەكرێتە جەژن و دەست لە رۆژو هەڵدەگيرێت، وە ئەگەر بە هۆی هەورو تەميشەوە نەتوانرا بينينی مانگ بسەلمێنرێت ئەوا دەبێت مانگەكە بە سی رۆژی پڕ بژمێردرێت و تەواو بكرێت.

## ( ٢ ) ( باشترين رۆژو رۆژوی داودە سەلامی خوای لەسەر بێت )

**(٤٢٩) ( حم ق د ن هـ ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الصِّيَامِ إلىَ اللهِ صِيامُ دَاوُدَ - عَلَيْهِ السَّلامُ وَكَانَ يَصُومُ يَوْماً وَ يُفْطِرُ يَوْماً وَ أَحَبُّ الصَّلاةِ إلىَ الله صَلاةُ دَاوُدَ كَانَ يَنامُ نِصْفَ اللَيْلِ وَ يَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنامُ سُدُسَهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٠ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: (خۆشەويسترين رۆژو لای خوای گەورە رۆژوی داودە سەلامی خوای لەسەر بێت، رۆژێك بەڕۆژو دەبوو وە رۆژێك دەيشكاند، وە خۆشەويسترين نوێژيش لای خوا نوێژی داودە، نيوەی شەوەكە دەخەوت وە سێ يەكی هەڵ دەساو بەندايەتی خوای دەكرد وە شەش يەكەكەی تريشی دەخەوتەوە).

**(٤٣٠) ( حم م ) عن ابن عباس رضي الله عنهما: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ قَدْ أَمَدَّهُ لِرُؤْيَتِه، فَإنْ أُغْمِيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٩٠ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە رۆژوی رەمەزانی درێژ کردۆتەوە هەتا مانگ دەبینرێتەوە جا ئەگەر هەوریش بەری لێ گرتن ئەوا مانگەکە تەواو بکەن).

## ( ٣ ) ( فەزلی رۆژو گرتن )

**(٤٣١) ( هب ) عن عثمان بن أبي العاص قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الصَّوْمُ جُنَّةٌ مِنْ عَذابِ اللهِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٨٣٦ ) في صحيح الجامع**

عثمانی کوڕی ابي العاص دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(رۆژو قەڵغانە لە عەزاب و ئەشکەنجەی خوا).

**(٤٣٢) ( ن ) عن عائشة عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ الصِّيامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ فَمَنْ أَصْبَحَ صَائِماً فَلا يَجْهَلْ يَوْمَئِذٍ وَإِنِ امْرُؤٌ جَهِلَ عَلَيْهِ فَلا يَشْتِمْهُ ولا يَسُبَّهُ وَ لِيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ وَ الَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٨٧٧ ) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( رۆژو قەڵغانە لە ئاگر، جا هەر کەسێکتان کە بەیانی هەستا بەڕۆژو بوو، با لەو رۆژەدا کاری نەفامیی تێدا نەکات، وە ئەگەر کەسێکیش کاری نەفامیی بەرامبەری کرد، با جوێن و قسەی ناشرینی پێ نەڵێت، وە با بڵێ من بەڕۆژوم ،وە سوێندبێت بەوەی کە گیانی محمدی بە دەستە، بۆنی ناخۆشی دەمی رۆژوەوان پاك وخۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك ).

**(٤٣٣) ( حم م ن ) عن أبي هريرة وأبي سعيد رضي الله عنهما قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالَى يَقُولُ: إنَّ الصَّوْمَ لِي وَ أَنَا أَجْزِي بِه إِنَّ لِلصَّائِمِ فَرْحَتَيْنِ: إِذا أَفْطَرَ فَرِحَ،وإذا لَقِيَ اللهَ فَرِحَ ، و الَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٠٧ ) في صحيح الجامع**

ابي هريرة وابی سعيد دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: رۆژو بۆ منە و من خۆم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە، بەڕاستی رۆژوەوان دوو خۆشی بە نسیب دەبێت، کاتێك کە رۆژوەکەی دەشکێنێت خۆشحاڵ دەبێت، وە کاتێکیش کە بە خوای گەورە دەگاتەوە خۆشحاڵ دەبێت. وە سوێندبێت بەوەی کە گیانی محمدی بە دەستەبۆنی ناخۆشی دەمی رۆژوەوان پاك و خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك).

**(٤٣٤) ( ق ن ) عن أبي هريرة يقول: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيامَ هُوَ لِي وَ أَنَا أَجْزِي بِه وَ الصِّيامُ جُنَّةٌ إذا كانَ يومُ صِيامِ أَحَدِكُمْ فَلا يَرْفُثْ وَ لا يَصْخَبْ فَإِنْ شَاتَمَهُ أَحَدٌ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ وَ الَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ عِنْدَ اللهِ أَطْيَبُ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ لِلصَّائِمِ**

فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُما: إذا أَفْطَر فَرِحَ بِفِطْرِهِ وَ إذا لَقِيَ رَبَّهُ عَزَوَجَلَ فَرِحَ بِصَوْمِهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٢٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: هەموو کارێکی بەنی ئادەم بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژو، ئەوەیان بۆ منە و هەر خۆشم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە، وە ڕۆژو قەڵغانە، جا ئەگەر هەر یەکێکتان بەڕۆژو بوو، با قسەی پیس و ناشرین و هات وهاواری تیدا نەکات، وە ئەگەر کەسێك جوێنی پێدا یان شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێت: من بەڕۆژوم. وە سوێندبێت بەوەی کە گیانی محمدی بە دەستە، بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژوەوان پاك و خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك، وە ڕۆژوەوان دوو خۆشی هەیە کە پێیان خۆشحاڵ دەبێت، کاتێك کە ڕۆژوەکەی دەشکێنێت خۆشحاڵ دەبێت بە ڕۆژو شکاندنەکەی، وە کاتێکیش کە بە پەروەردگاری خۆی دەگاتەوە خۆشحاڵ دەبێت بە ڕۆژوەکەی ).

(٤٣٥) ( حم خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الصِّيامُ جُنَّةٌ وَ إذا كانَ أحدُكُمْ صائماً فَلا يَرْفُثْ وَلايَجْهَلْ وَ إن امرؤٌ قاتَلَهُ أَوْ شاتَمَهُ فَلْيَقُلْ: إنِّي صائمٌ مَرَّتَيْنِ وَ الَّذي نَفْسي بِيَدِه لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ يَتْرُكُ طَعامَهُ وَ شَرابَهُ وَ شَهْوَتَهُ مِنْ أجْلي، الصِّيامُ لي و أنَا أَجْزِي بِهِ و الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثالِهَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٨٦٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژو گرتن قەڵغانە وە ئەگەر یەکێکتان بەڕۆژو بوو با قسەی خراپ و ناشیرینی تێدا نەکات و کاری نەفامیی ئەنجام نەدات، وە ئەگەر کەسێك شەڕی لەگەڵدا کرد یان جوێنی پێدا با بڵێت: من بەڕۆژوم دوو جار، وە سوێندبێت بەوەی کە گیانی منی بە دەستە بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژوەوان پاك و خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك، خواردنەکەی و خواردنەوەکەی و ئارەزووەکەی دەست لێ هەڵدەگرێت لە پێناوی مندا،ڕۆژو بۆ منە و هەر خۆم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە، وە کاری چاکەش بە دە هێندەی خۆیەتی).

(٤٣٦) ( حم م ن هـ ) عن أبي هريرة عن رسول الله(ﷺ): ﴿ مامِنْ حَسَنَةٍ عَمِلَهَا ابْنُ آدَمَ إلَّا كُتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ إلى سَبْعِمَائَةِ ضِعْفٍ، قَالَ اللهُ عَزَوَجَلَ: إلَّا الصِّيامَ فَإنَّهُ لي وَ أنا أَجْزِي بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَ طَعامَهُ مِنْ أجْلي، الصِّيامُ جُنَّةٌ، لِلصَّائمِ فَرْحَتَانِ فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ وَ فَرْحَةٌ عِنْدَ لِقاءِ رَبِّهِ و لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٥٣٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ:پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەموو چاکەیەکی بەنی ئادەم کە دەیکات بە دە چاکە بۆی دەنوسرێت هەتا حەوسەد قات، خوای گەورە فەرمووی: تەنها ڕۆژو نەبێت ئەوەیان بۆ منەو تەنها خۆم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە، ئەو واز لە ئارەزو و خواردنی دەهێنێت لەبەر من،ڕۆژو قەڵغانە، ڕۆژوەوان دوو خۆشیی هەیە ،خۆشییەك لە کاتی شکاندنی ڕۆژوەکەیدا، وە خۆشییەکیش لە کاتی گەیشتنی بە پەروەردگاری، وە بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژوەوان پاك و خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك )

(٤٣٧) ( طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الصِّيامُ جُنَّةٌ وَ هُوَ حِصْنٌ مِنْ حُصُونِ الْمُؤْمِنِ وَ كُلُّ عَمَلٍ لِصَاحِبِهِ إِلَّا الصِّيامِ يَقُولُ اللهُ: الصِّيامُ لِي وَ أَنَا أَجْزِي بِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٨٧٨) في صحيح الجامع

ابو امامه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ڕۆژو قەڵغانە، وە ڕۆژو قەڵایەکە لە قەڵاکانی باوەڕدار، وە هەموو کارێك بۆ خاوەنەکەیەتی تەنها ڕۆژو نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ڕۆژو بۆ منەوە هەر خۆم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە).

(٤٣٨) ( حم هب ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالَى: الصِّيامُ جُنَّةٌ يَسْتَجِنُّ بِها الْعَبْدُ مِنَ النَّارِ وَهُوَ لِي وَ أَنَا أَجْزِي بِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٠٧) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(خوای گەورە دەفەرموێت: ڕۆژو قەڵغانە، ئەو بەندەیە دەیکاتە سوپەری خۆی لە ئاگر، وە ڕۆژو بۆ منەو هەر خۆم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

لە فەزلەکانی ڕۆژو کە لەم فەرموودە پیرۆزانە هاتووە:

١- ڕۆژو قەڵغان و سوپەرە بۆ خاوەنەکەی لە ئاگری دۆزەخ.

٢- ڕۆژو قەڵایەکە لە قەڵاکانی موسڵمان کە لە شەیتان دەیپارێزێت.

٣- موسڵمانی ڕۆژوەوان بە ڕادەیەك لای خوا خۆشەویستە و ڕێزی هەیە کە تەنانەت بۆنی ناخۆشی دەم و هەناسەکەشی لە لای خوای پەروەردگار لە بۆنی میسك -کە بۆن خۆشترین جۆری عەترە- پاك و خۆشترە ،کە ئەم ڕاستییەش لە هەموو فەرموودەکاندا پێغەمبەر(ﷺ) سوێندی لەسەر خواردووە.

٤- خوای گەورە دوو جار ڕۆژوەوان خۆشحاڵ دەکات، جاری یەکەم کە ڕۆژوەکەی دەشکێنێت و بەربانگ دەکاتەوە، وە جاری دووەمیش کە لە قیامەتدا بە خوای گەورە و پەروەردگاری خۆی دەگاتەوە کە ئەمەیان خۆشیی هەرە گەورەیە، وە دیارە کەسێکیش خوا لەو ڕۆژەدا دڵخۆشی بکات ئەوا إنشاء الله هەر لێی دەبوورێت.

٥- وە هەموو کارێکی چاکە کە بەندەی موسڵمان دەیکات، خوای بەخشندە بە ڕەحمەتی خۆی بە دە هێندە هەتا حەوسەد هێندە بۆی دەنووسێت، بەڵام ڕۆژو لەو ڕادەیەشی تێ پەڕاندووە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ڕۆژو تەنها بۆ منە و بواری ڕیابازی تێدا نییە، چونکە هەموو کەس دەتوانێت بەڕۆژوش نەبێت بەڵام لای خەڵك بڵێت بەڕۆژوم، جا هەر کەسێك کە بەڕۆژو بێت دیارە تەنها بۆ خوا و لەبەر خاتری خوا بەڕۆژو بووە، هەر بۆیەش خوای گەورە وەسفی خێری ئەو بەندەیەی خۆی دەکات و دەفەرموێت: ئەو دەستی لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزووەکانی لەبەر خاتری من هەڵگرتووە بۆیە پاداشتی ئەو لای منە و هەر خۆم دەتوانم پاداشتی بدەمەوە،

جا لەبەر ئەوەی رۆژو ئەو هەموو خێر و فەزلە گەورەیەی هەیە لە لای پەروەردگار دەبێت بەندەی موسڵمان زۆر ئاگادار بێت کە رۆژوەکەی بە کاری نەفامی و شەڕ فرۆشی و جوێن فرۆشتن بەتاڵنەکاتەوە هەتا رۆژوەکەی لاواز و بەتاڵ نەبێتەوە ئەو هەموو خێر و پاداشتە لە دەستی خۆی نەدات و رەزامەندی پەروەردگار بەدەست بێنێت.

## ( ٤ ) ( فەزلی پارشێو کردن )

**(٤٣٩) ( حم ن ) عن رجل قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ السُّحُورَ بركةٌ أعطاكُمُوهَا اللهُ فَلا تَدَعُوهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ١٦٣٦ ) في صحيح الجامع**

پیاوێك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەو پارشێو کردنە بەرەکەتە خوای گەورە بەخشیویەتی بە ئێوە، ئێوەش وازی لێ مەهێنن و دەستی لێ هەڵ مەگرن).

**(٤٤٠) ( الشيرازي في الألقاب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ جَعَلَ الْبَرَكَةَ فِي السُّحُورِ وَ الْكَيْلِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٣٥ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بەرەکەتی خستۆتە پارشێو کردن و کێشانە کردنەوە).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەست لە کێشانە کردن ئەوەیە کە هەر شتێك بە پێوانە و ترازو کێشانەکردن بپێورێت ئەوا خوای گەورە بەرەکەتی تێ دەکات، نەك بە گۆترە و هەڕەمەکی، تەنانەت زانایان دەفەرموون ئەگەر ولاخیش بە کێشانە ئالیکی بدرێتێ ئەوا خوای گەورە بەرەکەتی تێ دەکات.

**(٤٤١) ( حب طس حل ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ وَ مَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ علىَ الْمُتَسَحِّرِينَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٤٤ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(خوای گەورە و فریشتەکانی سەڵەوات لەسەر ئەوانە دەدەن کە پار شێو دەکەن).

**(٤٤٢) ( حم ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ السُّحُورُ أَكْلُهُ بَرَكَةٌ فَلا تَدَعُوهُ ولو أنْ يَجْرَعَ أَحَدُكُمْ جُرْعَةً مِنْ ماءٍ فَإنَّ اللهَ وَ مَلائِكَتَهُ يُصَلُّون عَلىَ الْمُتَسَحِّرِين ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٦٧٦ ) في صحيح الجامع**

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (پارشێو خواردنەکەی بەرەکەتە، جا وازی لێ مەهێنن و دەستی لێ هەڵمەگرن. ئەگەر تەنانەت بەوەندەش بێت کە هەریەکێك لە ئێوە تەنها قومە ئاوێکیش بێت بیخواتەوە ،چونکە خوا و فریشتەکانی سەڵەوات لە سەر ئەوانە دەدەن کە پارشێو دەکەن).

## ( ٥ ) ( فەزلی رۆژوی شەشەلان )

**(٤٤٣) ( أبو الشيخ في الثواب ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ جَعَلَ اللّهُ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أمْثَالِهَا، الشَّهْرُ بِعَشْرَةِ أشْهُرٍ وَ صِيامُ سِتَّةِ أيَّامٍ بَعْدَ الشَّهرِ تَمامَ السَّنَةِ ﴾ (صحيح) انظر حيث رقم (٣٠٩٢) في صحيح الجامع**

ثوبان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە خێر و چاکەی داناوە بە دەهێندەی خۆی، وە مانگێکیش بە دە مانگە. وە رۆژوی شەش رۆژیش لە دوای مانگەکەی رەمەزان ئیتر ئەوە تەواوی ساڵەکە دەکات ).

## روونکردنەوەی فەرموودەکە :

واتە هەر کەسێك لە دوای رۆژوی مانگی رەمەزان شەش رۆژیش لە مانگەکەی دوای رەمەزان بەرۆژو بێت کە پێی دەوترێت شەشەلان ئەوا وەك ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بەرۆژو بوبێت. چونکە ئەوە دەکاتە سی و شەش رۆژ ، وە هەموو چاکەیەکیش لای خوا بە دە هێندەیە. واتە سی و شەش رۆژەکە دەکاتە سێ سەد و شەست رۆژ لای خوا کە ئەمیش ژمارەی رۆژەکانی ساڵی عەرەبیە. واتە وەك ئەوە وایە کە هەموو سێ سەد و شەست رۆژەکەی ساڵەکە بەرۆژو بوبێت، کە ئەمەش تەنها لە رەحمەتی خواوەیە بۆ بەندە موسڵمانەکانی خۆی.

## ( ٦ ) ( فەزلی رۆژو گرتن لە جیهاددا )

**(٤٤٤) ( ن هـ ) عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَامَ يَوْماً في سبيل الله بَاعد اللهُ بيْنَهُ وَبَيْنَ النّارِ بذلك اليَوْمِ سَبْعِينَ خريفاً ﴾**

ابو سعید الخدري دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك رۆژێك لە پێناوی خوادا بەرۆژو بێت، خوای گەورە ئەو رۆژە نێوانی ئەو و نێوانی ئاگر هەفتا پایز -- واتە هەفتا ساڵ - لێك دور دەخاتەوە ).

(٤٤٥) ( ن ) عن أبي سعيد عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ الله بَاعَدَ اللهُ وَجْهَهُ مِنْ جَهَنَّمَ سَبْعِينَ عَاماً ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٣٠ ) في صحيح الجامع

أبي سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك ڕۆژێك لە پێناوی خوای گەورەدا بەڕۆژو بێت، ئەوا خوا هەفتا دانە ساڵ دەم و چاوی لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە ).

(٤٤٦) ( ن ) عن عقبة بن عامر عن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ الله بَاعَدَ الله مِنْهُ جَهَنَّمَ مَسِيرَةَ مِائَةِ عَامٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٢٩ ) في صحيح الجامع

عقبەی کوڕی عامردەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك ڕۆژێك لە پێناوی خوای گەورەدا بەڕۆژو بێت، ئەوا خوای گەورە سەد ساڵە ڕێی دۆزەخی لێ دوور دەخاتەوە ).

(٤٤٧) ( ت ) عن أبي أمامة الباهلي عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ الله جَعَلَ الله بَيْنَهُ وَ بَيْنَ النَّارِ خَنْدَقاً كَما بَيْنَ السَّماءِ وَ الأَرْضِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٣٢ ) في صحيح الجامع

أبو أمامە الباهلی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك ڕۆژێك لە پێناوی خوادا بەڕۆژو بێت، ئەوا خوا چاڵێك دەخاتە نێوان ئەو و نێوان ئاگرەوە کە ئەو چاڵە هێندەی نێوان ئاسمان و زەوی بێت ).

(٤٤٨) ( حم ت ن هـ ) عن أبي هريرة عن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ الله زَحْزَحَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ بِذَلِكَ الْيَوْمِ سَبْعِينَ خَرِيفاً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٣٣ ) في صحيح الجامع

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك ڕۆژێك لە پێناوی خوای گەورەدا بەڕۆژو بێت، ئەوا خوا بەو ڕۆژە هەفتا پایز - واتە هەفتا ساڵ - ڕووی ئەو کەسە لە ئاگر دوور دەخاتەوە ولادەدات).

## ( ٧ ) ( فەزلی بەڕۆژو بوون لە ڕۆژی عەرەفەدا )

(٤٤٩) ( هـ ) عن قتادة بن النعمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَامَ يَوْمَ عَرَفَةَ غَفَرَ الله لَهُ سَنَتَيْنِ: سَنَةً أَمَامَهُ وَ سَنَةً خَلْفَهُ ﴾

قتادەی کوڕی النعمان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژو بێت، ئەوا خوای گەورە دوو ساڵی لێ دەبووڕێت: ساڵێکی پێشەوەی و ساڵێکی دواوەی ).

## ( ٨ ) ( ئەو کەسەی لە بیری بچێت و لە کاتی ڕۆژودا شت بخوات )

(٤٥٠) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ نَاسِياً فَلا يُفْطِرْ فَإِنَّما هُوَ رِزْقٌ رَزَقَهُ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٧٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك بە لە بیر چوون بخوات یان بخواتەوە با ڕۆژوەکەی نەشکێنێت چونکە ئەوە رزقێك بووە خوای گەورە پێی داوە ).

**(٤٥١) ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): « مَنْ نَسي وَهُوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ أَوْ شَرِب فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فإنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَ سَقَاهُ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٦٩) في صحيح الجامع**

ابوهريره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك بەڕۆژو بوو لە بیری چوو ، شتێکی خوارد یان خواردەوە، با ڕۆژوەکەی تەواو بکات ، چونکە ئەوە خوای گەورە ئەو خواردن یان خواردنەوەیەی دەرخوارد داوە ).

# ( بەشی: حەجی ماڵی خوا )

## ( ١ ) ( فەزیلەتی حەج )

**(٤٥٢) ( البزار ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْحُجَّاجُ وَ الْعُمَّارُ وَفْدُ اللهِ دَعَاهُمْ فَأَجَابُوهُ و سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣١٦٩ ) في صحيح الجامع**

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( حەج کاران و عومرە کاران وەفدی خوان و بانگهێشتی کردوون و ئەوانیش بەدەم بانگەوازەکەیەوە چوون، وە لە خوا پاڕاونەتەوە و داوایان لێ کردووە ئەویش پێی بەخشیوون ).

**(٤٥٣) ( هـ حب ) عن ابن عمر عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ الغَازِي فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ وَ الحاجُّ وَ الْمُعْتَمِرُ وَفْدُ اللهِ دَعَاهُمْ فَأَجَابُوهُ وَ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤١٦٦ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( غەزاکار لە پێناوی خوادا و حاجی و عومرەکار وەفدی خوان و بانگهێشتی کردوون و ئەوانیش بەدەم بانگەوازەکەیەوە چوون، وە لە خوا پاڕاونەتەوە و داوایان لێ کردووە ئەویش پێی بەخشیوون).

**(٤٥٤) ( هب ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا تَرْفَعُ إِبْلُ الحَاجِ رِجْلاً وَلا تَضَعُ يَداً إِلَّا كَتَبَ اللهُ تَعالَى لَهُ بِهَا حَسَنَةً أَوْ مَحا عَنْهُ سَيِّئَةً أَوْ رَفَعَهُ بِها دَرَجَةً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٩٤ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لەگەڵ بەرزکردنەوەی پێیەکی حوشتری حاجیەوان یان دانانی دەستێکی حوشترەکە خوای گەورە چاکەیەکی بۆ دەنوسێت یان تاوانێکی بۆ دەسڕێتەوە یان پلەیەکی بۆ بەرز دەکاتەوە ).

**(٤٥٥) ( ن حب ك ) عن أبي هريرة يقول: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَفْدُ اللهِ ثَلاثَةٌ: الْغَازِي وَ الْحَاجّ وَ الْمُعْتَمِرُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١٠٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( وەفدی خوا سیانن: موجاهیدێك کە غەزا دەکات وە ئەوەی بۆ حەج دەچێت وە ئەوەی بۆ عومرە دەچێت ).

## ( ٢ ) ( فەزیلەتی مەکە )

(٤٥٦) ( حم ق د ) عن أبي هريرة قال: لَمَا فتح اللهُ عز وجل على رسول الله(ﷺ) مكة، قام في الناس فحمد الله وأثنى عليه ثم قال: ﴿ إنَّ الله حبس عنْ مكةَ الفيلَ و سلطَ عليها رسُولَهُ و المُؤمنين، وإنها لنْ تحلَّ لأحد كانَ قبْلي، و إنها أُحلتْ لي ساعةً من نهار، وإنهالنْ تحلُّ لأحد بعْدي، فلا يُنفَّرُ صيْدُها، ولا يُخْتلى شوْكُها، ولاتحلُّ ساقطتُها إلا لمُنْشد، و منْ قُتلَ لهُ قتيلٌ فهو بخير النظرَيْن، إما أنْ يُفدى وإما أنْ يُقتلْ ﴾، فقالَ العبَاسُ: إلا الإذخر، يارسُول الله فإنا نجْعلُهُ في قُبُورنا وبُيُوتنا، فقال رسُولُ الله(ﷺ): ﴿ إلا الإذْخر ﴾، فقام أبُو شـاه، رجُلٌ منْ أهْل اليمن، فقالَ اكتُبُوا لي يا رسُولَ الله(ﷺ)، فقال رسُولُ الله(ﷺ): ﴿ اكتُبُوا لأبي شاه ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: کاتێك کە خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) خۆی فەتحی مەکەی کرد، لە ناو خەڵکەکەدا هەستا سوپاسی خوای کرد و ستایشی لەسەر دا، پاشان فەرمووی: (خوای گەورە شاری مەککەی لە فیلەکە پاراست و بەندی کرد کە نەیەتە ناوی، وە پێغەمبەرەکەی و بڕوادارانی زاڵ کرد بەسەر شارەکەدا، وە ئەم شارە بۆ هیچ کەسێکی پێش من حەڵاڵ نەکراوە وە تەنها ساتێکی ڕۆژیش بۆ من حەڵاڵ کرا، وە لە دوای من بۆ هیچ کەسێکی تر حەڵاڵ نەکراوە و ڕێگەی پێ نەدراوە، جا نابێت گیانلەبەری راوی تێدا بترسێنرێت. وە نابێت گژو گیا و دڕك و داڵی تێدا بڕنرێت، وە بەری داری هەڵوەریوی تێدا حەڵاڵ نییە تەنها بۆ کەسێك نەبێت کە وێڵە بە دوای ئاژەڵێکیدا کە لێی بزر بووە، وە هەر کەسێك کوژراوێکی لێ بکوژرێت. ئەوا سەرپشکە یەکێك لە باشترین ئەم دوو ڕێگە چارەیە هەڵبژێرێت ،یان فیدیەی بۆ بدرێت یان ئەوەتا بکوژرێتەوە )، (عباس)ی مامی پێغەمبەریش(ﷺ) ووتی: جگە لە گیای (إذخر) - کە گیایەکی بۆن خۆشە - ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چونکە ئێمە ئەو گیانە دەخەینە گۆڕەکانمانەوە و بۆ ماڵەکانیشمان بەکاری دەهێنین. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (جگە لە (إذخر) - واتە ڕێگەی دا - بەڕنینی ئەو ڕووەکە، پاشان (ابو شاه) کە پیاوێك بوو لە خەڵکی یەمەن هەستا و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بۆ من بنوسن پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: ( ئەمە بۆ ابو شاه بنوسن ) ).

(٤٥٧) ( خ ) عن ابن عباس أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ هذه مكةُ حرمَها الله عزوجلَ يوم خلقَ السَّموات و الأرْضَ لمْ تحلَّ لأحد قبْلي و لا لأحد بعْدي و إنما أُحلتْ لي ساعةً منْ نهار وهي ساعتي هذه حرامٌ بحرام الله إلى يوْم القيامة لايُخْتلى خلالُها ولا يُعْضدُ شجرُها ولا يُنفَّرُ صيْدُها ولا تحلُّ لُقطتُها إلا لمُنشد ﴾، فقام العبَاسُ كان رجُلاً مُجرباً فقالَ: إلا الاذخر فإنهُ لبُيُوتنا و قُبُورنا، فقال: ﴿ إلا الاذْخرَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٥١ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەمە مەککەیە خوای گەورە لەو ڕۆژەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە ئەم شارەی حەرام کردووە. بۆ کەسی پێش من حەڵاڵ نەکراوە و بۆ

کەسی دوای منیش حەڵاڵ نییە، وە تەنها ساتێك لە ڕۆژدا بۆ من حەڵاڵ کراوە کە ئەویش ئەم ساتەیە ،ئیتر حەرامە بە حەرامکردنی خوا هەتا ڕۆژی قیامەت، نابێت گژو گیای بڕنرێت و داری ببڕدرێت،وە نابێت گیانلەبەری ڕاوی تێدا بترسێنرێت، وە بەرو بومی هەڵوەریوی تێدا حەڵاڵ نییە تەنها بۆ کەسێك نەبێت کە وێڵە بە دوای ئاژەڵێکیدا کە لێی بزر بووە ) ئینجا عەباس کە پیاوێکی دونیا دیدەبوو وتی: تەنها ڕووەکی (إذخر) نەبێت چونکە ئەو بۆ ماڵەکانمان و گۆڕەکانمان بەکاری دەهێنین. ئەویش فەرمووی:(تەنها اذخر نەبێت)-واتە ڕنینی - ئەو گیایەی پێ داین.

(٤٥٨) ( حم ق ت ن ) عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْعَدَوِيِّ أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ وَهُوَ يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ: ائْذَنْ لِي أَيُّهَا الأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلاً قَامَ بِهِ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي وَ أَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ، إِنَّهُ حَمِدَ اللهَ وَ أَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ:﴿ إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللهُ وَ لَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ وَلاَ يَحِلُّ لامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ فِيهَا دَماً أَوْ يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ بِقِتَالِ رَسُولِ اللهِ( ﷺ) فِيهَا فَقُولُوا لَهُ: إِنَّ اللهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ( ﷺ) وَ لَمْ يَأْذَنْ لَكَ وَ إِنَّمَا أَذِنَ لِي فِيهِ سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ وَقَدْ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالأَمْسِ وَ لِيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ ﴾ . فقيل لأبي شريح: ماقال لك عمرو؟ قال أنا اعلم منك بذالك يا أبا شريح، إن الحرم لايعيذ عاصيا ولا فرا بدم ولا فار بخربة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢١٩٧ ) في صحيح الجامع

(ابو شریح العدوی) دەڵێ: کاتێك کە (عمروی کوڕی سعید) سەرقاڵی لەشکر کێشی بوو بۆ سەر شاری مەککە پێم ووت: (ئەی جەنابی ئەمیر ڕێگەم بدە فەرموودەیەکت بۆ بڵێم کە لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەستا و بۆ خەڵکەکەی فەرموو، گوێکانم بیستیان و دڵم وەری گرت و بە چاوەکانیشم بینیم کاتێك کە فەرمایشتەکەی فەرموو، ئەوە بوو سوپاسی خوای کرد و ستایشی لەسەر دا و پاشان فەرمووی: ( بە ڕاستی مەکە خوا حەرامی کردووە نەك خەڵك حەرامیان کردبێت، بۆیە بۆ هیچ مرۆڤێك کە باوەڕی بە خوا و بەرۆژی دوایی هەیە حەڵاڵ نییەکە خوێنێکی تێدا بڕێژێت یان دارێکی تێدا ببڕێت، وە ئەگەر یەکێك ویستی شەڕکردنی پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا بکات بە بیانووی ڕووخسەت بۆ خۆی ئەواپێی بڵێن: خوای گەورە ڕێگەی داوە بە پێغەمبەرەکەی خۆی(ﷺ) وە ڕێگەی نەداوە بە تۆ، وە منیش بۆ تەنها ساتێکی ڕۆژ ڕێگەی پێ داوم. وە ئیتر ئەمڕۆ حورمەتی شارەکە هەروەك حورمەتەکەی دوێنێی گەڕاوەتەوە بۆی، وە با ئەوەی کە ئامادەیە بەوە بگەیەنێت کە لێرە نییە و ئامادە نییە ).

ئینجا بە (ابو شریح) وترا: ئەی باشە عمرو چی وەڵام دایتەوە؟ ووتی: پێی ووتم: من لە تۆ باشتر ئەوە دەزانم ئەی (ابا شریح)، بەڵام ئەو حەرەمە داڵدەی نەیاخی بووان و نە هەڵهاتوو بە هۆی خوێنەوە و نەهەڵهاتوو بە هۆی دزییەوە نادات.

## ( ٣ ) ( فەزیلەتی مەدینە )

(٤٥٩) ( حم م ) عامر بن سعد عن ابيه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّي أُحَرّمُ مَابَيْنَ لابَتَي الْمَدِينَةَ، أَنْ يُقْطَعَ عضَاهُهَا أَوْ يُقْتَلَ صَيْدُهَا ﴾، و قال: ﴿ الْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُون، لايَدَعُهَا أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا إلّا أَبْدَلَ الله فِيهَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ منْهُ، وَ لا يَثْبُتُ أَحَدٌ عَلى لأْوائِهَا و جَهْدِهَا إلّا كُنْتُ لَهُ شَفيعاً أَوْ شَهيداً يَوْمَ القِيَامَةِ وَلا يُرِيدُ أَحَدٌ أَهْلَ الْمَدِينَةِ بِسُوءٍ إلّا أَذَابَهُ الله في النّار ذَوْبَ الرّصَاصِ، أَوْ ذَوْبَ الْمِلْحِ فِي الْماءِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٤٥ ) في صحيح الجامع

عامری کوڕی سعد لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من ئەوەی لە نێوان دوو دەروازەی شاری مەدینەدایە حەرامی دەکەم کە داری دڕکاوی تێدا ببڕێت، یان نێچیری تێدا راو بکرێت )، وە فەرمووی: ( مەدینە بۆ ئەوان باشترە ئەگەر پێ بزانن، وە هەر کەسێك بەجێی بهێڵێت لەبەر ئەوەی بەدڵی نییە ئەوا خوای گەورە کەسێکی لەو باشتری بۆ دەنێرێت، وە هەر کەسێکیش ئارام بگرێت بەسەر کارەسات و ناخۆشییەکانیدا ئەوا لە رۆژی قیامەتدا من بۆی دەبمە شەفاعەتکار یان شایەتی بۆ دەدەم وە هەر کەسێکیش بیەوێت خراپە بەرامبەر خەڵکی مەدینە بکات ئەوا خوا وەك توانەوەی قورقوشم لە ئاگردا دەیتوێنێتەوە، یان وەك توانەوەی خوێ لە ئاودا ).

(٤٦٠) ( حم م ن ) عن جابر بن سمرة قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ نَّ الله تَعَالىَ سَمّىَ الْمَدِينَةَ طَابَةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٧٥ ) في صحيح الجامع

جابری کوڕی سمرة دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستومە دەیفەرموو: ( خوای گەورە مەدینەی ناو ناوە – طابة – واتە پاك و باش ).

## ( ٤ ) ( دەنگ بەرزکردنەوە بە تەلبیە کردن )

(٤٦١) ( حم هـ حب ك ) عن زيد بن خالد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَتَاني جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السّلام فَقَالَ لِي: إنّ الله يَأْمُرُكَ أَنْ تَأْمُرَ أَصْحَابَكَ أَنْ يَرْفَعُوا أَصْواتَهُمْ بِالتّلْبِيَةِ فَإنّها مِنْ شَعَائِرِ الْحَجِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧ ) في صحيح الجامع

زیدی کوڕی خالد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( جبریل سەلامی خوای لەسەر بێت هات بۆ لام پێی ووتم:خوا فەرمانت پێ دەکات کە فەرمان بە هاوەڵەکانت بکەیت کە دەنگ بەرز بکەنەوە بە تەلبیە لێدان چونکە ئەوە یەکێکە لە دروشمەکانی حەج).

## ( ٥ ) ( فەزلی تەواف کردن )

**(٤٦٢) ( ت ن ك ) عن ابن عمر: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَنْ طَافَ بِهَذا الْبَيْتِ أُسْبُوعاً فأَحْصاهُ كَانَ كَعتْقِ رَقَبَةٍ، وسمعته يقول: ﴿لا يَضَعُ قَدماً وَلا يَرْفَعُ أُخْرى إلَّا حطَّ الله عَنْهُ بِها خَطِيئَةً وَ كَتَبَ لَهُ بِهَا حَسَنَةً ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٧٢ ) في صحيح الجامع**

**إبن عمر دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( هەر کەسێك هەفتەیەك تەوافی ئەمماڵی بەیتە بکات و بیژمێرێت، وەك ئەوە وایە کە گەردنێکی ئازاد کردبێت لە بەندایەتی ) وە گوێم لێبوو دەیفەرموو: ( لەگەڵ دانانی هەر پێیەك و بەرزکردنەوەی ئەوی تریاندا، خوا تاوانی لێ هەڵدەوەرێنێت و چاکەی بۆ پێ دەنوسێت ).**

## ( ٦ ) ( فەزلیەتی روکن و مەقام )

**(٤٦٣) ( حم ت حب ك ) عن عبدالله بن عمرو يقول: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ إنَّ الرُّكْن وَ الْمَقَامَ يَاقُوتَتَانِ مِنْ يَاقُوتِ الْجَنَّةِ طَمَسَ الله تعالى نُورَهُمَا وَلَوْ لَمْ يَطمس نورهُمَا لأَضاءتَا مَابَيْنَ الْمَشْرِقِ وَ الْمَغْرِبِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦٣٣ ) في صحيح الجامع**

**عبدالله ی کوڕی عمر دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( روکن و مەقام دوو یاقوتن لە یاقوتەکانی بەهەشت، خوای گەورە نور و روناکی هەردووکیانی کپ کردووە و داپۆشیوە، وە ئەگەر نور و روناکیان کپ و داپۆشراو نەکرایە ئەوا نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان روناك دەکردەوە).**

## ( ٧ ) ( فەزیلەتی بەردە رەشەکە )

**(٤٦٤) ( ت ) عن ابن عباس قال:قال رسول الله(ﷺ) في الحَجَر: ﴿ و الله لَيَبْعَثَنَّهُ الله يَوْمَ الْقِيَامَةِ - يَعْنِي الحَجَرَ - لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا وَ لِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ يَشْهَدُ عَلَى مَنْ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٠٩٧ ) في صحيح الجامع**

**إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو بەردە فەرمووی: ( سوێند بێت بە خوا رۆژی قیامەت خوا زیندووی دەکاتەوە دوو چاوی هەیە کە پێیان دەبینێت، وە زمانێکی هەیە قسەی پێ دەکات، شایەتی بۆ ئەو کەسانە دەدات کە بە حەق و راستی دەستیان لێداوە).**

## ( ٨ ) ( فەزڵی ڕۆژی عەرەفە )

(٤٦٥) ( طب ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَمَا خُرُوجُكَ مِنْ بَيْتِكَ تَؤُمّ الْبَيْتَ الْحَرام فَإِنَّ لَكَ بِكُلِ وَطَأَة تَطَؤُها راحلَتُكَ يَكْتُب اللهُ لَكَ بِها حَسَنَةً وَ يَمْحُو عَنْكَ بِهَا سَيِئَةً، وَ أَمَا وُقُوفُكَ بِعَرَفَة فَإِنَّ الله عَزَّوَجَلَ يَنْزِلُ إلى السَماءِ الدُّنْيا فَيُبَاهي بِهِمُ المَلائكَةَ فَيَقُولُ: هَؤُلاءِ عِبَادي جاءُوني شُعثاً غُبْراً مِنْ كُل فَجٍ عَميقٍ يَرْجُون رَحْمَتي وَ يَخافُونَ عَذابي وَ لَمْ يَروني فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْني؟ فَلَوْ كانَ عَلَيْكَ مِثْلَ رَمْلِ عالجٍ أَوْ مِثْلَ أيام الدُّنْيا أَوْ مِثْل قَطر السَماءِ ذُنُوباً غَسَلَها الله عَنْكَ، وَ أَمَا رَميكَ الجِمار فَإِنَهُ مَدْخُورٌ لَكَ، وَ أَمَا حَلقكَ رَأْسَكَ فَإِنَّ لَكَ بِكُلِ شَعرة تَسْقُط حَسَنَة فَإذا طُفتَ بِالْبَيْتِ خَرَجْتَ مِنْ ذُنُوبِكَ كَيَوْمِ وَلَدَتْكَ أُمُكَ ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٣٦٠ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سەبارەت بە دەرچوونت لە ماڵەوە کە ڕووت لە بەیتی حەرام کردبێت ئەوا بە هەموو هەنگاوێك کە وڵاخەکەت دەینێت، خوای گەورە چاکەیەکت بۆ پێ دەنوسێت، وە خراپەیەکت لەسەر دەسڕێتەوە، وە ئینجا وەستانت لە عەرەفەدا، ئەوا خوای گەورە دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و لە ناو فریشتەکاندا بە سەریاندا هەڵدەدات و دەفەرمووێت:ئەوانە بەندەی منن بە قژ و پرچ ئاڵۆزکاوی و تۆزاوییەوە هاتوون بۆ لام لە گشت کەلێنێکی قوڵ و شوێنێکی دوورەوە، ئومێدی ڕەحمەت و بەخششی من دەکەن وە لە ئەشکەنجەی من دەترسن وە هێشتا منیشیان نەدیوە، ئەی چۆن دەبوو ئەگەر بیانبینیمایە؟ جا ئەگەر هێندەی لمی بە کۆمەڵی بیابان گوناهت لەسەر بێت یان هێندەی ڕۆژەکانی دونیا یان هێندەی تنۆکە بارانی ئاسمان ئەوا خوا دەیشواتەوە و لێتی دەکاتەوە،وە ئەو بەردەشی دەیهاویت بۆ ڕەجمی شەیتان، ئەوە بۆت هەڵگیراوە و پارێزراوە، وە دەربارەی سەر تاشینەکەشت، ئەوا بە هەر تاڵە موویەك کە دەکەوێتەخوارەوە چاکەیەکت بۆ دەنوسرێت، ئینجا کە تەوافت کرد بە دەوری ماڵی بەیتدا ئەوا لە گوناهەکانت دێیتە دەرەوە و پاك دەبیتەوە هەر وەك ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لەدایك بوویت).

(٤٦٦) ( هـ ) عن بلال بن رباح: أن النبي(ﷺ) قال له: غداةَ جمْعٍ: ﴿يَابِلال أسْكِت النَّاس ( أَوْ أَنْصِت النَّاس )﴾ ثُمَ قال: ﴿ إِنَّ الله تَطاوَلَ عَلَيْكُمْ في جَمْعِكُمْ هَذَا فَوَهَبَ مُسيئَكُمْ لِمُحْسنِكُمْ وَ أَعْطَى مُحْسِنَكُمْ مَا سَأَلَ ادْفَعُوا بِاسْمِ الله ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٣٤ ) في صحيح الجامع

بلالی کوڕی ڕەباح دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی موسڵماناندا–واتە لە عەرەفەدا–: ( ئەی بیلال ئەو خەڵکە بێدەنگ بکە یا گوێ بگرن، پاشان فەرمووی: خوای گەورە ڕووی ڕەحمەتی کردۆتە ئەم کۆبوونەوەیەتان و خراپە کارانتانی بەخشیوە بە چاکە کارانتان وە ئەوەیشی کە چاکە کارانتن داوایان کردووە خوا داونیەتی و پێی بەخشیون. بەڕێکەون بە ناوی خواوە ).

(٤٦٧) ( حب ك هق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله يُباهي بأهْلِ عَرفات أهْلَ السَماء فَيَقُولُ لَهُمْ: انْظُرُوا إلىَ عبادي هَؤُلاء جاءُوني شُعْثاً غُبراً ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە لەلای خەڵکی ئاسمان بەسەر ئەهلی عەرەفەدا هەڵدەدات و هەڵیاندەکێشێت، پێیان دەڵێ: سەیری بەندەکانی من بکەن ئەوانە بە سەر و بەرگی خۆڵاوی‌یەوە هاتوون بۆ لای من ).

(٤٦٨) ( حم طب ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله تعالى يُباهي مَلائِكَتَهُ عَشيّةَ عَرَفَةَ بأهْلِ عَرَفَةَ يَقُولُ: انْظُرُوا إلىَ عبادي هَؤُلاء جاءُوني شُعثاً غُبراً ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٦٨) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە لە ئێوارەی عەرەفەدا لە لای فریشتەکانی خۆی بەسەر ئەهلی عەرەفەدا هەڵدەدات و دەفەرموێت: سەیری بەندەکانی من بکەن ئەوانە بە سەر و بەرگی قوڕاوییەوە هاتوون بۆ لای من ).

(٤٦٩) ( م ن هـ ) عن عائشة أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ مَامِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أنْ يُعْتِقَ الله فيهِ عَبْداً أوْ أمَةً مِنَ النّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ وَ إنّهُ لَيَدْنُو ثُمّ يُبَاهي بِهِمُ المَلائِكَةَ فَيَقُولُ: مَاذا أرادَ هَؤُلاءِ؟ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٩٣) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ ڕۆژێك نییە بە هێندەی ڕۆژی عەرەفە خوای گەورە بەندەکانی خۆی لە ژن و لە پیاو لە ئاگر ئازاد بکات، وە ئەو نزیك دەبێتەوە و پاشان لە ناو فریشتەکانی‌دا بەسەریاندا هەڵدەدات و دەفەرموێت: ئەوانە چییان دەوێت و داوای چی دەکەن ).

## (٩) ( کەسێك نەزر بکات بە پێ بچێت بۆ حەج )

(٤٧٠) ( حم د ن هـ ) عن عقبة بن عامر ( د ك ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مُرْ أخْتَكَ فَلْتَرْكَبْ وَ لْتَخْتَمِرْ وَلْتَصُمْ ثَلاثَةَ أيّامٍ فَإنّ الله عَنْ تَعْذيبِ أُخْتِكَ نَفْسَهَا لَغَنِيٌّ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٨٦٠) في صحيح الجامع

عقبەی کوڕی عامر و إبن عباسەوە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( فەرمان بکە بە خوشکەکەت با بە سواری وڵاخ بڕوات و با سەرپۆش بکات و سەری داپۆشێت و با سێ ڕۆژیش بەڕۆژو بێت، چونکە خوا پێویستی بەوە نییە خۆی ئەشکەنجەو ئازار بدات ).

### ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە:

هۆکاری ووتنی ئەم فەرموودەیە ئەوەبوو کە ئافرەتێکی موسڵمان نەزری کردبوو کە بە پێی پەتی و سەری ڕوتی بچێت بۆ حەج کە بە بۆچوون و تێگەیشتنی خۆی پێی وابوو کە خوا بەم جۆرە زیاتری پێ

خۆشە چونکە ئەمە ئەوپەڕی زەلیلی و ملکەچی نواندنی تێدایە بۆ خوا، بەڵام پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) زوو بە زوو هەواڵی بۆ دەنێرێت کە فەرمانی پێ بکەن کاری وا نەکات چونکە نەزری لەو جۆرە ناشەرعی و نا دروستە، چونکە خوای گەورە هیچ پێویستی بەوە نییە کە ئافرەتێکی موسڵمان یان پیاوێکی موسڵمان بەو جۆرە خۆیان توشی ئەشکەنجەو ئازار بکەن و بە پێچەوانەوە خوای بەخشندە پێی خۆشە کارئاسانی لەسەر بەندەکانی خۆی بکات نەك سەغڵەت کردن و زەحمەتدان و بە هەلاکەت بردنیان،وە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو راستیەشمان بۆ روون دەکاتەوە کە هەر کەسێك نەزر بکات کە کارێك ئەنجام بکات کە کارەکە نا شەرعی بوو، با نەزرەکە ئەنجام نەدات و لە بری ئەوە کەفارەتی سوێند شکاندن بدات، هەر بۆیە جواب بۆ ئەو ئافرەتە موسڵمانە دەنێرێت کە با بە سواری وڵاخ حەجەکەی بکات و سەریشی وەك هەموو ئافرەتێکی موسڵمان دابپۆشێت و لە بری شکاندنی نەزرەکەی با سێ رۆژ بەڕۆژو بێت.

## ( ١٠ ) ( فەزیلەتی رۆژی قوربانی کردن واتە رۆژی یەکەمی جەژنی قوربان )

**(٤٧١) ( حم د ك ) عن عبدالله بن قرط عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ إنّ أَعْظَمَ الأَيَامِ عِنْدَ اللهِ يَوْمُ النَّحْرِ ثُـمَّ يَوْمُ الْقَرِّ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٠٦٤ ) في صحيح الجامع**

عبدالله ی کوڕی قُرط دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( گەورەترینی رۆژەکان لە لای خوا رۆژی قوربانی کردنە، پاشان رۆژی حەوانەوەی حاجییەکان – واتە دووەم رۆژی جەژنی قوربان ).

## ( ١١ ) ( رێگە دان بە کوشتنی دووپشك لەماڵی بەیتدا )

**(٤٧٢) ( هـ ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْعَقْرَبَ مَا تَدَعُ الْمُصَلِّي وَ غَيْرَ الْمُصَلِّي، اقْتُلُوهَا فِي الْحَلِّ وَ الْحَرَمِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٠٩٧ ) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( نەفرەتی خوا لە دووپشك بێت، واز لە نوێژ خوێند و غەیری نوێژ خوێند ناهێنێت، بیکوژن لە دەرەوەی حەرەم و ناوەوەی حەرەمیشدا ).

## ( ١٢ ) ( دەست پێ کردن بە سەفا لە پێش مەروەدا لە کاتی تەواف کردندا )

**(٤٧٣) ( حم ٣ ) عن جابر قال: أَنّ النَّبِيَّ(ﷺ) حِيْنَ قَدِمَ مَكَّةَ طَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعاً فَقَرَأَ: ﴿ واتَّخذُوا من مقام إبراهيم مصلى ﴾، فَصَلَى خَلْفَ الْمَقَامِ ثُـمَّ أَتَى الْحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ ثُـمَّ قَالَ: ﴿ نبدأ بما بدأ الله به ، فبدأ بالصَّفا وَ قَرأ: ﴿ إنَّ الصفا والمروة من شعائر الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧٣٥ ) في صحيح الجامع**

لە جابرەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کە هاتە مەککە حەوت جار تەوافی بە دەوری ماڵی بەیتدا کردو ئەم ئایەتەی خوێند: (وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى)، – واتە: مەقامی ابراهیم بکەنە شوێنی نوێژ کردن

– ئەویش لە پشت مەقامەکەیەوە نوێژی کرد، پاشان هاتە لای بەردە رەشەکەو دەستی لێدا پاشان فەرمووی: بەوە دەست پێ دەکەین کە لە پێشدا خوای گەورە ناوی هێناوە، ئینجا دەستی کرد بە (سەفا) و ئەم ئایەتەشی خوێندەوە ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ – واتە سەفا و مەروە لە دروشمەکانی خوان – واتە سەفاکەی پێش مەروەکە خست چونکە لە ئایەتەکەدا سەفا لە پێش مەروەدا هاتووە).

## ( ١٣ ) ( فەزلی خێرا رۆشتنی نێوان سەفا ومەروە )

(٤٧٤) ( طب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَيْكُمْ السَّعْيَ فَاسْعَوا ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٩٨ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە ئەو خیرا رۆشتنەی لەسەر نووسیون – فەرزی کردووە – جا ئێوەش ئەنجامی بدەن).

(٤٧٥) ( حم ) عن حبيبة بنت أبي تجراة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اسْعَوْا فَإِنَّ اللهَ قَدْ كَتَبَ عَلَيْكُمُ السَّعيَ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٩٦٨ ) في صحيح الجامع

حبيبة کچی ابی تجراە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەو خێرا رۆشتنە ئەنجام بدەن چونکە خوای گەورە ئەو خێرا رۆشتنەی لەسەر نووسیون و فەرزی کردووە ).مەبەست پێی خێرا رۆشتن یان نیمچە راکردنی نێوان سەفاو مەروەیە .

## ( ١٤ ) ( حەج کردن لە بری کەسێکی تر )

(٤٧٦) ( خ ) عن ابن عباس قال: أَنَّ امْرَأَةً نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ فَمَاتَتْ فَأَتَى أَخُوهَا النَّبِيَّ(ﷺ) فَسَأَلَهُ عَنْ ذلكَ فَقَالَ: ﴿ أَرَأَيْتَ لَوْكَانَ عَلَىَ أُخْتِكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟ ﴾ ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ﴿ فَاقْضُوا اللهَ فَهُوَ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ ﴾ . واللفظ للنسائي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١٨٠ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: ( ئافرەتێك نەزری کردبوو کە حەج بکات بەڵام پێش ئەوە مرد، ئینجا براکەی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەوە، ئەویش فەرمووی: ( باشە ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەر بووایە، ئایا قەرزەکەت بۆ ئەدایەوە؟ ووتی: بەڵێ. فەرمووی: ( دە ئەوەش بدەنەوە کە تایبەتە بە خوا چونکە ئەوە لە پێشترە بدرێتەوە و ئەنجام بدرێت ).

## ( ١٥ ) ( حەجیماڵئاوایی )

(٤٧٧) ( م د ن ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَ أَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَلا إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ

و دماءُ الجَاهلِيّةِ مَوْضُوعةٌ، وَ أَوّلُ دمٍ أَضَعُهُ منْ دمائِنَا﴾، قال عُثمان:﴿ دمُ ابْنِ رَبِيعةَ، و قال سُليْمانُ: ﴿دَمُ رَبِيعةَ بنِ الحَارِثِ بنْ عَبْدِ المُطَّلِبِ﴾، و قال بعْضُ هؤلاء: كان مُسْتَرضعاً منْ بني سعْد فقَتَلتْهُ هُذيْلٌ، ﴿و رِبَا الجَاهِلِيّةِ مَوْضُوعٌ، وَ أَوَّلُ رِباً أَضَعُ منْ رِبَانَا رِبَا عبّاس بنْ عبْد المُطّلب فإنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلّهُ، فاتّقُوا اللهَ في النّسَاءِ فإنّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنّ بِأَمَانَةِ اللهِ وَ اسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجهُنّ بكلمةِ اللهِ و إنْ لكُمْ عليْهِنّ أنْ لا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أحداً تكْرَهُونَهُ فإنْ فعلْنَ فاضْرِبُوهُنّ ضَرْباً غَيْرَ مُبَرِّحٍ و لهُنّ عليْكُمْ رِزْقُهُنّ و كسْوَتُهُنّ بِالمَعْرُوفِ، و إنّي قدْ تَرَكْتُ فيكُمْ مالَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ كتَابَ اللهِ و أَنْتُمْ مَسْؤُولُون عنّي فَما أَنْتُمْ قَائِلُون؟﴾ قالُوا: نَشْهَدُ أنّكَ قدْ بلّغْتَ و أدّيْتَ و نصحْتَ. ثُمّ قال بإصْبعه السّبّابَةِ يَرْفَعُهَا إلى السّماءِ وَيَنْكُتُهَا إلى النّاسِ: ﴿اللّهُمّ اشْهدْ، اللّهُمّ اشْهدْ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٦٨) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بەڕاستی خوێن و ماڵتان لەسەر یەك حەرامە هەر وەك حورمەتی ئەم رۆژەتان لەم مانگەتاندا لەم شارەتاندا، جا بەڕاستی هەموو شتێك لە كار و كردەوەی سەردەمی نەفامی خراوەتە ژێر هەردوو پێمەوە، وە خوێنەكانی سەر دەمی نەفامیش هەمووی كەوتووە و وەلانراوە، وە یەكەم خوێنێكیش كە دەیخەم و دەستی لێ هەڵدەگرم خوێنەكانی خۆمانە. - عثمان وتی: (خوێنی كوڕی رەبیعە). وە سولەیمان وتی: (خوێنی رەبیعەی كوڕی حارسی كوڕی عبدالمطلب)، وە هەندێكیان وتیان: ئەو كوژراوە لە خێڵی بەنی سعد شیری خواردبوو پەروەردە كرابوو وە خێڵی(هذیل) كوشتبویان – ( وە سوو ( ربا ) ی سەردەمی نەفامیش هەمووی كەوتووەو وەلا نراوە، وە یەكەم سوویەك كەدەیخەم و وەلای دەنێم پارە سووەكانی تایەفەی خۆمانە، سوی عەباسی كوڕی عبدالمطلب هەمووی كەوتووە و وەلا نراوە، وە لە خوا بترسن و پارێزگاربن لە مەسەلەی ئافرەتدا چونكە ئێوە بە ئەمانەتی خوا هێناوتانن ،وە بە وشەی (الله) دامێنیانتان حەڵاڵ كردووە، وە مافی ئێوە بەسەریانەوە ئەوەیە كە كەسێك نەخەنە سەر پێخەفتان كە ئێوە پێتان ناخۆش بێت، وە ئەگەر كاری وایان لێ وەشایەوە ئەوا لێیان بدەن بەڵام لیدانێكی بێ ئازار، وە مافی ئەوانیش بەسەرتانەوە ئەوەیە كە رزق و پۆشاكیان بۆ دابین بكەن بە پێی عورف و چاكە، وە بەڕاستی من شتێكی وام لە ناوتاندا جێ هێشتووە كە ئەگەر دەستی پێوە بگرن ئەوا هەرگیز لەدوای ئەوە ئیتر ئێوە گومڕا و سەرلێشێواو نابن، ئەویش كتێبەكەی خوای گەورەیە، وە ئێوەش پرسیارتان دەربارەی من لێ دەكرێت، جا ئێوە چی دەڵێن؟) -ووتیان:گەواهی دەدەین كە تۆ تەواو تەبلیغت كردووین و پێت گەیاندووین و ئامۆژگاریت كردووین – پاشان ئەویش پەنجەی شایەتومانی بەرز كردەوە بۆ ئاسمان و پاشان دای دەنەواند و ئاماژەی بۆ خەڵكەكە پێدەكرد و دەیفەرموو: (ئەی خوایە بە شایەت بە ئەی خوایە بەشایەت بە ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرموودە پیرۆزە بەشێك بوو لەو وتارەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجی کۆتاییماڵئاواییکردندا بۆ موسڵمانانی ئامادەبووی حەجی ئەوساڵەی فەرموو، کە دوایین حەجی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، وە دوایین ساڵی تەمەنی پیرۆزیشی بوو، وە زیاتر لە سەد هەزاریش لە هاوەڵەکانی ئامادەی ئەو حەجە بوون، کە لە هیچ شوێن و کاتێکی تردا ئەو ژمارە گەورەیە لە هاوەڵان بەو شێوەیە و بە یەك جار کۆنەبووتەوە. هەر بۆیە فەرماییشتە شیرین و بەنرخەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) لە وتارەکەی ئەو ڕۆژەیدا زۆر گشت گیر و گرنگ بوون، چونکە دوا ئامۆژگاری و ڕێنومایی ئەو پێشەوا دڵسۆز و بێ وێنەیە بوو بۆ هاوەڵەکانی بەتایبەت و سەرجەم ئوممەتەکەشی بە گشتی هەتا ڕۆژی دوایی.

## وە گرنگ ترین ئەو خاڵانەیشی کە لەم بەشەی فەرموودەکەیدا هاتووە:

جاڕی کۆتایی و یەکجارەکی بە گوێی موسڵمانەکاندا دا کە ئەم ئوممەتە ئوممەتێکی نوێیە و لە سەر بنەمای نوێ و تازە دامەزراوە و وە هەموو بیر و باوەڕێك و داب و نەریتێکی سەردەمی نەفامی وەلا ناوە و خستۆتە ژێر پێیەوە، وە لە پێش هەموو شتێکدا دەبێت خێڵەکان و عەشیرەتەکان دەست لەو خوێنانە هەڵگرن کە لە سەردەمی نەفامیدا و بە هۆی داب و نەریتی نەفامییەوە لە یەکیان ڕشتووە، وە موسڵمانان دەبێت لاپەڕەیەکی تازە لە نێوان خۆیاندا هەڵبدەنەوە کە بە برایەتی و یەکبوون دێڕەکانی نەخشێنرابێت، نەك بە ڕق و کین و بوغز و دوژمنایەتی سەردەمی نەفامی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەلای ناوە و بنە بڕی کردووە، وە پێغەمبەریش(ﷺ) وەك و دیدەنی هەموو کاتێکی کە فەرمان بە چاکەیەك دەکات یەکەم جار لە خۆیەوە دەست پێ دەکات، هەتا ببێتە سەرمەشق بۆ خەڵکی تر، هەر بۆیە یەکەم جار لەخوێنی ڕژاوی تایەفەکەی خۆیەوە دەست پێ دەکات و وەلای دەنێت و دەستی لێ هەڵدەگرێت کە ئەمەش خوێنی(ربیعە)ی ئامۆزایەتی کە لە سەردەمی نەفامی دا لە لایەن خێڵی ( هذیل ) ـە وە کوژرابوو.

١. پاش خستنی خوێنەکانی سەردەمی نەفامی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئوممەتی ئیسلامە ئاگادار دەکاتەوە کە بە هەموو شێوەیەك خوێن و ماڵیان بە یەك حەرامە، وە لە ژێر هیچ پەردە و پاساوێکدا بۆ هیچ موسڵمانێك نییە خوێن و ماڵی برا موسڵمانەکەی بە حەڵاڵ بزانێت و دەست درێژی بکاتە سەری، چونکە ئەمە گەورەترین کەلێنە کە دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام لێوەی دزە بکەنە ناو ئەم ئوممەتە.

٢. هەر پارە و ماڵێك کە لە سەردەمی نەفامیدا لەسەر بنەمای سوو (ربا) بە قەرز دراوە، دەبێت دەست لەو (سوو)ە هەڵبگیرێت و تەنها بڕە قەرزەکە وەربگیرێتەوە بێ هیچ زیادەیەك، وە لەمەشدا یەکەم جار لە بنەماڵەکەی خۆیەوە دەست پێدەکات و (سوو)ەکەی عەباسی مامی خۆی دەخات و وەلای دەنێت،وە بەمەش لاپەڕەیەکی نوێ لە بواری ئابووری لە ئیسلامدا هەڵدەداتەوە و سیمایەکی تایبەتی خۆی پێ دەبەخشێت کە جیاوازە لە ئابووری سەرجەم سیستمە

نەفامییەکانی جیهان کە هەموویان لەسەر بنەمای (سوو) دامەزراون، چونکە سیستەمی (سوو) تەنها یەك ئاکامی لیّ دەکەویّتەوە کە ئەویش زیاتر دەوڵەمەند کردنی دەوڵەمەندەکان و زیاتر هەژار کردنی هەژارەکانە، کە ئەمیش تەواو پیّچەوانەی بنەماکانی ئیسلامە لە چەسپاندنی دادوەری و یەکسانیدا.

٣. ئینجا پیّغەمبەر(ﷺ) زۆر بە توندی جەخت لەسەر پاراستنی ماف و حورمەت و ریّزی ئافرەتان دەکاتەوە و پیاوانی ئوممەتەکەیشی ئاگادار دەکاتەوە کە لە خوا بترسن هیّز و توانای پیاوەتی خۆیان بەکار نەهیّنن لە ستەم لیّکردنی ئافرەتان و غەدر لیّکردنیان، چونکە ئەو ئافرەتانە بە ئامانەتی خوا هیّنراون و مارە براون، وە لەسەر وشەی خواو بە ناوی خواوە و لەسەر شەرعی خوا حەڵاڵ کراون، وە هەر سوکایەتی پیّکردن و ماف خواردنیّکیان شکاندنی سنوری خوایە و خیانەتە لە ئامانەتی خوا، وە ئافرەت دەبیّت لە ئیسلامدا ریّز و پایەی خۆی پاریّزراوبیّت و نابیّت لە مامەڵە کردن لەگەڵیاندا چاو لەکۆمەڵگا نەفامیەکان بکریّت کە ئافرەت لەلایان تەنها کاڵەیەك و هۆکاریّکی رابواردن و هەوەس بازییە، وەهەموو ماف و ئازادییەکی ئافرەت لەوەدا دەبینین کە ئافرەت رووت بیّت و بەرگی حەیا فڕیّبدات و لە خیّزان دابڕیّت و بکریّتە چەرەسی یانەکانی شەوان و تیاترۆ خانەکان، و بەرگی گۆڤارەکان و شاشەی سینەماکانیان پیّ برازیّنریّتەوە، و وەك هەر کاڵایەکی تر لە جامخانەی نمایشگاکاندا عەرز بکریّت و لەش فرۆشییان پیّوە بکریّت و وەك دەست کیّش هەر رۆژەی لە دەستیّکدا بن و دوایی فڕیّبدریّن، لە پیّناو گیرفان پڕ کردن و تیّرکردنی ئارەزوە نەخۆشەکانی خۆیاندا، کە لەلای هەموو ئاقڵیّکیش ئاشکرایە کە ئەم جۆرە ماف و ئازادییە چۆن شیرازەی خیّزان لیّك دەپچڕیّنیّت و تەنها زەرەیەك لە قەدر و حورمەتی ئافرەت ناهیّڵیّت و منداڵ لە باوکی خۆی بە گومان دەکات و باوك لە منداڵی خۆی بەگومان دەکات و دەیان هەزار هەتیوخانەش فریای داڵدەدان و لەخۆ گرتنی منداڵی زۆڵ ناکەون، ئەمەش جگە لە خستنەوەی چەندین نەخۆشی کوشندەی وەك ئایدز و زوهری و سفلس و سیلان کە ئیّستا ملیۆنەها کەس لەو کۆمەڵگایانەدا پیّوەی دەناڵیّنن و ملیۆنەهای تریش بوونەتە قوربانی ئەو نەخۆشیانە کە هەموویان لە ئاکامی ئەو فەساد و بەرەڵاییەوە دوچاری ئەو کۆمەڵگایانە دەبن، بەڵیّ لەمەسەلەی ئافرەتیشدا وەکو هەموو مەسەلەکانی تر، ئیسلامی پیرۆز لاپەڕەیەکی نوێی هەڵداوەتەوەوە و سیستەمیّکی نوێی بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەخشیوە کەتیایدا ئافرەت و پیاوی کردوە بە تەواوکەری یەکتری و ماف و ئەرکی هەریەکەشیانی بەرامبەر بەوی تر بەتەواوەتی دیاری کردووە و بەهەڕەشەیەکی خوایی دەستی پیاوی بەستوە کە هیچ زوڵم و غەدریّك لە ئافرەت نەکات و مافی پیّشیّل نەکات. بەڵکو لەوەش زیاتر پیّغەمبەر(ﷺ) باشترین پیاوی ئوممەتەکەی ئەو پیاوە دادەنیّت کە لە هەموو پیاوانی تر باشترە بۆ خیّزانەکەی ( **خَيْرُكُم خَيْرُكُم لِأهلِهِ** ) ،واتە: باشترین کەستان ئەو کەسەیە کەلە هەمووتان باشترە بۆ خیّزانەکەی

٤. ئنجا پێغەمەر(ﷺ) مافی پیاو بەسەر ئافرەتەوە وە مافی ئافرەتیش بەسەر پیاوەوە زۆر بە شێوەیەکی سادە و روون و ئاشکرا بەیان دەکات کە لەگەڵ فیترەت و ناخی پیاو و ژنیشدا دەگونجێت ،ئەوەتا دەفەرموێت: مافی پیاو بەسەر ئافرەتەوە ئەوەیە کە ئەو ئافرەتە رێگە نەدات و نەهێڵێت کە یەکێك پیاوەکەی پێ ناخۆشە و رقی لێیەتی بێتە ماڵەکەیەوەو بچێتە سەر پێخەفی، بەواتایەکی تر ئافرەتێکی داوێن پاك بێت و دەرگای خیانەت کردن لەمێردەکەی بۆ هیچ کەسێك نەکاتەوە، وەتاکە شوێنێك کە ئیسلام رێگەی داوە کە پیاو لە ژنەکەی خۆی بدات شکاندنی ئەم خاڵەیە لەلایەن ئافرەتەکەوە ئەویش بە مەرجێك کە لێدانەکە تەنها بۆ بە ئاگاهێنانەوەی ئافرەتەکە بێت نەك ئازاری بدات و عەیب باری بکات.

وە مافی ئافرەتیش بەسەر پیاوەوە ئەوەیە کە ئەو پیاوە کەم تەرخەمی نەکات لە دابین کردنی پێداویستییەکانی ئافرەتەکە لە خۆراك و پۆشاك بەپێی ئەو توانایەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە، بەوەش مسۆگەر کردن و زامن کردنی پێداویستییەکانی ژیانی ئافرەتەکە دەخاتە ئەستۆی پیاوەکە .وەلەئایەت و فەرموودە پیرۆزەکانی تریشدا چەندین ماف و ئەرکی ژن و مێرد بەرامبەر یەکتر دەست نیشان کراون بە درێژیش باس لە شێوازی مامەڵە کردنیان لەگەڵ یەکتردا کراوە بەجۆرێك کە هەموو لایەنەکانی ژیانی خێزانی گرتۆتەوە لە خۆشی و ناخۆشیدا کە ئەگەر هەر موسڵمانێك پێیانەوە پابەند بێت ئەوا دەبێتە مایەی ئاسودەیی و خۆش گوزەرانی دونیا و بەختەوەری قیامەتیش .

٥. پاش بەیان کردنی ئەو بنەما سەرەکیانەی ئیسلامی پیرۆز ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) وە بیر ئوممەتەکەی خۆی دێنێتەوە کە سەرجەم ئەو بنەمایانە و بنەماکانی تریش لە قورئانەکەی خوای گەورەدا بەروون و ئاشکرا بەیان کراون و ئەو قورئانەش خوا بەڵێنی داوە کە هەتا قیامەت دەپارێزرێت و نافەوتێت وە لە هەر شوێن و سەردەمێکدا موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ ئەو قورئانە و پەیوەست بن بە فرمانەکانی خوای گەورەوە تیایدا، ئەوا هەرگیز گومڕا نابن و سەریان لێ ناشێوێت، وە بەرنامە پاك و بێگەردەکەی ئیسلامی پیرۆزیش تیایدا دەدۆزنەوە و ئیتر نابنە دەسخەڕۆی سیستەمە نەفامیەکانی تر .

٦. پاشان لە کۆتاییدا پێغەمبەر(ﷺ) حەز دەکات دڵنیا بێت لەوەی کە ئەمانەتەکەی سەر شانی خۆی بە تەواوی بە ئوممەتەکەی گەیاندووە و ئەوانیش تەواو لێیان وەرگرتوە ،و دەیەوێت شایەتی‌یەك بۆ خۆی بەدەست بهێنێت لەبەردەم خوای پەروەردگاریدا کە ئەرکەکەی سەر شانی تەواو ئەنجام داوە بە تایبەت کە خۆی باش دەیزانی کە ئەمە حەجیماڵئاواییەتی و دوا کۆبوونەوەی ساڵانەیەتی لەگەڵ ئوممەتەکەیدا لەم دونیایەدا هەر بۆیە رووی دەمی دەکاتە ئامادە بووان و پێیان دەفەرموێت: (دەی خوای گەورە پرسیاریێ منتان لێ دەکات، ئەی ئێوەش چی وەڵام دەدەنەوە ؟) دایك و باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا پاش ئەو هەموو خەبات و تێکۆشانە، پاش ئەو هەموو ئازار و شەونخونی‌یە، پاش ئەو هەموو دەربەدەری و بێ وڵاتییە.

پاش ئەو هەموو ئارام و خۆڕاگرتنە، پاش پێگەیاندنی ئەو ئوممەتە بێ وێنەیەی کە جیهان نموونەی لەو جۆرەی بە خۆیەوە نەبینیوە، پاش گەیاندنی ئیسلام بە هەموو جیهان، پاش ئەو هەموو بەندایەتی کردنە بۆ خوا پاش .... پاش..... پاش .. هەموو ئەمانە لە پێناو رەزامەندی خوادا بەڵام دەیەوێت هێشتا دڵنیا بێت کە ئەو رۆژەی لەبەردەمی خوای گەورەدا رادەگیرێت هەڵوێستی تەواوە و کەم تەرخەمی نەکردووە و کاری خۆی بە ئەنجام گەیاندووە. هەر بۆیەش کاتێك کە هاوەڵانی ئامادە بوو کە ژمارەیان لە سەد هەزار زیاتر بووە دڵنیای دەکەن کەلەلای خوا شایەتی خێری بۆ دەدەن کە تەواو و پڕ بە پڕ ئەمانەتەکەی گەیاندووە و رێنمایی و ئامۆژگاری پێویستی ئوممەتەکەی خۆی کردووە، ئنجا پەنجەی موبارەکی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و پاشانیش دای دەنەوێنێتەوە بۆ لای خەڵکەکە و دەفەرمووێت: (ئەی خوای من بە شایەت بە ئەی پەروەردگاری من بە شایەت بە).

**ئەی خــوایە بڕژێـنی لێزمە بارانی رەحمەت**

**بەسەر گیانی موحەممەد هەتا قیامەت**

# (( بەشی: مامەڵە کردن ))

## (١) ( پـــێشتر ئـەجـــەل دیـاری کـــراوە و رزقـیـــش بەشکـــراوە )

(٤٧٨) ( حم م ) عن عبدالله قال: قالت أمُ حبيْبَةَ زَوْجُ النبيِ(ﷺ): اللَهُمَ أمْتِعْني بِزَوْجي رسُول الله(ﷺ) وبِأبي أبي سُفيانَ و باخي معاويةَ قال: فقال النبيَ(ﷺ): ﴿ قَدْ سَأَلْتِ اللهَ لآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَ أَيَامٍ مَعْدُودَةٍ، وَ أَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لَنْ يُعَجِّلَ شَيْئاً قَبلَ حلّه، أو يُؤَخِرَ شَيْئاً عن حلّه، وَلَوْ كُنْتِ سَأَلْتِ اللهَ أَنْ يُعِيذَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ أو عَذَابٍ فِي الْقَبْرِ كَانَ خَيْراً وَ أَفْضَلَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٢٧٣) في صحيح الجامع

عبد الله دەڵێ: ( ام الحبيبه ) ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) ووتی: ئەی خوداوەند وادەم بدەیت کە خۆش گوزەران بم بە مێردەکەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە بە ابو سفیانی باوکم وە بە معاویەی برام، ووتی: پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: ( ئەوە تۆ لە خوا پاڕایتەوە بۆ ئەجەلێك کە دیاری کراوە، وە رۆژانێك کە ئەژمار کراون، وە رزقێك کە دابەش کراوە، هیچ شتێك پێش وادەی خۆی ناخرێت، یان لەوادەی خۆی دوا ناخرێت، جا تۆ داوای ئەوەت لە خوا بکردایە کە لە ئەشکەنجەیەکی ناو ئاگر یان لە ئەشکەنجەیەکی ناو گۆڕ پەنات بدات و بتپارێزێت، ئەوە خێر تر و باشتر بوو بۆ تۆ ).

## (٢) ( فەزڵی کاسبی و هەوڵدان )

(٧٩٤) ( حم خ هـ ) عن الزبير بن العوام قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنْ يَأخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَأتِي الْجَبَلَ فَيَجِيءُ بِحزْمَةِ الْحَطَبِ عَلَىَ ظَهْرِهِ فَيَبِيعُهَا فَيَكُفُّ اللهُ بِهَا وَجْهَهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ أَعْطُوهُ أَوْ مَنَعُوهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٢٨) في صحيح الجامع

زبێر کوڕی العوام دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( گەر یەکێك لە ئێوە گوریسەکەی هەڵگرێت و بچێتە ئەو چیایە کۆڵە پشتێك دار بهێنێت و بیفرۆشێت و بەوە خوا رووی بپارێزێت، باشترە بۆی لەوەی کەداوا لە خەڵك بکات و سواڵ بکات جا بیدەنێ یا نەیدەنێ ).

## (٣) ( فەزڵی رازیبوون بەو بەشەی کە خوای گەورە دیاریکردوە )

(٤٨٠) ( حم ابن قانع هب ) عن رجل من بني سليم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله تَعالَى يَبْتَلِي الْعَبْدَ فِيمَا أَعْطَاهُ فَإِنْ رَضِيَ بِمَا قَسَمَ اللهُ لَهُ بُورِكَ لَهُ فِيهِ وَ وَسَّعَهُ وَ إِنْ لَمْ يَرْضَ لَمْ يُبَارِكْ لَهُ وَ لَمْ يَزِدْ عَلَى مَا كَتَبَ لَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٦٩) في صحيح الجامع

پیاوێك له ( بني سليم ) ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی. ( خوای گەورە بەندە تاقی دەکاتەوە بەوەی کە پێی بەخشیوە جا ئەگەر رازی بوو بەو بەشەی کە خوای گەورە دیاری کردووە بۆی ئەوا بەرەکەتی بۆ تێ دەکرێ و بۆشی فراوان دەکرێت، وەئەگەر پێی رازی نەبوو ئەوا نە بەرەکەتی بۆ تێدەکرێ و نە بۆشی زیاد دەکرێ لەوەی کە بۆی نووسراوە ).

## ( ٤ ) ( کۆمەکی خوایی بە پێی باری سەرشان دەبێ )

(٤٨١) ( الحكيم البزار الحاكم في الكنى هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الْمَعُونَةَ تَأْتِي مِنَ اللهِ لِلْعَبْدِ عَلَى قَدْرِ الْمُؤْنَةِ وَ إِنَّ الصَّبْرَ يَأْتِي مِنَ اللهِ عَلَى قَدْرِ الْمُصِيبَةِ ﴾ .
( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٥٢ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کۆمەك دێت لەلایەن خواوە بۆ بەندەی خۆی بە پێی بڕی ئەو بار و ئەرکەی کە لە سەر شانیەتی، وە ئارامیی و سەبووریش دێت لەلایەن خواوە بەپێی رادەی نەهامەتی و موسیبەتەکە ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

واتە خوای گەورە و کاربەجێ بەپێی گەورەیی و بچوکیی یان زۆری و کەمی ئەو بارەی کەلەسەر شانی بەندەکانیەتی کۆمەك و یارمەتی و هاوکارییان بۆ دەنێرێت، وەهەتا باری سەر شانی بەندەیەك قورس تر و گران تر بێت خوای گەورەش بەو رادەیە کۆمەك و یارمەتی دەدات، بۆ نموونە خوای گەورە کۆمەکی کەسێك زیاتر دەکات کە پێنج شەش منداڵی هەیە وەك لە کەسێك کە تەنها یەك منداڵی هەیە، وە هەروەها خوای گەورە سەبوری و ئارامیش بەسەر دڵی بەندەکانیدا بە رادەی ئەو موسیبەت و نەهامەتیانەی کە تێی کەوتون دەڕژێنێت واتە هەتا بەڵاو موسیبەت گەورەتر بێت خوای گەورە بڕێکی زیاتر لە ئارامی و سەبووری بەدڵی خاوەنەکەی دەدات، بەڵام لە یادمان نەچێت کە ئەمە تایبەتە بە کەسانی بڕوادار و خواناسەوە کە بەردەوام داوای کۆمەك و یارمەتی و پێبەخشینی سەبووری و ئارامی لەپەروەدگاری خۆیان دەکەن .

## ( ٥ ) ( هەوڵدان بۆ کاسبی پاك و حەڵاڵ )

(٤٨٢) حم م ) عن معاوية قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إِنَّمَا أَنَا خَازِنٌ وَإِنَّمَا يُعْطِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَمَنْ أَعْطَيْتُهُ عَطَاءً عَنْ طِيبِ نَفْسٍ فَهُوَ أَنْ يُبَارَكَ لأَحَدِكُمْ وَمَنْ أَعْطَيْتُهُ عَطَاءً عَنْ شَرَهٍ - وَشَرَهِ مَسْأَلَةٍ - فَهُوَ كَالآكِلِ وَلاَ يَشْبَعُ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٣٤١ ) في صحيح الجامع

معاويه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من تەنها پارێزەرێکی ماڵ و داراییم، وە ئەوەی کە دەبەخشێت تەنها خوایە، جا هەر کەسێك من بەخششێکی پێبدەم بە ئارەزوو رەزامەندی خۆم ئەوا

بەرەکەتی بۆ دەخرێتە ئەو بەخشینەوە کەمن پێی دەدەم، وەهەرکەسێکیش بە خشینێکی پێ بدەم بە نابە دڵی و بە زەبری پاڕانەوە و سواڵ کردن، ئەوا ئەو کەسە وەك ئەو بخۆرە وایە کە هەر دەخوات و تێر نابێت ).

(٤٨٣) ( حم م ت )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لايَقْبَلُ إِلَّا طَيِّباً وَ إِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، فَقَالَ: ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنْ الطَّيِّبَاتِ وَ اعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾، وَ قَالَ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ﴾، ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبُّ يَارَبُّ! وَ مَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَ مَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَ مَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَ غُذِّيَ بِالْحَرَامِ فَأَنَّى يَسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٧٤٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەی خەڵکینە خوا پاکە و پاکیش نەبێت قبوڵی ناکات، وە خوای گەورە ئەو فرمانەی کە بە نێردراوەکانی خۆی کردووە هەمان فرمانیشی بە بڕواداران کردووە، ئەوەتا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەران لە شتە پاکەکان بخۆن و کاری چاك بکەن، منیش زاناو ئاگادارم لەو کارانەی کە دەیکەن. وە فەرمووشیەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە پاکەکانی ئەم رزقانە بخۆن کە ئێمە پێمان بەخشیون. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) باسی کرد کە پیاوی وا هەیە درێژە دەدات بەسەفەر، سەر و بەرگی تەپ و تۆز و خۆڵاوی، دەست درێژ دەکات بۆ ئاسمان ئەی پەروەردگار ئەی پەروەردگار ، خواردنەکەی لە حەرامە، خواردنەوەکەشی حەرامە، پۆشاکەکەی بەریشی حەرامە ،و بە حەرامیش جەستەی دەرخوارد دراوە، ئاخر ئەو کەسە ئیتر چۆن وەڵام دەدرێتەوە و دوعای لێ قبوڵ دەکرێت ).

## (٦) ( فەزڵی ئەو دەستەی لە سەرەوەیە )

(٤٨٤) ( حم د ك )عن أبيه مالك بن نضلة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الأَيْدِي ثَلاثَةٌ: فَيَدُ اللهِ الْعُلْيَا وَ يَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا، وَ يَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى فَأَعْطِ الْفَضْلَ وَ لا تَعْجِزْ عَنْ نَفْسِكَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٧٧٠) في صحيح الجامع

مالکی کوڕی نضلة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دەستەکان سیانن: دەستی خوا ئەوە لە هەمووان بەرز تر و سەرووترە، وەبە دوای ئەودا دەستی کەسی بەخشندە دێت، وە دەستی سواڵکەر و دەروازەکەریش لە خوار هەموویانەوەیە، جا ئەوەی کە لێت زیادە ببەخشە، بەڵام واش مەکە کە خۆشت نەدارو دەستەو سان بیت ) .

## روونکردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە موسڵمان دەبێت لەو ماڵەی کە لێی زیادە و لە پێداویستی خۆی و ماڵ و منداڵی زیاترە خێر و چاکە و بەخشش بدات بۆ ئەوەی لە ریزی ئەو دەستانەدا بێت کە لەدوای دەستی خواوەوە دێن و لە سەرەوەن، بەڵام نابێت موسڵمان خۆی والێبکات بەهۆی بەخشین و خێرکردنەوە کە سبەینێ خۆشی ببێت بە سواڵکەر و کاری خۆی پێ هەڵنەسورێت و دەستی ببێتە دەستێکی دەروازە کەر کەهەمیشە لە ژێرەوەیە.

## ( ٧ ) ( کلیلی رزق پارێزکاری و لە خوا ترسانە )

(٤٨٥)( حل ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ رُوحَ القُدسِ نَفَثَ فِي رَوْعِي أَنَّ نَفساً لَنْ تَمُوتَ حَتَّى تَسْتَكْمِلَ أَجَلَهَا وَ تَسْتَوْعِبَ رِزْقَهَا فَاتَّقُوا اللهَ وَ أجمِلُوا فِي الطَّلَبِ وَ لايَحْمِلَنَّ أَحَدَكُم إسْتِبْطَاءُ الرِّزْقِ أَنْ يَطلُبَهُ بِمَعْصِيَةِ اللهِ فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى لايُنالُ مَا عِنْدَهُ إلَّا بِطَاعَتِه ﴾

( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٨٥ ) في صحيح الجامع

ابو امامە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( گیانە پیرۆزەکە ( واتە جبریل سەلامی خوای لێ بێت ) فووی کرد بە هۆشمدا و خستییە دڵمەوە کە هیچ نەفسێك نا مرێت هەتا ئەجەلەکەی خۆی تەواو نەکات و ئەو رزقەش دەستە بەر نەکات کە بۆی دیاری کراوە، جا پارێزکاری (تقوی) لە خوا بکەن و لێی بترسن، وە شێوازی جوان بگرنە بەر بۆ بەدەست هێنانی رزقتان. وە هێواش و خاو هاتنی رزقتان وا لەکەستان نەکات و هەڵینەنێت کە بە شێوازی بێ فرمانیی و یاخی بوون لە خوا هەوڵی بۆ بدات و دەستە بەری بکات، چونکە ئەوشتەی کە لای خوای گەورەیە. بە ملکەچی و گوێرایەڵی کردنی نەبێت بەدەست نایەت )

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرموودە پیرۆزە یەکێکە لەو فەرموودە گرنگ و بەنرخانەی کە یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی باوەری پێ دا دەمەزرێت کە ئەویش باوەر هێنانە بە قەزاو قەدەری خوای گەورەو باڵادەست و تەسلیم بوونێکی تەواویشە بەو قەزاو قەدەرە، وە هەر باوەر و قەناعەتەیشە کە مرۆڤی باوەردار دڵنیاو هێور و ئارام دەکات و دەیپارێزێت لە هەڵپە و دڵە راوکە و نائومێدی و ترسان لە مردن و گرتنە بەری رێوشوێنی نابەجێ و قێزەون بۆ بەدەست هێنانی ئەو رزقەی کە لە عیلمی کۆنی خوادا بۆی بریاردراوە،و ئیتر هەڵپە و دڵە راوکێ نە ئەجەلەکەی پێش و دوا دەخات و نەرزقەکەیشی زیاد و کەم دەکات. بەڵام ئەوەی کە بە مرۆڤ دەبرێت و لەسەر شانی خۆیەتی بریتییە لەو رێگا و شێوازانەی کە خۆی دەیگرێتە بەر بۆ بەدەست هێنانی ئەو رزقەی کە پێشتر بۆی دیاری کراوە. جا ئەگەر رێگایەکی جوان و پاك و شەرعیانەی گرتبێتە بەر ئەوا رزقەکەی پاك و حەڵاڵ دەبێت و پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە. بەڵام ئەگەر رێگەیەکی پیس و نا بەجێ و ناشەرعی یانەی گرتبێتە بەر ئەوا رزقەکەی خۆی حەرام دەکات و خۆی دووچاری سزا و

لێپرسینەوەش دەکات، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا رزقەکە هەر هەمان رزقە کە پێشتر لە لای خواوە بۆی دیاریکراوە بێ زیاد و کەم

وە خاڵێکی تریش کە پێویست بە لێکۆڵینەوە دەکات لەم فەرموودە پیرۆزەدا ناو هێنانی جوبرەئیلە سەلامی خوای لەسەر بێت بە گیانە پیرۆزەکە ( الروح القدس ) ئەویش هۆکارەکەی وەك و ئیمامی رازی دەفەرموێت ئەوەیە کە جبریل بەو پەیامەی کە دەیهێنێت گیان دەکاتەوە بەبەر دڵەکاندا و دڵەکانی پێ زیندوو دەکاتەوە. وە وشەی پیرۆزیشی دراوەتە پاڵ لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەسەر پاکی و بێ عەیبی دروستی کردووە. ئەو سیفەتە پیرۆزەش تایبەت دەدرێتە پاڵ جبریل لەناو هەموو فریشتەکانی تردا. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو فریشتەکانی تریش هەمان سیفەتی پاکی و بێ عەیبیان تێدایە بەڵام لە جبرەیلدا سەلامی خوای لەسەر بێت کامڵ تر و تەواوترە.

وەسەبارەت بەوەشی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت جبریل فووی کرد بە هەست و هۆشمدا ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی وەحی و گەیاندنی پەیامی خوداوەند بە پێغەمبەر(ﷺ) کە شەش جۆری هەیە. **یەکەمیان:** وەکو زرنگانەوەی زەنگ بۆی دەهات کە ئەمە لەهەموو جۆرەکانی تر لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) قورس و توندتر بوو، تەنانەت جارێکیان بەو جۆرە وەحی بۆ هات لەو کاتەدا رانی پیرۆزی لەسەر رانی ( زەیدی کوڕی ثابت ) بوو. بە جۆرێ قورسایی کەوتە سەر زەید کە هێندەی نەمابوو رانی بشکێت. وە **دووەمیان:** فریشتەکە لەشێوەی پیاوێکدا دەهاتە لای و قسەی لەگەڵ دەکرد. **سێهەمیان:** لە خەودا بوو **چوارەمیان:** خستنە دڵەوە وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە، **پێنجەمیان:** جبرەئیل سەلامی خوای لەسەر بێت لەسەر شێوە راستیەکەی خۆی دەهاتە لای کە شەسەد باڵی هەیە و بەری ئاسۆی دەگرت و دایدەپۆشی. و جۆری **شەشەمیشیان:** ئەوەی، کە خوای گەورە خۆی راستەوخۆ قسەی لەگەڵ کردووە هەروەك لەشەوی ئیسرا و میعراجدا رووی دا کە ئەمەیان لە هەموو پلەکانی تر بەرزتر و پیرۆزترە

## ( ٨ ) ( فەزڵی ئەو کەسەی کە قیامەتی کردۆتە خەم و خەیاڵی خۆی )

**( ٤٨٦ ) ( ت ) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ كَانَ الآخِرَةُ هَمَّهُ جَعَلَ اللهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ وَ جَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ وَ أَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَ مَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ جَعَلَ اللهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَ فَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ وَ لَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلَّا مَا قُدِّرَ لَهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٤٨٤ ) في صحيح الجامع**

انس ی کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەرکەسێ قیامەت خەم و خەیاڵی بێت، ئەوا خوای گەورە دەوڵەمەندیەکەی دەخاتە دڵیەوە، و کارە پەرت و بڵاوەکانی بۆ کۆدەکاتەوە و ئاسانی دەکات و دونیاش بە ملکەچی بەرەو پیری دێت. وەهەر کەسێکیش دنیا بکاتە هەوڵ و خەمی خۆی ئەوا خوای گەورە هەژارییەکەی بۆ دەخاتە نێو چاوانی. وە کاروباری زیاتر لێ پەرتەوازە و بڵاو دەکات. وە جگە لەوەیشی کە بۆی بڕیار دراوە لە دنیا هیچی زیاتری بۆ نابێت ).

( ٤٨٧ ) ( هـ ) عن زيد بن ثابت قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَنْ كَانَتْ الدُّنْيَا هَمَّهُ فَرقَ اللهُ عَلَيْه أَمْرَهُ وَجعلَ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْه وَلَمْ يَأْته منَ الدُّنْيَا إِلَّا مَاكُتبَ لَهُ، وَ مَنْ كَانَتْ الآخرَةُ نيَّتَهُ، جَمعَ اللهُ لَهُ أَمْرَهُ، وَ جَعلَ غنَاهُ في قَلْبِه، وَ أَتَتْهُ الدُّنْيَا وَ هيَ راغمَةٌ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥١٠) في صحيح الجامع

زیدی کوڕی ثابت دەڵێ: بیستومانە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( هەر کەسێك ئەم دنیایە هەوڵ و غەمی بێت، خوای گەورە کار و باری پەرش و پەرتەوازە دەکات، وە هەژار بوونەکەشی بۆ دەخاتە نێو چاوانی، وە هیچ شتێکی لەم دنیایە بۆ نابێت بە نسیب زیاتر لەوەی کە بۆی نووسراوە، وە هەرکەسێکیش نیەت و مەبەستی قیامەت بێت، خوای گەورە کاروباری بۆ کۆ دەکاتەوە و یەکی دەخات، وە دەوڵەمەندیەکەشی بۆ دەخاتە دڵیەوە، وە دنیاش بە ملکەچی دێتە بەر دەستی ).

## ( ٩ ) ( قەرزاری و فەزڵی دەست گیرۆیی قەرزار )

( ٤٨٨ ) ( ك ) عن حذيفة وعقبة بن عامر، وأبي مسعود الأنصاري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَتَى اللهُ عَزَّوَجَلَّ بِعَبْد منْ عبَاده آتَاهُ اللهُ مَالاً فَقَالَ لَهُ: مَاذا عَملْتَ في الدُّنْيَا؟ فَقَالَ: مَا عَملْتُ منْ شَيْء يَا رَبِّ إِلَّا أَنَّكَ آتَيْتَني مَالاً فَكُنْتُ أُبَايعُ النَّاسَ وَ كَانَ منْ خُلُقي أَنْ أُيَسرَ عَلَى الْمُوسرِ وَ أُنْظرَ الْمُعْسرَ قَالَ اللهُ تَعَالَى: أَنَا أَحَقُّ بِذَلكَ منْكَ تَجاوَزا عَنْ عَبْدي ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (١٢٥) في صحيح الجامع

حذیفە و عقبەی کوڕی عامر دەڵێن، و هەروەها ابو مسعودی ئەنصاری دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە و باڵا دەست بەندەیەك لە بەندەکانی خۆی کە ماڵ و سامانی پێ دابوو دەیهێنێت و پێی دەفەرمووێت: ئادەی چیت کردووە لە دنیادا؟ ئەویش دەڵێ: هیچ چاکەیەکم نەکردووە ئەی پەروەردگارە، تەنها ئەوە نەبێت کە تۆ ماڵ و سامانت پێ بەخشیبووم منیش کڕین و فرۆشتنم پێوە دەکرد لەگەڵ خەڵکدا، وەمن ڕەوشتم وابوو کە ئاسان کار بووم لەگەڵ ئەوانەی کە هەیان بوو بمدەنەوە، وەئەو کەسەش کە نەدار بووایە چاو پۆشیم لێ دەکرد، خوای گەورەش فەرمووی من لە تۆ لە پێشترم بەو کارە، چاو پۆشی لەم بەندەیەم بکەن و لێی ببورن ).

( ٤٨٩ ) ( ن حب ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ رَجُلاً لَمْ يَعْمَلْ خَيْراً قَطّ وَ كَانَ يُدَاينُ النَّاسَ فَيَقُولُ لرَسُوله : خُذْ مَاتَيَسَّرَ وَ اتْرُكْ مَاعَسَرَ وَ تَجَاوَزْ لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا فَلَمَّا هَلَكَ قَالَ اللهُ: هَلْ عَملْتَ خَيْراً قَطّ؟ قَالَ: لا، إِلَّا أَنَّهُ كَانَ لي غُلامٌ وَ كُنْتُ أُدَاينُ النَّاسَ فَإِذَا بَعَثْتُهُ يَتَقَاضَى قُلْتُ لَهُ: خُذْ مَا تَيَسَّرَ وَ اتْرُكْ مَا عَسَّرَ وَ تَجاوَزْ لَعَلَّ الله أَنْ يَتَجاوَزَ عَنَّا. قَالَ اللهُ: قَدْ تَجَاوَزْتُ عَنْكَ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٧٨) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك هەرگیز كاری چاكەی نەكردبوو، وە ئەو پیاوە وابو كە قەرزی دەدا بە خەڵكی، بەو كارمەندەی دەووت كە دەینارد بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكانی: ئەوەی كە رەخساو هەیبوو وەریبگرەوە، وە ئەوەی كە نەدار بوو وازی لێبێنە و چاوپۆشی لێ بكە، بەڵكو خوای گەورە لێمان ببورێت و چاو پۆشیمان لێ بكات، جا كاتێك كە مرد خوای گەورە پێی فەرموو: ئایا هەرگیز كارێكی چاكەت كردووە ؟ ئەویش ووتی: نەخێر تەنها ئەوە نەبێت كە كوڕیكی خزمەت كارم هەبوو، وەمن قەرزم دەدا بە خەڵك، جا هەركاتێك بم ناردایە كە قەرزم بۆ وەگرێتەوە پێم دەوت: ئەوەی بۆی رەخساو هەیبوو لێی وەبگرە، وەئەوەشی كە نەدارو و نەبوو بوو وازی لێ بهێنە و چاوپۆشی لێ بكە، بەڵكو خوا لێمان ببورێت و چاو پۆشیمان لێ بكات، خوای گەورەش فەرمووی: ئەوا چاو پۆشیمان لێ كردیت و لێت بوراین ).

**( ٤٩٠ ) ( تخ هـ ك ) عن عبدالله بن جعفر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى مَعَ الدَّائِنِ حَتَّى يَقْضِي دَيْنَهُ مَالَمْ يَكُنْ دَيْنُهُ فِيمَا يَكْرَهُ اللهُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٢٥) في صحيح الجامع**

عبدالله كوڕی عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە لەگەڵ قەرزداردایە هەتا قەرزەكەی دەداتەوە، بە مەرجێك قەرزەكەی بۆ شتێك نەبوو بێت كە خوا پێی ناخۆش بێت ).

**( ٤٩١ ) ( هـ ) عن صهيب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿أَيُّمَا رَجُلٍ يَدَيَّنُ دَيْنًا وَهُوَ مُجْمِعٌ أَنْ لاَ يُوَفِّيَهُ إِيَّاهُ لَقِيَ اللَّهَ سَارِقًا﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٧١٤) في صحيح الجامع**

صهيب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەرپیاوێك قەرزێك بكات و نیازی وا بێت كە نەیداتەوە، بە دز دەچێتەوە بەردەمی خوا ).

**( ٤٩٢ ) ( حم ن حب ) عن عمران بن حذيفة قال: كَانَتْ مَيْمُونَةُ تَدَّانُ وَتُكْثِرُ فَقَالَ لَهُ أَهْلُهَا فِي ذَلك وَلامُوهَا وَوَجَدوا عَلَيْهَا فَقَالَتْ: لا أَتْرُكُ الدَّيْنَ وَقَدْ سَمِعْتُ خَلِيلِي وَصَفِيِّ يَقُولُ: ﴿ مَا مِنْ أَحَدٍ يَدَّانُ دَيْناً فَعَلِمَ اللهُ أَنَّهُ يُرِيدُ قَضَاءَهُ إِلَّا أَدَّاهُ اللهُ عَنْهُ فِي الدُّنْيَا ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٧٣) في صحيح الجامع**

عمران ی كوڕی حذيفه دەڵێ: ( (ميمونة) – كە خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو– قەرزی زۆری دەكرد، كەس و كارەكەشی لەسەر ئەوە زۆریان پێ ووت و سەرزەنشتیان دەكرد، ئەویش ووتی: من دەست لە قەرز كردن هەڵناگرم چونكە خۆشەویست و دۆستە هەڵبژاردەكەی خۆم – مەبەستی پێ پێغەمبەر(ﷺ) بوو _ دەیفەرموو: ( هەر كەسێك قەرزێك بكات و خوای گەورە بزانێت كە مەبەستیەتی قەرزەكە بداتەوە ئەوا خوای گەورە هەر لە دنیا قەرزەكەی بۆ دەداتەوە).

**( ٤٩٣ ) ( حم خ هـ ) عن أبي هريرة رضي الله تعالي عنه عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَداءَهَا أَدَّى اللهُ عَنْهُ وَ مَنْ أَخَذَهَا يُرِيدُ إِتْلافَهَا أَتْلَفَهُ اللهُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٩٧٧) في صحيح الجامع**

ابو هريرة(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك پارە و ماڵی خەڵك وەربگرێت و مەبەستی بێت کە بیداتەوە، ئەوا خوا بۆی دەداتەوە، هەر کەسێکیش بەو مەبەستە وەریبگرێت کە نەیداتەوە و بیفەوتێنێت ئەوا خوا دەیفەوتێنێت ).

( ٤٩٤ ) ( ن ) عن ميمونة زوج النبي(ﷺ) قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَنْ أَخَذَ دَيْناً وَ هُوَ يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَهُ أَعَانَهُ اللهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٩٨٠ ) في صحيح الجامع

میمونة ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەر(ﷺ) م بیست دەیفەرموو: ( هەرکەسێك قەرزێك بکات و مەبەستی بێت و بیەوێت بیداتەوە ئەوا خوای گەورە دەست گیرۆیی دەکات ).

( ٤٩٥ ) ( طب ) عن ميمونة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَدانَ دَيْناً يَنْوِي قَضَاءَهُ أَدَّاهُ اللهُ عَنْهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٩٨٥ ) في صحيح الجامع

میمونة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویوتی: ( هەر کەسێك قەرزێك بکات و نییەتی هەبێت بیداتەوە ئەوا خوای گەورە بۆی دەداتەوە ).

## ( ١٠ )( ئەو کەسەی نەهامەتیەکەی بداتە دەست خوا پێویستی بە خەڵك نامێنێت )

( ٤٩٦ ) ( ت ) عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ نَزَلَتْ بِهِ فَاقَةٌ فَأَنْزَلَهَا بِالنَّاسِ لَمْ تُسَدَّ فَاقَتُهُ، وَ مَنْ نَزَلَتْ بِهِ فَاقَةٌ فَأَنْزَلَهَا بِاللهِ فَيُوشِكُ اللهُ لَهُ بِرِزْقٍ عَاجِلٍ أَوْ آجِلٍ ﴾
( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٦١ ) في صحيح الجامع

عبد الله ی کوڕی مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك نەبوونی و نەهامەتی بەسەردا بێت و ئەویش هانا بۆ خەڵك بەرێت ئەوا نەبوونیەکەی بۆ پڕ نابێتەوە، وە هەر کەسێکیش نەبوونی و نەهامەتیەکی بەسەردا بێت ئەویش بیداتە دەست خواو هانا بۆ ئەو بەرێت، ئەوا نزیکە کە خوای گەورە رزقی بدات جا زوو بێت یان درەنگ ).

( ٤٩٧ ) ( ت حل ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَرْضَى النَّاسَ بِسَخَطِ اللهِ وَكَلَهُ اللهُ إِلىَ النَّاسِ وَ مَنْ أَسْخَطَ النَّاسَ بِرِضَا اللهِ كَفَاهُ اللهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٠٧ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك بە تورە کردنی خوا خەڵك لە خۆی رازی بکات، ئەوا خوا دەیداتە دەست ئەو خەڵکە، وەهەر کەسێکیش بۆ رەزامەندی خوا خەڵك لە خۆی برەنجێنێت ئەوا خوای گەورە ئەرکی ئەو خەڵکەی لە کۆڵ دەکاتەوە ).

## (١١) ( فەزڵی ئەو کەسەی کە چاو پۆشی لە قەرزارێکی نەدار دەکات )

( ٤٩٨ ) ( حم م ) عن أبي اليسر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ أَظَلَّهُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّه ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦١٠٤) في صحيح الجامع

ابو اليسر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك مۆڵەتی قەرزارێکی نەدار بدات و لەسەری بوەستێت یان قەرزەکەی لەسەر بخات و لێی ببورێت ئەوا خوای گەورە دەیخاتە سێبەری خۆیەوە لەو رۆژەدا کە هیچ سێبەرێك نییە جگە لەسێبەری ئەو ).

## (١٢) ( چاو پۆشی لە کەسێك کە لە کڕین و فرۆشتندا پەشیمان ببێتەوە )

( ٤٩٩ ) ( د هـ ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَقَالَ مُسْلِماً أَقَالَ اللهُ تَعالىَ عَثْرَتَهُ ﴾

ابو هريرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك چاو پۆشی بکات لە موسڵمانێك کە لە گفت و بەڵێنی خۆی پەشیمان ببێتەوە لە کڕین و فرۆشتندا و ڕەزامەندێتی بەرامبەر بنوێنێت ئەوا خوای گەورەش لە کەوتن و نسۆکدا هەڵی دەسێنێتەوە ).

( ٥٠٠ ) ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ يَسَّرَ عَلىَ مُعَسَّرٍ يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَ الآخِرَة ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٦١٣) في صحيح الجامع

ابو هريرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویوتی: ( هەر کەسێك ئاسان کاری و دەست گیرۆیی نەدارێك بکات، خوای گەورەش لە دونیا و قیامەتدا دەست گیرۆیی دەکات ).

## (١٣) ( دوعای قەرزدانەوە )

( ٥٠١ ) ( حم ت ك ) عن علي رضي الله عنه أنَّ مكاتبا جاءه فقال: إني عجزْتُ عنْ كتَابتي فأعِنِّي، قالَ: ألا أُعلِمُكَ كَلِماتٍ علَّمَنيهنَّ رَسُولُ الله(ﷺ) لَوْ كَانَ عَلَيْكَ مِثْلُ جَبَلِ صُبَيْرٍ دَيْناً أداهُ الله عنك؟ قُلْ: ﴿اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَ أَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِواكَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٦٢٤) في صحيح الجامع

پیاوێك کە بەندە بوو هاتە لای ئیمام عەلی ڕەزای خوای لێ بێت ووتی: من دەستەو سان بووم لەوەی خۆم لە بەندایەتی رزگار بکەم و نرخی خۆم کۆ بکەمەوە هەتا خۆم بکڕمەوە جا هاوکاریم بکە، عەلیش ووتی: ئەی حەز دەکەیت چەند ووشەیەکت فێر بکەم کە پێغەمبەر(ﷺ) فێری کردوم، ئەگەر هێندەی چیای ( صُبیر) قەرزت لەسەر بێت لەسەرتی لابەرێت؟ بڵێ: ( اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ، وَ أَغْنِنِي

بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ )، واته ئەی خوداوەند بە حەلاَڵی خۆت کیفایەتم بدەیت هەتا پێویستم بە حەرام نەبێت، وە بە فەزڵی خۆت دەوڵەمەندم بکەیت هەتا جگە لە تۆ پێویستم بە کەسی تر نەبێت ).

## ( ١٤ ) ( دانەوەی ئەمانەت )

( ٥٠٢ ) ( طب ) عن عبدالرحمن بن أبي قراد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنْ أَحْبَبْتُمْ أَنْ يُحِبَكُمُ اللهُ تَعالىَ وَ رَسُولَهُ فَأَدُّوا إِذا ائْتُمِنْتُمْ وَ اصْدِقُوا إِذا حَدَّثْـتُمْ وَ أَحْسِنُوا جِوارَ مَنْ جَاوَرَكُمْ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٤٠٩ ) في صحيح الجامع

عبدالرحمن ی کوڕی ابی قراد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( حەز دەکەن خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی خۆشی بوێن، ئەوا ئەگەر ئەمانەتیان لا دانان بیدەنەوە، وە کاتێك کە قسە دەکەن ڕاست بدوێن، وە با دراوسێیەتیتان باش بێت لەگەڵ ئەوانەی کە دراوسێتانن ).

## ( ١٥ ) ( فەزڵی بەڵێن بردنە سەر )

(٥٠٣ ) ( طب حل ) عن أبي حميد الساعدي ( حم ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ خِيَارَ عِبَادِ اللهِ الْمُوفُونَ الْمُطَيِبونَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٦٢ ) في صحيح الجامع

له ابي حميد الساعدي یەوە ئەویش لە عائیشەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بەڕاستی باشترین بەندەکانی خوا ئەوانەن کە بەڵێنی خۆیان بردە سەر و دەستیان لە بۆنە خۆشەکە هەڵکێشا ).

### ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرموودە پیرۆزە باس لەو کەسانە دەکات کە لە خێڵی هاشم و زوهرە و تەمیم لە پێش هاتنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا لەماڵی ابن جدعان کۆبوونەوە و پێغەمبەریشیان(ﷺ) لەگەڵدا بوو وە هەرهەموویان دەستیان لە قاپێکی بۆن خۆش هەڵکێشا و بەڵێن و پەیمانیان دا کە بەهانای لێقەوماوانەوە بچن و کەسانی ستەم لێکراو سەر بخەن و ستەمیان لەسەر لابەرن، مەبەستی فەرموودەکەش ستایش کردنی ئەو کەسانەیە کە بەڵێن دەدەن دەست گیرۆیی خەڵکی نەدار و لێقەوامان بکەن، و وەفاداریش دەبن بەرامبەر بە بەڵێنەکەی خۆیان.

## ( ١٦ ) ( فەزڵی نەرم و نیانی لە کڕین و فرۆشتندا )

( ٥٠٤ ) ( حم ن هـ هب ) عن عثمان بن عفان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَدْخَلَ اللهُ الْجَنَّةَ رَجُلاً كَانَ سَهْلاً مُشْتَرِيا وَ بَائِعاً وَ قَاضِياً وَ مُقْتَضِيا الْجَنَّةَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٣ ) في صحيح الجامع

عثمانی کوڕی عفان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر پیاوێك ئاسان کار و نەرم و نیان بێت لە کڕین و فرۆشتندا، لە پارەدانەوەدا و لە پارە وەگرتنەوەدا، ئەوا خوای گەورە بیخاتە بەهەشتەوە ).

( ٥٠٥ ) ( ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى يُحِبُّ سَمْحَ الْبَيْعِ، سَمْحَ الشِّراءِ، سَمْحَ الْقَضاءِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨٨ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا کەسێکی خۆش دەوێت کە نەرم و نیان بێت لە فرۆشتندا، نەرم و نیان بێت لە کڕیندا، نەرم و نیان بێت لە پارە دان و پارە وەرگرتنەوەدا ).

( ٥٠٦ ) ( خ هـ ) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ عَبْداً سَمْحاً إِذا بَاعَ، سَمْحاً إِذا اشْتَرَى، سَمْحاً إِذا قَضَى، سَمْحاً إِذا اقْتَضَى ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٤٩٤ ) في صحيح الجامع

جابری کوڕی عبد الله دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ڕەحمەتی خوا لە بەندەیەك بێت کە ئەگەر بفرۆشێت نەرم و نیان بێت، وە ئەگەر بکڕێت نەرم و نیان بێت ،وە ئەگەر قەرز وەبگرێتەوە نەرم و نیان بێت ).

( ٥٠٧ ) ( حم ت هق ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ غَفَرَ اللهُ لِرَجُلٍ كَانَ قَبْلَكُمْ، كَانَ سَهْلاً إِذا بَاعَ، سَهْلاً إِذا اشْتَرَى، سَهْلاً إِذا اقْتَضَى ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤١٦١ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا لە پیاوێك خۆش بوو لە سەردەمی پێش ئێوەدا، ئاسانکار بوو ئەگەر شتی بفرۆشتایە، ئاسانکار بوو ئەگەر شتی بکڕیبایە، ئاسانکار بوو ئەگەر قەرزی وەربگرتایەتەوە ).

( ٥٠٨ ) ( ك هق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ كَانَ سَهْلاً هَيِناً لَيِناً حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٤٧٩ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەرکەسێك ئاسانکار و هێور و نەرم و نیان بێت ئەوا خوای گەورە لە ئاگری حەرام دەکات).

## ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم کۆمەڵە فەرموودانەی پێشوو هەرهەموویان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە موسڵمان دەبێت هەتا پێی دەکرێت ئاسانکار و نەرم و نیان و لێبوردە بێت بەرامبەر بە برای موسڵمانی خۆی بە تایبەت لە مامەڵە کردن و کڕین و فرۆشتن و قەرز دانەوەو قەرز وەرگرتنەوەدا، چونکە مامەڵە کردنی بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لە هەموو شتێکی تر زیاتر دەبنە هۆی دڵ یەشانی خەڵك لە یەکتر، وە بەداخەوە بەشی هەرە زۆری خەڵك لە مەسەلەی پارەو مامەڵە و کڕین و فرۆشتندا هێندە توند و ڕەقن کە ئامادە نین لە دینارێکی خۆیان ببورن یان ئامادەیە دەست بداتە یەخەی بەرامبەرەکەی لەسەر دینارێك، یان خاوەن

قەرز رۆژێك زیاتر لەماوەكەی خۆی لەسەر قەرزار ناوەستێت، یان كەسانی وا هەیە پیشەی خۆیان كردووە بە قەرزكردن و لە نیەتیشیاندا نییە قەرزی ئەو خەڵكە بدەنەوە، جا ئیسلامی پیرۆز هۆشیارمان دەكاتەوە و وەبیرمان دەهێنێتەوە كە خوای گەورە ئاگاداری ناخی دڵی هەموو بەندەكانی خۆیەتی و هیچ شتێكیش لەو شاراوە نیی؛ و فێڵی لێ ناكرێ .

بۆیە دەبێت دڵمان بەرامبەر موسڵمانان پاك بێت، نابێت نییەت و مەبەستی فێڵ كردن و دەگە لێدان لە دڵماندا هەبێت بەرامبەر بە برای موسڵمانی خۆمان، وە دەبێت من و تۆ كە لاف ئیسلامەتی و خواناسی لێ دەدەین، ئەو دینداری و خوا ناسیەمان رەنگدانەوەی هەبێت لە كار و مامەڵەو رەفتارماندا .دەبێت لە خەڵكی نەرم و نیان تر بین ئاسانكار تر بین، لێ بووردەتر بین، لەسەر گۆڕینی كاڵایەك بۆ كڕیار نابێت فرۆشیار دەنگە دەنگ و شەڕ و فەرتەنە دروست بكات، نابێت فرۆشیار نەشارەزایی و بێ ئاگایی كڕیار بە فرسەت بزانێت و قوڵی لە بندا ببڕێت.

چەند ناشرینە ئێمە ببینە مایەی ئەوەی كە ئیسلامەتی و دینداری و ناوی پاكی ئیسلام لەبەر چاوی خەڵك لەكە دار و بێزراو بكەین، كارێكی وا بكەین خەڵك بڵێت جولەكە و گاور لە موسڵمانەكە باشترە، یان بڵێن فلانەكەس لای خۆی حاجیە یان شێخە یان سەیدە یان خۆی بە موسڵمان دەزانێت و نوێژی بە جەماعەت ناچێت، كەچی لە هەموو كەس قوڵ بڕ ترە یان گرانجان یان تەماعكار ترە ،یان توڕە و مامەڵەی خراپترە، ئەم جۆرە رەفتار و مامەڵانە دەبنە هۆی ئەوەی كە ناخۆشی و دڵ ئێشان و ناكۆكی لەنێوان موسڵماناندا دروست بێت و خەڵك دڵی لە یەكتر رەش ببێت هەربۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هانی موسڵمانان بە گشتی دەدات كە دەست گیرۆیی یەكتر بكەن، چاوپۆشی لە یەكتر بكەن، لێ بووردەیی بەرامبەر بەیەكتری بنوێنن، مژدەی رەحمەت و سێبەری خوا لە قیامەتدا دەدات بەو خاوەن قەرزەی كە دەزانێت قەرزارەكەی جارێك نەدارەو نیەتی بیداتەوە لەسەری دەوەستێت یان دەبورێت و گەردنی ئازاد دەكات، مژدەی بەهەشت دەدات بەو موسڵمانەی كە لە كڕین و فرۆشتندا نەرم و نیانە، رووخۆش و ئاسانكارە، بێ فێڵ و سەر راستە، دەفەرمووێت هەركەسێك موسڵمانێكی برای لە نسكۆیەك هەڵسەنێتەوە، ئەوەی نەهامەتییەك لەسەر موسڵمانێك لابەرێت، خوای گەورە لەدنیاو قیامەتدا فریای دەكەوێت و نەهامەتیەكەی لەسەر لادەبات، بۆیە دەبێت كارێك بكەین كە خوا لە خۆمان رازی بكەین و روویەكی گەشی ئیسلامەتی و خواناسین پیشانی خەڵكی بدەین هەتا بەر رەحمەتی خوا بكەوین، نەك نەفرەتی خوا و خەڵك .

## ( ١٧ ) ( ئەگەر پارە و ماڵێكت پێ درا كە خۆت داوات نەكردبوو ):

( ٥٠٩ ) ( هق ) عن عمر قال: قال رسول الله( ﷺ ): ﴿ إذا آتَاكَ اللهُ تَعَالَى مَالاً لَمْ تَسْأَلْهُ وَلَمْ تَشْرَه إِلَيْهِ نَفْسُكَ فَاقْبلهُ فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ سَاقَهُ اللهُ إِليكَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٦ ) في صحيح الجامع

عومەر‌ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر خوای گەورە پارە و ماڵێكی بۆ ناردیت كە خۆت داوات نەكردبێت و هەوڵت بۆ نەدابێت، ئەوا وەری بگرە، چونكە ئەوە رزقێكە خوای گەورە بۆی راپێچ كردوویت ) .

( ٥١٠ ) ( خ د ) عن عبدالله بن عمرو يقول: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَرْبَعُونَ خَصْلَةً أَعْلاهُنَّ مَنِيحَةُ الْعَنْزِ لايَعْمَلُ رجلٌ بِخِصْلَةٍ مِنْهَا رَجَاءَ ثَوابِهَا وَ تَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا إِلَّا أَدْخَلَهُ اللهُ تَعالىَ بِهَا الْجَنَّةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨٩١ ) في صحيح الجامع

عبد الله كوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( چل خەسڵەت هەن كە گرنگترینیان بەخشینی بزنێكە، هەر كەسێك كار بە یەكێكیان بكات بە ئومێدی پاداشتەكەی و لەبەر ئەوەی كە بەڵێنی خوای پێ راستە كە پەیمانی پاداشتی خێری پێ داوە، ئەوا خوای گەورە بەو كارەی دەیخاتە بەهەشتەوە ).

( ٥١١ ) ( حم ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا آتَاكَ اللهُ مِنْ أَمْوالِ السُّلْطَانِ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ وَلا إِشْرافٍ فَكُلْهُ وَ تَمَوَّلْهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٠٠ ) في صحيح الجامع

ابو درداء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەرچیەك كە خوای گەورە لە پارە و ماڵی دەسەڵاتداران بۆی ناردیت بە بێ ئەوەی كە خۆت داوای بكەیت و تەماعت تیایدا هەبێت، ئەوا بیخۆ و وەریبگرە و بیخەرە سەر ماڵەكەی خۆت).

## روون كردنەوەی فەرموودەكە :

مەبەستی فەرموودەكە ئەوەیە كە چل خەسڵەتی باش هەن، واتە چل جۆری خێر كردن و چاكە كردن هەن كە لە هەموویان بەرزتر بە خشینی بزنێكە بە كەسێك بۆ ماوەیەك هەتا سود لە شیرەكەی و خوریەكەی ببینێت پاشان لێی وەبگرێتەوە ،هەر كەسێك یەكێك لەو چل خەسڵەت و خێركردنە بە ئەنجام ·گەیەنێت، وەكاری پێ بكات بەمەرجێك تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، بە ئومێد و لەسەر باوەڕ بوون بە بەلینی پاداشتی خوای گەورە بێت، ئەوا خوای گەورە بە رەحمی خۆی دەیخاتە بەهەشتەوە، كاتێكیش كە دەفەرموێت: بەخشینی ئەو بزنە بۆ ماوەیەك بە كەسێك بەرزترین جۆری ئەو چل خەسڵەتەیە مەبەستی ئەوەیە كە بەخشینی كەم هەرگیز بەكەم نەزانرێت، وە چل جۆرەكەی تریشی هەموویان بەیان نەكردووە، بۆ ئەوەی كە تۆ ئومێدت بە هەموو حۆرێكی خێركردن و ماڵ بەخشین و دەست گیرۆیی كردنی خەڵك هەبێت لە هەموو بوارێكدا هەرچەندە كەمیش بێت ئەگەر بە دەنكە خورمایەكیش بێت .

( ٥١٢ ) ( ن ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا آتَاكَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ مِنْ هَذا الْمَالِ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ وَلا إِشْرافٍ فَخُذْهُ فَتَمَوَّلَهُ أَوْ تَصَدَّقَ بِهِ وَ مَا لا فَلا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٠٣ ) في صحيح الجامع

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەرچیەك كە خوای گەورە لەم پارە و ماڵە پێی بەخشیت و بۆی ناردیت بە بێ ئەوەی كە خۆت داوای بكەیت و هەوڵی بۆ بدەیت ئەوا وەری بگرە و بەكاری بهێنە یان بیكە بەخێر و بیبەخشە، ئەگەر نا ئەوا تۆ هەڵپەی بۆ مەكە ).

( ٥١٣ ) ( حم ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مِنْ هَذَا الْمَالِ شَيْئاً مِنْ غَيْرِ أَنْ يَسْأَلَهُ فَلْيَقْبَلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ سَاقَهُ الله إِلَيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١/٥٩١٠) في صحيح الجامع وهذا حدث مستدرك من الطبعة الاولى قال الألباني في صحيح إبن ماجة رقم (٩٣٥) (صحيح)

ابو هريره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر كەسێك لەم پارە و ماڵە خوای گەورە شتێكی بۆ نارد بە بێ ئەوەی كە خۆی داوای بكات، با وەری بگرێت و قبوڵی بكات، چونكە ئەوە رزقێكە خوای گەورە بۆی ناردووە ).

## روون كردنەوەی فەرموودەكان :

لە روون كردنەوەی ئەم فەرموودانەدا إبن جرير الطبري دەڵێ: هەر كەسێك بەخششێكی پێ بدرێت لە لایەن كەسێكەوە كە بەخششەكەی دروستە جا ئیتر پاشا و دەسەڵاتداربێت یان هەر كەسێكی تر بێت، پیاوێكی عادل بێت یان فاسق بێت، ئەوا دروستە لێی قبولّ بكرێت، پاشان بە سەنەدی خۆی دەیگرێتەوە كە عبد العزيزی كوڕی مروان نامەیەك دەنووسێت بۆ عبدالله ی كوڕی عومەر پێی دەڵێ چ پێداویستیەكت هەیە بۆم بنووسە و بۆم بنێرە، ئەویش بۆی دەنووسێت: ( من داوای هیچ شتێكت لێ ناكەم وە ئەگەر رزقێكیش خوا بمداتێ و لە لایەن تۆوە بۆم بێت من رەتی ناكەمەوە ). ئەویش هەزار دیناری بۆ دەنێرێت، ئەویش وەری دەگرێت و قبوڵی دەكات .

## ( ١٨ ) ( بەرتیل )

( ٥١٤ ) ( حم ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللَّهُ الرَّاشِي وَ الْمُرْتَشِي فِي الْحُكْمِ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٥٠٩٢) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نەفرەتی خوا لە بەرتیل دەرو بەرتیل وەرگر بێت لە مەسەلەی حوكمدا ).

( ٥١٥ ) ( حم د ت هـ ) عن إبن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعْنَةُ الله عَلَى الرَّاشِي وَ الْمُرْتَشِي ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥١١٣) في صحيح الجامع

عبدالله ی كوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نەفرەتی خوا لە بەرتیل دەر و بەرتیل وەرگر بێت ) .

## روون کردنەوەی فەرموودەکان:

زاناکان دەفەرموون بەرتیلی حەرام کە پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی لێکردووە ئەو بەرتیلەیە کە ماف و حەقێکی رەوای پێ لەکار بخەیت و نەهێڵی بگاتە دەست خاوەنەکەی یان کارێکی نابەجێی پێ رایی بکەیت و مافێکی ناڕەوای پێ بەدەست بهێنیت. بەڵام ئەگەر مافێکی رەوای خۆت لێ زەوت کرابوو یان زوڵم و ستەمێکت لەسەر دانرابوو وە بەبێ بەرتیل دان مافەکەیان نەدایتەوە یان ستەمەکەیان لەسەر لانەبردیت ئەوا زاناکان پێیان وایە لەو کاتەدا بەرتیل دانەکە بۆ تۆی ماف خوراو و ستەملێکراو دروستە بەڵام بۆ ئەو کەسەی وەری دەگرێت حەرامە.

وە ئیمامی الذهبي دەڵێ: کە بەرتیل یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ( الكبائر ) چونکە نەفرەت لە خاوەنەکەی کراوە. بە تایبەت لە بواری حوکم و قەزاوەتدا .

## ( ١٩ ) ( سوێند خواردن لە فرۆشتندا )

**( ٥١٦ ) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَـةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ: رَجُلٌ حَلَفَ عَلَى سِلْعَتِه لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا أَكْثَـرَ مِمَّا أُعْطِيَ وَ هُوَ كَاذِبٌ، وَ رَجُلٌ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ لِيَقْـتَطِعَ بِهَا مَالَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ، وَ رَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ مَائِه فَيَقُولُ اللهُ: الْيَوْمَ أَمْنَعُكَ فَضْلِي كَمَا مَنَعْتَ فَضْلَ مَالَمْ تَعْمَلْ يَدَاكَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٦٥ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر کەس خوای گەورە لە قیامەتدا قسەیان لەگەڵدا ناکات و سەیریشیان ناکات، پیاوێك سوێند بخوات لەسەر کاڵاو شت و مەکەکەی کە زیاتریان پێ داوە لەوەی کە پێی دەدەن و بەدرۆیشی بێت، وە پیاوێك لە پاش عەسردا سوێند لەسەر شتێکی درۆ بخوات بۆ ئەوەی ماڵی پیاوێکی موسڵمانی بۆ خۆی پێ دابڕێت، وە پیاوێکیش زیادەی ئاوەکەی لە خەڵك قەدەغە بکات و نەیانداتێ، ئەوا خوای گەورە پێی دەڵێ: ئەمڕۆ منیش فەزڵی زیادەی خۆمت لێ قەدەغە دەکەم و بێ بەشت دەکەم لێی هەروەك چۆن تۆش ئەو زێدە ئاوەت لە خەڵك قەدەغە دەکرد هەرچەندە ئاوەکە شتێك بوو بە دەستی خۆت دروستت نەکردبوو ) .

**( ٥١٧ ) ( حم م ٤ ) عن أبي ذر عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ ثَلاثَـةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلا يُزَكِّيهِمْ وَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، قال: فقرأ رسول الله(ﷺ) ثلاث مرار، قال أبو ذر: خابوا وخسروا، من هم يا رسول الله(ﷺ)؟ قال: ﴿ الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَ الْمَنَّانُ، وَ الْمُنْفِقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٦٦ ) في صحيح الجامع**

ابوذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر کەس لە قیامەتدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا ناکات و سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوەو ئەشکەنجەیەکی زۆر بە ئازاریشیان هەیە ) دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ سێ جار ئەم فەرمایشتەی دووبارە کردەوە، ( ابو ذر )یش ووتی: دەی با هەر نابووت و

خەسارەت مەند بن، كێن ئەو كەسانە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: ئەوەی كە پۆشاكەكەی بەری درێژ و شۆڕ دەكاتەوە هەتا لە خاك بخشێت، وە ئەو كەسەی كە منەت بەسەر بەندەكانی خواوەوە دەكات، وە ئەو كەسەشی كە كاڵاو شتومەكی بە سوێندی درو سەرف دەكات و دەیفرۆشێت).

( ٥١٨ ) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَـةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلا يُزَكِّيهِمْ وَ لَهُمْ عَذابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلى مَنَعَ فَضْلَ ماءٍ بِالْفَلاةِ يَمْنَعُهُ مِنْ ابْنَ السَّبِيلِ، وَ رَجُلٌ بَايَعَ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ لَهُ بِاللهِ لأَخْذَهَا بِكَذا وَ كَذا فَصَدَّقَهُ وَ هُوَ عَلى غَيْرِ ذَلِكَ، وَ رَجُلٌ بَايَعَ إِمَاماً لا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِدُنْيَا فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا وَفَى لَهُ وَ إِنْ لَمْ يُعْطِهِ لَمْ يَفِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٦٧ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر كەسان هەن كە خوای گەورە لە قیامەتدا قسەیان لەگەڵدا ناكات، وەسەیریشیان ناكات لە قیامەتدا. وەپاكیشیان ناكاتەوە، و ئەشكەنجەیەكی زۆر بە ئازاریشیان بۆ دانراوە: پیاوێك وا لە سەر زیادە ئاوێك لە چۆڵەوانییەكدا و لە رێبوارانی قەدەغە دەكات، وە پیاوێك لە پاش عەسردا كاڵایەك بە پیاوێكی تر بفرۆشێت و سوێندی بۆ بخوات كە ئەوەندەی پێ داوە و ئەویش باوەڕی پێ بكات بەڵام واش نەبێت، وە پیاوێك بەیعەت بدات بە ئیمام و پێشەوایەك تەنها بۆ بەدەست هێنانی ماڵی دونیا ئەو بەیعەتەی پێ دابێت، جا ئەگەر لەو ماڵی دونیایەی پێ دا ئەوا وەفا بە بەیعەتەكەی بكات و، ئەگەر نەشیدایە ئەوا وەفای پێ نەكات و بەیعەتەكەی بشكێنێت ).

( ٥١٩ ) ( طب ) عن عصمة بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَـةٌ لا يَنْظُرُ اللهُ إِلَيْهِمْ غَدًا: شَيْخٌ زَانٍ، وَ رَجُلٌ اتَّخَذَ الإِيْمَانَ بِضَاعَةً يَحْلِفُ فِي كُلِّ حَقٍ وَ بَاطِلٍ، وَ فَقِيرٌ مُخْتَالٌ يَزْهُو ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٦٩ ) في صحيح الجامع

عصمەی كوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر كەسان سبەینێ خوای گەورە سەیریان ناكات، بە ساڵاچویەكی زیناكار و داوێن پیس، وە پیاوێك سوێند خواردنی كردبێتە كاڵای خۆی و سوێند لەسەر هەموو حەق و ناحەقێك بخوات، وە كەسێكی هەژار و نەدار كە بە فیز و دەعیە بێت و بە خۆی بنازێت ) .

( ٥٢٠ ) ( طب هب ) عن سلمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَـةٌ لا يَنْظُرُ اللهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذابٌ أَلِيمٌ: أُشَيمِط زَانٍ، وَ عَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ، وَ رَجُلٌ جَعَلَ اللهَ بِضَاعَتَهُ لا يَشْتَرِي إِلَّا بِيَمِينِهِ وَلا يَبِيعُ إِلَّا بِيَمِينِهِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٧١ ) في صحيح الجامع

سلمان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر كەس لە قیامەتدا خوای گەورە سەیریان ناكات و پاكیان ناكاتەوەوە ئەشكەنجەیەكی زۆر بە ئازاریشیان هەیە، پیرێكی سەر سپی زیناكار، وە هەژارێكی منداڵ دار كە لوت بەرز و خۆ بە گەورە زان بێت، وە پیاوێكیش ناوی خوای تێكەڵ بە كاڵاو

شتو مەکەکەی کردووە، هیچ ناکرێت هەتا سوێندی لەسەر نەخوات و هیچیش نافرۆشێت هەتا سوێندی لەسەر نەخوات ) .

( ٥٢١ ) ( ن هب ) عن أبي هريرة أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ أَرْبَعَةٌ يُبْغِضُهُمُ اللهُ تَعَالَى: الْبَيَّاعُ الْحَلَّافُ، وَ الْفَقِيرُ الْمُخْتَالُ، وَ الشَّيْخُ الزانِي، وَ الإِمَامُ الجَائِرُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٨٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( چوار جۆر کەسان خوای گەورە رقی لێیانە و دەیان بوغزێنێت: فرۆشیاری سوێند خۆر، وە هەژاری بە فیز و دەعیە، وە بەساڵاچووی زینا کار، وەپێشەوا وسەرکردەی ستەم کار).

## ( ٢١ ) ( هەرەشەی خوا لە سوو خۆران )

( ٥٢٢ ) ( حم طب ) عن عبدالله بن حنظلة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ دِرْهَمُ رِبًا يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ وَ هُوَ يَعْلَمُ أَشَدُّ عِنْدَ اللهِ مِنْ سِتَّةٍ وَ ثَلاثِيْنَ زَنْيَةً ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٣٦٥) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( درهەمێکی سوو کە پیاو بیخوات و بزانێت کە ئەو پارەیە سووە، گەورەتر و توندترە لە لای خوای گەورە لە سی و شەش زینا )

( ٥٢٣ ) ( حم د ت هـ ) عن عبدالله بن مسعود أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ لَعَنَ اللهُ آكِلَ الرِّبَا وَ مُوكِلَهُ وَ شَاهِدَهُ وَ كَاتِبَهُ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٧٩) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نە فرەتی خوا لەو کەسە بێت کە سووەکە دەخوات، و لەوەش کە دەیدات، و لە شاهیدەکەیشی و لە نووسەرەکەیشی ).

( ٥٢٤ ) ( طب ) عن عبدالله بن مسعود أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ لَعَنَ اللهُ الرِّبَا وَ آكِلَهُ وَ مُوكِلَهُ وَ كَاتِبَهُ وَ شَاهِدَهُ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٩٣) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نەفرەتی خوا لە سوو بێت، لەو کەسەش کە دەیخوات و ئەوەش کە سووەکە دەداتەوە، وە لە نووسەرەکەیشی و لەشایەتەکەیشی )

( ٥٢٥ ) ( حم م ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ آكِلَ الرِّبَا وَ مُوكِلَهُ وَ شَاهِدَيْهِ وَ كَاتِبَهُ هُمْ فِيْهِ سَوَاءٌ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٨٩) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت کە سووەکە دەخوات وە لەوەش کە دەرخواردی دەدات وە هەردوو شایەتەکەیشی و نووسەرەکەیشی، هەموویان تیایدا وەك یەك وان ) .

## (٢٢) ( مەی نۆشین و خواردنی مردارەوە بوو و گۆشتی بەراز )

( ٥٢٦ ) ( د ) عن أبي هريرة أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ إِنَّ اللهَ حَرَّمَ الْخَمْرَ وَ حَرَّمَ الْمَيْتَةَ وَ ثَمَنَهَا وَ حَرَّمَ الْخِنْزِيْرَ وَ ثَمَنَهُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٤٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە مەی حەرام کردووە وە نرخەکەیشی، وە مردارەوە بووی حەرام کردووە وە نرخەکەیشی، وە بەرازی حەرام کردووە وە نرخەکەیشی ) .

( ٥٢٧ ) ( ك هب ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ لَعَنَ الْخَمْرَ وَ عَاصِرَهَا وَ مُعْتَصِرَهَا وَ شَارِبَهَا وَ سَاقِيَهَا وَ حَامِلَهَا وَ الْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ وَ بَائِعَهَا وَ مُشْتَرِيْهَا وَ آكِلَ ثَمَنِهَا ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٠٢) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە مەی، وەلەو کەسەش کە میوەکەی دەگوشێت، وە لەو کەسەش کە بۆی دەگوشرێت، وە لەوەش کە دەیخواتەوە، وە لەوەش کە پێکەکەی بۆ تێدەکات و دەیداتێ، وە لەو کەسەش کە هەڵی دەگرێت وە لەوەشی کە بۆی هەڵدەگرن وە لە فرۆشیارەکەشی وە لە کڕیارەکەشی وە ئەو کەسەش کە نرخەکەی دەخوات ) .

( ٥٢٨ ) ( حم ق ٤ ) عن جابر بن عبد الله قال: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ يَقُولُ: ﴿ إِنَّ اللهَ وَ رَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَ الْمَيْتَةِ وَ الْخِنْزِيرِ وَ الأَصْنَامِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٣٢) في صحيح الجامع

جابری کوڕی عبدالله دەڵێ: لە ساڵی فەتحی مەکەدا کاتێك لەوێ بوو لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە کە فەرموویەتی: ( خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی مەی و مردارەوە بوو و بەراز و بت ( پەیکەر ) یان حەرام کردووە ).

## ( ٢٣ ) ( فەوتاندن و بەفیڕۆ دانی پارە و ماڵ )

( ٥٢٩ ) ( ق ) عن المغيرة بن شعبة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى حَرَّمَ عَلَيْكُمْ: عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ وَ وَأْدَ الْبَنَاتِ وَ مَنْعاً وَ هَاتِ، وَ كَرِهَ لَكُمْ: قِيْلَ وَ قَالَ وَ كَثْرَةَ السُّؤَالِ وَ إِضَاعَةَ الْمَالِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٤٩) في صحيح الجامع

مغیرەی کوڕی شعبە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە ئەمانەی لەسەر حەرام کردوون: ڕەنجاندن و دڵئێشانی دایکان، وەزیندە بەچاڵ کردنی کچان، وە ڕەزیلی و پیسکەیی لە ماڵی خۆتدا و داوا کردنی ماڵی خەڵك، وە پێشی ناخۆشە ئەم شتانە بکەن: وتی وتی و قسەو قسەڵۆك، وە زۆر پسیار کردن و خۆ لە شت هەڵقورتان، وە فەوتاندن و بە فیڕۆ دانی پارە و ماڵ ) .

## ( ٢٤ ) ( فەزڵی قەناعەت کردن بەوەی کە خوا پێی داوین )

( ٥٣٠ ) ( حم م ت هـ ) عن عبدالله بن عمرو: أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَ رُزِقَ كَفَافاً وَ قَنَّعَهُ اللهُ بِمَا آتَاهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٦٧ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەو کەسە رزگار و سەر فراز دەبێت کە موسڵمان بوو بێت و هێندەی پێویست رزقی درا بێت و خوای گەورەش قەناعەتداری کردبێت بەو بەشەی کە پێ ی داوە ).

## (٢٥) ( سەبارەت بە دەوڵەمەندی )

( ٥٣١ ) ( ق ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَّا مَنْ أَعْطَاهُ اللهُ تَعالىَ خَيْراً فَنَفَحَ فِيْهِ بِيَمِينِهِ وَ شِمَالِهِ وَ بَيْنَ يَدَيْهِ وَ وَرَاءَهُ وَ عَمِلَ فِيْهِ خَيْراً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٥٤ ) في صحيح الجامع

ابو ذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەوانەی کە لە دونیادا زۆریان هەیە ئەوانەن کەلە رۆژی قیامەت کەمیان هەیە جگە لە کەسێك نەبێت کە خوا ماڵ و خێرێکی زۆری پێداوە، ئەویش بە راست و چەپ و پێش و پاشیدا دەیبەخشیەوە، وەکاری خێر و چاکەی پێ کردووە ).

( ٥٣٢ ) ( حم ) عن رجل من مزينة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنِ اسْتَعَفَّ أَعَفَّهُ اللهُ وَ مَنِ اسْتَغْنَى أَغْنَاهُ اللهُ وَ مَنْ سَأَلَ النَّاسَ وَ لَهُ عَدْلُ خَمْسِ أَوَاقٍ فَقَدْ سَأَلَ إِلْحَافاً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠١٢ ) في صحيح الجامع

پیاوێك لە خێڵی – مزينة – دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك هەوڵبدات دەستی پاك رابگرێت خوای گەورەش دەست پاکیی پێ دەبەخشێ، وەهەر کەسێکیش بە بەشی خۆی قەناعەت بکات و داوا لە خەڵك نەکات ئەوا خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات و ناهێڵێت پێویستی بە خەڵك بێت، وەهەر کەسێکیش هێندەی بڕی پێنج هۆقەی هەبێت و دەستی لە خەڵك پان بکاتەوە ئەوا منجڕیی کردووە و نارەزایی دەربڕیوە بەرامبەر بە رزقی خۆی ).

( ٥٣٣ ) ( حم ن الضياء ) عن عبدالرحمن بن أبي سعيد الخدري عن أبيه قال: سَرَحَتْنِي أُمِّي إِلى رَسُولِ اللهِ(ﷺ) فَأَتَيْتُهُ وَقَعَدْتُ فَاسْتَقْبَلَنِي وَقَالَ: ﴿ مَنِ اسْتَغْنَى أَغْنَاهُ اللهُ وَ مَنِ اسْتَعَفَّ أَعَفَّهُ اللهُ وَ مَنِ اسْتَكْفَى كَفَاهُ اللهُ وَ مَنْ سَأَلَ وَ لَهُ قِيمَةُ أُوقِيَةٍ فَقَدْ أَلْحَفَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٢٦ ) في صحيح الجامع

عبدالرحمن ی کوڕی أبو سعيد الخدري لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: دایکم ناردمیە دەرەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) منیش هاتمە خزمەتی و دانیشتم، ئەویش رووی تێکردم و فەرمووی: ( هەر کەس بە بەشی خۆی قەناعەت بکات و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێت ئەوا خوای گەورەش دەوڵەمەندی دەکات و ناهێڵێت پێویستی بە خەڵك بێت، وە هەرکەسێکیش هەوڵبدات دەستی پاك رابگرێت ئەوا

خوای گەورەش دەستیی پاك دەكات، وە هەركەسێكیش هەوڵبدات كیفایەت بكات بەوەی كە خوا پێی داوە ئەوا خوای گەورەش لە هەموو شتێك هێندەی كیفایەت و پێویستی دەداتێ، وە هەركەسێكیش نرخی یەك هۆقە زیو ( ١٢ درهم ) ی هەبێت و سواڵ بكات ئەوا منجری كردووە و نارەزایی نواندووە بەرامبەر بەو بەشەی كە خوای گەورە پێی داوە ) .

## ( ٢٦ ) ( پێ كێش كردنی تاوانباران لەلایەن خواوە )

( ٥٣٤ ) ( حم طب هب ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا رَأَيْتَ اللهَ تَعالىَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنَ الدُّنْيَا مَا يُحِبُ وَ هُوَ مُقِيمٌ عَلىَ مَعاصِيهِ فَإِنَّما ذلِكَ مِنْهُ اسْتِدْراج ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦١ ) في صحيح الجامع

عقبەی كوڕی عامر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر بینیت خوای گەورە، هەرچی بەندەكەی خۆی پێی خۆشە لە دونیادا دەیداتێ و ئەویش هەر بەردەوامە لەسەر تاوان و بێ فرمانی خوا، ئەوە بە دڵنیایەوە بزانە كە ئەوە پێ كێش كردن و پێ خزانە لە لایەن خواوە بۆ ئەو بەندەیە ).

## ( ٢٧ ) ( نەفرەتی خوا لە كۆمەڵێك كەسان )

(٥٣٥ ) ( حم م ن ) عن علي بن أبي طالب قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ لَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيْه وَ لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ وَ لَعَنَ اللهُ مَنْ آوىَ مُحْدِثاً وَ لَعَنَ اللهُ مَنْ غَيَّرَ مَنَارِ الأَرْضِ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥١١١ ) في صحيح الجامع

علي كوڕی ابو طالب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: نەفرەتی خوا لەو كەسە بێت كە نەفرەت لە دایك و باوكی خۆی دەكات، وە نەفرەتی خوا لەهەر كەسێك بێت كە سەربڕین و قوربانییەكەی بۆ غەیری خوایە، وە نەفرەتی خوا لەهەر كەسێك بێت كە داڵدەی تاوانبارێكی فیتنە گێڕ بدات و پاڵپشتی لێ بكات، وەنەفرەتی خوا لە هەر كەسێك بێت كە هێما جیا كەرەوەكانی زەوی دەگۆڕێت )

## روون كردنەوەی فەرموودەكە :

پێغەمبەر(ﷺ) لەم فەرموودە پیرۆزەدا نەفرەت لە كەسانێك دەكات كە بە یەكێك لەم كارانەی خوارەوە هەستن:

**یەكەم:** كەسێك نەفرەت ( واتە جوێن دان و قسە پێ ووتن ) ئاراستەی دایك و باوكی خۆی بكات و قسەی سووك و ناشرینیان پێ بڵێت .

**دووەم:** کەسێك سەربڕین و قوربانییەکەی بۆ غەیری خوا بێت واتە شەریك بۆ خوا بڕیار بدات جا نیتر ئەو قوربانییەو سەربڕینە بۆ بتێك بێت یان بۆ شێخ و ئەولیا بێت یا بۆ گۆڕ و مردوو بێت یان بۆ کەسێکی تر بێت جگە لە خوا، ئەوا هیچ جیاوازیەکی نییە و لە هەموو حاڵەتەکاندا کاری شیرکی ئەنجام داوە و لەسنووری ئەم ئایەتە پیرۆزە دەرچووە ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ .

**سێهەم :** کەسێك دالّدەی کەسانێکی فیتنە گێڕ و ئاژاوە چی و تاوانبار بدات و پشت گیریان لێبکات

**چوارەم :** کەسێك کە هێمای جیا کەرەوەکانی زەوی بگۆڕێت، واتە ئەو نیشانەو هێمایانەی کە زەوی و موڵکی کەسێك لە موڵکی کەسێکی تر جیا دەکاتەوە، کە گومانی تێدا نییە لادان و گۆڕینی ئەو نیشانەو هێمایانە ئەبێتە هۆی تێکەڵ بوونی حەقی خەڵك و نانەوەی ئاشوب و شەڕ و فیتنە لە نێوانیاندا

## ( ٢٨ ) ( زەوت کردنی بستێك زەوی )

( ٥٣٦ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **لا يَأْخُذُ أَحَدٌ شِبْراً مِنَ الأَرْضِ بِغَيْرِ حَقِّهِ إلا طَوَّقَهُ اللهُ إلىَ سَبْعِ أَرْضِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ** ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٧٥٦٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك تەنها بستێك زەوی ببات بە بێ ئەوەی کە مافی خۆی بێت، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا لە گەردنی دەئاڵێت هەتا حەوت تەبەقەی زەوی دەیبات بە ناخدا ) .

( ٥٣٧ ) ( حم م ) عن وائل بن حجر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **مَنِ اقْتَطَعَ أَرْضاً ظَالِماً لَقِيَ اللهَ وَ هُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ** ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٠٧١ ) في صحيح الجامع

وائلي کوڕی حُجر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك بە زوڵم و ستەم پارچە زەوییەك بۆ خۆی ببچڕێت، ئەوا کاتێك دەچێتە بەردەمی خوا، خوا لێی ڕەنجاوو تووڕەیە ) .

( ٥٣٨ ) ( طب ) عن يعلى بن مرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **أَيُّما رَجُلٌ ظَلَمَ شِبْراً مِنَ الأَرْضِ كَلَّفَهُ اللهُ تَعالَى أَنْ يَحْفِرَهُ حَتَّى يَبْلُغَ آخِرَ سَبْعِ أَرْضِينَ ثُمَّ يُطَوِّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ** ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٤١١٢ ) في صحيح الجامع

يعلى ی کوڕی مرّة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر پیاوێك بە زوڵم بستێك خاك بەرێت، ئەوا خوای گەورە لە قیامەتدا پێی دەسپێرێت کە ئەو زەوییە هەڵبکەنێت هەتا دەگاتە حەوت تەبەقەی بنی. پاشان دەخرێتە گەردنی هەتا لێپرسینەوە و قەزاوەتی نێوان هەموو خەڵك تەواو دەبێت )

## ( ٢٩ ) ( زیندووکردنەوەی زەوییەکی مردوو )

( ٥٣٩ ) ( طب ) عن فضالة بن عبيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الأَرْضُ أَرْضُ اللهِ وَ الْعِبَادُ عِبَادُ اللهِ ، مَنْ أَحْيَا مَوَاتاً فَهِيَ لَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٧٤٨) في صحيح الجامع

فضالەی کوڕی عُبید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەم زەوییە زەوی خوایە و ئەم بەندانەش بەندەی خوان، جا هەر کەسێك زەوییەکی مردوو زیندوو بکاتەوە ئەوا زەوییەکە بۆ خۆیەتی )

## ( ٣٠ ) ( مافی ئاو و لە وەرگا )

( ٥٤٠ ) ( حم ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ مَنَعَ فَضْلَ مَاءٍ أَوْ كَلإٍ مَنَعَهُ اللهُ فَضْلَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٥٢) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك زیادەی ئاوێك یان لەوەڕگایەك لە خەڵك قەدەغە بکات ئەوا خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا لە زیادە و فەزڵی خۆی بێ بەشی دەکات ).

## ( ٣١ ) ( خوای گەورە مافەکانی دیاری کردووە )

( ٥٤١ ) ( حم ت ) عن أبي أمامة الباهلي قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) في خُطْبَتِهِ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ: ﴿ إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَ تَعَالَىٰ قَدْ أَعْطَىٰ لِكُلِّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَ لِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ وَ حِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ، وَ مَنْ إِدَّعَى إِلَىٰ غَيْرِ أَبِيهِ أَو إِنْتَمَى إِلَىٰ غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ التَّابِعَةُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَ لا تُنْفِقُ امْرَأَةٌ شَيْئاً مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا، قِيلَ: وَ لا الطَّعَامَ؟ قَالَ: ذٰلِكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٨٩) في صحيح الجامع

ابو امامەی باهلي دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) لە ووتاری حەجی ماڵ ئاواییدا دەیفەرموو: ( خوای گەورە هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی پێ داوە، جا ئەو کەسە کە میرات بە جێ دەهێڵێت بۆی نییە وەسیەتی لەسەر بکات، وە منداڵ ناوی ئەو باوکە هەڵدەگرێت کە زەواجی شەرعی لەگەڵ داییکدا کردووە، وەداوێن پیسی زیناکاریش بەرد باران دەکرێت وە حساب و لێپرسینەوەشیان لەسەر خوای گەورەیە، وەهەر کەسێکیش ناوی خۆی بداتە پاڵ کەسێکی غەیری باوکی یان ئینتیمای خۆی بۆ کەسانی غەیری خاوەنەکەی ڕابگەیەنێت، ئەوا نەفرەتی بەردەوامی خوای لەسەر بێت هەتا ڕۆژی قیامەت، ئافرەت نابێت لە ماڵی مێردەکەی ببەخشێت و سەرف بکات بەبێ ڕەزامەندی مێردەکەی، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا: خواردنیش نەبەخشێت ؟ فەرمووی: ئەوە باشترین جۆری ماڵ و سامانمانە ).

## روون كردنەوەی فەرموودەكە :

**یەكەم :** مەبەست لەوەی كەسێك كە میراتییەك بەجێ دەهێڵێت بۆی نییە وەسیەت بكات ئەوەیە كە خوای گەورە ڕێژەی دابەشكردنی میراتی بەسەر میراتگرەكاندا بەیان كردووە و كەسیش بۆی نییە بیگۆڕێت، تەنانەت خاوەن موڵكیش كە وەسیەت دەكات تەنها لە سێ یەكی ماڵەكەیدا بۆی هەیە وەسیەت بكات و بە دڵی خۆی دابەشی بكات ئیتر دوو بەشەكەی تر دەبێت هەر بەپێی حوكمەكانی میراتیی لەئیسلامدا دابەش بكرێت .

**دووەم:** نابێت هیچ منداڵێك بە غەیری ناوی باوكی ڕاستەقینەی خۆی ناو ببرێت، وەنابێت ئەگەر كەسێك منداڵێك هەڵبگرێتەوە و بە خێوی بكات ناوی بخاتە سەر ناوی خۆی، بەڵكو دەبێت بەناوی باوكی ڕاستەقینەی خۆیەوە ناو ببرێت.

**سێ هەم :** لەم فەرموودەیەدا هاتووە كە ئافرەت بە بێ ڕەزامەندی مێردەكەی نابێت خەرجی و بەخشین لە ماڵی مێردەكەی بكات، بەڵام ئەمە بۆ خەرجی و نەفەقەتی زیاد لە پێویستە، چونكە لە فەرموودەیەكی صحیحدا كە لە صحیح البخاري دا هاتووە كە هندی كچی عتبە كە ژنی ابو سفیان بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا مێردەكەم پیاوێكی چرووك و ڕەزیلە دڵی نایەت مەسرەفی ماڵەكەی بكات، جا ئایا ئەتوانم هیچ لە پارە و ماڵەكەی بەرم بۆ خەرجی؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: بەڵێ بەڵام هێندەی كە پێویستی خۆت و منداڵەكانت دابین دەكات .

## ( ٣٢ ) ( شتی وون بوو دۆزراوە )

( ٥٤٢ ) ( طب ) عن الجارود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **الضَالَةُ وَ الْلـقُطَـةُ تَجِدُهَا فَانْشُدهَا وَ لا تَـكْتُمْ وَ لا تُغَيِّبْ ، فَإنْ وَجَدْتَ رَبَّهَا فَأدِّهَا وَ إلاَّ فَإِنَّمَا هُوَ مَالُ اللهِ يُؤْتِيْهِ مَنْ يَشَاءُ** ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٣٨٨٧ ) في صحيح الجامع

الجارود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر شتێكی وون بوو و دۆزراوە كە دەیدۆزیتەوە، ئاشكرای بكە و هەوڵی دۆزینەوەی خاوەنەكەی بدە، وە نابێت بیشاریتەوە و پەردەپۆشی بكەیت، جا ئەگەر خاوەنەكەیت دۆزییەوە، بۆی بگەڕێنەرەوە، وە ئەگەر خاوەنەكەیت بۆ ئاشكرا نەبوو، ئەوا ئیتر ماڵی خوایە و دەیداتە هەركەسێك كە خۆی بیەوێت ).

( ٥٤٣ ) ( حم د هـ ) عن عياض بن حمار رضي الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَنْ وَجَدَ لُقْطَةً فَلْيُشْهِدْ ذَوِي عَدْلٍ وَ لا يَكْتُمْ وَ لا يَعْبَث فَإِنْ وَجَدَ صَاحِبَهَا فَلْيَرُدَّها عَلَيْهِ وَ إلاَّ فَهُوَ مالُ اللهِ يُؤْتِيْهِ مَنْ يَشاءُ** ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٥٨٢ ) في صحيح الجامع

عیاض کوڕی حمار دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك شتێکی دۆزییەوە، با دوو کەسایەتیی خاوەن عەدالەت ئاگادار بکاتەوە، وەنابێت بیشارێتەوە و دەستکاری بکات، جا ئەگەر خاوەنەکەیی دۆزییەوە، با بۆی بگەڕێنێتەوە، ئەگەر نا ئیتر ئەوەماڵی خوایە دەیداتە هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت ).

## (٣٣) ( شەفاعەت کردن بۆ یەکتری لە کار و باری دونیادا )

( ٥٤٤ ) ( ق ٣ ) عن أبي موسى قال: كان رسُولُ الله(ﷺ) إذا أتَاهُ طَالبُ حَاجَةٍ أقْبَلَ علىَ جُلَسَائه فقَالَ: ﴿ اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا وَ يَقْضِي اللهُ عَلىَ لِسَانِ نَبِيِّه مَا شَاءَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٠٠٧) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کەسێك بهاتایە لای و داوای یارمەتییەك یان جێبەجێکردنی کارێکی لێ بکردایە، ئەویش رووی دەکردە ئەوانەی کە لەگەڵیدا دانیشتوون و دەیفەرموو: ئێوەش شەفاعەت و دەست گیرۆیی بکەن چونکە پاداشتان دەدرێتەوە لەسەری، وە خوای گەورەش ئەوەی کە خۆی بیەوێت لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەیگەیەنێت ).

( ٥٤٥ ) ( د طب ك هق ) عن عبدالله بن عمر قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ منْ حُدُود الله فَقَدْ ضَادَّ اللهَ في أَمْره وَ مَنْ مَاتَ وَ عَلَيْه دَيْنٌ فَلَيْسَ بِالدِّينَار وَ الدِّرْهَم وَ لَكنْ بِالْحَسَنَات وَ السَّيِّئَات وَ مَنْ خَاصَمَ في بَاطلٍ وَ هُوَ يَعْلَمُهُ لَمْ يَزَلْ في سَخَط الله حَتَّى يَنْزعَ ، وَ مَنْ قَالَ في مُؤْمنٍ مَالَيْسَ فيْه أَسْكَنَهُ اللهُ رَدْغَةَ الْخَبَال حَتَّى يَخْرُجَ ممَّا قَالَ وَ لَيْسَ بِخَارِجٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦١٨٩) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی عومەر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك شەفاعەت و تەکلیفێکی وا بکات کە ببێتە هۆی پەك خستن و ئەنجام نەدانی حەدێکی شەرعیی کە خوای گەورە دایناوە، ئەوا ئەو کەسە دژایەتی خوای کردوە بەو کارەی، وە هەر کەسێکیش بمرێت و قەرزێکی لەسەر بێت، ئەوا بە دینار و درهەم لێی وەرناگیرێتەوە لە قیامەتدا بەڵکو بە چاکەکانی و خراپەکانی، وەهەرکەسێکیش مشت و مڕ لەسەر شتێکی ناحەق و بەتاڵ بکات و بشزانێت کەوایە، ئەوا بەردەوام دەکەوێتە بەر تووڕەیی خوا هەتا دەست لەو کارە هەڵنەگرێت، وە هەر کەسێکیش شتێك لەسەر موسڵمانێك بڵێت و بۆی هەڵبەستێت کە تیایدا نەبێت، ئەوا خوای گەورە لە (ردغة الخبال) واتە لەلیتاوی بۆگەنی دۆزەخ – دا جێ نشینی دەکات هەتا لەو قسەیەی کە بەرامبەر بەو موسڵمانە هەڵی بەستبوو دێتە دەرەوە، هەرگیزیش ناتوانێت لێی بێتە دەرەوە.

### ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

١. شەفاعەت کردن و تەکلیف کردنی موسڵمانان بۆ یەکتر بۆ کاری چاك و سودمەند ، پاداشت و خێری لەسەرە لەلایەن خواوە

٢ نابێت شەفاعەت و تەکلیف لە مەسەلەیەکدا بکرێت کەببێتە مایەی پەك خستنی عەدالەت و شەرعی خوا، بۆ نموونە نابێت تەکلیف بۆ دزێك یان جەردەیەك یان عەرەق خۆرێك بکرێت یان بۆ هەر کەسێك کە حەدێکی شەرعیی لەسەر واجب بووبێت هەتا حەدەکەی لەسەر جێبەجێ نەکرێت، چونکە شەفاعەت و تەکلیفی لەو جۆرە دژایەتی کردنی خوایە .

٣ هەر کەسێك بمرێت و حەقی خەڵکی بەسەرەوە بێت، جا قەرزی پارەو ماڵ بێت یان هەرجۆرە حەقێکی تر، ئەوا لە قیامەتدا دینار و درهەم نییە، هەتا بیداتەوە بە خاوەنەکەی بەڵکو لەو خێر و چاکانەی ئەم دەدرێتەوە بە خاوەن قەرزەکە یان خاوەن مافەکە، وە ئەگەر خێر و چاکەیشی نەما ئەوا لە تاوان و گوناهی خاوەن مافەکان هەڵدەگیرێت و دەدرێت بە کۆڵی ئەمدا، خوای گەورە پەنامان بدات.

٤. کەسی باوەڕدار نابێت مشت و مڕ و خۆ عاجز کردن لەسەر مەسەلەیەك بکات کە تەواو دڵنیا نەبێت کە تیایدا لەسەر حەقە و راستییەکە لای ئەمە، چونکە کەسێك لەسەر ناحەق خۆی توڕە و عاجز بکات خوای گەورە لێی دەڕەنجێت.

٥ قسە هەڵبەستن بۆ موسڵمانان، یان تۆمەت دانە پاڵیان بە ناحەق و بوهتان کردنیان، سزاکەی لای خوا هێندە گەورەیە کە خاوەنەکەیی پێ دەخاتە پیسترین شوێنی دۆزەخەوە کە ئەویش لیتاوی پیسی مەنگ خواردووی ناو دۆزەخە کە لە کێم و جەراعەتی پیسی جەستەی سوتاوی دۆزەخییەکانەوە دروست دەبێت.

## ( ٣٤ ) ( فێڵ کردن لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتندا )

**(٥٤٦) (ق) عن أبي هريرة (حم ق ن هـ) عن عمر (حم ق ٤) عن جابر بن عبدالله: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) عَامَ الْفَتْحِ وهُوَ بِمَكَّةَ يَقُولُ: ﴿ إِنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ وَ رَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَ الْمَيْتَةِ وَ الْخِنْزِيرِ وَ الأَصْنَامِ ﴾ . فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهُ يُطْلى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ، فَقَالَ: ﴿ هُوَ حَرَامٌ ﴾ . فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) عند ذلك: ﴿ قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ إِنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ جَمَّلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٢٩٠) في صحيح الجامع**

لە جابری کوڕی عبداللە وە دەڵێ لە ساڵی فەتحی مەککەدا لە شاری مەککە لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی مەی و مردارەوەبوو و بەراز و بتی حەرام کردووە) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی چەوری و بەزی مردارەوەبووش هەروایە؟ چونکە ئەوە روکەشی پاپۆڕەکانی پێ دەکرێت و پێستەی پێ چەور دەکرێت و بۆ روناکی چرا بەکاردەهێنرێت؟ ئەویش فەرمووی: ( نەخێر ئەوەیش حەرامە)ئینجا دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( نەفرەتی خوا

له جوله‌که بێت، کاتێك که خوای گه‌وره چه‌وری و به‌زی له‌سه‌ر حه‌رام کردن، چوون تواندیانه‌وه پاشان فرۆشتیان و ئینجا نرخه‌که‌یان خوارد ).

(٥٤٧) ( حم د ) عن ابن عباس قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) جَالِساً عِنْدَ الرُّكْنِ، قَالَ فَرَفَعَ بَصرهُ إلى السَّمَاءِ فَضَحِكَ فَقَالَ: ﴿ لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ ثَلاثاً إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ فَبَاعُوهَا وَ أَكَلُوا أَثْمَانَهَا وَ إِنَّ اللهَ إِذَا حَرَّمَ عَلَى قَوْمٍ أَكْلَ شَيْءٍ حَرَّمَ عَلَيْهِمْ ثَمَنَهُ ﴾. وَلَمْ يَقُلْ فِي حَدِيثِ خَالِدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الطَّحَّانِ رَأَيْتُ، وَ قَالَ: قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١٠٦ ) في صحيح الجامع

إبن عباس ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌رم(ﷺ) بینی دانیشتبوو له لای روکنی به‌یت، چاوی به‌رز کرده‌وه به‌ره‌و ئاسمان پێکه‌نی و فه‌رمووی: ( نه‌فره‌تی خوا له جوله‌که بێت سێ جار، خوای گه‌وره چه‌وری و به‌زی لێ حه‌رام کردن، که‌چی ئه‌وان هاتن فرۆشتیان ئینجا نرخه‌که‌یان ده‌خوارد،جا خوای گه‌وره ئه‌گه‌ر خواردنی شتێکی له‌سه‌ر میلله‌تێك حه‌رام کردبێت ئه‌وا نرخه‌كه‌شی له‌سه‌ر حه‌رام کردووه ).

## ( ٣٥ ) ( مه‌رجی به‌تاڵ )

(٥٤٨) ( البزار طب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلُّ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى فَهُوَ بَاطِلٌ وَ إِنْ كَانَ مَائَةُ شَرْطٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٢٤ ) في صحيح الجامع

إبن عباس ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( هه‌ر مه‌رجێك که له کتێبه‌که‌ی خوای گه‌وره –واته قورئان–دا نه‌بێت به‌تاڵه ئه‌گه‌ر سه‌د مه‌رجیش بێت ).

(٥٤٩) ( ق ٤ ) عن عائشة أنها قالت: جَاءَتْ بَرِيرَةُ إِلَيَّ فَقَالَتْ: يَاعَائِشَةُ إِنِّي كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَةٌ فَأَعِينِينِي، وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئاً فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ وَنَفَسَتْ فِيهَا: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أُعْطِيَهُمْ ذَلِكَ جَمِيعاً وَيَكُونَ وَلاؤُكِ لِي فَعَلْتُ ، فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا فَعَرَضَتْ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَأَبَوْا وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ وَيَكُونَ ذَلِكَ لَنَا فَذَكَرَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ لِرَسُولِ اللهِ(ﷺ) فَقَالَ: ﴿ لايَمْنَعُكِ ذَلِكِ مِنْهَا ابْتَاعِي وَأَعْتِقِي فَإِنَّ الْوَلاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ ﴾، فَفَعَلَتْ وَقَامَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) فِي النَّاسِ فَحَمِدَ اللهَ تَعَالَى ثُمَّ قَالَ: ﴿ أَمَّا بَعْدُ فَمَا بَالُ النَّاسِ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ ، مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطاً لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهُوَ بَاطِلٌ وَ إِنْ كَانَ مَائَةَ شَرْطٍ ،قَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ وَ شَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ وَ إِنَّمَا الْوَلاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٣٥٦ ) في صحيح الجامع

عائشه ده‌ڵێ: بريرة ( که که‌نیزه‌یه‌ك بوو ) هات بۆ لام ووتی: ئه‌ی عائشه من گرێبه‌ستێکم نوسیوه له‌گه‌ڵ خاوه‌نه‌که‌مدا له‌سه‌ر نۆ ئۆقه‌ی زیو که له هه‌ر ساڵێکدا ئۆقه‌یه‌کی بده‌مێ به‌رامبه‌ر ئازاد کردنم جا تۆش ده‌ستگیرۆیی و یارمه‌تیم بده، وه تا ئه‌و کاته‌ش هیچی له زیوه‌که نه‌دابوو به خاوه‌نه‌که‌ی، عائشه وره‌یه‌کی هێنایه‌وه به به‌ریدا و پێی ووت: بگه‌رێره‌وه بۆ لای خاوه‌نه‌که‌ت، جا ئه‌گه‌ر پێیان خۆش بوو ئه‌وا هه‌موو پاره‌که‌یان پێکه‌وه و به کۆمه‌ڵ ده‌ده‌مێ و تۆش ئازاد بیت و ببیته مه‌والی من.

( بريرة ) ش گەڕایەوە لای خاوەندارەکانی و عەرزەکەی عائشەی پێ گەیاندن، ئەوانیش رازی نەبوون و ووتیان: ئەگەر ئەیەوێت با ئەو چاکەیەت لەگەڵدا بکات و پارەکەت بۆ بدات بەڵام تۆ دەبێت دوای ئازاد کردنیشت هەر لە مەوالی ئێمە بیت و سەر بە ئێمە بیت. عائشەش مەسەلەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (با وەلأمەکەی ئەوان رێگەت لێ نەگرێت، بیکڕە و ئازادی بکە، دۆستایەتی و وەلائیشی هەردەبێت بۆ ئەو کەسە بێت کە ئازادی دەکات)عائشەش پارەکەی دا و ئازادی کرد،وە پێغەمبەر(ﷺ) هەستا لە ناو خەڵکدا و سوپاسی خوای گەورەی کرد پاشان فەرمووی: ( پاش سوپاسی خوا، ئەوە هەندێك کەسان چییانە، کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن کە لە کیتابی خوادا نییە، هەر کەسێك مەرجێك دابنێت کە ئەو مەرجە لە کیتابی خوادا نەبێت ئەوە بەتاڵە، جائەگەر سەد مەرجیش بێت، قەزاوەت و فەرمانی خوا حەق ترە و مەرجی خواش پتەوتر و شایستە ترە. جا دۆستایەتی و وەلائی بەندەیەکیش هەر بۆ ئەو کەسە دەبێت کە ئازادی دەکات ).

## روونکردنەوەی فەرموودەکە :

کاتێك ئیسلامی پیرۆز هات سیستەمی بەندایەتی سیستەمێکی جیهانی بوو لە ناو هەموو کۆمەڵگاکاندا بە کۆمەڵگای عەرەبیشەوە رەگی داکوتابوو، بە رادەیەك کە قەدەغە کردنی کت و پڕ و خێرای سیستەمەکە یاخود هەڵوەشاندنەوەی سیستەمەکە بە یەك جار کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر گەورەی لێ دەکەوتەوە، وە فیتنەی گەورەی لێ هەڵدەگیرسا، هەر بۆیە ئیسلامی پیرۆز چەند بنەماو مەرجێکی تایبەتی بۆ ئەو مەسەلەیە دانا و چەند رێگە چارەیەکی حەکیمانە و گونجاویشی بڕیارداوە هەتا بتوانرێت ئەو سیستەمە سنوردار بکرێت و بە چەند قۆناغێك چارەسەر بکرێت، یەکێك لەو رێگە چارانە ئەوەبوو کە رێگەی دا هەموو بەندەیەك یان کەنیزەیەك بتوانێت کە گرێبەستێك لەگەڵ خاوەنەکەیدا مۆر بکات بۆ ئازاد کردن و کڕینەوەی خۆی، وە هانی هەموو موسڵمانانیشی داوە کە پارە لەو رێگەیەدا سەرف بکەن و بیکەن بە خێر، بە جۆرێك کە هیچ بوارێکی ماڵبەخشینی نەهێشتۆتەوە لە زەکات و سەدەقە و کەفارەت دان و .... هتد کە ئازاد کردنی گەردنی ئەو بەندانەی تێدا پێش نەخستبێت و بە گرنگ ترین بواری خێر کردنی لە قەڵەم نەدابێت.

جا ئەو بەندە و کەنیزانە لە ماڵ و قەوم و میللەتی خۆیان دابڕاون و بێ کەسن، لەبەر ئەوە کە ئازاد دەکران پێویست بوو کە وەلائیان بۆ خانەوادە و عەشیرەتێك هەبێت و لەسەر ئەوان حیساب بن، هەتا بزر نەبن و مافیان نەخورێت و لە ناو خەڵکدا بناسرێن، وە بە پێی شەرعی خواش دەبێت وەلائەکەشیان بۆ ئەو کەس و لایەن و خانەوادەیە بێت کە ئازادی کردوون و لە بەندایەتی رزگاری کردوون ، وە دەبێت ناوی بەندە ئازادکراوەکە بدرێتە پاڵ ناوی ئازادکەرەکە و لە رێی ئەوانەوە بناسرێت و بوترێت ئەمە لە مەوالی ئەوانە.

جا وەك لە فەرموودە پیرۆزەکەدا هاتووە (بریرة) کەنیزەیەك بوو کە گرێبەستێکی لەگەڵ خاوەنەکەیدا مۆر کردبوو کە بڕێکی دیاری کراو پارە بدات بە خاوەنەکەی و خۆی بکڕێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش هاواری بۆ خاتوو عائشەی دایکی موسڵمانان بردووە کە پارەکەی بۆ دابین بکات و

بیکڕێتەوە و ئازادی بکات، بەڵام خاوەنەکەی وویستویەتی مەرجێك فەرز بکات کە پێچەوانەی شە‌ ـرع خوایە ،ئەویش بەوەی کە لە دوای فرۆشتنی کەنیزەکە بەو پارەیەی لەسەری ڕێکەوتبوون و ـازاد بوونیشی هەر بە مەوالی خاوەنە کۆنەکەی حیساب بکرێت و لە قەڵەم بدرێت، بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) بە خاتوو عائشەی ڕاگەیاند و بۆ موسڵمانانیشی روونکردەوە کە مەرجی لەو جۆرە و هەر مەرجێکی تر کە لە شەرعی خوادا ڕێگەی پێ نەدرابێت بەتاڵە و کاری پێ ناکرێت.

## ( ٣٦ ) ( تاوانی ئەو کەسەی کەنیزەیەك لە منداڵەکەی دابڕێت )

( ٥٥٠ ) ( حم ت ك ) عن أبي أيوب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ وَالِدَةٍ وَ وَلَدِهَا فَرَّقَ اللهُ بَيْنَهُ وَ بَيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٤٠٣ ) في صحيح الجامع

ابو ایوب دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( هەر کەسێك دایکێك و منداڵەکەی لێك دابڕێت، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دایدەبڕێت لە خۆشەویستەکانی ).

# ( بەشی : نیکاح )

## ( ١ ) ( مافەکانی ئافرەت )

**(٥٥١) ( ك هق ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ أَعْظَمَ الذُّنُوبِ عِنْدَ اللهِ رَجُلٌ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَلَمَّا قَضَى حَاجَتَهُ مِنْهَا طَلَّقَهَا وَ ذَهَبَ بِمَهْرِهَا وَ رَجُلٌ اسْتَعْمَلَ رَجُلاً فَذَهَبَ بِأُجْرَتِهِ وَ آخَرُ يَقْتُلُ دَابَّةً عَبَثاً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٥٦٧ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( گەورەترینی گوناحەکان لە لای خوا ئەوەیە پیاوێك ئافرەتێك مارە بکات، کاتێك کە مەبەستی خۆی لێ بەجێ هێنا تەلاقی بدات و مارەییەکەشی ببات و نەیداتێ، وە پیاوێك بە کرێ گرتە پیاوێك بەکار بهێنێت و کرێکەی ببات و نەیداتێ، وە کەسێکی تر تەنها بۆ گاڵتەو گەپ گیانلەبەرێك بکوژێت ).

## ( ٢ ) ( پیاو لێپرسراوە لە خێزان و منداڵەکانی )

**(٥٥٢)( حم خ ) عن حكيم بن حزام رضي الله عنه عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنْ الْيَدِ السُّفْلَى، وَ ابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَ خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى وَ مَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَ مَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨١٨٤ ) في صحيح الجامع**

حەکیمی کوڕی خزام دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەو دەستەی لە سەرەوە بێت باشترە لەو دەستەی لە ژێرەوە بێت، وە بەو کەسانە دەست پێ بکە کە بژێوییان لە ئەستۆی تۆدایە، وە باشترین سەدەقە ئەوەیە کە لە پاش دەوڵەمەندی و دابین کردنی پێداویستییەکانی خۆتەوە بێت، وە هەر کەسێك بە بەشی خۆی قەناعەت بکات و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێت، ئەوا خوای گەورەش دەوڵەمەندی دەکات و ناهێڵێت پێویستی بە خەڵك بێت، وە هەرکەسێك دەست و داوێنی پاك رابگرێت، ئەوا خوای گەورەش عیفەت و پاکیی پێ دەبەخشێت ).

**(٥٥٣)( ن حب ) عن أنس عن النبي(ﷺ) قال: إنَّ اللهَ تَعَالَى سَائِلٌ كُلَّ رَاعٍ عَمَّا اسْتَرْعَاهُ ،أَحَفَظَ ذَلِكَ أَمْ ضَيَّعَهُ؟ حَتَّى يَسْأَلَ الرَّجُلَ عَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٧٤ ) في صحيح الجامع**

انس لە پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: فەرموویەتی: ( خوای گەورە پرسیار لە هەموو سەرپەرشتیارێك دەکات سەبارەت بەوەی پێی سپێردرابوو ، ئایا پاراستوویەتی یان فەوتاندویەتی، تەنانەت پرسیار لە پیاو دەکات دەربارەی خێزان و ئەندامانی ماڵەکەی ).

## ( ٣ ) ( ژن له ماڵی خۆیدا نه‌بێت نابێت به‌رگ و پۆشاکی دابکه‌نێت )

**(٥٥٤) ( حم طب ك هب ) عن أم سلمة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّما امْرَأَةٍ نَزعَتْ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِهَا خَرَقَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ عَنْهَا سِتْرَهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٦٩٧ ) في صحيح الجامع**

ام سلمة ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( هه‌ر ئافره‌تێك له‌ غه‌یری ماڵه‌كه‌ی خۆیدا به‌رگ و پۆشاكی خۆی دابكه‌نێت ئه‌وا خوای گه‌وره‌ سیتری خۆی له‌سه‌ر هه‌ڵده‌ماڵێت ).

**(٥٥٥) ( حم هـ ك ) قالت عائشة: لَعَلَّكُنَّ مِنَ اللَّوَاتِي يَدْخُلْنَ الْحَمَّامَاتِ، سَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ أَيُّمَا امْرَأَةٍ وَضَعَتْ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا فَقَدْ هَتَكَتْ سِتْرَ مَا بَيْنَهَا وَ بَيْنَ الله عَزَّوَجَلَّ ﴾. من حيث ابن ماجة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٠٨ ) في صحيح الجامع**

عائشه‌ ووتی: له‌وانه‌یه‌ ئێوه‌ له‌و ئافره‌تانه‌ بن كه‌ ده‌چنه‌ گه‌رماو( حمام )ه‌ كانه‌وه‌، له‌ پێغه‌مبه‌رم(ﷺ) بیستووه‌ ده‌یفه‌رموو: ( هه‌ر ئافره‌تێكی موسڵمان له‌ غه‌یری ماڵی مێرده‌كه‌ی خۆیدا به‌رگ و پۆشاكه‌كه‌ی دابكه‌نێت، ئه‌وا ئه‌و سیتره‌ی كه‌ له‌ نێوان خۆی و له‌ نێوان خوادایه‌ هه‌ڵی ماڵیوه‌ ).

**(٥٥٦) ( د ت ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ امْرَأَةٍ تَخْلَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِهَا إلاَّ هَتَكَتْ مَابَيْنَهَا وَ بَيْنَ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٩١ ) في صحيح الجامع**

عائشه‌ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( هه‌ر ئافره‌تێك له‌ غه‌یری ماڵه‌كه‌ی خۆیدا جله‌كانی دابكه‌نێت، ئه‌وا ئه‌وه‌ی له‌ نێوان خۆی و له‌ نێوان خوادایه‌ هه‌ڵی ماڵیوه‌ ).

## ڕوونكردنه‌وه‌ی فه‌رمووده‌كان :

مه‌به‌ستی ئه‌م فه‌رمووده‌ پیرۆزانه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئافره‌تی باوه‌ڕدار و موسڵمان ده‌بێت پارێزگاری له‌ شه‌رم و ئابڕووی خۆی بكات كاتێك له‌ ماڵه‌كه‌ی خۆی ده‌چێته‌ ده‌ره‌وه‌، وه‌ مه‌به‌ست له‌ فه‌رمووده‌كانیش له‌وه‌ی كه‌ نابێت ئافره‌ت له‌ غه‌یری ماڵه‌كه‌ی خۆیدا پۆشاكه‌كانی به‌ری دابنێت ئه‌وه‌یه‌ كه‌نابێت خۆی بكاته‌ به‌ر نه‌زه‌ری خه‌ڵكی نا مه‌حره‌م و به‌رگی شه‌رم و ئابڕوو له‌به‌ر ده‌میاندا دابكه‌نێت و ڕێگه‌ خۆشی بكات و فرسه‌تێك بخوڵقێنێت و ده‌روازه‌یه‌ك بكاته‌وه‌ كه‌ شه‌یتان لێوه‌ی بێته‌ ژووره‌وه‌ و به‌مه‌ش خۆی و كه‌سانێكی تریش توشی گوناهو تاوان بكات. به‌ڵام ته‌نها به‌رگ گۆڕینێك له‌ ماڵی خزم و كه‌سێكدا ئه‌گه‌ر چاودێری په‌رده‌ پۆشیی تێدا بكرێت و نه‌بێته‌ مایه‌ی نه‌زه‌ری حه‌رام بۆ كه‌سێكی نا مه‌حره‌م و نییه‌تی كاری خراپه‌ی له‌گه‌ڵدا نه‌بێت ئه‌مه‌یان إنشاء الله هیچی تێدا نییه‌ و كارێكی ئاساییه‌.

## ( ٤ ) ( ئه‌وانه‌ی خوای گه‌وره‌ نزاو پاڕانه‌وه‌یان وه‌ڵام ناداته‌وه‌ )

**(٥٥٧) ( ك ) عن ابي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَـةٌ يَدْعُونَ اللهَ عَزَّوَجَلَّ فَلا يُسْتَجَابُ لَهُمْ: رَجُلٌ كَانَتْ تَحْتَهُ امْرأَةٌ سَيِّئَةُ الْخُلُقِ فَلَمْ يُطَلِّقْهَا، وَرَجُلٌ كَانَ لَهُ على رجلٍ مَالٌ فَلَمْ**

يشهد عليه، ورجلٌ آتى سَفيهاً مالَهُ ، وقالَ اللهُ تعالى: ﴿ ولا تؤْتوا السُّفهاءَ أموالَكمْ ﴾، ﴾.
صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٧٤ ) في صحيح الجامع

ابوموسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر کەسان هەن کە لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە بەڵام وەڵامیان نادرێتەوە، پیاوێك ژنێکی رەوشت خراپی هەبێت و تەڵاقی نەدات، وە پیاوێك قەرزی بەسەر پیاوێکی ترەوە هەبێت و کەسی لەسەر نەکردبێت بە شایەت، وە پیاوێکیش پارەو ماڵی خۆی بداتە دەست کەسێك کە عەقڵی نوقسان و ناتەواو بێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمْ﴾ واتە پارە و ماڵی خۆتان نەدەنە کەسانی سەفیهو بێ عەقڵ ).

## ( ٥ ) ( ئافرەت خۆی وەك پیاو لێبکات )

(٥٥٨) ( حم ن ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَةٌ لايَنْظُرُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ اليهم يوْمَ الْقيامَةِ: الْعاقُّ لوالدَيْه، وَ الْمَرْأَةُ الْمُتَرَجِّلَةُ، وَ الدَّيُّوثُ، وَ ثَلاثَةٌ لا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: الْعاقُّ لوالديْه، وَ الْمُدْمِنُ على الْخَمْرِ، وَ الْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٠٧٠) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر کەسان خوای گەورە لە قیامەتدا سەیریان ناکات: رەنجێنەر و ئازاردەری دایك و باوکی خۆی، وە ئافرەتێك خۆی وەك پیاو لێ بکات، وە ئەو کەسەی گەوادی دەکات، وە سێ جۆر کەسانیش ناچنە بەهەشتەوە: ئەوەی دڵی دایك و باوکی دەرەنجێنێت و ئازاریان دەدات، وە ئەو کەسەی بەردەوامە لەسەر مەی خواردنەوە، وە ئەو کەسەش کە منەت و خۆ هەڵکێشان دەنوێنێت لە بەخششدا ).

## ( ٦ ) ( ژن هێنان بە مەبەستی داوێن پاك بوون )

(٥٥٩) ( عد ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ حَقٌّ على الله عَوْنُ مَنْ نَكَحَ التماسَ العفافِ عمَّا حَرَّمَ الله ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٣١٤٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە کردوویەتی بە حەق بەسەر خۆیەوە کە دەست گیرۆیی و یارمەتیی کەسێك بدات کە بییەوێت ژن بهێنێت بە مەبەستی داوێن پاکیی و دوورە پەرێزیی لەو شتانەی کە خوای گەورە حەرامی کردوون ).

## ( ٧ ) ( زینای ئەندامەکانی لەش )

( ٥٦٠ )( ق د ن ) عن ابن عباس قال: ما رأيت شيئاً أشبه باللمم مما قال أبو هريرة عن النبي(ﷺ):

**﴿ إِنَّ اللهَ تَعالىَ كَتَبَ عَلىَ ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا، أَدْرَكَ ذَلِكَ لامَحَالَةَ، فَزِنَا العَيْنَيْنِ النَّظَرُ، وَ زِنَا اللِّسانِ المَنْطِقُ، وَ النَّفْسُ تَمَنَّى وَ تَشْتَهِي وَ الفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ ﴾** (صحيح) انظر حيث رقم (١٧٩٧) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: هیچ شتێکم نەدیوە کە زیاتر بشوبهێتە سەر وردە گوناه ( اللَّمَّ ) هێندەی ئەوەی کە ابوهریرە لە پێغەمبەری(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ( خوای گەورە بۆ هەموو بەنی ئادەمێك بەشی خۆی لە زینای لەسەر نوسیوە، کە هەر دەبێت توشی ببێت، جا زینای جوتە چاوەکە سەیر کردنە، وە زینای زمان قسەکردنە، وە نەفسیش ئاوات و ئارەزوو دەکات، وە فەرج و عەورەتیش یان دەیکات بە راست و دەیسەلمێنێت یان بە درۆی دەخاتەوە و نایکات )

## روونکردنەوەی فەرموودەکە :

إبن عباس(رضي الله عنه) کاتێك دەڵێ هیچ شتێکم نەدیوە کە زیاتر بشوبهێتە سەر (اللَّمَّ)واتە وردە گوناه و تاوان، مەبەستی پێ ئەو ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێت: (ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ )، واتە ئەو کەسانەی کە خۆیان لە گوناهی گەورەو کاری فاحشە دەپارێزن تەنها وردەگوناه نەبێت، واتە إبن عباس دەڵێ: کە ئەو ( زینای چاو و زمان و نەفس )ە کە لە فەرموودەکەدا باس کراون پێم وایە لە هەموو شتێکی تر زیاتر نزیك بن لە مانای (اللمم) کە خوای گەورە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا باسی کردووە لە تاوانی گەورە و کاری فاحیشەی جیاکردۆتەوە.

وە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەمان بۆ رووندەکاتەوە کە فاحیشەی گەورە و زینای فەرج پێشەنگ و رێ خۆشکەری خۆی هەیە کە ئەویش نەزەری حەرام و قسەی ئارەزوو بازی‌یە کە بە زمان دەکرێت، ئینجا ئەو شەهوەت و ئارەزوو و ئاواتەش کە لە نەفسدا کۆدەبێتەوە، ئیجا لە پاش هەموو ئەمانە فەرج یان فاحیشەکە ئەنجام دەدات و زیناکە دەکات بە راست، یان ئەوەیە کە خۆی دەگرێت و ناهێڵێت بگاتە زینای گەورە کە زینای فەرجە

## ( ٨ ) ( پیری زیناکار )

( ٥٦١ )( م ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): **﴿ ثَلاثَةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَ لا يُزَكِّيْهِمْ -قال أبو معاوية: وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ- وَ لَهُمْ عَذابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَ مَلِكٌ كَذَّابٌ، وَ عَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ ﴾** (صحيح) انظر حيث رقم (٣٠٦٨) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ جۆر کەس لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە - ابو معاويه کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرمودەکە ووتی: سەیریشیان ناکات - وە ئەشکەنجەیەکی زۆر بە ئازاریان هەیە: پیرێکی زیناکار، و پاشایەکی درۆزن، وە هەژارێکی بە فیز و لوت بەرز ).

## ( ٩ ) ( تاوانی چوونە لای ئافرەت لە دواوە )

(٥٦٢) ( ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **لا يَنْظُرُ اللهُ إِلىَ رَجُلٍ أَتـىَ رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً فِي الدُّبُرِ** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٧٨٨ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە سەیری پیاوێك ناکات کە بچێتە لای پیاوێك یان ئافرەتێك لە دواوە ).

(٥٦٣) ( هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا لا يَنْظُرُ الله إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ** ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦٩١ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەو کەسەی کە لە دواوە دەچێتە لای ژنەکەی خۆی، خوای گەورە لە قیامەتدا سەیری ناکات ).

(٥٦٤) ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **لا يَنْظُرُ اللهُ إِلىَ رَجُلٍ جَامَعَ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٠١ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە سەیری پیاوێك ناکات کە لە دواوە جیماعی لەگەڵ ئافرەتێکدا کردبێت ).

(٥٦٥) ( سمويه ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **اسْتَحْيُوا فَإِنَّ اللهَ لا يَسْتَحِيي مِنَ الْحَقِّ ،لا يَحِلُّ مَأَتـىَ النِسَّاءِ فِي حُشُوشِهِنَّ** ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٩٣٤ ) في صحيح الجامع

جابر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( شەرم بکەن وە خوای گەورە شەرم لە حەق ناکات، حەڵاڵ و دروست نییە جوت بوون لەگەڵ ئافرەتدا لەڕێی کۆمیانەوە ).

(٥٦٦) ( هق ) عن خزيمة بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **اسْتَحْيُوا فَإِنَّ الله لا يَسْتَحِيي مِنَ الْحَقِّ لاتَـأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَدْبَارِهِنَّ** ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٩٣٣ ) في صحيح الجامع

خزيمة ی کوڕی ثابت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( شەرم بکەن خوای گەورە شەرم لە حەق ناکات، مەچنە لای ئافرەتەکان لە ڕێی پاشویانەوە )

(٥٦٧) ( ن هـ ) عن خزيمة بن ثابت: أنّ رجلا سأل النّبيّ(ﷺ) عن إتْيان النّساء في أدبارهنّ أو عن إتْيان الرّجل امرأتهُ في دبُرها فقال النّبيّ(ﷺ): ﴿ **حَلالٌ ، فَلَمَّا وَلّى الرَّجُلُ دَعَاهُ أَوْ أَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ**

فَقَالَ: كَيفَ قُلْتَ في أَيِّ الْخرقَيْنِ أَوفي أَيِّ الْخَرَزَتَيْنِ أَوْ في أَيِّ الْخصْفَتَيْنِ أَمْ منْ دُبُرِها في قُبُلِها فَنَعَمْ أَمْ مِنْ دُبُرِهَافِي دُبُرِهَا فلا فَإِنَّ الله لايَسْتَحي مِنَ الْحَقِّ لا تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَدْبَارِهِنَّ ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٥٢ ) في صحيح الجامع

خزيمة ى كوڕى ثابت دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد دەربارەی چوونە لای ئافرەتان لە پاشویانەوە یان پیاو لە دواوە بچێتە لای خێزانەكەی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (حەڵاڵە). ئینجا كە پیاوەكە ڕۆیشت بانگی كردەوە یان فەرمانی كرد بۆیان بانگ كردەوەو پێی فەرموو: ( پرسیارەكەت چۆن بوو؟ لە كام دوو درزیان یان لەكام دوو كونیان یان لە كام دوو پارچەیان،جا ئەگەر لە دواوە بچیتە لای بەڵام لە پێشەوە بكرێت ئەوە بەڵێ دروستە، بەڵام ئەگەر لە دواوە بچیتە لای و هەر لە دواوەش بكرێت ئەوە نەخێر دروست نییە، جا خوای گەورە شەرم لە حەق ناكات لە دواوە مەچنە لای ئافرەتان ).

(٥٦٨) ( طب ) عن خزيمة بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): « إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَدْبَارِهِنَّ ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٢١ ) في صحيح الجامع

خزيمة ى كوڕى ثابت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە نەهیتان لێ دەكات كە لە كونی پاشویانەوە جیماع لەگەڵ ئافرەتاندا بكەن ).

## ( ١٠ ) ( عەزل كردن بە مەبەستی منداڵ نەبوون )

عەزل كردن: مەبەست پێی ئەوەیە كە پیاو لە كاتی جیماعدا ڕێگە نەدات تۆو ( مني ) یەكەی خۆی بڕژێتە ناو ڕەحمی ئافرەتەكەوە بەڵكو فڕێی بداتە دەرەوە.

(٥٦٩) ( حم ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « اصْنَعُوا مَا بَدا لَكُمْ فَمَا قَضَى اللهُ تَعَالَى فَهُوَ كَائِنٌ وَ لَيْسَ مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَد ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٠١٦ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( چۆنتان ویست وا بكەن، چونكە هەرچی خوای گەورە قەزای كردبێت و بڕیاری لەسەر دابێت هەر دەبێت، وە منداڵیش لە هەموو ئاوی پیاو دروست نابێت ).

(٥٧٠) ( الطيالسي ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « إِنْ قَضَى اللهُ تَعَالَى شَيْئاً لِيَكُونَنَّ وَ إِنْ عَزَلَ ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٢٦ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر خوای گەورە قەزای شتێكی كرد و فەرمانی لەسەردا هەر دەبێت، ئەگەر عەزلیش بكات ).

**(٥٧١) ( ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَوَ إِنَّكُمْ تَفْعَلُونَ ذلِكَ؟ لا عَلَيْكُمْ أَنْ لا تفعلوا ذلكَ فَإِنَّهَا لَيْسَتْ نَسْمَةٌ كَتَبَ اللهُ أَنْ تَخْرُجَ إِلاَّ هِيَ خَارِجَةٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٣٤ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ( بۆ ئايا ئێوە عەزل دەكەن؟ قەيناكە ئەگەر تەركيشی نەكەن. چونكە هيچ گيانلەبەرێك نييە كە خوای گەورە نوسيبێتی بێتە دەرەوە ئيلا هەر دێتە دەرەوە ).

**(٥٧٢) ( ن ) عن أبي سعيد وأبي هريرة قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاعَلَيْكُمْ أَنْ لا تَعْزِلُوا فَإِنَّ الله قَدَرَ مَاهُوَ خَالِقٌ إِلىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٤٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ( قەيدی نييە ئەگەر دەست لە ( عزل ) كردنيش هەڵنەگرن، چونكە خوای گەورە تەقديری كردووە كە هەرچی دروست دەكات، هەتا رۆژی قيامەت ).

**(٥٧٣) ( م ) عن أبي سعيد قال: سُئِلَ رَسُولَ الله(ﷺ) عَنِ الْعَزْلِ؟ فَقَالَ: ﴿ مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الولدُ وَ إِذا أرادَ الله خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٤٩ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پرسيار كرا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی عەزل؟ ئەويش فەرمووی: ( منداڵ لە هەموو ئاوەكە دروست نابێت، وە ئەگەر خوا ويستی شتێك دروست بكات ئەوا هيچ شتێك رێگری نابێت

**(٥٧٤) ( م د ) عن أبي سعيد قال: ذُكِرَ الْعَزْلُ عِنْدَ رَسُولِ الله(ﷺ) فَقَالَ: ﴿ لِمَ يَفْعَلُ ذلِكَ أَحَدُكُمْ؟ ﴾. قال أبو عيسى: زاد ابن ابي عمر في حديثه: ﴿ وَ لَمْ يَقُلْ لايَفْعَلْ ذلِكَ أَحَدُكُمْ؟ ﴾. قَالا فِي حَدِيثِهِمَا: ﴿ فإنَّهُ لَيْسَتْ نَفْسٌ مَخْلُوقَةٌ إِلاَّ اللهُ خَالِقُهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١١٢ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: باسی عەزل كرا لە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەويش فەرمووی: ( جا ئێوە لەبەر چی ئەوە دەكەن؟ )، ابو عيسى وتی: ابن أبي عمر وتی: ئەو نەيفەرموو عەزل مەكەن بەڵكو فەرمووی: لەبەر چی دەيكەن؟ هەردووكيان وتيان: ئينجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( چونكە هيچ گيانلەبەرێكی دروستكراو نييە ئيلا خوای گەورە خۆی خولقێنەرێتی ).

**(٥٧٥) ( حم م ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا عَلَيْكُمْ أَنْ لا تَفْعَلُوا فَإِنَّ الله تَعَالىَ كَتَبَ مَنْ هُوَ خَالِقٌ إِلىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٥٣٦ ) في صحيح الجامع**

ابوسعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ( قەيدی نييە ئەگەر دەست لە عەزل هەڵنەگرن چونكە خوای گەورە نوسيويەتی كە هەتا رۆژی قيامەت كێ دروست دەكات ).

**(٥٧٦) ( م ) عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وإذا أرادَ اللهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣١٠ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ( وە ئەگەر خوای گەورە ويستی شتێك دروست بكات هيچ شتێك رێگری نابێت ).

(٥٧٧) ( حم الضياء ) عن أنس: جاء رجلٌ إلى رسول الله(ﷺ) يسأل عن العزل. فقال: ﴿ لَوْ أَنَّ الْمَاءَ الَّذِي يَكُونُ مِنْهُ الْوَلَدُ أَهْرَقْتَهُ عَلَى صَخْرَةٍ لأَخْرَجَ اللهُ تَعالى مِنْهَا وَلَداً وَ لِيَخْلُقَنَّ اللهُ نَفْساً هُوَ خَالِقُهَا ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٢٤٤ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری لێکرد دەربارەی عەزل کردن. ئەویش فەرمووی: ( ئەگەر ئەو ئاوەی کە منداڵی لێ دروست دەبێت بیڕژێنیت بە سەر بەردێکدا ئەوا خوای گەورە ئەو منداڵەی هەر لێ دێنێتە دەر. وە نەفسێك کە خوای گەورە بییەوێت دروستی بکات ئەوا هەر دروستی دەکات ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکان:

١. پێغەمبەر(ﷺ) عەزل کردنی حەرام نەکردووە

٢. عەزل کردن ناتوانێت ڕێ لە دروستبوونی منداڵ بگرێت ئەگەر خوای گەورە خۆی بییەوێت.

٣. لەم فەرموودە پیرۆزانە موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا دەبێت ئەویش ئەوەیە کە زانیارییەك ئاشکرا دەکات کە لەو کاتەدا هیچ پزیشکێك نەیزانیوە و هیچ کەسێکیش خەیاڵی بۆی نەچووە، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرمووێت: ( منداڵ لە هەموو ئاوەکە دروست نابێت )، واتە ئەگەر تەنها کەمێکیش لەو ئاوە بچێتە ناو ڕەحمی ئافرەتەوە ئەوا بەسە بۆ ئەوەی منداڵی لێ دروست ببێت ئەگەر خوای گەورە بییەوێت، بە واتایەکی تر فەرموودە پیرۆزەکە دەڵێ کە تۆوەکە هەمووی نییە دەبێتە هۆی دروست بوونی منداڵ. بەڵکو تەنها یەك بەشی کەمی بەسە. کە ئەمەش یەکێکە لەو ڕاستییانەی کە زانستی سەردەم بە هۆی میکرۆسکۆبەوە سەلماندوویەتی، کە ئەو تۆوەی پیاو دەیڕژێت لە سەدان هەزار گیانلەبەری زۆر ورد پێك دێت کە پێیان دەوترێت (سپێرم). کە وەك سەرەمێکوتە وان کە تەنها یەك دانە لەو سپێرمانە خۆی دەگەیەنێتە هێلکەی ئافرەت لە منداڵاندا و دەپیتێنرێت و منداڵەکەی لێ دروست دەبێت. واتە وەك پێغەمبەر ﷺ لە پێش چواردە سەدە لەمەو پێشدا فەرموویەتی: ( منداڵ بە هۆی هەموو ئاوەکەوە دروست نابێت ). کە ئەمەش ڕاستیی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەسەلمێنێت.

## (١١) ( قۆناغەکانی دروست بوونی منداڵ )

(٥٧٨)( م ) عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ أَنَّ عَامِرَ بْنَ وَاثِلَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ الشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ وَالسَّعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيْرِهِ فَأَتَى رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يُقَالُ لَهُ حُذَيْفَةُ بْنُ أَسِيدٍ الْغِفَارِيُّ فَحَدَّثَهُ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ وَكَيْفَ يَشْقَى رَجُلٌ بِغَيْرِ عَمَلٍ فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ أَتَعْجَبُ مِنْ ذَلِكَ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)يَقُولُ﴿ إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَ أَرْبَعُونَ لَيْلَةً، بَعَثَ اللهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا وَ خَلَقَ سَمْعَهَا وَ بَصَرَهَا وَ جِلْدَهَا وَ لَحْمَهَا وَ عِظَامَهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ وَ يَكْتُبُ الْمَلَكُ ثُمَّ يَقُولُ: يَارَبِّ أَجَلُهُ، فَيَقُولُ رَبُّكَ مَا شَاءَ وَ يَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَارَبِّ رِزْقُهُ

**فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ وَ يَكْتُبُ الْمَلَكُ ثُمَّ يَخْرُجُ الْمَلَكُ بِالصَّحِيْفَةِ فِي يَدِهِ فَلا يَزِيدُ عَلَى مَا أُمِرَ وَ لا يَنْقُصُ ﴾** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٩٧ ) في صحيح الجامع

ابی الزبیر المکی دەڵێ کە عامری کوڕی وائلە بۆی گێڕاوەتەوە کە گوێی لە عبدالله ی کوڕی مەسعود نەبێت کە دەڵێت: ( سەرگەردان ئەو کەسەیە کە هەر لە سکی دایکیەوە سەرگەردان دەبێت، وە سەرفرازیش ئەو کەسەیە کە پەند و عیبرەت لە خەڵکانی تر وەردەگرێت). ئەویش دەچێتە لای یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێی دەوترا حذیفە ی کوڕی أسید ی غەفاری و وتەکەی ابن مسعودی بۆ نەگێڕێتەوە و دەڵێ: باشە چۆن پیاو پێش ئەوەی بێتە دونیاوە هیچ کارێك بکات سەرگەردان دەبێت؟ حذیفەش پێی دەڵێ: ئەوەت پێ سەیرە؟ من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) دەیفەرموو: ( هەر کاتێك چل و دوو شەو بەسەر نوتفەدا تێ پەڕی. خوای گەورە. فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت. ئینجا وێنەی نەکێشێت و گوێ و چاو و پێست و گۆشت و ئێسقانی بۆ دروست دەکات. ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگار نێر بێت یان مێ ؟ پەروەردگاریش ئەوەی کە بیەوێت فرمانی لەسەر دەر دەکات .وە فریشتەکەش دەینوسێت. پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگار ئەجەلەکەی؟ پەروەردگاریش چەندی ویست نەیڵێت و فریشتەکەش دەینوسێت، پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگار رزقەکەی؟ پەروەردگاریش ئەوەی کە بیەوێت بڕیاری لەسەر دەدات و فریشتەکەش دەینوسێت. پاش ئەوە فریشتەکە دەچێتە دەرەوە و نامەکەش لە دەستیدایە، ئیتر ئەوەی کە فرمانی پێ کراوە نە زیاد دەکات و نەکەم ).

(٥٧٩) ( ق ٤ ) عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: حدثنا رسول الله(ﷺ) وهو الصادق المصدوق: ﴿ **إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، وَ يُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ وَ أَجَلِهِ وَعَمَلِهِ وَ شَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَوَ الَّذِي لا إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَ بَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَ بَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا ﴾** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٥٤٣ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەری راستگۆ(ﷺ) پێی فەرمووین: ( هەر یەکێك لە ئێوە چل رۆژ بە (**نطفة** -تۆو-) لە سکی دایکیدا پێکهاتەکەی کۆ دەکرێتەوە. پاشان ئەوەندەی تر بە ( **علقة** - هەڵواسراویی بە دیواری ڕەحمەوە-) دەمێنێتەوە، پاشان ئەوەندەی تر بە(**مضغة**-گۆشت پارەیی-) دەمێنێتەوە. پاشان فریشتەکە دەنێردرێت ئەویش رۆحی دەکات بە بەردا. وە فەرمانی پێ دەکرێت بە چوار ووشە:بە نووسینی رزقەکەی وە ئەجەلەکەی وە کاروکردەوەی وە سەرگەردان دەبێت یان سەرفراز. جا سوێند بێت بەوەی کە هیچ خوایەك نییە جگە لەو. کەسی وا هەیە کار دەکات بە کاری ئەهلی بەهەشت هەتا وای لێ دێت لە نێوان ئەو و بەهەشتدا هیچ نامێنێت تەنها باڵێك نەبێت. کەچی قەدەرە نوسراوەکەی پێشی دەداتەوە و کار بە کاری ئەهلی ئاگر دەکات و دەچێتە ناوی. وە کەسی وا هەیە کار بە کاری

ئەهلی ئاگر دەكات هەتا وای لیٚ دیٚت لە نیٚوان ئەو و دۆزەخدا هیچ نامیٚنیٚت تەنها بالیٚك نەبیٚت كەچی قەدەرە نوسراوەكەی پیٚشی دەداتەوە و كار بە كاری ئەهلی بەهەشت دەكات و دەچیٚتە ناوی ).

## ( ١٢ ) ( باشترین ئەو ناوانەی كە لە مندالٚ دەنریٚت )

**(٥٨٠) ( م د ت هـ ) عن ابن عمر عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ أَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلىَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ: عَبْدُ اللهِ وَ عَبْدُالرَّحْمَنِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦١ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەلٚیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خۆشەویسترینی ناوەكان لە لای خوای گەورە – عبدالله و عبدالرحمن– ـە ).

**(٥٨١) ( م ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ عِنْدَ اللهِ: عَبْدُ اللهِ وَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حديث رقم ( ١٥٣٤ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەلٚیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموویوتی: ( خۆشەویسترین ناوەكانتان لە لای خوای گەورە – عبدالله و عبدالرحمن– ـە ).

**(٥٨٢) ( ع ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلىَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ: عَبْدُ اللهِ وَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ وَ الْحَارِثُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦٢ ) في صحيح الجامع**

انس دەلٚیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموویوتی: ( خۆشەویسترین ناوەكان لە لای خوا – عبدالله و عبدالرحمن – ـە ).

**(٥٨٣) ( م د ) محمد بن عمرو بن عطاء قال: سَمَّيْتُ ابْنَتِي بَرَّةَ، فَقَالَتْ لِي زَيْنَبُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ إِنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) نَهَى عَنْ هَذَا الإِسْمِ، وَسُمِّيتُ بَرَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿لا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ ،اللهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ ﴾، فَقَالُو بِمَ نُسَمِّيهَا؟ قال: ﴿ سَمُّوهَا زَيْنَبَ ﴾. مسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٢٩٣ ) في صحيح الجامع**

محمد كوڕی عمرو كوڕی عطاء دەلٚیٚ: كچەكەم ناو نا ( بَرة ) واتە ( چاكەكار )، كەچی ( زينب ی كچی ابي سلمة ) وتی: پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی كردووە لەو ناوە، وە منیش بە مندالٚیی ناونرابووم ( بَرة )، كەچی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووبوی: پاكانەی خۆتان مەكەن، خوا خۆی دەزانیٚت كامتان چاكەكارن، ئەوانیش وتبویان: ئەی ناوی بنیٚین چی؟ فەرمووبوی: ( ناوی بنیٚن زينب ).

## ( ١٣ ) ( حەوتمی مندالٚ كە پیٚی دەوتریٚت -عقيقة- )

**(٥٨٤) ( حم ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ لا يُحِبُّ الْعُقُوقَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٤٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عمرو دەلٚیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە – العقوق –ی پیٚ خۆش نییە ).

واته بەکارهێنانی وشەی عقوقی پێ خۆش نییە بۆ حەوتەم یان حەوت ڕۆژەی منداڵ چونکە وشەی (العقوق ) بە مانای ڕەنجاندن و ئازاردان دێت.

**(٥٨٥) ( د ن ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يُحِبُّ اللهُ الْعُقُوقَ وَ مَنْ وُلِدَ لَهُ وَلَدٌ فَاحبَّ أنْ يَنْسُكَ عَنْهُ فَلْيَنْسُكْ عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافَأَتَانِ وَ عَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٦٢٩) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویوتی: ( خوای گەورە ئەو وشەی ( عقوق ) ە ی پێ خۆش نییە: وە هەر کەسێك كە منداڵی بوو وە حەزی کرد حەیوانی بۆ سەر ببڕێت، با بۆ کوڕ دوو بزنی هاوشان سەر ببڕێت وە بۆ کچیش یەك بزن ).

## ( ١٤ ) ( حەرام کردنی مارە کردنی موتعە-سیغە- )

**(٥٨٦) ( م هـ ) عَنِ الرَّبِيعِ بنِ سَبْرَةَ الْجُهَنِيِّ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) فَقَالَ: ﴿ يَا أيها النَّاسُ! إنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الإسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ وَ إنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهُ وَ لا تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ٧٨٧٧ ) في صحيح الجامع**

ڕەبیعی کوڕی سبرە ی الجهني دەڵێ: کە باوکی خۆی بۆی گێڕاوەتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو فەرموویەتی: ( ئەی خەڵکینە من پێشتر ڕێگەم پێدا بوون کە موتعە لەگەڵ ئافرەتدا بکەن، بەڵام وا خوای گەورە ئەوەی حەرام کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت، جا هەر کەسێك ئافرەتێکی لەوانە لایە با دەستی لێ هەڵبگرێت، وە لەو مارەییەشی کە پێتان داون هیچیان لێ مەسەنەنەوە ).

### ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

نیکاحی موتعە یان سیغە بریتیە لەوەی کە پیاو و ژنێك ڕێك بکەون لەسەر مارەکردن بە مارەییەکی دیاریکراو ، بۆ ماوەیەکی دیاری کراو جا ساڵێك بێت یان مانگێك یان هەفتەیەك یان ڕۆژێك یان سەعاتێك یان ... وە بە کۆتایی هاتنی ئەو کاتە مارەییەکەی هەڵ دەوەشێتەوە، وە ئەم جۆرە نیکاحە لە سەرەتای ئیسلامدا هەبووە، بەڵام پاشان وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە خوای گەورە حەرامی کردوە بە یەکجاریی هەتا ڕۆژی قیامەت، بۆیە دوای فەرمانە خواییەکە پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمان بە هاوەڵانی بەڕێزی خۆی دەکات کە هەر کەسێکیان ئافرەتێکی لەوانە لایە کە بەو جۆرە مارەی کردووە با ڕاستەوخۆ دەستی لێ هەڵبگرێت، وە لەو مارەییەشی کە پێی داوە با هیچی لێ نەسەنێتەوە. وە لێرەدا پێویستە ئەوە بوترێت کە ئەو جۆرە مارە کردنە نەریتێك بووە لە پێش ئیسلامیشدا هەبووە ، پێغەمبەریش( ﷺ ) چاو پۆشی لێکردووە هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە کە پێیان ڕابگەیەنێت کە با ئیتر دەستی لێهەڵبگرن و بە حەرامی لە قەڵەم داوە ،وەك چۆن پێشتریش مەی نۆشین وچەندین شتی تریشی بە قۆناغ و لە کاتی گونجاوی خۆیدا حەرام کردووە .

## ( ١٥ ) ( ماره به جاش )

( ٥٨٧ ) ( حم ٣ ) عن علي ( ت ن ) عن ابن مسعود ( ت ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْمُحِلَّ وَ الْمُحَلَّلَ لَهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١٠٠ ) في صحيح الجامع

له علي و. له إبن مسعود و. له جابرەوه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی. ( نەفرەتی خوا لەو کەسەبێت که ماره به جاشەکەی حەڵاڵ کردووه، وه لەوەشی که بۆی حەڵاڵ کراوه )

## ( ١٦ ) ( پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکانی سەرپشك دەکـــات که هەڵبژێرن )

( ٥٨٨ ) ( ق ن هـ ) عن عائشة زوج النبي(ﷺ): أنها أخبرتهُ أنَ رسول الله(ﷺ) جاءها حين أمرهُ الله أنْ يُخيِر أزْواجهُ، قالتْ عائشةُ، فبدأ بي رسُول الله(ﷺ) فقال: ﴿ إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْراً وَ لا عَلَيْكِ أَنْ لا تُعَجِّلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ ﴾، قالت: علم أنْ أبوي لا يأمراني بفراقه ثمَ قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ ﴾. فقلت في هذه أستأمر أبوي ، فإني أُريدُ الله ورسُولهُ والدَار الآخرة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٥٨ ) في صحيح الجامع

عائشەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتۆته لای کاتێك که خوا فەرمانی پێ کرد که خێزانەکانی سەرپشك بکات له هەڵبژاردندا - ئایا خوا و پێغەمبەرو ڕۆژی دواییان دەوێت یان خۆشی و رابواردنی دونیا -عائشه وتی: جا پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم جار به من دەستی پێ کرد و فەرمووی: ( من شتێکت پێ دەڵێم قەیناکه ئەگەر به پەله وەڵامم نەدەیتەوه هەتا پرسی تێدا به دایك و باوکت دەکەیت ). وتی: وه باش دەیزانی که دایك و باوکم هەرگیز فەرمانی ئەوەم پێ ناکەن که من وازی لێ بهێنم و لێی جیا ببمەوه. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا .. ). منیش پێم وت: جا ئایا ئەوه شتێکه که من پرسیاری تێدا له دایك و باوکم بکەم؟ به دڵنیایییەوه من خوا و پێغەمبەرەکەی و ماڵەکەی دوا ڕۆژم ( قیامەت ) هەڵدەبژێرم

( ٥٨٩ ) ( د ت ) عن عائشة سمعتْ رسُول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَا مِنْ امْرَأَةٍ تَخْلَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِهَا إِلَّا هَتَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَ بَيْنَ اللهِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٩١ ) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: له پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووه دەیفەرموو: ( هەر ئافرەتێك بەرگ و پۆشاکی خۆی دابکەنێت له غەیری ماڵەکەی خۆیدا ئەوا پەردەی نێوان خۆی و نێوان خوای هەڵماڵیوه )

## ( ١٧ ) ( شیردان به منداڵ )

( ٥٩٠ ) ( ت ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَاحَرَّمَ مِنَ الْوِلادَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٥٢ ) في صحيح الجامع

(ت) عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە ئەوەی کە لە ڕێی منداڵ بوونەوە حەرامی کردووە، هەمان ئەوەیشی لە ڕێگەی شیردانەوە حەرامە کردووە ).

(٥٩١) ( ت ) عن علي قال: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعِ مَاحَرَّمَ مِنَ النَّسَبِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٥٣) في صحيح الجامع

ئیمام علی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەوەی کە خوای گەورە لە ڕێی خزمایەتی یەوە حەرامی کردووە، هەمان ئەویشی لە ڕێگەی شیردانەوە حەرام کردووە ).

## ( ١٨ ) ( چەند حوکمێکی شەرعی لەسەر کەسایەتی و خزمایەتی )

(٥٩٢) ( هـ هق ) عن عائشة قالت: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ فِرْيَةً: لَرَجُلٌ هَاجَى رَجُلاً فَهَجَا الْقَبِيلَةَ بِأَسْرِهَا وَ رَجُلٌ انْتَفَى مِنْ أَبِيهِ وَ زَنَّى أُمَّهُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم ١٥٦٩ في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( گەورەترین بوهتانی هەڵبەستراو کە کەسێك بیکات ئەوەیە کە پیاوێك جوێنی دابێت بە پیاوێك ئەویش جوێن بە هەموو عەشیرەتەکەی ئەو بدات. وە پیاوێکیش حاشا لە باوکی خۆی بکات و دایکی خۆی بە زیناکار لە قەڵەم بدات ).

(٥٩٣) ( ت ) عن عمرو بن خارجة: أنَّ النبيَّ(ﷺ) خطب على ناقته وأنا تحت جرانها وهي تقصع بجرتها وإنَّ لعابها يسيل بين كتفيَّ فسمعته يقول: ﴿ إِنَّ اللهَ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ وَ الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَ لِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٢٠) في صحيح الجامع

عمرو کوڕی خارجە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەدا لەسەر ووشترەکەی خۆی، منیش لە ژێر ملی وشترەکەدا بووم کە کاوێشی دەکرد و دەیجووەوە، وە لیکەکەی بە نێوان هەردوو شانمدا دەهاتە خوارەوە، جا گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ( خوای گەورە و باڵا دەست هەموو خاوەن حەقێك حەقی خۆی پێداوە، جا خاوەن میرات بۆی نییە وەسیەتی لەسەر بکات. وە منداڵ ناوی ئەو باوکە هەڵدەگرێت کە سەرجێی شەرعی لەگەڵ دایکیدا کردووە، وە بەرد بارانیش بۆ داوێن پیسی زیناکارە ).

(٥٩٤) ( حم هـ ) عن عمرو بن خارجة قال: أنَّ النبيَّ(ﷺ) خطبهم وهو على راحلته، و إنَّ راحلته لتقصع بجرتها، و إنَّ لغامها ليسيل بين كتفيَّ، قال: ﴿ إِنَّ اللهَ قَسَمَ لِكُلِّ وَارِثٍ نَصِيبَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ، فَلا تَجُوزُ لِوَارِثٍ وَصِيَّةٌ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَ لِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَ مَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَ الْمَلائِكَةِ وَ النَّاسِ أَجْمَعِينَ، لايَقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاعَدْلٌ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٩٤) في صحيح الجامع

عەمری کوڕی خارجە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری بۆ داین لەسەر ووشترەکەی خۆی، وە وشترەکە کاوێشەکەی دەمی دەجووەوە لیکەکەی بە نێوان هەردوو شانمدا دەهاتە خوارێ، دەیفەرموو: ( خوای

گەورە بۆ هەموو میرات گرێك بەشی خۆی لە میرات بۆ دەستنیشان كردووە، جا ئیتر خاوەن میرات بۆی نییە وەسیەتی لەسەر بكات، وە منداڵ ناوی ئەو باوكە هەڵدەگرێت كە سەرجێیی شەرعی لەگەڵ دایكیدا كردووە، وە داوێن پیسی زیناكاریش بەشی هەر بەرد بارانە، وە هەر كەسێك ناوی خۆی بداتە پاڵ ناوی غەیری باوكی خۆی یان خۆی بداتە پاڵ غەیری خاوەنەكانی خۆی، ئەوا ئەو كەسە نەفرەتی خوا و فریشتەكانی و هەموو خەڵكی لەسەر بێت، وە هیچ شتێكیشی لە بری و بەرامبەردا لێ وەرناگیرێت ).

(٥٩٥) ( حم د ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَ فَخْرَهَا بِالآبَاءِ ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌ وَ فَاجِرٌ شَقِيٌ، أَنْتُمْ بَنِي آدَمَ وَ آدَمُ مِنْ تُرَابٍ، لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ إِنَّمَا هُمْ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونَنَّ أَهْوَنَ عَلَى الله مِنَ الْجِعْلاَنِ الَّتِي تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتْنَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٨٧ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فیز و دەعیەی سەر دەمی نەفامی و خۆ هەڵكێشان بە باووباپیرانی لەسەر لابردوون، جا یان باوەڕدارێكی لەخواترس یان خراپەكارێكی سەرگەردان، ئێوە نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵ بووە،، جا پیاوانێك دەست هەڵدەگرن لە خۆهەڵكێشان بە كەسانێكەوە كە لە راستیدا هیچ نین جگە لە خەڵوزی دۆزەخ، یان ئەوەتا لە لای خوا لەو قالۆنچانەی كە بە لوت پاڵ بە شیاكە و پیسایییەوە دەنێن، سوك و كەم نرخ تر دەبن ).

(٥٩٦) ( خ ت ن هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَ لا تَنَاجَشُوا وَ لا الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ وَ لا يَخْطُبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ وَ لا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاقَ أُخْتِهَا لِتَكْتَفِيءَ مَا فِي إِنَائِهَا وَ لِتُنْكَحَ فَإِنَّمَا لَهَا مَا كَتَبَ الله لَهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٥٧٧ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( با خەڵكی شار بە كۆچەریی و دەشتەكیی نەفرۆشێت، وە نابێت پیاو چاو بەست و زەمكاری بەسەر كڕین و فرۆشتنی براكەیەوە بكات، وە نابێت خوازبێنی بەسەر خوازبێنی ئەودا بكات، وە ئافرەت هەوڵی بە تەڵاق دانی خوشكەكەی نەدات لە پێناو ئەوەی جامی رقی خۆی پێ بڕژێت و خۆی مارە بكرێت، چونكە خوا چی بۆ نوسیوە هەر ئەوەی بۆ دەبێت ).

(٥٩٧) ( هـ ) عن إبن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ انْتَسَبَ إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ الله وَ الْمَلائِكَةِ وَ النَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٩٧ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك ناوی خۆی بخاتە سەر ناوی غەیری باوكی خۆی یان خۆی بداتە پاڵ غەیری مەوالی و خاوەنی خۆی، ئەوا نەفرەتی خوا و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر بێت ).

## ( ١٩ ) ( فەرمووده لەسەر ئازاد کردنی گەردنێك لە کۆیلایەتی )

(٥٩٨) ( د حب ) عن أبي نجيح السلمي قال: حَاصَرْنَا مَعَ رَسُولِ الله(ﷺ) قَصْرَ الطَّائِف: قَالَ مَعَاذ: سمعتُ أبي يَقُولُ بِقَصْرِ الطَّائِفِ بِحِصْنِ الطَّائِف كُلَّ ذلِكَ فَسَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ مَنْ بَلَغَ بِسَهْمٍ فِي سبيلِ الله فَلَهُ دَرَجَةٌ ﴾، وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَ سَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ أَيُّمَا رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ رَجُلاً مُسْلِماً فَإِنَّ الله تَعَالَى جَاعِلٌ وِقَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظامِه عَظْماً مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِه مِنَ النَّارِ وَ أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَعْتَقَتْ امْرَأَةً مُسْلِمَةً فَإِنَّ الله تَعَالَى جَاعِلٌ وِقَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهَا عَظْماً مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِهَا مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٢٤ ) في صحيح الجامع

أبی نجیح السلمي دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) گەمارۆی قەڵاکەی ( طائف ) مان دابوو، لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( هەر کەسێك بە هاویشتنی تیرێك لە پێناوی خوادا بەشداری بکات ئەوا پلەیەکی بۆ بەرز دەکرێتەوە ... وە لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: هەر پیاوێکی موسڵمان پیاوێکی موسڵمانی تر لە کۆیلایەتی ئازاد بکات، ئەوا خوای گەورە بە هەر ئێسکێك لە ئێسکەکانی کەسە ئازادکراوەکە ئێسکێك لە ئێسکەکانی ئازاد کەرەکەی پێ دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، وە هەر ئافرەتێکیش ئافرەتێکی موسڵمان ئازاد بکات لە کۆیلایەتی ئەوا خوای گەورە بە هەر ئێسکێك لە ئێسکەکانی ئافرەتە ئازاد کراوەکە ئێسکێك لە ئێسکەکانی ئازاد کەرەکەی پێ لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێت و رزگاری دەکـات لە رۆژی قیامەتدا ).

(٥٩٩) ( ق ت ) عن أبي هريرة عن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً أَعْتَقَ الله لَهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهَا عُضْواً مِنْهُ مِنَ النَّارِ حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ ﴾. ( حسن ) أنظر حديث رقم ( ٦٠٤٨/١ ) في صحيح الجامع الصحيحة ( ١٠٢٠ )

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك گەردنی موسڵمانێك لە کۆیلایەتی و بەندایەتی ئازاد بکات، ئەوا خوای گەورە بە هەموو ئەندامێکی ئازاد کراوەکە، ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەو لە ئاگر ئازاد دەکـات، تەنانەت فەرجیشی لە بەرامبەر فەرجی ئەودا ئازاد دەکرێت ).

# (( بەشی: میرات ))

## ( ١ ) ( چۆنیەتی دابەش کردنی میرات )

**(٦٠٠) ( م د هـ ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اقْسِمُوا الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللهِ فَمَا تَرَكَتِ الْفَرَائِضُ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١٧٨ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەو ماڵە دابەش بکەن بە سەر ئەو کەسانەی کە بە پێی کیتابەکەی خوا میراتییەکەیان بۆ فەرز کراوە، جا هەرچییەکیش لە دوای فەرزەکانەوە مایەوە ئەوا بیدەن بە نزیك ترین نێرینەیان ).

## ( ٢ ) ( خوا و پێغەمبەرەکەی کەسی بێ کەسانن )

**(٦٠١) ( ت هـ ) عن أبي أمامة بن سهل رضي الله عنه قال: كَتَبَ عُمَرُ إلي أبِي عُبَيْدَةَ رضي الله عنهما أنَّ رسُولَ الله(ﷺ) قال: ﴿ اللهُ وَ رَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لا مَوْلَى لَهُ وَ الْخَالُ وَارِثُ مَنْ لا وَارِثَ لَهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٢٥٤ ) في صحيح الجامع**

ابي امامة ی کوڕی سهل دەڵێ: عومەر نوسیی بۆ ابوعبیدة رەزای خوا لە هەردووکیان بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خواو پێغەمبەرەکەی گەورە و خاوەنداری هەرکەسێکن کە خاوەنی نەبێت، وە خاڵ دەبێت بە میراتگری هەر کەسێك کە میرات گری نەبێت ).

## ( ٣ ) ( خاوەن میرات بۆی نییە وەسیەتی لەسەر بکات )

**(٦٠٢) ( هـ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالَى قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٨٨ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی داوە پێی، جا ئیتر خاوەن میرات بۆی نییە وەسیەتی لەسەر بکات ).

### روونکردنەوەی فەرمودەکان :

ئەو فەرمودە پیرۆزانەی کە باس لەوە دەکەن خاوەن میرات بۆی نییە وەسێت بکات ، واتە بۆی نییە ئەو جۆرە دابەشکردنەی کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دایناوە بۆ میرات ئەم بیگۆڕێت و

دەستکاری بکات ، واتە بەشی هەندێك زیاد بکات و بەشی هەندێك کەم بکات و هەندێك بێ بەش بکات ،بەڵکو خوای گەورەو کاربەجێ چۆنی دابەشکردووە لە قورئان و شەرعی پیرۆزدا هەر دەبێت وا بێت ، وە خوای گەورە تەنها ئەوەندە ڕێگەی داوە بە خاوەن میرات کە لە سێ یەکی ماڵەکەیدا ئازاد بێت ئەگەر ویستی زیاد لە میراتییەکە بڕێکی زیاد بۆ کەسێك تەرخان بکات ،یان بڕێك بدات بە کەسێك کە لە میراتییەکەی بەرناکەوێت ،یان بڕێك پارە بۆ کارێکی خێروچاکە تەرخان بکات ، یان هەر شتێکی تر کە خاوەن میراتەکە مەبستی بێت ،ئەویش بە پێی وەسیەتێکی باوەڕ پێکراو کە لە دوای خۆی بە جێی بهێڵێت ،ئەو وەسیەتەش وەك پێشتر ووتمان دەبێت تەنها لە سێیەکی ماڵەکەدا بێت و نابێت لە دوو بەشەکەی تریدا بێت ، واتە هەتا سێیەکی ماڵەکە بۆی هەیە وەسێتی لەسەر بکات ، وە دوو بەشەکەی تری هەر دەبێت بەپێی شەرعی پیرۆزی پەروەردگار دابەش بکرێت .

## ( ٤ ) ( بەشی : فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە )

**(٦٠٣) ( حم هـ حب ) عن أبي سعيد الخدري يقول: سمعتُ رسُول الله(ﷺ) يقُول: ﴿ إنَّ اللهَ تَعَالَى لَيَسْأَلُ الْعَبْدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَسْأَلَهُ: مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَ الْمُنْكَرَ أَنْ تُنْكِرَهُ؟ فَإِذَا لَقَّنَ اللهُ الْعَبْدَ حُجَّتَهُ قَالَ: يَارَبِّ رَجَوْتُكَ وَ فَرِقْتُ مِنَ النَّاسِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨١٨ ) في صحيح الجامع**

ابو سعید الخدري دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیار لە بەندەی خۆی دەکـات، هەتا لێی دەپرسێت: چ شتێك ڕێی لێ گرتیت، کاتێك کە خراپەکاریی و بێ فەرمانیی خوات بینی کە بەرهەڵەستی بکەیت و نەهێڵیت بکرێت؟ جا کە خوای گەورە بەندەکەی خۆی بیانوو بڕاو کرد، بەندەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگار ئومێدم بە لێبوردنی تۆ هەبوو وە لە خەڵکیش ترسام ).

## ( ٥ ) ( ئەو کەسانەی چاو پۆشی لە خراپەکاری دەکەن )

**(٦٠٤) ( حم ) عن أبي بكر: سمعْنا رسُول الله(ﷺ) يقُول: ﴿ إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الْمُنْكَرَ وَ لا يُغَيِّرُونَهُ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقَابِهِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٧٤ ) في صحيح الجامع**

ابو بکر دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( ئەگەر خەڵکیی تاوان و خراپەکارییان بینی و نەیان گۆڕی، ئەوا نزیکە خوای گەورە سزای خۆی بەسەر هەموویاندا ببارێنێت ).

**(٦٠٥) ( حم ت ) عن حذيفة رضي الله عنه عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَ لَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَاباً مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلا يُسْتَجَابَ لَكُمْ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٠٥٨ ) في صحيح الجامع**

**حذیفه‌ﷺ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمـوویه‌تی: ( سوێند به‌وه‌ی كه‌ گیانی منی به‌ده‌سته‌، فه‌رمان به‌ چاكه‌ ده‌كه‌ن و ڕێگری له‌ خراپه‌ ده‌كه‌ن، یان ئه‌وه‌تا نزیكه‌ خوای گه‌وره‌ سزایه‌كی خۆی بنێرێته‌ سه‌رتان، ئیتر پاش ئه‌وه‌ هه‌ر هاواری بكه‌ن و ئه‌ویش وه‌ڵامتان نه‌داته‌وه‌ ).**

# (( بەشی : ئیمامەتی گەورە ))

## ( ١ ) ( فەزلی یەك كۆمەڵیی موسڵمانان )

**(٦٠٦) ( ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَدُ اللهِ عَلىَ الْجَمَاعَةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٥٨) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( دەستی خوا لەسەر یەك كۆمەڵیتانە ).

**(٦٠٧) ( طب ) عن كليب بن شهاب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُحِبُ اللهُ الْعَامِلَ إِذا عَمِلَ أَنْ يُحْسِنَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٣٥) في صحيح الجامع**

كليب ی كوڕی شهاب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە پێی خۆشە ئەگەر كارمەندێك كارێكی كرد باش بیكات ).

## ( ٢ ) ( ئامۆژگاری كردن بۆ كۆمەڵی موسڵمانان )

**(٦٠٨) ( حم هـ ك ) عن جبير بن مطعم ( د هـ ) عن زيد بن ثابت ( ت هـ ) عن ابن مسعود، عن أبيه: أنّ رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ نَضَّرَ اللهُ عَبْداً سَمِعَ مَقَالَتِي فَحَفِظَهَا وَرَعَاهَا فَأَدَّاهَا إِلىَ مَنْ لَمْ يَسْمَعْهَا فَرُبَّ حَامِلِ فقه غَيْرُ فَقِيه وَ رُبَّ حَامِلِ فقه أَدَّاهُ إِلىَ مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ ، ثَلاثٌ لا يُغِلُّ عَلَيْهِنَّ قَلْبُ مُسْلِمٍ: إِخْلاصُ الْعَمَلِ لله وَ النَّصِيحَةُ لِلْمُسْلِمِينَ وَ لُزُومُ جَمَاعَتِهِمْ فَإِنَّ دَعْوَتَهُمْ تُحِيطُ مِنْ وَرَاءِهِمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٧٦٥) في صحيح الجامع**

لە جُبیری كوڕی مطعم و لە زیدی ی كوڕی ثابت و لە عبد الرحمن ی كوڕی عبدالله كوڕی مسعودە وە لە باوكییەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕووی هەر بەندەیەك گەش وسپی بێت كە گوێی لەم فەرمایشتەی من دەبێت و لەبەری دەكـات و دەیپارێزێت و دەیگەیەنێت وەك خۆی كە بیستوویەتی، چونكە جاری وا هەیە كەسێك زانیاری هەڵگرتووە بەڵام خۆی زانا نییە،یان جاری وا هەیە كەسێك زانیاری پێیە دەیگەیەنێتە كەسێك كە لە خۆی زاناتر و تێگەیشتوو ترە،وە سێ شت هەیە نابێت دڵی موسڵمان لەسەریان گەرد بگرێت و بڕەنجێت: دڵسۆزی كار و كردەوەكان بۆ خوای گەورە وە ئامۆژگاریی بۆ موسڵمانان، وە پەیوەست بوون بە كۆمەڵی موسڵمانانەوە چونكە نزای ئەوان ئەوانەی دوای خۆشیان دەگرێتەوە ).

(٦٠٩) ( حم ق د ن ) أبو سعيد الخدري أنَ أعرابيا سأل رسول الله(ﷺ) عن الهجرة فقال: ﴿ وَيْحَكَ! إنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ لَشَدِيْدٌ فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ﴿ فَهَلْ تُؤْتِي صَدَقَتَهَا؟ ﴾، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ﴿ فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ، فَإِنَّ اللهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئاً ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١٢٦ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد الخدري دەڵێ:عەرەبێكی دەشتەكی پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ)كرد دەربارەی ( الهجرة ) كۆچكردن؟ ئەویش فەرمووی: ( وەی بۆ تۆ مەسەلەی كۆچ كردن زۆر توند و قورسە، جا ئایا تۆ هیچ حوشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: جا زەكاتەكەی دەدەیت؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دە كاری خۆت لە گوند و دێهاتەكانی خۆتان بكەن. چونكە خوای گەورە هیچ كار و كردەوەیەكت نافەوتێنێت ).

## ( ٣ ) ( كۆچكردن لە ناو بێ باوەڕانەوە بۆ ریزی باوەڕداران واجیبە )

(٦١٠) ( هـ ) عن معاوية بن حيدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَقْبَلُ اللهُ تَعالَى مِنْ مُسْلِمٍ أَسْلَمَ بَعْدَ مَا أَشْرَكَ عَمَلاً حَتَّى يُفَارِقَ الْمُشْرِكِينَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٧٤٧ ) في صحيح الجامع

معاویەی كوڕی حیدە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هیچ كار و كردەوەیەك لە كەسێكی موسڵمان وەرناگرێت كە لە پاش بێ باوەڕیی موسڵمان بووە ، هەتا ناو موشریكەكان بەجێ نەهێڵێت بۆ ناو موسڵمانەكان ).

(٦١١) ( حم ق د ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ) يوم الفتح، فتح مكة: ﴿ لا هِجْرَةَ وَ لَكِنْ جِهَادٌ وَ نِيَّةٌ، وَ إِذا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا ﴾،وقال: يوم الفتح ، فتح مكة: ﴿ إِنَّ هَذا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَواتِ وَ الأَرْضَ، فَهُوَ حَرامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَىَ يَوْمِ الْقِيامَةِ، وَ إِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيْهِ لأَحَدٍ قَبْلِي وَ لم يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهارٍ، فَهُوَ حَرامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، لا يُعْضَدُ شَوْكُهُ، وَ لا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ، وَ لا يَلْتَقِطُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا وَلايُخْتَلَى خَلاهَا ﴾. فقال العباس: يارسول الله(ﷺ): إلاّ الإذخر، فإنّهُ لقينهمْ ولبُيُوتِهم. فقال: ﴿ إِلاَّ الإِذْخِرَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٥٣٨ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی ئازاد كردنی مەككەدا فەرمـووی: ( ئیتر هیجرەت نەما بەڵكو لەمەو دوا جیهاد و نییەتە، وە ئەگەر بانگهێشتی جیهاد كران بۆی راپەڕن و بچن بە دەمیەوە ). وە هەر لە رۆژی ئازاد كردنی مەككەدا فەرمووی: ( ئەم شارە خوای گەورە حەرامی كردووە هەر لەو رۆژەوەی كە ئاسمانەكان و زەوی تێدا دروست كردووە. جا بە حورمەت و پیرۆزكردنی خوایی حەرام كراوە هەتا رۆژی قیامەت، وە لە پێش مندا شەڕ و كوشتار بۆ هیچ كەسێك حەڵاڵ نەكراوە لەم شارەدا. وە منیش تەنها سەعاتێكی رۆژ نەبێت ئیتر بۆم حەڵاڵ نەكراوە. جا ئیتر بە حورمەت و پیرۆزكردنی خوایی حەرامە هەتا رۆژی قیامەت. نابێت درك و داڵی بڕنرێت. وە نابێت راوی تێدا بكرێت، وە جگە لە خاوەنەكەی یان ئەو كەسەی دەیناسێنێت نابێت هیچ كەس ئاژەڵی وێڵ بوو هەڵگرێتەوە، وە گژ و گیای

نابێت بزنرێت )، ( عباس ) یش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تەنها روەکی ( اذخر ) نەبێت چونکە ئەوە بۆ خۆ جوانکردن و بۆ ماڵەکانیشمان بەکاری دەهێنین، ئەویش فەرمووی: ( تەنها اذخر نەبێت ).

## ( ٤ ) ( فەزیڵەتی هیجرەت )

**(٦١٢) ( طب ) عن ابي فاطمة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَلَيْكَ بِالْهِجْرَةِ فَإِنَّهُ لا مِثْلَ لَهَا، عَلَيْكَ بِالْجِهَادِ فَإِنَّهُ لا مِثْلَ لَهُ، عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لا مِثْلَ لَهُ، عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ فَإِنَّكَ لا تَسْجُدَ لله سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَكَ الله بِهَا دَرَجَةً وَ حَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً ﴾ ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٤٠٣٠ ) في صحيح الجامع**

ابي فاطمة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیجرەت بکە چونکە عیبادەتێکی بێ وێنەیە، جیهاد بکە چونکە ئەویش وێنەی نییە، رۆژو بگرە چونکە ئەویش بێ وێنەیە، سوجدەی زۆر بەرە چونکە هەر سوجدەیەك کە دەیبەیت بۆ خوا، ئەوا خوای گەورە پلەیەکت بۆ پێ بەرز دەکاتەوە، وە تاوانێکیشت پێ لەسەر هەڵدەوەرێنێت ).

## ( ٥ ) ( وەزیری باش و وەزیری خراپ )

**(٦١٣) ( ن ) عن عائشة: عن إبن ابي حسين عن القاسم بن محمد قال: سمعت عمتي تقول: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ وَلِيَ مِنْكُمْ عَمَلاً فَأَرَادَ الله بِهِ خَيْراً جَعَلَ لَهُ وَزِيراً صَالِحاً إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ ﴾ ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٦٥٩٥ ) في صحيح الجامع**

عائشة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك لە ئێوە ئەگەر بکرێتە بەرپرسی کارێك، وە خوای گەورە مەبەستی خێری پێی هەبێت، ئەوا وەزیرێکی چاك و باشی بۆ دەرەخسێنێت ئەگەر شتێکی لە بیر چوو وەبیری بهێنێتەوە، وە ئەگەر بیریشی بوو هاوکاری بکات )

**(٦١٤) ( خد ت ) عن ابي هريرة: قال النبي(ﷺ): ﴿ إِنَّ الله تَعَالَى لَمْ يَبْعَثْ نَبِيّاً وَ لا خَلِيفَةً إِلاَّ وَ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَ تَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ ، وَ بِطَانَةٌ لا تَأْلُوهُ خَبَالاً ، وَ مَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السَّوْءِ فَقَدْ وُقِيَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٠٥ ) في صحيح الجامع**

ابوهریرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێك یان خەلیفەیەکی نەناردووە ئیلا دوو جۆر دەست و پێوەندی دەبێت، دەست و پێوەندێك فرمانی بە چاکە پێ دەکات و نەهی لێ دەکات لە خراپە، وە دەست و پێوەندێکیش کەمتەرخەمی ناکات لە هاندانی بۆ خراپە، جا هەرکامیان لە دەست و پێوەندی خراپ بپارێزرێن، ئەوا پارێزراو دەبێت ).

**(٦١٥) ( د هب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا أرادَ اللهُ بالأمير خيراً جعلَ لهُ وزيرَ صدْقٍ إنْ نَسيَ ذكَرهُ وَ إنْ ذكرَ أعانَهُ وَ إذا أرادَ به غيْر ذلكَ جعَل لهُ وزيرَ سَوْءٍ إنْ نَسيَ لمْ يُذكِرهُ وَ إنْ ذكَرَ لمْ يُعنْه ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٠٢) في صحيح الجامع**

عائشة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەگەر خوای گەورە مەبەستی خێری بە ئەمیر و دەسەڵات دارێك هەبوو ئەوا وەزیرێكی راستگۆی پێدەدات، ئەگەر شتێكی لە یاد چوو بیری بهێنێتەوە، وە ئەگەر لەیادیشی بوو هاوكاری بكات، وە ئەگەر مەبەستی خێریشی پێ نەبوو ئەوا وەزیرێكی خراپی دەداتێ، ئەگەر شتێكی لە یاد چوو بیری نەخاتەوە، وە ئەگەر لە یادیشی بوو هاوكاری نەكات ).

**(٦١٦) ( ن ) عن أبي أيوب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ما بَعثَ اللهُ منْ نَبيَ وَ لا كَانَ بَعْدَهُ منْ خَليفَة إلاَّ كَانَ لَهُ بطَانَتان، بطَانَةٌ تَأمُرُهُ بالمعْرُوف وَ تَنْهَاهُ عَن المُنْكَر، وَ بطَانَةٌ لا تَألُوهُ خَبالاً وَمَنْ يُوقَ بطَانَةَ السَّوْء فَقَدْ وُقيَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٧٩) في صحيح الجامع**

ابو ايوب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە، وە لە پاشیشی هیچ خەلیفەیەك نەبووە، ئیلا دوو دەست و پێوەندی هەبووە، دەست و پێوەندێك فرمانی چاكەی پێ دەكەن و نەهی لێ دەكەن لە خراپە، وە دەست و پێوەندێكیش كە كەمتەرخەمی ناكات لە هاندانیدا بۆ خراپە، وە هەر كەسێك بەدوور بێت لە دەست و پێوەندی خراپ ئەوا پارێزراو دەبێت ).

**(٦١٧) ( حم خ ن ) عن أبي سعيد عن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ ما بَعثَ الله منْ نَبيَ وَ لا اسْتَخْلَفَ منْ خَليْفَة إلاَّ كَانَتْ لَهُ بطَانَتان، بطَانَةٌ تَأمُرُهُ بالْخَيْر وَ بطَانَةٌ تَأمُرُهُ بالشَّر وَ تَحُضَهُ عَلَيْه وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللهُ عَزَوَجَلَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٧٨) في صحيح الجامع**

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە وە هیچ خەلیفەیەكیشی نەكردووە بە جێنشینی، ئیلا دوو دەست و پێوەندی هەر هەبووە، دەست و پێوەندێك فەرمانی چاكەی پێ دەكات، وە دەست و پێوەندێكیش فەرمانی خراپەی پێ دەكـات و هانی دەدات لەسەری، وە پارێزراو ئەو كەسەیە كە خوای گەورە بیپارێزێت ).

## ( ٦ ) ( هاندانی پێشەوا لەسەر دادوەری )

**(٦١٨) ( حم ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا منْ رَجُل يَلي أمْرَ عَشَرَة فَمَا فَوقَ ذلكَ إلاَّ أتَى اللهَ مَغْلُولاً يَدَهُ إلَى عُنُقه فَكَّهُ برُّهُ أوْ أوْثَقَهُ إثْمُهُ ، أوَّلُهَا مَلامَةٌ وَ أوْسَطُهَا نَدامَةٌ وَ آخَرُها خزْيٌ يَوْمَ الْقيَامَة ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧١٥) في صحيح الجامع**

ابو امامە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر پیاوێك كار و بەرپرسیارێتی دە كەس بەرەوسەر بگرێتە دەست، ئەوا كە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا دەستی لە گەردنیدا كۆت بووە، چاكەكانی دەیكاتەوە یان تاوانەكانی دەیبەستێتەوە، بەرپرسیارێتی سەرەتاكەی لۆمە و گلەییە، وە ناوەڕاستەكەی پەشیمانییە، وە كۆتاییەكەشی روو زەردیی رۆژی قیامەتە ).

## ( ٧ ) ( ئاكامی ستەم كاری )

(٦١٩) ( ق ت هـ ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَ الله تَعالَى لَيُمْلي لِلظَّالِمِ حَتَّى إذا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٢٢) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتي: ( خوای گەورە هەر بوار بۆ ستەمكار درێژ دەكـاتەوە هەتا كاتێك كە گرتی ئیتر بەری نادات ).

## ( ٨ ) ( خراپی دووره پە پرێز بوونی پێشەوا لە جەماوەر )

(٦٢٠) ( د هـ ك ) عن أبي مريم الأزدي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ وَلِيَ مِنْ أُمُورِ الْمُسْلِمِينَ شَيْئاً فَاحْتَجَبَ دُوْنَ خَلَّتِهِم وَ حَاجَتِهِمْ وَ فَقْرِهِمْ وَ فَاقَـتِهِمْ ، احْتَجَبَ اللهُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ دُونَ خَلَّتِهِ وَ حَاجَتِهِ وَ فَاقَـتِهِ وَ فَـقْرِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٩٣) في صحيح الجامع

ابو مريم الأزدي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتي: ( هەر كەسێك شتێك لە كارو باری موسڵمانان بگرێتە دەست ئینجا دەرگا و پەردە بخاتە بەردەم نەبونی و پێداویستی هەژاری و نەداری‌یانەوە، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا پەردە دەخاتە بەردەم نەبونی و پێداویستی و هەژاری و نەداری‌یەكەیەوە ).

(٦٢١) ( حم ت ) عن عمرو بن مرة قال لمعاوية: إني سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَا مِنْ إمَامٍ يُغْلِقُ بَابَهُ دُونَ ذَوِي الْحَاجَةِ وَ الْخَلَّةِ وَ الْمَسْكَنَةِ إلاَّ أَغْلَقَ اللهُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ دُونَ خَلَّتِهِ وَ حَاجَتِهِ وَ مَسْكَنَتِهِ ﴾ فجعل معاويةُ رجلاً على حوائج الناس. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٨٤) في صحيح الجامع

عمرو ی كوڕی مُرة بە معاوية ی ووت: من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( هەر پێشەوایەك دەرگاكەی دابخات لەبەردەم كەسانی خاوەن پێداویستی و هەژاران و لێقەوماواندا، ئەوا خوای گەورە دەرگای ئاسمان دادەخات لەبەردەم فەقیری و پێویستی و لێقەومانی ئەودا )، ئیتر معاویەش دوای ئەوە پیاوێكی دانابوو كە تایبەت بەرپرس بوو لە پێداویستیەكانی خەڵك.

## ( ٩ ) ( پێشەوا نابێت غەش و خیانەت بكات )

(٦٢٢) ( ق ) عن معقل بن يسار قال: إنِي سَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ الله رَعِيَةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَ هُوَ غَاشٌ لِرَعِيَّتِهِ إلاَّ حَرَّمَ الله عَلَيْهِ الْجَنَّةَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٣٩) في صحيح الجامع

معقل ی کوڕی یسار دەڵێ لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( هەر بەندەیەك خوای گەورە لێپرسراوێتی کۆمەڵێك خەڵك بخاتە ئەستۆی، ئەویش ئەو ڕۆژەی کە دەمرێت، بمرێت و غەش و خیانەتی لەو خەڵکەی ژێر دەستی کردبێت، ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام دەکـات ).

**(٦٢٣) ( البزار ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَدِّمُوا قُرَيْشاً وَ لا تُقَدِّمُوهَا وَ لَوْلا أَنْ تَبْطَرَ قُرَيْش لأَخْبَرْتُهَا بِمَا لَهَا عِنْدَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٨١ ) في صحيح الجامع**

عەلی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( قوڕەیش پێشبخەن و پێشی مەکەون، وە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە قوڕەیش لە خۆی بایی بێت، پێم دەوتن کە لە لای خوای گەورە چ خێر و پاداشتێکتان بۆ ئامادە کراوە ).

## ( ١٠ ) ( گوێڕایەڵی کردنی پێشەوای موسڵمانان پێویستە )

**(٦٢٤) ( م ) عن ابن عمر قال: سمعتُ رسُولَ الله(ﷺ) يقُولُ: ﴿ مَنْ خَلَعَ يَداً مِنْ طَاعَةٍ لَقِيَ اللهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاحُجَّةَ لَهُ، وَ مَنْ مَاتَ وَ لَيْسَ فِي عُنُقِهِ بَيْعَةٌ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً ﴾ رواه مسلم ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٠٧ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( هەر کەسێك دەست بکێشێتەوە لە گوێڕایەڵی پێشەواکەی، ئەوا ڕۆژی قیامەت کە بە خوای خۆی گەیشتەوە هیچ بەڵگەیەکی پێ نییە، وە هەر کەسێك بمرێت و بەیعەیەك بۆ پێشەوایەکی موسڵمانان لە گەردنی دا نەبێت، ئەوا وەك و مردنی سەردەمی نەفامی دەمرێت ).

**(٦٢٥) ( حم ق هـ ) عن إبي حازم قال: قاعدتُ أبا هُرَيْرَةَ خمس سنين فسمعتُهُ يُحدِّثُ عن النَّبيِّ(ﷺ) قال: ﴿ كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ، كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وَ إِنَّهُ لا نَبِيَّ بَعْدِي وَ سَتَكُونُ خُلَفَاءُ فَتَكْثُرُ ﴾، فقالوا: فما تأمُرُنا، قال: ﴿ فُوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ فَالأَوَّلِ، وَ أَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَإِنَّ اللهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٤٦٣ ) في صحيح الجامع**

ابو حازم دەڵێ: پێنج دانە ساڵ من دانیشتنم لەگەڵ ابو هریرة دەکرد، جا بیستومە لێی کە لە پێغەمبەر(ﷺ) ی دەگێڕایەوە کە فەرمـوویەتی: ( کاتی خۆی بەنی ئیسرائیل پێغەمبەرەکانیان فەرمان ڕەواییان دەکردن و دەیانبردن بە ڕێوە، هەر کە پێغەمبەرێکیان دەمـرد، پێغەمبەرێکی تریان دەبوو بە جێنشینی، بەڵام من هیچ پێغەمبەرێکـی ترم بە دوا دا نایەت، بەڵکو جێ نشین و خەلیفەم دەبێت و زۆریش دەبن )، وتیان: جا فەرمانی چیمان پێ دەکەیت؟ فەرمـووی: ( وەفا داربن بۆ ئەو بەیعە و بەڵێنانەی کە پێیان دەدەن یەك لەدوای یەکیان، وە ئەوەی کە مافی ئەوانە پێیان بدەن ،چونکە خوای گەورە پرسیاری ئەو ڕەعیەتەیان لێ دەکـات کە پێی سپاردبوون ).

(٦٢٦)( حم م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ يَرْضَىَ لَكُمْ ثَلاثَاً وَ يَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاثَاً، فَيَرْضَى لَكُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ، وَ لا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَ أَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ الله جَمِيعاً وَ لا تَفرَّقُوا، وَ يَكْرَهُ لَكُمْ: قِيْلَ وَ قَالَ، وَ كَثْرَةِ السُّؤالِ، وَ إِضَاعَةِ الْمَالِ ﴾ (صحيح) انظر حيث رقم (١٨٩٥) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە سێ شتی بۆ ئێوە پێ خۆشە و لێی رازییە، وە سێ شتی پێ ناخۆشەو رقی لێیە، پێی خۆشە کە بەندایەتی بۆ بکەن، وە هاوتا و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن، وە پەیوەست بن بە یەك کۆمەڵیی بە ڕێبازی خواوە و پەرتەوازە نەبن، وە ئەمانەشی پێ ناخۆشە بۆتان: قسە و قسەڵۆك و وتی وتی، وە زۆر پرسیار کردن و خۆ لە شت هەڵقورتاندن، وە فەوتاندنی پارە و ماڵ ).

## (١١) ( رێز گرتن لە پێشەواو بەرپرسی موسڵمانان )

(٦٢٧)( ت ) عن أبي بكرة رضي الله عنه قال: سمعتُ رسُول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَنْ أَهَانَ السُّلْطَانَ أَهَانَهُ اللهُ ﴾ . (صحيح) انظر حيث رقم (٦١٠٧) في صحيح الجامع

ابو بکر(رضي الله عنه) دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( هەر کەسێك سوکایەتی بە سوڵتان و دەسەڵات داری موسڵمانان بکات، خوای گەورەش سوکایەتی پێ دەکات ).

(٦٢٨)( طب ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَجَلَّ سُلْطَانَ اللهِ أَجَلَّهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ . (صحيح) انظر حيث رقم (٥٩٤٧) في صحيح الجامع

ابي بكرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هەر کەسێك رێز و پیرۆزی بنوێنێت بەرامبەر بە سوڵتانی خوا ئەوا خوای گەورەش لە قیامەتدا رێز و پیرۆزیی پێ دەبەخشێت ).

(٦٢٩)( د ت هـ ) عن أبي بكر الصديق رضي الله عنه قال: يا أيها الناس، إنكم تقرؤون هذه الآية: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ﴾ . وإني سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ ﴾ (صحيح) انظر حيث رقم (١٩٧٣) في صحيح الجامع

ابو بکر الصدیق(رضي الله عنه) ووتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ﴾. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوە خەم خۆری خۆتان بن، ئەوانەی کە گومرابوون هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنن ئەگەر خۆتان هیدایەت وەربگرن-وە من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: ( ئەو خەڵکە ئەگەر ستەم کاریان بینی و دەستیان نەگرت و ڕێگرییان لێ نەکرد ئەوا نزیکە کە خوای گەورە گشت گیریان بکات بە سزایەك لە لایەن خۆیەوە ).

## ( ١٢ ) ( كوشتارى ئەهلى بەغى )

(٦٣٠) ( حم ت هـ ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْداثُ الأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الأَحْلامِ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لايُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَقُولُونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ الْبَرِيَّةِ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ فَمَنْ لَقِيَهُمْ فَلْيَقْتُلْهُمْ فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ عِنْدَ اللهِ لِمَنْ قَتَلَهُمْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٨٠٥٠) في صحيح الجامع

عبد الله ى كوڕى مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتى: ( لە ئاخير زەماندا كەسانێكى هەرزە و تەمەن منداڵ دەر دەكەون، خەون و ئاواتى بێ نرخيان هەيە، قورئان دەخوێنن بەلآم لە قوڕقوڕاگەيان تێپەر ناكات ،وە فەرموودەى پێغەمبەر ﷺ دەڵێنەوە، هەر وەك چۆن تيرێك نێچيرەكەى دەسمێت و لێى دەردەچێت ئەوانيش ئاوا لە دين دەردەچن، جا هەركەس پێيـان گەيشت با بيان كوژێت، چونكە كوشتنيان پاداشتى لەسەرە لاى خوا بـۆ هـەر كەسێك كە بيان كوژێـت ).

(٦٣١) ( حم ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ رَطْباً لا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٢٤٢٠) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتى: ( لە بنەچەو توخمى ئەم پياوە كەسانێك دەكەونەوە قورئانەكەى خوا بە پاراويى دەخوێننەوە لە گەروويان تێ ناپەڕێت، لە دين دەردەچن هەر وەك چۆن تيرێك نێچيرەكەى دەسمێت و لێى دەر دەچێت، ئەگەر بگەمە سەردەمى ئەوان، ئەوا هەر وەك چۆن قەومى ( ثمود ) بكوژم ئاوا دەيانكوژم ).

## ( ١٣ ) ( خراپيى غەدر كردن )

(٦٣٢) ( م ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِذا جَمَعَ اللهُ الأَوَّلِينَ وَ الآخِرِيْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرْفَعُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ، فَقِيلَ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلانِ ابْنِ فُلانٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٨٣) في صحيح الجامع

ابن عمر دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتى: ( هەر كاتێك خواى گەورە لە ڕۆژى قيامەتدا خەڵكانى ئەوەڵ و ئاخيرى كۆكردەوە، ئەوا بۆ هەموو ستەمكارێك ئالآيەكى بۆ بەرز دەكرێتەوە و دەوترێت: ئەمە غەدرى فلآنى كوڕى فلآنە ).

## ( ١٤ ) ( فريو خواردن بە جوانى و خۆشييەكانى دونيا )

(٣٣٣) ( م هـ ) عن عبدالله بن عمرو بن العاص، عن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ إِذا فُتِحَتْ عَلَيْكُمْ فَارِسُ وَ الرُّومُ، أَيَّ قَوْمٍ أَنْتُمْ؟ ﴾ قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: نَقُولُ كَمَا أَمَرَنَا اللهُ، قَالَ رَسُولُ

الله(ﷺ): ﴿ أَوْ غَيْرُ ذلك، تَتَنافَسُونَ، ثُم تَتَحاسدُون، ثُم تَتَدابرُونَ، ثُم تَتَبَاغَضُونَ، ثُم تنطلقُونَ في مساكنِ الْمُهاجرِينَ، فَتَجْعلُونَ بعْضَهُمْ عَلى رقَاب بعْضٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٩٧) في صحيح الجامع

عبدالله ى كورِى عەمرى كورِى عاص دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتى: ( ئەگەر خواى گەورە وڵاتى رۆم و فارسى بۆ فەتح كردن، ئەو كاتە ئێوە چ جۆرە كەسانێك دەبن؟ )، عبدالرحمن ى كورِى عەوفيش وتى: خواى گەورە چۆن فەرمانى پێ كردوين ئێمەش وا دەڵێين. پێغەمبەريش(ﷺ) فەرمووى: ( ئەى ئەگەر وا نەبوو، موونافەسە و پێشبڕكێى يەكتر دەكەن، پاشان حەسودى بە يەكتر دەبەن، پاشان پشت لە يەكتر دەكەن، پاشان رق لە يەكتر هەڵدەگرن،- يان لەو بابەتە-، پاشان دەچن بە ناو فەقير و هەژارى كۆچبەرەكان و دەياندەن بەسەر ملى يەكتردا ).

# (( بەشی: جیهاد ))

## (١) (فەزلی جیهاد)

(٦٣٤) ( حل ) عن عبدالله بن يزيد الانصاري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللهَ تَعالىَ جَعَلَ عَذابَ هَذِهِ الأُمَّةِ فِي الدُّنْيَا القَـتْلُ** ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٣٨) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی یزیدی ئەنصاری دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە عەزاب و ئەشکەنجەی ئەم ئومەتەی خستۆتە دونیاوە کە ئەویش کوشتنە ).

(٦٣٥) ( ت هـ ك ) عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ألا أُنبِئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَ أَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَ أَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَ خَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَ الْوَرِقِ، وَ خَيْرٍ مِنْ أَنْ تَلْقُوا عَدُوَّكُمْ فَـتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ؟** ﴾ . قالوا: بلى، قال: ﴿ **ذِكْرُ اللهِ تَعَالىَ** ﴾ (حسن) أنظر حيث رقم (٢٦٢٥) في صحيح الجامع

أبو الدرداء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (ئەرێ هەواڵتان بدەمێ سەبارەت بە باشترینی کردەوەکانتان وپاکژکەرەوەتریان لە لای پادشاکەتان(خوای گەورە) ،و بەرز کەرەوەتریان لە پلەکانتاندا ،و کە بۆ ئێوە باشتر بێت لە بەخشینی زێڕو زیو، وباشتر بێت لەوەی بە دوژمنەکەتان بگەن و لە ملیان بدەن ؟ ) ووتیان :بەڵێ ،فەرمووی :(زیکری خوای گەورە) .

(٦٣٦) ( ق ن ) عن أبي هريرة عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ **تَكَفَّلَ اللهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيْلِهِ لا يُخْرِجُهُ مِنْ بَيْتِهِ إِلاَّ جِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ وَ تَصْدِيقُ كَلِمَتِهِ ، بِأَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرْجِعَهُ إِلىَ مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيْمَةٍ** ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٩٨٠) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە کەفیل و زامنی هەر کەسێکە کە لە پێناوی ئەودا جیهاد بکات، لەبەر هیچ شتێك لە ماڵی خۆی دەرنەچووبێت جگە لە جیهاد کردن لە پێناوی خوادا و باوەڕی تەواو بە گفت و بەڵێنی خوا نەبێت، کە بیخاتە بەهەشتەوە. یان بیگێڕێتەوە بۆ ئەو ماڵەی خۆی کە لێی هاتۆتە دەر لەگەڵ ئەو پاداشت و غەنیمەتەی کە بەدەستی هێناوە )

(٦٣٧) ( حم ت ن هـ ك ) عن أبي هريرة قال:قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ثَلاثَـةٌ حَقٌّ عَلىَ اللهِ تَعَالىَ عَوْنُهُمْ: الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَ الْمُكَاتِبُ الَّذِي يُرِيدُ الأَدَاءَ، وَ النَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ العَفَافَ** ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٠٤٤) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( سێ جۆر کەس هەن کە خوای گەورە کردوویەتی بە حەق بە سەر خۆیەوە کە کۆمەکیان بکات: موجاهید لە پێناوی خوادا، وە ئەو بەندەیەی نوسراوی

لەگەڵ خاوەنەکەیدا نووسیوە کە هەر کات بڕێکی دیاری کراو پارە بدات ئازاد بکرێت وە هەوڵ دەدات بڕە پارەکە پەیدا بکات، وە ئەو کەسەی کە هەوڵی ژن هێنان دەدات مەبەستییەتی داوێن پاك بێت ).

(٦٣٨) ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَنْ مَاتَ مُرابِطاً فِي سَبِيلِ اللهِ أَجْرَى اللهُ عَلَيْهِ عَمَلَهُ الصَّالِحُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُ عَلَيْهِ وَ أَجْرَى عَلَيْهِ رِزْقَهُ وَ أَمِنَ مِنَ الفَتانِ وَ بَعَثَهُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ آمِناً مِنَ الْفَزَعِ** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٤٣ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك بە سەنگەر پارێزی لە پێناوی خوادا بمرێت ئەوا خوای گەورە کردەوە چاکەکانی کە بەردەوام دەیکرد، بۆی درێژە پێ دەدات هەر وەك ئەوەی کە لە کاتی ژیانیدا دەیکرد، وە رزقەکەی خۆیشی بەردەوام درێژە پێ دەدات، وە لە فیتنەی گۆڕ ئەمین و دڵنیای دەکات وە رۆژی دواییش بە دڵنیایی و ئەمینی لەو ترسە گەورەیە زیندووی دەکاتەوە ).

(٦٣٩) ( حب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ضَحِكَ اللهُ مِنْ رَجُلَيْنِ قَتَلَ أَحَدُهُما صَاحِبَهُ وَ كِلاهُمَا فِي الْجَنَّةِ** ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٨٨١ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە پێکەنی بۆ دوو پیاو، یەکێکیان هاوڕێکەی خۆی کوشتبوو، وە هەردووکیان لە بەهەشتدان ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە کوژراوەکە موسڵمان بووە وە دەچێتە بەهەشت، وە بکوژەکەش لە کاتی کوشتنەکەیدا بێ باوەڕ بووە موسڵمانەکەی کوشتووە، بەڵام دوای ئەویش موسڵمان بووە و تۆبەی کردووە، بەمەش کوژراوەکە و بکوژەکە پێکەوە دەچنە بەهەشتەوە بە رەحمی خوای گەورە پاش ئەوەی کە خوای گەورە کوژراوەکە رازی دەکات، پاشان بەدەم هەردووکیانەوە پێدەکەنێت کە وەك دوو برا دەست دەکەنە ملی یەك و دەچنە بەهەشتەوە.

(٦٤٠) (طب) فضالة بن عبيد يحدث عن رسول الله(ﷺ) أنه قال: ﴿ **كلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إلا الذي مَاتَ مُرابِطاً فِي سَبِيلِ اللهِ فإنَّهُ يُنْمي لَهُ عَمَلَهُ إلى يَومِ القِيامَةِ وَ يَأْمَنُ مِنْ فِتْنَةِ القَبْرِ** ﴾ ، و سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ **الْمُجاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ** ﴾ و اللفظ للترمذي من حديث فضالة بن عبيد. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٦٤ ) في صحيح الجامع

فضالة ی کوڕی عبيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەموو مردوویەك مۆری کۆتایی هاتن لە نامەی کردەوەکانیدەدرێت، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بە سەنگەر پارێزیی لە پێناوی خوادا مردووە. چونکە ئەو کردەوە چاکەکانی بۆ گەشەونما پێ دەکرێت هەتا رۆژی قیامەت. وە لە فیتنەی گۆڕیش ئەمین و دڵنیا دەبێت )، وە لە پێغەمبەریشم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( موجاهید ئەو کەسەیە کە جیهادی نەفسی خۆی بکات ).

(٦٤١) ( د حب ك ) عن أبي أمامة الباهلي: عن رسول الله(ﷺ) قال: « ثَلاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ على اللهِ عَزَّوَجلَ: رَجُلٌ خَرج غَازِياً في سَبِيلِ الله عَزَوجلَ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلى الله عَزَّوَجل حتَّى يَتوفاهُ فَيُدْخلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرُدَّهُ بِما نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيْمَةٍ، و رَجُلٌ رَاحَ إلى الْمَسْجد فَهُو ضَامِنٌ علىَ الله عَزَّوَجلَ حتَّى يَتَوفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ، و رَجُلٌ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلام فَهُو ضَامِنٌ على الله سُبْحَانَهُ وَتَعالىَ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٠٥٢) في صحيح الجامع

ابو امامة الباهلي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( سێ جۆر کەسان خوای گەورە زامنی کردوون لەسەر خۆی: پیاوێك بۆ غەزا لە پێناوی خوای گەورەدا رۆشتۆتە دەر، ئەوا زامنە لەسەر خوای گەورە هەتا ئەو رۆژەی دەیمرێنێت و دەیخاتە بەهەشت یان بەو پاداشت و غەنیمەیەی کە دەستی کەوتووە دەینێرێتەوە، وە پیاوێکیش دەچێت بۆ مزگەوت، ئەوا زامنە لەسەر خوای گەورە هەتا دەیمرێنێت و دەیخاتە بەهەشت یان بەو پاداشت و غەنیمەیەی کە دەستی کەوتووە دەینێرێتەوە، وە پیاوێك بە ئاشتی و بێ وەی دەچێتە ماڵی خۆیەوە، ئەویش زامنە لەسەر خوای گەورە ).

(٦٤٢) ( حم طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): « أَحبُّ الْجِهَادِ إلىَ اللهِ كَلِمَةُ حَقٍ تُقَالُ لإمامٍ جَائِرٍ ». (حسن) أنظر حيث رقم (١٦٨) في صحيح الجامع

ابو امامة الباهلي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خۆشەویسترین جیهاد لای خوا وشەیەکی حەقە کە لە بەردەم دەسەڵاتدارێکی ستەمکار بوترێت ).

(٦٤٣) ( طس ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): « عَلَيْكُم بِالْجِهَادِ فِي سَبِيلِ اللهِ فَإنَّهُ بَابٌ مِنْ أَبْوابِ الْجَنَّةِ يَذْهَبُ اللهُ بِهِ الْهَمَّ وَ الْغَمَّ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٠٥٠) في صحيح الجامع

ابو امامة الباهلي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( جیهاد بکەن لە پێناوی خوادا چونکە جیهاد دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، خوای گەورە خەم و پەژارەی پێ دەرەوێنێتەوە ).

(٦٤٤) ( طس ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): « عَيْنَانِ لا تَرَيانِ النَّارَ: عينٌ بَكَتْ وجَلاً مِنْ خَشْيَةِ اللهِ، و عَيْنٌ بَاتَتْ تَكْلأُ فِي سَبِيلِ اللهِ ». (حسن) أنظر حيث رقم (٤١٠٨) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( دوو جۆر چاو ئاگر نابینن:چاوێك لە ترسی خوای گەورە گریابێت، وە چاوێکیش نەخەوتبێت پاسەوانی بکات لە پێناوی خوادا ).

(٦٤٥) ( ت ) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): « يَقُولُ اللهُ تعالى: الْمُجَاهِدُ في سَبِيلِي هُوَ عليَ ضَامِنٌ إنْ قَبَضْتُهُ أُوْرَثْتُهُ الْجَنَّةَ، و إنْ رَجَعْتُهُ رجَعْتُهُ بِأَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٢٥) في صحيح الجامع

انس کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( مانای ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمـوویت: کەسی موجاهید لە پێناوی مندا زامنە لەسەر من، ئەگەر گیانی بکێشم دەیخەمە بەهەشتەوە ئەگەر بیشی گەڕێنمەوە ئەوا بە پاداشت و غەنیمەوە دەیگەڕێنمەوە ).

(٦٤٦) ( ٤ ) عن مالك بن عبدالله الخثعمي ( **الشيرازي في الألقاب** ) عن عثمان قال: **قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا اغْبَرَتْ قَدَمَا عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللهِ إلاَّ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ النَّار ﴾**. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٢٥) في صحيح الجامع

له مالك ی کوڕی عبدالله الخثعمي له عثمان ەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر بەندەیەکی خوا دوو پێی خۆڵاوی و تۆزاوی بێت لە پێناوی خوادا ئەوا خوای گەورە ئاگری لەسەر حەرام دەکات ).

(٦٤٧) ( حم ) عن عائشة قالت: **قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا خَالَطَ قَلْبُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ رَهَجٌ فِي سَبِيلِ اللهِ إلاَّ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ النَّار ﴾**. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦١٠) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( دڵی هەر کەسێك تێکەڵ بێت بە خۆڵ و تۆزی جەنگ لە پێناوی خوادا ئەوا خوای گەورە ئاگری لیٚ حەرام دەکات ).

(٦٤٨) ( حم خ ت ن ) عن أبي عبس قال: **قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ اغْبَرَتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللهِ حَرَّمَهُ اللهُ عَلىَ النَّار ﴾**. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٠٥١) في صحيح الجامع

ابو عبس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر بەندەیەکی خوا دوو پێی خۆڵاوی و تۆزاوی بێت لە پێناوی خوادا ئەوا خوای گەورە لە سەر ئاگر حەرامی دەکات ).

(٦٤٩) ( د ك ) عن أبي مالك الأشعري قال: **سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) يَقُولُ: ﴿ مَنْ فَصَلَ فِي سَبِيلِ اللهِ عزَّوَجلّ فَمَاتَ أَوْ قُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ، أَوْ وَقَصَهُ فَرَسُهُ أَوْ بَعِيرُهُ، أَوْ لَدَغَتْهُ هَامَةٌ، أَوْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ، بِأَيِ حَتْفٍ شَاءَ اللهُ، فَإِنَّهُ شَهِيدٌ وَ إِنَّ لَهُ الْجَنَّةَ ﴾**. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤١٢) في صحيح الجامع

ابو مالك الأشعري دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( هەر کەسێك دابڕێت ( واتە لە ماڵ و کەسی خۆی ) لە پێناوی خوای گەورەدا جا بمرێت یان بکوژرێت ئەوا شەهیدە، یان ئەسپەکەی یان وڵاخەکەی بیگلێنێت، یان جانەوەرێك پێوەی بدات، یان لەسەر جێگای خۆی بمرێت، یان بە هەر حاڵەتێك کە خوا بییەوێت گیانی لەدەست بدات، ئەوا هەر شەهیدە و بەهەشتی دەدرێتیٚ ).

## ( ٢ ) ( فەزڵی شەهید بوون لە پێناوی خودا )

(٦٥٠) ( طب ) عن كعب بن مالك وأم مبشر قال: **قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَرْوَاحُ الْمُؤْمِنِينَ فِي أَجْوَافِ طَيْرٍ خُضْرٍ تَعْلَقُ فِي أَشْجَارِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَرُدَّهَا اللهُ إِلىَ أَجْسَادِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾**. (صحيح) أنظر حيث رقم (٩١٢) في صحيح الجامع

كعب ی کوڕی مالك و ام مبشر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕۆحی باوەڕداران وا لە ناو جەستەی باڵداری سەوزدا، بە دارەکانی بەهەشتەوە دەنیشێت، هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە دەیگێڕێتەوە بۆ لاشە و جەستەکانی خۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا ).

(٦٥١) ( حم ن حب ) عن سبرة بن أبي فاكه قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ قَعَدَ لابْنِ آدَمَ بِأَطْرُقِه فَقَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الإِسْلامِ فَقَالَ: تُسْلِمُ وَ تَذَرُ دِيْنَكَ وَ دِينَ آبَائِكَ وَ آبَاءِ أَبِيْكَ؟ فَعَصَاهُ فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْهِجْرَةِ فَقَالَ: تُهَاجِرُ وَ تَدَعُ أَرْضَكَ وَ سَمَاءَكَ وَ إِنَّمَا مَثَلُ الْمُهَاجِرِ كَمَثَلِ الْفَرَسِ فِي الطِّوَلِ، فَعَصَاهُ فَهَاجَرَ ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْجِهَادِ فَقَالَ: تُجَاهِدُ فَهُوَ جَهْدُ النَّفْسِ وَ الْمَالِ فَتُقَاتِلُ فَتُقْتَلُ فَتُنْكَحُ الْمَرْأَةُ وَ يُقْسَمُ الْمَالُ؟ فَعَصَاهُ فَجَاهَدَ ﴾ . فقال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَ مَنْ قُتِلَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَ إِنْ غَرِقَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَ إِنْ وَقَصَتْهُ دَابَّتُهُ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (١٦٥٢) في صحيح الجامع

سبرةى كوڕى ابي فاكه دەڵێ، له پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( شەیتان لەسەر هەموو ڕێگاكانی بەنی ئادەم بۆی دانیشتووە، جا له ڕێی ئیسلامدا بۆی دانیشتووە و دەڵێ: ئەوە دەبیت بە موسڵمان و دەستبەرداری ئاینی خۆت و ئاینی باو و باپیرانت دەبیت؟! ئەویش گوێرایەڵی شەیتان ناكات و موسڵمان دەبێت، پاشان له ڕێگەی كۆچكردندا بۆی دادەنیشێت و دەڵێ: ئەوە كۆچ دەكەیت ودەستبەرداری زەوی و ئاسمانی خۆت دەبیت؟!ئەی نازانی كه نموونەی كۆچبەر وەك نموونەی ئەو ئەسپەیە كه پێكانی بە گوریس بەسترابنەوە ، ئەویش سەرپێچی شەیتان دەكات و كۆچەكەی خۆی دەكات، پاشان له ڕێگەی جیهاد كردندا بۆی دادەنیشێت و دەڵێ: ئەوە جیهاد دەكەیت؟!ئەوە فەوتان و بەفیڕۆدانی خۆت و ماڵتە، شەڕ دەكەیت و دەكوژرێیت، جا ژنەكەت شو دەكاتەوە و ماڵەكەشت بەش دەكرێت، ئەویش بەقسەی ناكات و جیهادەكەی هەر دەكات )، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( جا هەر كەسێك ئەوەی كرد ئەوە خوای گەورە كردویەتی بە ماف بەسەر خۆیەوە كه بیخاتە بەهەشتەوە ،وە هەر كەسێك لەو ڕێگەدا بكوژرێت ئەوا خوای گەورە كردوویەتی بە حەق بەسەر خۆیەوە كه بیخاتە بەهەشتەوە، وە هەر كەسێك كه لەو ڕێگەدا بخنكێت له ئاودا ئەوا خوای گەورە كردوویەتە بە ماف بەسەر خۆیەوە كه بیخاتە بەهەشتەوە یان وڵاخەكەی بیگلێنێت و ملی بشكێنێت، ئەوا خوای گەورە كردوویەتی بە ماف بەسەر خۆیەوە كه بیخاتە بەهەشتەوە ).

(٦٥٢) ( الدارقطني في الأفراد ك ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ قَدْ جَعَلَ لِجَعْفَرَ جَنَاحَيْنِ مُضَرَّجَيْنِ بِالدَّمِ يَطِيرُ بِهِمَا مَعَ الْمَلائِكَةِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٩٢) في صحيح الجامع

البراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دوو باڵی خەڵتان بە خوێنی بۆ جەعفەر كردووە، لەگەڵ فریشتەكاندا پێ ی دەفرێت ).

(٦٥٣) ( طس ) عن نعيم بن هبار ويقال همار قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الشُّهَدَاءُ الَّذِيْنَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ وَ لا يَلْتَفِتُونَ بِوُجُوهِهِمْ حَتَّى يُقْتَلُوا، فَأُولَئِكَ يَلْتَقُونَ فِي

**الْغُرَفِ الْعُلا مِنَ الْجَنَّةِ يَضْحَكُ إِلَيْهِمْ رَبُّكَ إِنَّ اللهَ تَعالىَ إِذا ضَحِكَ إِلىَ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنَ فَلا حِسَابَ عَلَيْهِ** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٧١٦ ) في صحيح الجامع

نعيم ی کوڕی هبار – پێشی دەوترێت همار - دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەو شەهیدانەی کە لە پێناوی خوادا لە ریزی یەکـەدا دەجەنگن و دەم و چاویان وەرناگێڕن و ئاوڕ نادەنەوە هەتا دەکوژرێن، ئا ئەوانە لە ژوور و باڵەخانە بەرزەکانی بەهەشتدا بە یەکتر دەگەن، پەروەردگارت بۆیان پێدەکەنێت، وە خوای گەورەش بەدەم هەر بەندەیەکی باوەڕداری خۆیەوە پێکەنی، ئیتر لێپرسینەوەی لەسەر نابێت ).

(٦٥٤) ( د ) عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **عَجِبَ رَبُّنَا مِنْ رَجُلٍ غَزَا فِي سَبِيلِ اللهِ فَانْهَزَمَ- يَعْنِي أَصْحَابُهُ- فَعَلِمَ مَاعَلَيْهِ فَرَجَعَ حَتَّى أُهْرِيقَ دَمُهُ فَيَقُولُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ لِمَلائِكَتِهِ: انْظُرُوا إِلىَ عَبْدِي رَجَعَ رَغْبَةً فِيمَا عِنْدِي وَ شَفَقَةً مِمَّا عِنْدِي حَتَّى أُهْرِيقَ دَمُهُ** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٩٧٣ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( پەروەردگاری گەورەمان سەرسوڕمان دەنوێنێت لە پیاوێك کە لە پێناوی خوای گەورەدا غەزای کردبێت، هاوەڵەکانی هەڵبێن و بشکێن، ئەمیش بزانێت چی پێویستە لەسەری، وە بگەڕێتەوە هەتا خوێنی دەڕژێت ،جا خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرمـوویت:سەیری ئەو بەندەیەی من بکەن، بە هیوای پاداشتی من گەڕایەوە، وە لە ترسی سزای من، هەتا خوێنی ڕژا ).

(٦٥٥) ( حم ت هـ ) عن المقدام بن معدي كرب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللهِ سَبْعُ خِصَالٍ: يَغْفِرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ مِنْ دَمِهِ وَ يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَ يُحَلَّى حُلَّةَ الإِيمَانِ وَ يُزَوَّجُ اثْـنَيْنِ وَ سَبْعِينَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ الْعِيْنِ وَ يُجارُ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ وَ يَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الأَكْبَرِ وَ يُوضَعُ عَلىَ رَأْسِهِ تَـاجُ الْوِقَارِ اليَاقُوتَةُ مِنْهُ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَ مَافِيهَا وَ يَشْفَعُ فِي سَبْعِينَ إِنْسَاناً مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ** ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١٦٤ ) في صحيح الجامع

مقدادی کوڕی معدي كرب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( شەهید لای خوا حەوت تایبەت مەندی هەیە: لەگەڵ یەکەم فیچقە لە خوێنەکەی لێی دەبورێت، وە شوێنی خۆی لە بەهەشتدا پیشان دەدرێت، وە بەرگ وپۆشاکی باوەڕیشی بە کاڵادا دەکرێت، وە حەفتاودوو خێزانی لە (حور العین) لێ مارە دەکرێت، وە لە ئەشکەنجەی گۆڕیش دەپارێزرێت، وە لە ترس و تۆقێنە گەورەکەی ڕۆژی قیامەتیش دڵنیا و ئەمین دەبێت ،وە تاجی ڕێز و هەیبەتیشی دەخرێتە سەر سەری، کە هەر یاقوتێکی ئەو تاجە لە دونیا و هەرچییەکی تێدایە باشتر و بەنرخترە، وە شەفاعەتیش بۆ حەفتا کەس لە خانەوادە و کەسوکاری خۆی دەکات ).

(٦٥٦) ( حم ن ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَاعَلىَ الأَرْضِ مِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ وَ لَهَا عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ تُحِبُّ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْكُمْ وَ لا تُضَافِرَ الدُّنْيَا إِلاَّ الْقَتِيلَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَإِنَّهُ**

**يُحِبُ أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ مَرَةً أُخْرَى لِمَا يَرىَ مِنْ ثَـوَابِ اللهِ لَهُ ﴾**. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٣٧ ) في صحيح الجامع

عبادة كوڕی الصامت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــووی: ( لەسەر زەویدا هیچ نەفسێك نییە بمرێت و لە لای خوا پاداشتی باشی بۆ دانرابێت، حەز بكات كە بگەڕێتەوە بۆ لاتان وە نە جارێكی تریش خۆی لە دونیاوە بئاڵێنێت، تەنها ئەو كەسە نەبێت كە لە پێناوی خوادا كوژراوە، تەنها ئەو حەز دەكات بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی جارێكی تر بكوژرێت لەبەر ئەو هەموو پاداشتەی كە دەبینێت خوای گەورە پێ ی داوە ).

(٦٥٧) ( حم ن ) عن محمد بن أبي عميرة أن رسول الله(ﷺ) قال: **﴿ مَامِنَ النَّاسِ مِنْ نَفْسٍ مُسْلِمَةٍ يَقْبِضُهَا رَبُّهَا تُحِبُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْكُمْ وَ أَنَّ لَهَا الدُّنْيَا وَ مَا فِيْهَا غَيْرُ الشَّهِيدِ ﴾**. قال إبن أبي عميرة قال رسول الله(ﷺ): **﴿ وَ لأَنْ أُقْتَلَ فِي سَبِيلِ اللهِ أَحَبُ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي أَهْلُ الْوَبَرِ وَ الْمَدَرِ ﴾**. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٨٣ ) في صحيح الجامع

ابن ابی عمیره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( لەناو ئەوخەڵكەدا هیچ نەفسێكی موسڵمانی تێدا نییە كە پەروەردگاری بیباتەوە بۆ لای خۆی و وە ئەو حەز بكات بگەڕێتەوە بۆ لاتان. ئەگەر دونیا و هەرچییەكیشی تێدایە بیدەنێ، تەنها شەهید نەبێ ). ئنجا ابن ابی عمیرة وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــووی: ئەگەر لە پێناو خوادا بكوژرێم لام خۆشەویستر و شیرین ترە لەوەی كە هەموو ئەهلی دەشتەكی و شارستێن موڵكی من بن ).

وبر: واتە چادرو خێوەنگایەك كەلە مووی ئاژەڵ دروست دەكرێن وە ئەهلی (وبر) واتە ئەهلی دەشتەكی.

مدر: واتە بەرد مەبەستیشی ئەو خانوانەیە كەلە بەرد دروست دەكرێن وە ئەهلی (مدر) واتە خەڵكی شارنشین.

( ٦٥٨ ) ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): **﴿ مَامِنْ مَجْرُوحٍ يُجْرَحُ فِي سَبِيلِ اللهِ- وَ اللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجْرحُ فِي سَبِيلِهِ- إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَ جُرحُهُ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ جُرِحَ ،اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ وَ الرِّيحِ رِيحُ مِسْكٍ ﴾**. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١/٥٧٥٢ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر بریندارێك لە پێناوی خوادا بریندار ببێت- وەخوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت كێن ئەوانەی كە لەپێناوی ئەودا بریندار دەبن- ئەوا لە رۆژی قیامەتدا دێت، وە برینەكەی وەكو ئەو رۆژە وایە كە تیایدا بریندار بووە، رەنگەكەی رەنگی خوێنەو وە بۆنەكەیشی بۆنی میسكە ).

( ٦٥٩ ) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): **﴿ إِنْتَدَبَ اللهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيْلِهِ لا يُخْرِجُهُ إِلاَّ إِيْمَانٌ بِي وَ تَصْدِيْقٌ بِرُسُلِي أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَ**

**لوْلا أنْ أَشُقَّ عَلىَ أُمَّتي مَاقَعَدْتُ خَلفَ سَرِيَّةٍ وَ لَوَدِدْتُ أَني أُقْـتَلُ في سَبيلِ الله ثُـمَّ أَحْيَا ثُـمَّ أُقْتَلُ ثُـمَّ أحْيا ثُـمَّ أُقْتَلُ ثُـمَّ أَحْيَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٩١ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە وای داناوە کە: هەر کەسێك لە پێناوی ئەودا لە ماڵ دەرچێت ،وە هیچ شتێك نەیبردێتە دەرەوە جگە لە باوەڕ بەمن و بە راست زانینی پێغەمبەرەکانم، کە یان بیگەڕێنمەوە بەو پاداشت و غەنیمەتەوەی کە دەستی کەوتووە، وە یان بیخەمە بەهەشتەوە، وەلەبەر ئەوە نەبوایە کە لەسەر ئوممەتەکەم ببێت بە ئەرك و هیلاکی، هیچ کاتێك لە پشت سریەیەکەوە کە بۆ غەزا دەرچو بێت دانەدەنیشتم، وەپڕ بەدڵ حەزم دەکرد کە بکوژرێم لە پێناو خوادا و پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە ).

**( ٦٦٠ ) ( خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ مَكْلُومٍ يُكْلَمُ في الله إلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَكَلْمُهُ يَدْمَى اللَّوْنُ لَونُ الدَّمِ وَ الرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٨٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هەر برینداریك لە پێناو خوادا بریندار بێت، ئەوا رۆژی قیامەت دێت و برینەکەی خوێنی لێ دەتکێت ، رەنگەگەی رەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە )

**( ٦٦١ ) ( حم ق ت ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ لَهَا عِنْدَ الله خَيْر يَسُرُّهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلىَ الدُّنْيَا وَ أَنَّ لَهَا الدُّنْيَا وَ مَافِيهَا إلاَّ الشَّهِيدُ فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ إِلىَ الدُّنْيَا فَيُقْـتَلَ مَرَّةً أُخْرىَ لِمَا يَرىَ مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٩٠ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هیچ نەفسێك نییە بمرێت و لە لای خوا پاداشتی باشی بۆ دانرابێت و حەز بکات کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ دنیا،ئەگەرچی دونیا و هەرچییەکیشی تێدایە بیدەنێ، تەنها شەهید نەبێت، هەر ئەو حەز دەکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەتا جارێکی تر بکوژرێت، لەبەر ئەو هەموو فەزڵ و پاداشتەی کە دەیبینێت لەسەر شەهید بوونەکەی پێی بەخشراوە ).

**(٦٦٢) ( ت هـ ) عن جابر بن عبد الله يقول: لقيني رسول الله(ﷺ) فقال لي: ﴿ يَا جَابِرُ مَالِيَ أَرَاكَ مُنْكَسِراً ﴾. قلت يارسول الله(ﷺ) استشهد أبي قتل يوم أحد وترك عيالا ودَينا، قال: ﴿ أَفَلا أُبَشِّرُكَ بِمَا لَقِيَ الله بِه أَبَاكَ؟ ﴾. قال: بلي يارسول الله(ﷺ)، قال: ﴿ مَا كَلَّمَ الله أَحَداً قَطّ إلاَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابِه وَ أَحْيَى أَبَاكَ فَكَلَّمَهُ كِفَاحاً، فَقَالَ: يَا عَبْدِي تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِيكَ، قَالَ: يَا رَبِّ تُحْيِينِي فَأُقْـتَلُ فِيكَ ثَـانِيَةً، فَقَالَ الرَّبُ تَبَارَكَ وَ تَعَالَى: إِنَّهُ قَدْسَبَقَ مِنَي ﴿ أَنَّهُمْ لا يَرْجِعُون ﴾، قَالَ: وأنزلت هذه الآية: ﴿ ولا تَحْسَبَنَّ الذينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ الله أَمواتَـاً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٧٨٩٣ ) في صحيح الجامع**

جابری کوڕی عبدالله دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێم گەیشت پێی فەرمووم: ( ئەی جابر ئەوە بۆ بە مات و مەلول و دڵشکاوی دەتبینم ؟) ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا: باوکمشەهید بوو لە رۆژی ئوحدا

کوژرا ، وه منداڵ و قەرزێکی لەدوای خۆی بەجێهێشتوه ، ووتی: ئەویش فەرمووی: ( ئەی حەز ناکەیت پێت بڵێم کە چۆن خوای گەورە پێشوازی لە باوکت کردووە ؟ ) وتی: بەرەوەڵا ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ( خوای گەورە هەرگیز قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردووە تەنها لەپشت پەردەوە نەبێت، بەڵام باوکتی زیندوو کردەوە روو بە روو قسەی لەگەڵدا کرد، پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم: تەمەنای چیم لێ دەکەیت با بتدەمێ؟ ئەویش فەرمـووی: ئەی پەروەردگارا: زیندووم بکەیتەوە هەتا جارێکی تریش لە پێناوتا بکوژرێم، پەروەردگاری گەورەش فەرمـووی تازە پێشتر بڕیارم داوە کە کەس ناگەڕێتەوە ﴿أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ )، وتی: ئنجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًا﴾ ).

( ٦٦٣ ) ( **حم م ت ن** ) ( **ن** ) **عن أبي قتادة** ( **ن** ) **عن أبي هريرة قال: جاء رجلٌ إلى النبي(ﷺ) وهُو يخطُبُ على المنْبر فقال: أرأيْت إنْ قاتلْتُ في سبيل الله صابراً مُحتسباً مُقْبلاً غيْر مُدْبرٍ أيُكفّرُ اللهُ عنّي سيّئاتي؟ قال: ﴿ نعمْ ﴾ ، ثمّ سكت ساعةً قال: ﴿ أيْن السّائلُ آنفاً؟ ﴾ ، فقال الرّجُلُ ها أنا ذا قال: ﴿ ما قُلْت؟ ﴾ ، قال: ﴿ أرأيْت إنْ قُتلْتُ في سبيل الله صابراً مُحْتسباً مُقْبلاً غيْر مُدْبرٍ أيُكفّرُ اللهُ عنّي سيّئاتي؟ ﴾، قال: ﴿ نعمْ، إلاّ الدّيْن سارّني به جبْريلُ آنفاً ﴾** . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٢٥ ) في صحيح الجامع

لە ابو قتادە وە لە ابوهریرة وە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا کە ئەو لەسەر مینبەر ووتاری دەدا. وتی: باشە ئەگەر من شەڕ بکەم لە پێناو خوادا بە ئارامگری و تەنها نیەتی پاداشتی خوا، بەرەو پێش بچم و هەڵنەیەم، ئایا گوناهو تاوانەکانم لەسەر دەسڕدرێتەوە ؟ فەرمـووی: ( بەڵێ ) پاشان ساتێك بێ دەنگ بوو فەرمـووی: ( کوا ئەوەی کە ئێستا پرسیاری کرد ؟ ) پیاوەکەش وتی: فەرموو من ئەوەتام، فەرمووی: ( پرسیارەکەت چۆن بوو ؟) وتی: ئەگەر من لە پێناوی خوادا بکوژرێم بە ئارام گری و تەنها لەبەر خوا، بەرەو پێش بچم و هەڵنەیەم، ئایا خوای گەورە تاوانەکانم لەسەر دەسڕێتەوە ؟ فەرمووی: ( بەڵێ تەنها قەرز نەبێت، ئێستا جبریل ئاگاداری کردم لێی )

## روون کردنەوەی فەرموودەکان:

ئەو هەموو فەرموودە پیرۆزانەی کە باسی فەزڵی جهاد بەگشتی و شەهید بوون بەتایبەتی دەکەن ئەو راستیەمان بۆ روون دەکەنەوە کە ئەم عیبادەتە هەتا چ رادەیەك لەئیسلامدا گرنگی پێ دراوە، وەخوای گەورەو کار بەجێش هەتا چ رادەیەك بە هەند و بە بەرز دەیگرێت چونکە ئەم عیبادەتە تەنها ئەو کەسانە دەتوانن ئەنجامی بدەن کە تەواو بۆ پەروەردگاری خۆیان یەك لابوونەوەتەوە و هیچ کام لە خۆشی و نیعمەتەکانی دونیا نەیانتوانیوە رێگر بن لە نێوان دڵی ئەو و پەروەردگارەکەیدا بۆیە ئامادەیە سەروماڵی لە پێناوی دا ببەخشێت وە زاناکان دەفەرموون کە ووشەی ( شەهید ) لەوەوە هاتووە کە فریشتەکان شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە ئەو کوژراوە لە پێناوی خوادا باوەڕدارەو ئەهلی بەهەشت و رەزامەندی خوایە. وە ئیمامی عەلیش رضي الله عنه دەفەرموێت: ( رێگاکانی بەهەشت زۆرن بەڵام کورترینی ئەو

ڕێگایانه که زوو بتگەیەنێت، وە زامنترینشیان کەلێ دڵنیا بیت که به خێرایی و سەلامەتی دەتگەیەنێته بەهەشت تەنها شەهیدیە ) .

وەهەر ئیمام عەلیش ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت: ( که ڕۆح زۆر شیرین و بەنرخە، وەهەتا ئەو ڕۆژەی که کاتی مردنت دێت ئەو ڕۆحە موڵکی خۆتە، تۆش دەتوانیت بیفرۆشیت وە بەهەشتی پێ بکریت، بەڵام ئەگەر هەر دڵت نەهات بیبەخشیت له پێناوی خوادا ئەوا فریشتەکان لەسەرە مەرگدا بە خۆڕایی لێت دەستێنن و هیچیشت له بەرامبەریدا نادەنێ ) .

وە ئیمامی غەزالیش ڕەحمەتی خوای لێبێت له کتێبی ( إحياء علوم الدين ) دا لەبەشی ( الامر بالمعروف والنهى عن المنكر ) دا دەڵێ: ( هەموو موسڵمانێك کاتێك که دەمرێت هەرچەندە باوەڕدار و چاکەکاریش بووبێت بەڵام هێشتا هەر ترسی ئەوەی لەسەرە که لەسەرە مەرگدا توشی فیتنە ببێت و شەیتان زەفەری پێ ببات و خەتەرەیەکی خراپ بە دڵیدا بێت و دڵی بە لایەکدا بگۆڕێت و خواپەنامان بدات لەسەر ئەو حاڵە خراپە بمرێت، وە هیچ کەس لەم فیتنە خەتەر و ترسناکە پارێزراو نابێت تەنها شەهید نەبێت، که فریشتەکان شایەتی باوەڕداریی و ڕەزامەندی خوای بۆ دەدەن، وە نهێنی ئەم تایبەت مەندێتییەش بۆ شەهید لەوەدایە، که پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( من كان آخرُ كلامه –لا إله إلا الله– دخل الجنة) واته هەر کەسێك کۆتا وشەی ژیانی (لا اله لا الله) بێت دەچێتە بەهەشتەوە، جا ئەگەر کەسێك کۆتا وشەی (لا اله الا الله) بێت بچێتە بەهەشتەوە، ئەوا شەهید کۆتا عەمەل و کۆتا کرداری (لا اله الا الله) بووە، چونکه ئەو خوێنی خۆی بۆ (لا اله الا الله) ڕشتووە و خۆی کردووە بە قوربانی (لا اله الا الله) بۆیە ئەو گیان بەخت کردن و خوێن ڕژانەی له پێناو بەرز ڕاگرتنی ووشەی خوادا شایەتییەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر باوەڕداریی ئەو بەندەیەی خوا، وە فریشتەو ڕۆحە پاکەکانیش ئەو شایەتییەی بۆ دەدەن و بەمەش ناوی شەهید و پلەی بەرزی شەهادەت بە کاڵایدا دەبڕێت ).

## ( ٣ ) ( خوای گەورە دروست کراوەکانی خۆی تەسخیر دەکات بۆ سەرخستنی ئایینەکەی خۆی )

**( ٦٦٤ ) ( طب ) عن عمرو بن النعمان بن مقرن قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى لَيُؤَيِّدُ الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨١٣ ) في صحيح الجامع**

عمروی کوڕی نعمان ی کوڕی مقرن دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە بە پیاوی فاجر و خراپەکاریش ئاینەکەی پاڵپشت دەکات و سەری دەخات ).

### روون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە که هەندێ جاری وا هەیە خوای گەورە کەسێکی فاجرو خراپەکار دەکاتە هۆکارێك و تەخسیری دەکات بۆ سەرخستنی ئەم ئایینی ئیسلامە، هەرچەندە کابرای خراپەکار مەبەستی خزمەت کردنی ئیسلامیشی نەبووبێت .

## ( ٤ ) ( هۆكارەكانی سەركەوتن )

( ٦٦٥ ) ( ن ) عَنْ مُصْعَبِ بنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ ظَنَّ أَنَّ لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ(ﷺ) فَقَالَ النَّبِيُّ(ﷺ): ﴿ إِنَّمَا يَنْصُرُ اللهُ هَذِهِ الأُمَّةَ بِضَعِيفِهَا بِدَعْوَتِهِمْ وَ صَلاتِهِمْ وَ إِخْلاصِهِمْ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٣٨١ ) في صحيح الجامع

مصعب ی كوڕی سعد لە باوكیەوە دەڵێ: پێی وابووە فەزڵ و پایەیەكی بەرزتری هەبووبێت لە هاوەڵەكانی تری پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرمووە: ( بەڕاستی خوای گەورە ئەم ئوممەتە بەهۆی لاواز و كەم دەسەڵاتەكانیەوە سەر دەخات، بە دوعای ئەوان و بە نوێژی ئەوان و بە دڵسۆزی ئەوان ) .

## ( ٥ ) ( هێز لە شەردا بریتییە لە ڕەمی كردن )

( ٦٦٦ ) ( حم م ت ) عن عقبة بن عامر، أَنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ عَلَى الْمِنْبَرِ: ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ ﴾، قَالَ: ﴿أَلا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيِ، أَلا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيِ، أَلا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيِ، أَلا إِنَّ اللهَ سَيَفْتَحُ لَكُمُ الأَرْضَ وَ سَتُكْفَوْنَ الْمُؤْنَةَ، فَلا يَعْجِزَنَّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٦٣١ ) في صحيح الجامع

عقبەی كوڕی عامر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ﴾، واتە: هەرچی هێزێك لە تواناتاندایە بۆ كافرانی ئامادە بكەن، فەرمووی: ( بەڕاستی ئەو هێزە ڕەمی كردنە ، بەڕاستی ئەو هێزە ڕەمی كردنە ، بەڕاستی ئەو هێزە ڕەمی كردنە ، ئیتر خوای گەورە زەویتان بۆ ئازاد دەكات و ئەركتان لەسەر نامێنێت جا ئەوە واتان لێ نەكات كە دەستەو سان بن و یاری بە تیرەكانتان نەكەن ).

### ڕوون كردنەوەی فەرموودەكە :

پێغەمبەر(ﷺ) لەم فەرمـوویەدەدا ڕاستیەكی گرنگ و زانیارییەكی بەسود لە بواری سەربازیدابە ئوممەتەكەی ڕادەگەیەنێت ئەویش ئەوەیە كە چەكی كارامە و گورجك بڕ لەكاتی جەنگ و ڕوبەڕوبونەوەدا بریتییە لەو چەك و ئامێرەی كە ڕەمی پێ دەكرێت، جا ئەگەر جاران تیر هاویشتن و مەنجەنیق هاویشتن بووبێت ئەوا ئێستا لای هەمووان ئاشكرایە كە چەكی هەموو سوپاكانی جیهان بریتییە لەو چەكانەی كە ڕەمی یان پێ دەكرێت هەر لە دەمانچەوە تا گەورەترین ڕاجیمە و موشەك، واتە پێغەمبەر(ﷺ) پێش وەخت جەنگاوەرانی ئوممەتەكەی ئاگادار دەكاتەوە كە پاشە ڕۆژ لە بواری چەكسازیدا تەنها بۆ ئەو چەكانەیە كە ڕەمی یان پێ دەكرێت بۆیە پێویستە گرنگی پێ بدەن، تەنانەت لە برگەی كۆتایی

فەرموودەکەدا دەفەرموێت: کە ڕۆژێك دێت خوای گەورە دەسەڵاتان بەسەر زەویدا بڵاودەکاتەوە، جا بێداریان دەکاتەوە کە ئەو دەسەڵاتە سارد و خاوییان نەکاتەوە لە گرنگیدان بە تیرەندازی و ڕەمی کردن و پێشخستنی ئەو بوارە، چونکە ساردی و سستی لەو بوارەدا ئاکامەکەی دواکەوتنی موسڵمانان و پێشکەوتنی ناحەزەکانیان دەبێت لە بواری ئامێر و کەرەسەی هونەری جەنگیدا، کە ئەمەش بە زەرەر و شکستی موسڵمانان کۆتایی دێت، هەروەك لە واقیعی ئەمڕۆی خۆماندا دەیبینین.

## ( ٦ ) ( فەزڵی ڕەمی کردن لە پێناوی خوادا )

**( ٦٦٧ ) ( طب ) عن عمرو بن عبسة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّمَا مُسْلِمٍ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَبَلَغَ مُخْطِئاً أَوْ مُصِيباً فَلَهُ مِنَ الأَجْرِ كَرَقَبَةٍ أَعْتَقَهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ وَ أَيُّمَا رَجُلٌ شَابَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ لَهُ نُورٌ وَ أَيُّمَا رَجُلٌ أَعْتَقَ رَجُلاً مُسْلِماً فَكُلُّ عضو من المعتَقِ بِعَضْوٍ مِنَ المعتِقِ فداءً لَهُ مِنَ النَّارِ وَ أَيُّمَا رَجُلٌ قَامَ وَ هُوَ يُرِيدُ الصَّلَاةَ فَأَفْضَى الْوُضُوءَ إِلَى أَمَاكِنِهِ سَلِمَ مِنْ كُلِّ ذَنْبٍ وَ خَطِيئَةٍ هِيَ لَهُ فَإِنْ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ رَفَعَهُ اللهُ تَعَالَى بِهَا دَرَجَةً وَ إِنْ رَقَدَ رَقَدَ سَالِماً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٣٨ ) في صحيح الجامع**

عمروی کوڕی عبسة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر موسڵمانێك تیرێك لەپێناوی خوادا بهاوێژێت جا بگات و نەپێکێت یا بگات و بپێکێت، ئەوا هێندەی پاداشت بۆ دەنوسرێت کە وەك ئەوە وابێت گەردنێکی لە نەوەی اسماعیل ئازاد کردبێت، وەهەر پیاوێك لە ڕێی خوادا سەری سپی بووبێت، ئەوا بۆی دەبێت بە نور و ڕووناکی، وە هەرپیاوێك پیاوێکی موسڵمان ئازاد بکات، ئەوا هەر ئەندامێکی ئازاد کراوەکە لە بەرامبەر هەمان ئەندامی ئازاد کەرەکەدا بۆی دەکرێت بە قوربانی لە ئاگر، وە هەر پیاوێك هەستێت و مەبەستی نوێژ کردن بێت، وە ئاوی دەست نوێژەکە بگەیەنێتە شوێنەکانی خۆی، ئەوا لە هەموو گوناهو تاوانێك کە پێی کردبن پاك دەبێتەوە، جا ئەگەر هەستا بۆ نوێژەکەی، ئەوا خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە پێی، وە ئەگەر ڕاکشێت و پاڵ بکەوێت، ئەوا بە پاك و سەلامەتی لە تاوان پاڵدەداتەوە و ڕادەکشێت ).

**( ٦٦٨ ) ( حم م ) عن عقبة بن عامر قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرَضُونَ وَ يَكْفِيكُمُ اللهُ فَلَا يَعْجِزُ أَحَدَكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٦٠٣ ) في صحيح الجامع**

عقبەی کوڕی عامر دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( خوای گەورە چەندین شوێنی زەویتان لەسەر دەستدا ئازاد دەکات، وە خوای گەورە سەرکەوتوو و پارێزراوتان دەکات لە دوژمنان، جا با کەستان دەستەوسان نەبێت لەوەی کە یاری بە تیرەکانی بکات ).

## ( ٨ ) ( چۆنێتی سوار بوونی وڵاخ لەکاتی ڕۆشتن بەرەو غەزا )

( ٦٦٩ ) ( ك ) عن أبي هريرة: ﴿ عَلىَ ذِرْوَةِ كُلِّ بَعيرٍ شَيْطانٌ فَامْتَهِنُوهُنَّ بِالْرُكُوبِ فَإِنَّمَا يُحْمِلُ اللهُ تَعالىَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٠١٣ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( لەسەر سەری لوتی هەموو وشترێك ( وولاخێك ) شەیتانێکی پێوەیە، جا ئێوە بەسوار بوونیان سوك و لوت شکاویان بکەن، چونکە ئەوەی ئێمەی بەو وولاخانە هەڵگرتووە و خستوینیەتیە سەریان هەر خوای گەورەیە ).

( ٦٧٠ ) ( م د ) عن جابر بن عبدالله: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ هَذَا اللاَّعِنُ بَعِيْرَهُ؟ ﴾، قال: أنا يا رسول الله(ﷺ)، قال:﴿انْزِلْ عَنْهُ فَلا تَصْحَبْنَا بِمَلْعُونٍ، لاتَدْعُوا عَلىَ أَنْفُسِكُمْ، وَ لاتَدْعُوا عَلىَ أَوْلادِكُمْ وَلا تَدْعُوا عَلىَ أَمْوالِكُمْ، لا تُوافِقُوا مِنَ الله سَاعَةً يُسْأَلُ فِيْهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبُ لَكُمْ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٧٧ ) في صحيح الجامع

جابری کوڕی عبد الله دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەوە کێ بوو لەعنەتی لە وشترەکەی کرد ؟ وتی- پیاوێك لە ئەنسارەکان- : من بووم ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: دابەزە لەسەری، وامەکە نەفرەت لێکراوێك هاوڕێمان بێت، دوعا لەخۆتان مەکەن، وە دوعا لەمنداڵەکانتان مەکەن، وە دوعا لەماڵ و سامانتان مەکەن، نەبادا هاوکاتی ساتەوەختێ بکات کە هەر دوعایەکی تێدا بکرێت لێتانی قبوڵ بکات

( ٦٧١ ) ( حم ك ) عن أبي الأوس الخزاعي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ بَعِيْرٍ إِلاَّ فِي ذِرْوَتِه شَيْطَانٌ فَإِذَا رَكِبْتُمُوهَا فَاذْكُرُوا نِعْمَةَ الله تَعالىَ عَلَيْكُمْ كَما أَمَرَكُمُ الله ثُمَّ امْتَهِنُوهَا لأَنْفُسِكُمْ فَإِنَّمَا يُحْمِلُ الله تَعالىَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٩٢ ) في صحيح الجامع

ابو الاوس الخزاعي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ وشترێك نییە ئیلا لەسەر لوتی شەیتانێکی پێوەیە، جا ئەگەر سواری بوون ئەوا نیعمەتی بە سەردا داڕژاوی خوای گەورەتان وەبیر بێتەوە، هەروەك خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون، پاشان ملکەچ و زەلیلیان بکەن بۆ خۆتان، چونکە هەر خوای گەورە ئێمەی خستۆتە سەریان و هەڵمان دەگرێت پێ یان ).

## ( ٩ ) ( فەزڵی چاودێری کردن و گرینگیدان بە ئەسپ )

(٦٧٢) ( حم هب ) عن تميم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ آمْرِئٍ مُسْلِمٍ يَنْقِي لِفَرَسِهِ شَعِيراً ثُمَّ يُعَلِقَهُ عَلَيْهِ إِلاَّ كَتَبَ الله لَهُ بِكُلِ حَبَةٍ حَسَنَةً ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٥٦٨٧ ) في صحيح الجامع

تمیم دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ کەسێکی موسڵمان نییە کە دانی جۆ بۆ ئەسپەکەی بژار بکات و بە ملیدا هەڵیبواسێت، ئیلا خوای گەورە بە هەموو دەنکێکی ئەو جۆیە چاکەیەکی بۆ دەنووسێت ).

## ( ١٠ ) ( نمونەی کەسی موجاهید )

**( ٦٧٣ ) ( ن ) عن أبي هريرة قال: سمعت رسول الله( ﷺ ) يقول: ﴿ مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ وَ اللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيْلِهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْخَاشِعِ الرَّاكِعِ السَّاجِدِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨٤٣ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ( نمونەی کەسێکی موجاهید لە پێناوی خوادا- وە خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت کێ لە پێناویدا جیهاد دەکات- هەروەك نمونەی ڕۆژوەوانی نوێژخوێنی لە خوا ترسی کرنوش بەری سوجدەبەر وایە ).

**( ٦٧٤ ) ( ق ت ن ) عن أبي هريرة قال: سمعت رسول الله( ﷺ ) يقول: ﴿ مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ وَ اللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ، وَ تَوَكَّلَ اللهُ تَعَالَى لِلْمُجَاهِدِ فِي سَبِيْلِهِ بِأَنْ يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرْجِعَهُ سَالِماً بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيْمَةٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨٥٠ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( نمونەی کەسێکی موجاهید لە پێناوی خودا- وە خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت کێ لەپێناویدا جیهاد دەکات- هەروەك نمونەی ڕۆژوەوانی نوێژ خوێند وایە، وە خوای گەورە بۆ موجاهیدێك لەپێناوی ئەودا، ئەوە دەستەبەر و دابین دەکات کە ئەگەر گیانی بکێشێت بیخاتە بەهەشتەوە، یان بەسەلامەتی بیگەڕێنێتەوە بەو پاداشت و غەنیمەتەی کە بەدەستی هێناوە ).

**( ٦٧٥ ) ( د ن حب ك ) عن أبي نجيح السلمي قال: سمعت رسول الله( ﷺ ) يقول: ﴿ مَنْ بَلَغَ بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ لَهُ دَرَجَةٌ فِي الْجَنَّةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١١٢ ) في صحيح الجامع**

ابی نُجیح السلمي دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( هەرکەسێك بە هاویشتنی تیرێك لە پێناوی خوادا بەشداری بکات، ئەوە بۆی دەبێت بە پلەیەك لە بەهەشتدا ).

## ( ١١ ) ( فەزڵی ئەو کەسەی داوای شەهید بوون لە خوای گەورە دەکات )

**( ٦٧٦ ) ( م ٤ ) عن سهل بن حنيف رضي الله عنه، أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَ إِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٧٤ ) في صحيح الجامع**

سهل ی کوڕی حنیف ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك بە ڕاستی داوای شەهید بوون لە خوای گەورە بکات، ئەوا خوای گەورە دەیگەیەنێتە مەنزڵگەی شەهیدەکان، ئەگەر لەسەر جێ خەوەکەی خۆشی بمرێت ).

( ٦٧٧ ) ( ت ) عن معاذ ( ك ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ سَأَلَ اللهَ القَتْلَ فِي سَبِيلِ اللهِ صَادِقاً مِنْ قَلْبِهِ أَعْطَاهُ اللهُ أَجْرَ شَهِيدٍ وَ إِنْ مَاتَ عَلَىَ فِرَاشِهِ ﴾. (صحيح) انظر حيث رقم ( ٦٢٧٦ ) في صحيح الجامع

لە معاذ لە انس ـە وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێ بەڕاستیی لە دڵیەوە داوا لە خوا بکات کە لە پێناوی خوادا بکوژرێت، ئەوا خوای گەورە پاداشتی شەهیدێکی پێ دەدات، ئەگەر لەسەر جێ خەوەکەی خۆشی بمرێت ).

## ( ١٢ ) ( فەزڵی ڕۆژو گرتن لە کاتی جیهادا )

( ٦٧٨ ) ( حم ت ن هـ ) عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللهِ، بَاعَدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ بِذَلِكَ الْيَوْمِ سَبْعِينَ خَرِيفاً ﴾. (صحيح) انظر حيث رقم ( ٦٣٣١ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد الخدری دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( هەر کەسێك ڕۆژێك لە پێناوی خوادا بە ڕۆژو بێت، ئەوا خوای گەورە حەفتا ساڵ دەم و چاوی لە ئاگر دوور دەکاتەوە ).

## ( ١٣ ) ( کوشتنی سەرانی کوفر )

( ٦٧٩ ) ( خ ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الأَشْرَفِ؟ فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللهَ وَ رَسُولَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٥٢٦ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( کێ خۆی دادەنێت بۆ کەعبی کوڕی اشرف ؟ بەڕاستی بۆتە مایەی ئازار بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی ).

## ( ١٤ ) ( سەربازانی خوا )

( ٦٨٠ ) ( طب هب ) عن أبي زهير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لاتَقْتُلُوا الْجَرَادَ فَإِنَّهُ مِنْ جُنْدِ اللهِ الأَعْظَمِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٧٣٧٧ ) في صحيح الجامع

**ابو زهیر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( کوللە مەکوژن چونکە ئەوە لەسەربازە هەرە گەورەکانی خوان ).**

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە:

**کوللە یەکێکە لەو گیانلەبەرانەی کە شەرعی ئیسلام خواردنی حەڵاڵ کردووە، و تەنها ماسی و کوللە بە مردوویی خواردنیان حەڵاڵە، جا مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە بە خۆڕایی و گاڵتە و گەپ مەیانکوژن، دەنا ئەگەر بوونە مایەی زەرەر و زیان بۆ زەراعەت و دەغڵ ودان، ئەوا دەتوانرێت بە کوشتن و لەناو بردن بێت یان هەر ڕێگایەکی تر دەفعی زەرەر و زیانیان بکرێت.**

# ( بەشی: قەزاوەت )

## ( ١ ) ( دوعا و نزای ستەم لێکراو )

( ٦٨١ ) ( طب الضياء ) عن خزيمة بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **اتَّقُوا دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهَا تُحْمَلُ عَلَى الْغَمَامِ، يَقُولُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: وَ عِزَّتِي وَ جَلَالِي لَأَنْصُرَنَّكَ وَ لَوْ بَعْدَ حِينٍ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١٧ ) في صحيح الجامع

خزیمەی کوڕی ثابت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (خۆتان بپارێزن لە دوعای ستەم لێکراو، چونکە ئەوە لەسەر هەور هەڵدەگیرێت: خوای گەورە دەفەرموێت: بە عیزەت و جەلالی خۆم هەر دەبێت سەرت بخەم ئەگەر پاش ماوەیەکی تریش بێت ).

## ( ٢ ) ( قـازیی داد پەروەر )

( ٦٨٢ ) ( ت ) عن عبدالله بن أبي أوفى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللهَ مَعَ الْقَاضِي مَالَمْ يَجُرْ فَإِذَا جَارَ تَخَلَّى عَنْهُ وَ لَزِمَهُ الشَّيْطَانُ** ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٢٥٣ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی ابی اوفی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە لەگەڵ قازیدایە هەتا ستەم نەکات، جا ئەگەر ستەمی کرد ئەوا وازی لێ دەهێنێت و ئینجا شەیتان دەیگرێت و پەیوەستی دەبێت ).

( ٦٨٣ ) ( ه حب ) عن عبد الله بن أبي أوفى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللهَ مَعَ الْقَاضِي مَالَمْ يَجُرْ عَمْداً فَإِذَا جَارَ وَكَلَهُ إِلَى نَفْسِهِ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٢٦ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی ابی اوفی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە لەگەڵ قازیدایە هەتا ستەم نەکات بە دەستی ئەنقەست، جا ئەگەر ستەمی کرد ئەوا دەیداتە دەستی نەفسی خۆی )

( ٦٨٤ ) ( ك هق ) عن عبدالله بن أبي أوفى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللهَ تَعَالَى مَعَ الْقَاضِي مَالَمْ يَجُرْ فَإِذَا جَارَ تَبَرَأَ مِنْهُ وَ أَلْزَمَهُ الشَّيْطَانُ** ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٢٧ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی ابی اوفی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە لەگەڵ قازیدایە هەتا ستەم نەکات، جا ئەگەر ستەمی کرد ئەوا دەست بەرداری دەبێت و، شەیتان دەکات بە پەیوەستی ).

( ٦٨٥ ) ( طب ) عن ابن مسعود ( حم ) عن معقل بن يسار قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى مَعَ الْقَاضِي مَالَمْ يَحِفْ عَمْداً ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٢٨ ) في صحيح الجامع

له ابن مسعود معقلی کوڕی یسار دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە لەگەڵ قازیدایە تا ئەو کاتەی کە بە ئەنقەست ستەم نەکات ).

( ٦٨٦ ) ( طب ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَىَ لا يُقَدِّسُ أُمَّةً لا يَعْطُونَ الضَّعِيفَ مِنْهُمْ حَقَّهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٥٨ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە میللەتێك بە پیرۆز راناگرێت کە مافی کەسی لاواز و بێ دەسەڵات لە ناویاندا نەدەن ).

( ٦٨٧ ) ( هق ) عن أبي سفيان بن الحارث قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ لايُقَدِّسُ أُمَّةً لا يَأْخُذُ الضَّعِيفَ حَقَّهُ مِنَ الْقَوِيِّ وَ هُوَ غَيْرُ مُتَعْتَعٍ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٥٧ ) في صحيح الجامع

أبو سفیانی کوڕی حارث دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە میللەتێك پاك و پیرۆز ناکات کە لاواز و بێ دەسەڵاتەکەیان بەبێ دەم تەتەڵە بوون مافی خۆی لە بەهێز و دەسەڵاتدارەکەیان نەستێنێت ).

(٦٨٨) ( حم م ن ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ الْمُقْسِطِيْنَ عِنْدَ اللهِ عَلَىَ مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ، عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّوَجَلَّ، وَ كِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ،الَّذِيْنَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَ أَهْلِيْهِمْ وَ مَا وَلُوا ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٥٣ ) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویـەتی: ( داد پەروەرەکان، لەلای خوای گەورە وان لەسەر مینبەرەکانی نور، لە لای راستی خوای رەحمانی خاوەن عیزەت و جەلالەوە. وە هەردوو دەستەکەی خوا هەر راستەیە، ئەو کەسانەی کە داد پەروەرن لە حوکمدانیان و لە نێو کەس و کاریان و لەوەشدا کە پێیان سپێردراوە ).

( ٦٨٩ ) ( د هق ) أبو هريرة: أن رجلا جاء فقال: ﴿ يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ) سَعِّرْ، فَقَالَ: بَلْ أَدْعُوا، ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ) سَعِّرْ، فَقَالَ: بَلِ اللهُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ وَإِنِّي لأَرْجُوا أَنْ أَلْقَى اللهَ وَلَيْسَ لأَحَدٍ عِنْدِي مَظْلَمَةٌ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٨٠٠ ) في صحيح الجامع

أبو هریرە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا نرخ دیاری بکە بۆ شتەکان، ئەویش فەرمـووی: ( بەڵکو من دوعا دەکەم ). پاشان پیاوێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نرخ دیاری بکە. ئەویش فەرمووی: بەڵکو خوای گەورە خۆی بەرز و نزمی دەکات. وە من ئومێدم وایە کە بچمەوە خزمەت خوای گەورە، وە هیچ کەسێك مافێکی خوراوی لام نەبێت ).

( ٦٩٠ ) ( هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَةٌ لايَرُدُّ اللهُ دُعَاءَهُمْ: الذَّاكِرَ اللهَ كَثِيْراً وَ الْمَظْلُومَ وَ الإِمَامَ الْمُقْسِطِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٥٩ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتـی: ( سێ جۆر کەسان خوای گەورە دوعا و نزایان ڕەت ناکاتەوە: ئەو کەسەی کەزۆر زیکری خوا دەکات، وە هەر کەسێکی زوڵم لێ کراو، وە پێشەوایەکی داد پەروەر ) .

## ( ٣ ) ( جۆرەکانی زوڵم و ستەم )

**( ٦٩١ ) ( الطيالسي البزار ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الظُّلْمُ ثَلاثَةٌ: فَظُلْمٌ لا يَغْفِرُهُ الله وَ ظُلْمٌ يَغْفِرُهُ وَ ظُلْمٌ لا يَتْرُكُهُ، فَأَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي لا يَغْفِرُهُ الله فَالشِّرْك، قَالَ الله: ﴿ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾، وَ أَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي يَغْفِرُهُ فَظُلْمُ الْعِبَادِ أَنْفُسَهُمْ فِيمَا بَيْنَهُمْ وَ بَيْنَ رَبِّهِمْ وَ أَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي لا يَتْرُكُهُ الله فَظُلْمُ الْعِبَادِ بَعْضَهُمْ بَعْضاً حَتَّى يُدَبِّر لِبَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٩٤٩ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتـی: ( زوڵم سێ جۆرە، زوڵمێکیان خوا لێی خۆش نابێت وە زوڵمێکیان لێی خۆش دەبێت، وە زوڵمێکیان وازی لێ ناهێنێت، جا ئەو زوڵمەی کە لێی خۆش نابێت بریتییە لە شەریك بڕیاردان بۆ خوا (إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ) واتە شەریك بڕیاردان بۆ خوا زوڵمێکی گەورەیە، وە ئەو زوڵمەش کە خوای گەورە لێی دەبورێت بریتییە لەو زوڵمەی کە بەندەکان لە خۆیانی دەکەن لە نێوان خۆیان و پەروەردگاری خۆیاندا، وە ئەو زوڵمەش کە خوا وازی لێ ناهێنێت بریتییە لە زوڵمی بەندەکان هەندێکیان لە هەندێکی تریان هەتا لە یەکتریان بۆ دەستێنێتەوە ).

## ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە هەرکەس بمرێت ئەوا ئەو زوڵم و تاوانانەی کە تۆبەی لێ نەکردوون دەکرێن بەسێ جۆرەوە، جا هەرکەسێك شەریکی بۆ خوا بڕیار دابێت یان کوفری کردبێ و تۆبەی لێ نەکردبێت و لەسەر ئەوە مردبێت ئەوا بە هیچ جۆرێك لێبوردن نایگرێتەوە خوا پەنامان بدات، بەڵام ئەو تاوانانەی کە لەنێوان بەندەکان و خوای خۆیاندایە، وەکو نەزەر و کەم و کوڕی لە نوێژ و ڕۆژودا و شتی لەو بابەتە کە مافی خەڵکی پێوە نییە و تەنها مافی خوایە، ئەمانەیان ئومێد زۆرە کە خوای گەورە لێیان ببورێت بە مەرجێك کە ئەو کەسە تاوانی شیرك و و کوفری نەبێت. وە جۆری سێ هەمیش کە زوڵمی بەندەکانە لە یەکتر، ئەمەیان عەدالەتی خوایی وا دەخوازێت کە هەموو خاوەن مافێك مافەکەی خۆی بۆ بگێڕدرێتەوە، وە هەموو ئەوانەش کە مافی خەڵکیان خواردووە، مافەکانیان لێ بستێنرێتەوە و بدرێتەوە بە خاوەنەکانی خۆیان .

جا لەو ڕۆژەشدا خوا پەنامان بدات هیچ کەسێك لە مافی خۆی نابورێت، تەنانەت دایك لە جگەرگۆشەکەی خۆی نابورێت و مافەکەی خۆی دەوێتەوە بۆ ئەوەی لە سزای سەختی دۆزەخ ڕزگاری

ببێت، جا بۆیە پێویستە هەر لە دونیادا مافی خەڵك بدرێتەوە ،و تۆبەی راستەقینەش هەر ئەو تۆبەیەیە کە لەگەڵ پەشیمان بوونەوە و دەست هەڵگرتن لە تاوان، مافی هەموو ئەو خەڵکانەی کە ستەمت لیٚ کردوون بیاندەیتەوە، جا ئەو مافە خوێن بێت یان ماڵ بێت یان غەیبەت و زەم و بوختان بێت یان جوێن پێدان و ئازار دان بێت، یان هەر جۆرێکی تر بێت لە جۆرەکانی زوڵم و ماف خواردن. وەیان رازییان بکەیت کە گەردنت ئازاد بکەن، وە ئەگەر دەستیشت پیٚیان نەگەیشت، لانی کەم دەبێت خێرو سەدەقەیان بۆ بکەیت و دوعای خێریان بۆ بکەیت و چاکە لەگەڵ کەس و کاریاندا بکەیت .

( ٦٩٢ ) ( ع هق ) عن بريدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَيْفَ يُقَدِّسُ اللهُ أُمَّةً لا يُؤْخَذُ لِضَعِيفِهَا حَقُّهُ مِنْ قَوِيِّهَا وَ هُوَ غَيْرَ مُتَعْتَعٍ؟ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٩٥ ) في صحيح الجامع

بُريدة دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: خوای گەورە چۆن میللەتێك پاك و پیرۆز دەكات كە بیٚ هێز و لاوازەکەیان بەبیٚ ئەوەی دەمی تەتەڵە بکات مافی خۆی لە بەهێز و دەسەڵاتدارەکەیان بۆ بستێنرێتەوە ).

( ٦٩٣ ) ( هـ حب ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَيْفَ يُقَدِّسُ اللهُ أُمَّةً لا يُؤْخَذُ لِضَعِيفِهِمْ مِنْ شَدِيْدِهِمْ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٩٧ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە چۆن میللەتێك پاك و پیرۆز دەكات كە ماف لە دەسەڵاتدارو بە تواناکانیان نەسەندرێتەوە بۆ لاواز و بیٚ دەسەڵاتەکانیان ).

# ( بەشی : سنوورەکان و سزاکان )

## ( ١ ) ( ئەو تاوانانەی کە دەبنە مایەی پێشخستنی تۆڵە و سزای خوا )

**( ٦٩٤ ) ( تخ طب ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إثْنَانِ يُعَجِلُهُمَا اللهُ فِي الدُّنْيَا: البَغْيُ وَ عُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٣٧ ) في صحيح الجامع**

ابي بكرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دوو جۆر تاوان هەر لە دونیادا خوای گەورە سزاکەیان پێش دەخات، دەست درێژی و رەنجاندنی دایك و باوك ).

**( ٦٩٥ ) ( طب ك ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا ظَهَرَ الزِّنَا وَ الرِّبَا فِي قَرْيَةٍ فَقَدْ أَحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عَذابَ اللهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر زینا و سوو خۆری بە ئاشكرا ئەنجام درا لە ئاواییەکدا، ئیتر ئەوا عەزابی خوایان بەسەر خۆیاندا هاوردووە و قەرماندووە ).

## ( ٢ ) ( شاردنەوە و ئاشكرا نەكردنی هەندێ لە تاوانەکان )

**( ٦٩٦ ) ( ك هق ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اجْتَنِبُوا هَذِهِ الْقَاذُورَاتِ الَّتِي نَهَى اللهُ تَعَالَى عَنْهَا، فَمَنْ أَلَمَّ بِشَيْءٍ مِنْهَا فَلْيَسْتَتِرْ بِسَتْرِ اللهِ وَ لِيَتُبْ إِلَى اللهِ فَإِنَّهُ مَنْ يُبْدِ لَنَا صَفْحَتَهُ نُقِمْ عَلَيْهِ كِتَابَ اللهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خۆتان لەو پۆخڵەواتانە بپارێزن کە خوای گەورە نەهی لێ کردوون، جا ئەگەر کەسێك بە شتێك لەو گوناهانەوە گلا، با خۆی پەردە پۆش بکات بە ستری خوا، وە با بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و تۆبە بکات، چونکە هەر کەسێك لاپەڕەی خۆیمان بۆ ئاشكرا بکات، ئەوا ئەو سنوورەی لە کتێبەکەی خوادا هاتووە لەسەری جێبەجێی دەکەین ).

## ( ٣ ) ( چۆنیەتی سەلامەت بوون لە کاری خراپە )

**( ٦٩٧ ) ( حب طب ) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اجْعَلُوا بَيْنَكُمْ وَ بَيْنَ الْحَرَامِ سِتْراً مِنَ الْحَلالِ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ اسْتَبْرَأَ لِعِرْضِهِ وَ دِينِهِ وَ مَنْ أَرْتَعَ فِيهِ كَانَ كَالْمُرْتِعِ إِلَى جَنْبِ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَقَعَ فِيهِ وَ إِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمَىً وَ إِنَّ حِمَى اللهِ فِي الأَرْضِ مَحَارِمُهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٥٢ ) في صحيح الجامع**

نعمانی کوڕی بشیر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( پەردەیەك لە حەڵاڵ بخەنە نێوان خۆتان و نێوان حەرامەوە، جا هەر کەسێك وای کرد ئیتر ئەوە هەوڵی پاك ڕاگرتنی ناموس و ئایینی خۆی داوە. وە هەر کەسێکیش خۆی تێوە گلاند، ئەوە وەك ئەو کەسە وایە کە لەتەنیشت شوێنێکی قەدەغەوە خۆی دەگلێنێت و دەگەوزێت ، وە نزیکە کە بکەوێتە ناوی. وە هەموو پادشایەکیش شوێنی قەدەغە کراوی خۆی هەیە، وە شوێنە قەدەغە کراوەکەی خواش لەسەر زەویدا بریتییە لەو شتانەی کە حەرامی کردوون ).

## ( ٤ ) ( ئەشکە نجەدانی خەڵك لە دونیا )

( ٦٩٨ ) ( حم هب ) عن خالد بن الوليد ( ك ) عن عياض بن غنم وهشام بن حكيم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَشَدُّ النَّاسِ عَذاباً لِلنَّاسِ فِي الدُّنْيَا أَشَدُّ النَّاسِ عَذاباً عِنْدَ الله يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾.
( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٩٩٨ ) في صحيح الجامع

لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە لە عیاضی کوڕی غنم و هشام ی کوڕی حکیم ەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی:( ئەو کەسەی کە توندترین ئەشکەنجەی خەڵك دەدات لە دونیادا، لە هەموو کەسێك ئەشکەنجەی زیاترە لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ).

## ( ٥ ) ( فەزڵی بەجێ گەیاندنی سنورەکانی خوا )

( ٦٩٩ ) ( هـ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِقَامَةُ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ الله خيرٌ مِنْ مَطَرِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً فِي بِلادِ الله ﴾. ( صحيح . أنظر حيث رقم ( ١١٣٩ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( بەجێ گەیاندنی حەددی سنوورێك لە سنوورەکانی خوا خێرتر و باشترە لە باران بارینی چل شەو لە شارەکانی خوادا )

( ٧٠٠ ) ( هـ ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَقِيمُوا حُدُودَ الله تَعَالَىٰ فِي الْقَرِيبِ وَ الْبَعِيدِ، لا تَأْخُذْكُمْ فِي الله لَوْمَةُ لائِمٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١٩٠ ) في صحيح الجامع

عُبادەی کوڕی صامت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویـەتی: ( سنوورەکانی خوا لەسەر نزیك و دوور جێبەجێ بکەن، وە لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك مەترسن ).

## ( ٦ ) ( کوشتنی باوەڕدارێك بە ناحەق )

( ٧٠١ ) ( حم ن ك ) عن عقبة بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ الله أَبىَ عَليَّ فِيمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً ثَلاثاً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦٩٨ ) في صحيح الجامع

عقبەی کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە سێ جار داواکاریەکەمی ڕەت کردەوە کە تۆبەی کەسێك قبوڵ بکات کە باوەڕدارێکی کوشتبێت ).

( ٧٠٢ ) ( ن الضياء ) عن بريدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَتْلُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٥٧ ) في صحيح الجامع

بُريدة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویـەتی: ( کوشتنی باوەڕدار گەورەترە لە لای خوا لە فەوتان و لە ناوچونی هەموو دونیا ).

( ٧٠٣ ) ( هـ ) عن البراء بن عازب، أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِغَيْرِ حَقٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٠٧٧ ) في صحيح الجامع

براء ی کوڕی عازب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( لە ناو چوونی هەموو دونیا ئاسان ترە لە لای خوا لە کوشتنی بڕوادارێك بە ناحەق ).

( ٧٠٤ ) ( ت ن ) عن عبدالله بن عمرو أنَّ النبي(ﷺ) قال: ﴿ لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٠٧٣ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( فەوتان و لە ناوچونی دونیا ئاسانترە لە لای خوا لە کوشتنی پیاوێکی موسڵمان ).

(٧٠٥ ) ( ت ) عن أبي سعيد وأبي هريرة معا: عن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ لَوْ أَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ وَ الأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لأكَبَّهُمْ اللهُ عَزَّوَجَلَّ فِي النَّارِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٢٤٥ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد و ابو هريرە پێکەوە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەگەر هەموو خەڵکی ئاسمان و خەڵکی زەوی بەشدارییان کربێت لە خوێنی باوەڕدارێکدا، ئەوا خوا هەموویان نەغرۆی ئاگر دەکات ).

## ( ٧ ) ( باوەڕدار نابێت بەرامبەر بەبێ باوەڕ بکوژرێتەوە )

( ٧٠٦ ) ( د ن ك ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْمُؤْمِنُونَ تَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَ هُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ وَ يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، أَلا لا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ وَ لا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ، مَنْ أَحْدَثَ حَدَثاً فَعَلَى نَفْسِهِ وَ مَنْ أَحْدَثَ حَدَثاً أَوْ آوَى مُحْدِثاً فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَ الْمَلائِكَةِ وَ النَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦٤ ) في صحيح الجامع

علي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( باوەڕداران خوێنەکانیان یەکسانە، وە هەموویشیان یەك دەستن لەسەر غەیری خۆیان، وە ئەو پەیمان و پەنادان و زەمانەتەی کە نزمترین کەسیان بیدات، دەبێت هەموو کاری پێ بکەن و پابەند بن پێوەی. جا بزانن کە نابێت بڕوادار لە بری بێ باوەڕدا

بكوژرێتەوە، وە نابێت هیچ مۆڵەت پێدراوێکیش لە ماوەی ئەو مۆڵەتەی کە پێی دراوە بکوژرێت ، جا هەر کەسێك رووداوێك بقەومێنێت ئەوا لە ئەستۆی خۆیەتی، وە هەرکەسێك کارەساتێك بقەومێنێت ( واتە بە کوشتن )، یان پەناو داڵدەی بکوژێك بدات، ئەوا نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت ).

## ( ٨ ) ( هەڵە و لەبیر چونەوە و زۆر لێکردن )

( ٧٠٧ ) ( حم ه ) عن أبي ذر ( طب ك ) عن ابن عباس ( طب ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعَالىَ تَجَاوَزَ لي عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأُ وَ النِّسْيَانُ وَمَا آسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٣١) في صحيح الجامع

ابي ذر و إبن عباس و ثوبان دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە بۆم بوراوە لە ئومەتەکەم لە هەڵە و لە بیر چونەوە و ئەوەیشی کە بە زۆر پێیان دەکرێت ).

( ٧٠٨ ) ( هـ ) عن ابن عباس رضي الله عنهما عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ إنَّ الله تَعَالىَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَ النِّسْيَانَ وَ ما اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٣٦) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە خستویەتی و بوراوە لە ئومەتەکەم لە هەڵە و لە بیر چونەوە، وە ئەوەیشی کە بە زۆر پێیان دەکرێت ).

## ( ٩ ) ( ئازار و ئەشکە نجەدانی خەڵك )

( ٧٠٩ ) ( حم م د ) عن هشام بن حكيم ( حم هب ) عن عياض بن غنم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعَالىَ يُعَذِّبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ فِي الدُّنْيَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٩٠٠) في صحيح الجامع

هشامی کوڕی حکیم و عیاض ی کوڕی غنم دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا ئەشکەنجەی ئەو کەسانە دەدات کە لەدونیادا ئەشکەنجەی خەڵك دەدەن ).

( ٧١٠ ) ( حم خ ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاناً وَ فُلاناً بِالنَّارِ وَ إنَّ النَّارَ لا يُعَذِّبُ بِهَا إلاَّ الله فَإنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٤٦٢) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـووی: ( من پێشتر فەرمانم پێ کردبوون کە فلان و فلان بە ئاگر بسوتێنن، جا ئاگر نابێت هیچ کەس ئەشکەنجەی پێ بدات جگە لە خوا نەبێت. جا ئەگەر ئەو دوو کەسەتان دەست کەوت ئەوا بیانکوژن ).

( ٧١١ ) ( د ت ك ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ الله ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٣٣٠) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( بە ئەشکەنجەی خوا ئەشکەنجەی کەس مەدەن ): واتە بە ئاگر.

## ( ١٠ ) ( جێبەجێ کردنی سنووری خوا لەسەر کەسێك پاکی دەکاتەوە لە تاوانەکەی )

( ٧١٢ ) ( ك ) عن خزيمة بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّمَا عَبْدٌ أَصَابَ شَيْئاً مِمَّا نَهَى الله عَنْهُ ثُمَّ أُقِيمَ عَلَيْهِ حَدُّهُ، كَفَّرَ اللهُ ذَلِكَ الذَّنْبَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٧٢٨) في صحيح الجامع

خزیمەی کوڕی ثابت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر بەندەیەك گرفتاری شتێك بوو لەوانەی کە خوا نەهی لێ کردووە، پاشان حەدد و سنورەکەی خوای لەسەر جێبەجێ کرا، ئەوا خوا ئەو تاوانە دەسڕێتەوە ).

## ( ١١ ) ( ئاکامی لاساری کردن لە فەرمانەکانی خوا )

( ٧١٣ ) ( طب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ خَمْسٌ بِخَمْسٍ: مَا نَقَضَ قَوْمٌ العَهْدَ إِلَّا سَلَّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوَّهُمْ، وَ مَا حَكَمُوا بِغَيْرِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلاَّ فَشَا فِيهِمُ الفَقْرُ، وَ لا ظَهَرَتْ فِيهِمُ الفَاحِشَةَ إِلاَّ فَشَا فِيهِمُ المَوْتَ، وَ لا طَفَّفُوا المِكْيَالَ إِلاَّ مُنِعُوا النَّبَاتَ وَ أُخِذُوا بِالسِّنِينَ، وَ لا مَنَعُوا الزَّكَاةَ إِلاَّ حُبِسَ عَنْهُمُ القَطرَ ﴾ (حسن) أنظر حيث رقم (٣٢٣٧) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( پێنج جۆر سزا بەرامبەر بە پێنج جۆر تاوان، هەر کۆمەڵێك پەیمان بشکێنن، ئەوا دوژمنەکانی خۆیانیان بەسەردا زاڵ دەکرێت، وە هەر کات حوکمیان بە غەیری ئەوە کرد کە خوا ناردویەتییە خوارەوە، ئەوا هەژاری و نەدارییان تێدا بڵاو دەبێتەوە، وە هەر کات فاحشە و داوێن پیسییان تێدا بوو بە ئاشکرا، ئەوا مردنیان تێدا بڵاو دەبێتەوە، وە هەرکات فێڵیان لە کێشانەدا کرد ئەوا رووەك و بەروبوومیان لێ وەردەگیرێتەوە، وە گرانییان بەسەردا دێت، وە هەرکات زەکاتیان نەدا ئەوا بارانیان لێ وەردەگیرێتەوە ).

## ( ١٢ ) ( واجب بوونی قصاص – واتە تۆڵە سەندنی حەق بەرامبەر – )

( ٧١٤ ) ( حم ق د ن هـ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كِتَابُ الله القِصَاصُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٤٦٦) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( کیتابی خوا واتە قورئان _ فەرمانی بە قیصاصە _ واتە تۆڵە سەندنەوەی حەق بەرامبەر ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

واتە سیستەمی خوای گەورە کە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا کە بۆ مرۆڤایەتی ناردووە و واجبی کردووە لەسەر باوەڕداران. بریتییە لە سیستەمی تۆڵە سەندنەوەی حەق بەرامبەر ( القصاص ) واتە چەندت دەست درێژی کراوەتە سەر دەبێت تۆڵەکەی تۆش هێندەی ئەو دەست درێژیە بێت کە کراوەتە سەرت نەك زیاتر ( فمن إعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم ) وە ئەگەر سزایەکت دا دەبێت سزاکە حەق بەرامبەری ئەو زوڵمە بێت کە لێت کراوە نەك زیاتر ( و ان عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به ) واتە دان بە دان و چاو بە چاو و برینیش تۆڵە بەرامبەر ( والجروح قصاص ). وە لە هەمووشیاندا خوای گەورە فەزڵی داوە بە لێبوردن ئەگەر کەسێك ویستی ببورێت و تۆڵە نەکاتەوە.

## ( ١٣ ) ( دزی کردن )

( ٧١٥ ) ( حم ق ن هـ ) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ وَ يَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعَ يَدُه ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٥٠٩٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( نەفرەتی خوا لە دز بێت، هێلکەیەك دەدزێت دەستی دەبڕدرێت، وە گوریسێك دەدزێت دەستی دەبڕدرێت ).

## ( ١٤ ) ( داخ کردنی دەم و چاو )

( ٧١٦ ) ( طب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ مَنْ يَسم فِي الْوَجْهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٥١٠٩ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوا نەفرەتی لە کەسێك کردووە کە دەمو چاو دەسمێت و داخی دەکات ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی پێ داخ کردنی دەم و چاوی ئاژەڵە بە ئاگر بۆ نیشانە کردن .

## ( ١٥ ) ( سەلماندنی بە بەڵگەوە پێویستە بۆ ئەنجام دانی حەددی شەرعی )

**( ٧١٧ ) ( د ت هـ ) عن ابن عباس ( ن ) عن أنس قال النبي(ﷺ): ﴿ لَوْلا مَا مَضى مِنْ كِتَابِ الله لَكَانَ لِي وَ لَهَا شَأنٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٣٢٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس لە انس ـە وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەگەر لەبەر ئەو حوکمە نەبوایە کە پێشتر لە قورئانەکەی خوای گەورەدا هاتووە، ئەوا من بە جۆرێکی تر مامەڵەم لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا دەکرد ) .

## ( ١٦ ) ( ئازار نەدانی بەندە و کەنیزەك )

**( ٧١٨ ) ( حم د ) عن أبي ذر قال: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ لايَمَكُم مِنْ خَدَمِكُمْ فَأَطْعِمُوهُ مِمَّا تَأكُلُونَ وَ ألْبِسُوهُمْ مِمَّا تَلْبِسُونَ وَ مَنْ لَمْ يُلايِمْكُم مِنْهُمْ فَبِيعُوهُ وَ لا تُعَذِّبُوا خَلْقَ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦٠١ ) في صحيح الجامع**

ابو ذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کامێك لە خزمەتکارەکانتان گونجاو بوون بۆتان ئەوا لەوەی کە خۆتان دەیخۆن بەشی ئەوانیش بدەن، وەلە پۆشاکەکەی کە خۆتان لەبەری دەکەن لەبەر ئەوانیشی بکەن، وە هەر کامێکیشیان گونجاو نەبوو بۆتان ئەوا بیفرۆشن، وە ئەشکەنجەو ئازاری بەنـدەی خوا مـەدەن ) .

**( ٧١٩ ) ( د ) عن أبي ذر قال: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ يَا أبَا ذَرَ إنَّكَ امْرؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ، إنَّهُمْ إخْوانُكُمْ فَضَّلَكُمُ الله عَلَيْهِمْ فَمَنْ لَمْ يُلائِمُكُمْ فَبِيعُوهُ وَ لا تُعَذِّبُوا خَلْقَ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨١٤ ) في صحيح الجامع**

ابو ذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەی ابا ذر تۆ کەسێکیت هێشتا نەفامیت تێدا ماوە، ئەوانە براتانن، خوا فەزڵی ئێوەی داوە بەسەریاندا، جا هەر کامێکیانتان بۆ نەگونجا ئەوا بیفرۆشن، وە ئەشکەنجەو ئازاری خەڵقی خوا مەدەن ).

## ( ١٧ ) ( هیچ سزایەك نابێت لە دە قامچی زیاتر بێت ئەگەر حەدی شـــەرعی نەبێت )

**( ٧٢٠ ) ( خ ) عن رجل أنه سمع رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ لا عُقُوبَةَ فَوْقَ عَشْرِ ضَرَبَاتٍ إلاَّ فِي حَدَ مِنْ حُدُودِ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٥٠٢ ) في صحيح الجامع**

لە پیاوێکەوە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( هیچ سزایەك نابێت لەسەرو دە جار لێدانەوە بێت، مەگەر سنوورێك لە سنوورەکانی خوای گەورە بێت ).

( ٧٢١ ) ( حم ق ٤ ) عن أبي بردة الأنصاري أنه سمع رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ لا يُجْلَدُ فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ، إلاَّ فِي حَدّ مِنْ حُدُودِ الله ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٥٩١) في صحيح الجامع

ابو بردةى انصاري دەڵێ:بیستومە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ( هیچ کەسێك نابێت لەسەرو دە قامچییەوە لێی بدرێت، تەنها مەگەر لە سنوورێك لە سنوورەکانی خوادا نەبێت ).

## ( ١٨ ) ( شەفاعەت کردن لە سنوورەکانی خوای گەورەدا )

( ٧٢٢ ) ( ق د ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا أُسَامَةُ! أَتَشْفَعُ فِي حَدٍ مِنْ حُدُودِ الله؟ ﴾! (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٢٢) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـووی: ( ئەی ئوسامە، ئەوە شەفاعەت لە سنوورێك لە سنوورەکانی خوادا دەکەیت ). واتە وەك سەرزەنش کردنێك کە چۆن تۆ کاری وا دەکەیت.

## ( ١٩ ) ( خوێن دانی ( دیة ) کوشتنی هەڵە )

( ٧٢٣ ) ( د ن هـ ) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيَا أَوْ رِمِّيَاً يَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحجَرٍ أَوْ سَوْطٍ فَعَقْلُهُ عَقْلُ الْخَطَإ، وَ مَنْ قُتِلَ عَمْداً فَقَوَدُ يَدَيْهِ ، فَمَنْ حَالَ بَيْنَهُ وَ بَيْنَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ الله وَ الْمَلائِكَةِ وَ النَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٣٨) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك بکوژرێت لە گەرە لاوژێ یان لە رەمی کردن لە نێوان خۆیاندا، بە بەرد بێت یان بە قامچی ئەوا بری خوێنەکەی بری خوێنی هەڵەیە، وە هەرکەسێك بە ئەنقەس بکوژرێت، ئەوا تۆڵەی قیصاصەکەی کوشتنەوەی بکوژەکەیە کە تاوانەکە لـەسەر دەستیدا رووی داوە. وە هەر کەسێکیش ببێتە رێگر و بەربەست لە نێوان خاوەنی کوژراوەکەو کوشتنەوەی بکوژەکە دا، ئەوا نەفرەتی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت ).

( ٧٢٤ ) ( د ن ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيَا فِي رَمْيٍ يَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحِجَارَةٍ أَوْ بِالسِّيَاطِ أَوْ ضَرْبٍ بِعَصَا فَهُوَ خَطَأٌ وَ عَقْلُهُ عَقْلُ الْخَطَإِ وَ مَنْ قُتِلَ عَمْداً فَهُوَ قَوَدُ يَدٍ ثُمَّ اتَّفَقَا وَ مَنْ حَالَ دُونَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ الله وَ غَضَبُهُ لا يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَ لا عَدْلٌ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٥٠) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك لە گەرە لاوژێ و تێك بەربووندا لە شت گرتنە یەك لە نێوانیاندا بکوژرێت، بەبەرد بێت یان بە قامچی یان بە دار لێی بدرێت، ئەوە کوشتنی هەڵەیە، وە بری خوێنەکەشی بری خوێنی هەڵەیە. وە هەر کەسێکیش بەدەستی ئەنقەست بکوژرێت ئەوا قیصاصەکەی کوشتنەوەی بکوژەکەیە کە تاوانەکە لەسەر دەستیدا رووی داوە یان ئەگەر پاشان رێك

بکەون. وە هەر کەسێکیش ببێتە رێگر و بەربەست لە بەردەمیدا بۆ کوشتنەوەی بکوژەکە - یان ببێتە رێگر بۆ رێکەوتنی نێوانیان - ئەوا نەفرەتی خواو تووڕەبوونی ئەوی لەسەر بێت، وە نەتۆبە و نە هیچ موقابیل و بەرامبەرێکی لێ وەرناگیرێت.

( ٧٢٥ ) ( د الضياء ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً فَاغْتَبَطَ بِقَتْلِه لَمْ يَقْبَلِ الله مِنْهُ صَرْفاً وَ لا عَدْلاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٥١) في صحيح الجامع

عُبادەی کوڕی الصامت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویـەتی: ( هەر کەسێك بڕوادارێك بەبێ تاوان بکوژێت وە دڵخۆشیش بێت بە کوشتنەکەی، ئەوا خوای گەورە نە تۆبە و نە هیچ بەرامبەرێکی لێ وەرناگرێت ).

## ( ٢٠ ) ( کوشتنی موعاهید و پەیمان پێ دراوەکان )

مُعاهد: ئەو کەسەیە کە موسڵمان نەبێت بەڵام لە پەیماندا بێت لەگەڵ موسڵماناندا جا بەهۆی سوڵحەوە بێت یان هودنە و ئاگر بەست بێت، یان پەیمانی ئەمان و سەلامەتی لە موسڵمانێك یان بەرپرسێکی موسڵمانانەوە پێ‌ی درا بێت و دڵنیا کرا بێت کە سەرو ماڵی پارێزراو دەبێت ).

( ٧٢٦ ) ( حم د ن ك ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَتَلَ مُعَاهِداً فِي غَيْرِ كُنْهِهِ حَرَّمَ الله عَلَيْهِ الْجَنَّةَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٥٤) في صحيح الجامع

ابي بكرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویـەتی: ( هەر کەسێك موعاهیدێك واتە پەیمان پێدراوێك بکوژێت لە غەیری وادەی شەڕ و ڕووبەڕوبونەوەدا، ئەوا خوای گەورە بە هەشتی لەسەر حەرام دەکات ).

( ٧٢٧ ) ( حم ن ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَتَلَ نَفْساً مُعَاهِدَةً بِغَيْرِ حِلِّهَا حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ أَنْ يَشُمَّ رِيحَهَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٥٦) في صحيح الجامع

ابي بكرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك نەفسێکی موعاهید و پەیمان پێ درا بە بێ ڕوویەکی حەڵاڵ بکوژێت، ئەوا خوای گەورە لەسەری حەرام دەکات کە بۆنی بەهەشت بکات ).

# (( بەشی: پزیشکی و دەرمان کردن ))

## (١) ( هاندان بۆ چارەسەرکردن و تیمار کردن )

( ٧٢٨ ) ( حم ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالىَ حَيْثُ خَلَقَ الدَّاءَ خَلَقَ الدَّواءَ فَتَداوَوْا ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (١٧٥٤) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە لە هەر کات و شوێنێ دەرد و نەخۆشیەکی دروست کردبێت ئەوا دەرمانەکەیشی دروست کردووە، جا دەرمان بەکار بهێنن و چارەسەر بکەن ).

( ٧٢٩ ) ( طب ) عن أم الدرداء قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالىَ خَلَقَ الدَّاءَ وَ الدَّواءَ فَتَداوَوْا وَلاتَـتَداوَوْا بِحَرامٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٦٢) في صحيح الجامع

ام الدردار دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەردیش و دەرمانیشی دروست کردووە، جا دەرمان بۆ چارەسەر بەکار بهێنن بەڵام بەشتی حەرام چارەسەر و تیمارمەکەن ).

( ٧٣٠ ) ( حم ٤ حب ك ) عن أسامة بن شريك قال: قَالَت الأَعْرَابُ يَا رَسُول الله(ﷺ) ألا نَتَداوى؟ قال: نَعَمْ يَا عِبَادَ اللهِ تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللهَ تَعالىَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ شِفَاءً أَوْ دَوَاءً،إِلاَّ داءً وَاحِداً، فَقَالُوا يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ): وَمَا هُوَ؟ قَالَ: ﴿الْهَرَمُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٣٢) في صحيح الجامع

اسامەی کوڕی شریك دەڵێ: عەرەبە دەشتەکی‌یەکان ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەرێ تیمارو چارەسەر نەکەین ؟ فەرمووی: بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا چارەسەرو تیمار بکەن، چونکە خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە، ئیلا شیفایەك یان دەرمانێکی بۆ داناوە. تەنها یەك دەرد نەبێت )، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو دەردە چییە ؟ فەرمـووی: ( پیری ).

( ٧٣١ ) ( ك ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالىَ لَمْ يَنْزِلَ دَاءَ إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ دَوَاءً عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ، وَ جَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ إِلاَّ السَّامُ وَ هُوَ الْمَوْتُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٠٩) في صحيح الجامع

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەبەزاندووە ئیلا دەرمانێکیشی بۆ دابەزاندووە، جا هەر کەس زانی ئەوا زانیوەتی و هەر کەسیش نەیزانی ئەوا نەیزانیوە، تەنها دەردێك نەبێت کە ئەویش مردنە ).

( ٧٣٢ ) ( **الطيالسي** ) عن أسامة بن شريك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **عِبَادَ اللهِ! وَضَعَ اللهُ الْحَرَجَ إِلاَّ امْرِءاً اقْتَرَضَ امْرِءاً ظُلْماً فَذَاكَ يُحْرِجُ وَ يُهْلِكُ عِبَادَ اللهِ! تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللهَ تَعَالىَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً إِلاَّ دَاءً وَاحِداً : الْهَرَمُ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٩٧٢ ) في صحيح الجامع

أسامةی كوڕی شريك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( بەندەكانی خوا، خوای گەورە ئەرك و ئيحراجيی لەسەر لاداون، تەنها كەسێك نەبێت كە بەزوڵم كەسێكی تر عەيبدار بكات، ئەوە دووچاری ئيحراجی و لەناو چوون و فەوتان دەبێت لە قيامەتدا، بەندەكانی خوا، چارەسەر بە دەرمان بكەن چونكە خوای گەورە هیچ دەردێكی دانەناوە ئيلا دەرمانێكيشی بۆ داناوە، جگە لەيەك دەرد نەبێت )، ووتيان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی يە؟ فەرمووی: ( پيری ) .

( ٧٣٣ ) ( **طب أبو نعيم** ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **الدَّوَاءُ مِنَ الْقَدَرِ وَ قَدْ يَنْفَعُ بِإِذْنِ اللهِ تَعَالىَ** ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٩٣ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( دەرمانيش هەر بە قەدەری خوايە. وە سودی خۆی دەگەيـەنێت ئەگەر خوای گەورە بيەوێت ).

( ٧٣٤ ) ( **حم م** ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءٌ الدَّاءَ بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١٤٣ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هەموو دەردێك دەرمانی خۆی هەيە، جا ئەگەر دەرمانێك بەر دەردەكەی خۆی بكەوێت ئەوا چاك دەبێتەوە، ئەگەر خوای گەورە بيەوێت )

(٧٣٥) ( **هـ** ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَا أَنْزَلَ اللهُ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ الدَّوَاءَ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٥٤ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە هیچ دەردێكی دانەبەزاندووە ئيلا دەرمانێكيشی بۆ دابەزاندووە ).

( ٧٣٦ ) ( **هـ** ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَا أَنْزَلَ اللهُ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٥٨ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە هیچ دەردێكی دانەبەزاندووە ئيلا شيفاشی بۆ دابەزاندووە ).

## ( ٢ ) ( دەربارەی – تا - گرتن )

( ٧٣٧ ) ( **حم هـ ك** ) عن أبى هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **أَبْشِرْ فَإِنَّ اللهَ تَعَالىَ يَقُولُ: هِيَ نَارِي أُسَلِّطُهَا عَلىَ عَبْدِيَ الْمُؤْمِنِ فِي الدُّنْيَا لِتَكُونَ حَظَّهُ مِنَ النَّارِ فِي الآخِرَةِ** ﴾. و اللفظ لإبن ماجة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( مژدەت لێ بێت، خوای گەورە دەفەرموێت ؟ ئەوە ئاگری خۆمە – واتە ( تا ) – ئەیدەم بەسەر بەندەی باوەڕدارمدا، هەتا ببێتە بەشی خۆی لە ئاگر لە ڕۆژی دواییدا ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

واتە ئەو موسڵمانەی کە بە هۆی نەخۆشییەوە تای لێ دێت،خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی وای بۆ ئەژمار دەکات کە وەك ئەوە وابێت کە بە ئاگر سووتابێت،بەمەش لە ئاگری دۆزەخی دوور دەخاتەوە.

## ( ٣ ) ( چارەسەر بە قورئانی پیرۆز )

( ٧٣٨ ) ( حب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَالِجِيهَا بِكِتَابِ اللهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٩٦٦ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( بە کتێبەکەی خوا چارەسەری بکە ) .

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دوو شتی بە شیفا ناو بردووە،یەکەمیان قورئان و دووەمیان هەنگوین، جا بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بە عائشەی خێزانی دەفەرموێت کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ چارەسەر و شیفای نەخۆشییەکان بەکار بهێنێت.

## ( ٤ ) ( دەربارەی چاو پیسی و حەسوودی )

( ٧٣٩ ) ( الطيالسي تخ الحكيم البزار الضياء ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَكْثَرُ مَنْ يَمُوتُ مِنْ أُمَّتِي بَعْدَ قَضَاءِ اللهِ وَ قَدَرِهِ بِالْعَيْنِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٢٠٦ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( لە پاش قەزاو قەدەری خوا، زۆرترینی ئەوانەی کە لە ئومەتەکەی من دەمرن بە چاو و نفوسی پیس دەمرن ).

## ( ٥ ) ( چارەسەر کردن بە شیری مانگا )

( ٧٤٠ ) ( حم ) عن طارق بن شهاب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ شِفَاءً فَعَلَيْكُمْ بِأَلْبَانِ الْبَقَرِ فَإِنَّهَا تَرِمُ مِنْ كُلِّ الشَّجَرِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٠٨ ) في صحيح الجامع

طارق ی کوڕی شهاب دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـووی: ( خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە، ئیلا شیفاشی بۆ داناوە، جا ئێوە شیری مانگا زۆر بەکاربهێنن چونکە لە هەموو جۆرە دارو گژو گیایەك دەخوات ) .

( ٧٤١ ) ( ك ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالىَ لَمْ يُنَزِّلْ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً إِلاَّ الْهَرَم فَعَلَيْكُمْ بِأَلْبَانِ الْبَقَرِ فَإِنَّهَا تَرَمُ مِنْ كُلِّ الشَّجَرِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨١٠) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەبەزاندووە ئیلا شیفاشی بۆ دابەزاندووە، تەنها پیری نەبێت، جا ئێوە شیری مانگا زۆر بەکاربهێنن چونکە لە هەموو جۆر دار و گژو گیایەك دەلەوەڕێت ).

( ٧٤٢ ) ( طب ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تَدَاوَوْا بِأَلْبَانِ الْبَقَرِ فَإِنِّي أَرْجُو أَنْ يَجْعَلَ اللهُ فِيهَا شِفَاءً فَإِنَّها تَأْكُلُ مِنْ كُلِّ الشَّجَرِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٩١٩) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( بە شیری مانگا چارەسەرو تیمار بکەن، چونکە من ئومێدم وایە کە خوای گەورە شیفای تێدا دابنێت، چونکە لە هەموو جۆرە دارو گژو گیایەك دەلەوەڕێت ) .

## ( ٦ ) ( فەزیلەتی ئارام گرتن لەسەر کوێری )

( ٧٤٣ ) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ اللهُ تَعالىَ: مَنْ أَذْهَبْتُ حَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ وَ احْتَسَبَ لَمْ أَرْضَ لَهُ ثَوَاباً دُونَ الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٣٩) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کەسێك جوتە خۆشەویستەکەی لێ بستێنم، - واتە هەردوو چاوی - وە ئەویش ئارام بگرێت و چاوەڕێی پاداشت لە خوا بکات، ئەوا بە هیچ پاداشتێك رازی نابم بۆی لە بەهەشت کەمتر بێت ) .

( ٧٤٤ ) ( حم م ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ اللهُ تَعالىَ: يَا ابْنَ آدَمَ! إِذَا أَخَذْتُ كَرِيمَتَيْكَ فَصَبَرْتَ وَ احْتَسَبْتَ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولىَ لَمْ أَرْضَ لَكَ ثَوَاباً دُونَ الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٤٢) في صحيح الجامع

ابو امامة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەنی ئادەم، ئەگەر جوتە خۆشەوستەکەتم لێ سەندیتەوە، و تۆش هەر لەگەڵ یەکەم جاری لێقەومانەکەتدا ئارامت گرت و چاوەڕێی پاداشتت لە من کرد، ئەوا بە هیچ پاداشتێك بۆ تۆ رازی نابم کە لە بەهەشت کەمتر بێت ) .

( ٧٤٥ ) ( ت ) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ يَقُولُ إذا أَخَذْتُ كَرِيمَتَي عَبْدِي فِي الدُّنْيَا لَمْ يَكُنْ لَهُ جَزاءٌ عِنْدِي إلاَّ الجَنَّةَ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٠٤ ) في صحيح الجامع

انسی کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــووی: (خوای گەورە دەفەرمویت: ئەگەر جوتە چاوە شیرینەکەی بەندەکەم لە دونیادا لێ سەندەوە و بردمەوە، ئەوا هیچ پاداشتێکی لای من نابێت جگە لە بەهەشت ).

( ٧٤٦ ) ( حم خ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ الله تَعالىَ: إذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ - يُرِيد بِعَيْنَيْهِ - ثُـمَّ صَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٠١ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــووی: ( خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر بەندەکەی خۆمم تاقیکردەوە بە لێسەندنەوەی جوتە چاوە خۆشەویستەکەی و ئەویش لە پاشدا ئارام بگرێت، ئەوا لەبری دوو چاوەکەی بەهەشتی دەدەمێ ).

( ٧٤٧ ) ( طب حل ) عن عرباض قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ الله تَعالىَ: إذا سَلَبْتُ مِنْ عَبْدِي كَرِيمَتَيْهِ وَ هُوَ بِهِمَا صَابِرٌ ضَنِينٌ لَمْ أَرْضَ لَهُ بِهِمَا ثَـوَاباً دُونَ الْجَنَّةَ إذا حَمَدني عَلَيْهِمَا ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٠٤ ) في صحيح الجامع

عرباض دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــووی: ( خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر لەبەندەکەم جوتە چاوەکەیم لێ سەندەوە و ئەویش بەبێ دوو چاوەکەی خۆڕاگر و بە ئارام بوو، ئەوا بە هیچ پاداشتێك بۆی رازی نابم کە لە بەهەشت کەمتر بێت، بەمەرجێ سوپاسی کردبێتم لەسەر نەمانی دوو چاوەکەی ).

## ( ٧ ) ( فەزڵی ئارام گرتن لەسەر بەڵاو نەهامەتی )

( ٧٤٨ ) ( م ) عن عائشة قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ﴿ مَامِنْ شَيْءٍ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ حَتَّىَ الشَّوْكَة تُصِيبُهُ إلاَّ كَتَبَ الله لَهُ بِهَا حَسَنَةً وَ حَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٢٠ ) في صحيح الجامع

عائیشە دەڵێ: بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ( هیچ شتێك نییە کە دووچاری بڕوادار ببێت تەنانەت دڕکێکیش کە پێیدا بچێت، ئیلا خوای گەورە چاکەی بۆ پێ دەنووسێت، یان تاوانی بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت ).

( ٧٤٩ ) ( حم ك ) عن معاوية قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ شَيْءٍ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ فِي جَسَدِهِ يُؤْذِيهِ إلاَّ كَفَرَ الله عَنْهُ بِهِ مِنْ سَيِّئَاتِهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٢٣ ) في صحيح الجامع

معاویه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هیچ شتێك نییە كە توشی باوەڕدار ببێت لە جەستەیداو ئازاری بدات ئیلا خوای گەورە لە خراپە و تاوانەكانی بۆپێ هەڵدەوەرێنێت ) .

( ٧٥٠ ) ( طب الضياء ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله( ﷺ ): ﴿ مَا مِنْ عَبْدٍ يَصْرَعُ صَرْعَةً مِنْ مَرَضٍ إِلاَّ بَعَثَـهُ اللهُ مِنْهَا طَاهِراً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٤٢ ) في صحيح الجامع

ابو امامة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هیچ بەندەیەك نییە كە یەك – فێ – لە هۆش چونی بەسەر بێت بە هۆی نەخۆشییەكەوە، ئیلا خوای گەورە بەپاكی لە گوناهەكانی هەڵی دەستێنێتەوە ).

(٧٥١) ( ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله( ﷺ ): ﴿ مَامِنْ مُسْلِمٍ يُصَابُ فِي جَسَدِهِ إِلاَّ أَمَرَ اللهُ تَعالَى الْحَفَظَةَ: اكْتُبُوا لِعَبْدِي فِي كُلِّ يَوْمٍ وَ لَيْلَةٍ مِنَ الْخَيْرِ مَا كَانَ يَعْمَلُ مَادَامَ مَحْبُوساً فِي وَثَاقِي ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٦٠ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (هەر موسڵمانێك جەستەی گرفتار وناساغ بێت، ئەوا خوای گەورە فرمان دەكات بە فریشتە پارێزەرەكانی: لە هەموو شەو و ڕۆژێكدا هێندە چاكە بۆ ئەو بەندەیە بنوسن بە ئەندازەی ئەوەی كە لە پێش نەخۆشیەكەیدا دەیكرد، مادەم بە هۆی كۆت و زنجیری منەوە بەند كراوە ).

(٧٥٢) ( حم خ ) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله( ﷺ ): ﴿ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُصِبْ مِنْهُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦٠٩ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر كەس خوای گەورە نیازی خێری پێ هەبێت ئەوا دوچاری دەرد و موسیبەتی دەكات ).

(٧٥٣) ( د ) عن أم العلاء قالت: عَادَنِي رَسُولُ اللهِ(ﷺ) وَأَنا مَرِيضَةٌ فَقَالَ: ﴿ أَبْشِرِي يَا أُمَّ الْعَلاءِ فَإِنَّ مَرَضَ الْمُسْلِمِ يُذْهِبُ اللهُ بِهِ خَطَايَاهُ كَمَا تُذْهِبُ النَّارُ خَبَثَ الذَّهَبِ وَ الْفِضَّةِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٤٩ ) في صحيح الجامع

ام العلاء دەڵێ: من نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی كردم و فەرمووی: ( مژدەت لێ بێت ام العلاء، چونكە نەخۆشییەك كە توشی موسڵمان دەبێت، خوای گەورە تاوانەكانی بۆ پێ دەبات، هەر وەك چۆن كە ئاگر خەوش و خاڵی زێڕو زیو دەبات ).

## ( ٨ ) ( خوێنی پیس گرتن - كەڵە شاخی - )

( ٧٥٤ ) ( ه ك ابن السني أبو نعيم ) عن ابن عمر قال: يَا نَافِعُ! قَدْ تَبَيَّغَ بِي الدَّمُ، فَالْتَمِسْ لِي حَجَّاماً وَاجْعَلْهُ رَفِيقاً إِنِ اسْتَطَعْتَ، وَلا تَجْعَلْهُ شَيْخاً كَبِيراً وَلا صَبِياً صَغِيراً، فَإِنِّي سمعتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) يَقُولُ: ﴿

الحجَامَةُ علَىَ الرِّيْقِ أَمْثَـلُ وَ فِيْهَا شِفاءٌ وَ بَرَكَةٌ وَ تَزِيْدُ فِي الْعَقْلِ وَ فِي الْحفْظِ، فَاحْتَجِمُوا علَىَ بَرَكَةِ اللهِ يَوْمَ الْخَمِيسِ، وَ اجْتَنِبُوا الْحجَامَةَ يَوْمَ الأَرْبَعاءِ وَ الْجُمُعَةِ وَ السَّبْتِ وَ يَوْمَ الأَحَدِ، تَحَرِّياً، وَ احْتَجِمُوا يَوْمَ الإِثْـنَيْنِ وَ الثُّلاثَـاءِ فَإِنَّهُ الْيَوْمُ الَّذِي عَافَىَ اللهُ فِيْهِ أَيُّوبَ مِنَ الْبَلاءِ، وَضَرَبَهُ بِالْبَلاءِ يَوْمَ الأَرْبَعاءِ، فَإِنَّهُ لا يَبْدُو جُذَامٌ وَ لا بَرَصٌ إِلاَّ فِي يَوْمِ الأَرْبَعَاءِ أَوْ لَيْلَةَ الأَرْبَعاءِ ﴾ ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٣١٥٩ ) في صحيح الجامع

إبن عمر وتی: ئەی نافع ئەوا خوێنەکەم هەڵچووە، بزانە خوێن گرێکم بۆ پەیدا بکە، وە ئەگەر توانیت با کەسێکی نەرم و نیان بێت، وە با پیرێکی گەورە نەبێت و با گەنجێکی منداڵیش نەبێت، وە من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( خوێنی پیس گرتن لەسەر برسێتی باشترە، وە شیفاو بەرەکەتی تێدایە. وە دەبێتە هۆی زیاد بوونی عەقڵ و لەبەرکردن، جا لەسەر بەرەکەتی خوا لە ڕۆژی پێنج شەممەدا ئەو خوێن گرتنە ( کەڵە شاخییە ) بکەن، وە ئەو خوێن گرتنە لە ڕۆژی چوار شەممەو هەینی و شەممە و ڕۆژی یەك شەممەدا مەکەن و خۆتانی لێ بپارێزن. بۆ زیاتر دڵنیایی، لە ڕۆژی دووشەممەو سێ شەممەدا کەڵە شاخی بکەن، چونکە ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە ئەیوبی تێدا چاك کردۆتەوە وە رزگاری کرد لە بەڵاکەی. وە لە ڕۆژی چوار شەممەدا بوو کە ئەو بەڵایە لێ ی دا، وەهیچ ئیفلیجی وگەڕییەك سەر هەڵنادات و دەرناکەوێت تەنها لە ڕۆژی چوار شەممە یان لە شەوی چوار شەممەدا نەبێت ).

## ( ٩ ) ( گرنگی دومبەڵان )

( ٧٥٥ ) ( م هـ ) عنْ سعيد بن زَيْد بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ قَال: قَال رسُولُ الله(ﷺ): ﴿ الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ الَّذِي أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَىَ عَلَىَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَ مَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٩٨ ) في صحيح الجامع

سعیدی کوڕی زیدی کوڕی عمرو کوڕی نفیل دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( دومبەڵان لەو گەزۆیەیە کە خوای گەورە دای بەزاند بەسەر بەنی ئیسرائیلدا، وە ئاوەکەیشی شیفایە بۆ چاو ).

## ( ١٠ ) ( نەخۆش نابێت زۆری لێ بکرێت بۆ خواردن و خواردنەوە )

( ٧٥٦ ) ( ت هـ ك ) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ وَ الشَّرَابِ فَإِنَّ اللهَ يُطْعِمُهُمْ وَ يَسْقِيهِمْ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٤٣٣) في صحيح الجامع

عقبەی کوڕی عامر دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بە زۆر نەخۆشەکانتان نا چار مەکەن لەسەر خواردن و خواردنەوە، چونکە خوای گەورە خواردن و خواردنەوەیان دەداتێ ).

## ( ١١ ) ( بڵاوبوونەوەی دەرد و پەتا )

( ٧٥٧ ) ( حم ت ) عن ابن مسعود قال: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ(ﷺ) فَقَالَ: ﴿ لايُعْدِي شَيْءٌ شَيْئاً ﴾ فَقَالَ أعْرَابِيٌ يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) الْبَعِيرُ أَجْرَبُ الْحَشْفَةَ نُدبِنُهُ فيجربُ الإبلِ كُلّهَا فقال رسولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ فَمَنْ أَجْرَبَ الأَوَّلَ؟ لاعَدْوَى وَلا صَفَرَ خَلَقَ اللهُ كُلَّ نَفْسٍ فَكَتَبَ حَيَاتَهَا وَ رِزْقَهَا وَ مَصَائِبَهَا ﴾ و اللفظ للترمذي. (حسن) أنظر حيث رقم (٧٧٣٢) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە ناوماندا هەستاو و فەرمووی: ( شتێك شتێکی تر توش ناکات)، عەرەبێکی دەشتەکیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حوشترە گەڕێك بەربدەین، حوشترەکانی تر هەمووی گەڕ دەکات. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ( ئەی کێ ئەوەی یەکەم جاری گەڕ کرد ؟ نە لێك توش بوون و نە (صفر) نی یە .خوای گەورە هەموو نەفسێکی دروست کردووە و ژیانی و رزقی و نەهامەتیەکانیشی بۆ نووسیوە ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

صَفَر: یەکێك لە دوو مانا هەڵدەگرێت:

**یەکەمیان:** کرمێکە تووشی سکی مرۆڤ و ئاژەڵ دەبێت و زۆر جاریش دەبێتە هۆی مردن، وە وەك پەتا بڵاودەبێتەوە و لای عەرەب لە گەڕیی ترسناك ترە، ئەمە بۆچوونی ئیمامی( بخاري و ئیمامی طبري )ە

**دووەمیان:** مەبەست پێی مانگی (سەفەرە)، چونکە عەرەب مانگی سەفەریان حەرام دەکرد و مانگی (محرم)یان حەلاڵ دەکرد، هەتا ئیسلام بەتاڵی کردەوە. ابن بطال دەڵێ: ئەم بۆچونەیان لە ئیمامی ( مالك ) ەوە گێڕدراوەتەوە، وە فەرموودەکەش دەیەوێت ئەو راستییە لە موسڵمانان بگەیەنێت کە هیچ

شتێك به بێ ڕه‌زامه‌ندی و ویستی خوا نه‌خۆشیه‌ك یان ده‌ردێك له‌ شتێكی تره‌وه‌ ناگرێت و توشی نابێت، وه‌ هه‌موو جۆره‌ نه‌خۆشییه‌ك له‌ لای خواوه‌ و به‌ویست و ئیراده‌ی ئه‌و داده‌به‌زێت و ئه‌و دروست كه‌ریه‌تی، نه‌ك وا تێبگه‌ین كه‌ ئه‌و نه‌خۆشییه‌ هه‌ر خۆی به‌ خۆ دروست ده‌بێت و هه‌ر خۆیشی بڵاو ده‌بێته‌وه‌ و ویستی خوای تێدا نییه‌، وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌ عه‌ره‌به‌ موشریكه‌كان پێشتر قه‌ناعه‌تیان وابوو، وه‌ هه‌ر وه‌ك له‌ فه‌رمووده‌كانی پێشتریدا پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئاماژه‌ی پێ داوه‌ كه‌ هه‌موو جۆر نه‌خۆشی و ده‌رده‌كان له‌ لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه‌ و به‌ ویستی ئه‌ویش داده‌به‌زێت وه‌ له‌ هه‌مان كاتیشدا له‌گه‌ڵ دابه‌زاندنی هه‌ر جۆره‌ ده‌رد و نه‌خۆشی یه‌كه‌یشدا ده‌رمان و چاره‌سه‌ره‌كه‌یشی داده‌به‌زێت، وه‌ هانی موسڵمان ده‌دات كه‌ به‌ دوای ئه‌و چاره‌سه‌رانه‌دا بگه‌ڕێن و هه‌وڵیان بۆ بده‌ن و لێكۆڵینه‌وه‌ی پێویستیش بۆ دۆزینه‌وه‌یان بكه‌ن، به‌ڵام گرنگ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ بزانین توش بوون به‌ هه‌ر ده‌ردێك و چاكبوونه‌وه‌شیان یان چاك بوونه‌وه‌ له‌و ده‌رده‌، هه‌مووی هه‌ر به‌ قه‌ده‌ری خوایه‌ و كه‌س ناتوانێت له‌و قه‌ده‌ره‌ خواییه‌ لابدات.

# فەرموودەكان دەربارەی خواردن و خواردنەوە و سەربڕینی ئاژەڵ

## ( ١ ) ( فەزڵی شوكرانە ژمێری لەسەر نیعمەتەكان )

**(٧٥٨) ( حم م ت ن ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ الله تعالى ليرضى عن العبد أن يأكُل الأكلةَ فيحمدُهُ عليها أو يشربُ الشَّربةَ فيحمدُهُ عليها » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨١٦ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە رازی دەبێت لەو بەندەیەی كە خواردنێك دەخوات و سوپاسی ئەوی لەسەر دەكات، وە خواردنەوەیەك دەخواتەوە و سوپاسی ئەوی لەسەر دەكات ).

## ( ٢ ) ( حەرام بوونی مەی بە هەموو جۆرەكانی )

**(٧٥٩) ( طب هق ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ الله حرّم على أُمّتي الخمر و الميسر و المزر و الكوبة و الغُبيراء و زادني صلاة الوتر » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٧ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە لەسەر ئومەتەكەمی حەرام كردووە: مەی – عەرەق– و قومار و شەرابي گەنم يان جۆ و ياريكردن بە زار و شەرابي گەنمەشامی يان دانەوێڵە، وە نوێژی وەتریشی بۆ من زیاد كردووە ).

**(٧٦٠) ( هق ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ الله حَرَّمَ عليكُمُ الخَمر و المَيسر و الكوبة و الغُبَيْرَاء» ، وَقالَ: «كلّ مُسكرٍ حرامٌ» . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٨ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە مەی و قومار و یاری بە زار و شەرابي گەنمەشامی لەسەر حەرام كردوون)، وە فەرمووی: (هەموو شتێك كە سەرخۆش و مەستت بكات حەرامە ).

**(٧٦١) ( حم ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): « ثلاثةٌ قدْ حرّم الله عليهمُ الجنَّة: مُدمنُ الخَمْرِ و العاقّ و الدَّيوثُ الّذي يقرُّ في أهله الخبث » ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٥١ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( سێ جۆر كەسان بەهەشتیان لەسەر حەرام كراوە: ئەو كەسەی مودمنی شەرابە، وە رەنجێنەری دایك و باوك، وە ئەو گەوادەی كە چاوپۆشی لە بەدڕەوشتی خانەوادەكەی دەكات )

(٧٦٢) ( ن ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): « حرّم الله الخمر، و كلّ مُسْكر حرامٌ ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٩٧ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە مەی حەرام کردووە. وە هەر شتێکیش کە ببێتە هۆی سەرخۆشیی و مەستیی حەرامە ).

(٧٦٣) ( د ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): « كلّ مُخمر خمر، وكلّ مُسكر حرامٌ، و من شرب مُسْكراً بُجست صلاتُهُ أربعين صباحاً فإنْ تاب تاب الله عليه فإنْ عاد الرابعة كان حقاً على الله أنْ يسقيهُ من طينةُ الخبال » ،قيلَ وَمَا طِينَةُ الخَبَالِ يارَسُولَ الله(ﷺ)؟ قالَ: «صديدُ أهْل النار و منْ سقاهُ صغيراً لا يعْرفُ حلالهُ من حرامه كان حقا على الله أن يَسْقيهُ من طيْنة الخَبال ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٣٨ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەموو گەڕاوەیەك لە شەراب عەرەقە، وە هەموو سەرخۆشکەرێکیش حەرامە، وە هەر کەسێك شتێك بخواتەوە کە مەستی بکان ئەوا هەتا چل دانە ڕۆژ نوێژی لێ دادەبڕێت و وەرناگیرێت، جا ئەگەر تۆبەی کرد ئەوا خوا لێی دەبووڕێت، وە ئەگەر بۆ جاری چوارەم هەر گەڕایەوە سەر مەی خواردنەوەکە، ئەوە حەقی خۆیەتی کە خوای گەورە قوڕو لیتەیخەباڵی پێ نۆش بکات )، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا قوڕ و لیتەی خەباڵ چییە؟ فەرمووی:( کێم و جەراعەتی ئەهلی ئاگرە، وە هەر کەسێکیش مەی دەرخواردی منداڵێك بدات کە حەڵاڵ و حەرامی خۆی بۆ جیا نەکرێتەوە ئەوا حەقی خۆیەتی کە خوای گەورە لەو لیتەی خەباڵەی پێ نۆش بکات ).

(٧٦٤) ( حم م ن ) عن جابر قال: أنّ رَجُلاً قَدِمَ مِنْ جَيْشَانَ ( وَ جَيْشَان مِنْ اليَمَنِ ) فَسَأَلَ النَّبِيّ(ﷺ) عَنْ شَرَابٍ يَشْرَبُونَهُ بِأَرْضِهِمْ مِنْ الذُّرَةِ يُقَالُ لَهُ المِزْرُ؟ فَقَالَ النَّبِيّ(ﷺ): أَوَ مُسكرٌ هُوَ؟ قَالَ: نَعَم. قَالَ رَسُولُ الله(ﷺ): « كُلُّ مُسْكرٍ حرامٌ و إنّ عَلىَ الله لعَهْداً لمن يشْربُ المُسكر أنْ يسْقيهُ من طيْنة الخَبال »، قَالُوا يَارَسُولَ الله(ﷺ) وَمَا طِينَةُ الخَبَالِ؟ قَالَ: « عرقُ أهْل النَّار، أوْ عُصارةُ أهْل النَّار ». و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٥٤٨ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: کە پیاوێك لە ( جیشان ) ی یەمەنەوە هاتبوو، پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی شەرابێك کە لە خاکی ئەوان دەیخۆنەوە لە دانەوێڵە دروست دەکرێت پێی دەوترێت (مزر)؟پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئایا دەبێتە هۆی سەرخۆش بوون و مەست بوون؟ )، وتی: بەڵێ. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ( هەموو شتێکی مەست و سەرخۆشکەر حەرامە، وە خوای گەورە پەیمانی لەسەر خۆی داوە، کە هەر کەسێك شەرابي مەست کەر بنۆشێت. ئەوا ئەویش لە لیتەی خەباڵ پێ بنۆشێت ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لیتەی خەبال چی یە؟ فەرمووی: ( عەرەقی ئەهلی ئاگر، یان کێم و جەراعەتی ئەهلی ئاگرە ).

(٧٦٥) ( د ك ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ الله الْخَمْرَ وَ شَارِبَهَا وَ سَاقِيَهَا وَ بَائِعَهَا وَ مُبْتَاعَهَا وَ عَاصِرَهَا وَ مُعْتَصِرَهَا وَ حَامِلَهَا وَ الْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ وَ آكِل ثَمَنِهَا ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٩٠) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە نەفرەتی كردووە لە مەی. وە لەو كەسەش كە دەیخواتەوە، وە لەو ساقیەش كە مەی دەگێڕێت، وە لە فرۆشیارەكەی و، لە كڕیارەكەی و،لەوەش كە دەیگوشێت -دروستی دەكات -، وە لەوەش بۆی گوشراوە - بۆی دروست كراوە - وە لەوەش كە هەڵی دەگرێت و باری دەكات، وە لەوەش كە بۆی بار دەكرێت، وە لەوەشی كە نرخەكەی دەخوات )

(٧٦٦) ( حم ت ) عن ابن عمر ( حم ن ك ) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحاً فَإِنْ تَابَ تَابَ الله عَلَيْهِ فَإِنْ عَادَ لَمْ يَقْبَلِ الله لَهُ صَلاةً أَرْبَعِينَ صَباحاً فَإِنْ تَابَ تَابَ الله عَلَيْه فَإِنْ عَادَ لَمْ يَقْبَلِ الله لَهُ صَلاةً أَرْبَعِينَ صَباحاً فَإِنْ تَابَ تَابَ الله عَلَيْه فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ لَمْ يَقْبَلِ الله لَهُ صَلاةً أَرْبَعِينَ صَبَاحاً فَإِنْ تَابَ لَمْ يَتُبْ الله عَلَيْهِ وَ سَقَاهُ مِنْ نَهْرِ الْخَبَالِ ﴾. قيل: يَا أَبَا عَبْدِالرَّحْمن وَمَا نَهْرُ الْخَبالِ؟ قَالَ: نَهْرٌ مِنْ صَدِيد أَهْلِ النَّار. و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٣٠٤) في صحيح الجامع

إبن عمر و عبدالله ی كوڕی عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر كەسێك مەی بنۆشێت، چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، جا ئەگەر تۆبەی كرد ئەوا خوا لێی دەبووڕێت، جا ئەگەر بۆ جاری چوارەم گەڕایەوە سەری، ئەوا خوا چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگرێت، وە ئەگەر تۆبەشی كرد لێی قبوڵ ناكات، وە لە ڕوباری خەبالیشی پێ دەنۆشێت)وتیان: ئەی باوكی عبدالرحمن ڕوباری خەبال چییە؟ فەرمووی:ڕوبارێكە لە كێم و چڵكی جەستەی سووتاوی ئەهلی ئاگر ).

(٧٦٧) ( هـ ) عن عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ وَ سَكِرَ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أَرْبَعِينَ صَباحاً وَ إِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّار، فَإِنْ تَابَ تَابَ الله عَلَيْه وَ إِنْ عَادَ فَشَرِبَ فَسَكِرَ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أَرْبَعِينَ صَباحاً فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ فَإِنْ تَابَ تَابَ الله عَلَيْه وَ إِنْ عَادَ فَشَرِبَ فَسَكِرَ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أَرْبَعِينَ صَباحاً فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّار فَإِنْ تَابَ تَابَ الله عَلَيْه فَإِنْ عَادَ كَانَ حَقاً عَلَى الله أَنْ يَسْقِيه مِنْ رَدْغَةِ الْخَبَالِ يَوْمَ الْقِيَامَة ﴾، قَالُوا: يارَسُولَ الله(ﷺ) وَمَا رَدْغَةُ الْخبالِ؟ قَالَ: ﴿ عُصَارَةُ أَهْلِ النَّار ﴾ (صحيح) انظر حيث رقم (٦٣١٢) في صحيح الجامع

عبدالله ی كوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر كەسێك مەی نۆشی و مەست بوو، چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت. وە ئەگەر بشمرێت دەچێتە ئاگرەوە، وە ئەگەر تۆبەی كرد خوا لێی دەبووڕێت، وە ئەگەر گەڕایەوە و جارێكی تر خواردیەوە و سەرخۆش بووەوە. ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، وە ئەگەر بمرێت دەچێتە ئاگرەوە، وە ئەگەر گەڕایەوە و خواردیەوە و سەرخۆش بوو. چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت. وە ئەگەر مردیش دەچێتە ئاگرەوە. وە ئەگەر تۆبەشی كرد خوا تۆبەكەی لێ

وەردەگرێت، وە ئەگەر گەڕایەوە، ئەوا خوا کردوویەتی بە هەق بە سەر خۆیەوە کە لە قوڕ و لیتاوی خەبالی پێ بنۆشێت لە ڕۆژی قیامەتدا) ،ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا قوڕ و لیتاوی خەبال چییە؟ فەرمووی: ( گوشراوەی ئەهلی ئاگر ).

**(٧٦٨) ( ن ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَشْرَبُ الْخَمْرَ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي فَيَقْبَلَ اللهُ مِنْهُ صَلاةً أَرْبَعِيْنَ يَوْماً ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٧١٣ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هیچ پیاوێك نییە لە ئومەتەکەم کە مەی بخواتەوە و خوای گەورە هەتا چل ڕۆژنوێژی لێ قبوڵ بکات ).

**(٧٦٩) ( طب حل ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ مَاتَ وَ هُوَ مُدْمِنُ الْخَمْرِ لَقِيَ اللهَ وَ هُوَ كَعَابِدِ وَثَـنٍ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٤٥ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر کەسێك لەسەر ئیدمان بوونی عەرەق بمرێت، ئەوا وەك بت پەرست دەچێتە بەردەمی خوا ).

## ( ٣ ) ( خواردەمەنی )

**(٧٧٠) ( ع حب هب الضياء ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الطَّعَامِ إِلَى اللهِ مَا كَثُـرَتْ عَلَيْهِ الأَيْدِي ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧١ ) في صحيح الجامع**

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خۆشەویسترینی خواردن لە لای خوا ئەوەیە کە دەستەکان لەسەری زۆر و قەرەباڵغ بن ).

**(٧٧١) ( هـ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَفْشُوا السَّلامَ وَ أَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَ كُونُوا إِخْوَاناً كَما أَمَرَكُمُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٠٨٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( سەلام کردن لە نێوانتاندا بڵاو بکەنەوە، وە خواردن دەرخواردی خەڵك بدەن، وە ببنە برای یەکتر، هەر وەك چۆن خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە )

## ( ٤ ) ( سەربڕین )

**(٧٧٢) ( طس ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِذا حَكَمْتُمْ فَاعْدِلُوا وَ إِذا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا فَإِنَّ اللهَ مُحْسِنٌ يُحِبُّ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٩٤ ) في صحيح الجامع**

أنس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر حوکمتان کرد ئەوا دادپەروەر بن، وە ئەگەر کوشتاریشتان کرد ئەوا باش و چاك بیکەن، چونکە خوا چاکەکارە و چاکەکارانیشی خۆش دەوێت )

(٧٧٣) ( حم م ٤ ) عن شداد بن أوس قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَ الله تعالى كتَب الإحسان على كل شيء، فإذا قَتَلْتُمْ فَأحْسنُوا الْقتْلَةَ و إذا ذبحْتم فأحْسنُوا الذَّبْح، و ليَحدَ أحدُكُمْ شَفْرتهُ و لْيُرحْ ذبيْحته ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٩٥ ) في صحيح الجامع

شدادی کوڕی اوس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە چاکسازیی لەسەرهەموو شتێك واجب کردووە، جا ئەگەر کوشتارتان کرد، باش و چاك کوشتارەکە بکەن، وە ئەگەر سەربڕینیشتان کرد، ئەوا سەربڕینەکە باش بکەن، وە هەر یەکەتان با تیغەکەی تیژ بکاتەوە و سەربڕاوەکەی بحەوێنێتەوە ).

(٧٧٤) ( طب ) عن شداد بن أوس قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ الله مُحسنٌ يُحبُ الإحسان فإذا قَتَلْتمْ فأحْسنُوا الْقتْلَةَ و إذا ذبحْتمْ فأحْسنُوا الذّبح، و ليُحدَ أحدُكُم شفْرتهُ ثُمَ ليُرح ذبيحته » ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٢٤ ) في صحيح الجامع

شدادی کوڕی اوس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە چاکەکارە و چاکە کارانیشی خۆش دەوێت، جا ئەگەر کوشتارتان کرد، بە شێوەیەکی چاك کوشتارەکە بکەن، وە ئەگەر سەربڕینیشتان کرد، ئەوا سەربڕینەکە بە چاکی بکەن، وە هەریەکەتان با تیغەکەی تیژ بکاتەوە، پاشان سەربڕاوەکەی بحەوێنێتەوە ).

(٧٧٥) ( خد طب الضياء ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): « من رحم ولو ذبيحة عصفُور رحمهُ الله يوْم الْقيامة ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٤٦ ) في صحيح الجامع

ابو امامة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك رەحم ئەگەر بە سەربڕینی چۆلەکەیەك بکات، خوا لە قیامەتدا رەحمی پێ دەکات ).

# ( فەرموودەكانی بەرگ و پۆشاك و جوانكاری )

## ( ١ ) ( فەزڵی پۆشاكی باش )

**(٧٧٦) ( ٣ ك ) عن والد أبي الأحوص قال: قال رسول الله(ﷺ): « إذا آتاك الله مالاً فليُرَ أثرُ نعمة الله عليك و كرامته ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٤ ) في صحيح الجامع**

باوكی ابی الأحوص دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەمووی: ( ئەگەر خوا پارە و ماڵێكی دایتێ،ئەوا با شوێنەواری ئەو ڕێز و نیعمەتەی خوا بە سەرتەوە دیار بێت ).

**(٧٧٧) ( تخ طب الضياء ) عن زهير بن أبي علقمة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إذا آتاك الله مالاً فليُر عليْك فإنّ الله يُحبُّ أنْ يرى أثرهُ على عَبْده حسناً و لايحبُ البُؤس و لا التَّباؤس ». ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٥ ) في صحيح الجامع**

زوهەیری كوڕی ابی علقمة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا پارە و ماڵێكی پێ دایت با پێتەوە دیار بێت، چونكە خوا پێیخۆشە كە شوێنەوارەكەی بە باشی بە سەر بەندەكەیەوە دیار بێت، وە حەز بە داماوی و خۆ بە داماو پیشاندان ناكات ).

**(٧٧٨) ( طب هق ) عن عمران بن حصين قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ الله إذا أنْعم على عَبْد نعْمةً يُحبُّ أنْ يرى أثَـر نعْمته على عبْده ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧١٢ ) في صحيح الجامع**

عمرانی كوڕی حصين دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا نیعمەتێكی ڕشت بە سەر بەندەكەیدا پێی خۆشە كە شوێنەواری نیعمەتەكەی بەسەر بەندەكەیەوە دیار بێت ).

**(٧٧٩) ( هب ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ الله تعالى جميْلٌ يُحبُّ الْجمال و يُحبُّ أنْ يرى أثَـر نعْمته على عبده و يبْغضُ الْبُؤس و التَّباؤس ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٢ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا جوانە و حەزیشی بە جوانییە، وە حەز دەكات كە شوێنەواری نیعمەتی بە سەر بەندەكەیدا ببینرێت، وە ڕقی لە داماوی و خۆ بە داماو دەرخستنە ).

**(٧٨٠) ( م ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): « لايدْخل الْجنَّةَ منْ كانَ في قلْبه مثْقالُ ذرّة منَ كبْر، فقال رجلٌ: إنّ الرَّجُل يُحبُّ أنْ يكُون ثـوْبهُ حسناً و نعْلُهُ حسنةً، قال: إنّ الله جميلٌ يُحبُّ الْجمال، الكبْرُ بطرُ الحقّ وَ غمْطُ النَّاس ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٦٣٠ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر كەسێك هێندەی ئەندازەی تۆزقاڵە گەردێك لە فیز و خۆ بە زل زانین لە دڵیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە )، پیاوێكیش وتی: دەی پیاو حەز دەكات بەرگ و

پۆشاکەکەی باش بێت و پێڵاوی باش بێت، فەرمووی: ( خوا جوانە و حەزی بە جوانییە، فیز و خۆ بە زل گرتن بریتییە لە پێشێل کردنی حەق و بە کەم سەیر کردنی خەڵك ).

## ( ٢ ) ( زوهد کردن بە بەرگ و پۆشاك )

(٧٨١) ( ت ك ) عن معاذ بن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَرَكَ اللِّبَاسَ تَوَاضُعاً لله وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَيْه دَعَاهُ الله يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَىَ رُؤُوس الخَلائِقِ حَتَّى يُخَيِّرُهُ مِنْ أيِّ حُلَلِ الإِيْمانِ شَاءَ يَلْبَسُهَا ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٤٣ ) في صحيح الجامع

معاذی کوڕی انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر کەسێك بەرگ و پۆشاکێك لەبەر خوا واز لێ بهێنێت و دەسەڵاتیشی هەبێت بە سەریدا، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەر سەری ئەو هەموو خەڵکەوە بانگی دەکات، هەتا سەر پشکی دەکاتکە کامەی دەوەێت لە باڵاپۆشەکانی باوەڕ با لە بەری بکات ).

## ( ٣ ) ( زیادە ڕۆیی لە ڕازاندنەوەی ماڵدا )

(٧٨٢) ( م د ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعَالَىَ لَمْ يَأْمُرْنَا فِيْمَا رَزَقْنَا أَنْ نَكْسُوَ الحِجَارَةَ وَ اللَّبَنَ وَ الطِّينَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٠٤ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە لەو ڕزقەی کە پێی داوین فەرمانی پێ نەکردووین کە بەرد و خشت و قوڕ پەردەپۆش بکەین )

(٧٨٣) ( ت ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعَالَىَ يُحِبُّ أَنْ يَرَى أَثَـرَ نِعْمَتِه عَلَىَ عَبْدِه ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨٧ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە پێی خۆشە کە شوێنەواری نیعمەتی خۆی بەسەر بەندەکەیەوە ببینێت ).

## ( ٤ ) ( خۆ شوبهاندنی ژن و پیاو بە یەکتر )

(٧٨٤) ( د ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ المَرْأَةِ، وَ المَرْأَةُ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٠٩٤ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا نەفرەتی کردووە لەو پیاوەی کە بەرگی ئافرەت لەبەر دەکات وە لەو ئافرەتەش کە بەرگی پیاو لەبەر دەکات ).

(٧٨٥) ( د ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الرَّجُلَةَ مِنَ النِّسَاء ﴾ (صحيح) انظر حيث رقم (٥٠٩٥) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرووی: ( خوا نەفرەتی لەو ئافرەتانە كردووە كە چاولیكەری پیاو دەكەن )

(٧٨٦) ( حم د ت هـ ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ، وَ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٩٩) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەی كە خۆیان بە پیاو دەشوبهێنن. وە لەو پیاوانەش كە خۆیان بە ئافرەت دەشوبهێنن ).

(٧٨٧) ( خد ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَ الْمُتَرَجِّلاتِ مِنَ النِّسَاءِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥١٠٢) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا نەفرەتی لەو پیاوانە كردووە كە لەنجە و لاری وەك ئافرەت دەكەن. وە لەو ئافرەتانەش كە خۆیان وەك پیاو نیشان دەدەن ).

## (٥) ( خاڵ كوتان و موو هەڵكێشان )

(٧٨٨) ( حم ق ٤ ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْوَاشِمَاتِ وَ الْمُسْتَوْشِمَاتِ وَ النَّامِصَاتِ وَ الْمُتَنَمِّصَاتِ وَ الْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ ﴾ و النفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥١٠٣) في صحيح الجامع

إبن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا نەفرەتی كردووە لەوانەی كە خاڵ دەكوتن و لەوانەش كە خاڵەكەیان بۆ دەكوترێت. وە لەوانەش كە موو هەڵكێشی دەم و چاون و لەوانەش كە بۆیان هەڵدەكێشرێت. وە لەوانەش كە نێوانی دانەكانیان بڵاو دەكەنەوە بۆ جوانی و ئەوەی خوا دروستی كردووە دەست كاری دەكەن و دەیگۆڕن ).

## (٦) ( درێژ كردنی پرچ و پرچی دەستكرد )

(٧٨٩) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ وَ الْمُسْتَوْصِلَةَ وَ الْوَاشِمَةَ وَ الْمُسْتَوْشِمَةَ ﴾ و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥١٠٤) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا نەفرەتی كردووە لەوەی كە پرچی خۆی درێژ دەكاتەوە بە لكاندنی پرچی دەستكرد پێوەی. وە لەوەش كە كاری پرچ درێژكردنەوەكەی بۆ دەكات. وە لەوەی كە خاڵ دەكوتێت. وە لەوەی كە بۆی دەكوترێت ).

## روونكردنەوەی فەرموودەكە :

مرۆڤ دروست كراوێكی تایبەتی خوایە و هەر یەكەش لە مرۆڤەكان خوای گەورە شێوە و روخسارێكی تایبەتی پێ بەخشیوە و جیاوازە لە باقی مرۆڤەكانی تر،وە ئەوەی كە لەو فەرموودە پیرۆزەوە بۆمان دەردەكەوێت ئەوەیە كە خوا پێی ناخۆشە و نەفرەت لە كەسێك دەكات كە بییەوێت بە دەستی ئەنقەست و تەنها بە مەبەستی زیاتر خۆ جوان كردن و خۆ دەرخستن ئەو روخسار و شێوەیەی كە خوا پێی بەخشیوە بیگۆڕێت چونكە ئەوە ڕازی نەبوون بە بەشی خوا و بە حیكمەتی خوای گەورە دەگەیەنێت، و دەست تێوەردانیش لە كاری خوا پیشان دەدات، بەڵام پێویستە جیاوازی بكرێت لە نێوان خۆ جوانكردن و خۆ ڕازاندنەوە و ئارایشت كردن كە لە شوێنی خۆیدا ڕێی پێ دراوە و كارێكی پەسەندە، وە لەگەڵ دەستكاری كردن و گۆڕینی ئەو روخسار و شێوەیەی كە خوای گەورە پێی بەخشیون كە ئەمەیان نەشیاو و نەفرەت لێ كراوە.

هەروەها زاناكان ڕێگەیان بەوە داوە ئەگەر كەسێك عەیبێكی جەستەیی وا لە روخساریدا بێت كە روخساری شێواندبێت و عەیبداری كردبێت و ببێتە مایەی كێشە و ئازار بۆی لای ببات و هەوڵی چارەسەری بدات، چونكە ئەمەیان جودایە لەگەڵ دەست كاری كردن و گۆڕینی شێوە و روخسار لەبەر ئەوەی كە بە دڵت نییە.

## ( ٧ ) ( حەرام بوونی پۆشاكی ئاوریشم بۆ پیاو )

**(٧٩٠) ( خ د ) عن أبي عامر وأبي مالك الأشعري قالا: قال رسول الله(ﷺ): « ليكونَنَّ مِنْ أُمّتي أقْوامٌ يُسْتحلُّونَ الْخزَّ و الْحريْر و الْخمْر و الْمعازف و لينْزلنَّ أقْوامٌ إلى جنْب علم تَروحُ عليْهم سارحَتُهُم فيأْتيهمْ آتٍ لحاجته فيقُولُون لهُ: ارْجع إليْنا غداً فيُبيّتُهُمُ اللهُ وَ يقع الْعلم عليْهمْ و يمْسخُ منْهُمْ آخرين قردَةً وَ خنَازير إلى يوْم الْقيامة ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٤٥٧) في صحيح الجامع**

ابو عامر و ابو مالكی ئەشعەری دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( كەسانێك لە ئومەتەكەم پەیدا دەبن كە نەرمە موو و ئاوریشم و عەرەق و ئامێرەكانی مۆسیقا بە حەرام نازانن، وە كۆمەڵانێك لە پەنا چیایەكدا دادەبەزن ئێوارە شوان و وشتر گەلەكەیان دێتەوە لایان، ئینجا كەسێك دێتە لایان و داوای یارمەتییان لێ دەكات و ئەوانیش پێی دەڵێن:بەیانی بگەڕێوە بۆ لامان – واتە وەك گاڵتە پێ كردن- ئینجا خوای گەورە كە هەڵیان دەستێنێت چیاكە دەدات بە سەریاندا و ژمارەیەكی تریشیان روویان وەردەگێڕێت بۆ مەیمون و بەراز هەتا ڕۆژی قیامەت ).

## ( ٨ ) ( پۆشاکی درێژ بۆ فیز و دەعیە )

**(٧٩١) ( م ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): « منْ جرَ إزارهُ لا يُريْدُ بذلك إلا المخيلة ، فإنَ الله لاينْظُرُ إليه يوم القيامة ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٨٣ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك پۆشاکەکەی بەری بە دوای خۆیدا راکێشێت تەنها بە مەبەستی فیز و دەعیە، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا سەیری ناکات ).

**(٧٩٢) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): « منْ جرَ ثـوْبهُ خُيلاء لمْ ينْظر الله إليْه يوْم الْقيامة ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٨٧ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر کەسێك بۆ فیز و دەعیە پۆشاکی بەری راکێشێت، ئەوا خوا لە قیامەتدا سەیری ناکات ).

**(٧٩٣) ( د ) عن جابر بن سليم قال: قال رسول الله(ﷺ): « لا تسُبَنَ أحداً ولا تحْقرنَ من المعرُوف شيْئاً ولوْ أنْ تكلِّمَ أخاك و أنْت مُنبسطٌ إليه وجْهُك إنَ ذلك من الْمعْرُوف و ارْفعْ إزارك إلى نصْف السَاق فإنْ أبيْت فإلى الْكعْبيْن، و إيَاك و إسبال الإزار فإنَها من الْمخيلة و إنَ الله لايُحبُ الْمخيلةَ و إن امْرُؤٌ شتمك و عيَرك بمَا يعلمُ فيك فلا تُعيِّرْهُ بما تعْلَمُ فيْه فإنَمَا وبَالُ ذلك عليْه ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٢٩٧ ) في صحيح الجامع**

جابری کوڕی سلیم دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( جوێن بە کەس مەدە وە هیچ شتێکی باشت لا بێ نرخ و کەم نەبێت،ئەگەر تەنانەت هەر ئەوەندەش بێت کە کاتێك قسە لەگەڵ برادەرەکەتدا دەکەیت رووت خۆش بێت، چونکە ئەوەش هەر بە خێر و چاکە حیسابە ، وە پۆشاکەکەی بەرت بەرز بکەرەوە هەتا نیوەی لاقت، ئەگەر نا با هەتا هەردوو پاژنە پێت بێت، وە نەکەیت پۆشاکەکەت شۆڕ و درێژ بکەیت، چونکە ئەوە لە فیز و دەعیەوەیە، خواش فیز و دەعیەی پێ خۆش نییە، وە ئەگەر کەسێك جوێنی پێ دایت و گاڵتەی شتێکی پێ کردیت کە دەزانێت عەیبی تۆیە ، ئەوا تۆ بە شتێك عەیبداری مەکە و قسەی پێ مەڵێ، کە دەزانیت تیایدایە، ئیتر بەوە نۆباڵەکەی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو ).

**(٧٩٤) ( ق ت ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): « لا ينْظُرُ اللهُ إلى منْ جرَ ثـوبهُ خُيلاء ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٠٢ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا سەیری ئەو کەسە ناکات کە بۆ فیز و دەعیە پۆشاکەکەی رادەکێشێت ).

**(٧٩٥) ( حم خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « لا ينْظُرُ اللهُ يوْم الْقيامة إلى منْ جرَ إزارهُ بطراً ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٠٣ ) في صحيح الجامع**

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا سەیری کەسێك ناکات کە بۆ فیز و خۆ بە زل گرتن پۆشاکەکەی بە دوای خۆیدا رابکێشێت ).

(٧٩٦) ( حم هـ ) عن المغيرة بن شعبة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَاسُفيَانَ ابْنَ سَهْلٍ لاتُسْبِلْ إِزَارَكَ فَإِنَّ اللهَ لايُحِبُّ الْمُسْبِلِيْنَ ﴾ واللفظ لإبن ماجة. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩١٢) في صحيح الجامع

مغيرەی كوڕی شعبه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەی سوفیانی كوڕی سهل. پۆشاكت شۆڕ مەكەرەوە چونكە خوا پۆشاك شۆڕەكانی خۆش ناوێت ).

(٧٩٧) ( د هـ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ لَبِسَ ثَـوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَـوْباً مِثْلَهُ ثُمَّ يَلْهَبُ فِيْهِ النَّارُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٢٢) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: ( هەر كەسێك پۆشاكێكی خۆ نواندن لەبەر بكات. ئەوا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا پۆشاكێكی وەك ئەوەی لەبەر دەكات و پاشان ئاگری تێ بەر دەدات ).

# ( بەشی: پاراو بوونی دڵەکان )

## ( ١ ) ( نیشانەکانی خۆشەویستی خوایی )

**(٧٩٨) ( ت ك هب ) عن قتادة بن النعمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً حَمَاهُ فِي الدُّنْيَا كَمَا يَحْمِي أَحَدُكُمْ سَقِيمَهُ الْمَاءَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٨٢ ) في صحيح الجامع**

قتادة ی‌كوڕی نعمان دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: ( ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆش ویست لە دونیا دەیپارێزێت، هەر وەك چۆن یەكێكتان نەخۆشەكەی لە ئاو دەپارێزێت و نایداتێ )

**(٧٩٩) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً نَادَى جِبْرِيلَ: إنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاناً فَأَحِبَّهُ فَيُحِبَّهُ جِبْرِيلُ فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاناً فَأَحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الأَرْضِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٨٣ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆش ویست جبریل بانگ دەكات و پێی دەفەرموویێت: خوا فلانەكەسی خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێت، ئیتر جبریلیش خۆشی دەوێت، ئینجا جبریل لە ناو خەڵكی ئاسماندا بانگ دەكات: ئەوا خوا فلانە كەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بووێت، ئیتر خەڵكی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت، پاشان لە سەر زەویش رەزامەندی خەڵكی بۆ دادەنرێت ).

**(٨٠٠) ( ت ) عن أبي هريرة أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ إذا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً نَادَى جِبْرِيلَ: إنِّي قَدْ أَحْبَبْتُ فُلاناً فَأَحِبَّهُ، قال: فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تُنْزَلُ لَهُ الْمَحَبَّةُ فِي أهْلِ الأرْضِ، فَذَلكَ قَوْلُ اللهِ تَعالَى: ﴿ إنَّ الَّذِيْنَ آمَنُوا وَ عَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدّاً ﴾، وَ إذا أَبْغَضَ اللهُ عَبْداً نَادَى جِبْرِيلَ: إنِّي أَبْغَضْتُ فُلاناً فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تُنْزَلُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الأَرْضِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٨٤ ) في صحيح الجامع**

ابو هريره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆش ویست جبریل بانگ دەكات: ئەوا من فلانە كەسم خۆش ویستووە تۆش خۆشت بوێت )، فەرمووی: ( ئەویش لە ئاسماندا بانگ دەكات، پاشان خۆشەویستیی بۆ دادەبەزێتە سەر خەڵكی سەر زەوی، جا ئەوەیە فەرمایشتەكەی خوا: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾. واتە: ئەوانی باوەڕیان هێناوە و كاری چاكەیان كردووە ئەوانە خوای خاوەن سۆز و رەحم خۆشەویستییان پێ دەدات– وە ئەگەر خوای گەورە رقی بووەوە لە بەندەیەك، جبریل بانگ دەكات ئەوا من رقم لە فلان بۆتەوە، ئەویش لە ئاسماندا بانگ دەكات، پاشان بوغز و رقەكەی بۆ دادەبەزێتە سەر زەوی ).

(٨٠١) ( ضـ هب الضياء ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا أحبَّ اللهُ قوْماً ابتلاهم . (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٨٥) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا کۆمەڵێکی خۆش بووێت دووچاری بەڵا و تاقیکردنەوەیان دەکات ).

(٨٠٢) ( ت ك ) عن أنس ( طب ك هب ) عن عبدالله بن مغفل ( طب ) عن عمار بن ياسر ( عد ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ). ﴿ إذا أَرادَ اللهُ بعبْدِه الْخيْرَ عجَّلَ لهُ الْعُقُوبةَ في الدُّنْيا، و إذا أراد بعبْده الشَّر أمْسكَ عَنْهُ بذنْبه حتّى يُوافي به يوْمَ الْقيامَةَ ﴾ و اللفظ للترمذي. من حديث أنس رضي الله عنه. (صحيح) أنظر حديث رقم (٣٠٨) في صحيح الجامع

انس لە عبداللە ی کوڕی مغفل وە ئەویش لە عماری کوڕی یاسرە وە لە ابو هریرة وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا مەبەستی خێری بە بەندەی خۆی هەبوو، ئەوا سزای خۆی لە دونیا بۆ پێش دەخات، وە ئەگەر مەبەستی خراپی بە بەندەی خۆی هەبوو، ئەوا ئەوسزایەی کا شایەنیەتی بە هۆی تاوانەکانییەوە، لێی دەگرێتەوە هەتا لە ڕۆژی قیامەتدا پێی بنوێنێت ).

(٨٠٣) ( حم تخ هب ) عن عائشة ( البزار ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا أراد اللهُ بأهْلِ بيْتٍ خيْراً أدْخل عليْهِمُ الرِّفْقَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٠٣) في صحيح الجامع

عائشە لە جابرە وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر خوا مەبەستی خێری بە خانەوادەیەك هەبێت ئەوا نەرم و نیانییان بە سەردا دەڕژێنێت ).

## ( ٢ ) ( زاهد بوون لەسەر دونیا )

(٨٠٤) ( ه طب ك هب ) عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إزْهدْ في الدُّنْيا يُحبُّكَ اللهُ، و ازْهدْ فيْما عنْدَ النّاس يحبُّك النَّاس ﴾. و اللفظ لإبن ماجة. (صحيح) أنظر حيث رقم (٩٢٢) في صحيح الجامع

سهلی کوڕی سعد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( زاهد بە لە دونیا و بە کەم سەیری بکە خوا خۆشی دەوێت، وە زاهد و بێ تەماع بە لەوەی کە خەڵك هەیەتی خەڵکیش خۆشی دەوێت ).

(٨٠٥) ( حل ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ازْهدْ في الدُّنْيا يُحبُّكَ الله، و أمّا النَّاسُ فانْبذْ إليْهم هذا يُحبُّوك ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٩٢٣) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( زاهد و دەست بەرداری دونیا بە، خوا خۆشی دەوێت، وە خەڵکیش ئائەوەیان بۆ فڕێدە ئینجا خۆشیان دەوێت ).

## ( ٣ ) ( شەرم كردن لە خوا )

(٨٠٦) ( حم ت ك هب ) عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): « استحيوا من الله تعالى حقَّ الحياء». قال: قُلنا: يا نبيَ الله(ﷺ) إنَا لَنَستَحيي وَالحَمدُ لله،قال: « ليس ذاك ولكنَ الإستحياء من الله حقَّ الحَياء أنْ تحفظ الرأس و ما وعى، و تحفظ البطن و ما حوى، و تتذكَر الموت و البلى، و مَنْ أراد الآخرَةَ ترك زينة الدنيا. فمنْ فعل ذلك فقد استحيى يعني من الله حقَّ الحياء ». و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٩٣٥ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( شەرم لە خوا بکەن شەرمێکی شایستە )، وتی: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە شەرم دەکەین سوپاس بۆ خوا، فەرمووی: ( ئەوە نییە بەڵکو شەرم کردن لە خوا شەرمێکی شایستە ئەوەیە کە سەر و هەرچی لە خۆی گرتووە بیپارێزیت، وە سک و هەرچییەکی تێدایە بیپارێزی، وە مردن و ئێسك رزینت لە یاد بێت،وە هەر کەس ئاخیرەتی بوویت زینەت و جوانی دونیا واز لێ دێنێت،جا هەر کەس ئەوەی کرد ئیتر ئەوە شەرمی کردووە لە خوا شەرمێکی شایستە ).

## ( ٤ ) ( نیشانەکانی خۆشەویستی خوای گەورە )

(٨٠٧) ( م ) عن أبي هريرة قال:قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ الله تعالى إذا أحبَ عبداً، دعا جبْرِيلَ فَقَالَ: إنّي أحبُّ فُلاناً فأحبَهُ، فيُحبُهُ جبريلُ، ثُمَ يُنادي في السَماء فيقُولُ: إنَ الله تعالى يُحبُّ فُلاناً فَأحبُوهُ فيُحبُهُ أهْلُ السَماء، ثُمَّ يُوضَعُ لهُ القَبُول في الأرْض، و إذا أبْغض عبْداً دعا جبْرِيلَ فيَقُولُ: إنّي أبْغَضُ فُلاناً فأبغضْهُ، فيبْغضُهُ جبريلُ، ثُمَ يُنادي في أهْل السَماء: إنَ الله يبغَضُ فُلاناً فَأبْغضُوهُ، فيبْغضُونَهُ، ثُمَ يُوضَعُ لهُ البغْضاءُ في الأرْض ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٠٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا ئەگەر بەندەیەکی خۆش ویست، جبریل بانگ دەکات و پێی دەفەرموێت: من فلانە کەسم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێت )، فەرمووی: ( ئیتر جبریل خۆشی دەوێت، پاشان بانگ دەکات لە ئاسماندا و دەڵێت: خوا فلانە کەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت، ئیتر خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت )، فەرمووی: ( پاشان لە سەر زەویش رەزامەندی لە دڵی خەڵك بۆ دەچەسپێنرێت، وە ئەگەر رقی لە بەندەیەك بوو جبریل بانگ دەکات و پێی دەفەرموێت: من رقم لە فلانە تۆش رقت لێی بێت )، فەرمووی: ( ئیتر جبریل رقی لێی دەبێت. پاشان بانگ دەکات لە ناو خەڵکی ئاسماندا، خوا رقی لە فلانە ئێوەش رقتان لێی بێت )، فەرمووی: ئەوانیش رقیان لێی دەبێت، پاشانیش لەسەر زەویدا رق و قینی لە دڵی خەڵکدا بۆ دادەنرێت ).

## ( ٥ ) ( خۆ بەکەم گرتن - التواضع - )

( ٨٠٨ ) ( م د هـ ) عن عياض بن حمار قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ أَوْحَى إِلَيَّ: أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لايَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَىَ أَحَدٍ وَلا يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَىَ أَحَدٍ ﴾ و اللفظ لابي داود. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٢٥ ) في صحيح الجامع

عياض ى كوڕى حمار دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە وەحی بۆ ناردم کە: خۆ بەکەم زان و بێ فیز بن هەتا کەس فەخر بەسەر کەسدا نەکات، وە هەتا کەس دەست درێژی بۆ سەر کەس نەکات ).

( ٨٠٩ ) ( خد هـ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَىَ أَوْحَىَ إِلَيَّ: أَنْ تَوَاضَعُوا وَلا يَبْغِي بَعْضُكُمْ عَلَىَ بَعْضٍ ﴾ واللفظ لإبن ماجة. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٢٦ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا وەحی بۆ ناردم کە: خۆ بە کەم زان و بێ فیز بن، وە هەندێکتان دەست درێژی مەکەنە سەر هەندێکی ترتان ).

## ( ٦ ) ( فەزڵی ڕەوشت بەرزی )

( ٨١٠ ) ( طس ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَىَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ وَ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ وَ يَكْرَهُ سَفْسَافَهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٣ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە جوانە و حەزی بە جوانییە، وە حەز بە ڕەوشتە جوانەکان دەکات و ڕقی لە ڕەوشتە نزم و سوکەکانە ).

( ٨١١ ) ( طب حل ك هب ) عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ وَ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ وَ يَكْرَهُ سَفْسَافَهَا ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٠١ ) في صحيح الجامع

سهل ى كوڕى سعد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە خاوەن کەرەم و بەخشندە و حەزی بە بەخشندە، وە ڕەوشتە بەرزەکانی خۆش دەوێت و ڕقی لە ڕەوشتە نزم و سوکەکانە ).

( ٨١٢ ) ( هب ) عن طلحة بن عبيدالله ( حل ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَىَ جَوَادٌ يُحِبُّ الْجُودَ وَ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ وَ يَكْرَهُ سَفْسَافَهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٤ ) في صحيح الجامع

طلحة ى کوڕی عبيدالله وإبن عباس دەڵێن : پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە خاوەنی بەخشینی زۆرە وحەزی لە بەخشینی زۆرە .وە حەزی لە ڕەوشتە بەرزەکانەو ڕقی لە ڕەوشتە نزم و سوکەکانە )

## ( ٧ ) ( فەزڵی جود و سەخاوەت )

( ٨١٣ ) ( البزار ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ وَ يُعْطِي عَلَيْهِ مَالا يُعْطِي عَلىَ الْعُنْفِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٧١ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوا خاوەن نەرم و نیانییە و حەزیشی بە نەرم و نیانییە، وە ئەوەی لەسەر نەرم و نیانی دەیدات، لەسەر توند و تیژی نایدات ).

( ٨١٤ ) ( خ ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّه ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨١ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوا لەهەموو کارەکانیدا حەزی بە نەرم و نیانییە )

( ٨١٥ ) ( طب ) عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ وَ يَكْرَهُ سَفْسَافَهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨٩ ) في صحيح الجامع

سهل ی کوڕی سعد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویـەتی: ( خوا رەوشتە بەرزەکانی خۆش دەوێت و رقی لە نزم و سوکەکانێتی ).

( ٨١٦ ) ( طب ) عن الحسين بن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأُمُورِ وَ أَشْرَافَهَا وَ يَكْرَهُ سَفْسَافَهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٩٠ ) في صحيح الجامع

حسن ی کوڕی عەلی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویـەتی: ( خوا حەزی لە کارە بەرز و بەرێزەکانە. وە رقی لە سوک و خراپەکانە ).

## ( ٨ ) ( فەزڵی لێبوردن )

( ٨١٧ ) ( ك ) عن ابن مسعود ( عد ) عن عبدالله بن جعفر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ عَفُوٌ يُحِبُّ الْعَفْوَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٧٩ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود لە عبدالله ی کوڕی جعفرە وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی. ( خوای گەورە لێبوردەیە و حەزی بە لێبووردنە ).

## ( ٩ ) ( تەماع کاری )

( ٨١٨ ) ( حم طب ) عن أبي واقد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله قَالَ: إنَّا أَنْزَلْنَا الْمَالَ لإِقَامِ الصَّلاةِ وَ إِيْتَاءِ الزَّكَاةِ وَ لَوْ كَانَ لابْنِ آدَمَ وَاد لأَحَبَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ ثَـان وَلَوْ كَانَ لَهُ وَادِيانِ لأَحَبَّ

أنْ يَكُون لهُما ثـالث ولا يمْلأُ جوْف ابن آدم إلاّ التُراب، ثُـمَّ يتُوبُ اللهُ على منْ تـاب ». (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٨١) في صحيح الجامع

ابي واقد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە فەرمــوویەتی: ئێمە ماڵ و سامانمان دابەزاندووە بۆ راگرتنی نوێژەکان و دانی زەکات، بەنی ئادەمیش ئەگەر پڕ دۆڵێکی هەبێت، هەر حەز دەکات کە دانەیەکی تریشی هەبێت، وە ئەگەر دوانیشی هەبێت هەر حەز دەکات کە سێ هەمێشی هەبێت، وە بۆشایی سکی بەنی ئادەمیش هیچ شتێك پڕی ناکاتەوە خۆڵ نەبێت، وە خوای گەورەش لە هەر کەس ببورێت ئەوا دەبورێت ).

## (١٠) ( فەزڵی ئەولیا و دۆستانی خوا )

( ٨١٩ ) ( خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسـول الله(ﷺ): « إنَّ الله تعالى قـالَ: منْ عادى لي وَلياً فقدْ آذنْتُهُ بـالحرْب ومَا تَقرَّب إليَّ عبْدي بشيْء أحبَّ إليَّ مما افْترضْتُهُ عليْه، وَ ما يزالُ عبْدي يتَقرَّبُ إليَ بـالنَّوافل حتَّى أحبَهُ فإذا أحْببْتهُ كُنْتُ سمْعَهُ الَّذي يَسْمَعُ به وَ بصرهُ الَّذي يبْصرُ به وَ يدَهُ الَّتي يبْطشُ بهَا و رجْله الَّتي يمْشي بها وَ إنْ سألَني لأعْطيَنَهُ وَ إن اسْتَعاذني لأعيذَنَّهُ ومَا ترددتُ عنْ شيْءٍ أنَا فَاعله ترددي عنْ قبض نفْس المُؤْمن يكْرهُ الموْتَ وَ أنَا أكْرَهُ مُساءته ». (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٨٢) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە فەرمــوویەتی: هەر کەسێك دوژمنایەتی دۆستێکی من بکات، ئەوا با بزانێت من جەنگی لەگەڵ دەکەم، وە بەندەی من بە هیچ شتێکی هێندە خۆی لەمن نزیك ناکاتەوە کە لام خۆشەویستر بێت لەوەی کە لەسەریم فەرز کردووە، وە بەندەکەم بەردەوام لێم نزیك دەبێتەوە بە ئەنجام دانی سوننەتەکان هەتا خۆشم دەوێت، جا ئەگەر خۆشم ویست، ئیتر من ئەو گوێیەی دەبم کە پێی دەبیستێت،وە ئەو چاوەی دەبم کە پێی دەبینێت، وە ئەو دەستەی دەبم کە دەیوەشێنێت ،وە ئەو قاچەی دەبم کە پێی دەڕوات، وە ئەگەر داوای لێ کردم دەیدەمێ، وە ئەگەر پەنای پێ گرتم پەنای دەدەم، وە لە هیچ شتێکدا دو دڵ نەبووم کە من بیکەم وەك دوو دڵیم لە کێشانی گیانی بڕوادارێك، ئەو پێی ناخۆشە بمرێت و منیش پێم ناخۆشە ئازاری بدەم ).

( ٨٢٠ ) ( الحكيم ) عن ابن عباس قال: قال رسـول الله(ﷺ): « أوْلياءُ الله تعالى: الَّذيْن إذا رُءوا ذُكر الله تعالى ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٥٤١) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەولیا و دۆستانی خوا ئەوانەن کە هەر کات بینران، خوای گەورە یاد دەکرێتەوە ).

## ( ١١ ) ( بەدی بەدکار )

(٨٢١) ( حم ) عن اسامة بن زيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ الله لايحبُّ كُلَّ فاحشٍ مُتفحشٍ » (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٥٠) في صحيح الجامع

اسامەی کوڕی زید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە هەموو بەدێکی بەد کاری خوش ناوێت).

( ٨٢٢ ) ( حم ) عن أسامة بن زيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ الله تعالى يبْغضُ الفاحش المُتفحش » . (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٧٧) في صحيح الجامع

اسامەی کوڕی زید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە رقی لە بەدی بەد کارە ).

( ٨٢٣ ) ( د ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): « يا عائشةُ إنَّ الله لايُحبُّ الفاحش المُتفحش » . (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٢١) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەی عائشە خوای گەورە بەدی بەدکاری خۆش ناوێت ).

( ٨٢٤ ) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): « مه يا عائشةُ! فإنَّ الله لايُحبُّ الفاحش المتفحّش » (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٦٢٥) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:( بەس ئەی عائشە ،چونکە خوای گەورە بەدی بەدکاری خۆش ناوێت ).

### روونکردنەوە فەرمودە:

**فاحِش**: ئەو کەسەیە کە هەر لە پێکهاتەیدا کارو قسە و رەفتار و رەوشتی بە بەدو خراپ هەڵکەوتووە .

**مُتَفَحِش**: ئەو کەسەیە کە وتە و قسەو کاری بەد و خراپ ئەنجام دەدات .

## ( ١٢ ) ( دەوڵەمەندی لە خوا ترس )

( ٨٢٥ ) ( حم م ) عن سعد بن أبي وقاص قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ الله تعالى يُحبُّ العَبْدَ التّقيَّ الغَنيَّ الخفيَّ » . واللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٨٢) في صحيح الجامع

سعدی کوڕی أبي وقاص دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا بەندەی لە خوا ترس و پارێزکاری دەوڵەمەندی شاراوەی خۆش دەوێت ).

## ڕوونكردنەوەی فەرموودەكە :

واته كەسێك كه دەوڵەمەند بێت له هەمان كات پارێزكار بێت و تێكەڵ به حەرام نەبێت و له خوا بترسێت، وه هەروەها شاراوه بێت واته خەڵك به حاڵی نەزانێت و حەزی به خۆ دەرخستن نەبێت ئەوا خوای گەوره بەندەی لەوجۆرەی خۆش دەوێت ).

## ( ١٣ ) ( خۆ تەرخان كردن بۆ بەندایەتی خوای گەوره )

( ٨٢٦ ) ( **حم ت هـ ك** ) **عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله تَعالىَ يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي أَمْلأُ صَدْرَكَ غِنَىً وَ أَسُدَّ فَقْرَكَ وَ إن لا تَفْعَلْ مَلأتُ يَدَيْكَ شُغْلا وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ ﴾. و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩١٤ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەوره دەفەرموێت: ئەی بەنی ئادەم خۆت دەست بەتاڵ بكه بۆ بەندایەتی كردنی من، منیش سنگت پڕ دەكەم له دەوڵەمەندی و هەژاریەكەیشت بۆ دەگرم و لای دەبەم، وه ئەگەر وات نەكرد ئەوا هەردوو دەستت پڕ لەكار دەكەم، هەژاریەكەیشت بۆ ناگرم)

## ( ١٤ ) ( فەزڵی ڕەحم و بەزەیی )

( ٨٢٧ ) ( **طب** ) **عن جرير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّمَا يَرْحَمُ الله مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٣٧٣ ) في صحيح الجامع**

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەوره له ناو بەندەكانیدا ڕەحم بەوانه دەكات كه بەڕەحمن ).

## ( ١٥ ) ( خۆشەویستی لەبەر خوا )

( ٨٢٨ ) ( **خد حب ك** ) **عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاتَحَابَ اثْنَانِ فِي الله تَعالىَ إلاَّ كَانَ أَفْضَلُهُمَا أَشَدُّهُمَا حُباً لِصَاحِبِهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٨٥ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر دوو كەسێك لەبەر خوا یەكتریان خۆش بووێت ئەوا باشترینیان ئەو یەكەیانه كه زیـاتر هاوڕێكەی خۆی خۆش دەویت ).

# (( بەشی: ئاکارو رەوشتەکان ))

## (١) ( خەون بینین )

( ٨٢٩ ) ( ق د ت ) عن أبي قتادة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ وَ الْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِذا رَأى أَحَدُكُمْ شَيْئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفِثْ حِيْنَ يَسْتَيْقِظ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثاً وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لا تَضُرَّهُ** ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٣٥٠١ ) في صحيح الجامع

أبو قتاده دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خەون بینینی باش لە خواوەیە. وە خەونی خراپیش لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان شتێکی بینی و پێی ناخۆش بوو، با کە بە ئاگا هاتەوە سێ جار فوو بکات بەلای چەپیدا، وە با پەنا بەخوا بگرێت لەشەڕ و لە زەرەری خەونەکە. ئیتر زیانی پێ ناگەیەنێت ).

( ٨٣٠ ) ( م ) عن أبي قتادة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ وَ الرُّؤْيَا السَّوْءُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأى رُؤْيَا فَكَرِهَ مِنْهَا شَيْئاً فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِه وَ لْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، لا تَضُرَّهُ، وَلا يُخْبِرَ بِهَا أَحَداً، فَإِنْ رَأى رُؤْيَا حَسَنَةً فَلْيُبْشِرْ، وَلا يُخْبِرَ بِهَا إِلاَّ مَنْ يُحِب** ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٣٥٣١ ) في صحيح الجامع

أبي قتادة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( خەوی چاك لە خواوەیە، وە خەوی خراپیش لە شەیتانەوەیە، جا هەر کەسێك خەوێکی بینی و شتێکی پێ ناخۆش بوو تیایدا، باسێ جار فوو بەلای چەپیدا بکات، وە با پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان. ئیتر زیانی پێ ناگەیەنێت. وە بابۆ کەسی نەگێڕێتەوە، وە ئەگەر خەوێکی باشی بینی با پێی شادومان بێت. وەنەشی گێڕێتەوە تەنها بۆ کەسێك نەبێت کە خۆشی بوێت )

( ٨٣١ ) ( هـ ) عن أبي قتادة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **الرُّؤْيَا مِنَ اللهِ وَ الْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذا رَأى أَحَدُكُمْ شَيْئاً يَكْرَهُهَا، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثاً وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ثَلاثاً، وَ لْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ** ﴾ ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٣٥٢٣ ) في صحيح الجامع

أبي قتاده دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( خەونی باش لەخواوەیە و، خەوی خراپیش لەشەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی بینی پێی ناخۆش بوو، با سێ جار تف بەلای چەپیدا بکات. وە با سێ جار پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان، وە با لەسەر ئەو لایەی وەرچەخێت کەلەسەری خەوتبوو ).

**(٨٣٢) ( حم خ هـ ) عن أبي سعيد الخدري أنه سمع النبي(ﷺ) يقول: « إذا رأى أحدُكُم الرؤيا يُحبُها فإنَّما هي منْ الله فلْيحمْد الله عليْها وليُحدثْ بها و إذا رأى غير ذلك ممَّا يكرَهُهُ فإنَّما هي من الشيْطان فلْيستعذْ بالله من شرّها ولا يذْكُرها لأحد فإنّها لا تضُرُّهُ » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٤٩ ) في صحيح الجامع**

له ئه‌بی سه‌عیدی خدری یه‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوای(ﷺ) بیستووه ده‌یفه‌رموو (ئه‌گه‌ر یه‌کێکتان خه‌ونێکی بینی پێی خۆش بوو، ئه‌وه له‌لای خواوه‌یه‌و با سوپاسی خوای له‌سه‌ر بکات، وه ئه‌وه‌یشی که بینوویه‌تی با بیگێڕێته‌وه، وه‌ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی که بینی وا نه‌بوو وه به جۆرێك بوو که‌پێی ناخۆش بێت، ئه‌وه له‌شه‌یتانه‌وه‌یه، جا با په‌نا بگرێت به خوا له‌شه‌ڕو له‌زه‌ره‌ری وه با بۆ هیچ که‌سێکی نه‌گێڕێته‌وه، ئیتر ئاوا زیانی پێ ناگه‌یه‌نێت ).

**( ٨٣٣ ) ( حم خ هـ ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « إذا رأى أحدُكُمْ الرؤيا يُحبُها فإنَّمَا هي من الله فَلْيحْمَد الله عليْها و ليُحدّثْ بها و إذا رأى غيْر ذلك ممَّا يكرهُ فإنَّما هي من الشَّيْطانِ فَلْيَستعذْ بالله منْ شرّهَا ولا يذْكُرها لأحد فإنَّها لا تضُرُّهُ » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٠ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمـوویه‌تی: ( ئه‌گه‌ر یه‌کێکتان خه‌ونێکی بینی پێی خۆش بوو، ئه‌وه له‌لای خوای گه‌وره‌وه‌یه، جا با سوپاسی خوای گه‌وره‌ی له‌سه‌ر بکات، وه با بیگێڕێته‌وه، وه ئه‌گه‌ر وانه‌بوو به‌ڵکو شتێکی بینی که پێی ناخۆش بوو، ئه‌وه له‌شه‌یتانه‌وه‌یه، جا با په‌نا بگرێت به خوا له‌شه‌ڕو زیانی خه‌وه‌که، وه با بۆ که‌سی نه‌گێڕێته‌وه، ئیتر ئه‌وه زیانی پێ ناگه‌یه‌نێت ).

## ( ٢ ) ( جۆره‌كانی خه‌ون )

**( ٨٣٤ ) ( ت هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « الرؤيا ثلاثـةٌ فَبُشْرى منَ الله، و حَديْثُ النَفْس، و تَخْويْفٌ منَ الشيْطان. فإذا رأى أحد كُم رُؤيا تُعجبُهُ فلْيقُصها إنْ شاء على أحد. وَ إنْ رأى شيْئاً يَكْرَهُهُ فَلا يَقُصَّهُ على أحد وَ لْيَقُمْ يُصلي، و أَكْرَهُ الغُلَّ و أحبُّ القَيْدَ والقَيْدُ ثَباتٌ في الدّيْنِ » ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٥٣٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمـوویه‌تی: ( خه‌ون سێ جۆره: هه‌یانه مژده‌یه له‌لایه‌ن خواوه، وه‌هه‌یانه قسه‌و خه‌یاڵاتی مێشکه، وه هه‌شیانه ترساندنه له شه‌یتانه‌وه، جا ئه‌گه‌ر یه‌کێکتان خه‌ونێکی بینی به دڵی بوو، با بۆ یه‌کێکی بگێڕێته‌وه ئه‌گه‌ر حه‌زی کرد، وه ئه‌گه‌ر شتێکیشی بینی پێی ناخۆش بوو، با بۆ که‌سی نه‌گێڕێته‌وه، وه با هه‌ستێت و نوێژ بکات، وه حه‌ز به کۆتی گه‌ردن ناکه‌م – واته له خه‌ودا – وه حه‌ز به‌پێ کۆت ده‌که‌م – واته کۆت بکرێته پێوه – چونکه پێکۆت دامه‌زراوییه له ئاییندا )

## ( ٣ ) ( ڕەوشتەکانی سەفەر کردن )

( ٨٣٥ ) ( طب ) عن عبدالله بن مغفل قال: قال رسول الله(ﷺ): ❊ إذا رَكِبْتُمْ هذه الْبهائم الْعُجْم فانْجُوا عليْها فإذا كَانَتْ سَنَة فانْجُوا و عَليْكُمْ بِالدُّلجة فإِنَّما يطويها الله ❊. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٦ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مغفل دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەگەر سواری ئەو وڵاخە بێ زمانانە بوون، ئەوا خێرا ڕێیان بکەن، وە ئەگەر ڕێگەتان وشك و بێ لەوەڕ بوو، ئەوا خێراتر ڕێیان پێ بکەن، وە زیاتر بە شەو ڕێ بکەن، چونکە خوای گەورە دەیهێنێتەوە یەك و نزیکی دەکاتەوە ).

## ( ٤ ) ( فەزڵی ڕاستگۆیی )

( ٨٣٦ ) ( ن ك ) عن شداد بن الهاد قال: قال رسول الله(ﷺ): ❊ إنْ تَصْدُقِ الله يصْدُقْك ❊. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤١٥ ) في صحيح الجامع

شدادی کوڕی الهاد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـووی: ( ئەگەر ڕاست بکەیت لەگەڵ خوا، خواش ڕاستت لەگەڵ دەکات ).

( ٨٣٧ ) ( حم خد م ت ) عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ❊ عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فإنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إلى الْبِرِّ، و إنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إلَى الْجَنَّة، و ما يزالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ و يَتَحرّى الصِّدْقَ حتّى يُكْتَب عنْد الله صدِّيْقاً، و إيَاكُمْ و الْكَذِب، فَإنَّ الْكَذب يهْدي إلى الْفُجُور و إنَّ الْفُجُورَ يَهْدي إلى النَّار، وما يزالُ الْعَبْدُ يكْذبُ و يتَحرَى الْكَذِبَ حتّى يُكْتَب عنْد الله كذَّاباً ❊. و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٠٧٠ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕاستگۆیی بگرن، چونکە ڕاستگۆیی ڕێنمایی دەکات بۆ چاکە، وە چاکەش ڕێنومایی دەکات بۆ بەهەشت، وە بەردەوام پیاو ڕاست دەڵێ و هەوڵی ڕاست گۆیی دەدات هەتا لەلای خوا بەڕاستگۆ دەنووسرێت، وەنەکەن بچن بەلای درۆدا، چونکە درۆ ڕێنومایی دەکات بۆ خراپە و بەد کاری، وە خراپە و بەدکاریش ڕێنومایی دەکات بۆ ئاگر، وە بەردەوام ئەو بەندەیە درۆ دەکات و هەوڵی درۆ کردن دەدات، هەتا وای لێدێت لەلای خوا بە درۆزن دەنووسرێت ).

## ( ٥ ) ( زمان پاریزی )

( ٨٣٨ ) ( مالك حم ت ن هـ حب ك ) عن بلال بن الحارث قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوانِ الله تَعالى مَا يَظُن أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، فَيَكْتُبُ اللهُ تعالى لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إلىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَ إنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ الله تَعالىَ مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، فَيَكْتُبُ اللهُ تعالى بِهَا سَخَطَهُ إلىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٦١٩ ) في صحيح الجامع

بلالی كوڕی حارث دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( پیاو وشەیەك دەڵێ لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا، گومانی نەدەبرد بگاتە ئەو رادەیەی كە گەیشتوویەتی، خوای گەورە ڕەزامەندی خۆی بۆ پێ دەنووسێت هەتا ڕۆژی قیامەت، وە پیاو وشەیەك دەڵێ لە توڕەبوونی خوای گەورەدا، گومانی ئەوەی نەدەبرد كە بگاتە ئەو رادەیەی كە گەیشتویەتی، خوای گەورە توڕەبوونی خۆیی بۆ پێ دەنووسێت هەتا ڕۆژی قیامەت ).

( ٨٣٩ ) ( أبو الشيخ ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ مَنْ تَكَلَّمَ فَغَنِمَ، أَوْ سَكَتَ فَسَلِمَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٤٩٦ ) في صحيح الجامع

أبو امامە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕەحمەتی خوا لەكەسێك بێت كە قسەی كرد دەستكەوتی هەبێت، وە یان بێ دەنگ بێت و سەلامەت بێت ).

( ٨٤٠ ) ( هب ) عن أنس والحسن مرسلا قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ امْرِءاً تَكَلَّمَ فَغَنِمَ، أَوْ سَكَتَ فَسَلِمَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٤٩١ ) في صحيح الجامع

لە أنس و حسن وە بە (مرسل) ی دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕەحمەتی خوا لەو كەسەی كە قسەی كرد دەست كەوتی هەبێت، وە یان بێ دەنگ بێت و سەلامەت بێت ).

( ٨٤١ ) ( ت حب ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ وَقَاهُ الله شَرَّ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَ شَرَّ مَابَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٩٠ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك خوای گەورە بیپارێزێت لەشەڕی ئەوەی نێوان دوو لێوەكەی . وە شەڕی ئەوەی نێوان دوو ڕانەكەی، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە ).

( ٨٤٢ ) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغضب الضياء ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله إذا أَحَبَّ أَهْلَ بَيْتٍ أَدْخَلَ عَلَيْهِمُ الرِّفْقَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٠٤ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمـبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە ئەگەر خانەوادەیەكی خۆشت ویست، ئەوا نەرم و نیانیان دەخاتە ناو )

## ( ٦ ) ( زمان لوسی )

( ٨٤٣ ) ( حم د ت ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى يَبْغَضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِي يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ تَخَلُّلَ الْبَاقِرَةِ بِلِسَانِهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٧٥ ) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوا رقی لە زمان لوسە لە پیاواندا، ئەوەی کە زمانی هەڵدەسورێنێت، هەروەك چۆن مانگا زمانی هەڵدەسورێنێت ).

## ( ٧ ) ( کەسی زانا بە دنیا بێ ئاگا لەقیامەت )

( ٨٤٤ ) ( هق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ يَبْغَضُ كُلَّ جَعْظَرِيٍّ جَوَّاظٍ سَخَّابٍ فِي الأَسْوَاقِ ،جِيفَةٍ بِاللَّيْلِ حِمَارٍ بِالنَّهَارِ ،عَالِمٍ بِالدُّنْيَا جَاهِلٍ بِالآخِرَةِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٧٨ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوا رقی لە هەموو بەد رەوشتێکی بە فیز و لوت بەرزە، دەمەوەر لە بازارەکاندا، بەشەو کەلاکی تۆپیوە و بە رۆژیش گوێ درێژ، لێزان لە کارو باری دونیادا و نەزان لە کاری قیامەتدا ).

( ٨٤٥ ) ( ك في تاريخه ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى يَبْغَضُ كُلَّ عَالِمٍ بِالدُّنْيَا جَاهِلٍ بِالآخِرَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٧٩ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە رقیەتی لە هەموو کەسێکی زانا بۆ دونیا و نەزان بۆ قیامەت ).

## ( ٨ ) ( چاك ئەنجام دانی کار )

( ٨٤٦) ( هب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨٠ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خـوا پێی خۆشە ئەگەر یەکێکتان کارێکتان کرد بـە چاکی و ووردی ئەنجامـی بدەن ).

( ٨٤٧ ) ( خ د ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَ يَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨٣ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە پژمینی پێ خۆشە و رقی لە باوێشکە ).

**( ٨٤٨ ) ( حم خ د ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله يُحبُّ العُطاس و يكرهُ التّثاؤب، فإذا عطس أحدُكم فحمد الله كانَ حقاً على كُلّ مُسْلم سمعهُ أنْ يقُول لهُ: يرْحمُك الله، و أمَّا التَّثاؤبُ فإنَّما هُو من الشّيْطانِ فإذا تثاءب أحدُكمْ فليَرُدَّهُ ما اسْتطاع ولا يقُولُ هاه هاه، فإنَّما ذلك من الشّيْطانِ يضْحكُ منْهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٨٤ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتـی: ( خوای گەورە پژمینی پێ خۆشە و رقی لە باوێشکە، جا ئەگەر یەکێکتان پژمی و سوپاسی خوای گەورەی کرد، ئەوا پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە گوێی لێ دەبێت، پێی بڵێت: خوداوەند رەحمەت پێ بکات، بەڵام باوێشك ئەویان لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی دا، با هێندەی کە لە توانایدایە بیگەڕێنێتەوە وە نەڵێت هاه...... هاه، چونکە ئەوە لە شەیتانەوەیە پێی پێ دەکەنێت ).

**( ٨٤٩ ) ( ت ابن السني في عمل اليوم والليلة ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ العُطاسُ من الله و التّثاؤبُ من الشّيْطانِ فإذا تثاءب أحدُكمْ فليضعْ يدهُ على فيْه و إذا قال آه آه فإنَّ الشّيْطانَ يضحكُ منْ جوْفه و إنَّ الله عزّوجلَّ يُحبُّ العُطاس و يكرهُ التّثاؤب ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤١٢٣ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( پژمین لە خواوەوەیە و باوێشك لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی دا، با دەست بخاتەسەر دەمی، وە ئەگەر وتی: هاه .....هاه، ئەوە شەیتان لەناو سکییەوە پێ دەکەنێت، وە خوای گەورە حەزی بە پژمینە وە رقی لە باوێشکە ).

## ( ١٠ ) ( حوكمی وێنە كێشان )

**( ٨٥٠ ) ( هب ) عن كليب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تعالى يُحبُّ منَ العامل إذا عمل أنْ يُحْسنَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٩١ ) في صحيح الجامع**

كليب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە حەز دەکات ئەگەر کارمەندێك کارێکی کرد بە چاکی و باشتر بیکات ).

**( ٨٥١ ) ( الشيرازي خط ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله يُعذِّبُ المُصوِّرينَ بما صوَّروا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوا ئەشکەنجەی وێنەگران دەدات لەسەر ئەو وێنانەی کە گرتوویانە ).

## ( ١١ ) ( فەزڵی ڕێز گرتن لە گەورە )

( ٨٥٢ ) ( د ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ من إجلال الله إكرامَ ذي الشَّيبة المُسلم و حامل القُرآن غيْر الغالي فيْه و الجافي عنْهُ، و إكرام ذي السُّلطان المُقْسط » . (صحيح) أنظر حيث رقم (٢١٩٩) في صحيح الجامع

ابو موسى الاشعري دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( یەکێك لە شێوەکانی بە گەورە و پیرۆز گرتنی خوا ئەوەیە، ڕێز لە موسڵمانی خاوەن سەرو ریشی سپی بگیرێت، وە ڕێز لە هەڵ گرێکی قورئان کە نەزیادە ڕەوی و نە کەم ڕەوەی تێدا ناکات، وە ڕێزگرتنیش لە خاوەن دەسەڵاتێکی دادوەر ).

## ( ١٢ ) ( کلیلەکانی خێر و کلیلەکانی شەڕ )

( ٨٥٣ ) ( هـ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ من النَّاس ناساً مفاتيْح للْخير مغاليق للشَّرْ و إنَّ من النَّاس ناساً مفاتيح للشَّر مغاليق للخير. فطُوبى لمنْ جعل اللهُ مفاتيح الْخَيْر على يديْه و ويْلٌ لمنْ جعل الله مفاتيح الشَّرْ على يديه » . (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٢٢٣) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لەناو خەڵکدا کەسانێك هەن کلیلن بۆ خێر و چاکە، ڕێگرن بۆ شەڕ و خراپە، وە خەڵکانێکیش هەن کلیلن بۆ شەڕ و خراپە، ڕێگرن بۆ خێر و چاکە، جا ئافەرین وخۆشبەختی بۆ کەسێك کە خوا کلیلەکانی چاکەی خستبێتە سەر دەستی ئەو، وە واوەیلاش بۆ کەسێك کە خوا کلیلەکانی خراپەی خستبێتە سەر دەستی ئەو ).

## ( ١٣ ) ( لە ئەدەبەکانی نووستن )

( ٨٥٤ ) ( حم ت ك ) عن أبي هريرة قال: رَأىَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) رجُلاً مُضْطَجعاً علَىَ بَطْنِه فَقَالَ: « إنَّ هذه ضِجْعةٌ لايُحبُّها اللهُ تَعالى » . و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٢٧٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی بینی لەسەر سك ڕاکشابوو، پێی فەرموو: ( ئەوە ڕاکشانێکە خوای گەورە حەزی پێ ناکات ).

( ٨٥٥ ) ( حم د هـ ) عن طخفة بن قيس الغفاري قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ هذه ضِجْعةٌ يبْغضُها اللهُ تَعالى - يعْني الاضْطجاعُ علَى الْبطْن - » . (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٢٧١) في صحيح الجامع

لە طخفة کوڕی قيس الغفاری یەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەوە ڕاکشانێکە خوای گەورە رقی لێیەتی ) ... واتە ڕاکشان بەسەر سکدا.

## ( ١٤ ) ( نەکردنی گاڵتەو گەپ لە دوای عیشاوە )

( ٨٥٦ ) ( ك ) عن جابر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ إيَّاكَ وَ السَمَر بَعْدَ هَدْأَةَ الرَجلِ فَإنَّكُمْ لاتَدْرُونَ مَايَأتِي الله فِي خَلْقِهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٦٦٤) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( نەکەیت قسەی گاڵتەو گەپ بکەیت پاش ئەوەی کە پیاو دەحەوێتەوە. چونکە ئێوە نازانن خوای گەورە چی بەناو دروست کراوەکانی خۆیدا دەنێرێت )

## ( ١٥ ) ( ئاکامی فیز و بە خۆ نازین )

( ٨٥٧ ) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ تُعجِبُهُ نَفْسُهُ مُرْجِل جُمَّتِه إذ خَسَفَ اللهُ بِهِ الأرْضَ فَهُوَ يَتَجَلجَلُ فِيهَا إلىَ يَوْمِ القِيَامَةِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٨٧٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( لە کاتێکدا کە پیاوێك بە بەرگ و پۆشاکێکی رازاوەوە دەڕۆیشت، بە خۆی دەنازی و لە خۆی رازی بوو، پرچی خاو و شۆڕ کردبۆوە، ئا لەو کاتەدا خوا بردی بە ناخی زەویدا، جا هەتا رۆژی قیامەت سوری تیا دەخوات ).

## ( ١٦ ) ( سوپاس گوزاری نیعمەت )

( ٨٥٨ ) ( أبو القاسم بن بشران في أماليه ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ تَعَرَّفْ إلىَ اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٩٣٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( تۆ لە خۆش گوزەرانیدا خوا بناسە، ئەویش لە تەنگانەو ناخۆشیدا دەتناسێت )

## ( ١٧ ) ( دەربارەی هێوری و لەسەرخۆیی )

( ٨٥٩ ) ( هب ) عن أنس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ التَّأَنِي مِنَ الله وَ العَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٩٨٥) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هێوری و لەسەر خۆیی لە خواوەیە، وە پەلە کردنیش لە شەیتانەوەیە )

## ( ١٨ ) ( باس كردنی نیعمەتی خوا )

( ٨٦٠ ) ( هب ) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ التَحَدُّثُ بِنِعْمَةِ اللهِ شُكْرٌ وَ تَرْكُهَا كُفْرٌ وَمَنْ لا يَشْكُر القَلِيلَ لا يَشْكُرِ الكَثِيْرَ وَ مَنْ لا يَشْكُرِ النَّاسَ لا يَشْكُرِ اللهَ ، وَ الجَمَاعَةُ بَرَكَةٌ وَ الفُرقَةُ عَذابٌ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٠١١ ) في صحيح الجامع

نعمانی کوڕی بشیر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( باسکردنی نیعمەتی خوا بۆخۆی سوپاس کردنە، وە باس نەکردنیشی کوفر و ناشوکرییە، وە ئەوەی کە لەسەر کەم سوپاس نەکات لەسەر زۆریش سوپاس ناکات، وە ئەوەی سوپاسی خەڵك نەکات سوپاسی خواش ناکات، وە کۆمەڵ بوون بەرەکەتەو، پەرتەوازەبونیش ئازار و و ناخۆشییە ).

## ( ١٩ ) ( هەر کەس کێبڕکێ لەگەڵ خوادا بکات لە سیفەتەکانیدا )

( ٨٦١ ) ( خد ع طب ) عن فضالة بن عبيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَةٌ لاتَسْأَلْ عَنْهُمْ: رَجُلٌ يُنَازِعُ اللهَ إِزَارَهُ وَرَجُلٌ يُنَازِعُ اللهَ رِدَاءَهُ فَإِنَّ رِدَاءَهُ الكِبْرِيَاءَ وَ إِزَارَهُ العِزَّ، وَرَجُلٌ فِي شَكٍّ مِنْ أَمْرِ اللهِ، وَالقُنُوطُ مِنْ رَحْمَةِ اللهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٥٢ ) في صحيح الجامع

فضالەی کوڕی عبید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( سێ جۆر کەسان هەن هەر مەپرسە لە حاڵیان: پیاوێك کێبڕکێی خوا بکات لە پۆشاکیدا، وە پیاوێك کێبڕکێی خوا بکات لە بەرگیدا، چا بەرگەکەی خوا خۆ بەگەورەگرتنەوە پۆشاکەکەیشی شکۆمەندییە، وە پیاوێکیش بە گومان بێت لە کاری خوا، وە هەروەها بێ ئومێد بونیش لە ڕەحمی خوا )

## ( ٢٠ ) ( مافی دراوسێ )

( ٨٦٢ ) ( حم ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ثَلاثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللهُ وَ ثَلاثَةٌ يَشْنَؤُهُمُ اللهُ: الرَجُلُ يَلْقَى العَدُوَّ فِي فِئَةٍ فَيَنْصِبُ لَهُمْ نَحْرَه حَتَّى يُقْتَلَ أَوْ يُفْتَحَ لأَصْحَابِه، وَ القَوْمُ يُسَافِرُونَ فَيَطُولُ سَرَاهُمْ حَتَّى يُحِبُّوا أَنْ يَمَسُّوا الأَرْضَ فَيَنْزِلُونَ فَيَتَنَحَّى أَحَدُهُم فَيُصَلِّي حَتَّى يُوقِظَهُمْ لِرَحِيلِهِمْ وَ الرَجُلُ يَكُونُ لَهُ الجَارُ يُؤْذِيهِ جَارُهُ فَيَصْبِرَ عَلَىَ أَذَاه حَتَّى يُفَرِّقَ بَيْنَهُمَا مَوْتٌ أَوْ ظَعْنٌ ، وَ الَّذِيْنَ يَشْنَؤهُمُ اللهُ: التَّاجِرُ الحَلَّافُ وَ الفَقِيرُ المُخْتَالُ وَ البَخِيْلُ المَنَّانُ ﴾ ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٣٠٧٢ ) في صحيح الجامع

ابو ذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( سێ جۆر کەسان هەن خوا خۆشی دەوێن و سێ جۆریش خوا دەیان بوغزێنێت، پیاوێك کە ڕووبەڕووی دوژمن دەبێتەوە لەگەڵ کۆمەڵێکدا، گەردنی خۆ بیانی بو دادەنێت هەتا دەکوژرێت یان هاوڕێکانی سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، وە کۆمەڵێکیش سەفەر

دەکەن، وە شەو رۆشتنیان درێژە دەخایەنێت هەتا وایان لێدێت حەز دەکەن بێ لە ولاخەکانیان داگرن و بیدەن لە زەوی، جا کە دادەبەزن یەکێکیان کەنار دەوەستێت دەست دەکات بە نوێژ کردن. بۆ ئەوەی دواتر برادەرەکانی لە خەو هەڵسێنێت و بکەونەوە رێ، وە پیاوێکیش دراوسێی هەبێت، دراوسێکەی ئازاری بدات، ئەویش ئارام بگرێت لەسەر ئازارو خراپەکەی، هەتا مردن بان ماڵ بار کردن لێکیان جیا دەکاتەوە، وە ئەوانەیشی کە خوای گەورە دەیان بوغزێنێت و رقی لێیانە بازرگانی سوێند خۆر، وە هەژاری بە فیز و دەعیە، وە رەزیلی منەت کار ).

## ( ٢١ ) ( دڵێك رەحمی تێدا نەبێت )

( ٨٦٣ ) ( الدولابي في الكنى أبو نعيم في المعرفة ابن عساكر ) عن عمرو بن حبيب قال: قال رسول الله(ﷺ): « خَابَ عَبْدٌ و خَسِرَ لم يجعل اللهُ تعالى في قلبه رحْمَةً للبَشر ». (حسن) أنظر حيث رقم (٣١٩٥) في صحيح الجامع

عەمری کوڕی حبیب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( بەندەیەك مایە پوچ و خەسارەمەندە کە خوای گەورە رەحمی لە دڵ نەنابێت بۆ خەڵکیی ).

## ( ٢٢ ) ( باشترین هاوڕێ )

( ٨٦٤ ) ( حم ت ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): « خَيْرُ الأصْحَاب عنْد الله خَيْرُهُمْ لصاحبه وخَيْرُ الْجيْران عنْد الله خَيْرُهُم لجَاره ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٢٥٧) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( باشترین هاوڕێکان لەلای خوا ئەوەیانە کە لە هەموویان باشترە بۆ هاوڕێکانی، وە باشترین دراوسێکان لەلای خوا ئەوەیانە کە لە هەموویان باشترە بۆ دراوسێکانی ).

## ( ٢٣ ) ( قەدەغەکردنی کرینی دار مۆرد )

( ٨٦٥ ) ( د الضياء ) عن عبدالله بن حبشي قال: قال رسول الله(ﷺ): « منْ قَطَعَ سدْرَةً صوَّبَ اللهُ رأسهُ في النَّار ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٧٣) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی حبشی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك دار مۆردێك ببڕێت ئەوا خوا سەری نەغرۆی ناو ئاگر دەکات ).

( ٨٦٦ ) ( طب هق ) عن معاوية بن حيدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ من الله تعالى لا من رسوله : لعن الله قاطع السدر ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٩٠٥ ) في صحيح الجامع

معاويه ی کوڕی حيدة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوويەتی: ( لــە خـوای گەورەوە نـەك لـە پێغەمبەرەکەیەوە: نەفرەتی خـوا لەو کەسە بێت کە دار مۆردێك دەبڕێتەوە ).

( ٨٦٧ ) ( هق ) عن معاوية بن حيدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قاطع السدر يصوب الله رأسه في النار ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٢٩٢ ) في صحيح الجامع

معاويەی کوڕی حيده دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوويەتی: ( ئەو کەسەی کە دار مۆرد دەبڕێت، خوا سەری نەغرۆی ناو ئاگر دەکات ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

داری سدر یان ( النبق ) کە بەکوردی پێی دەوترێت دار مۆرد یان هەندێ جار هەر ( نەبق ) یشی پێ دەوترێت، ئەم دارە لەو سێ فەرموودەی پێشووەدا هەڕەشە لە بڕینیان کراوە ، ئیمامی (البيهقی) دەفەرموێت: مەبەستی پێی بڕینی دار مۆردە لە چۆڵەوانیدا چونکە ڕێبوار لەبەر سێبەریدا دەحەوێتەوە، وە لە ریوایەتەکەی (الطبراني) بە ( سدر الحرم ) هاتووە، واتە ئەو دار مۆردانەی کە لە سنووری حەرەمی کەعبەی ماڵی خوادان، کەواتە فەرموودەکان بڕینی ئەو دار مۆردانە قەدەغە دەکەن کە لە سنووری (حەرەمی بەیت)دان یان لە دەشت و چۆڵەوانیدا ڕێبوار سود لە سێبەریانی وەردەگرێت، بەهەر حاڵ لەوانەیە ڕێگرتن لە بڕینی ئەو جۆرە دارە بە تایبەت حیکمەتی تریشی بە دواوەبێت کە ئێمە نەیزانین و دەرکی پێ نەکەین: وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ).

## ( ٢٤ ) ( کەسێك بیەوێت چاکەیەك بکات )

( ٨٦٨ ) ( ق ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قال الله تعالى : إذا همَّ عبْدِي بحسنة ولمْ يعملْها كتبْتُها لهُ حسنةً فإنْ عملها كتبْتُها لهُ عشْر حسنَات إلى سبْعمائة ضعْف و إذا همَّ بسَيِّئة ولَمْ يعْملْها لمْ أكْتُبْها عليه فإنْ عَملَها كتَبْتُها سيِّئةً واحدةً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٠٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوويەتی: ( خوای گەورە فەرمــوويەتی: ئەگەر بەندەیەکم ویستی هەستێت بە کارێکی چاك وە نەیکرد ئەوا هەر بە چاکەیەك بۆی دەنووسم، خۆ ئەگەر کردی،ئەوا بە دە چاکە هەتا حەوت سەد بەرامبەر بۆی دەنووسم. وە ئەگەر ویستی هەستێت بە کارێکی خراپە، وە نەی کرد، ئەوا لەسەری نایـنووسم، خۆ ئەگەر کردی ئەوا تەنها بە یەك خراپە بۆی دەنووسم ).

## ( ٢٥ ) ( ئەوانەی لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێت )

( ٨٦٩ ) ( حم طب ك ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالىَ: حَقَّتْ مَحبَتي لِلْمُتَحابِّينَ فِيَّ، وَ حَقَّتْ مَحبَّتي لِلْمُتَواصِليْنَ فِيَ، وَ حَقَّتْ مَحبَتي لِلْمُتَنَاصِحينَ فِيَّ وَ حَقَتْ مَحبَتي لِلْمُتَزاوِرِينَ فِيَّ وَ حَقَتْ مَحبَتي لِلْمُتَبَاذِلينَ فِيَ، الْمُتَحابّونَ فِيَّ عَلىَ مَنَابِرٍ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمْ بِمَكَانِهِمْ النَبِيُّونَ وَ الصِّدِيْقُونَ وَ الشُّهَداءُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٢٠ ) في صحيح الجامع

عبادەی کوڕی الصامت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فەرمـوویەتی: خۆشەویستیی من واجب بووە بۆ ئەو کەسانەی لەبەر خاتری من پەیوەندی بە یەکترەوە دەبەستن، وە خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەوانەی لەبەر من ئامۆژگاری یەکتر دەکەن، وە خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەوانەی لەبەر من سەردانی یەکتر دەکەن، وە خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەوانەی لەبەرمن دەستگیرۆیی یەکتر دەکەن. ئەوانەی کە لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێت لەسەر مینبەرانێکن لە نور، پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدان ئاوات بە شوێنیان دەخوازن ).

( ٨٧٠ ) ( حم طب ك هب ) عن معاذ قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالىَ: وَجَبَتْ مَحَبَّتي لِلْمُتَحابِّينَ فِيَ وَ الْمُتَجَالِسينَ فِيَ وَ الْمُتَبَاذِلِينَ فِيَ وَ الْمُتَزَاوِرِينَ فِيَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٣٠ ) في صحيح الجامع

معاذ دەڵی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فەرمـوویەتی: خۆشەویستیی من واجب بووە بۆ ئەوانەی کە لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێت و لەبەر من لەگەڵ یەکتردا دادەنیشن و لەبەر من دەست گیرۆیی یەکتر دەکەن و لەبەر من سەردانی یەکتر دەکەن ).

## ( ٢٦ ) ( ئافرەتان بۆ کاروباری خۆیان دەتوانن لە ماڵ بچنە دە )

( ٨٧١ ) ( ق ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَدْ أَذِنَ اللهُ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَوَائِجِكُنَّ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٦٤ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەوا خوای گەورە رو... داون، بۆتان هە... بۆ کاروباری خۆتان بچنە دەرەوە ).

## ( ٢٧ ) ( فەزڵی میوانداری )

( ٨٧٢ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: جاءَ رَجُلٌ إلى رَسُولِ الله(ﷺ) فقال: إنّي مَجْهُودٌ، فأرسل إلى بعْضِ نسائه فقالتْ: والّذي بعثك بالْحَق ماعِنْدِي إلاّ مَاءٌ، ثُمَّ أَرسَلَ إِلىَ أُخرىَ فَقالَتْ مِثْلَ ذلِك، حَتّى قُلْنَ كُلُّهُنَّ مِثْل

ذلك: لا، وَالَّذي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَاعنْدي إلا ماءٌ، فَقَالَ: ﴿ مَنْ يُضَيِّفُ هَذَا اللَّيْلَةَ، رَحِمَهُ اللهُ ﴾، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَار، فَقَالَ: أَنَا يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ) فَانْطَلَقَ بِهِ إلىَ رَحْله، فَقَالَ لامْرَأَته: هَلْ عنْدَك شَيْءٌ؟ قَالَتْ: لا إلاَّ قُوتَ صبْيَاني، قَالَ: فَعَلِّليهِمْ بِشَيْءٍ، فَإذا دَخَلَ ضَيْفُنَا فَأَطْفئي السِّرَاجَ وَ أَريه أَنَّا نَأْكُلُ.فَإذَا أَهْوَى لِيَأْكُلَ فَقُومي إلىَ السِّرَاجِ حَتَّى تُطْفئيه، قَالَ فَقَعَدُوا وَأَكَلَ الضَّيْفُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا عَلىَ رسول الله(ﷺ) فَقَالَ: ﴿ قَدْ عَجِبَ اللهُ مِنْ صَنيعِكُمَا بِضَيْفكُمَا اللَّيْلَةَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٧٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی ووت: ( من هيلاك و برسيم، ئەويش جوابي نارد بۆ يەكێك لە ژنەكانی، ئەويش ووتبوی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە جگە لە ئاو هیچی ترم لا نییە، پاشان جوابی نارد بۆ یەكێكی تریان ئەویش هەر هەمان وەڵامی هەبوو، هەتا هەر هەموویان وەك ئەوەی یەكەمجار ووتیان: نەخێر، سوێند بەوەی كە تۆی بە حەق ناردووە جگە لە ئاو هیچم لا نییە، ئەویش فەرمووی: ( كێ ئەمشەو میوانداریی ئەمە دەكات رەحمەتی خوای لێ بێت ) پیاوێك لە ئەنسارەكان هەستا و وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا بردیەوە بۆ ماڵەوە، وە بە ژنەكەی ووت: هیچت لا هەیە ؟ وتی: نەخێر: تەنها خواردنی منداڵەكان نەبێت، وتی: دە بەشتێك سەرقاڵیان بكە، ئینجا كە میوانەكەمان هاتە ژوورەوە، چراكە بكوژێنەرەوە ،وە وای پیشان بدە كە ئێمە نان دەخۆین، جا كە دەستی برد بۆ نانەكە بیخوات ئەوا هەستە بۆ لای چراكە، هەتا دەیكوژێنیتەوە، وتی: ئیتر ئاوا دانیشتن و میوانەكەش نانەكەی خوارد، جا بۆ سبەینێ ئەنسارییەكە چووەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش پێی فەرموو: ( بە راستی خوای گەورە سەیری لێ هات لەو كارەی كە ئەمشەو تۆ و خێزانەكەت لەگەڵ میوانەكەتاندا كردتان ).

## ( ٢٨ ) ( هەموو كارێكی باش بە چاكە دەنووسرێت )

( ٨٧٣ ) ( هب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلّ مَعْرُوف صَدَقَةٌ وَ الدَّالُ عَلىَ الْخَيْرِ كَفَاعله وَ اللهُ يُحِبُّ إغَاثَةَ اللُّهْفَان ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٥٥١) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەموو كارێكی باش سەدەقەیە، وە ئەو كەسەیشی كە رێنمایی كەسێك بكات بۆ خێر و چاكە هەر وەك ئەوە وایە كە پێی هەڵدەستێت، وە خوای گەورە حەز بە فریاكەوتنی لێقەوماوان دەكات ).

## ( ٢٩ ) ( ئەتك كردنی ئاژەڵان )

( ٨٧٤ ) ( حم ق ن ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ مَنْ مَثَّلَ بِالْحَيْوانِ ﴾. و اللفظ للنسائي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥١١٢) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت کە ئەتکی گیانلەبەر دەکات ).

## ( ٣٠ ) ( دەربـارەی تـەماع كـاری )

( ٨٧٥ ) ( حم ق ت ) عن أنس ( حم ق ) عن ابن عباس ( خ ) عن ابن الزبير ( ه ) عن أبي هريرة ( حم ) عن أبي واقد ( تخ البزار ) عن بريدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ كَانَ لابْنِ آدَمَ وَادٍ مِنْ مَالٍ لابْتَغَى إلَيْهِ ثَانِياً وَلَوْكَانَ لَهُ وَادِيَانِ لابْتَغَى لَهُمَا ثَالِثاً وَلا يَمْلأُ جَوْفُ ابْنُ آدَمٍ إلاَّ التُّرابَ وَ يَتُوبُ اللهُ عَلَى مَنْ تَابَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٢٦٦) في صحيح الجامع

لە أنس لە إبن عباس لە ابن زهير لە أبو هريرة لە ابی واقده وە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەگەر بەنی ئادەم دۆڵێك لە پارەی هەبێت، هەوڵ دەدات بیكات بە دووان، وە ئەگەر دووانی هەبێت هەوڵدەدات بیكات بە سیان، وە ناو سكی بەنی ئادەمیش هەر بە خۆڵ پڕ دەبێتەوە، وە خواش لەهەر كەس ببورێت دەبورێت ).

( ٨٧٦ ) ( حل ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لِيَتَكَلَّفْ أَحَدُكُمْ مِنَ الْعَمَلِ مَا يُطِيْقُ فَإِنَّ اللهَ تَعالىَ لايَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا وَ قَارِبُوا وَ سَدِدُوا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٣٣٨) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( با هەر یەكەتان هێندە كار لە ئەستۆی خۆی بگرێت كە لەتوانای دایە، چونكە خوای گەورە بێزار نابێت مەگەر ئێوە بێزار بن، وە هەوڵی راست ڕەوی بدەن لە كارەكانتاندا و زۆر ڕۆ مەچن ).

## ( ٣١ ) ( موسڵمان نـابێت پشتی برای موسڵمانی بەربدات )

( ٨٧٧ ) ( حم د الضياء ) عن جابر وأبي طلحة بن سهل مَامِنْ امْرِىءٍ يَخْذُلُ امْرَأً مُسْلماً فِي مَوْضِعٍ تُنْتَهَكُ فِيْهِ حُرْمَتُهُ وَ يُنْتَقَصُ فِيْهِ مِنْ عِرْضِهِ إلاَّ خَذَلَهُ اللهُ تَعالَى فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ فِيْهِ نُصْرَتَهُ، وَ مَامِنْ إمْرِىءٍ يَنْصُرُ مُسْلماً فِي مَوْطِنٍ يُنْتَقَصُ فِيْهِ مِنْ عِرْضِهِ، وَ يُنْتَهَكُ فِيْهِ مِنْ حُرْمَتِهِ إلاَّ نَصَرَهُ اللهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ نُصْرَتَهُ ﴾. و اللفظ لأبي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٨٨) في صحيح الجامع

جابر و ابو طلعة ی كوڕی سهل دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر كەسێك پشتی كەسێكی موسڵمان بەربدات لە شوێنێكدا كە حورمەتی تێدا بشكێنرێت و ناموسی تێدا لە كەدار بكرێت، ئیلا خوای گەورەش لە شوێنێكدا پشتی ئەو كەسە دەشكێنێت كە زۆری پێ خۆش بوو تیایدا سەركەوتوو بێت، وە هەر كەسێك موسڵمانێك سەربخات لە شوێنێكدا كە نامووسی تێدا لە كەدار بكرێت

و حورمەتی تێدا بشکێنرێت، ئیلا خوای گەورەش لە شوێنێکدا سەری دەخات کە زۆری پێ خۆشە تیایدا سەرکەوتوو بێت).

## ( ٣٢ ) ( ئەدەبی رۆشتن بە رێ دا )

**( ٨٧٨ ) ( حم خد ك ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ رَجُلٍ يَتَعَاظَمُ فِي نَفْسِهِ وَ يَخْتَالُ فِي مَشْيَتِهِ إِلاَّ لَقِيَ اللهَ تَعالىَ وَ هُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٠٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك لە نەفسیدا خۆی بە گەورە بزانێت وە لە رۆشتنیشدا خۆی هەڵکێشێت، ئەوا کە گەڕایەوە بۆ لای خوا ، خوا لێی تورەیە ).

**( ٨٧٩ ) ( حم خد ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿مَنْ تَعَظَّمَ فِي نَفْسِهِ وَ اخْتَالَ فِي مَشْيَتِهِ لَقِيَ اللهَ وَ هُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٥٢ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك خۆ بە گەورە زان بێت لە نەفسیدا، وە بە فیز و دەعیە بێت لە رۆشتنیدا، ئەوا کە گەڕایەوە لای خوا، خوای گەورە لێی تورەیە ).

## ( ٣٣ ) ( پیر بوون لە رێی ئیسلامەتیدا )

**( ٨٨٠ ) ( د ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ مُسْلِمٍ يَشِيْبُ شَيْبَةً فِي الإِسْلامِ إِلاَّ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً وَ حَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٥٥ ) في صحيح الجامع**

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر موسڵمانێك تاڵێك مووی سپی ببێت لە ئیسلامەتیدا، ئەوا خوا چاکەیەکی بۆ پێ دەنووسێت، وە تاوانێکیشی لەسەر بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت ).

## ( ٣٤ ) ( فەزڵی ئارام گرتن لەسەر بەڵاو نەهامەتی )

**( ٨٨١ ) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَايَزَالُ الْبَلاءِ بِالْمُؤمِنِ وَ الْمُؤْمِنَةَ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَ مَالِهِ حَتَّى يَلْقَى اللهَ وَ مَاعَلَيْهِ خَطِيئَةٌ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨١٢ ) في صحيح الجامع**

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( بەردەوام بەڵاو نەهامەتی وا بە پیاوی بڕواداروژنی بڕوادارەوە، لە خۆی و منداڵ و ماڵیدا، هەتا وای لێ دێت کاتێك دەگەڕێتەوە لای خوا هیچ تاوانێکی لەسەر نەماوە ).

( ٨٨٢ ) ( حم ق ) عن أبي سعيد وأبي هريرة معا قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَايُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلا وَصَبٍ وَلا هَمٍ وَلا حَزَنٍ وَلا أَذىً وَلا غَمٍ حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا إلاَّ كَفَّرَ اللهُ بِها مِنْ خَطَايَاه ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨١٥ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد و ابو هريرة پێكەوە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هەرچی كە توشی موسڵمان دەبێت لە شەڕو نەخۆشی و خەم و پەژارە و ئازارو مەینەتی، تەنانەت دڕكێكیش كە بە پێی دا دەچێت، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەكانی بۆ پێ دەسڕێتەوە ).

## ( ٣٥ ) ( هیچ شتێك هێندەی ئارامی باش نییە )

( ٨٨٣ ) ( حم ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ وَ إنَّهُ مَن يَسْتَعِفَّ يُعِفَّهُ اللهُ وَ مَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ وَ مَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرَهُ اللهُ وَ مَا أُعْطِيَ أَحَدٌ شَيْئاً هُوَ خَيْرٌ وَ أَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨١٨ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( من هەر پارە و ماڵێكم بێتە لا، لێتانی گلنادەمەوە و رایناگرم، وە هەر یەك لە ئێوە هەوڵ بدات كە دەست پاك و دوور لە حەرام بێت ئەوا خواش دەست پاكیی و دوور لە حەرامیی پێ دەبەخشێت، وە هەر كەس هەوڵ بدات بێ منەت بێت لە دەستی خەڵك و بێ نیاز بێت لێیان ئەوا خوای گەورەش دەوڵەمەند و بێ منەتی دەكات لە خەڵك، وە هەر كەس هەوڵی خۆڕاگریی و ئارام گرتن بدات ئەوا خوای گەورەش ئارامیی و خۆڕاگریی پێ دەبە خشێت، وە هیچ كەسیش شتێكی پێ نەدراوە كە هێندەی ئارامی و خۆڕاگرتن باش و فراوان بێت ).

## ( ٣٦ ) ( هەركەس ناوی خۆی بداتە پاڵ ناوێك جگە لە ناوی باوكی خۆی )

( ٨٨٤ ) ( د ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنِ ادَّعَىَ إلىَ غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ انْتَمىَ إلىَ غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ الْمُتَتَابِعَةُ إلىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٩٨٦ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هەر كەسێك ناوی بداتە پاڵ ناوێك غەیری باوكی خۆی، یان بڵێت من سەر بە كەسانێكم لە غەیری خاوەنەكەی خۆی، ئەوا نەفرەتی یەك لە داوی یەكی خوای لەسەر بێت هەتا رۆژی قیامەت ).

## ( ٣٧ ) ( پشتیوانی كردن لە ستەم كار )

( ٨٨٥ ) ( ك ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَعَانَ ظَالِماً لِيَدْحَضَ بِبَاطِلِهِ حَقاً فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ ذِمَّةُ اللهِ وَ ذِمَّةُ رَسُولِهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٤٥ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك یارمەتی ستەم کارێك بدات، بۆ ئەوەی بە کارە بەتاڵ و ناڕەواکەی مافێك پێشێل بکات، ئەوا ئیتر هیچ بەڵێن و پەیمانێکی لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی نامێنێت ).

## ( ٣٨ ) ( دەبێت موسڵمان مافی برای موسڵمانی بپارێزێت )

( ٨٨٦ ) ( حم د ك ) عن المستورد بن شداد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَكَلَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَكْلَةً فَإِنَّ اللهَ يُطْعِمُهُ مِثْلَهَا مِنْ جَهَنَّمَ ،وَمَنْ كُسِيَ ثَوْباً بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ فَإِنَّ اللهَ يَكْسُوهُ مِثْلَهُ مِنْ جَهَنَّمَ ،وَمَنْ قَامَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ مَقَامَ سُمْعَةٍ وَ رِيَاءٍ فَإِنَّ اللهَ يَقُومُ بِهِ مَقَامَ سُمْعَةٍ وَ رِيَاءٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ و اللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٨٢ ) في صحيح الجامع

مستوردي کوڕی شداد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك بە ماف پیاوێکی موسڵمان پاروویەك بخوات ئەوا خوای گەورە هەمان شێوەی ئەو پارووەی لە دۆزەخدا دەرخوارد دەدات، وە هەرکەسێك بە ماف پیاوێکی موسڵمان پۆشاکێك لەبەر بکات، ئەوا خوای گەورە وەك و ئەو پۆشاکەی لە دۆزەخدا بەبەردا دەکات، وە هەر کەسێك لەسەر مافی پیاوێك هەستێت بە خۆدەرخستن و ریا بازی .ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا لە شوێنی خۆدەرخستن و ریا بازی دا رای دەگرێت ).

## ( ٣٩ ) ( هەوڵی بەدەست هێنانی رەزامەندی خوای گەورە )

( ٨٨٧ ) ( ت ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنِ الْتَمَسَ رِضَا اللهِ بِسَخَطِ النَّاسِ كَفَاهُ اللهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ وَ مَنِ الْتَمَسَ رِضَا النَّاسِ بِسَخَطِ اللهِ وَكَلَهُ اللهُ إِلَى النَّاسِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٩٠ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك هەوڵی بەدەست هێنانی رەزامەندی خوای گەورە بدات ئەگەر بە تووڕە بوونی خەڵکیش بێت، ئەوا خوای گەورە کێشە وئەرکی خەڵکی لە کۆڵ دەکاتەوە، وە هەر کەسێکیش هەوڵی رەزامەندی خەڵك بدات ئەگەر بە تووڕە بوونی خواش بێت، ئەوا خوای گەورە پشتی بەردەدات و دەیداتە دەست ئەو خەڵکە ).

## ( ٤٠ ) ( فەزڵی ملکەچ بوون بۆ خوای گەورە )

( ٨٨٨ ) ( حل ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَوَاضَعَ لِلّٰهِ رَفَعَهُ اللهُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦١٥٩ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی:(هەر کەسێك گەردن کەچ بکات بۆ خوا، خوایش بەرزی دەکاتەوە).

## ( ٤١ ) ( هەر كەسێك قیامەت بكات بە خەمی خۆی )

( ٨٨٩ ) ( هـ ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ جَعَلَ الْهُمُومَ هَمّاً وَاحداً، هَمَّ الْمَعَاد ، كَفَاهُ اللهُ سَائِرَ هُمُومِهِ ،وَمَنْ تَشَعَّبَتْ بِهِ الْهُمُومُ فِي أَحْوالِ الدُّنْيَا لَمْ يُبالِ اللهُ فِي أَيِّ أَوْدِيَتِهَا هَلَكَ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٦١٨٨) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك خەمەكان بكاتە یەك خەم، خەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئەوا خوای گەورەش هەموو خەمەكانی تری لە كۆڵ دەخات، وە هەر كەسێكیش خەمەكانی پەرت و بڵاو ببێتەوە بەدوای ماڵ و حاڵی دونیادا، ئەوا خوا لای گرنگ نییە لە چ دۆڵێكدا سەر لە قوڕ دەنێت ).

## ( ٤٢ ) ( بەرگری كردن لە ناموسی برای موسڵمانت )

( ٨٩٠ ) ( حم طب ) عن أسماء بنت یزید قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ ذَبَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيْهِ بِالْغَيْبَةِ كَانَ حَقّاً عَلىَ اللهِ أَنْ يُعْتِقَهُ مِنَ النَّارِ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٢٣٨) في صحيح الجامع

اسماء كچی یزید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك بەرگری لە شەرەف و ناموسی براكەی بكات لە كاتێكدا كە خۆی لەوێ نییە، ئەوا خوا كردوویەتی بە حەق بەسەر خۆیەوە كە لە ئاگری دۆزەخ رزگاری بكات ).

( ٨٩١ ) ( حم ت ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيْهِ رَدَّ اللهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٢٦١) في صحيح الجامع

ابو الدراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك لەسەر ناوو سومعەی براكەی رەت بداتەوە و هەڵبداتێ، ئەوا خوای گەورەش لە رۆژی قیامەتدا ئاگر لە دەم و چاوی رەت دەكاتەوە و دووری دەخاتەوە ) .

## ( ٤٣ ) ( دەربارەی غەیبەت و ئابڕوو بردنی خەڵك )

( ٨٩٢ ) ( حم خد ن هـ حب ك ) عن أسامة بن شريك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا عِبَادَ اللهِ! وَضَعَ اللهُ الْحَرَجَ إِلاَّ مَنِ اقْتَرَضَ عِرْضَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ ظُلْماً فَذَلِكَ الَّذِي حَرِجَ وَ هَلَكَ ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٣٤) في صحيح الجامع

اسامەی كوڕی شریك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویـەتی: ( ئەی بەندەكانی خوا، خوای گەورە هەموو ئەرك و زەحمەتێكی لاداوە، تەنها ئەو كەسە نەبێت كە بە زوڵم ناوو ئابڕووی كەسێكی موسڵمان دەشكێنێت، ئا ئەوەیە كە دووچاری زەحمەت و لە ناو چوون بووە ).

( ٨٩٣ ) ( حم د ) عن أبي برزة الأسلمي ( ٤ ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَ لَمْ يَدْخُلِ الإِيْمَانُ قَلْبَهُ! لا تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِيْنَ وَ لا تَتَّبِعُوا عَوْراتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ تَتَّبَعَ عَوْرَةَ أَخِيْهِ الْمُسْلِمِ تَتَّبَعَ اللهُ عَوْرَتَهُ وَ مَنْ تَتَّبَعَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ بَيْتِهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٨٢) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەی کۆمەڵی ئەوانەی کە بە دەم موسڵمان بوون و هێشتا باوەڕ نەچۆتە دڵیانەوە، غەیبەتی موسڵمان مەکەن و دوای ئابڕوو عەیبیان مەکەون، چونکە هەر کەسێك دوای ئابڕووی برا موسڵمانەکەی بکەوێت خوای گەورەش دوای ئابڕووی ئەو دەکەوێت، وە هەر کەسێکیش خوای گەورە دوای ئابڕوو ناموسی بکەوێت، ئەگەر لە ناو ماڵی خۆشیدا بێت هەر حەیا و ئابڕووی دەبات ).

( ٨٩٤ ) ( ت ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيْمَانُ إِلَى قَلْبِهِ! لا تُؤْذُوا الْمُسْلِمِيْنَ وَ لا تُعَيِّرُوهُمْ وَ لا تَتَّبِعُوا عَوْراتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيْهِ الْمُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ وَمَنْ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٨٤) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەی کۆمەڵی ئەوانەی کە بە زمان موسڵمانن و هێشتا باوەڕ نەچۆتە دڵیانەوە، ئازاری موسڵمانان مەدەن، وە عەیبداریان مەکەن، وە دوای ئابڕوو ناموسیان مەکەون، چونکە هەر کەس دوای ئابڕووی براکەی بکەوێت، ئەوا خوای گەورەش دوای ئابڕووی ئەو دەکەوێت، هەر کەسێکیش خوای گەورە دوای ئابڕووی بکەوێت، ئەوا ئەگەر لەناو جێگای ماڵەکەشیدا بێت هەر ئابڕووی دەبات ).

## ( ٤٤ )( فەزڵی پەردەپۆش کردنی عەیبی موسڵمانان )

( ٨٩٥ ) ( ٥ ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيْهِ الْمُسْلِمِ سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَ مَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيْهِ الْمُسْلِمِ كَشَفَ اللهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٢٨٧) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك عەیبی برا موسڵمانەکەی پەردەپۆش بکات، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا عەیبی ئەو پەردە پۆش دەکات، وە هەر کەسێکیش عەیبی برا موسڵمانەکەی هەڵماڵێت، ئەوا خوای گەورەش عەیبی ئەو هەڵدەماڵێت هەتا لەناو ماڵی خۆیدا ئابڕووی دەبات ).

( ٨٩٦ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لايَسْتُرُ اللهُ عَلَى عَبْدٍ فِي الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧١١) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هەر بەندەیەك لە دونیادا سەتر بكات و پەردەپۆشی بكات، ئەوا لە قیامەتیشدا هەر سەتری دەكات ).

( ٨٩٧ ) ( حم ) عن رجل قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ سَتَرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ فِي الدُّنْيَا سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٨٥ ) في صحيح الجامع

لە پیاوێكەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك لە دونیادا برا موسڵمانەكەی پەردە پۆش بكات، ئەوا خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا پەردە پۆشی دەكات ).

## ( ٤٥ ) ( فەزڵی سەردانی نەخۆش )

( ٨٩٨ ) ( د ك ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ عَادَ مَرِيْضاً لَمْ يَحْضُرَ أَجَلُهُ فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مَرَاتٍ: أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيْمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ أَنْ يَشْفِيَكَ إِلاَّ عَافَاهُ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ ﴾ . و اللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٨٦ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك سەردانی نەخۆشێك بكات كە ئەجەلی نەهاتبێت و ڕۆژی تەواو نەبوو بێت، ئینجا حەوت جار لە لای بڵێت: داوادەكەم لە خوای گەورە پەروەردگاری عەرشی گەورە كە شیفات بدات، ئەوا خوای سبحانە و تعالى چاكی دەكاتەوە لەو نەخۆشییە ).

## ( ٤٦ ) ( فەزڵی شاردنەوەی تووڕەیی )

( ٨٩٩ ) ( ٤ ) عن معاذ بن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ كَتَمَ غَيْظاً وَ هُوَ قَادِرٌ عَلَىَ أَنْ يَنْفِذَهُ دَعَاهُ اللهُ عَلَىَ رُؤُوسِ الْخَلائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّىَ يُخَيِّرَهُ مِنَ الْحُورِ الْعَيْنِ مَا شَاءَ ﴾ . اللفظ لأبي داود والترمذي و ابن ماجة. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٥١٨ ) في صحيح الجامع

معاذی كوڕی انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك توڕە بوونێك و رقێك بخواتەوە و بیشارێتەوە، لە كاتێكدا كە توانای ئەوەشی هەیە دەریببڕێت و بە جێی بگەیەنێت، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر سەری ئەو هەموو خەڵكەدا بانگی دەكات، هەتا سەر پشكی دەكات، كام لە حۆرییەكانی بەهەشت هەڵدەبژێریت ).

## ( ٤٧ ) ( سوپاس كردنی خەڵك )

( ٩٠٠ ) ( حم ت الضياء ) عن ابي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ لايَشْكُرِ النَّاسَ لايَشْكُرِ اللهَ ﴾ .و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٣٢ ) في صحيح الجامع

ابي سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کەسێك سوپاسی خەڵك نەکات، سوپاسی خواش ناکات ).

( ٩٠١ ) ( حم د حب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لايَشْكُرِ اللهَ مَنْ لايَشْكُرِ النَّاسَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧١٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( سوپاسی خوا ناکات، ئەو کەسەی سوپاسی خەڵك نەکات).

( ٩٠٢ ) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ لايَشْكُرِ النَّاسَ لايَشْكُرِ اللهَ ﴾ و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٩٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کەسێك سوپاسی خەڵك نەکات سوپاسی خواش ناکات ).

## ( ٤٨ ) ( سەرخستنی موسڵمانێك كە خۆی لەوێ نەبێت )

( ٩٠٣ ) ( هق الضياء ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ نَصَرَ أَخَاهُ بِظَهْرِ الْغَيْبِ نَصَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَ الآخِرَةَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٥٧٣) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کەسێك براکەی سەرخات و بەرگری لێبکات لە حاڵێکدا کە خۆی لەوێ نەبێت، ئەوا خوای گەورە لە دونیا و قیامەتدا سەری دەخات ).

## ( ٤٩ ) ( هەر كەسێك نەهامەتییەك لە كۆڵ بڕوادارێك بكاتەوە )

( ٩٠٤ ) ( حم م د ت هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَ مَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَ الآخِرَةِ، وَ مَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَ الآخِرَةِ، وَ اللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَ مَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْماً سَهَّلَ اللهُ لَهُ طَرِيقاً إِلَى الْجَنَّةِ، وَ مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ وَ يَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَ غَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَ ذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَ مَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ ﴾ و اللفظ لمسلم. (حسن أنظر حيث رقم (٦٥٧٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کەسێك نەهامەتییەك لە نەهامەتییەکانی دونیا لەسەر موسڵمانێك سووك بکات، ئەوا خوای گەورەش نەهامەتییەك لە نەهامەتییەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر سوك دەکات، وە هەر کەسێکیش دەست گیرۆیی کەم دەرامەتێك بکات، خوای گەورەش لە دونیا و قیامەتدا دەست گیرۆیی دەکات، وە هەر کەسێکیش موسڵمانێك پەردەپۆش بکات، خوای

گەورەش لە دونیا و لە قیامەتدا پەردە پۆشی دەکات، وەخوای گەورە لە هاوکاری بەندەی خۆیدایە هەتا ئەو بەندەیە لە هاوکاری براکەیدا بێت، وە هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ بەدەست هێنانی زانیارییەك، ئەوا خوای گەورەش ڕێگایەکی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەکات، وە هیچ کۆمەڵێك نییە کە لەماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆ ببنەوە، قورئانەکەی خوا بخوێننەوە و لەنێوان خۆیاندا وداراسەی بکەن، ئیلا دڵ ئارامی و هێوری بەسەریاندا دەبارێت، وە ڕەحمەت دایان دەپۆشێت و فریشتەکانیش دەوریان دەدەن وە خوای گەورەش لای ئەوانەی خۆی باسیان دەکات، وە هەرکەسێك کارو کردەوەکانی خۆی دوای بخەن، ئەوا نەسەب و ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخەن ).

## ( ٥٠ ) ( ڕەحم کردن بە خەڵك )

**( ٩٠٥ ) ( حم ق ت ) عن جرير ( حم ت ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ مَنْ لا يَرْحَمِ النَّاسَ لايَرْحَمُهُ اللهُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٥٩٦ ) في صحيح الجامع**

لە جرير ـە وە ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەوەی ڕەحم بە خەڵك نەکات، خواش ڕەحمی پێ ناکات ).

## ( ٥١ ) ( جێبەجێ کردنی کاری موسڵمانان )

**( ٩٠٦ ) ( ابن أبي الدنيا في قضاء الحوائج ) عن جابر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ مَنْ يَكُنْ فِي حَاجَةِ أَخِيْهِ يَكُنِ اللهُ فِي حَاجَتِه ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦١٨ ) في صحيح الجامع**

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك لە هەوڵی جێبەجێ کردنی پێداویستی براکەیدا بێت، ئەوا خوای گەورەش لە جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی ئەودایە ).

## ( ٥٢ ) ( موسڵمان برای موسڵمانە )

**( ٩٠٧ ) ( حم ق ٣ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لا يَظْلِمُهُ وَ لا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيه كَانَ اللهُ فِي حَاجَتِه، وَ مَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَ مَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ . و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦٨٥ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێ ناکات، دەست بەرداری نابێت، وە هەرکەسێکیش لە هەوڵی جێبەجێکردنی پێداویستی براکەیدا بوو، خواش لە

جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی ئەودایە، وە هەرکەسێکیش نەهامەتییەك لا بەرێت لەسەر موسڵمانێك، خوایش نەهامەتییەك لە نەهامەتییەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەبات، وە هەر کەسێك موسڵمانێك پەردە پۆش بکات، خوایش لە ڕۆژی قیامەتدا پەردە پۆشی دەکات ).

## ( ٥٣ ) ( موسڵمان کێ یە ؟ )

**( ٩٠٨ ) ( خ د ن ) عن ابن عمرو: ﴿ الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ وَ الْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَانَهَى اللهُ عَنْهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧٠٨ ) في صحيح الجامع**

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت بن، وە کۆچەریش ئەو کەسەیە کە کۆچ لەو شتانە بکات کە خوا نەهی لێکردوون ).

## ( ٥٤ ) ( پیاهەڵدانی خەڵك )

**( ٩٠٩ ) ( حم ق د ن ) عن أبي بكرة رضي الله عنه قال: أنَّ رَجُلاً ذُكِرَ عِنْدَ النَّبيّ(ﷺ) فَأَثنى عَلَيْه رَجُلٌ خَيْراً، فَقَالَ النبيّ(ﷺ): ﴿ وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِك، يَقُولُهُ مراراً ،إنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادحاً لامَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسَبُ كَذا وكَذا إنْ كَانَ يَرى أنَّهُ كَذَلِكَ وَ حَسِيبُهُ اللهُ وَ لايُزَكّي عَلَى اللهِ أَحَداً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١٣٠ ) في صحيح الجامع**

ابی بکرە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ: ( پیاوێك باس کرا لەلای پێغەمبەر(ﷺ)، پیاوێکیش بە چاك باسی کرد و پیای هەڵدا، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ( وەی بۆ تۆ ،ملی هاوڕێکەی خۆتت شکاند، ( چەند جارێك هەر دەیوتەوە )، ئەگەر یەکێکتان هەر چار نەبوو ویستی مەدحی کەسێك بکات با بڵێت: من وای تێدەگەم و پێم وایە کە ئاواو ئاوایە، ئەگەر بە ڕاستی پێی وابوو کەوایە، وە خوا خۆی حیسابی لەگەڵ دەکات و دەیناسێت، وە کەسێکیش با پاکانەی کەسێك نەکات بەسەر خوادا).

### ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە :

دەبێت لێرەدا جیاوازی بکرێت لە نێوان بەباشی باس کردنی موسڵمانێك کە خۆی لەوێ نەبێت، وە دانانی ڕێز و حورمەت بۆی کە ئەمەیان بە پێی فەرموودەکانی پێشتر کارێکی چاکە و پاداشتی لەسەرە، وە لەنێوان مەدح و پیاهەڵدان لەبەردەم کەسەکە خۆیدا کە ئەمەش. هەر وەك پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەکەدا دەیلێت دەبێتە مایەی مل شکاندنی ئەو کەسە، چونکە بە خۆ نازین و غرور و فیز و دەعیەی تێدا دروست دەکات و وای لێ دەکات لە خۆی بایی ببێت، وە ئەگەر هەر مەدحی کەسێکی کرد با بلێ من وای تێدەگەم و خوایش خۆی باشتر بەندەی خۆی دەناسێت.

## ( ٥٥ ) ( جوێن دان بە کات و زەمان )

**( ٩١٠ ) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ وَ لا تَقُولُوا خَيْبَةَ الدَّهْرِ فَإِنَّ اللهَ هُوَ الدَّهْرُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٣١٧ ) في صحيح الجامع**

**ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوويەتی: ( ناوی ترێ مەبەن بە ( كَرْم ) وە مەشڵێن زەمانێکی نابوتە، چونکە خوا خۆی زەمانە ).**

**( ٩١١ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَسُبَّ أَحَدُكُمْ الدَّهْرَ فَإِنَّ اللهَ هُوَ الدَّهْرُ، وَلا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ لِلْعِنَبِ: الْكَرْمَ فَإِنَّ الْكَرْمَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٧٠٠ ) في صحيح الجامع**

**ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوويەتی: ( کەستان جوێن بە زەمان مەدەن، چونکە خوا خۆی زەمانە، وە کەسیشتان بە ترێ نەڵێت (كَرْم )، چونکە (كَرْم) پیاوی موسڵمانە ).**

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

**(کرم) لە زمانی عەرەبیدا واتە بەخشش و دڵ سەخاوەتی، جا کۆن عەرەبەکان بە ترێ ( عنب) یان وتوە ( کرم )، بەو واتایەی کە شەرابي لێدروست دەکرێت و مەی دەبەخشێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لەو ناوە دەکات کە لە ترێ بنرێت، بەڵکو دەفەرمووێت کە موسڵمان خۆی شیاوی ئەو ناوەیە کە دڵی پڕ لە بەخشش و سەخاوەتە .**

**هەروەها جوێن نەدان و سەرزەنشت نەکردنی سەردەم و زەمانەش لەوەوە دێت، کە خەڵك هەڵەن کاتێك جوێن بە زەمان و سەردەم دەدەن و سەرزرەنشتی دەکەن، چونکە زەمان و سەردەم هیچی بە دەست نی یە وە هیچیشی لە تواناداا نییە بەڵکو خوای گەورە خۆی هەڵسوێنەری چەرخ و زەمانە، وە هەموو ڕووداوەکان بە وویستی خوایە نەك زەمانە، وە تۆ کاتێك کە گلەیی لە زەمان دەکەیت واتە گلەیت لە خوا کردووە، یان جنێوت بە خوا داوە، خوا پەنامان بدات. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت خوا خۆی زەمانە، واتە خوای گەورە خۆی کارگێڕی زەمانەو سەردەمەکەیە .**

## ( ٥٦ ) ( نەفرەت کردن )

**( ٩١٢ ) ( د ت ك ) عن سمرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تَلاعَنُوا بِلَعْنَةِ اللهِ وَلا بِغَضَبِهِ وَلا بِالنَّارِ ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٧٤٣٩ ) في صحيح الجامع**

**سمرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوويەتی: ( نە بە نەفرەتی خوا نەفرەت لە یەکتر بکەن، وە نە بە غەزەبی خوا و نەبە ئاگری خواش ).**

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

واتە: بە یەکتر مەڵێن بەر نەفرەتی خوا کەویت یان بەر غەزەبی خوا بکەویت یان بەر ئاگری خوا بکەویت ) .

## ( ٥٧ ) ( فەزڵی ئارامی و خۆراگری )

( ٩١٣ ) ( ت حب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿لا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ شَوْكَةً فَمَا فَوْقَهَا إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ بِها دَرَجَةً وَ حَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً ﴾. و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧١٩) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ شتێك نییە کە توشی موسڵمان ببێت، لە درکێك و بەرەو سەرەوە، ئیلا خوا پلەیەکی بۆ پێ بەرز دەکاتەوە، و تاوانێکیشی بۆ پێ هەڵدەوەرێنێت ).

## ( ٥٨ ) ( هەموو بەندەو کەنیزەی خواین )

( ٩١٤ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَ أَمَتِي ،كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللهِ وَ كُلُّ نِسَائِكُمْ إِماءُ اللهِ وَ لَكِنْ لِيَقُلْ: غُلامِي وَ جَارِيَتِي وَ فَتَايَ وَ فَتَاتِي ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧٥٧) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کەستان نەڵێت: بەندەی من و کەنیزەی من، هەمووتان بەندەی خوان، وە هەموو ژنەکانیشتان کەنیزەکی خوان، بەڵام با بڵێن: غولامی من و جارییەی من، کوڕی من و کچی من ).

( ٩١٥ ) ( د ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَ أَمَتِي وَ لا يَقُولَنَّ الْمَمْلُوكُ رَبِّي وَ رَبَّتِي وَ لْيَقُلِ الْمَالِكُ فَتَايَ وَ فَتَاتِي وَ لْيَقُلِ الْمَمْلُوكُ سَيِّدِي وَ سَيِّدَتِي فَإِنَّكُمْ الْمَمْلُوكُونَ وَ الرَّبُّ اللهُ تَعَالَى﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧٦٥) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کەستان نەڵێت بەندەی من و کەنیزەی من، وە ئەوانیش ( مەملوکەکان ) نەڵێن ئاغای پەروەردگارم و خانمی پەروەردگارم، با خاوەندارەکە بڵێت: کوڕەکانم و کچەکانم، وە با ئەوانیش ( مەملوکەکان ) بڵێن: ( ئاغام ( گەورەم ) – خانمم ) چونکە ئێوە موڵکی خوان و پەروەردگاریش هەر خوای گەورەیە ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکانی ئەم بەشە :

بەڕاستی ئەم ئایینی ئیسلامە ئایینێکی بەرز و ناوازەیە، بەرزە لە دەقەکانیدا، بەرزە لە ناوەرۆکیدا، ناوازەیە لە لێکدانەوەکانیدا، سەرسور هێنەرە لە چارەسەری بۆ کێشەکاندا، بێ وێنەیە لە تێکڕای لایەن و بوارەکانیدا، هیچی نەپەڕاندووە، لە گرنگترین مەسەلەکانی بوونەوەر و ژیانەوە هەتا بچوکترین گرفتەکانی مرۆڤی لەبیر نەکردووە، باسی لە هەموو شتێك کردووە، لە هەمووشیدا سەرکەوتوو بووە، ئێستا لەبیرمە کە منداڵ بووم، ڕۆژێکیان مەلایەکی پیری نورانی پێی ووتم: کوڕم، ئەم ئیسلامە عەزیمە ئەمەندە گشت گیر و هەمە لایەنە کە بۆ نموونە تەنها مەسەلەیەکی لاوەکیی وەکو چوونە سەر ئاوو تارەت گرتن کە هیچ کام لەو فیکر و بەرنامانەی کە ئەمڕۆ لە جیهاندا هەن و بە حیسابی خۆیان خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکەن خۆیان لێ نەداوە و بە شیاوی باسکردنیان نەزانیوە، بەڵام لە ئیسلامی پیرۆزدا تەنها لەسەر ئەم مەسەلەیە ( ٢٧ ) ئەدەبی لەسەر هاتووە، کە هەمووی لە خزمەت مرۆڤەکان و زیاتر پاك ڕاگرتنیان و فێرکردنیانە بەبەرزترینی ئەو ڕەوشت و ئاکارانەی کە لە نرخی مرۆڤایەتی مرۆڤ بەرز دەکەنەوە و ڕێزی تایبەتی دەدەنێ، ئەمە چ جای مەسەلە گرنگەکانی تری ژیان کە ئیسلامی پیرۆز لە هەموویاندا ئەسپی خۆی تاو داوە و بە ئەندازەی بڕکردنی چاو هەموو بەرنامە و بیردۆزەکانی تری ژیانی لە دوای خۆیەوە بە جێ هێشتووە، بەڵێ جا دەبێت هەر وا بێت بەرنامەیەك کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکان بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی خۆی دایبڕێژێت لە کوێ و، بیرۆکە دەست کردەکانی مرۆڤیش لە کوێ، کە هەموویان تەنها زیان و ماڵ کاولی نەبێت هیچی تریان بەسەر مرۆڤایەتی نە هێناوە، جا ئەم کۆمەڵە ئاکارو ئەدەبانەی کە لەم چەند فەرموودە پیرۆزانەی ڕابردوودا بە خزمەتیان گەیشتین و- لە خوارەوەدا بە کورتی کۆیان دەکەینەوە- تەنها چەپکە گوڵێکن لە باغی ئیرەمی بەها بەرز و ڕەسەنەکانی ئیسلام و ئەو ڕەوشتە ئیسلامیانەی کە هەر تەنها موسڵمان دەتوانێت هەڵگریان بێت، چونکە ئەو ڕەوشت و ئەدەبە جوانانە بە بێ بڕوابوون بە خواو هەست کردن بە چاودێری ئەو لە هەموو کات و شوێنێکدا، هەرگیز کەسێك نییە بتوانێت هەموویان لە خۆیدا کۆبکاتەوە و وێنەیەکی بەرجەستە بێت بۆیان.

## ئەدەب و ئاکاری موسڵمان:

١- ڕاستگۆیە و هەوڵی ڕاستگۆیی دەدات .

٢- ڕقی لە درۆیەو خۆی لێدەپارێزێت .

٣- زمانی دەپارێزێت و لە خۆیەوە قسە فڕێ نادات .

٤- نەرم و نیانە لەگەڵ خەڵکی ماڵەکەی و هەموو موسڵمانانەدا .

٥- زمان لوس و ماستاو چی نییە .

٦- بە فیز و دەعیە و دەنگ بەرزو هەڵپەچی نییە بۆ دونیا .

٧- ئەگەرکارێکی کرد بە باشی ئەنجامی دەداو بێ کەم و کوڕی تەواوی دەکات .

٨- ئەگەر پژمی سوپاسی خوا دەکات و براکانیشی داوای رەحمەتی لە خوا بۆ دەکەن .

٩- باوێشك بە دەنگی بەرز نادات و دەست بە دەمییەوە دەگرێت .

١٠-رێز لە پیر و سەر سپی دەگرێت .

١١- رێز لە لێپسراو و کاربەدەستی داد پەروەر دەگرێت .

١٢-توند رەوی لە قورئان و بەرنامەی خوادا ناکات و لەهەمان کاتدا شل گیری وکەمتەرخەمیشی تێدا ناکات .

١٣-کلیلی خێر و چاکەیە بۆ خەڵك ، ورێگری زەرەر و خراپەیە بۆ خەڵك.

١٤-کە راکشا بەسەر سکدا راناکشێت .

١٥-لە نیوە شەودا گاڵتە و گەپ و دەنگ و هەرا ناکات و خەڵك بێزار ناکات .

١٦-بەرگ وپۆشاکی پاك و جوان لەبەر دەکات ، بەڵام خۆی پێوە هەڵناکێشێت .

١٧-لە خۆشی و ناخۆشیدا خوای گەورەی لە یادە .

١٨-لەسەرخۆیە و پەلە ناکات .

١٩-سوپاس ژمێری نیعمەتەکانی خوایە و وەك پێ زانینێك باسیان دەکات .

٢٠-لە جەنگ و رووبەڕووبونەوەدا خۆی دەکات بە قەڵغان بۆ هاوڕێکانی و لە مردن ناترسێت و تامەزرۆی گەیشتن بە خوایە .

٢١-دوو دڵ و ڕاڕا نییە لە ئاست کاری خواداو، لە رەحمەتی خواش بێ ئومێد نییە .

٢٢-لەکاتی سەفەردا لە هەموو هاوڕێکانی زیاتر خزمەت دەکات و شەو پاسەوانیان دەکات هەتا ئەوان بحەوێنەوە .

٢٣-چاك و بە خزمەت دەبێت بۆ دراوسێ، وە ئەگەر دراوسێ ئازاری داو کێشەی بۆ نایەوە، لەبەر خوای گەورە دان بە خۆیدا دەگرێت خراپە بە خراپە وەڵام ناداتەوە .

٢٤-لە کڕین و فرۆشتندا سوێند خۆر نییە .

٢٥-ئەگەر هەژار بوو ناشوکر نی‌یە .

٢٦-رەزیل و منەت کار نییە .

٢٧-دڵی پڕ لە رەحم و سۆزە بەرامبەر بە خەڵکی .

٢٨-باشترین کەسە بۆ هاوڕێ و دراوسێ .

٢٩-دار وسەوزایی نابڕێتەوە، کاول ناکات، ئاوەدان دەکات.

٣٠-ئەگەر کەسێکی خۆش ویست ئەوا لەبەر خوا خۆشی دەوێت ،وە ئەگەر رقیشی لێی بوو لەبەر خوا رقی لێی دەبێت .

٣١-لەبەر خوا سیلەی رەحم بە جێ دەهێنێت و خزمایەتی نافەوتێنێت .

٣٢-لەبەر خوا ئامۆژگاری برایانی موسڵمانی دەکات و لەبەر خوا سەردانیان دەکات و لەبەر خواش دەست گیرۆییان دەکات .

٣٣-ڕێ لە دایك و خوشك و كچ و خێزانی ناگرێت كە هەر گیز لە ماڵ نەچنە دەرەوە و بەندی ماڵەوەیان ناكات .

٣٤-لەگەڵ برسییەكی بینی لە ماڵی خۆی تێری دەكات، ئەگەر خۆیشی نەیبوو لای خەڵكی تر هەوڵی بۆ دەدات .

٣٥-میوانداری دەكات و لەبەشی خۆی و ماڵ و منداڵی دەبورێت بۆ میوانەكەی .

٣٦-بە جۆرێك رێز لە میوان دەگرێت كە میوانەكە هەست نەكات بۆتە ئەرك لەسەریان وە یان وا هەست بكات كە بەشی ئەوانی خواردووە .

٣٧- هیچ كارێكی چاكە بە كەم و بێ نرخ نازانێت .

٣٨-بە فریای لێقەوماوەوە دەچێت .

٣٩-تەنانەت مافی گیانلەبەرانیش دەپارێزێت و ڕێگە نادات كەس ئاژەڵێك ئەتك بكات .

٤٠-هەرگیز پشتی برای موسڵمان بەر نادات و دەست بەرداری نابێت .

٤١- ئەگەر براكەشی لەوێ نەبوو ڕێگە نادات خەڵك بە خراپی باس و غەیبەتی بكەن.

٤٢-لە ڕۆشتندا فیز و خۆ بەزل گرتنی پێوە دیار نییە .

٤٣-ئەگەر دووچاری هەر بەڵا و ناخۆشی و مەینەتی و هەژاری و نەخۆشییەك بوو خۆ ڕاگر دەبێت و سوپاسی خوای لەسەر دەكات و چاوەڕێی پاداشتی نەبڕاوەی خوایە، و چەكی ئەو بەرامبەر هەموو نارەحەتییەكان سەبرو ئارامییە .

٤٤-دەست پاك و دەم پاك و داوێن پاك و دوورەپەرێزە لە حەرام .

٤٥-تەماعی لەماڵ و سامانی خەڵك نییە و چاوەڕێی دەستی خەڵك ناكات .

٤٦-بێ ڕێز سەیری ناوی باوك و ڕەچەڵەكی خۆی ناكات و ناوی خۆی ناداتە پاڵ ناوی كەسێكی غەیری باوكی .

٤٧-هاوكاری ستەم كار ناكات و نابێتە دەست و پێوەندی.

٤٨-لەسەر خوێنی موسڵمان و مافی موسڵمانان پاروی حەرام ناخوات .

٤٩-بە خراپی لە هیچ كۆڕێكدا باسی برای موسڵمانی خۆی ناكات .

٥٠-لەبەر خاتری خەڵك خوا لە خۆی ناڕەنجێنێت .

٥١- خەمی سەرەكی ئەو یەك خەمە، ئەویش خەمی قیامەتە .

٥٢-عەیب و عاری موسڵمانان هەڵنامالێت و ئابڕووی خەڵك نابات .

٥٣-ئەگەر موسڵمانێك عەیبێكی هەبوو بۆی پەردە پۆش دەكات و سەتری دەكات.

٥٤-نەخۆش بەسەر دەكاتەوە و دوعای خێری بۆ دەكات .

٥٥-ئەگەر توورەی بكەن و دڵی بێشێنن، توڕەیەكەی خۆی دەخواتەوە و لەبەر خوا دەری ناخات و ڕەدی ناداتەوە .

٥٦-هەر كەسێك چاكەیەكی لەگەڵ كرد سوپاسی دەكات. و لەبەر چاوییەتی .

٥٧-هەتا پێی بکرێت هەوڵ دەدات کێشەی موسڵمانان چارەسەر بکات و نەهامەتیەکانیان نەهێڵێت.

٥٨-هەوڵ دەدات رێگەیەك بگرێتە بەر کە زانیاری زیاتری تێدا دەستەبەر بکات .

٥٩-لە دەرس و دەوری مزگەوتەکاندا بەشداری دەکات بۆ فێربوونی قورئان و زیکری خوا .

٦٠-ئومێدی بە کارە چاکەکانی خۆیەتی، نەك بە رەچەڵەك و پشت بەستن بەوەی کە من نەوەی فلان و فیسارم .

٦١-هەوڵ دەدات کە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت بن.

٦٢-ئەو شتانەی کە خوا نەهی لێکردوون وازیان لێ دەهێنێت .

٦٣-مەدح و پیاهەڵدانی کەس ناکات لە رووی خۆیدا.

٦٤-جوێن بە کات و زەمانەو سەردەم نادات و دەزانێت خوای گەورە کارگێڕی بونەوەرە .

٦٥-ناوی شیاو بۆ شتی شیاو و لەکات و شوێنی شیاودا بەکاردەهێنێت .

٦٦- بە خەڵك ناڵێت بە لەعنەت بیت، بەر غەزەبی خوا بکەویت، بەر ئاگری خوا بکەویت .

٦٧-بە خزمەت کار و بەردەستی ناڵێت عەبدەکەم، بەڵکو کوڕەکەم، کچەکەم .

٦٨-ئەگەر بەردەست بوو بە گەورەی ناڵێت پەروەردگارم، بەڵکو ئاغام، بە ڕێزم .

٦٩-ئەگەر خەوێکی خۆشی بینی سوپاسی خوای لەسەر دەکات و دەیگێڕێتەوە وە ئەگەر خەوی ناخۆشی بینی پەنا بە خوا دەگرێت و نایگێڕێتەوە .

بەڵێ خوێنەری بەڕێز، ئەمانە تەنها چەند رەوشت و ئاکارێکن کە تەنها لە فەرموودە قودسی یەکاندا هاتوون و پێشەوای مرۆڤایەتی فێری شوێن کەوتوانی ئەم ئایینە پیرۆزەی دەکات ،وە هەر یەك لەو سیفەت و ئاداب و خەسڵەتانەش پێش وەخت لە خۆیدا بینراوەو کاری پێ کردووە پاشان فێری ئومەتەکەی دەکات، بۆیە ئەم جارەش دەڵێین:

خوایە بڕژێنە لێزمە بارانی رەحمەت بەسەر گیانی موحەممەد هەتا قیامەت .

# (( بەشی: سیلەی رەحم ))

## (١) ( فەزڵی سیلەی رەحم )

( ٩١٦ ) ( ع ) عن رجل من خثعم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلىَ اللهِ إِيْمَانٌ بِاللهِ ثُمَّ صِلَةُ الرَّحِمِ ثُمَّ الأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَ النَّهِيُ عَنِ الْمُنْكَرِ ،وَ أَبْغَضُ الأَعْمَالِ إِلىَ اللهِ الإِشْرَاكُ بِاللهِ ثُمَّ قَطِيْعَةُ الرَّحِمِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٦٦ ) في صحيح الجامع

پیاوێك لە خثعم دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خۆشەویسترینی کارەکان لە لای خوا، باوەڕ بوون بە خوایە، پاشان سیلەی رەحم، پاشان فرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، وە قێزەوەنترین کارەکانیش لەلای خوا شەریك پەیدا کردنە بۆ خوا و و پاشان پچڕاندنی سیلەی رەحم ).

( ٩١٧ ) ( ق ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالىَ خَلَقَ الْخَلْقَ حَتَّى إِذا فَرِغَ مِنْ خَلْقِه قَامَتِ الرَّحِمُ فَقالَ: مَه؟ قَالت: هَذا مَقَامُ العَائِذُ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ . أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَ أَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلىَ يَا رَبِّ، قَالَ: فَذَاكِ لَكِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٦١ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا دروست کراوەکانی دروست کرد، هەتا کاتێك لە دروست کردنیان تەواو بوو رەحم راست بوەوە، خواش فەرمووی: ها چییە ؟ ئەویش وتی: ئەمە باشترین شوێنە بۆ پەنا گرتن بە تۆ لە پچڕاندنم. خواش فەرمووی: بەڵێ، ئەی رازی نابیت هەر کەسێك تۆ بگەیەنێت منیش بیگەیەنم وە هەر کەسێکیش تۆ بپچڕێنێت منیش بیپچڕێنم ؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارە، فەرمووی: دەی وا ئەوەم دا بە تۆ ).

( ٩١٨ ) ( خ ) عن أبي هريرة وعائشة قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الرَّحِمُ شِجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمَنِ ، قَالَ اللهُ: مَنْ وَصَلَكِ وَصَلْتُهُ وَ مَنْ قَطَعَكِ قَطَعْتُهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٥٣٦ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( رەحم داتاشراوە لە رەحمانەوە، خوا فەرمویەتی: هەر کەسێك بتگەیەنێت دەیگەیەنم، وە هەر کەسێکیش بتپچڕێنێت منیش دەی پچڕێنم ).

( ٩١٩ ) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَقُولُ: مَنْ وَصَلَنِي وَصَلَهُ اللهُ وَ مَنْ قَطَعَنِي قَطَعَهُ اللهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٥٤٨ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( رەحم بە عەرشەوە هەڵواسراوە و دەڵێ: هەر کەس بمگەیەنێت خواش دەیگەیەنێت، وەهەر کەس بم پچڕێنێت خواش دەی پچڕێنێت ).

**( ٩٢٠ ) ( حم خد د ت ك ) عن عبدالرحمن بن عوف ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالىَ: أَنَا خَلَقْتُ الرَّحِمَ وَ شَقَقْتُ لَهَا إِسْماً مِنْ إِسْمِي فَمَنْ وَصَلَها وَصَلْتُهُ وَ مَنْ قَطَعَهَا قَطَعْتُهُ وَ مَنْ بَتَها بَتَتَهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣١٣ ) في صحيح الجامع**

له عبد الرحمن ی كوڕی عەوفەوە لە أبو هريرة وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە فەرمـوويەتی: من خۆم ڕەحمم دروست كردووە و ناوێكیشم بۆ داتاشیوە لە ناوی خۆم، جا هەر كەس بیگەیەنێت دەیگەیێنم، وە هەر كەسێكیش بیپچڕێنێت منیش دەیپچڕێنم، وەهەر كەسێك دەستی لێ بەر بدات و نەچێتەوە سەری منیش دەستی لێ بەردەدەم و ناچمەوە سەری ).

**( ٩٢١ ) ( هق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَيْسَ شَيْءٌ أُطِيعَ اللهَ تَعالىَ فِيْهِ أَعْجَلُ ثَواباً مِنْ صِلَةِ الرَّحِمِ ،وَ لَيْسَ شَيْءٌ أَعْجَلَ عِقَاباً مِنَ الْبَغْيِ وَ قَطِيْعَةُ الرَّحِمِ ،وَ الْيَمِينُ الْفَاجِرَةُ تَدَعُ الدِّيَار بَلاقِعَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٣٨٩ ) في صحيح الجامع**

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هیچ شتێك نییە كە گوێ ڕایەڵی خوای گەورەی پێ كرابێت هێندەی سیلەی ڕەحم پاداشتەكەی خێرا بێت، وە هیچ شتێكیش هێندەی دەست درێژی و پچڕاندنی ڕەحم تۆڵە و سزاكەیان بە پەلە نییە، وە سوێندخواردنی درۆش ئاوەدانی و وڵات دەكاتە كەلاوە و وێرانە ).

**( ٩٢٢ ) ( طب ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللهُ تَعالىَ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا مَعَ مَا يَدَّخِرُهُ لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ قَطِيعَةِ الرَّحِمِ وَ الْخِيَانَةِ وَ الْكَذِبِ ،وَ إِنَّ أَعْجَلَ الطَّاعَةِ ثَواباً لَصِلَةُ الرَّحِمِ ،حَتَّى إِنَّ أَهْلَ الْبَيْتِ لِيَكُونُوا فَجَرَةً فَتَنْمو أَمْوالُهُمْ وَ يَكْثُرُ عَدَدُهُمْ إِذَا تَوَاصَلُوا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٠٤ ) في صحيح الجامع**

ابي بكرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( هیچ تاوانێك نییە شایستە تر بێت كە خوا تۆڵە و سزاكەی لە دونیادا پێش بخات بۆ خاوەنەكەی لەگەڵ ئەو سزایەش كە بۆی هەڵگرتووە بۆ قیامەت هێندەی پچڕاندنی ڕەحم و خیانەت و درۆ، وە خێراترین تاعەت وخوا پەرستی لە پاداشتدا بریتییە لە سیلەی ڕەحم، تەنانەت خانەوادەی وا هەیە كە بەد و خراپە كارن بەڵام ماڵ و سامانیان هەر پەرە دەستێنێت و ژمارەشیان هەر زۆر دەبێت ئەگەر سیلەی ڕەحم لە نێوان خۆیاندا بە جێ بگەیەنن ).

**( ٩٢٣ ) ( حم د ن ) عن أنس: ﴿ مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَعْظُمَ اللهُ رِزْقَهُ وَ أَنْ يَمُدَّ فِي أَجَلِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٩٠ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: ( كێ پێی خۆشە كە خوا ڕزقی بۆ گەورە بكات و تەمەنیشی بۆ درێژ بكات، باسیلەی ڕەحمی خۆی بگەیەنێت ).

## ( ٢ ) ( خزمەتی ماڵ و منداڵ )

( ٩٢٤ ) ( **عبدالله في زوائد الزهد** ) عن الحسن مرسلا قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **أَحَبُّ الْعِبَادِ إِلىَ اللهِ تَعالىَ أَنْفَعُهُمْ لِعِيَالِه** ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٢ ) في صحيح الجامع

له (حسن) ـه وه به (مرسل)ی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خۆشەویسترینی بەندەکان لەلای خوای گەورە، بە سودترینیانە بۆ ماڵ و منداڵی خۆی ).

## ( ٣ ) ( سود گەیاندن بە خەڵك )

( ٩٢٥ ) ( **ابن أبي الدنيا في قضاء الحوائج طب** ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **أَحَبُّ النَّاسِ إِلىَ اللهِ أَنْفَعُهُمْ وَ أَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلىَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ سُرورٌ تُدْخِلُهُ عَلىَ مُسْلِمٍ أَوْ تَكْشِفُ عَنْهُ كُرْبَةً أَوْ تَقْضَي عَنْهُ دَيْناً أَوْ تَطْرُدَ عَنْهُ جُوعاً وَ لَأَنْ أَمْشيَ مَعَ أَخِي الْمُسْلِمِ في حَاجَةٍ أَحَبُّ إِليَّ مِنْ أَنْ أَعْتَكِفَ فِي الْمَسْجِدِ شَهْراً وَ مَنْ كَفَّ غَضَبَهُ سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ وَ مَنْ كَظَمَ غَيْظاً وَ لَوْ شَاءَ أَنْ يُمْضِيَهُ أَمْضَاهُ مَلأَ اللهُ قَلْبَهُ رِضىً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَ مَنْ مَشىَ مَعَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ في حَاجَتِهِ حَتَّى يُثْبِتَها لَهُ أَثْبَتَ اللهُ تَعالىَ قَدَمَهُ يَوْمَ تَزِلُّ الأَقْدَامُ وَ إِنَّ سُوءَ الْخُلُقِ لَيُفْسِدُ الْعَمَلَ كَمَا يُفْسِدُ الْخَلُّ الْعَسَلَ** ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٦ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خۆشەویست ترین خەڵك لەلای خوا سود بەخشترینیانە، وە خۆشەویسترین کارەکان لە لای خوای گەورە، خۆشی و شادییەکە کە بیخەیتە دڵی موسڵمانێکەوە، یان لادانی نەهامەتییەکە لەسەری یان دانەوەی قەرزێکە بۆی، یان برسێتییەکەی لە کۆڵ بکەیتەوە، وەمن کەلەگەڵ برایەکی موسڵماندا بڕۆم بۆ جێ بەجێکردنی کارێکی، لام خۆشەویسترە لەوەی کە یەك دانە مانگ لە مزگەوتدا ئیعتکاف بکەم و بمێنمەوە، وە هەر کەسێکیش تورەیی خۆی راگرێت، خواش عەیب و عاری بۆ پەردەپۆش دەکات، وە هەر کەسێك رقێك بخواتەوە، وە ئەگەر بیشیویستایە لە توانایدا هەبوو کە رقەکەی بڕژێت، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا دڵی پڕ دەکات لە رەزامەندی، وە هەر کەسێکیش لەگەڵ برایەکی موسڵمانیدا بڕوات بۆ جێبەجێ کردنی کارێکی هەتا تەواو بۆی دادەمەزرێنێت،ئەوا خوای گەورەش پێی ئەو کەسە ڕاگیرو دامەزراو دەکات لەو رۆژەدا کە پێکانی تێدا دەترازێن، وە رەوشتی خراپ و ناشرین کاروکردەوەکان خراپ دەکات هەروەك چۆن سرکە هەنگوین خراپ دەکات ).

( ٩٢٦ ) ( **طب** ) عن أسامة بن شريك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **أَحَبُّ عِبَادِ اللهِ إِلىَ اللهِ أَحْسَنَهُمْ خُلُقاً** ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٩ ) في صحيح الجامع

ئسامەی کوڕی شریك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خۆشەویسترینی بەندەکانی خوا لە لای خوا ئەوەیانە کە لە هەموویان رەوشتی باشترە ).

## ( ٤ ) ( راگرتنی دڵی دایك )

**( ٩٢٧ ) ( خد ه طب ك ) عن المقدام قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ يُوصِيكُمْ بِأُمَّهَاتِكُمْ- ثَلاثاً-إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُوصِيكُمْ بِآبَائِكُمْ- مَرَّتَيْنِ-إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُوصِيكُمْ بِالأَقْرَبِ فَالأَقْرَبِ ﴾.**

**( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٢٤ ) في صحيح الجامع**

مقداد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوا ڕاتان دەسپێرێت بە خزمەت کردنی دایکتان- سێ جار ووتیەوە-، خوا ڕاتان دەسپێرێت بە خزمەت کردنی باوکتان – دوو جا ووتیەوە –، وە خوا ڕاتان دەسپێرێت بە خزمەت کردنی نزیکترینەکان ئینجا نزیکەکان ).

### ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە :

واتە گرنگترینیان و بەرزترینیان خزمەت کردنی دایك وڕاگرتنی دڵیەتی بۆیە لە پێشدا سێ جاری دووبارە کردۆتەوە، پاشان خزمەتی باوك دێت بە پلەی دوو کەدوو جار تەئکیدی لەسەر کردۆتەوە. پاشانیش کەسە نزیکەکان یەك بە دوای یەکدا لە نەنك و باپیرو خوشك و برا و ...).

## ( ٥ ) ( دەنگ دابڕین لە یەکتر )

**( ٩٢٨ ) ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ يَوْمَ الاثْنَيْنِ وَ الْخَمِيسِ يَغْفِرُ اللهُ فِيهِمَا لِكُلِّ مُسْلِمٍ إِلاَّ مُتَهَجِرَيْنِ ،يَقُولُ: رُدُّوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٧٨ ) في صحيح الجامع**

ابو هریرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ڕۆژی دووشەممەو پێنج شەممە، خوای گەورە تیایاندا لە هەموو موسڵمانێك دەبورێت تەنها دوان نەبێت کە دەنگیان لە یەکتر دابڕیوە و قسە لەگەڵ یەکتر ناکەن. دەفەرموێت: ئەو دوانە بگەڕێننەوە هەتا ئاشت دەبنەوە ).

## ( ٦ ) ( فەزڵی سەردان کردنی یەکتر لەبەر خوا )

**( ٩٢٩ ) ( حم خد م ) عن أبي هريرة، عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَدَ اللهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِه مَلَكاً، فَلَماَ أَتَى عَلَيْه قَالَ: أَيْنَ تُرِيْدُ؟ قَالَ: أُرِيْدُ أَخاً لِي فِي هَذِه الْقَرْيَةِ، قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْه مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبَّهَا؟ قَالَ: لا ،غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللهِ عَزَّوَجَلَّ، قَالَ:**

فَإِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكَ، بِأَنَّ اللهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيْـهِ ﴾. و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٥٦٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( پیاوێك چوو بۆ سەردانی برایەكی لە دێیەكی تر، خوایش فریشتەیەكی بۆ دانا لەسەر رێگەیدا، كاتێك كە پیاوەكە گەیشتە لای فریشتەكە پـێی ووت: بە تەمای بۆ كوێ بچیت؟ وتی: نیازی لای برایەكم هەیە لەو دێ یە .فریشتەكە پـێی ووت: هیچ مافێكت هەیە لەلای كە جێبەجێی بكەیت و بەسەری بكەیتەوە ؟ وتی: نەخێر، تەنها ئەوەیە كە لەبەر خوا خۆشم دەوێت. وتی: دەی من نێردراوی خوام بۆ لای تۆ، كە پێت بڵێم ئەوا خوایش تۆی خۆش وویستوە، هەر وەك چۆن تۆ ئەو كابرایەت لەبەر خوا خۆش ویستووە ).

## (٧) ( ئەو كەسەی كە رەحم دەپچڕێنێت )

( ٩٣٠ ) ( حم خد د ت ه حب ك ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ ذَنْبٍ أَجْـدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللهُ تَعالىَ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا مَعَ مَايَدَّخِرُ لَهُ فِي الآخِرَةِ ، مِنَ الْبَغْيِ وَ قَطِيْعَةِ الـرَّحِمِ ﴾. (حسن) أنظر حديث رقم (٥٦٩٩) في صحيح الجامع

ابی بكره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ تاوانێك نییە كە شیاوتر بێت خوا لـە دونیادا تۆڵە و سزا بۆ خاوەنەكەی پێش بخات لەگەڵ ئەو سزایەش كە لە قیامەتدا بۆی هەڵگرتووە وەك دەست درێژی و پچراندنی سیلەی رەحم ).

# (( بەشی: پلە و پایە و فەزیڵەتەکان ))

## (١) ( فەزڵی پێغەمبەر(ﷺ) )

( ٩٣١ ) ( حم ) عن ابي طلحة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي عَزَّوَجَلَّ فَقَالَ: مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ مِنْ أُمَّتِكَ صَلاةً كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ وَ مَحَا عَنْهُ عَشْرَ سَيِّئَاتٍ وَ رَفَعَ لَهُ عَشْرَ دَرَجاتٍ وَ رَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَهَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧) في صحيح الجامع

ابي طلحة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هاتوویەك لە لای پەروەرگاری گەورەمەوە هاتە لام و پێی ووتم: هەر کەسێك لە ئومەتەکەت یەك سەڵاواتت لەسەر بدات، خوای گەورە دە خێری بۆ پێ دەنووسێت، وە دە تاوانیشی بۆ پێ دەسڕێتەوە، وە دە پلەی بۆ پێ بەرز دەکاتەوە، وە بەهەمان شێوەش وەڵامی دەداتەوە ).

(٩٣٢ ) ( طب أبو نعيم في الدلائل ابن مردويه ) عن أبي مريم الغساني قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَخَذَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ مِنِّي الْمِيثَاقَ كَمَا أَخَذَ مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَ بَشَّرَ بِيَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَ رَأَتْ أُمِّي فِي مَنَامِهَا أَنَّهُ خَرَجَ مِنْ بَيْنِ رِجْلَيْهَا سِرَاجٌ أَضَاءَتْ لَهُ قُصُورُ الشَّامِ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٢٢٤) في صحيح الجامع

ابو مريم العنساني دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بەڵێنامەی منی وەرگرتووە ،هەر وەك چۆن لە پێغەمبەرەکانی تری وەرگرتووە، وە بە عیسای کوڕی مریمدا مژدەی منی داوە ، وە دایکم لە خەونیدا بینی کە لە نێوان هەردوو قاچییەوە چرایەك هاتە دەرەوە کۆشکەکانی شامی پێ ڕووناك بۆوەوە ).

( ٩٣٣ ) ( م ) عن عمرو بن أبي سلمة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَمَا وَاللهِ إِنِّي لأَتْقَاكُمْ للهِ وَ أَخْشَاكُمْ لَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٣٣٥) في صحيح الجامع

عمرو کوڕی ابی سلمە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەرێ سوێند بێ بە خوا من لە هەمووتان زیاتر پارێزکارترم بۆ خوا، وە لە هەمووشتان زیاتر لێی دەترسم ).

( ٩٣٤ ) ( م ) عن طلحة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ فَلْيَصْنَعُوهُ فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنّاً فَلا تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ وَ لَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنِ اللهِ شَيْئاً فَخُذُوا بِهِ فَإِنِّي لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٤٣٢) في صحيح الجامع

طلحة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەگەر ئەوە سودیان پـێ دەگەیـەنێت با بیکەن، ئەوە من هەر گومانێك بوو بردم، جا لەسەر گومان و بۆچوون لێم مەگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم بۆ باس کردن لە خواوە، ئەوا وەری بگرن، چونکە درۆ لەسەر خوای گەورە ناکەم ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

( جارێکیـان پێغەمبـەر(ﷺ) بـەلای کۆمـەڵێك لـە هاوەڵەکانیـدا تـێ پـەڕی و بینـی موتوربـەی دار خورماکـان دەکـەن، فـەرمووی بیکـەن و نەیکـەن هـەر وەك یەکـە، ئـەوانیش وازیـان لـێ هێنـا، چونکە وا تێگەیشتن کە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی ئەو کارەیان لێ دەکات، دواتر هاتن و ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمـە لەسـەر فەرمایشتەکەی جەنابت موتوربەکەمان نـەکرد کە چی بەری نـەگرت، ئـەویش بۆیـان روون دەکاتەوە کە ئەوەی پێی ووتبون فرمانێکی خوایی و ئەرکێکی شـەرعی نـەبووە، بەڵکو تـەنها بۆچون و گومانێك بوە لە مەسەلەیەکی دونیایدا ).

(٩٣٥) ( ك ) عن أبي هريـرة قـال: قـال رسـول الله(ﷺ): ﴿ أنـا أبوالقـاسـم، اللهُ يُعْطِي، وَ أنـا أقْسِمُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٤٧ ) في صحيح الجامع

ابو هريـرة دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: ( مـن بـاوکی قـاسمم ،الله خـوّی دەدات و دەبەخشێت ،وە من تەنها دابەشی دەکەم بە سەرتاندا ).

(٩٣٦) ( حم ت ) عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِى وَدَاعَةَ قَالَ: جَاءَ الْعَبَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَكَأَنَّهُ سَمِعَ شَيْئًا فَقَامَ النَّبِىُّ (ﷺ) عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: ﴿ مَنْ أَنَا ؟﴾قَالُوا: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ عَلَيْكَ السَّلاَمُ. قَالَ: ﴿ أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الْخَلْقَ فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِهِمْ ثُمَّ جَعَلَهُمْ فِرْقَتَيْنِ فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِهِمْ فِرْقَةً ثُمَّ جَعَلَهُمْ قَبَائِلَ فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِهِمْ قَبِيلَةً ثُمَّ جَعَلَهُمْ بُيُوتًا فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِهِمْ بَيْتًا وَخَيْرِهِمْ نَفْسًا﴾. و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٧٢ ) في صحيح الجامع

المطلب ی کوڕی أبو وداعة دەڵێ: عباس هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) _ جا وەك بڵێی شتێکی بیست- ئنجا پێغەمبـەر هەستا بۆ سـەر مینبەرەکە و فەرمووی : ( من کێم؟ ) ، ووتیـان تـۆ پێغەمبـەری خوایت سەلامی خوات لە سەر بێت ، فەرمووی:(من محمد ی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبد المطلب م ،بە ڕاستی خوای گەورە دروست کراوەکانی دروست کرد و منی لە باشترینیاندا دانا ، پاشان کردنی بە دوو تیپەوە و منی لە تیپە باشەکەیاندا دانا ،پاشان کردنی بە چەندین هۆز و منی لە باشترین هۆزیاندا دانا ،پاشان کردنی بە چەندین ماڵ و منی لە باشترین ماڵیان ولە باشترین کەسیاندا دانا ).

(٩٣٧) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ أرْسَلَنِي مُبَلِّغاً وَلَمْ يُرْسِلْنِي مُتَعَنِّتاً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧١٥ ) في صحيح الجامع

عائشة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( بە ڕاستی خوای گەورە منی ناردووە هەتا گەیەنەر بم نەك گرانكار ).

**( ٩٣٨ ) ( م ت ) عن واثلة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَ اصْطَفَى قُرَيْشاً مِنْ كِنَانَةَ وَ اصْطَفَى هاشِماً مِنْ قُرَيْش، وَ اصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ ﴾.**

**( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧١٧ ) في صحيح الجامع**

وائلە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە خێڵی (كنانة)ی لە نەوەی ئیسماعیل هەڵبژاردووە، وە قوڕەیشی لە (كنانة) هەڵبژاردووە، وە هاشمیشی لە قوڕەیش هەڵبژاردووە، وە منیشی لە نەوەی هاشم هەڵبژاردووە ).

**( ٩٣٩ ) ( د هـ ) عن عبدالله بن بسر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ جَعَلَنِي عَبْداً كَرِيماً وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّاراً عَنِيداً ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٤٠ ) في صحيح الجامع**

عبدالله ی كوڕی بسر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە كردوومی بە بەندەیەكی خاوەن ڕێز و كەرەم و نەیكردوم بە زۆردارێكی ستەمكار).

**( ٩٤٠ ) ( طب الضياء ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ فَضَّلَنِي عَلىَ الأَنْبِيَاءِ بِأَرْبَعٍ: أَرْسَلَنِي إِلىَ النَّاسِ كَافَّةً، وَ جَعَلَ الأَرْضَ كُلَّهَا لِي وَ لأُمَّتِي طَهُوراً وَ مَسْجِداً فَأَيْنَمَا أَدْرَكَ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي الصَّلاَةَ فَعِنْدَهُ مَسْجِدُهُ وَ عِنْدَهُ طَهُورُهُ وَ نَصَرَنِي بِالرُّعْبِ مَسِيْرَةَ شَهْرٍ وَ أَحَلَّ لِي الْمَغَانِمَ ﴾.**

**( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٨٠ ) في صحيح الجامع**

ابو امامة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە فەزڵی منی داوە بەسەر پێغەمبەرەكاندا بە چوار شت: ناردوومی بۆ خەڵك بە گشتی، وە زەوی هەر هەمووی بۆ من و ئومەتەكەم كردووە بە پاكژكەرەوە و جێگای نوێژ، جا هەر پیاوێك لە ئومەتەكەم كاتی نوێژی هات، ئەوا شوێنی نوێژەكەی لایە و پاكژكەرەوەیشی لایە، وە بەوەش سەری خستوم كە مانگە ڕێیەك ترسمان وا لە دڵی دوژمناندا ، وە دەست كەوتی جەنگیشی بۆ حەڵاڵ كردووم ).

## ڕوون كردنەوەی فەرموودەكە :

ئەو چوار شتەی كەخوای گەورە داویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) و وەبەوەش فەزڵی داوە بەسەر پێغەمبەرەكانی تردا:

**یەكەم :** ئەوان هەر یەكە بۆ قەومی خۆی بووە، بەڵام ئەم بۆ سەرجەم گرۆی مرۆڤایەتی‌یە.

**دووەم :** نوێژكردن پێویستی بە تارەت و دەست نوێژە و پاشان بە شوێنێك كە نوێژی تێدا بكرێت، جا خوای گەورە تایبەت بە پێغەمبەری ئیسلام و ئومەتەكەی داوە كە لە هەموو شوێنێكی زەویدا

دەتوانرێت ئەگەر ئاو نەبوو هەر بە بەرد تارات بگرێت و بە خۆڵیش(تیمم) بکات، وە ئەگەر مزگەوت نەبوو ئەوا لەسەر زەوی و خۆڵەکە نوێژی خۆی بکات. کە ئەمە بۆ هیچ پێغەمبەرێکی تر نەبووە .

**سـێ هـەم:** خوای کار بەجێ عیزەت و هەیبەتێکی وای داوە بەو ئیسلامە کە لە دووری مانگە رێیەکەوە دوژمنانی ئەم ئایینە لە ترسی لەشکر و هێزی موسڵمانان، ترس دڵی داگرتوون و هێزی ئەژنۆیان شکاوە.

**چوارەم:** دەست کەوتی جەنگ و جیهاد بۆ پێغەمبەرانی تر و ئومەتەکانیان حەڵاڵ نەبووە بەڵام بۆ پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) و ئومەتەکەی حەڵاڵ کراوە.

**( ٩٤١ ) ( ك )عن جندب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ اتَّخَذَنِي خَلِيلاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٨٥) في صحيح الجامع**

جندب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بە ڕاستی خوای گەورە منی کردووە بە خەلیلی – هەڵبژاردە دۆستی– خۆی ).

**( ٩٤٢ ) ( مالك ق ت ن )عن جبير بن مطعم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنَا مُحَمَّدٌ وَ أَنَا أَحْمَدُ وَ أَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى عَقِبِي وَ أَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِي الْكُفْرَ وَ أَنَا الْعَاقِبُ ،وَ الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ نَبِيٌ ﴾. و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢١٨٩) في صحيح الجامع**

جبیری کوڕی مطعم دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من محەمەدم، وەمن ئەحمەدم، وە من ( ماحي )م کە خوای گەورە کوفرم پێ دەسڕێتەوە، وە من ( حاشر)م کە خەڵك لە دوای منەوە حەشر دەکرێن، وە من ( العاقب)م وە عاقیبیش ئەوەیە کە لە دوامەوە ئیتر پێغەمبەر نایەت ).

**( ٩٤٣ ) ( حم هـ )عن طلحة قال: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) فِي نَخْلٍ ، رَأَى قَوْماً يَلْقَحُونَ النَّخْلَ فَقَالَ: ﴿ مَا يَصْنَعُ هَؤُلاءِ؟ ﴾، قَالُوا: يَأْخُذُونَ مِنَ الذَّكَرِ فَيَجْعَلُونَهُ فِي الأُنْثَى ،قَالَ: ﴿ مَا أَظُنُّ ذَلِكَ يُغْنِي شَيْئاً﴾، فَبَلَغَهُمْ، فَتَرَكُوهُ، فَنَزَلُوا عَنْهَا فَبَلَغَ النَّبِيُّ(ﷺ) فَقَالَ: ﴿ إِنَّمَا هُوَ الظَّنُّ إِنْ كَانَ يُغْنِي شَيْئاً فَاصْنَعُوهُ، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ وَ إِنَّ الظَّنَّ يُخْطِئُ وَ يُصِيبُ وَ لَكِنْ مَا قُلْتُ لَكُمْ: قَالَ اللهُ فَلَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٣٤٠) في صحيح الجامع**

طلحة دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بە ناو هەندێ دار خورمادا تێپەڕین، کۆمەڵێکی بینی، کە دار خورماکانیان موتوربە دەکرد، فەرمووی: ( ئەوانە چی دەکەن ؟) ووتیان: لە نێرەکە دەبەن و دەیخەنە لای مێیەکە، فەرمووی: ( باوەڕ ناکەم ئەوە هیچ سودێکی هەبێت )، ئەوانیش قسەکەی پێغەمبەرﷺ یان پێ گەیشتەوە وازیان لە موتوربەکردنەکە هێنا و لەسەر دارەکان دابەزین، ئینجا بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوە تەنها گومان و بۆچونێك بوو، ئەگەر دەزانن موتوربە کردن سودتان پێ دەگەیەنێت ئەوا بیکەن، وە من هەر مرۆڤێکم وەك ئێوە، وە گومان و بۆچونیش جاری وا هەیە هەڵە دەبێت جاری واش هەیە دەیپێکێت، بەڵام هەرچییەك کە پێم ووتن خوا فەرموویەتی ئەوا هەرگیز درۆ لەسەر خوا ناکەم ).

( ٩٤٤ ) ( ت ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّمَا بَعَثَنِيَ اللهُ مُبَلِّغاً وَلَمْ يَبْعَثْنِي مُتَعَنِّتاً ﴾ . (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٣٤٧) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووویەتی: ( خوای گەورە منی بە پەیام گەیاندەر ناردووە، وە نەیناردوم کە ببمە ئەرك و زەحمەت ).

( ٩٤٥ ) ( خ ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنْظُرُوا كَيْفَ يَصْرِفُ اللهُ عَنِّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَ لَعْنَهُمْ إِنَّهُمْ يَشْتِمُونَ مُذَمَّماً وَ يَلْعَنُونَ مُذَمَّماً وَ أَنَا مُحَمَّدٌ ﴾ . و اللفظ للنسائي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٦٤٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ( سەیر کەن چۆن خوای گەورە جنێوی قورەیش و نەفرەتیانم لەسەر لادەبات، ئەوان جنێو بە ( مُذَمَّمْ ) دەدەن و نەفرەت لە (مُذَمَّمْ ) دەکەن بەڵام من ( محمد)م ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

بێ باوەڕەکانی قورەیش کاتی خۆی ناو و ناتۆرە و قسەی ناشرینیان ئاڕاستەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، وە یەکێك لەو ناو و ناتۆرە ناشیرینانە ئەوە بوو کەناوەکەیان هەڵدەگێڕایەوە لە ( محمد ) کە بە واتای ئەو کەسە دێت کە خەڵك سوپاسی دەکەن و مەمنوونی دەبن بۆ (مُذَمَّمْ) کە بە واتا کەسێك دێت کە خەڵك زەمی دەکەن و ئاخی لێ هەڵدەکێشن، وە ئەو جوێن و نەفرەتەیشی کەدەیان دا بە ناو (مُذَمَّمْ)یان دەدا نەك بە ناو ( محمد )، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: خوا سەری لێ شێواندوون چونکە جوێن و نەفرەتەکەیان بۆ (مُذَمّ ) ناوە، منیش ناوم محمەدە لەبەر ئەوە من ناگرێتەوە و بەر من ناکەوێت ).

( ٩٤٦ ) ( خ هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَابَعَثَ اللهُ نَبِيّاً إِلاَّ راعِيَ غَنَمٍ ﴾ ،قَالَ لَهُ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) قَالَ: ﴿ وَأَنَا كُنْتُ أَرْعَاهَا لأَهْلِ مَكَّةَ بِالْقَرارِيطِ ﴾ . و اللفظ لأبن ماجة. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٨٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووویەتی: ( خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە کە شوانیی مەڕی نەکردبێت، هاوەڵەکانی پێیان ووت: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی: منیش شوانی مەڕم دەکرد بۆ خەڵکی مەککە بەرامبەر چەند قیراتێك ).

## روون کردنەوە ی فەرمودە:

قیراط: دراوێکی کۆنی پارەیە کە نزیکەی نیو درهەمی ئەو کاتە بووە. وەحیکمەتی ئەوەش کە هەموو پێغەمبەرێك کە خوا هەڵیبژاردووە دەبێت لە پێشدا شوانی مەڕی کردبێت ئەوەیە کە هەر لەسەرەتاوە دەبێت ئامادە بکرێت بۆ ئەوەی دواتر ببێت بە شوانی ئومەتێك .

( ٩٤٧ ) ( حل )عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا أُوذِيَ أَحَدٌ مَا أُوذِيتُ فِي الله ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٦٣) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ کەس ئازار نەدراوە هێندەی ئەوەندەی کە من ئازار دراوم لە پێناوی خوادا ).

( ٩٤٨ ) ( د )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّ الله عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ ﴾ (حسن) أنظر حيث رقم (٥٦٧٨) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ کەسێك نییە کەسەلامم لێ بکات ئیلا خوا رۆحم دەکاتەوە بەبەردا هەتا وەڵامی سەلامەکەی بدەمەوە ).

( ٩٤٩ ) ( حم ق )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَامِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَ إِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْياً أَوْحَى الله إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٨٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( لەناو پێغەمبەراندا هیچ پێغەمبەرێك نییە، ئیلا ئەوەندە ئایەت و موعجیزەی پێ دراوە، کە مرۆڤەکان لەسەری باوەڕ بهێنن، وە ئەوەی کە دراوە بە من، وەحیەك بووە خوای گەورە ناردویەتی بۆم، جا ئومێدم وایە کە من لە هەموویان زیاتر شوێن کەوتووم هەبێت لە رۆژی قیامەتدا ).

( ٩٥٠ ) ( م )عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَمَعَهُ شَيْطَانٌ قَالُوا: وَ أَنْتَ يَا رَسُولَ الله؟ قَالَ: وَ أَنَا إِلاَّ أَنَّ الله أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٩٨) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( یەکێك نییە لە ئێوە ئیلا شەیتانێکی وا لە گەڵدا، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: منیش، بەڵام خوا یارمەتی دام بەسەریدا ئیتر موسڵمان بوو ).

( ٩٥١ ) ( ق )عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ مَثَلَ مَا بَعَثَنِيَ اللهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى وَ الْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْثِ أَصَابَ أَرْضاً، فَكَانَتْ مِنْهَا طَائِفَةٌ طَيِّبَةٌ، قَبِلَتِ الْمَاءَ فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَ الْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَ كَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ فَنَفَعَ الله بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا مِنْهَا وَ سَقَوا وَ رَعَوا وَ أَصَابَ طَائِفَةً مِنْهَا أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاتُمْسِكُ مَاءً وَلا تُنْبِتُ كَلأً فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ الله، وَنَفَعَهُ بِمَا بَعَثَنِيَ الله بِهِ فَعَلِمَ وَ عَلَّمَ وَ مَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْساً، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى الله الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٨٥١) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( نموونەی ئەوەی کە خوای گەورە منی پێ ناردووە لە رێنومایی و زانیاری وەك نموونەی بارانێك وایە کە لە زەویەك بدات، جا بەشێکی زەوییەکە پاك و باش

بووه ئاوەکەی وەرگرتووە، لەوەڕگا و گیای زۆری پێ رواوە، وەبەشێکیشی سەخت بووە ئاوەکەی گل داوەتەوە، خوای گەورەش خەڵکی پێ سودمەند کردووە، لێیان خواردۆتەوە و ئاوی ئاژەڵیان پێ داوە و ئاودێرییان پێ کردووە، وە بارانەکە لە بەشێکی تریشی داوە، بەڵام زەویەکەی فش و بڵ بووە نەئاو لە خۆ دەگرێت و نەگیاشی لێ سەوز دەبێت، جا ئەوە نمونەی ئەو کەسەیە کە لە ئاینی خوا تێگەیشتووە و سودمەند بووە لەوەی کە خوای گەورە بەمندا ناردویەتی وە خۆی فێر بووە و خەڵکیشی فێر کردووە، وەنمونەی ئەو کەسەشە کە سەری لە ئاستدا بەرز نەکردۆتەوە و هیدایەتەکەی خوای گەورە قبوڵ نەکردووە کە بە مندا ناردوویەتی ).

( ٩٥٢ ) ( ق )عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ مَثَلي وَمَثَلَ مَابَعَثَني اللهُ بِهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتى قَوْمَهُ فَقالَ: يَا قَوْمِ إنِّي رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وَ إنِّي أَنَا النَّذيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَاءُ،فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا فَانْطَلَقُوا عَلى مُهْلَتِهِمْ، وَ كَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَني وَ اتَّبَعَ مَاجِئْتُ بِهِ وَ مَثَلُ مَنْ عَصَاني وَ كَذَّبَ مَاجِئْتُ بِهِ مِنَ الْحَقِّ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٥٨٥٥ ) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نمونەی من و نمونەی ئەوەی کە خوای گەورە بە مندا ناردوویەتی، وەك نموونەی پیاوێك وایە دێتە لای قەومەکەیی و دەڵێ: ئەی قەوم و هۆزەکەم من بەو دوو چاوەی خۆم لەشکرەکەی دوژمنم دیوە، وە تەنها ئاگادار کەرەوەیەکی روونم بۆ ئێوە، جا خۆتان رزگار بکەن، ئیتر بەشێك لە هۆزەکەی بە قسەی دەکەن، بەشەو دەڕۆن بۆی دەردەچن هەتا فرسەتیان لەبەر دەستایە ،وە بەشێکی تریشیان بە درۆی دەزانن و هەر لە شوێنەکەی خۆیان دەمێننەوە، لەشکرەکەش بەیانی دەدات بەسەریاندا لەناویان دەبات و رای دەماڵێت، جا ئەوە نمونەی ئەو کەسەیە کە گوێ رایەڵیم دەکات و شوێن ئەوە دەکەوێت کە من هێناومە، وە نمونەی ئەو کەسەشە کە گوێ رایەڵیم ناکات و درۆ بەو حەقە دەکات کە من هێناومە ).

( ٩٥٣ ) ( ت )عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلْيُصَلِّ عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ مَرَّةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْراً ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٢٤٠ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك کە ناوی منی لەلا هێنرا با سەڵاواتم لەسەر بدات، چونکە ئەوەی یەك جار سەڵاواتم لەسەر بدات، خوای گەورەش دە جار سەڵاواتی لەسەر دەدات ).

( ٩٥٤ ) ( حم م ٣ )عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٣٤٤ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەسێك یەك سەڵاواتم لەسەر بدات، خوا دە سەڵاواتی لەسەر دەدات ).

( ٩٥٥ ) ( حم خد ن ك ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْرَ صَلَوَاتٍ وَ حُطَّتْ عَنْهُ عَشْرُ خَطِيئَاتٍ وَ رُفِعَتْ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٥٨ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك یەك سەڵاواتم لەسەر بدات، خوا دە سەڵاواتی لەسەر دەدات، وە دە گوناهی بۆ هەڵدەوەرێنێت، وە دە پلەشی بۆ بەرز دەکاتەوە ).

( ٩٥٦ ) ( خ ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ يُطِيعُ اللهَ إذا عَصَيْتُهُ؟! أَيَأْمَنُنِي اللهُ عَلَى أَهْلِ الأَرْضِ وَ لا تَأْمَنُونِي؟! إنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْماً يَقْرَءُونَ القُرآنَ لايُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّيْنِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإسْلامِ وَ يَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦١٤ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( جا کێ گوێ رایەڵی خوا دەکات ئەگەر من نەیکەم ؟! خوای گەورە بە ئەمینم دادەنێت لەسەر هەموو خەڵکی زەوی، کەچی ئێوە بە ئەمینم دانانێن ؟ لە توخمی ئەم زەلامە کەسانێك دەبن، قورئان دەخوێنن لە قورقوڕاگەیان تێناپەڕێت، لە دین دەردەچن هەروەك چۆن تیر نێچیرەکە دەسمێت و لێی دێتە دەرەوە، ئەهلی ئیسلام دەکوژن و ئەهلی بت پەرستێتی واز لێ دێنن، ئەگەر بگەمە سەردەمیان، کوشتنێك دەیان کوژم هەروەك کوشتنی عاد ).

( ٩٥٧ ) ( حم ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الوَسِيْلَةُ دَرَجَةٌ عِنْدَ اللهِ لَيْسَ فَوْقَهَا دَرَجَةٌ فَسَلُوا اللهَ أَنْ يُؤْتِيَنِي الوَسِيْلَةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١٤٠ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( – وەسیلەت – پلەیەکە لەلای خوا هیچ پلەیەکی تری لەسەرەوە نییە جا داوام لە خوا بۆ بکەن کە ئەو وەسیلەتە بدات بە من ).

( ٩٥٨ ) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ لَمْ يَبْعَثْنِي مُعَنِّتاً وَلا مُتَعَنِّتاً وَلَكِنْ بَعَثَنِي مُعَلِّماً مُيَسِّراً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٠٦ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوا منی نەناردووە کە ببمە زەحمەت لەسەر خەڵك يان داوای زەحمەت و ئەرك لە خەڵك بکەم، بەڵکو منی ناردووە کە مامۆستایەکی ئاسانکار بم ).

## ( ٢ ) ( سەڵەوات دان لەسەر هەموو پێغەمبەران )

( ٩٥٩ ) ( ابن أبي عمر هب ) عن أبي هريرة ( خط ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ صَلُّوا عَلَى أَنْبِياءِ اللهِ وَ رُسُلِهِ فَإِنَّ اللهَ بَعَثَهُمْ كَمَا بَعَثَنِي ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٧٦٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة لە انس ـە وە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( سەڵەوات بدەن لەسەر پێغەمبەرانی خوا و نێردراوەکان، چونکە خوای گەورە ئەوانیشی ناردووە، هەروەك چۆن منیشی ناردووە ).

## ( ٣ ) ( فەزڵی لوط(عليه السلام) )

( ٩٦٠ ) ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ لُوطَ كَانَ يَأْوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيْدٍ وَمَا بَعَثَ اللهُ بَعْدَهُ نَبِيًا إِلاَّ وَ هُوَ فِي ثَرْوَةٍ مِنْ قَوْمِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٤٩٨) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( رەحمەتی خوا لە لوط بێت، پەنای دەدایە بەر پەناگەیەکی توند و بەهێز، وە خوا لە دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە، ئیلا لە ناو زۆرینەیەکدا بووە لە قەومەکەی خۆی ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

پەناگەی توند و بەهێز مەبەستی لێی خوای گەورەیە هەر وەك لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە ( قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ). وە مەبەستیش لەوەی لە زۆرینەیەکدا بووە لە قەومەکەی خۆی واتە قەوم و عەشرەتێکی زۆری وایان هەبووە کە دیفاعیان لێ بکەن و نەهێڵن دەست درێژیان بکرێتە سەر .

## ( ٤ ) ( فەزڵی یونس کوڕی متی(عليه السلام) )

( ٩٦١ ) ( حم ت ن ك هب الضياء ) عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا بِهَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوْتِ: لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِيْنَ، لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطّ إِلاَّ اسْتَجَابَ لَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٣٧٥) في صحيح الجامع

سعد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەو دوعاو نزایەی خاوەن حوتەکە – واتە یونس – کە لە سکی حوتەکەدا بانگی پەروەردگاری خۆی پێ کرد: (لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ) واتە: هیچ خوایەك نییە جگە لە تۆ، پیرۆزی و پاکی بۆ تۆ من لە ستەم کارەکان بووم _ هەرگیز هیچ پیاوێکی موسڵمان نییە داوای لە خوا پێ کردبێت ئیلا وەڵامی داوەتەوە ).

( ٩٦٢ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعَالىَ: لا يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَقُولَ: أَنَا خَيْرٌ مِن يُونُسَ بْنِ مَتَّىَ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٤٣٣٥) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خـوای گـەورە فەرمـوویـەتی: هیچ کەسێك بۆی نییە بڵێت من باشترم لە یونس ی کوڕی متی ).

## ( ٥ ) ( فەزڵی یوسف ی کوڕی یعقوب - سەلاًت و سەلامی خوای لەسەر بێت )

( ٩٦٣ ) ( حم في الزهد ابن المنذر ) عن الحسن قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ أَخِي يُوسُفَ لَوْأَنا أَتَانِي الرَسُولُ بَعْدَ طُولِ الحَبْسِ لأَسْرَعْتُ الإجابة حِيْنَ قَالَ: ﴿ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَابَالُ النِّسْوَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٧٢ ) في صحيح الجامع

حسن دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕەحمەتی خوا لە یوسفی برام بێت ،ئەگەر من بوومایە کە نێردراوەکەی پاشا بهاتایەتە لام لـە دوای ئەو زیندانی کردنـە دوور و درێژە، هـەر زوو بـە دەمیەوە دەچووم، کاتێك کە وتی: ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ﴾، واتە بگەڕێرەوە بۆ لای پاشاکەی خاوەنت و پرسیاری لێ بکە دەربارەی مەسەلەی ئافرەتەکان ).

## ( ٦ ) ( فەزڵی موسی(ﷺ) )

( ٩٦٤ ) ( حم ق ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَحِمَ اللهُ مُوسَى لَقَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرِ مِنْ هَذا فَصَبَرَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٤٩٩ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ڕەحمـەتی خـوا لـە موسـا بێـت زۆر بـە لەمـەش زیاتر ئازاری درا بەڵام هەر ئارامی گرت ).

( ٩٦٥ ) ( د ن ك ) عن أبي زاد الباوردي: العجاب قال: كَانَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) إذا دَعَا بَدَءَ بِنَفْسِه وَقَالَ: ﴿ رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْنَا وَ عَلَى مُوسَى لَوْ صَبَرَ لَرَأَى مِنْ صَاحِبِه الْعَجَبَ وَلَكِنَّهُ قَالَ: ﴿ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْراً ﴾ طَوَّلَهَا حَمْزَةُ ﴾. و اللفظ لأبي داود من حديث ابن كعب. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٥٠٠ ) في صحيح الجامع

ابو زاد الباوردی: العجاب: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ئەگەر دوعای بکردایە بە خۆی دەستی پێ دەکرد و دەیفەرموو: ( ڕەحمەتی خوا لەسەر ئێمە و لەسەر موساش بێت، ئەگەر ئارامی بگرتایـە شتی سـەیری لـە هاوڕێکەی دەبینـی، بەڵام وتـی: قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۢ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا﴾، واتـە: ئەگـەر لـە دوای ئەمە پرسیاری شتێکی ترم لێ کردیت ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە ).

( ٩٦٦ ) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تُفَضِّلُوا بَيْنَ أَنْبِيَاءِ اللهِ فَإِنَّهُ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ فَصُعِقَ مَنْ فِي السَّمَوات وَ مَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَاشَاءَ اللهُ، قال: ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ بُعِثَ أَوْ فِي أَوَّلِ مَنْ بُعِثَ، فَإِذَا مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ آخِذٌ بِالْعَرْشِ فَلا أَدْرِي أَحُوسِبَ بِصَعْقَتِه يَوْمَ الطُّورِ أَمْ بُعِثَ قَبْلِي، وَلا أَقُولُ: إِنَّ أَحَداً أَفْضَلُ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى عَلَيْهِ السَّلاَمُ ﴾. و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٣٦٧ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( فـەزڵ كـاری لـە نێوان پیغەمبـەرەكانی خـوادا ﷺ مەكـەن، چونكە فـوو دەكرێـت بـە كـەڕەنادا و هـەرچی لـە ئاسمانـەكان و هەرچـی لـە زەویدایـە گیانیـان دەردەچێت جگـە لـەوەی كـە خـوا بیـەوێت ) فەرمووی: ( پاشـان جارێكی تـر فـووی پیا دەكرێتـەوە، مـن یەكەم دەبم كە زیندوو دەكرێمەوە، یان لە یەكەمی زیندووكراوەكان دەبم، كە چـی دەبینـم موسا سـەلامی لێ بێت دەستی گرتووە بە عەرشەوە، جا نازانم گیان دەرچوونەكەی ڕۆژی كێوی طوری بۆ حساب كراوە یان لە پێش مندا زیندوو بۆتەوە، وە ناشڵێم: كە كەسێك باشترە لە یونس ی كوڕی مـتی سـەلامی لەسـەر بێت ).

( ٩٦٧ ) ( ك ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مُوسَى بـنُ عِمْـرَانَ صَـفِيُّ اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٦٢٦ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( موسای كوڕی عمران هەڵبژێردراوی خوایە ).

## ( ٧ ) ( فەزڵی سلێمانی كوڕی داود صەلات و سەلامیان لەسەر بێت )

( ٩٦٨ ) ( حم ن ه حب ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ سُلَيْمَانَ بـنَ دَاوُدَ لَمَّـا بَنَى بَيْتَ الْمَقْدس سَأَلَ الله عَزَّوَجَلَ خلالاً ثَـلاثَـةً: سَأَلَ اللهَ حُكْماً يُصَادِفُ حُكْمَهُ فَأُوتِيَـهُ وَ سَـأَلَ اللهَ مُلْكاً لا يَنْبَغِي لأَحَد مِنْ بَعْدِه فَأُوتِيَهُ وَ سَأَلَ اللهَ حِينَ فَرَغَ مِنْ بِنَاءِ الْمَسْجِدِ أَنْ لا يَـأْتِيَهُ أَحَدٌ لا يَنْهَـزُهُ إِلاَّ الصَّلاة فِيهِ أَنْ يُخْرِجَهُ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّـهُ ﴾ و اللفظ للنسائي. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٢٠٩٠ ) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( سولەیمانی كوڕی داود، كاتێك كە ( بيت القدس ) ی دروست كرد، داوای سێ خەسڵەتی لە خوای گەورە كرد: داوای لـە خـوای گەورە كرد كـە حوكمێكی پێ ببەخشێت گونجا و ڕێك و پێك بێت لەگەڵ حوكمی خوادا، وە پێ‌ی درا، وە داوای لە خوای گەورەش كرد كە موڵكێكی بداتێ كە بۆ هیچ كـەس نـەبێت لـە دوای ئـەو، وە پـێ‌ی درا، وە داوای لـە خـوای گـەورە كـرد كاتێك كـە لـێ بـوەوە لـە دروسـت كردنـی مزگەوتەكە كە هـەر كەسـێك بێتـە نـاوی بەمـەرجێك هـیچ پاڵنەرێك هەڵی نەنابێت بۆ هاتنی مزگەوتەكە جگە لە نوێژ كردن تیایـدا، خـوای گـەورە بیهێنێتـە دەرەوە لە گوناهەكانی هەر وەك ئەو ڕۆژەی كە دایكی خستویەتی‌یەوە)

## ( ٨ ) ( فەزڵی ابو بكری صديق رضي الله عنه )

( ٩٦٩ ) ( خ ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أُرْسِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَ ابْنِهِ فَأَعْهَدَ أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُونَ أَوْ يَتَمَنَّى الْمُتَمَنُّونَ ثُـمَّ قُلْتُ: يَـأْبَى اللهُ وَ يَدْفَعُ الْمُؤْمِنُـونَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٥١٤١ ) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هات بە دڵمدا کە بنێرم بە دوای ابو بکر و کوڕەکەیدا بۆ ئـەوەی پـەیمانی خەلافـەتی بە ڕەسمـی بـۆ بنووسـم تـا دوایـی کـەس قسە نـەکات و کەسـش ئـاوات نەخوازێت، پاشان ووتم: خوا هەر ئەوی دەوێت و باوەڕدارانیش هەر خۆیان پێشی دەخەن )

( ٩٧٠ ) ( حم ق ت ) عن أبي بكر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا أَبَا بَكْرٍ مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا؟ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٠٤) في صحيح الجامع

ابو بكر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەی ئەبابکر دەبێت گومانت چۆن بێت بە دوو کەس کە خوا سێهەمیان بێت ).

( ٩٧١ ) ( م ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ خَلِيْلاً لاتَّخَذْتُ ابْنَ أَبِي قُحَافَةَ خَلِيْلاً وَ لَكِنْ صَاحِبُكُمْ خَلِيلُ اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٢٩٢ في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەگەر لە هەموو خـەڵكی سـەر زەویـدا هەڵبـژاردە دۆستێكم بۆ خۆم دابنایە، ئەوا كوڕەكەی ابي قحافە ( واتە ابو بكر ) م دەكردە خـەلیل و تاكە دۆستم بەڵام هاوڕێكەتان – واتە پێغەمبەر خۆی – هەڵبژاردە دۆستی خوایە ).

( ٩٧٢ ) ( م ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيْلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيْلاً وَ لَكِنَّهُ أَخِي وَ صَاحِبِي وَ قَدْ اتَّخَذَ اللهُ صَاحِبَكُمْ خَلِيْلاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٢٩٦) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەگەر كەسێكم بكردایـە خـەلیل و تاكە دۆستم، ئـەوا ابـو بكـرم دەكـردە خـەلیل و تاكـە دۆسـتی خـۆم، بـەڵام ئـەو بـرام و هاوڕێمـە، وە خـوای گـەورە هاوڕێكەتانی كردۆتە خەلیل و تاكە دۆستی خۆی ).

( ٩٧٣ ) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَالأَحَدٍ عِنْدَنَا يَدٌ إِلاَّ وَ قَدْ كَافَأْنَاهُ مَاخَلا أَبَابَكْرٍ فَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا يَداً يُكَافِئُهُ اللهُ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَ مَا نَفَعَنِي مَالُ أَحَدٍ قَطُّ مَا نَفَعَنِي مَالُ أَبِي بَكْرٍ، وَلَوْكُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيْلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيْلا أَلا وَ إِنَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيْلُ اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٤٩) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی. ( هیچ كەسێك نییە كە چاكەیەكی لـە گەڵدا كردبێن ئیلا خەڵاتمان كردووە جگە لە ابو بكر نەبێت، ئەو چاكەیەكی بەسەرمانەوەیە كە خوای گەورە خۆی لـە ڕۆژی قیامەتدا خەڵاتی دەكات، وە هەرگیز ماڵ و سامانی كەس هێندەی ماڵ و سامانی ابو بكر سودی پێ نەگەیاندووم، وە ئەگەر من كەسێكم بكردایە بە خەلیلی خۆم ئەوا ابو بكرم دەكردە خەلیل. دەی بەڵام هاوڕێكەتان خەلیلی خوایە ).

( ٩٧٤ )( حم م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ادْعِي لِي أَبَابَكْرٍ وَ أَخَاكِ حَتَّى أَكْتُبَ كِتَاباً فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ وَ يَقُولُ قَائِلٌ: أَنَا أَوْلَى وَ يَأْبَى اللهُ وَ الْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبَابَكْرٍ ﴾.

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەبابەکر و براکەتم بۆ بانگ بکە، هەتا نووسراوێك بنووسم، چونکە من دەترسم کە کەسێك ئاوات بخوازێت و کەسێك قسە بکات و بڵێت: من لە پێشترم، وە خواو باوەڕدارانیش رازی نابن هەر دەبێت ئەبا بکر بێت ).

**( ٩٧٥ ) ( م ن هـ ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلا إِنِّي أَبْرَأُ إِلَى كُلِّ خِلٍّ مِنْ خِلِّتِه وَ لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيْلاً لاتَّخَذْتُ أَبـا بَكْـرٍ خَلِـيْلاً، إِنَّ صَـاحِبَكُمْ خَلِيْـلُ اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حديث رقم (٢٦٣٤) في صحيح الجامع**

ابن مسعود دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەوا من حاشا دەکەم لە هەموو دۆستێك لە دۆستایەتییەکەی، وە ئەگەر من کەسێکم بکردایە خەلیلی خۆم ،ئەوا ابوبکر م دەکردە خەلیلی خۆم، بەڵام هاوڕێکەتان خەلیلی خوایە ).

## ( ٩ ) ( فەزڵی عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه )

**( ٩٧٦ ) ( هـ ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ وَضَعَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ يَقُولُ بِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٣٤) في صحيح الجامع**

ابوذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە حەقی خستۆتە سەر زمانی عومەر قسەی پێ دەکات ).

**( ٩٧٧ ) ( حم ق ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ بَيْنَما أَنَا عَلَى بِئْرٍ أَنْزَعُ مِنْهَا إِذْ جاءَ أَبُو بَكْرٍ و عُمَر فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ الدَّلْوَ فَنَزَعَ بِها ذَنُوباً أَوْ ذَنُوبَيْنِ وَ فِي نَزْعِه ضُعْفٌ فَغَفَرَ اللهُ لَهُ ثُمَّ أَخَذَها ابْنُ الْخَطَّابِ مِنْ يَدِ أَبِي بَكْرٍ فَاسْتَحَالَتْ فِي يَدِهِ غَرْباً فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِياً مِنَ النَّاسِ يَفْرِي فَرْيَهُ حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٨٦٤) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( لە خەونمدا وەك ئەوەی کە لەسەر بیرێك بم، ئاوی لێ دەربهێنم، لەو کاتەدا ابو بکرو عمر هاتن، ئینجا ابو بکر دۆلکە ( سەتڵ ) ی ئاو هەڵکێشانەکەی هەڵگرت و دۆلکەیەك یان دووانی لێ دەرهێنا، وە لە هەڵکێشانەکەیدا لاوازییەکی پێوە دیار بوو، خوای گەورەش لێی بورا، پاشان کوڕەکەی خەتتاب لە دەستی ابو بکری وەرگرت، ئینجا بە دەستیەوە بوو بە سەتڵێکی زۆر گەورە، ئیتر لەو خەڵکەدا هیچ ئازایەکم نەبینی کەوەك هەڵێنجانەکەی ئەو ئاو هەڵەنجێنێت، هەتا خەڵکەکە هەمووی لە دوای هیلاکی حەوانەوە ).

**( ٩٧٨ ) ( حم ت ) عن ابن عمر ( حم د ك )عن أبي ذر ( ع ك ) عن أبي هريرة ( طب ) عن بلال وعن معاوية قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ جَعَلَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَ قَلْبِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٣٦) في صحيح الجامع**

إبن عمر لە ابو ذر لە أبو هريرة لە بلال و معاوية دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە حەقی خستۆتە سەر زمانی عومەر و ناو دڵی ).

## ( ١٠ ) ( فەزڵی عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه )

( ٩٧٩ ) ( **حم ت هـ ك** ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **يَا عُثْمَانُ إِنَّهُ لَعَلَّ اللهَ يُقَمِّصُكَ قَمِيصاً فَإِنْ أَرَادُوكَ عَلَى خَلْعِهِ فَلاَتَخْلَعْهُ لَهُمْ** ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٩٤٣ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەی عوسمان ئەگەر هاتوو خوای گەورە کراسێکی کردە بەرت، وە ویستیان لەبەرتی دابکەنن، ئەوا بۆیانی دانەکەنیت ). مەبەستی پێ خەلافەت بوو.

## ( ١١ ) ( فەزڵی عەلی کوڕی أبو طالب رضي الله عنه )

( ٩٨٠ ) ( **ابن مندة** ) عن رافع مولى عائشة قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **عَادَى اللهُ مَنْ عَادَى عَلِياً** ﴾

( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٩٦١ ) في صحيح الجامع

رافع ی خزمەت کاری عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوا دوژمنایەتی هەر کەسێك دەکات کە دوژمنایەتی عەلی بکات ).

## ( ١٢ ) ( فەزڵی حەسەن و حوسەین رضي الله عنهما )

( ٩٨١ ) ( **حم خ ٣** ) عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ يُصْلِحُ اللهُ عَلَى يَدَيْهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ** ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٥٢٨ ) في صحيح الجامع

ابو بكرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەم کوڕەی من هەر گەورە و سەردارە، خوای گەورە لەسەر دەستیدا دوو دەستەو تاقمی گەورە سوڵح پێ دەکات ). مەبەست پێ ی ئیمامی حەسەنە.

( ٩٨٢ ) ( **خد ت هـ ك** ) عن يعلى بن مرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **حُسَيْنٌ مِنِّي وَ أَنَا مِنْ حُسَيْنٍ، أَحَبَّ اللهُ مَنْ أَحَبَّ** [illegible] **يْناً، حُسَيْنٌ سِبْطٌ مِنَ الأَسْبَاطِ** ﴾ . و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣١٣٤ ) في صحيح الجامع

يعلى ی کوڕی مرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( حوسەین لە منە و منیش لە حوسەینم، هەر کەسێك حوسێنی خۆش بووێت خوایش خۆیشی دەوێت، حوسەین کوڕەزامە و بۆ خۆی هۆزێکە لە هۆزەکان ).

### ڕوون کردنەوە ی فەرمودە:

ووشەی ( السبط ) بەمانای کوڕی کوڕ دێت، هەروەها بەمانای هۆزو قەبیلەش دێت.

( ٩٨٣ ) ( **حم ٤ حب ك** ) عن بريدة قال: قال رسول الله(ﷺ): **كَانَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) يَخْطُبُنَا إِذْ جَاءَ الْحَسَنُ وَ الْحُسَيْنُ عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) مِنَ الْمِنْبَرِ فَحَمَلَهُمَا وَوَضَعَهُمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ:** ﴿ **صَدَقَ اللهُ** [illegible] **أَمْوَالُكُمْ وَ أَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ** [illegible] **نَظَرْتُ** [illegible] **الصَّبِيَّيْنِ** [illegible] **نِ وَ**

**يعْثُـرانِ فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قَطَعْتُ حَدِيثِي وَ رَفَعْتُهُما ﴾**. و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٧٥٦ ) في صحيح الجامع

بريدة دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ووتاری بۆ دەداین، لەو کاتەدا حەسەن و حوسەین سەلامیان لەسەر بێت هاتن، دوو کراسی سووریان لەبەردا بوو دەڕۆشتن و دەکەوتن، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) هاتە خوارەوە لەسەر مینبەرەکە هەردووکیانی هەڵگرت و خستیە بەردەمی خۆی، پاشان فەرمووی: خوا راستی فەرمووە: ﴿أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ﴾، بە راستی ماڵ و منداڵەکانتان فتنەو تاقیکردنەوەن بۆتان. سەیری ئەم دوو کوڕەم دەکرد دەڕۆشتن و دەکەوتن، ئیتر خۆم بۆ رانەگیرا هەتا دابەزیم و بەرزم کردنەوە ).

## ( ١٣ ) ( فەزڵی عائشەی دایکی موسڵمانان رضي الله عنها )

( ٩٨٤ ) ( حم ق ) عن عائشة أنها قالت: قال رسول الله(ﷺ): **﴿ أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ ثَلَاثَ لَيَالٍ، جَاءَنِي بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ فَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُكَ؟ فَأَكْشِفُ عَنْ وَجْهِكِ، فَإِذَا أَنْتِ هِيَ فَأَقُولُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللهِ يُمْضِهِ ﴾**. و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٩١٥ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( سێ شەو لە خەونمدا تۆیان پیشان دەدام، فریشتەکە لە پارچە قوماشێکی ئاوریشمدا تۆی بۆ دەهێنام، و دەیوت: ئەوە ژنی تۆیە، منیش پەچەکەم لەسەر رووت لا دەدا کە دەمبینی تۆیت، ئینجا دەمگوت: ئەگەر ئەمە لای خواوەوە بێت ئەوا خۆی بە جێی دەگەیەنێت

( ٩٨٥ ) ( خ ت ن ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): **﴿ يَا أُمَّ سَلَمَةَ! لَا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ فَإِنَّهُ مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ الْوَحْيُ وَ أَنَا فِي لِحَافِ امْرَأَةٍ مِنْكُنَّ غَيْرَهَا ﴾**. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٥٤ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەی دایکی سەلمە، دڵم مەیەشێنە بە ئازار دانی عائشە، چونکە لە پێخەفی هیچ ئافرەتێك لە ئێوەدا وەحیم بۆ نەهاتۆتە خوارەوە جگە لەو نەبێت ) .

## ( ٧ ) ( فەزڵی ئەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە )

( ٩٨٦ ) ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): **﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ ﴾**. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧١٩ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە سەیری ئەهلی بەدری کرد و فەرمووی: هەر چیتان دەوێت بیکەن من تازە لێتان بوورام ).

( ٩٨٧ ) ( حم هـ ) عن حفصة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنِّي لأَرْجُو أَلاَّ يَدْخُلَ النَّارَ أَحَدٌ إنْ شَاءَ اللهُ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً و الْحُدَيْبِيَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٧٦ ) في صحيح الجامع

حفصه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( من ئومێدم وایە کە هیچ کەسێك نەچێتە ئاگرەوە، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لەوانەی کە ئامادەی بەدر و حودەیبیە بوون ).

( ٩٨٨ ) ( حم ق د ت ) عن علي ( د ) عن أبي هريرة ( حم ) عن ابن عباس وعن جابر قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ قَدْ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَاشِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١٢٢ ) في صحيح الجامع

لە علی ـ وە لە ابو هریرة وە لە إبن عباس و جابرەوە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( جا تۆ چوزانیت بەڵکو خوای گەورە سەیری ئەهلی بەدری کردبێت و فەرموو بێتی، هەرچی دەکەن بیکەن ، من تازە لێتان بوراوم )

## ( ١٥ ) ( فەزڵی ئەوانەی بەشداری جەنگی ئوحودیان کردووە )

( ٩٨٩ ) ( حم د ك ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَمَّا أُصِيبَ إِخْوَانُكُمْ بِأُحُدٍ جَعَلَ اللهُ أَرْوَاحَهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ تَرِدُ أَنْهَارَ الْجَنَّةِ تَأْكُلُ مِنْ ثِمَارِهَا وَ تَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مِنْ ذَهَبٍ مُعَلَّقَةٍ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ فَلَمَّا وَجَدُوا طِيبَ مَأْكَلِهِمْ وَ مَشْرَبِهِمْ وَ مَقِيلِهِمْ قَالُوا: مَنْ يُبَلِّغُ إِخْوَانَنَا عَنَّا أَنَّا أَحْيَاءٌ فِي الْجَنَّةِ نُرْزَقُ لِئَلاَّ يَزْهَدُوا فِي الْجِهَادِ وَلا يَنْكُلُوا عِنْدَ الْحَرْبِ؟ فَقَالَ اللهُ تَعَالَى: أَنَا أُبَلِّغُهُمْ عَنْكُمْ، قَالَ: وَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِيْنَ قُتِلُوا فِي سَبِيْلِ اللهِ أَمْوَاتاً ﴾ إِلَي آخِرِ الآيَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٢٠٢ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( کاتێك کە براکانتان لـە جـەنگی ئوحدا پـێ کران، خوای گەورە رۆحەکانیانی خستە ناو باڵندەی سەوزەوە، دەچێتە سەر رووبارەکانی بەهەشت، وە لە میوە جاتەکان دەخوات و دەچێتەوە ناو چراخانێك لە ئاڵتون کە لە سێبەری عەرشدا هەڵواسراوە، جا کاتێك کە بینیان خواردن و خواردنەوە و جێ مانەوەیان چەند خۆشە، ووتیان: کێ بێ و هەواڵی ئێمە بە براکانمان بگەیەنێت کە ئێمە زیندووین لە بەهەشتداو رۆزیمان دەدرێتێ، نەوەك سستی و بێ تاقەتی بنوێنن لە جیهاددا و پاشگەزبنەوە و بترسن لە کاتی جەنگدا، جا خوای گەورەش فەرمووی: من لە جیاتی ئێوە پێیان رادەگەیەنم و هەواڵەکەیان دەدەمێ ) فەرمووی: وە خوای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە ( وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ) تا کۆتایی ئایەتەکە ).

## ( ١٦ ) ( فەزڵی حەمزە رضي الله عنه مامی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم )

( ٩٩٠ ) ( ك ) عن جابر ( طب ) عن علي قال: قال رسول الله( صلى الله عليه وسلم ): ﴿ سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٦٦٦ ) في صحيح الجامع

لە جابرەوە لە علی یەوە دەڵێن: پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمـوویەتی: ( سەردارو گەورەی شەهیدەکان لە رۆژی قیامەتدا "حەمزەی کوڕی عبد المطلبە ).

## ( ١٧ ) ( فەزڵی عەماری کوڕی یاسر رضي الله عنه )

( ٩٩١) ( حم ن حب ك ) عن خالد بن الوليد قال: قال رسول الله( صلى الله عليه وسلم ): ﴿ مَنْ عَادَى عَمَّاراً عَادَاهُ اللهُ وَ مَنْ أَبْغَضَ عَمَّاراً أَبْغَضَهُ اللهُ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٣٨٣ ) في صحيح الجامع

خالیدی کوڕی وەلید دەڵێ: پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەس دوژمنایەتی عەممار بکات، خوای گەورەش دوژمنایـەتی ئـەو دەکـات، وە هـەر کەسـێکیش رقـی لـە عـەممار بێـت خـوایش رقـی لـەو دەبێت ).

## ( ١٨ ) ( فەزڵی خالیدی کوڕی وەلید رضي الله عنه )

( ٩٩٢ ) ( البغوي ) عن عبدالله بن جعفر قال: قال رسـول الله( صلى الله عليه وسلم ): ﴿ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللهِ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٠٥ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی جعفر دەڵێ: پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمـوویەتی: ( خالیدی کوڕی وەلیـد شمشێرێکە لـە شمشێرەکانی خوا ).

( ٩٩٣ ) ( ابن عساكر ) عن عمر قال: قال رسـول الله( صلى الله عليه وسلم ): ﴿ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيْدِ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللهِ سَلَّهُ اللهُ عَلَى الْمُشْرِكِيْنَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٠٦ ) في صحيح الجامع

عمر دەڵێ: پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمـوویەتـی: ( خالیدی کوڕی وەلید شمشێرکە لە شمشێرەکانی خوا، خوای گەورە هەڵی کێشاوە بەسەر موشریکەکاندا ).

( ٩٩٤ ) ( حم ) عن أبي عبيدة قال: قال رسول الله( صلى الله عليه وسلم ): ﴿ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيـدِ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللهِ وَ نِعْمَ فَتَى الْعَشِيْرَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٠٧ ) في صحيح الجامع

ابـو عبیـدە دەڵـێ: پێغەمبـەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمـوویەتی. (خالیـدی کـوڕی وەلیـد شمـشێرێکە لـە شمشێرەکانی خوا،وە باشترین لاوی عەشیرەتەکەشە)

( ٩٩٥ ) ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة قـال: بعث النبي( صلى الله عليه وسلم ) عمر بن الخطاب رضي الله عنـهُ على الصَدقة فمنع ابنَ جميل وخالد بنَ وليد والعبَاسَ فقال رسُول الله( صلى الله عليه وسلم ): ﴿ مَـايَنْقِمُ ابْـنُ جَمِيـلٍ إلاَّ أَنَّـهُ كَـانَ فَقِيراً فَأَغْنَاهُ اللهُ، وَ أَمَّا خَالِدُ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِداً وَ قَدْ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَ أَعْتُدَه فِي سَبِيلِ اللهِ، أَمَّا

الْعَبَّاس عم رسُولِ الله(ﷺ) فَهِي عَلَي و مِثْلُهَا، ثُم قَالَ أَمَا شَعَرْتَ أَنّ عَمّ الرجُل صِنْوُ الأب أَوْ صِنْوُا أَبِيه ». و اللفظ لأبي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٨١٩) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) عومەری کوڕی خەتابی‌ﷺ کردە بەرپرسی پارەی سەدەقە. ئەویش بەشی ابن جمیل و خالیدی کوڕی وەلید و عەباسی نەدا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ( چ شتێك ابن جمیلی نیگەران کردووە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە هەژار بووە و خوا دەوڵەمەندی کردووە، بەڵام خالیدی کوڕی وەلید، ئەوە ئێوە زوڵم لە خالید دەکەن، ئەو قەڵغانەکان و چەك و تفاقەکانی لە رێی خوای گەورەدا بەند کردووە، بەڵام عەباسی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو سەدەقەکەی لەسەر منە و ئەوەندەی تریش ) پاشان فەرمووی: ( ئەی هەستت پێ نەکردووە کە مامی پیاو هاوشانی باوکە یان هاوشانی باوکییەتی ).

( ٩٩٦ ) ( حم ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « نِعْم عَبْد الله خَالِدُ بْنُ الْوَلِيد سَيْفٌ مِنْ سُيُوف الله ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٧٦٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە باشترینی بەندەکانی خوایە خالیدی کوڕی وەلید، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا).

## ( ١٩ ) ( فەزڵی حەسانی کوڕی ثابت )

( ٩٩٧ ) ( حم ت ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ الله يُؤَيّدُ حَسّانَ بِرُوحِ الْقُدُس مايُفَاخِرُ أَوْ يُنَافِحُ عنْ رسُولُ الله ». و اللفظ للترمذي. (صحيح، أنظر حيث رقم (١٨٦٥) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بە روح القدس - واتە جبریل - پشتیوانی لە حەسان دەکات، هەتا ئەو فەخر بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بکات یان بەرگری لێ بکات )

( ٩٩٨ ) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ رُوحُ الْقُدُسِ لايَزَالُ يُؤَيّدُك مَا نَافَحْتَ عنْ الله و رسُوله »، - قاله لحسان -. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٨٦) في صحيح الجامع

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( روح القدس بەردەوام پشتیوانیت لی دەکات، هەتا تۆ بەرگری لە پێغەمبەرەکەت بکەیت ) - بە حەسانی فەرموو -

## ( ٢٠ ) ( فەزڵی الأشَجّ رضي الله عنه )

( ٩٩٩ ) ( هـ ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « يَا أَشَجُّ! إنّ فِيك لَخصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا الله: الْحِلْم و التُّؤَدَةَ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٤٦) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەی ئەشەج: تۆ دوو سیفەتت تێدایە کە خوا خۆشی دەوێن: هێوری و لەسەر خۆیی ).

## ( ٢١ ) ( فەزڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ )

( ١٠٠٠ ) ( طب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ سبَّ أصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَـةُ الله و المَلائِكَةِ وَ النَّاسِ أجْمَعِين ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٨٤ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هـەر کەسێك جنێو بە هاوەڵەکانم بدات ئەوا نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت ).

( ١٠٠١ ) ( طب ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لعَنَ الله مَنْ سَبَّ أصْحَابِي ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١١٠ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت کە جنێو بە هاوەڵکانم دەدات ).

( ١٠٠٢ ) ( ن ) عن أبي هريرة قال: مَرُّوا بِجَنَازَةٍ عَلىَ النَّبيِّ(ﷺ) فَأثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبيّ(ﷺ): ﴿ وَجَبَتْ ﴾، ثُمَّ مروا بِجَنَازَةٍ أُخرىَ فَأثْنَوْا عليْهَا شراً، فَقَالَ النَّبيّ(ﷺ): ﴿ وَجَبَتْ ﴾، قَالُوا يارَسُول الله(ﷺ) قَوْلُك الأولى و الأُخرىَ وَجبتْ؟ فَقَالَ النَّبيّ(ﷺ): ﴿ المَلائِكَةُ شُهَدَاءُ الله فِي السَّماءِ وَأنْتُمْ شُهَدَاءُ الله فِي الأرْضِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧١١ ) في صحيح الجامع

ابــوهريرة دەڵــێ: جەنازەیــەکیان بــرد بــە لای پێغەمبــەردا(ﷺ) وە بــە باشــی باســیان کــرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــووی: ( واجب بوو )، پاشان جەنازەیەکی تریان برد بەلایدا و بە خراپە باسیان کــرد، پێغەمبــەریش(ﷺ) فەرمــووی: ( واجــب بــوو )، ووتیــان: ئــەی پێغەمبــەری خــوا بــۆ یەکــەم و دووەمــیش فــەرمووت واجــب بــوو ؟ پێغەمبــەریش(ﷺ) فــەرمووی: ( فریــشتەکان شــایەتی خــوان لــە ئاسماندا وە ئێوەش شایەتی خوان لەسەر زەوی ).

( ١٠٠٣ ) ( طب ) عن سلمة بن الاكوع قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أنْتُمْ شُهَدَاءُ الله فِي الأرْضِ وَ المَلائِكَةُ شُهَدَاءُ الله فِي السَّمَاءِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٩٠ ) في صحيح الجامع

سلمەی کــوڕی اکــوع دەڵــێ: پێغەمبــەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئێــوە شــایەتی خــوان لــە زەویــدا و فریشتەکانیش شایەتی خوان لە ئاسماندا ).

## ( ٢٢ ) ( فەزڵی ئال و بەیت ( خانەوادە )ی پێغەمبەر(ﷺ) )

( ١٠٠٤ ) ( ق ن ) عن أبي هريرة ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَامَعْشَرَ قُـرَيْشٍ اشْتَرُوا أنْفُسَكُمْ مِنَ الله لاأُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ الله شَيْئاً يَابَنِي عَبْدِ مَنَافٍ اشْتَرُوا أنْفُسَكُمْ مِنَ الله لا أُغْنِـي

عَنْكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئاً، يَاعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لا أُغْنِيَ عَنْكَ مِنَ اللهِ شَيْئاً، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللهِ لا أُغْنِيَ عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً، يَا فَاطِمَةُ سَلِينِي مَا شِئْتِ لا أُغْنِيَ عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٧٩٧٠ ) في صحيح الجامع

له ابو هريرة وه عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ئەی کۆمەڵگەی قورەیش، خۆتان لە خوا بکڕنەوە، من ناتوانم لای خوا هیچ سودێکتان پێ بگەیەنم. ئەی نەوەی ( عبد المناف ) ناتوانم هیچ سودێکتان پێ بگەیەنم لەلای خوا، ئەی عەباسی کوڕی عبد المطلب هیچم بۆت پێ ناکرێ لە لای خوا ئەی صفیەی پوری پێغەمبەر(ﷺ) هیچم بۆت پێ ناکرێ لە لای خوا، ئەی فاتمە هەرچیت ویست داوام لێ بکە من هیچم پێ ناکرێ بۆت لە لای خوا ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە هاوار لە عەشرەت و بنەماڵە و کەسەکانی خۆی دەکات هەتا موسڵمان بن و باوەڕ بە خوا بهێنن، چونکە تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) هیچی بۆ بێ باوەڕان پێ ناکرێ لە لای خوای گەورە.

## ( ٢٣ ) ( فەزڵی أویس ی قەڕەنی )

( ١٠٠٥ ) ( م ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ خَيْرَ التَّابِعِيْنَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: أُوَيْسٌ، وَ لَهُ وَالِدَةٌ وَ كَانَ بِهِ بَيَاضٌ فَمُرُوْهُ فَلْيَسْتَغْفِرَ لَكُمْ ﴾، وَفِي رِوَايَةٍ عِنْدَهُ ﴿ لَهُ وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٢٠٦٤ ) في صحيح الجامع

عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( باشترین کەسی شوێن کەوتووەکان ( تابعینەکان ) پیاوێکە پێی دەوترێت اویس دایکێکی هەیە، وە پەڵەیەکی سپی پێوەیە، جا بەسەری بکەنەوە با داوای لێبووردنتان بۆ بکات لای خوا ) وە لە ریوایەتێکی ترەوە هەر لەوەوە: ( دایکێکی هەیە زۆر چاکە کارە لەگەڵ ئەو دایکەیدا، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات، خوا سوێندی ناشکێنێت چی بوێت دەیداتێ ).

**تابعی**: بەو کەسە دەوترێت کە هاوەڵانی پێغەمبەری(ﷺ) بینیوە و بەڵام خۆی نەبینیوە.

( ١٠٠٦ ) ( م ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ رَجُلاً يَأْتِيْكُمْ مِنَ الْيَمَنِ يُقَالُ لَهُ: أُوَيْسٌ، لا يَدَعُ بِالْيَمَنِ غَيْرَ أُمٍّ لَهُ قَدْ كَانَ بِهِ بَيَاضٌ فَدَعَا اللهَ فَأَذْهَبَهُ عَنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ الدِّيْنَارِ أَوِ الدِّرْهَمِ ، فَمَنْ لَقِيَهُ مِنْكُمْ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ ﴾. ( صحيح ) انظر حيث رقم ( ٢٠٨٣ ) في صحيح الجامع

عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( پیاوێك دێت بۆ لاتان لە یەمەنەوە، پێی دەوترێت: اویس، کەسی نییە لە یەمەن کە لەدوای خۆی بەجێی هێشتبێت تەنها دایکی نەبێت، پەڵەیەکی سپی

پێوە بوو، جا داوای لە خوا کرد ئەویش بۆی لابرد و پێوەی نەهێشت. تەنها شوێنی دینارێك یان دەرهەمێك نەبێت، جا هەر کامێکتان پێی گەیشتن با داوای لێبوردنتان لە خوا بۆ بکات ).

## ( ٢٤ ) ( فەزڵی هۆزی قورەیش )

( ١٠٠٧ ) ( ابن عساكر ) عن جابر ( خد طب ) عن رفاعة بن رافع قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ قُرَيْشاً أَهْلُ أَمَانَةٍ لا يَبْغِيهِمُ الْعَثَراتِ أَحَدٌ إلاَّ كَبَّهُ اللهُ لِمَنْخِرِيهِ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢١٣٩ ) في صحيح الجامع

لە جابرەوە رفاعەی کوڕی رافع دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( قورەیش ئەهلی دەست پاکین هەر کەس مەبەستی بێت پێیان بترازێنێت، ئەوا خوا لوتی شۆڕ دەکات )

( ١٠٠٨ ) ( حم ق ن ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ هَذَا الأَمْرَ فِي قُرَيْشٍ لا يُعَادِيهِم أَحَدٌ إلاَّ كَبَّهُ اللهُ عَلىَ وَجْهِهِ مَا أَقَامُوا الدِّيْنَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٤٣ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەم کارە وا لە قورەیشدا - واتە خەلیفایەتی- هیچ کەسێك نییە دوژمنایەتییان بکات ئیلا خوای گەورە بە تەپڵی سەردا دەیدات بە زەویدا،هەتا ئەوان بەردەوام بن لە ڕاگرتنی ئاینی خودا ).

( ١٠٠٩ ) ( طس ) عن الزبير بن العوام قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَضَّلَ اللهُ قُرَيْشاً بِسَبْعِ خِصَالٍ: فَضَّلَهُمْ بِأَنَّهُمْ عَبَدُوا اللهَ عَشْرَ سِنِيْنَ لا يَعْبُدُ اللهَ إلاَّ قُرَيْشٌ وَ فَضَّلَهُمْ بِأَنَّهُمْ نَصَرَهُمْ يَوْمَ الْفِيْلِ وَ هُمْ مُشْرِكُونَ وَ فَضَّلَهُمْ بِأَنَّهُ نَزَلَتْ فِيْهِمْ سُورَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ لَمْ يَدْخُل فِيْهَا أَحَدٌ مِنَ الْعَالَمِيْنَ وَ هِيَ: ﴿ لإيلافِ قُرَيْشٍ ﴾، وَ فَضَّلَهُمْ بِأَنَّ فِيْهِمُ النُّبُوَّةَ وَ الْخِلافَةُ وَ الْحِجَابَةُ وَ السِّقَايَةُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٢٠٤ ) في صحيح الجامع

زوبێری کوڕی عەوام دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بە حەوت شت فەزڵی قورەیشی داوە: فەزڵی داوە بەوەی کە دە دانە ساڵ خوایان پەرستووە و لە غەیری قورەیش کەسی تر خوای نەپەرستووە، وە فەزڵی داوە بەوەی لە ڕۆژی فیلەکەدا سەری خستون لە کاتێکدا کە ئەوان موشریکیش بوون، وە فەزڵی داون بەوەی کە سورەتێك لە قورئان تایبەت دەبارەیان هاتۆتە خوارەوە وهیچ یەکێکی تری لە خەڵکان تێ نەکراوە کە ئەویش ( لایلاف قریش) ە. وە فەزڵی داون بەوەی کە پێغەمبەرایەتی و خەلیفایەتی و کلیلدارێتی کەعبەو ئاودانی حاجیانی ماڵی خوا لەناو ئەواندایە ).

( ١٠١٠ ) ( تخ طب ك البيهقي في الخلافيات ) عن أم هانيء قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَضَّلَ اللهُ قُرَيْشاً بِسَبْعِ خِصَالٍ لَمْ يُعْطِهَا أَحَدٌ قَبْلَهُمْ وَ لا يُعْطَاهَا أَحَدٌ بَعْدَهُمْ: فَضَّلَ اللهُ قُرَيْشاً أَنِّي مِنْهُمْ وَ أَنَّ النُّبُوَّةَ فِيهِمْ وَ أَنَّ الْحِجَابَةَ فِيْهِمْ وَ أَنَّ السِّقَايَةَ فِيْهِمْ وَ نَصَرَهُمْ عَلَى الْفِيْلِ وَ عَبَدُوا اللهَ عَشْرَ سِنِيْنَ لا يَعْبُدهُ غَيْرُهُمْ وَ أَنْزَلَ اللهُ فِيْهِمْ سُورَةً مِنَ الْقُرْآنِ لَمْ يَذْكُرْ فِيْهَا أَحَد غَيْرَهُمْ: ﴿ لإِيْلافِ قُرَيْشٍ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٤٢٠٨ ) في صحيح الجامع

ام هانيء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوا فەزڵی قورەیشی داوە بە حەوت خەسڵەت بە کەسی تری نەداوە لە پێش ئەواندا، وە ناشدرێت بە کەسی تر لە دوای ئەوان، خوا فەزڵی قورەیشی داوە بەوەی کە من لەوانم وە پێغەمبەرایەتی لەواندایە، وە کلیلداریتی کەعبە لە واندایە، وە ئاودانی حاجیان لەواندایە، وە سەریشی خستن بەسەر فیلەکەدا، وە دە ساڵ خوایان پەرستووە، لە غەیری ئەوان کەسی تر نەیپەرستووە، وە خوا سورەتێکی لە قورئان دەربارەی ئەوان دابەزاندووە کە کەسی تری تێدا باس نەکراوە جگە لەوان ( لایلاف قریش ).

( ١٠١١ ) ( حم ك ) عن عثمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَهَانَ قُرَيْشاً أَهَانَهُ الله ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦١١١ ) في صحيح الجامع

عثمان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کەسێك سوکایەتی بە قورەیش بکات، خوایش سوکایەتی پێ دەکات ).

( ١٠١٢ ) ( حم ن ك ) عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ يُرِدْ هَوَانَ قُرَيْشٍ أَهَانَهُ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٦١٢ ) في صحيح الجامع

سعد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کەسێك سوکایەتی قورەیشی بوێت، خوا سوکایەتی بە خۆی دەکات ).

( ١٠١٣ ) ( حم ت ه حب ك ) عن عبدالله بن عدي بن الحمراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَ الله إِنَّكَ لَخَيْرَ أَرْضِ الله وَ أَحَبُّ أَرْضِ الله إِلىَ الله وَ لَوْلا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٠٧٤ ) في صحيح الجامع

عبدالله ی کوڕی عدی کوڕی الحمراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( سوێند بێت بە خوا تۆ باشترین زەوی خوایت، وە خۆشەویسترین زەوی خوایشی لەلای خوا، وە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە بە زۆر لێت کراومەتە دەرەوە، لێت دەرنەدەچووم ).

## ( ٢٥ ) ( فەزیڵەتی مەدینە و ئەنسارەکان )

( ١٠١٤ ) ( طب ) عن جابر بن سمرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ الله أَمَرَنِي أَنْ أُسَمِي الْمَدِيْنَةَ طَيْبَةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٢٣ ) في صحيح الجامع

جابری کوڕی سمرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوا فەرمانی پێ کردووم کە مەدینە ناو بنێم ( طَيبةَ ).

( ١٠١٥ ) ( حم طب ) عن الحارث بن زياد الانصاري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ النَّاسَ يُهَاجِرُونَ إِلَيْكُمْ وَ لا تُهَاجِرُونَ إِلَيهِم وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لايُحِبُّ الأَنْصَارَ رَجُلٌ حَتَّى يَلْقَى الله إِلاَّ لَقِيَ

**اللهِ وَ هُوَ يُحِبُّهُ وَلا يَبْغُض الأَنْصَارَ رَجُلٌ حَتَّى يَلْقَىَ الله إلاَّ لَقِيَ الله وَ هُوَ يَبْغَضُهُ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (١٩٧٩) في صحيح الجامع**

حارث ی کوڕی زیادی ئەنصاری دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خەڵك کۆچ دەکات بۆ لاتان و ئێوە کۆچ ناکەن بۆ لایان، جا سوێند بێت بەوەی کە گیانی منی بە دەستە هیچ پیاوێك نییە کە ئەنساری خۆش بووێت هەتا ئەو کاتەی دەچێتە بەردەمی خوا ئیلا ئەو کاتەی بە خزمەت خوا دەگات خوای گەورە خۆشی دەوێت، وە هیچ پیاوێك نییە کە رقی لە ئەنسار بێت هەتا دەگەڕێتەوە لای خوا ئیلا کە گەڕایەوە لای خوا، خوا رقی لێیەتی ).

**( ١٠١٦ ) ( حم ق ) عن عبدالله بن زيد بن عاصم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَامَعْشَرَ الأَنْصَارِ أَلَمْ أَجِدْكُمْ ضُلاَّلاً، فَهَداكُمُ الله بِي؟ وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ الله بِي؟ وَ مُتَفَرِّقِيْنَ فَجَمَعَكُمُ الله بِي، وَ يَقُوْلُونَ الله وَرَسُولُهُ أَمَنّ. فَقَالَ: ﴿أَلا تجيبوني؟ ﴾، فَقَالُوا: الله وَرَسُلُهُ أَمَنّ، فَقَالَ: ﴿ أَمَا إِنَّكُمْ لَوْ شِئْتُمْ أَنْ تَقُوْلُوا كَذَا وَ كَذَا، وَكَانَ مِنَ الأَمْرِ كَذا وَكَذا ﴾، لأشْيَاء عدَدَها، زعم عمْرو أنْ لايَحْفَظُها، فَقَالَ: ﴿ أَلا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاءِ وَالإِبِل، وَ تَذْهَبُونَ بِرَسُولِ الله إِلىَ رِحَالِكُمْ؟ ، أَلأَنْصَارُ شِعارٌ وَالنَّاسُ دِثَارٌ، وَ لَوْلا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ وَ لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِياً وَ شِعْباً، لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ وَ شِعَبِهِمْ، إِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ بَعْدِي أَثَـرَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّىَ تَلْقَوْنِي عَلىَ الْحَوْضِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٦٨) في صحيح الجامع**

عبدالله ی کوڕی زیاد کوڕی عاصم دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەی کۆمەڵگەی ئەنسارەکان، کە ئێوەم بینی ئایا هەموو گومڕا نەبوون؟، وە خوای گەورە بە من هیدایەتی دان، ئەی هەژار و دەستە وسان نەبوون و خوا بە من دەوڵەمەندی کردن؟ ئەی پەرتەوازە نەبوون، وە خوای گەورە بە من کۆی کردنەوە ؟ ) ئەوانیش دەیانووت: خوا و پێغەمبەرەکەی خاوەنی منەتن، ئەویش فەرمووی: ( دەی وەڵامم نادەنەوە ؟ ) ئەوانیش ووتیان: خواو پێغەمبەرەکەی خاوەنی منەتن، ئینجا فەرمووی: ( دەی ئێوە ئەگەر دەتانەوێت بڵێن ئەو شتە ئاوا و ئاوا ،وە ئەو شتە ئاوا و ئاوا بوو ). چەند شتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی ژماردن و (عەمر )دەڵێ لە بیرم نەماوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( دەی رازی نابن خەڵك بڕۆن و وشتر بەرنەوە، وە ئێوەش پێغەمبەری خوا لەگەڵ خۆتان بەرنەوە بۆ ماڵەکانتان، ئەنسارەکان بەرگە پۆشی ناوەوەن خەڵکیش پۆشاکی دیوی دەرەوەن .وە ئەگەر لەبەر کۆچ کردنەکە نەبوایە من هەر کەسێك دەبووم لە ئەنسارەکان، وە ئەگەر ئەو خەڵکە شیو و دۆڵی ئەنسارەکاتن و رێگایەك بگرن، ئەوا من شیو دۆڵ و رێگاکەی ئەوان دەگرم، جا ئێوە لە دوای من فەرق و جیاوازییەك دەبینن کە لەگەڵتاندا دەکەن، وە ئێوە بە ئارام و خۆ راگر بن هەتا ئەو کاتەی کە لەسەر حەوزی کەوسەر پێم دەگەنەوە ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

لە دوای فەتحی مەککە ژمارەیەکی زۆر لە بێ باوەڕەکانی ئەو شارە هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە، کە هەندێك لەوانە هێشتا تەواو شیرینی ئیسلام نەچوبوە ناو دڵیانەوە وە باوەڕەکەیان پتەو و دامەزراو نەبوو، بۆیە هەر لە یەکەم جەنگ دا کە موسڵمانەکان پێی هەستان لە دوای فەتحی مەککەوە کە غەزوەی حونەین بوو، وە بە بەشداری و سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی بوو، وە چەند هەزارێکیش لەو تازە موسڵمان بووانە لەناو ئەو لەشکری ئیسلامەدا بوون، ئەوە بوو موسڵمانەکان غافڵ گیر کران بە هۆی کەمینێکی بێ باوەڕ و موشریکەکانەوە، بەمەش شڵەژاوییەك کەوتە دڵی موسڵمانەکانەوە، ئەوە بوو کە تازە موسڵمان بووەکان کە ژمارەیان چەند هەزارێك دەبوو، یەکسەر لە مەیدانی جەنگەکە هەڵهاتن و پێیان وابوو ئەگەر زوو هەڵنەیەن ئەوا لە ناو دەچن، چونکە وەك پێشتر ووتمان هێشتا تەواو ئیسلامیان نەناسیبوو، وە وەك کۆمەڵی کۆچ بەر و ئەنسارەکان باوەڕ لە دڵەکانیاندا نەچەسپیبوو، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پێشەوەی لەشکری ئیسلامیداو لە بەرامبەر کەمین و لە شکری بێ باوەڕەکاندا وەك چیا دامەزرا و نەجوڵاو هاواری کرد کە کۆمەڵی کۆچ بەر و ئەنسارەکان لە دەوری کۆببنەوە، ئەوەبوو تەنها چەند صەد نەفەرێك لە دەوری پێغەمبەر کۆبوونەوە کە سەرجەمیان کۆچ بەر و ئەنسارە دێرینەکان بوون ( لە کۆی ئەو لەشکرەی کە دوانزە هەزار کەس دەبوون )، وە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بە پشتیوانی خوا کە توانیان کەمینی دوژمنان تێك بشکێنن و لەشکرەکەشیان تێك و پێك بدەن، وە کاتێك کە تازە موسڵمان بووە هەڵهاتووەکان ئاوڕیان دایەوە سەیریان کرد کە ئەمان بێ ئاگا هەڵدێن کەچی وا لەپێشەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ چەند سەد کەسێك لەگەڵ هاوەڵە باوەڕدارەکانی وا شەڕەکەیان کۆتایی پێ هێنا و سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، بۆیە ئەمانیش بە شەرمەزارییەوە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لەوێشدا گەورەیی و مامۆستایەتی خۆی سەلماند ئەوەبوو لەبری ئەوەی سەرزەنشت و لێ پرسینەوەیان لەگەڵدا بکات لەسەر هەڵهاتنەکەیان کە بووە مایەی شیرازە تێك دانی لەشکری موسڵمانان کەچی بەشی زۆری ئەو دەست کەوت و غەنیمەتەی کە لەو جەنگەدا بەدەستیان هێنا، کە لە هەموو جەنگەکانی تر دەست کەوتەکەیان زیاتر بوو، دابەشی کرد بەسەر ئەو تازە موسڵمان بووانەی کە لە سەرەتای جەنگەکە هەڵهاتن وە هیچی وای بەشی ئەو ئەنسار و کۆچ بەرانە نەدا کە لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوونەوە و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەو کارە ئەوە بوو کە بە هۆی ئەو غەنیمەتە و ماڵی دونیایەوە، زیاتر دڵی ئەو تازە موسڵمان بووانەی شاری مەککە رابکێشێت بەرەو ئیسلام و باوەڕ لە دڵیاندا بچەسپێنێت، وە دڵنیاش بوو لەوەی کە موسڵمانە پێشینەکان هێندە چاوەڕێی پاداشتی خوا دەکەن هێندەی چاوەڕێی غەنیمەت و سامان ناکەن ،بەڵام مونافقینەکانی شاری مەدینە ئەم فرسەتەیان قۆزتەوە پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ شاری مەدینە، هانی هانییەکیان لە ناو ئەنسارییەکاندا دروست کرد بەوەی کە دەمار گیری و جاهیلیەتیان تێدا دەجوڵاندن و دەیان ووت: ئێوە چیتان نەکرد بۆ محەمەد، قەومەکەی خۆی دەریان کرد و ئێوە جێتان کردەوە، ئێوە پاڵپشتیتان کرد و سەرتان خست، کەچی هەر

لەگەڵ قەومەکەی خۆی لە مەککە هاتە ناو ئیسلامەوە خێرا ئێوەی لە بیر کرد و، ئەوەتا ئێوە شەڕەکەتان بۆ بردەوە، کەچی هەموو دەست کەوتەکەی دا بە قەومەکەی خۆی لە تازە موسڵمان بووەکانی مەککە کە لەم جەنگەدا هەڵهاتن، بەمەش وەخت بوو فیتنەییەکی گەورە لەناو شاری مەدینە دروست بێت.

بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەحیکمەت و لێزانینی خۆی هەموو ئەنسارەکانی کۆ کردەوە و وتارێکی هێندە بە جۆشی بۆ دان کە هەموو ئەنسارەکانی هێنایە گریان و راستی مەسەلەکەی بۆ روون کردنەوە کە لە بەرچی وای کردووە، وە وەك لە فەرموودەکەیشدا هاتووە کە دەقی ووتارەکەیە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو راستی‌یانەی وە بیر دەهێنێتەوە کە دەبێت ئەنسارەکان سوپاسی خوا بکەن، چونکە ئەوان بێ باوەڕ و گومڕابوون خوا لەسەر دەستی موحەمەد هیدایەتی دان، پاشان ئەوان هەژار و بێ دەسەڵات بوون و ئێستا گەورەی عەرەبن، پاشان ئەوان دوژمن و ناکۆك بوون و ئەوس و خەزرەج چل ساڵ بوو لە یەکتریان دەکوشت. بەڵام خوا لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشتی کردنەوە و یەکی خستنەوە و کردنی بە برا، پاشانیش پێغەمبەر(ﷺ) گلەیی ئەوەیان لێ دەکات کە هەندێك قسە و قسەلۆکی موناfیقەکان کاری تێ کردوون و راستییەکەیان لەبەر چاو شێواوە، بۆیە پێیان دەفەرموێت: ئەوە عەیب ناکەن لە سەر هەندێ مەڕ وبزن و هەندێ شتی بەتاڵی دونیا دڵتان یەشاوە، وە من ئەگەر فەزڵی ئەوانەی مەککەم بدایە بەسەر ئێوەدا، ئەوا هەڵبەتە لەگەڵ ئەوان دەڕۆشتمەوە بۆ مەککە، دەی رازی نابن ئەوان بزن و وشتر بەرنەوە، ئێوەش پێغەمبەری خوا بهێننەوە بۆ ناو خۆتان، پاشان پێیان دەفەرموێت: ئێوە ( شعار) ن و خەڵکی تر ( دثار)، مەبەستیش (شعار) واتە ئەو بەرگ و پۆشاکەی کە خەڵك لە ژێرەوە لەبەری دەکات راستەوخۆ وا بەسەر پێستەکەیەوە، وە ( دثار)یش ئەو پۆشاکانەی ترە کە بەسەر ئەوانەی ژێرەوەدا لەبەر دەکرێن، واتە ئێوە نزیکترن لەمن وەك لەوان، پاشانیش بۆ دڵنیایی کردنیان سوێندی ئەوەیان بۆ دەخوات کە ئەگەر هەموو خەڵکی جیهان بە رێگایەکدا بڕۆن، ئەم لەگەڵ ئەنسارەکان دەبێت و رێگای ئەوان دەگرێتە بەر، پاشان دەڵێ من لەبەر ئەوە نەبوایە کە هیجرەتم کردووە ئەوا هەر یەکێك دەبووم لە ئەنسارەکان، چونکە لە راستیدا خاڵوانی دایکی هەر خەڵکی مەدینەن. پاشانیش هەروەك لە ریوایەتەکانی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتایی وتارەکەیدا بۆ ئەنسارەکان داوا لە خوا دەکات و دەڵێ: خوایە رەحم بە ئەنسارەکان و ئەولادی ئەنسارەکان و ئەولادی ئەولادی ئەنسارەکانیش بکەیت، ئیتر ئەوە بووو هەموو ئەنسارەکان دەستیان بە گریان کرد و ووتیان: رازین ئەی پێغەمبەری خوا رازین هەزاران سەڵات و سەلام لەسەر گیانی پاکی موحەمەد بەراستی نموونەی پێشەوای بە حیکمەت و، دڵسۆز و خەمخۆر و دڵ پاك بووە لەگەڵ ئومەتەکەیدا، تەنانەت غەیری موسڵمانەکانیش ئەو شایەتییەی بۆ دەدەن، ئەوەتا ئەدیبی گەورەی ئینگلیز ( بەرنادشۆ ) لە مەجلیسێکدا کە تیایدا باس لە ئاڵۆز بوون و زۆربوونی کێشەکانی ئەمرۆی دونیا و جیهان کراوە هەڵدەداتێ و دەڵێ: ( ئەگەر محمد زیندوو بکرایەتەوە لە ماوەیەکی کەمدا هەموو کێشەکانی جیهانی چارەسەر دەکرد).

(١٠١٧) ( ق هـ ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ رَأَيْتُ في المَنَام أني أُهَاجِرُ مِنْ مكَةَ إلى أَرْضٍ بها نَخْلٌ فَذَهَبَ وَهْلي إلى أنَّهَا يَمَامَةُ أَوْ هَجَرٌ، فَإذا هيَ المَدِيْنَةُ يَثْرِبُ، وَ رَأَيْتُ في رُؤْيَايَ هَذه أنِّي هَزَزْتُ سَيْفاً فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ فَإذا هُوَ مَا أُصيبَ منَ المُؤْمنيْنَ، وَ رَأَيْتُ فيْهَا أَيْضاً بَقَراً، وَ الله خَيْرٌ فَإذا هُمُ النَّفَرُ منَ المُؤْمنيْنَ يَوْمَ أُحُد، وَ إذا الْخَيْرُ مَاجَاءَ الله به منَ الْخَيْرِ بَعْدُ، وَ ثَوابُ الصِّدْقِ الَّذي آتَانَا الله بَعْدَ يَوْم بَدْرٍ ﴾ و اللفظ لابن ماجة. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٤٦٢) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (لە خەونمدا بینیم كەوا من لە مەككەوە كۆچ دەكەم بۆ خاكێك كە دار خورمای زۆری تێدایە، جا وای بۆ چووم كە ( يمامة ) بێت یـان ( هجر ) بێت. كەچی مەدینە (يثرب) بوو، وە لەو خەونەشمدا بینیم كە من شمشێرێكم هەژاند سنگەكەی شكا. ئەویش ئەو كارەساتە بوو كە ئەو برِوادارانە توشی بوون، وە هەروەها هەندێ مانگام تێدا بینی ، كە خێرو فەرِێكی زۆریان تێدا بوو، ئەویش ئەو كۆمەڵە برِوادارانە بوون كە لە رۆژی ئوحددا شەهید بوون. وە خێرو فەرِەكەش ئەو خێرو فەرِە بوو كە پاشتر بە دوای خۆیاندا هێنایان . وەپاداشتی ئەو خۆرِاگری و راستكردنەمان بوو لەگەڵ خوادا كە لە رۆژی بەدردا خوای گەورە پێی بەخشین ).

(١٠١٨) ( حم ق د ت ) عن علي ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْمَدِيْنَةُ حَرَامٌ مَابَيْنَ عَيْرٍ إلىَ ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فيْهَا حَدَثاً أَوْ آوىَ فيْهَا مُحْدثاً فَعَلَيْه لَعْنَةُ الله وَ الْمَلائكَة وَ النَّاسِ أَجْمَعينَ، لايَقْبَلُ اللهُ منْهُ يَوْمَ الْقيَامَة صَرْفاً وَلا عَدْلاً، و ذمَّةُ الْمُسْلميْنَ وَاحدَةٌ يَسْعى بهَا أَدْنَاهُمْ، وَ مَنْ ادَّعَى إلىَ غَيْرِ أَبيْه أَو انْتَمىَ إلىَ غَيْرِ مَوَاليْه فَعَلَيْه لَعْنَةُ الله وَ الْمَلائكَة وَ النَّاسِ أَجْمَعينَ لا يَقْبَلُ الله منْهُ يَوْمَ الْقيَامَة صَرْفاً وَلا عَدْلاً ﴾ و اللفظ لمسلم من حديث علي رضي الله عنه. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٦٦٦ ) في صحيح الجامع

لە علی یە وە لە ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( مەدینە خاكی حەرەمە لە نێوان (عَير)هەتا (ثور)، جا هەر كەس كوشتنێكی تێدا بقەومێنێت، یـان داڵدەی بكوژێكی تێدا بدات، ئەوا نەفرەتی خوا و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر بێت. خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا نە تۆبە و نە بەرامبەری لێ قبوڵ ناكات، وە پەیمان و بەڵێنی موسڵمانان هەر یەكە. دەبێت هەموویـان پابەند بن. وە هەر كەسێك ناوی خۆی دایە پاڵ ناوی غەیری باوكی خۆی یـان خۆی خستە پاڵ كەسانێكی غەیری خاوەنەكانی خۆی، ئەوا نەفرەتی خوا و فریشتەكان و هەموو دنیای لەسەر بێت. خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا نە تۆبە و نە بەرامبەری لێ قبوڵ ناكات ).

(١٠١٩) ( حم ق ) عن عاصم قال: قلت لأنس بن مالك: أحرمَ رسُولُ الله(ﷺ) المديْنَةَ؟ قال: ﴿نَعَمْ، مَابَيْنَ كَذا إلىَ كَذا فَمَنْ أَحْدَثَ فيْهَا حدَثاً أَوْ آوىَ مُحْدَثاً﴾ قال: ثمَّ قال لي: هذه شديْدةٌ ﴿فَعَلَيْه لَعْنَةُ الله وَ الْمَلائكَة وَ النَّاسِ أَجْمَعينَ لا يَقْبَلُ الله منْهُ يَوْمَ الْقيَامَة صَرْفاً وَلا عَدْلاً ﴾ و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٦٦٨٣ ) في صحيح الجامع

عاصم دەڵێ بە ئەنەسی کوڕی مالکم ووت: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) شاری مەدینەی حەرام کردبوو؟ وتی:( بەڵێ لە نێوان ئەوێ هەتا ئەوێ، جا هەر کەسێك خوێنێکی تێدا بڕژێت یـان داڵدەی بکوژێکی تێدا بدات، ووتی: پاشان پێی وتم:ئەمە زۆر توندە کوشتن و داڵدەدانی بکوژ ( ئەوا نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت. خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا نە تۆبە و نە هیچ بەرامبەرێکی لێ وەرناگرێت).

**(١٠٢٠) ( حم ق ت ن ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لايحبهُمْ إلاَّ مؤمنٌ و لا يَبْغضُهُمْ إلاَّ مُنَافقٌ مَنْ أَحبَهُمْ أَحَبَهُ الله و مَنْ أَبْغَضَهُمْ أبغـضه الله ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٦٢٣ ) في صحيح الجامع**

البراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (کەسی باوەڕدار نەبێت خۆشی ناوێن، وە کەسی مونافیق نەبێت رقی لێیـان نییە، وە کەسێك خۆشی بوێن خوایش خۆشی دەوێن،وە هەر کەسێك رقی لێیـان بێت خوایش رقی لێی دەبێتەوە): ( -واتە ئەنسارەکان- ).

## ( ٢٦ ) ( فەزڵی ئەهلی مزگەوتی قبـاء )

**(١٠٢١) ( ت ) عن أبي هريرة قال: ﴿ نزَلَتْ هَذه الآيَةُ في أهل قبـاء: ﴿ فيْه رجالٌ يُحبُونَ أنْ يَتَطَهَّرُوا وَ الله يُحبُّ الْمُطَّهّرِيْنَ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧٥٩ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی قباء هاتۆتە خوارەوە: ﴿ **فيْه رجالٌ يُحبُون أنْ يَتَطَهَّرُوا**﴾، واتە: پیاوانێکی تێدایە حەزیـان بە خۆ پاکردنەوەیە.

## ( ٢٧ ) ( فەزڵی هۆزی حمیَر )

**حميَر:** ( هۆزێکن لە دۆڵی یەمەن ).

**(١٠٢٢) ( حم طب ) عن ذي مخمر قال: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ كان هذا الأمْرُ في حمْير فَنَزعه الله منْهُمْ وَ جَعَلَهُ في قُرَيْشٍ وَ سَيَعُودُ إليْهِمْ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٤٦١ ) في صحيح الجامع**

ذي مخمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: (ئەم کارە - واتە خەلافەت - کاتی خۆی لە حیمیەردا بووە ،جا خوا لەوانی سەندووەتەوە خستویەتییە ناو قورەیشەوە، وە لە ئاخیر زەماندا هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوان). واتە: جارێکی تر دەگەڕێتەوە حیمیەریەکانی یەمەن.

## ( ٢٨ ) ( فەزڵی ئەهلی شام )

**(١٠٢٣) ( طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسـول الله(ﷺ): ﴿ صَفْوَةُ الله منْ أرْضه الشّام و فيْها صَفْوتُهُ منْ خَلْقه و عبَاده و لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ منْ أُمَّتي ثُـلةٌ لا حسَاب عَلَيْهِمْ ولا عَذاب ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٧٦٤ ) في صحيح الجامع**

ابو امامة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەڵبژاردەی خوا لە زەوی خۆیدا، بریتیيە لە شام، وە هەڵبژاردەی دروست کراوەکان و بەندەکانی خۆیشی تێدایە .وە کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە نە حیساب و نە ئەشکەنجەیــان لەسەر نییە ).

**(١٠٢٤) ( طب ) عن واثلة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَلَيْكُمْ بِالشَّامِ فَإِنَّها صَفْوَةُ بِلادِ اللهِ يَسْكُنُهَا خِيْرَتُهُ مِنْ خَلْقِهِ فَمَنْ أَبى فَلْيَلْحَقْ بِيَمَنِهِ و لْيَسْقِ مِنْ غُدُرِهِ فَإِنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ تَكَفَّلَ لِي بِالشَّامِ و أَهْلِهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٤٠٦٣) في صحيح الجامع**

وائله دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( بەرەو شام برۆن چونکە ئەوە هەڵبژاردەی وڵاتەکانی خوایە ،وە باشەکان لە دروست کراوەکانی خوا تیایدا نیشتەجێ دەبن،جا ئەگەر کەسێك هەر نەیویست با خۆی بگەیەنێتە یەمەنەکەی، وە با لە حەوزەکەی خۆی ئاژەڵەکانی ئاو بدات، چونکە خوای گەورە کەفالەتی شام و خەڵکەکەی بۆ کردووم ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەست لەوەی کە با لە حەوزەکەی خۆی ئاژەڵەکانی ئاو بدات، ئەوەیە کە خەڵکی شام جاران عادەتیــان وابوو کە هەر کۆمەڵێکیــان حەوزی تایبەتی خۆیــان هەبوو بۆ ئاودانی وڵاخ، جا پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت موسڵمانان ئاگادار بکاتەوە کە بۆ هیچ سەبەبێك نەهێڵن لەگەڵ خەڵکەکەیدا تێك بگیرێن و ناخۆشی دروست بکەن، تەنانەت ئەگەر بە هۆی ئاودانی ئاژەڵەکانیــایشەوە بێت، با هەر یەك لە حەوزەکەی خۆی ئاوی ئاژەڵەکانی خۆی بدات.

## ( ٢٩ ) ( فەزیلەتی هۆزکانی أسلم و غفار و جهینە )

**(١٠٢٥) ( حم طب ك ) عن سلمة بن الاكوع ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللهُ وَ غِفَارٌ غَفَرَ اللهُ لَهَا أما وَ اللهِ مَا أَنَا قُلْتُهُ وَ لَكِنَّ اللهَ قَالَهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم (٩٧٥) في صحيح الجامع**

سلمةی کوڕی اکوع و ابو هريرة دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( اسلم خوا سەلامەتیــان بکات و لە شەڕ بەدوریــان بکات، وە غەفار خوا لێیــان ببورێت، وە سوێند بێت بە خوا من نەمووتوە بەڵکو خوا خۆی فەرمــوویەتی ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

واتە سەلامەت بوونی هۆزی أسلم و لێبووردنی هۆزی غفار،خوای گەورە خۆی فەرمــوویەتی، خۆی ئەو ڕێزەی پێ داون نەك من.

(١٠٢٦ ) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَسْلَمُ وَ غُفَارُ وَ شَيءُ مِنْ مُزَينَةَ وَ جهينة خَيْرٌ عِنْدَ اللهِ مِنْ أَسَدٍ وَ تَمِيمٍ وَ هَوَازِنٍ وَ غطفَانٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٩٧٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( اسلم و غفار و بەشێك لە مرينة وجُهينة لای خوا باشترن لە اسد و تميم و هوازن و غطفان ).

## روونكردنەی فەرموودەكە :

چونكە ئەو چوار هۆزەی یەكەم هەر لە سەرەتاوە موسڵمان بوون و پێشوازیــان لە ئاینی ئیسلام و پێغەمبەرەكەی كردوە، بە پێچەوانەی چوار هۆزەكەی دواییەوە كە هەتا سەردەمێكی درەنگ بەرەنگاری ئیسلام و موسڵمانانیــان كردووە.

(١٠٢٧) (حم ق ت) عن إبن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ غفَارُ غَفَرَ اللهُ لَهَا وَ أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللهُ وَ عُصَيَّةُ عَصَتِ اللهَ وَ رَسُولَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤١٣٠) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( غفار خوا لێی ببورێت، و اسلم خوا سەلامەتی بكات ،وە عُصَيّة لە خوا و پێغەمبەرەكەی عاسی بوون ).

(١٠٢٨) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَ الَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَغِفَارٌ وَ أَسْلَمُ وَ مُزَيْنَةُ وَ مَنْ كَانَ مِنْ جُهَيْنَةَ أَوْ قَالَ جُهَينَةُ، وَ مَنْ كَانَ مِنْ مُزَيْنَةَ خَيْرٌ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَسَدٍ وَ طَيِّءٍ وَ غَطَفَانَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٠٢٣) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( سوێند بەوەی كە گیــانی موحەمەدی بەدەستە، غفار و اسلم و مزينة وە هەر كەس كە لە جوهەینە بێت )، یــان فەرمووی: ( جهينە وە هەر كەس لە مزينة بێت، لای خوا باشترە لە ڕۆژی قیامەتدا لە اسد و طيئ و غطفان ).

## ( ٣٠ ) ( فەزڵی ئومەتی موحەمەد(ﷺ) )

(١٠٢٩) ( م ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ دُفِعَ إِلَى كُلِّ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِيْنَ فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا فِدَاؤُكَ مِنَ النَّارِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٧٨) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر كاتێك كە بوو بە ڕۆژی قیامەت،هەر پیاوێك لە موسڵمانەكان پیاوێك لە موشریكەكانی دەدرێتێ و پێی دەوترێت: ئائەمە قوربانی تۆیە لە ئاگر ).

(١٠٣٠) ( طب الحاكم في الكنى ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بَعَثَ الله إلىَ كُلِّ مُؤْمِنٍ مَلَكاً مَعَهُ كَافِرٌ فَيَقُولُ الْمَلَكُ لِلْمُؤْمِنِ: يَا مُؤْمِن هَاكَ هَذَا الْكَافِرُ فَهَذا فِدَاؤُكَ مِنَ النَّارِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٧٩ ) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کاتێك کە بوو بە ڕۆژی قیامەت، خوای گەورە بۆ لای هەر باوەڕدارێك فریشتەیەك دەنێرێت، کە کافرێکی پێیە ،ئینجا فریشتەکە بە بڕوادارەکە دەڵێ: ئەی بڕوادار ها بگرە ئەو کافرە، ئەوە قوربانی تۆیە لە ئاگر ).

(١٠٣١) ( طب ) عن محجن بن الأدرع قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ رَضِيَ لِهَذِهِ الأُمَّةَ اليُسْرَ وَ كَرِهَ لَهَا الْعُسْرَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٦٩ ) في صحيح الجامع

محجن کوري الأدرع دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە بۆ ئەم ئومەتە ڕازی بووە بە ئاسانکاری، وەگرانکاریشی پێ ناخۆشە ).

(١٠٣٢) ( ابن أبي عاصم ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ قَدْ أَجَارَ أُمَّتِي أنْ تَجْتَمِعُ عَلىَ ضَلالَةِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٧٨٦ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە ئەم ئومەتەی منی پاراستووە لەوەی کە لەسەر گومڕایی کۆ ببێتەوە ).

(١٠٣٣) ( حل ) عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله لَنْ يُعْجِزَنِي فِي أُمَّتِي أنْ يُؤَخِرَهَا نصْف يوم ( خمسمائة عَام ) ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨١١ ) في صحيح الجامع وما بين قوسين ضعيف عند الألباني

سعد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەستەوسانم ناکات لە ئومەتەکەمدا کە ماوەی نیو ڕۆژ دوایـان بخات - پێنج سەد ساڵ - ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

ئەم فەرموودە پیرۆزە مانای ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئومێدی لە خوای گەورە، یـان چاوە ڕێی ئەوەیە لە خوای گەورە ،یـان بەڵێنێکی وای وەرگرتووە لە خوای گەورە، کە بۆ ماوەی نیو ڕۆژ لە ڕۆژەکانی لای خوای گەورە کە هەر ڕۆژێکی هەزار ساڵی دونیایە( وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ) وە نیوەی ڕۆژەکەش دەکاتە پێنج سەد ساڵ ،تەمەنی ئەم ئومەتی ئیسلامە درێژ بکاتەوە واتە زیاتر لەو ماوەیەی کە تەمەنی ڕەسمی ئەم ئومەتەیە. خوای گەورە ٥٠٠ ساڵی تریش مۆڵەتی پێ دەدات و وادەی بۆ درێژ دەکاتەوە، واتە وادەی هاتنی قیامەت و هەستانی ئەو ڕۆژە گەورەیە، بە ویست و ئیرادەی خوا بۆ پێنج سەد ساڵی تر دوا دەخرێت لە پاش هاتنی وادەکەی خۆی وە ئەم فەرموودەیەش

ئیمامی سیوطي و هەندێك لە زاناكانی تر وەك شێخ محمد رسول البرزنجي لە كتێبی (الإشاعة)دا لەسەری رۆشتون و لێكدانەوەی زۆریـــان لەسەر كردووە، بەڵام ئەوەی كە پێویستە بوترێت ئەوەیە كە خوای گەورە خۆی نەبێت كەس نازانێت وادەی تەمەنی ئەم ئومەتە چەندە،وە ناشزانین كە پاش خستنە سەری ئەو پێنج سەد ساڵە، تەمەنەكە دەبێتە چەند و كەی كۆتایی پێ دێت.

(١٠٣٤) ( ت ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تعالى لا يَجْمَعُ أُمَّتي، أوْقَالَ أُمَّةُ مُحَمَّد(ﷺ) عَلىَ ضَلالَةٍ وَيَدُ الله عَلىَ الْجَمَاعَة، وَمَنْ شَذَّ شَذَّ إلى النَّار ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٤٨) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە ئومەتەكەم كۆ ناكاتەوە – یــان فەرمووی ئومەتی محمد(ﷺ) كۆناكاتەوە – لەسەر گومڕایی. وە دەستی خوایش لەگەڵ كۆمەڵدایە. وە هەر كەس شاپەڕ بێت و و لابدات ئەوا بەرەو ئاگر شاپەڕ دەبێت و لادەدات ).

(١٠٣٥) ( د ك هق في المعرفة ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلىَ رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِيْنَهَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٧٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( خوای گەورە لەسەری هەموو سەد ساڵێكدا، كەسێك دەنێرێت بۆ ئەم ئومەتە كە ئاینەكەی بۆ نوێ و تازە بكاتەوە ).

(١٠٣٦) ( حم ت هـ ك ) عن معاوية بن حيدة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّكُمْ تُتِمُّونَ سَبْعِيْنَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَ أَكْرَمُهَا عَلىَ الله ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٢٣٠١) في صحيح الجامع

معاویەی كوڕی حیدە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئێوە تەواوكەری هەفتا ئومەتن، ئێوە باشترینیـــانن و بەرێزترینیشیـــان لە لای خوا ).

(١٠٣٧) ( د ك ) عن أبي ثعلبة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَنْ يَعْجِزَ اللهُ هَذِهِ الأُمَّةَ مِنْ نِصْفِ يَوْمٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٢٢٢) في صحيح الجامع

ابي ثعلبـة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتــی: ( خوای گەورە ئەم ئومەتە دەستەوسان ناكات بۆ نیو رۆژ ).

(١٠٣٨ ) ( حم ) عن طلحة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَيْس أَحَدٌ أَفْضَلُ عِنْدَ الله مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَمَّرُ فِي الإِسْلامِ لِتَكْبِيرِهِ وَ تَحْمِيدِهِ وَ تَسْبِيْحِهِ و تَهْلِيلِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٣٧٠) في صحيح الجامع

طلحة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هیچ كەسێك لای خوا باشتر نییە لە بڕوادارێك كە تەمەندار دەبێت لە ئیسلامدا، لەبەر ئەو (الله أكبر و الحمدلله و سبحان الله و لا اله الا الله )یەی كە دەیكات ).

(١٠٣٩) ( حم م هـ ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُول الله تَعالى: مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَ أَزِيدُ، وَ مَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ مِثْلُهَا، أوْ أَغْفِرُ، و مَن تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْراً تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعاً، وَمَن تَقَرَّبَ مِنِّي ذِراعاً تَقَرَّبْتُ باعاً، وَمَنْ أَتاني يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً،

وَمَنْ لَقِيْنِي بِقِرابِ الأَرْضِ خَطِيْئَةً ثُمَّ لا يُشْرِكُ بِي شَيْئاً، لَقِيْتُهُ بِمِثْلِها مَغْفِرَةً ،وَمَنْ اقْتَرَبَ إِليَّ شِبْرا اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ ذِراعاً وَ مَنْ اقْتَرَب إِليَّ ذِراعاً اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ بَاعاً وَ مَنْ أَتانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً ❊
( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨١٤٠ ) في صحيح الجامع

ابوذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای تەبارەك و تەعالا دەفەرمـوویت: ( هەر کەسێك چاکەیەك بهێنێت ئەوا دە بەرامبەری دەدرێتێ و زیاتریش، وە هەر کەسێك خراپەیەك بهێنێت ئەوا پاداشتی هەر خراپەیەك وەك خۆیەتی، یـان دەیبورم، وە هەر کەسێك بستێك خۆییم لێ نزیك بکاتەوە. ئەوا باڵێك لێی نزیك دەبمەوە وە هەر کەسێك باڵێك خۆیم لێ نزیك بکاتەوە من باوەشێك لێی نزیك دەبمەوە وە ئەوەی کە بە رۆیشتن بەرەو پیرم بێت من بە راکردن بەرەو پیری دەچم وە هەر کەسێك بە پڕاو پڕی زەوی لە خراپە و تاوان بێتەوە لام بەڵام لە دوای ئەوە هیچ هاوتا و شەریکێکی بۆ بڕیار نەدابم، ئەوا منیش بە هێندەی ئەوە لە لێبوردن پێشوازی لێ دەکەم، وە ئەو کەسەی بستێك لێم نزیك بێتەوە، باڵێك لێی نزیك دەبمەوە ،وە ئەوەی باڵێك لێم نزیك بێتەوە، باوەشێك لێی نزیك دەبمەوە، وە ئەوەی بە رۆیشتن بەرەو رووم بێت من بە راکردن بەرەو رووی دەڕۆم ).

(١٠٤٠) ( حم خ ن ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ❊ أَيُّما مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ قَالُوابِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ أَوْ ثَلاثَـةٌ أَوِ اثْـنَانِ ❊. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٣٩ ) في صحيح الجامع

عمر دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر موسڵمانێك لە لایەن چوارە وە شایەتی بۆ بدەن بە چاکە،خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە ،یـان سێـان، یـان دووان ).

## روونکردنەوەی فەرموودەکە :

واتە ئەگەر کەسێك بە موسڵمانیی بمرێت پاشان چوار موسڵمانی باش و خاوەن عەدالەت شایەتی بۆ بدەن کە پیاوێکی باش بووە ئەوا خوای گەورە بە رەحمی خۆی دەیخاتە بەهەشتەوە.جا پرسیاریـان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر سێ کەس شایەتی بۆ بدات؟فەرمووی یـان سێـان.وتیـان ئەی دوان؟ وتی:یـان دوان ، واتە تەنانەت ئەگەر موسڵمانێك لە دوای مردنی تەنها دوو موسڵمانی عەدالەت شایەتی چاکە و خێرخوازی بۆ بدەن، ئەوا إنشاءالله خوای گەورە بە رەحمی خۆی شایەتییەکەیان قبوڵ دەکات و بە بەهەشتی خۆی شادی دەکات.

## ( ٣١ ) ( فەزیڵەتی شەوی نیوەی مانگی شەعبان-واتە شەوی بەرات- )

(١٠٤١) ( هب ) عن أبي ثعلبة الخشني قال: قال رسول الله(ﷺ): ❊ إِذا كَانَ لَيْلَةُ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ اطَّلَعَ اللهُ إِلى خَلْقِهِ فَيَغْفِرُ لِلْمُؤْمِنِيْنَ وَ يُمْلِي لِلْكَافِرِيْنَ وَ يَدَعُ أَهْلَ الْحِقْدِ بِحِقْدِهِمْ حَتى يَدَعُوْهُ ❊. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٧٧١ ) في صحيح الجامع

ابوثعلبة الخشني دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەگەر بوو بە شەوی نیوەی مانگی شەعبان، ئەوا خوای گەورە دەڕوانێتە دروست کراوەکانی خۆی، ئینجا لە باوەڕدارەکان خۆش دەبێت وە پەتیش بۆ بێباوەڕەکان درێژ دەکاتەوە ،وە کەسانی رق لەدڵ وەلا دەخات بە رق و کینەکەیانەوە، هەتا وازی لیَ دەهێنن ).

**(١٠٤٢) ( هـ ) عن أبي موسى ال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىَ لَيَطَلِعُ في لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ فَيَغْفِرُ لِجَمِيعِ خَلْقه إلاَّ لِمُشْرِكٍ أَوْ مُشَاحِنٍ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨١٩ ) في صحيح الجامع**

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای تەبارەك و تەعالا لە شەوی نیوەی مانگی شەعباندا دەڕوانێت، جا لە هەموو دروست کراوەکانی خۆی خۆش دەبێت جگە لە موشریکێك یان شەڕەنگێزێکی رقەبەر ).

**(١٠٤٣) ( طب ) عن أبي ثعلبة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ يَطَلِعُ عَلىَ عِبَادِه في لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ فَيَغْفِرُ لِلمُؤْمِنِيْنَ وَ يُمْلِي لِلْكَافِرِيْنَ وَ يَدَعُ أَهْلَ الحِقْدِ بِحِقْدِهِمْ حَتّى يَدَعُوه ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٩٨ ) في صحيح الجامع**

ابوثعلبة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەڕوانێت بەسەر بەندەکانیدا لە شەوی نیوەی مانگی شەعباندا جا لە باوەڕدارەکان خۆش دەبێت و پەتیش بۆ بێباوەڕەکان درێژ دەکاتەوە، وە رقەبەر و قین لە دڵەکانیش وەلا دەنێت بە رق و کینەیانەوە هەتا ئەو کاتەی وازی لیَ دەهێنن و دەستی لیَ هەڵدەگرن ).

**(١٠٤٤) ( هب ) عن كثير بن مرة الحضرمي مرسلا قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ في لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ يَغْفِرُ الله لأَهْلِ الأَرْضِ إلاَّ لِمُشْرِكٍ أَوْ مُشَاحِنٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٢١٣ ) في صحيح الجامع**

كثير ی کوڕی مرة الحضرمي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( لە شەوی نیوەی شەعباندا خوا لە خەڵکی زەوی دەبورێت، جگە لە موشرکێك نەبێت یان شەڕەنگێزێکی رقەبەر ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

کەواتە شەوی پانزەی شەعبان شەوێکی پیرۆزە و خوای گەورەش لەو شەوەدا چاوی رەحمەتی خۆی ئاراستەی گشت دروست کراوەکانی سەر زەوی دەکات و لە هەمووشیان دەبورێت، تەنها دوو جۆر کەس نەبێت، یەکەمیان ئەو بێباوەڕەیە کە هاوتا و شەریك بۆ خوا بڕیار دەدات،ئەمەیان خوای گەورە پەتی خراپەی بۆ درێژ دەکاتەوە هەتا لە کۆتاییدا غافڵ گیری دەکات ،وە جۆری دووەمیشیان کەسانێکی رق و کین لە دڵن بەرامبەر موسڵمانان و رقەبەرایەتییان دەکەن و شەڕیان پیَ دەفرۆشن، ئەوانە هەتا واز لەو رقەیان نەهێنن ئەوا خوا لێیان نابورێت، وە ئەم جۆرەی دووەمیشیان هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەگەڵ یەکتردا عاجزن و لەسەر هۆکارێکی دونیایی رقیان لە یەك هەڵ گرتووە و ئامادە نین رق و کینەیان بەرامبەر بە یەك وەلا بنێن و ئاشت ببنەوە.

# ( ٤٢ ) ( بەشی : زیکری خوای گەورە )

## ( ١ ) ( فەزڵی زیکر کردن )

**(١٠٤٥) ( حب ابن السني في عمل اليوم والليلة طب هب ) عن معاذ قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الأَعمالِ إلى الله أَنْ تَمُوتَ ولِسانُكَ رطبٌ مِنْ ذِكْرِ الله ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٦٥ ) في صحيح الجامع**

معاذ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خۆشەویسترین کارەکان لە لای خوا ئەوەیە کە بمریت و زمانت تەڕ و پاراو بێت بە زیکری خوا ).

**(١٠٤٦) ( طب ) عن معاذ بن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالى: لا يَذْكُرُني عَبْدٌ في نَفْسه إلاَّ ذَكَرْتُهُ في مَلأٍ مِنْ ملائكتي و لا يذْكُرني في ملأٍ إلاَّ ذَكَرْتُهُ في الرَّفِيقِ الأَعْلَى ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٣٤ ) في صحيح الجامع**

معاذ ی کوڕی انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فەرمـوویەتی: هیچ بەندەیەك نییە کە لە دڵی خۆیدا زیکرم بکات ئیلا لە پۆلێك لە فریشتەکانمدا زیکر و باسی دەکەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکیشدا باسی کردم و ناوی هێنام ئەوا منیش لە ( الرفيق الأعلى ) دا باسی دەکەم ).

(الرفيق الاعلى):بەرزترین پلەی دۆستانەی خوایە کە باوەڕدار بتوانێت پێی بگات).

**(١٠٤٧ ) ( هب ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالَى: عَبْدِي إذا ذَكَرْتَني خالياً ذَكَرْتُكَ خالياً و إنْ ذَكَرْتَني في ملأٍ ذَكَرْتُكَ في مَلأٍ خَيْرٌ مِنْهُمْ وَ أَكْبَر ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٢٣ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فەرمـوویەتی: ئەی بەندەی من: ئەگەر تۆ لە چۆڵیدا زیکرت کردم، ئەوا من لە تەنهایی خۆمدا ناوت دەهێنم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا زیکر و باست کردم ئەوا من لە ناو کۆمەڵێکی باشتر و گەورەتر لەواندا منیش باست دەکەم ).

**(١٠٤٨) ( حم ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالَى: يَا ابْنَ آدَمَ! إنْ ذَكَرْتَني في نَفْسك ذَكَرْتُك في نَفْسي و إنْ ذَكَرتَني في مَلأٍ ذَكَرْتُكَ في مَلأٍ خَيْرٌ مِنْهُمْ وَ إنْ دَنَوتَ مني شِبْراً دَنَوتُ مِنْك ذِراعاً وَ إنْ دَنَوتَ مني ذِراعاً دَنَوتُ مِنْكَ باعاً وَ إنْ أَتَيْتَني تَمْشي أَتَيْتُ إليْكَ أُهَرْوِلُ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٣٦ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فەرمـوویەتی:ئەی بەنی ئادەم، ئەگەر لە دڵی خۆتدا زیکر و یادم بکەیت ،من لە لای خۆم یادت دەکەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێدا زیکر و باسم بکەیت ،لە ناو کۆمەڵێکی چاکتر لەواندا زیکر و باست دەکەم ،و ئەگەر بستێك لێم نزیك ببیتەوە ،باڵێك

لێت نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر باڵێك لێم نزیك ببیتەوە باوەشێك لێت نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بە ڕۆیشتن بەرەو من هاتیت، من بە ڕاکردن بەرەو تۆ دێم ).

**(١٠٤٩) ( حم ) عن معاذ قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا عَمِل آدَميٌّ عَمَلاً أنجى لَهُ مِنْ عَذاب اللهِ مِنْ ذِكْر الله ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٤٣) في صحيح الجامع**

معاذ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئادەمیی - واتە مرۆڤ - هیچ کارێکی نەکردووە کە باشتر لە سزاو ئەشکەنجەی خوا ڕزگاری بکات، هێندەی زیکر کردنی خوای گەورە ).

**(١٠٥٠) ( حم ت هـ حب ك ) عن عبدالله بن بسر قال: ﴿ لا يَزالُ لِسَانُكَ رَطْباً مِنْ ذِكْر الله ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٦٩٩) في صحيح الجامع**

عبدالله ی کوڕی بسر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( با بەردەوام زمانت تەڕ و پاراو بێت بە زیکری خوا ).

## ( ٢ ) ( فەزیڵەتی هەندێك زیكری تایبەت )

**(١٠٥١) ( ق ت ن ) عن أبي أيوب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَانَتْ لَهُ عَدْلُ أَرْبع رِقَاب مِنْ وَلَد إِسْمَاعِيل مَنْ قَالَ: لا إلهَ إلاَّ الله وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ وَ هُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، عَشْرَ مَرَّاتٍ، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٣٤) في صحيح الجامع**

ابو ایوب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەوە بۆ ئەو بەرامبەری چوار گەردنە لە نەوەی ئیسماعیل ،هەر کەس وتی:( **لا إلهَ إلاَّ الله وَحْدَهُ لا شَرِيك لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ وَ هُوَ على كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ** ) دەجار وەك ئەو کەسە وایە کە چوار نەفسی لە نەوەی ئیسماعیل ئازاد کردبێت )

**(١٠٥٢) ( حم ن حب ك ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَالَ: لا إلهَ إلاَّ الله وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ (يُحْيِي وَ يُمِيْتُ ) وَ هُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، عَشْرَ مَرَّاتٍ كَانَ لَهُ بِعَدْلِ نسمة ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٣٥) في صحيح الجامع**

براء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر کەس دە جار وتی ( **لا إله إلاَّ الله وحْدَهُ لاشَرِيك لَهُ لَهُ المُلْكُ وَ لَهُ الحَمْدُ (يُحْيِي و يُمِيتُ ) و هُوَ على كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**)ئەوە بەرامبەری گیانی مرۆڤێکە ).

**(١٠٥٣) ( حم م ) عن سمرة بن جندب قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الْكَلامِ إِلىَ اللهِ تَعالىَ أَرْبَعٌ: سُبْحَانَ اللهِ، وَ الْحَمْدُ لله، وَ لا إِلَهَ إِلاَّ الله، وَ الله أَكْبَرُ، وَلا يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٣) في صحيح الجامع**

سمرة ی کچی جندب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خۆشەویسترینی قسە لای خوای گەورە چوارە: **سبحان الله و الحمد لله و لااله إلا اله و الله أكبر**، زەرەری نییە بە هەرکامێکیان دەست پێ بکەیت ).

(١٠٥٤) ( حم ك الضياء ) عن أبي سعيد وأبي هريرة معا قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالَى اصْطَفَى مِنَ الْكَلامِ أرْبَعاً: سُبْحَانَ الله، وَ الْحَمْدُ لله، وَ لا إِلَهَ إِلاَّ الله، وَ الله أَكْبَرُ، لايَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْت، فَمَنْ قَالَ: سُبْحَانَ الله، كُتِبَتْ لَهُ عِشْرُونَ حَسَنَةً وَ حُطَتْ عَنْهُ عِشْرُونَ سَيِّئَةً، وَ مَنْ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، مِثْلُ ذلِكَ وَ مَنْ قَالَ: لا إِلَهَ إِلاَّ الله، مِثْلُ ذلِكَ وَ مَنْ قَالَ: الحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِيْنَ، مَنْ قِبَلِ نَفْسِه كُتِبَتْ لَهُ ثَلاثُون حَسَنَةً وَ حطَّ عَنْهُ ثَلاثُونَ خَطِيْئَةً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧١٨) في صحيح الجامع

ابوسعيد وابو هريرة پێكەوە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خوای گەورە لە ناو قسەدا چواريانی هەڵبژادووە، سبحان الله و الحمد لله و لااله إلا الله و الله أكبر، بە هەر كامێكيان دەست پێ بكەيت زەرەرت لێ نادات، جا هەر كەس وتی سبحان الله، بيست خێری بۆ دەنوسرێت وە بيست خراپەشی لێ هەڵدەوەرێت، وە هەر كەس وتی:الله أكبر ،ئەويش وەك ئەو، وە هەر كەس وتی: لا إله إلا الله هەر وەك ئەو، وە هەر كەس خۆ بە خۆ وتی: الحمد لله رب العالمين . ئەوا سی خێری بۆ دەنوسرێت وسی خراپەيشی لێ هەڵدەوەرێت ).

## ( ٣ ) ( خۆشەويسترين وشە لای خوای گەورە )

(١٠٥٥) ( حم م ت ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَحَبُّ الْكَلامِ إِلَى الله: سُبْحَانَ الله وَ بِحَمْدِه ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٤) في صحيح الجامع

ابوذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوويەتی: ( خۆشەويسترينی قسە لای خوای گەورە: سبحان الله و بحمده ).

(١٠٥٦) ( ت ك هب ) عن أبي ذر قال: أنَّ رسول الله(ﷺ) عادهُ أوْ أنَّ أبا ذرّ عاد رسول الله(ﷺ) فقال: بِأبي أنْتَ وَأمِّي يارَسُولَ الله(ﷺ) أيُّ الْكَلامِ أحَبُّ إلى الله عزَّوَجلَّ؟ فقال: ﴿ مَا اصْطَفَاهُ الله لِمَلائِكَتِه: سُبْحَانَ رَبِّي وَ بِحَمْدِه سُبْحَانَ رَبِّي وَ بِحَمْدِه ﴾. و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٥) في صحيح الجامع

ابوذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی كردووە يان ابوذر سەردانی پێغەمبەر(ﷺ) كردووە و وتويەتی: دايك و باوكم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا: چ وشەيەك لەلای خوای گەورە لە هەموو قسەيەكی تر خۆشەويسترە؟ ئەويش فەرمووی: ( ئەوەی كە خوای گەورە بۆ خۆی و فريشتەكانی هەڵبژاردووە: سبحان ربي و بحمده، سبحان ربي و بحمده ).

## ڕوونكردنەوەی فەرموودەكان:

**سُبْحَانَ الله:** واتە پاكی و بێگەردی بۆ خوا لە هەموو عەيب و كەم و كوڕييەك.

**الحَمْدُ لله:** واتە سوپاس و ستايش بۆ خوا .

**لا إِلَهَ إِلاَّ الله:** واتە هيچ خوايەك نييە جگە لە زاتی الله نەبێت.

**اللهُ أَكْبرُ:** واته خوا گەورەترە لە هەموو شتێکی تر.

**لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدهُ لا شَرِيْكَ لَهُ وَ لَهُ الْمُلْكُ وَ لهُ الْحَمْدُ، يُحيِي وَ يُمِيْتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ:** واته هیچ خوایەك نییە جگە لە زاتی الله ،هاوتاو شەریکی نییە، موڵك هەر بۆ ئەوە و سوپاس هەر بۆ ئەوە ،زیندوو دەکاتەوە و دەشمرێنێت، خێر و نیعمەت بە دەستی ئەوە،و ئەو بە سەر هەموو شتێکدا توانا و دەسەڵاتی هەیە.

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ:** واته سوپاس بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکان.

**سُبْحَانَ رَبِّي وَ بِحَمْدِهِ:** واته پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارم و سوپاسیش هەر بۆ ئەو.

بە راستی ئەم کۆمەڵە وتە پیرۆزانە کلیلی دەرگای هەموو خێر و چاکەیەکن، بە راستی هەر کەسێك توانای عیبادەتی زۆری نییە و حەزیشی لە پاداشتی زۆرە با هەتا دەتوانێت زمانی بەم وشە پیرۆزانە پاراو بێت. وە ئەوەندەی فەرمووده لەسەر پیرۆزیی و گەورەیی ئەم وتانە و خۆشەویستی خوا بۆیان و پاداشتی بێ ئەندازەی ئەو لەسەریان هاتووە، لە هیچ کارێکی تر و بۆ هیچ عیبادەتێکی تر بەو شێوەیە نەهاتووە،جا هەر کەسێك ئەو زیکرانەی بە بەردەوامی لەسەر دەم بوو إنشاءالله ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە خوای گەورە ئەو بەندەیەی خۆی خۆش دەوێت، بەڵام با موسڵمان هەوڵ بدات بە پێی توانا زیکرەکان بە دەم و بە دڵیش بن، ئەو کات گەورەترین سودیان لە دونیا دەبێت و گەورەترین پاداشتیان لە قیامەتدا دەبێت،

## ( ٤ ) ( باشترین کاتەکان بۆ زیکر کردن )

**(١٠٥٧) ( ت ن ك ) عن عمرو بن عبسة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَقْرَبُ مَايَكُونُ الرَّبُّ مِنَ الْعَبْدِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ الآخر فإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللهَ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ فَكُنْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١٧٣ ) في صحيح الجامع**

عمرو ی کوڕی عبسه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەو کاتەی کە پەروەردگار تیایدا لە هەموو کاتێکی تر لە بەندەی خۆیەوە نزیکە، لە بەشی کۆتایی شەودایە، جا ئەگەر توانیت لەو کەسانە بیت کە لەو کاتەدا زیکری خوای گەورە دەکەن ئەوا وابە ).

**(١٠٥٨) ( طب ) عن عثمان بن أبي العاص قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تُفْتَحُ أَبْوابُ السَّماءِ نِصْفَ اللَّيْلِ فَيُنَادِي مُنادٍ: هَلْ مِنْ دَاعٍ فَيُسْتَجابُ لَهُ؟ هَلْ مِنْ سَائِلٍ فَيُعْطَى؟ هَلْ مِنْ مَكْرُوبٍ فَيُفْرَجُ عَنْهُ؟ فَلا يَبْقَى مُسْلِمٌ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ إلاَّ اسْتَجَابَ اللهُ تَعالىَ لَهُ إلاَّ زَانِيَةً تَسْعى بِفَرْجِها أَوْ عَشَّاراً. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٩٦٩ ) في صحيح الجامع**

عثمان کوڕیأبي العاص دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە نیوەی شەوەوە دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە و بانگدەرێك بانگ دەدات، ئایا کەسێك هەیە دوعا بکات هەتا وەڵامی بدرێتەوە؟ئایا کەسێك هەیە داوا بکات هەتا پێی بدرێت؟ ئایا کەس هەیە لێی قەرمابێت هەتا دەرووی لێ

بكرێتەوە؟ئیتر هیچ موسڵمانێك نامێنێت كە دوعای شتێكی كردبێت ئیلا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە ،جگە لە ئافرەتێكی زیناكار نەبێت كە كاسبی بە داوێن و عەورەتی خۆیەوە دەكات، یان سەرانە سەندێك كە خەڵك گومرگ دەكات و سەرانەیان لێ دەسەنێت ).

(١٠٥٩) ( هـ ) عن رفاعة الجهني قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إنَّ الله يُمْهِلُ حتَّى إذا ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ نِصْفُهُ أوْ ثُلُثَاهُ قَالَ: لا يسأَلَنَّ عِبادي غَيْري مَنْ يَسْأَلُنِي اسْتَجِبْ لَهُ مَنْ يَسْأَلُنِي أعْطِه مَنْ يَسْتَغْفِرنِي أغْفِرُ لَهُ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩١٧ ) في صحيح الجامع

رفاعة الجهني دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوا مۆڵەت دەدات، هەتا كاتێك كە نیوەی شەو یان لە سێ بەش دوو بەشی تێ پەڕی دەفەرمـوویت:بەندەكانم لە غەیری من داوا لە هیچ كەس نەكەن، ئەوەی داوام لێ بكات وەڵامی دەدەمەوە:ئەوەی داوام لێ بكات پێی دەدەم، ئەوەی داوای لێبوردنم لێ بكات لێی دەبورم، هەتا ئەو كاتەی كە بەیان هەڵدێت ).

(١٠٦٠) ( حم م ) عن أبي سعيد وأبي هريرة معا قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إنّ الله تعالى يُمْهِلُ حتَّى إذا ذهب ثُلُثُ اللَّيْلِ الأوَّلِ نَزل إلى السماء الدُّنْيا فيَقُولُ: هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ؟ هَلْ مِنْ تَائِبٍ؟ هَلْ مِنْ سَائِلٍ ؟ هَلْ مِنْ دَاعٍ؟ حَتَّى يَنْفَجِرُ الْفَجْرُ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩١٨ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد و ابو هريرة پێكەوە دەگێرنەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوا مۆڵەت دەدات هەتا كاتێك سێیەكی شەو تێپەڕ دەبێت، دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و دەفەرمـووێت:كەس هەیە داوای لێبوردنم لێ بكات؟ كەس هەیە تۆبە بكات؟كەس هەیە لێم بپاڕێتەوە؟ كەس هەیە دوعایەك بكات؟ هەتا ئەو كاتەی كە بەیان هەڵدێت ).

## ( ٥ ) ( زیكری خوا قەڵای موسڵمانە )

(١٠٦١) ( حم تخ ت ن حب ك ) عن الحارث ابن الحارث الأشعري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إنَّ الله أمر يحْيى بْنَ زَكَرِيا بِخَمْسِ كَلِماتٍ أنْ يعْمل بِهِنَّ و أنْ يأمر بني إسْرائِيْل أنْ يعْمَلُوا بِها، وَ أنَّهُ كَانَ أنْ يبْطِيء بِها، فَقَالَ عِيسى: إنَّ الله أمَركَ بِخَمْسِ كَلِماتٍ لِتَعْمَلَ بِها و تَأمر بني إسْرائِيْل أنْ يَعْمَلُوا بِهَا، فإمَّا أنْ تأمُرَهُمْ وَ إمَّا أنْ آمُرَهُمْ، فَقَالَ يَحْيى: أخْشى إنْ سَبَقْتَني بها أنْ يُخْسَفَ بِي أوْ أُعذَّبَ، فَجَمَعَ النَّاسَ في بَيْتِ المَقْدِسِ فَامْتَلأَ الْمَسْجِدُ و قَعَدَ علىَ الشَّرَفِ، فَقَالَ: إنّ الله أمَرَني بِخَمْسِ كَلِماتٍ أنْ أعْمَلَ بِهِنَّ وَ آمُرَكُمْ أنْ تَعْمَلُوا بِهِنَّ: أوَّلُهُنَّ أنْ تعبُدُوا الله وَ لا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَ إنَّ مَثَلَ مَنْ أشْرَكَ بِالله كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْداً مِنْ خَالِصِ مَالِهِ بِذَهَبٍ أوْ وَرِقٍ فَقَالَ: هَذه دَارِي وَهَذا عَمَلي فَاعْمَلْ وَ أدِّ إلَيَّ، فكان يعْمَلُ وَ يُؤدِّي إلى غَيْرِ سَيِّدِه، فَأيُّكُمْ يَرضَى أنْ يَكُون عَبْدُهُ كَذلكَ؟ وَ إنَّ الله أمَرَكُمْ بِالصَّلاةِ فَإذا صَلَّيْتُمْ فَلا تَلْتَفِتُوا فَإنَّ الله عزَّوجلَّ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِوَجْهِ عَبْدِهِ في صَلاتِه مَالَمْ يَلْتَفِتْ، وَ آمُرَكُمْ بِالصِّيَامِ، فَإنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ في عِصَابَةٍ مَعَهُ صُرَّةٌ فِيهَا مِسْكٌ فَكُلُّهُمْ يُعْجَبُ أوْ**

**يُعْجِبُهُ رِيْحُهَا وَ إِنَّ رِيْحَ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيْحِ الْمِسْكِ، وَ آمُرُكُمْ بِالصَّدَقَةِ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَسَرَهُ الْعَدُوُّ فَأَوْثَقُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ وَ قَدَّمُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَقَالَ: أَنَاأَفْدِيْهِ مِنْكُمْ بِالْقَلِيْلِ وَ الْكَثِيْرِ فَفَدَا نَفْسَهُ مِنْهُمْ، وَ آمُرُكُمْ أَنْ تَذْكُرُوا اللهَ فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرَجَ الْعَدُوُّ فِي أَثَرِهِ حَتَّي إِذَا أَتَى عَلَى حِصْنٍ حَصِيْنٍ فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ مِنْهُمْ كَذَلِكَ الْعَبْدُ لا يُحْرِزُ نَفْسَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ إِلاَّ بِذِكْرِ اللهِ، قَالَ النَّبِيّ(ﷺ): وَ أَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ أَمَرَنِيَ اللهُ بِهِنَّ: السَّمْعِ وَ الطَّاعَةِ وَ الْجِهَادِ وَ الْهِجْرَةِ وَالْجَمَاعَةِ فِي سَبِيلِ اللهِ فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ قِيْدَ شِبْرٍ، فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلامِ مِنْ عُنُقِهِ إِلاَّ أَنْ يَرْجِعَ، وَ مَنْ أَدعَى دَعْوَى الْجَاهِلِيَةِ، فَإِنَّهُ مِنْ جُثَى جَهَنَّمَ، فَقَالَ رَجُلٌ يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ) وَ إِنْ صَلَّى وَصَامَ؟ فَقَالَ: وَ إِنْ صَلَّى وَ صَامَ، فَادْعُوا بِدَعْوَى اللهِ الَّذِي سَمَاكُمُ الْمُسْلِمِيْنَ الْمُؤْمِنِيْنَ عِبَادَ اللهِ ﷻ.** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٢٤ ) في صحيح الجامع

الحارث ی كوڕی الحارث الأشعری دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە فەرمانی بە یەحیای كوڕی زەكەریا كرد بە پێنج وشە كە كاری پێ بكات و فەرمانیش بە بەنی ئیسرائیل بكات كە كاری پێ بكەن،وە ئەو خەریك بوو كە سستی تێدا بكات، عیساش پێی ووت:خوای گەورە فەرمانی پێ كردوویت بە پێنج ووشە كە كاریان پێ بكەیت و فەرمانیش بكەیت بە بەنی ئیسرائیل هەتا كاریان پێ بكەن، جا یان تۆ فەرمانیان پێ بكە یان ئەوەیە من فەرمانیان پێ دەكەم، یەحیاش ووتی:ئەترسم ئەگەر تۆ پێش من بكەویت بەو كارە، ئەوا من رۆبچم بە زەویدا یان دوچاری سزا و ئەشكەنجە ببم. ئینجا خەڵكی كۆكردەوە لە ( بيت المقدس ) دا هەتا مزگەوتەكە پڕبوو وە لە سەر تارمەكان دانیشتن. ئینجا فەرمووی:خوای گەورە فەرمانی پێ كردووم بە پێنج ووشە كە كاریان پێ بكەم و فەرمانیش بە ئێوە بكەم كە ئێوە كاریان پێ بكەن: یەكەمیان: كە خوا بپەرستن و هیچ شتێك نەكەن بە هاوتا و شەریكی، وە نمونەی ئەو كەسەی كە شەریكی بۆ خوا بڕیارداوە وەك نمونەی پیاوێكە كە بەندەیەكی كڕیبێت لە پوختەی ماڵەكەی بە ئاڵتون بێت یان بە زیو ئینجا پێی بڵێت: ئەوە ماڵەكەمە ئەوەش كارەكەمە، جا كار بكە و دەستكەوت بدە بە من،ئەویش كاری دەكرد و دەستكەوتەكەی دەدایە غەیری خاوەنەكەی خۆی. جا كامتان رازین كە بەندەكانتان بەو شێوەیە بێت؟وە خوا فەرمانی پێ كردوون بە نوێژ كردن جا كە نوێژتان كرد بەملاولادا ئاوڕ مەدەنەوە، چونكە خوای گەورە ڕووی خۆی لە ڕووی بەندەكەیدا دادەنێت لە نوێژەكەیدا هەتا ئەو بەملا و ئەولادا ئاوڕ نەداتەوە، وە فەرمانتان پێ دەكەم بە ڕۆژو گرتن چونكە نمونەی ڕۆژو وەك نمونەی پیاوێكە كە لەناو كۆمەڵێكدا تورەكەیەكی پێیە و میسكی تێدایە، جا هەموویان سەرسام دەبن یان ئارەزوومەندی بۆنەكەی دەبن ،وە بۆنی ڕۆژووان پاك و خۆشترە لە لای خوا لە بۆنی میسك،وە فەرمانتان پێ دەكەم بە سەدەقە چونكە نمونەی سەدەقە وەك نمونەی پیاوێكە كە دوژمن بە دیل بیگرن و توند دەستی ببەستنەوە بە گەردنیەوە وە بیهێننە پێشەوە بۆ ئەوەی لە گەردنی بدەن، ئەویش پێیان بڵێت من گەردنم ئازاد دەكەم لە دەستتان بە كەم و زۆری ئەوەی كە هەمە، وە بەوە خۆی ئازاد بكات لە دەستیان، وە فەرمانتان پێ دەكەم كە زیكر و یادی خوا بكەن چونكەی نمونەی ئەوە ،وەك نمونەی پیاوێكە دوژمن بە خێرایی دەربچن بەدوایدا، هەتا كاتێك كە دەگاتە قەڵایەكی قایم و

پارێزراو خۆی دەپارێزێت و رزگار دەکات لە دەستیان، بەو جۆرەش بەندە ناتوانێت خۆی بپارێزێت و خۆی رزگار بکات لە شەیتان تەنها بە زیکری خوا نەبێت)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمـووی: ( وە منیش فەرمانتان پێ دەکەم بە پێنج شت کە خوا فەرمانی بە منیش پێ کردوون: بیستن و گوێ رایەڵی کردن و جیهاد و هیجرەت و جەماعەت. چونکە ئەو کەسەی کە هێندەی یەك بیست لە جەماعەت دابڕێت،ئەوا پەتی ئیسلامی لە گەردنی خۆی داکەندووە، ئیلا ئەگەر بگەڕێتەوە ،وە ئەگەر یەکێك بانگەوازێك بکات لە بانگەوازەکانی جاهلییەت و نەفامی، ئەوە لە کۆمەڵ و تاقمەکانی دۆزەخە )، پیاوێکیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەگەر نوێژیش بکات و بەڕۆژوش بێت؟ ئەویش فەرموی: ( ئەگەر نوێژیش بکات و ئەگەر بەڕۆژوش بێت، جا بانگەواز بە بانگەوازەکەی خوا بکەن کە ناوی ناون موسڵمانانی بڕوادارانی بەندەکانی خوا ).

## ( ٦ ) ( فەزڵی سوپاس وستایشی خوا )

**(١٠٦٢) ( حم هب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ يَقُولُ: إنَّ عَبْدِي الْمُؤْمِن عِنْدِي بِمَنْزِلَةِ كُلِّ خَيْرٍ يَحْمَدُنِي وَ أَنَا أَنْزَعُ نَفْسَهُ مِنْ بَيْنِ جَنْبَيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٩١٠) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەفەرمـوویت:بەندەی بڕوادار لە لای من لە ئاست و پلەی هەموو خێر و چاکەیەکدایە، ئەو سوپاسم دەکات و منیش ئەو گیانەی دەکێشم کە لە نێوان هەردوو لاتەنیشتی دایە ).

## ( ٧ ) ( گیرانی خۆر و مانگ )

**(١٠٦٣) ( ق ن ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): خَسَفَتِ الشَّمْسُ فَقَامَ النَّبِيَ(ﷺ) فَزِعاً يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ فَقَامَ حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ فَقَامَ يُصَلِّي بِأَطْوَلِ قِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَ سُجُودٍ مَا رَأَيْتُهُ يَفْعَلُهُ مِنْ صَلاتِهِ قَطّ ثُمَّ قَالَ: ﴿ إنَّ هَذِهِ الآيَاتَ الَّتِي يُرْسِلُ اللهُ لاتَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ وَ لَكِنَّ اللهَ يُرْسِلُهَا يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئاً فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللهِ وَ دُعَائِهِ وَ اسْتِغْفَارِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٢٦٠) في صحيح الجامع**

ابو موسى دەڵێ: خۆر گیرا پێغەمبەریش(ﷺ) هەستا راپەڕی دەترسا کە قیامەت بێت، جا هەستا هەتا هاتە مزگەوت، و هەستا بە نوێژ کردن بە درێژترین وەستان و کڕنوش و سوجدەوە کە هەرگیز نەمبینی بوو بەو جۆرە بکات لە نوێژدا، پاشان فەرمووی: ( ئەم نیشانانەی کە خوا دەینێرێت، نە بە هۆی مردنی هیچ کەسێکەوە روودەدەن نە بە هۆی ژیانیشیەوە، بەڵام خوا دەیاننێرێت بۆ ئەوەی بەندەکانی خۆی پێ بترسێنێت، جا ئەگەر شتێکتان لەوانە بینی، ئەوا راپەڕن بۆ زیکر و دوعا و داوای لێبوردنی خوا ).

## ( ٨ ) ( وشەیەك لە گە نجینەی بەهەشت )

**(١٠٦٤) ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلا أَدُلُكَ عَلىَ كَلِمَةٍ مِنْ تَحْتِ الْعَرْشِ مِنْ كَنْزِ الْجَنَّةِ؟ تَقُولَ: لا حَوْلَ وَ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِالله، فَيَقُولُ الله: أَسْلَمَ عَبْدِي وَ اسْتَسْلَمَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٦٠٤ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( ئەرێ وشەیەکت نیشان نەدەم لە ژێر عەرشدا لە گەنجینەی بەهەشت؟ دەڵێیت: **لا حول و لا قوة إلا بالله**، خوایش دەفەرمــوویت بەندەکەم هەموو کارەکانی بە من سپارد و خۆیشی پێ سپاردم ).

## ( ٩ ) ( باشترین وشەکانی زیکر )

**(١٠٦٥) ( ت ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ إِذا قُلْتَهُنَّ غَفَرَ الله لَكَ وَ إِنْ كُنْتَ مَغْفُوراً لَكَ؟ قُلْ: لا إِلَهَ إِلاَّ الله الْعَلِيَ الْعَظِيْمُ، لا إِلهَ إِلاَّ الله الْحَلِيْمُ الْكَرِيْمُ، لا إِلهَ إِلاَّ الله سُبْحَانَ الله رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٦١٨ ) في صحيح الجامع**

علي دەڵێ: پێغەمبەر فەرمــوویەتی: ( ئەرێ چەند وشەیەکت فێر نەکەم ئەگەر بیانڵێیت خوا لێت دەبورێت؟هەرچەندە لەوانەش بیت کە پێشتر لێت خۆش بووە، فەرمووی بڵێ: ﴿ **لا إِلَهَ إِلاَّ الله الْعَلِيَ الْعَظِيْمُ، لا إِلهَ إِلاَّ الله الْحَلِيْمُ الْكَرِيْمُ، لا إله الأ الله سُبْحَانَ الله رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ** ﴾، واتە هیچ خوایەك نییە تەنها زاتی (الله) ی خاوەن بەرزی و عەزەمەت نەبێت، هیچ خوایەك نییە تەنها زاتی (الله) ی خاوەن حیلم و کەرەم نەبێت، هیچ خوایەك نییە تەنها الله نەبێت ،پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری عەرشی گەورەیە

## ( ١٠ ) ( هەر کۆڕێك زیکری خوای تێدا نەکرێت )

**(١٠٦٦) ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّما قَوْمٌ جَلَسُوا فَأَطَالُوا الْجُلُوسَ ثُمَّ تَفَرَّقُوا قَبْلَ أَنْ يَذْكُرُوا الله تَعالىَ أَوْ يُصَلُوا عَلىَ نَبِيه كَانَتْ عَلَيهِم تِرَةٌ مِنَ الله إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَ إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٣٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمــوویەتی: ( هەر کۆمەڵێك دابنیشن و درێژە بە دانیشتنەکەیان بدەن، پاشان لێك جیا ببنەوە پێش ئەوەی زیکر و یادی خوای گەورە بکەن یان سەڵەوات لەسەر پێغەمبەرەکەی بدەن، ئەوە لە لایەن خواوە دەبێت بە لەکەیەکی کەم و کوڕی و حەسرەت بەسەریانەوە، ئەگەر ویستی ئەشکەنجەیان دەدات لە سەری، وە ئەگەر ویستیشی لێیان دەبورێت ).

**ترة**: وشەی ( ترة ) لە فەرموودەکەدا لە ( وتر فلان )ـە وە هاتووە، واتە کەسێك کەسێکی بکوژێت و خوێنەکەیشی پێ نەدرێت. یان لە ( وترة الصفه ): واتە کەم و کوڕی و نوقسانی،هەردووکیان هەر مایەی حەسرەت مەندییە.

## ( ١١ ) ( فەزڵی سوپاس گوزاری خوا )

(١٠٦٧) ( طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ما أَنْعَمَ الله على عَبْدٍ نِعْمَةً فَحَمِد الله عَلَيْهَا إلاَّ كَانَ ذَلِكَ الْحَمْدُ أَفْضَل مِنْ تِلْك النِّعْمَة ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٦١ ) في صحيح الجامع

ابو امامە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە هیچ نیعمەتێکی بە بەندەیەکی خۆی نەداوەو کە ئەویش سوپاسی خوای لەسەر کردبێت، ئیلا ئەو سوپاسەی کە کردوویەتی باشتر بووە لە نیعمەتەکەی کە پێ ی دراوە ).

## ( ١٢ ) ( نەکردنی زیکری خوا پەشیمانی لەدوایە )

(١٠٦٨) ( حل هب ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ سَاعَةٍ تَمُرُّ بِابْنِ آدَمَ لَمْ يَذْكُر الله فِيهَا إلاَّ حَسَرَ عَلَيْهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧١٩ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر ساتە وەختێك کە لە بەنی ئادەم تێدەپەڕێت، ئەگەر زیکری خوای تێدا نەکات، ئیلا لە ڕۆژی قیامەتدا حەسرەتی لەسەر هەڵدەکێشێت ).

(١٠٦٩) ( د ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعاً لَمْ يَذْكُر الله فِيْهِ كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَ مَنْ قَعَدَ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُر الله فِيْهِ إلاَّ كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٤١ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر بەندەیەك لە شوێنێکدا پاڵ بکەوێت و زیکری خوای تێدا نەکات ،ئیلا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە خەم و حەسرەت لە سەری، وە هەر کەس لە شوێنێکدا دابنیشێت زیکری خوای تێدا نەکات، ئیلا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە خەم و حەسرەت لە سەری ).

## ( ١٣ ) ( پەلە کردن لە گیرابوونی دوعا )

(١٠٧٠) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ عَبْدٍ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُو إِبْطهُ يَسْأَلُ الله مَسْأَلَةً إلاَّ آتَاهُ إِيَاهَا مَالَمْ يَعْجَلْ، قَالُوا: يَارَسُولَ الله(ﷺ) وَ كَيْفَ عَجَلَتُهُ؟ قَالَ يَقُولُ: قَدْ سَأَلْتُ وَ سَأَلْتُ وَلَمْ أُعْطَ شَيْئاً ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٣٨ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ بەندەیەك نییە دەستی بەرز بکاتەوە هەتا بن باڵی دەر بکەوێت داوای شتێك لە خوا بکات ئیلا ئەو شتەی دەداتێ، بە مەرجێك پەلە نەکات )، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پەلە کردنەکەی چۆنە؟ فەرمووی: ( دەڵێ: هەر پاڕامەوە و هەر پاڕامەوە و هیچ شتێکیشم پێ نەدرا).

## ( ١٤ ) ( راپەڕین لە خەو لە شەودا )

(١٠٧١) ( حم د هـ ) عن معاذ قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ مُسْلِمٍ يَبِيْتُ عَلَىَ ذِكْرٍ طَاهِراً فَيَتَعَارُّ مِنَ اللَّيْلِ فَيَسْأَلُ الله تَعالَىَ خَيْراً مِنَ الدُنْيَا وَ الآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٥٣ ) في صحيح الجامع

معاذ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـووی: ( هیچ موسڵمانێك نییە شەو لەسەر زیکری خوا و بە پاکی بخەوێت ئینجا لە شەودا راپەڕێت لە خەو و لە خوا بپاڕێتەوە کە خێرێکی دونیا و قیامەتی پێ بدات، ئیلا ئەو خێرەی هەر دەداتێ ).

## ( ١٥ ) ( نمونەی ئەو ماڵەی کە زیکری خوای تێدا دەکرێت )

(١٠٧٢) ( ق ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَثَلُ الْبَيْتِ الَّذِي يُذْكَرُ الله فِيْهِ وَ الْبَيْتُ الَّذِي لا يُذْكَرُ الله فِيْهِ ، مَثَلُ الحَيِّ وَ الْمَيِّتِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٨٢٢ ) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( نمونەی ئەو ماڵەی کە زیکری خوای تێدا دەکرێت و، ئەو ماڵەشی کە زیکری خوای تێدا ناکرێت، وەك زیندوو و مردوو وایە ).

## ( ١٦ ) ( فەزڵی داوا کردنی لێبوردن بۆ باوەڕداران )

(١٠٧٣) ( طب ) عن عبادة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِيْنَ وَ لِلْمُؤْمِنَاتِ كَتَبَ الله لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَ مُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٠٢٢ ) في صحيح الجامع

عبادة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر کەسێك داوای لێبوردن بۆ پیاوان و ژنانی باوەڕداران بکات، ئەوا خوای گەورە بە هەموو ژن و پیاوێکی باوەڕدار چاکەیەکی بۆ دەنوسێت ).

## ( ١٧ ) ( زیكری چونه بازاڕ )

**(١٠٧٤) ( حم ت هـ ك ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَالَ فِي الأَسْوَاقِ: لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَ يُمِيْتُ وَ هُوَ حَيٌ لا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَ هُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفَ حَسَنَةٍ وَ مَحى عَنْهُ أَلْفَ أَلْفَ سَيِّئَةٍ وَ بَنَى لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٢٩ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك لە بازاردا بڵێت: **﴿ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَ يُمِيْتُ وَ هُوَ حَيٌ لا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَ هُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾**، خوای گەورە هەزار هەزار چاكەی بۆ دەنوسێت و هەزار هەزار خراپەشی لێ دەسڕێتەوە، وە ماڵێكیشی لە بەهەشت بۆ دروست دەكات ).

## ( ١٨ ) ( فەزڵی وشەی سبحان الله و بحمده )

**(١٠٧٥) ( حم ق ت هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَ بِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَ إِنْ كَانَتْ مِثْلُ زَبَدِ الْبَحْرِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٤٢٩ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێ لە ڕۆژێكدا سەد جار وتی **﴿ سُبْحَانَ اللهِ وَ بِحَمْدِهِ ﴾**، ئەوا تاوانەكانی هەڵدەوەرێن ئەگەر وەك كەفی دەریاش وابێت ).

**(١٠٧٦) ( د ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَعَدَ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُرِ اللهَ فِيْهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ، وَ مَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعاً لا يَذْكُرُ اللهَ فِيْهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٤٧٦ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك لە شوێنێكدا دابنیشێت و زیكری خوای گەورەی تێدا نەكات، ئەوا لە لایەن خواوە دەیكاتە كەمی و نەنگی لەسەری، وە هەر كەسێك لە شوێنێكدا رابكشێت و زیكری خوای گەورەی تێدا نەكات، ئەوا خوای گەورە دەیكاتە كەمی و نەنگی لە سەری ).

## ( ١٩ ) ( فەزڵی زیكری خوای گەورە پاش هەستان لە خەو )

**(١٠٧٧) ( حم ق د ن هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ عَلَى كُلِّ عُقْدَةٍ مَكَانَهَا : عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ فَإِنْ**

اسْتَيْقَظَ وَذَكَرَ اللهِ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِن تَوضَأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقَدُهُ كُلُّهَا فَأَصْبَحَ نَشِيْطاً طَيِّبَ النَّفْسِ، وَ إِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيْثَ النَّفْسِ كَسْلانَ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٠٢) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( شەیتان لە پشتە ملی سەری هەر یەکەتان کاتێك کە دەخەوێت سێ گرێ لێ دەدات، لەسەر هەر گرێیەکیان کە لێی دەدات دەڵێ: شەوێکی درێژت لەسەرە جا بخەوە. جا ئەگەر خەبەری بێتەوە و زیکری خوای گەورەی کرد ئەوا گرێیەکیان دەکرێتەوە ،ئینجا ئەگەر دەست نوێژی شت گرێیەکی تریش دەکرێتەوە وە ئەگەر نوێژی کرد ئەوا گرێکان هەموویان دەکرێنەوە، ئیتر ئەو رۆژە چالاك و دەروون پاك و کراوە دەبێت ئەگەر نا ئەو رۆژە دەروون پیس و تەمبەڵ دەبێت ).

## ( ٢٠ ) ( خوای گەورە لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە زیکری دەکات )

(١٠٧٨) ( حم ) عن أنس ( م ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ اللهُ تَعالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَ أَنَا مَعَهُ إِذا دَعَانِي ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٣٥) في صحيح الجامع

لە انس و ابو هريرة وە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەفەرمـوویت: من لە ئاستی گومانی بەندەکەمدام پێم، وە منیش لەگەڵیدام کاتێك لێم دەپارێتەوە ).

(١٠٧٩) ( حم ق ت هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَ أَنَا مَعَهُ حِيْنَ يَذْكُرُنِي، إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِه، ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَ إِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ، ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ هُم خَيْرٌ مِنْهُمْ، وَ إِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ شِبْراً، تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِراعاً، وَ إِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِراعاً تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعاً، وَ إِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٣٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( من لە ئاستی گومانی بەندەکەمدام پێم، وە منیش لەگەڵیدام کاتێك زیکر و یادم دەکات ،ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادی کردم، منیش لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا باسی کردم منیش لە ناو کۆمەڵیکی لەوان باشتردا ناوی دەبەم ،وە ئەگەر بستێك خۆیم لێ نزیك بکاتەوە، من باڵێك خۆمی لێ نزیك دەکەمەوە، وە ئەگەر باڵێك خۆی لێ نزیك کردمەوە، من باوەشێك خۆمی لێ نزیك دەکەمەوە، وە ئەگەر بە رۆیشتن هات بۆ لام، من بە راکردن دەچم بۆ لای ).

(١٠٨٠) ( حم هـ ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى يَقُولُ: أَنَا مَعَ عَبْدِي مَاذكَرنِي و تَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (١٩٠٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە دەفەرمـوویت:من لەگەڵ بەندەکەمدام هەر کاتێك کە زیکری کردم و لێوەکانی پێم جوڵا ).

## ( ٢١ ) ( دوعا و پاڕانەوە واجبە )

(١٠٨١) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّهُ مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللهَ تَعالى يَغْضَبْ عَلَيْهِ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٠٧ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( ئەو کەسەی لە خوا نەپاڕێتەوە، خوا غەزەبی لێ دەگرێت ).

(١٠٨٢) ( حم خد ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلىَ اللهِ تَعَالىَ مِنَ الدُّعَاءِ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٣٩١ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ شتێك لای خوا هێندەی دوعا و پاڕانەوە بەڕێز نییە ).

## ( ٢٢ ) ( شێواز و ئەدەبەکانی دوعا کردن )

(١٠٨٣) ( ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ادْعُوا اللهَ وَ أَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالإِجَابَةِ، و اعْلَمُوا أَنَّ اللهَ لا يَسْتَجِيبُ دُعاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاهٍ** ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( لە خوا بپاڕێنەوە و دڵنیابن لەوەی کە وەڵامتان دەداتەوە، وە بشزانن کە خوای گەورە دوعا قبوڵ ناکات لە دڵێکی بێ ئاگا و سەرقاڵ بە شتێکی ترەوە ).

## ( ٢٣ ) ( بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی دوعادا )

(١٠٨٤) ( حم د ت هـ ك ) عن سلمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللهَ تَعالىَ حَيِيٌ كَرِيمٌ يَسْتَحِيي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً خَائِبَتَيْنِ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٥٧ ) في صحيح الجامع

سلمان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە شەرمن و خاوەن کەرەمە، شەرم دەکات ئەگەر پیاو هەردوو دەستی بۆ لای ئەو بەرز کردەوە کە بە هیچ و مایە پوچی بیان گەڕێنێتەوە ).

(١٠٨٥) ( ك ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّ اللهَ رَحِيمٌ حَيِيٌ كَرِيمٌ يَسْتَحِيي مِنْ عَبْدِهِ أَنْ يرفع إِلَيْهِ يَدَيْهِ ثُمَّ لا يَضَعَ فِيهِمَا خَيْراً** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٦٨ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( خوای گەورە شەرمن و خاوەن کەرەمە، شەرم دەکات لە بەندەی خۆی کە ئەو دەستەکانی بۆ لای ئەو بەرز بکاتەوە و ئەمیش هیچ خێرێکیان تێ نەکات ).

## ( ٢٤ ) ( چی دەڵێیت لە کاتی لێقەوماندا )

**(١٠٨٦) ( حم د هـ ) عن أسماء بنت عميس قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ألا أُعَلِّمَكِ كَلِمَاتٍ تَقُولِينَهُنَّ عِنْدَ الكَرْبِ، اللهُ اللهُ رَبِّي لا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٦٢١) في صحيح الجامع**

اسماء کچی عمیس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەرێ چەند وشەیەکت فێر نەکەم لە کاتی لێقەوماندا بیانڵێیت: ﴿اللهُ اللهُ رَبِّي لا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً﴾، واتە: الله الله پەروەردگارمە و هیچ شتێك ناکەمە شەریك و هاوتای ئەو ).

## ( ٢٥ ) ( زۆرترین دوعایەك کە پێغەمبەر ﷺ دەیکرد )

**(١٠٨٧) ( ت ) عن أم سلمة قالت: كَانَ أَكْثَرُ دُعَائِهِ: ﴿ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَىَ دِيْنِكَ ﴾ ، فَقِيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ؟ قَالَ: ﴿إِنَّهُ لَيْسَ آدَمِيٌ إِلاَّ وَ قَلْبُهُ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ فَمَنْ شَاءَ أَقَامَ وَ مَنْ شَاءَ أَزَاغَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٧٨٢) في صحيح الجامع**

ام سلمە دەڵێ: زۆربەی دوعای پێغەمبەر(ﷺ) ئەمە بوو: ﴿يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَىَ دِيْنِكَ ﴾، واتە: ئەی وەرچەرخێنەری دڵان دڵم چەسپاو بکەیت لەسەر ئاینەکەت ،جا پێیان ووت: بۆ زیاتر ئەو دوعایە دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: ( هیچ مرۆڤێك نییە ئیلا دڵی لە نێوان دوو پەنجەدایە لە پەنجەکانی خوا، جا هەر کەسێکی بوێت دامەزراوی دەکات وە هەر کەسێکیشی بوێت لار و خواری دەکات ).

## ( ٢٦ ) ( خوا هیچ نزاکارێك بە دەستی بەتاڵ ناگەڕێنێتەوە)

**(١٠٨٨) ( ت ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاعَلَىَ الأَرْضِ مُسْلِمٌ يَدْعُو اللهَ بِدَعْوَةٍ إِلاَّ آتَاهُ اللهُ إِيَّاهَا، أَوْ صَرَفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا مَالَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيْعَةِ رَحِمٍ مَالَمْ يَعْجَلْ يَقُولَ: قَدْ دَعَوْتُ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٣٢) في صحيح الجامع**

عبادة کوڕی الصامت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ موسڵمانێك نییە لە رووی زەویدا لە خوای گەورە بپاڕێتەوە بە پاڕانەوەیەك ،ئیلا خوای گەورە ئەو شتەی دەداتێ، یان هێندەی ئەوە خراپە و زیانی لەسەر لادەدات، بە مەرجێك داوای خراپەیەکی نەکردبێت یان پچڕاندنی سیلەی رەحمێك، بە مەرجێك پەلەی لەسەر نەکات بڵێت: ئەوە هەر پاڕامەوە هەر پاڕامەوە کەچی هەر وەڵامم نەدرایەوە ).

(١٠٨٩) ( حم ت ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ أَحَدٍ يَدْعُو بِدُعَاءٍ إلاّ آتَاهُ الله مَاسَأَلَ أَوْ كَفَّ عَنْهُ مِنَ السُوءِ مِثْلَهُ مَالَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيْعَةِ رَحِمٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٧٧) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هیچ یەكێك نییە كە بپاڕێتەوە بە پاڕانەوەیەك، ئیلا خوا ئەوەی كە داوای كردووە دەیداتێ،یان هێندەی ئەوە خراپە و زیانی لێ لادەبات، بە مەرجێك بۆ خراپەیەك نەپاڕێتەوە یان بۆ پچراندنی سیلەی رەحمێك ).

## ( ٢٧ ) ( دوعای خواردن )

(١٠٩٠) ( حم د ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ أَطْعَمَهُ الله طَعَاماً فَلْيَقُلْ: اللّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيْهِ وَ أَطْعِمْنَا خَيْراً مِنْهُ وَ مَنْ سَقَاهُ الله لَبَناً فَلْيَقُلْ: اللّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيْهِ وَ زِدْنَا مِنْهُ فَإِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يِجْزِي مِنَ الطَّعَامِ وَ الشَّرَابِ غَيْرَ اللَّبَنِ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٦٠٤٣) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك خوای گەورە خۆراكێكی دەرخوارد دا با بڵێت: ﴿ اللّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيْهِ وَ أَطْعَمْنا خَيْراً مِنْهُ ﴾، واته: خوا بەرەكەتمان بۆ لێ بنێیت و، لەوەش باشترمان دەرخوارد بدەیت،وە هەر كەسێك خوای گەورە شیری دەرخوارد دا با بڵێت: ﴿ اللّهُمَّ بَارِكْ لَنا فِيْهِ وَ زِدْنَا مِنْهُ ﴾، واته خوایە بەرەكەتمان بۆ تێ بكەیت و بۆشمان زیاد بكەیت، چونكە هیچ شتێك لە خواردن و خواردنەوەدا بە تەنها جێ ناگرێت جگە لە شیر نەبێت ).

## ( ٢٨ ) ( فەزڵی دوعا و پاڕانەوە لە كاتی خۆشگوزەرانیدا )

(١٠٩١) ( ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَسْتَجِيْبَ اللهُ لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَ الْكُرَبِ فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٢٨٧/١) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( هەر كەسێك پێی خۆشە خوای گەورە لە كاتی ناخۆشیەكان و لێقەوماندا وەڵامی بداتەوە و بە هانایەوە بێت، ئەوا با لە كاتی خۆش گوزەرانیدا دوعا و پاڕانەوەی زۆر بكات ).

## ( ٢٩ ) ( مرۆڤ نابێت دوعا لە خۆی بكات )

(١٠٩٢) ( د ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تَدْعُوا عَلَىَ أَنْفُسِكُمْ، وَ لا تَدْعُوا عَلَىَ أَوْلادِكُمْ وَ لا تَدْعُوا عَلَىَ خَدَمِكُمْ و لا تَدْعُوا علىَ أَمْوالِكُمْ لا تُوافِقُوا مِنَ الله سَاعَةً يَسْأَلُ فِيْهَا عَطَاءٌ فَيُسْتَجَابَ لَكُمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧١٧٤) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمـوویەتی: ( دوعا لە خۆتان مەکەن وە دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن، وە دوعا لە خزمەت کارەکانتان مەکەن، وە دوعا لە ماڵ و سامانتان مەکەن،نەکا ڕێکەوتی ساتە وەختێك بکات لە لای خوا داوای هەر بەخششێکی لێ بکرێت وەڵامتان بداتەوە، وە لێتان قبوڵ بکات ).

# ( بەشی : چیرۆك وە بەسەرهات )

## ( ١ ) ( بکوژی نەوەد و نۆ کەسەکە )

(١٠٩٣) ( ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيْلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَ تِسْعِيْنَ إِنْسَاناً، ثُمَّ خَرَجَ يَسْأَلُ فَأَتَى رَاهِباً فَسَأَلَهُ فَقَالَ لَهُ: أَلِي تَوْبَةٌ ؟ قَالَ: لا، فَقَتَلَهُ، فَجَعَلَ يَسْأَلُ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: ائْتِ قَرْيَةَ كَذَا وَ كَذَا فَأَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَنَأَى بِصَدْرِهِ نَحْوَهَا فَاخْتَصَمَتْ فِيْهِ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ وَ مَلائِكَةُ الْعَذَابِ فَأَوْحَى اللهُ إِلَى هَذِهِ: أَنْ تَقَرَّبِي وَ أَوْحَى اللهُ إِلَى هَذِهِ: أَنْ تَبَاعَدِي، وَ قَالَ: قِيْسُوا مَا بَيْنَهُمَا فَوَجَدَاهُ إِلَى هَذِهِ أَقْرَبَ بِشِبْرٍ فَغَفَرَ لَهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٤٥٥) في صحيح الجامع

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە ناو بەنی ئیسرائیلدا پیاوێك هەبوو نەوەدو نۆ کەسی کوشتبوو ،پاشان رۆیشت پرسیار بکات هاتە لای راهیبێك و پرسیاری لێکردو پێی وت: ئایا تۆبە بۆ من هەیە؟ ئەویش وتی نەخێر:ئینجا ئەویشی کوشت، ئینجا کەوتەوە پرسیار کردن، پیاوێکیش پێی وت: برۆ بۆ گوندێکی ئاوا و ئاوا، کەچی مردن بەرۆکی پێ گرت و ئەویش سنگی وەچەرخاند بەرەو گوندەکە، ئینجا فریشتەکانی رەحمەت و فریشتەکانی ئەشکەنجە بووە مشت و مریان لە سەری ،خوایش فەرمانی نارد بۆ ئەو رێگەیەی کە مابوی بەرەو گوندەکە: کە نزیك بەرەوە، وە فەرمانی نارد بۆ ئەو رێگەیەی کە لێوەی هاتبوو:کە دوور بکەوەرەوە، وە فەرمووی: نێوان هەردوو لایان بپێون، کە بینیان بۆ ئەو گوندەی کە بۆ تۆبەکردن بۆی دەچو نزیکترە بە تەنها یەك بیست، ئیتر لێی بوراو عەفوی کرد ).

(١٠٩٤) ( حم م ه ) عن أبي سعيد الخدري أن نبي الله(ﷺ) قال: ﴿ كَانَ فِيْمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَ تِسْعِيْنَ نَفْساً، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَ تِسْعِيْنَ نَفْساً فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: لا، فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ بِهِ مِائَةً، ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ؟ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَ مَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَ بَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَ كَذَا، فَإِنَّ بِهَا أُنَاساً يَعْبُدُوْنَ اللهَ فَاعْبُدِ اللهَ مَعَهُمْ وَ لا تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ، فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيْقَ أَتَاهُ الْمَوتُ، فَاخْتَصَمَتْ فِيْهِ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ وَ مَلائِكَةُ الْعَذَابِ، فَقَالَتْ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ: جَاءَ تَائِباً مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللهِ تَعَالَى، وَ قَالَتْ مَلائِكَةُ الْعَذَابِ: إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْراً قَطّ، فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُوْرَةِ آدَمِي فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُم فَقَالَ: قِيْسُوا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى فَهُوَ لَهَا فَقَاسُوا فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٧٦) في صحيح الجامع

ابو سعید الخدری دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە ناو ئەوانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون پیاوێك هەبوو نەوەد و نۆ کەسی کوشتبوو ،جا پرسیاری زاناترین خەڵکی سەر زەوی کرد، ئاماژەی بە

راهبێك بۆ كرا، ئەویش هاتە لای و پێی وت: كە وا نەوەد و نۆ كەسی كوشتووە، جا ئایا تۆبەی بۆ هەیە؟ ئەویش وتی: نەخێر. ئیتر ئەویشی كوشت و سەد كەسەكەی پێ تەواو كرد،پاشان كەوتە پرسیار كردن دەربارەی زاناترین كەسی سەر زەوی، ئاماژەی بە پیاوێكی زانا بۆ كرا، هاتە لای و پێی وت: كەوا سەد كەسی كوشتووە، جا ئایا تۆبەی بۆ هەیە؟ ئەویش وتی: بەڵێ ،جا كێ هەیە ببێتە رێگر لە نیوان ئەو و لە نێوان تۆبەدا؟ هەستە بڕۆ بۆ خاكێكی ئاوا و ئاوا لەوێدا كەسانێكی لێن خوا دەپەرستن ،تۆیش دەست بكە بە خوا پەرستی لەگەڵیاندا ،وە نەگەڕێیتەوە بۆ خاكەكەی خۆت چونكە ئەوە خاكی خراپەیە. ئەویش هەستا و بەڕێ كەوت هەتا كاتێك گەیشتە نیوەی رێگاكە مردن بەرۆكی گرت ،ئینجا فریشتەكانی رەحمەت و فریشتەكانی ئەشكەنجەدان بوو بە مشت و مڕیان لەسەری، فریشتەكانی رەحمەت وتیان: ئەو بە تۆبەكاری هاتووە و بە دڵ رووی كردۆتە لای خوا،وە فریشتەكانی ئەشكەنجەش وتیان: ئەمە هەرگیز خێر و چاكەی نەكردووە،ئینجا فریشتەیەكیش لە وێنەی ئادەمیەكدا هات بۆ لایان و ئەوانیش خستیانە نێوان خۆیانەوە هەتا حوكم بدات ئەویش وتی: نێوان هەردوو خاكەكە بپێون، جا بە لای كامیاندا نزیك بوو ئەوا بۆ ئەو لایەنەتان، كە پێوایان بینیان نزیكترە بۆ ئەو خاكەی كە مەبەستی بووە بۆی بچێت، ئیتر فریشتەكانی رەحمەت گیانیان كێشا ).

## ( ٢ ) ( ئەو پیاوەی ویستی لە دەستی خوا رابكات )

**(١٠٩٥) ( حم ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ رَجُلاً كَانَ قَبْلَكُمْ رَغَسَهُ اللهُ مَالاً فَقَالَ لِبَنِيه لَمَا حَضَرَ: أيُّ أَبٍ كُنْتُ لَكُمْ؟ قَالُوا: خَيْرُ أَبٍ، قَالَ: إنِّي لَمْ أَعْمَلْ خَيْراً قَطّ، فَإذا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اسْحَقُونِي، ثُمَّ ذَرُونِي فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ، فَفَعَلُوا فَجَمَعَهُ الله، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ؟ قَالَ: مَخَافَتُكَ فَتَلَقَّاهُ بِرَحْمَتِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٧٧) في صحيح الجامع**

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك هەبوو خوا ماڵ و سامانێكی زۆری پێ دابوو ،جا كە كەوتە سەرە مەرگەوە بە كوڕەكانی خۆی وت: ئەرێ من چۆن باوكێك بووم بۆتان؟ وتیان باشترین باوك بوویت، وتی دەی من هەرگیز چاكەیەكم نەكردووە، جا ئەگەر مردم ئەوا بمسوتێنن پاشان بمهاڕن پاشان لە رۆژێكی رەشەبادا تۆزەكەم بپرژێنن و بڵاوی بكەنەوە، ئەوانیش وایان لێكرد، خوای گەورەش كۆیكردەوە و پێی فەرموو:چی وای لێ كردیت ئەوە بكەیت؟ وتی: لە ترسی تۆ، خوای گەورەش بە رەحمەتی خۆی پێشوازی لێ كرد ).

## ( ٣ ) ( پیاوێك بە چاوپۆشی كردن لە خەڵك چووە بەهەشتەوە )

**(١٠٩٦) ( حم ق هـ ) عن حذيفة وأبي مسعود قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ رَجُلاً مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ أَتَاهُ مَلَكُ الْمَوْتِ لِيَقْبِضَ نَفْسَهُ، فَقَالَ لَهُ: هَلْ عَمِلْتَ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: مَا أَعْلَمُ، قَالَ لَهُ: انْظُرْ**

**قَالَ: مَا أَعْلَمُ شَيْئاً غَيْرَ إِنِّي كُنْتُ أُبَايِعُ النَّاسَ وَ أحَارِفُهُمْ فَأَنْظُرُ الْمُعْسِرِ و أتْجَاوَزُ عَنْ الْمُوسِرِ فَأَدْخَلَهُ الله الْجَنَّةَ ﴾.** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٧٩ ) في صحيح الجامع

حذيفه و ابو مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك هەبوو لەوانەی پێش ئێوە، فریشتەی مەرگ هات بۆ لای بۆ ئەوەی گیانی بكێشێت و پێی وت:هیچ خێر و چاكەیەكت كردووە وتی: نەمزانیوە كردبێتم ،پێی وت: باش سەیر بكە بزانە ،وتی هیچ شتێكم نەزانیوە كردبێتم جگە لەوەی كڕین و فرۆشتنم لەگەڵ خەڵكدا دەكرد و كاسبیم لەگەڵدا دەكردن، جا مۆڵەتم دەدا بە نەدار و كەم دەرامەتەكان، وە چاوپۆشیم دەكرد لەگەڵ باشحاڵ و هەبووەكان ،خوای گەورەش خستیە بەهەشتەوە ).

## ( ٤ ) ( پیاوێك خوای كردۆتە شایەت و كەفیل لەسەر قەرزەكەی )

(١٠٩٧) ( حم خ ) عن أبي هريرة عن رسول الله(ﷺ): **﴿ أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلاً مِنْ بَنِي إِسْرائِيْلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرائِيْلَ أَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِيْنَارٍ، فَقَالَ: ائْتِنِي بِالشُّهَداءِ أُشْهِدُهُمْ، فَقَالَ: كَفَى بِاللهِ شَهِيْداً قَالَ: فَأْتِنِي بِالْكَفِيْلِ، قَالَ: كَفَى بِالله وَكِيلاً، قَالَ: صَدَقْتَ فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلىَ أَجَلٍ مُسَمَّى، فَخَرَجَ فِي الْبَحْرِ فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ الْتَمَسَ مَرْكَباً يَرْكَبُهَا، يَقْدَمُ عَلَيْهِ للأَجَلِ الَّذِي أَجَّلَهُ، فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَباً فَأَخَذَ خَشَبَةً فَنَقَرَهَا فَأَدْخَلَ فِيْهَا أَلْفَ دِيْنَارٍ وَ صَحِيْفَةً مِنْهُ إِلىَ صَاحِبِهِ، ثُمَّ زَجَّجَ مَوْضِعَهَا، ثُمَّ أَتَى بِهَا إِلىَ الْبَحْرِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنِّي كُنْتُ تَسَلَّفْتُ فُلاناً أَلْفَ دِيْنَارٍ فَسَأَلَنِي كَفِيْلاً، فَقُلْتُ: كَفَى بِالله وَكِيْلاً، فَرَضِيَ بِكَ، وَ سَأَلَنِي شَهِيْداً فَقُلْتُ: كَفَى بِالله شَهِيْداً، فَرَضِيَ بِكَ، وَ إِنِّي جَهَدْتُ أَنْ أَجِدَ مَرْكَباً أَبْعَثُ إِلَيْهِ الَّذِي لَهُ فَلَمْ أَقْدِرْ، وَ إِنِّي أَسْتَوْدِعُكَهَا فَرَمَى بِهَا إِلىَ الْبَحْرِ حَتَّى وَلَجَتْ فِيْهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَ هُوَ فِي ذَلِكَ يَلْتَمِسُ مَرْكَباً يَخْرُجُ إِلىَ بَلَدِهِ فَخَرَجَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ يَنْظُرُ لَعَلَّ مَرْكَباً قَدْ جَاءَ بِمَالِهِ، فَإِذَا بِالْخَشَبَةِ الَّتِي فِيْهَا الْمَالُ، فَأَخَذَهَا لأَهْلِهِ حَطَباً فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ الْمَالَ وَ الصَّحِيْفَةَ، ثُمَّ قَدِمَ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ فَأَتَى بِالأَلْفِ دِيْنَارٍ، وَ قَالَ: وَ الله مَازِلْتُ جَاهِداً فِي طَلَبِ مَرْكَبٍ لآتِيَكَ بِمَالِكَ، فَمَا وَجَدْتُ مَرْكَباً قَبْلَ الَّذِي أَتَيْتُ فِيْهِ قَالَ: هَلْ كُنْتَ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِشَيْءٍ؟ قَالَ: أُخْبِرُكَ أَنِّي لَمْ أَجِدْ مَرْكَباً قَبْلَ الَّذِي جِئْتُ فِيْهِ قَالَ: فَإِنَّ الله قَدْ أَدَّى عَنْكَ الَّذِي بَعَثْتَ فِي الْخَشَبَةِ فَانْصَرَفَ بِالأَلْفِ الدِّيْنَارِ رَاشِداً ﴾.** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٨١ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێكی كردووە لە بەنی ئیسرائیل داوای لە یەكێكی بەنی ئیسرائیلی كردووە كە هەزار دیناری بە قەرز بداتێ، ئەویش دەڵێ: شایەتم بۆ بهێنە كە شایەت بن لە سەر قەرزەكە، ئەویش دەڵێت: بەسە كە خوا شایەت بێت، دەڵێ: دە باشە كەفیلێكم بۆ بهێنە، دەڵێ: بەسە كە خوا كەفیل بێت، وتی: ڕاست دەكەیت، ئینجا پارەی پێدا بۆ كاتێكی دیاری كراو،وە هەستا بەڕێ كەوت لە دەریادا و كار و پێدا ویستیەكانی خۆی ئەنجام دا، پاشان بەدوای پاپۆڕێكدا دەگەڕا كە سواری بێت،هەتا پێی بگەڕێتەوە بۆ ئەو وادەیەی كە بۆی دانابوو، بەڵام پاپۆڕی دەست نەكەوت،

ئەویش تەختە دارێکی هێنا و کونی کردو هەزار دینارەکەی تێخست و نامەیەکیش لە خۆیەوە بۆ هاوڕێکەی، پاشان کونەکەی بە شوشە گرت، پاشان هێنای بۆ دەریاکەو وتی: ئەی خوای من تۆ دەزانیت من هەزار دینارم لە فلان کەس قەرز کردووە ،جا داوای کەفیلی لێ کردم، منیش وتم:خوا بەسە کەفیل بێت، ئەویش پێت رازی بوو، وە داوای شایەتی لێ کردم ،منیش وتم: خوا بەسە شایەت بێت، ئەویش پێت رازی بوو ،وە من زۆر هەوڵم دا پاپۆڕێکم دەست بکەوێت بۆ ئەوەی پارەکەی خۆی بۆ بنێرمەوە ،بەڵام دەستم نەکەوت ،وە من ئەوا ئەیدەمە دەستی تۆ، ئینجا فڕێی دایە ناو دەریاکەوە هەتا تیایا ون بوو، پاشان رۆیشت ،لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەوڵی پەیدا کردنی پاپۆڕێکی بوو ،هەتا پێی بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی ئینجا پیاوەکەش کە قەرزەکەی پێ دابوو هاتە دەر سەیر بکات بەڵکو پاپۆڕێك پارەکەی بۆ هێنابێتەوە، لەو کاتەدا دارە تەختەکەی بینی کە پارەکەی تێدا بوو ،ئەویش بە مەبەستی سوتاندن بردیەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك کە دایتاشی پارەکە و نامەکەی تێدا دۆزیەوە، لە پاشاندا ئەوەی کە قەرزەکەی پێ درابوو گەڕایەوە و هەزار دینارەکەی هێنا، وتی: سوێند بێت بە خوا بەردەوام لە هەوڵدا بووم کە پاپۆڕێکم دەست بکەوێت کە پارەکەتت بۆ بهێنمەوە بەڵام پێش ئەم پاپۆڕەی کە ئێستا پێی هاتوومەتەوە هیچ پاپۆڕێکی ترم دەست نەکەوت، ئەویش وتی: ئایا تۆ هیچ شتێکت بۆ نەناردبووم، وتی: پێت دەڵێم کە من لە پێش ئەم پاپۆڕە هیچ پاپۆڕێکی ترم دەست نەکەوت ،ئەویش وتی: دەی ئەوا خوای گەورە ئەوەی کە تۆ لە دار تەختەکەدا ناردبووت بۆی گەیاندیت، جا رێك و راست هەزار دینارەکەت لەگەڵ خۆت ببەرەوە ).

## ( ٥ ) ( پیاوێك پەلەی مردن دەكات و خۆی دەكوژێت )

**(١٠٩٨) ( حم ق ) عن جندب البجلي قال: قال رسول الله(ﷺ): « إِنَّ رَجُلاً كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ خَرَجَتْ بِهِ قَرْحَةٌ، فَلَمَّا آذَتْهُ انْتَزَعَ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِه، فَنَكَأَهَا فَلَمْ يَرْقَأِ الدَّمُ حَتَّى مَاتَ، قَالَ رَبُّكُمْ: قَدْ حرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٨٢ ) في صحيح الجامع**

جندب البجلي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك لەوانەی کە لە پێش ئێوەدا هەبوون، برینێکی لێ هاتبوو، جا کاتێك کە ئازاری پێ گەیاند، تیرێکی لە جوعبەی دەرهێنا و برینەکەی هەڵدڕی پێش چاکبوونەوە، ئیتر خوێنەکەی هەر نەگیرسایەوە هەتا مرد، پەروەردگاریشتان فەرمووی: ئەوا بەهەشتم لەسەر حەرام کرد ).

## ( ٦ ) ( چیرۆکی شەرم کردنی موسا )

**(١٠٩٩) ( حم خ ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنَّ مُوسَى كَانَ رَجُلاً حَيِيًا سِتِّيراً لا يُرى مِنْ جِلْدِهِ شَيْءٌ اسْتَحْيَاءً مِنْهُ فَآذَاهُ مَنْ آذَاهُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ فَقَالُوا: مَا يَسْتَتِرُ هَذَا التَّسَتُّرَ إِلاَّ مِنْ عَيْبٍ بِجِلْدِهِ إِمَّا بَرَصٍ وَ إِمَّا أُدْرَةٍ وَ إِمَّا آفَةٍ وَ إِنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ أَرَادَ أَنْ يُبَرِّئَهُ مِمَّا قَالُوا، وَ إِنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلام خَلا يَوْماً وَحْدَهُ فَوَضَعَ ثِيَابَهُ عَلَى الْحَجَرِ ثُمَّ اغْتَسَلَ فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ إِلى ثِيَابِهِ لِيَأْخُذَهَا وَ إِنَّ الْحَجَرَ عَدَا بِثَوْبِهِ فَأَخَذَ مُوسَى عَصَاهُ فَطَلَبَ الْحَجَرَ فَجَعَلَ يَقُولُ: ثَوْبِي حَجَرُ ثَوْبِي حَجَرُ حَتَّى انْتَهى إِلى مَلأٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ فَرَأَوْهُ عُرْيَاناً أَحْسَنَ النَّاسِ خَلْقاً وَ أَبْرَأَهُ مِمَّا كَانُوا يَقُولُونَ، قَالَ وَ قَامَ الْحَجَرُ فَأَخَذَ ثَوْبَهُ فَلَبِسَهُ وَ طَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْباً بِعَصَاهُ، فَوَاللهِ إِنَّ بِالْحَجَرِ لَنَدْباً مِنْ أَثَرِ عَصَاهُ ثَلاثاً أَوْ أَرْبَعاً أَوْ خَمْساً فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعالى: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا لا تَكُونُوا كَالَّذِيْنَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللهُ مِمَّا قَالُوا وَ كَانَ عِنْدَ اللهِ وَجِيْهاً ﴾ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٣٩ ) في صحيح الجامع**

**ابو هريرة دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( موسا سەلامی خوای لەسەر بێت پیاوێکی شەرمن و پۆشتە بوو، لە شەرمی خۆیدا هیچ شتێك لە پێستی نەدەبینرا ،جا هەر کەس لە بەنی ئیسرائیل ئازاری دا ئەوا ئازاری داو دەیان وت: ئەمە خۆی پۆشتە ناکات بەو جۆرە ئیلا لەبەر عەیبێك نەبێت کە بە پێستییەوەتی، وە یان لێ دراوی و پەڵەیە، وە یان دەرد و نەخۆشییەکە، وە خوای گەورەش ویستی پاکی بکاتەوە لەوەی کە دەیان وت، جا موسا سەلامی لەسەر بێت رۆژێك بە تەنها خۆی چووە چۆڵییەك و پۆشاکەکانی دانا لەسەر بەردێك، پاشان خۆی شت ،جا کاتێك کە لێبووەوە ویستی پۆشاکەکانی لەبەر بکات کەچی بەردەکە بە پۆشاکەکانیەوە هەڵهات، موسا دارەکەی هەڵگرت و دوای بەردەکە کەوت و هەر دەیوت ،جلەکانم بەردەکە، جلەکانم بەردەکە، هەتا گەیشتە لای کۆمەڵێك لە بەنی ئیسرائیل ئیتر بە روتی بینییان، کە لە هەموو خەڵك بونیادی جوانترە و بێ عەیبیشە لە هەموو ئەوشتانەی کە ئەوان دەیان ووت )، فەرمووی: ( ئینجا بەردەکە وەستا و ئەمیش جلەکانی هەڵگرت و لەبەری کردو بە دارەکە کەوتە لێدانی بەردەکە جا سوێند بێت بە خوا ئەو بەردە لە شوێنەواری دارەکە سیان یان چوار یان پێنج جێ لێدانی پێوەیە، جا هەر ئەوەشە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا )، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ،وەك ئەو کەسانە مەبن کە ئازاری موسایان دا ،خوایش پاکی کردەوە لەوەی کە وتیان وە ئەو لەلای خوای گەورە خاوەن رێز و وەجاهەت بوو ).**

## ( ٧ ) ( ئەو پێغەمبەرەی شارە مێرووڵەکەی سوتاند )

(١١٠٠) (ق د ن هـ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنَّ نَمْلَةً قَرَصَتْ نَبِياً مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى الله تَعالَى إِلَيْهِ: أَفِي أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةً أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٨٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( مێرووڵەیەك گازی لە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان گرت، ئەویش فەرمانی دا شارە مێرووڵەکەیان سوتاند، خوای گەورەش وەحی بۆ نارد: ئەوە لەسەر ئەوەی کە مێرووڵەیەك گازی لێ گرتیت ئومەتێکت لە ئومەتەکان فەوتاند کە تەسبیحاتی خوایان دەکرد ).

(١١٠١) ( حم خ د ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ فَأَمَرَ بِبَيْتِهِنَّ فَحُرِّقَ عَلَىَ مَافِيْهَا فَأَوْحَى الله إِلَيْهِ فَهَلاَّ نَمْلَةً وَاحِدَةً ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٦٧٥٥) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران لە ژێر دارێکدا دابەزی و مێرووڵەیەك پێوەی دا، ئەویش فەرمانی دا ماڵەکەیان سوتێنرا بە هەرچیەکەوە کە تیایەتی، خوای گەورەش وەحی بۆ نارد، دەی کە هەر وات کرد با تەنها مێرووڵەکە خۆی بووایە ).

## ( ٨ ) ( چیرۆکی دوو پیاوەکەی بەنی ئیسرائیل )

(١١٠٢) ( حم د ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَانَ رَجُلاَنِ فِي بَنِي إِسْرَائِيْلَ مُتَوَاخِيَيْنِ فَكَانَ أَحَدُهُمَا يُذْنِبُ وَ الآخَرُ مُجْتَهِدٌ فِي الْعِبَادَةِ فَكَانَ لا يَزَالُ الْمُجْتَهِدُ يَرَى الآخَرُ عَلَى الذَّنْبِ فَيَقُولُ: أَقْصِرْ فَوَجَدَهُ يَوْماً عَلَى ذَنْبٍ فَقَالَ لَهُ: أَقْصِرْ فَقَالَ: خَلِّنِي وَ رَبِّي أَبُعِثْتَ عَلَيَّ رَقِيْباً؟ فَقَالَ: وَ الله لا يَغْفِرُ اللهُ لَكَ أَوْ لايُدْخِلُكَ اللهُ الْجَنَّةَ، فَقُبِضَ أَرْوَاحُهُمَا فَاجْتَمَعَا عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ فَقَالَ لِهَذَا الْمُجْتَهِدِ: أَكُنْتَ بِي عَالِماً أَوْ كُنْتَ عَلَى مَافِي يَدِي قَادِراً، وَ قَالَ لِلْمُذْنِبِ: إِذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِي وَ قَالَ لِلآخَرِ: إِذْهَبُوا بِهِ إِلَى النَّارِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٤٥٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دوو پیاو لە بەنی ئیسرائیل دۆست و برادەری یەکتر بوون، جا یەکێکیان گوناهی دەکرد و ئەوی تریشیان لە عیبادەت کردندا تێدەکۆشا، جا بەردەوام ئەوەی کە تێدەکۆشا ئەوی تریانی دەبینی لەسەر تاوان و دەیووت: دەست هەڵگرە و واز بێنە، جا رۆژێکیان لەسەر تاوانێك بینی و پێی ووت: واز بێنە و مەکە، ئەویش پێی ووت: دەوازم لێ بێنە خۆم و پەروەردگاری خۆم، چییە ئەڵێی کراویت بە چاودێر بە سەرمەوە؟ ئەویش ووتی: سوێند بە خوا خوا لێت خۆش نابێت و ناتخاتە بەهەشتەوە، جا رۆحی هەردووکیان کێشرا و لای پەروەردگاری جیهانیان

کۆبوونەوە و گەیشتنەوە بە یەك ئینجا خوا بەوەیانی فەرموو کە تێدەکۆشا لەعیبادەتدا: ئایا تۆ زانا بوویت بە من یان تۆ توانای ئەوەت هەبوو کە بڕیاری شتێك بدەیت کە لە دەستی مندایە ؟ وە فەرمووی بە تاوانبارەکە: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە بە رەحمەتی خۆم، وە بەوی تریشیانی ووت: بڕۆن بیبەن بۆ ئاگر ).

## ( ٩ ) ( هاوڕێیانی چاڵەکە - أصحاب الأخدود - )

(١١٠٣) ( حم م ) عن صهيب قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ وَ كَانَ لَهُ سَاحِرٌ، فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ: إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلاماً أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلاماً يُعَلِّمُهُ، فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ إِذَا سَلَكَ رَاهِبٌ، فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَ سَمِعَ كَلامَهُ، فَأَعْجَبَهُ، فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَ قَعَدَ إِلَيْهِ، فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ فَقَالَ: إِذَا جِئْتَ السَّاحِرَ فَقُلْ: حَبَسَنِي أَهْلِي، وَ إِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ: حَبَسَنِي السَّاحِرُ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ، فَقَالَ: الْيَوْمَ أَعْلَمُ السَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ؟ فَأَخَذَ حَجَراً فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ، فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا، وَ مَضَى النَّاسُ، فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: أَيْ بُنَيَّ، أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي، قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى، وَ إِنَّكَ سَتُبْتَلَى،فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلا تَدُلَّ عَلَيَّ، وَ كَانَ الْغُلامُ يُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَ الأَبْرَصَ وَ يُدَاوِي النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الأَدْوَاءِ، فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ، فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ فَقَالَ: مَا هَهُنَا لَكَ أَجْمَعُ، إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي قَالَ: إِنِّي لا أَشْفِي أَحَداً، إِنَّمَا يَشْفِي اللهُ عَزَّوَجَلَّ، فَإِنْ آمَنْتَ بِاللهِ دَعَوْتُ اللهَ فَشَفَاكَ، فَآمَنَ بِاللهِ فَشَفَاهُ اللهُ، فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ؟ قَالَ: رَبِّي قَالَ: وَ لَكَ رَبٌّ غَيْرِي؟ قَالَ: رَبِّي وَ رَبُّكَ اللهُ، فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلامِ، فَجِيءَ بِالْغُلامِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: أَيْ بُنَيَّ قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَايُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَ الأَبْرَصَ وَ تَفْعَلُ وَ تَفْعَلُ، فَقَالَ: إِنِّي لا أَشْفِي أَحَداً إِنَّمَا يَشْفِي اللهُ عَزَّ وَ جَلَّ، فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ، فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى فَدَعَا بِالْمِنْشَارِ فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ عَلَى مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ، ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ فَأَبَى، فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلامِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ فَأَبَى فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَ كَذَا، فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذُرْوَتَهُ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَ إِلاَّ فَاطْرَحُوهُ، فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ فَرَجَفَ بِهِمُ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا، وَ جَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللهُ، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورَةٍ، فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَ إِلاَّ فَاقْذِفُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ فَغَرِقُوا، وَ جَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ فَقَالَ: كَفَانِيهِمُ اللهُ،

فَقَالَ لِلْمَلِكِ: إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ، قَالَ: وَ مَا هُوَ؟ قَالَ: تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَ تَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ خُذْ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِي ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قُلْ: بِسْمِ اللهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ ارْمِنِي فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِي، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَ صَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ أَخَذَ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِهِ ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قَالَ: بِسْمِ اللهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ مَوْضِعَ السَّهْمِ فَمَاتَ فَقَالَ النَّاسُ: آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ فَأَتَى الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ: أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ؟ قَدْ وَ اللهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ قَدْ آمَنَ النَّاسُ فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ وَ أَضْرَمَ النِّيرَانَ وَ قَالَ: مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا، أَوْ قِيلَ لَهُ: اقْتَحِمْ، فَفَعَلُوا حَتَّى جَاءَتْ امْرَأَةٌ وَ مَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا، فَقَالَ لَهَا الْغُلَامُ: يَا أُمَّهِ اصْبِرِي فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٤٦٠) في صحيح الجامع

صُهَیْب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پاشایەك هەبوو لەوانەی لە پێش ئێوەدا بوون ،و ئەو پاشایە سیحربازێکی هەبوو، جا کاتێك کە پیر بوو بە پاشاکەی ووت: من وا بە تەمەندا چووم، جا گەنجێکم بۆ بنێرە هەتا فێری سیحری بکەم، ئەویش لاوێکی بۆ نارد کە فێری بکات، جا لاوەکە لە رێگەکەیدا کە دەیگرتە بەر ،خواناسێك هەبوو لە لای دادەنیشت و گوێی لە قسەکانی دەگرت و بە دڵی بوو، جا هەر کاتێك کە بهاتایە بۆ لای سیحربازەکە بە لای خوا پەرستەکەدا تێ دەپەڕی و لە لای دادەنیشت ،وە کە ئەهاتە لای سیحربازەکە لێی دەدا، ئەویش سکاڵای خۆی بۆ خواپەرستەکە کرد، ئەویش پێی ووت: ئەگەر ترست هەبوو لە سیحربازەکە ئەوە بڵێ: کەس و کارم رایان گرتبووم و دوایان خستم، وە ئەگەر لە کەس و کارت ترسایت، ئەوا بڵێ: سیحربازەکە دوای خستم. جا لە کاتێکدا کە بەو جۆرەی دەکرد، جارێکیان هات بە سەر جانەوەرێکی گەورەدا کە ئەو خەڵکەی راگیر کردبوو، ئینجا وتی: ئەمڕۆ دەبێت بزانم کە سیحربازەکە باشترە یان خواناسەکە باشترە؟ ئینجا بەردێکی هەڵگرت و ووتی: ئەی خواوەندی من، ئەگەر کاری خوا ناسەکە خۆشەویسترە لە لات لە کاری سیحربازەکە ئەوا ئەم جانەوەرە بکوژە هەتا ئەو خەڵکە بتوانن تێ بپەڕن، ئینجا تێی گرت و کوشتی و خەڵکەکەش رۆیشتن ،ئەویش هاتە لای خواناسەکە و بۆی گێڕایەوە، خواناسەکەش پێی ووت: ئەی کوڕەکەم ئەمڕۆ تۆ لە من باشتریت، بە جۆرێك کە کاری تۆ گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کەوا ئەیبینم، بە دڵنیاییەوە تۆ دوچاری بەڵا و تاقیکردنەوە دەبیت، جا ئەگەر تێوەگلایت ئەوا منیان بۆ ئاشکرا نەکەیت. ئیتر کوڕەکە کەسانی کوێر و گەڕی چاك دەکردەوە و تیماری خەڵکی دەکرد لە هەموو دەردەکان جا یەکێك لە هاودەمانی پاشاکە کە کوێر ببوو بیستیەوە ،ئینجا بە دیارییەکی زۆرەوە هات بۆ لای و ووتی: ئائەمانە هەمووی بۆ تۆ ئەگەر بتوانیت چاکم بکەیتەوە، ئەویش ووتی: من هیچ کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو خوا شیفا دەنێرێت و چاکی دەکاتەوە ،جا ئەگەر تۆ باوەڕ بە خوا بێنیت، ئەوا لە خوا بۆت دەپاڕێمەوە کە شیفات بدات. ئەویش باوەڕی بە خوا هێنا و خوایش شیفایدا، ئینجا هاتە لای پاشا و هەر وەك جاری جاران دانیشت لە لای، پاشایش پێی وت: ئەوە کێ وای لێ کردیت ببینیتەوە؟وتی: پەروەردگارم. وتی: بۆ جگە لە من

پەروەردگاری ترت هەیە؟ وتی:پەروەردگاری من و پەروەردگاری تۆ زاتی ( الله ) یە، ئەویش گرتی و هێندە ئەشکەنجەی دا هەتا ئاماژەی بە کوڕە لاوەکە دا، ئینجا کوڕەکەیان هێنا و پاشا پێی وت:ئەوە کوڕەکەم سیحرەکەت گەیشتۆتە رادەیەك کە کوێر و گەڕ چاك بکەیتەوە و ئەوە بکەیت و ئەوە بکەیت.
ئەویش وتی: من هیچ کەسێکم بۆ چاك ناکرێتەوە، بەڵکو خوای گەورە چاکیان دەکاتەوە ،ئەویش گرتی وئەوەندە ئەشکەنجەی دا هەتا ئاماژەی بە خواناسەکە کرد، ئینجا خوا ناسەکەیان هێنا و پێی وترا: بگەڕێوە لە ئاینەکەت ئەویش رازی نەبوو، ئینجا مشاریان هێنا و مشارەکەیان خستە ناوەڕاستی سەری و دوکەرتیان کرد هەتا هەردوو کەرتەکەی کەوتن بە زەویدا، پاشان هاودەمەکەی پاشایان هێنا و پێی وترا: بگەڕێرەوە لە ئاینەکەت. ئەویش رازی نەبوو، ئینجا مشارەکەیان خستە ناوەڕاستی سەری ئەویشەوە و دووکەرتیان کرد هەتا هەردوو کەرتەکەی کەوتنە سەر زەوی، پاشان کوڕەکەیان هێناو پێی وترا: بگەڕێرەوە لە ئاینەکەت. ئەویش رازی نەبوو، ئەویش دای بە چەند کەسێك لە هاوڕێکانی و وتی:ببەن بۆ چیای ئەوە و ئەوە، ئینجا سەری بخەن بە چیاکەدا و کە گەیشتە لوتکەکەی، ئەگەر گەڕایەوە لە ئاینەکەی، ئەگەر نا بیخەنە خوارەوە، ئینجا بردیان سەریان خست بە سەر چیاکەدا و ئەویش وتی: خوایە بە هەر شتێك کە خۆت پێت باشە ئەمانەم لە کۆڵ بکەیتەوە، ئیتر چیاکە رایوەشاندن و کەوتنە خوارەوە، وە بە رۆیشتن هاتەوە بۆ لای پاشا و پاشاش پێی وت: ئەی ئەوانەی کە لەگەڵتدا بوون چییان کرد؟ وتی:خوای گەورە لە کۆڵمی کردنەوە. ئینجا دایە دەست کۆمەڵێکی تر لە هاوڕێکانی و وتی:ببەن بیخەنە ناو قوڕقوڕەیەکەوە و ببەنە ناوەڕاستی دەریاکە ،جا ئەگەر گەڕایەوە لە ئاینەکەی ،ئەگەر نا فڕێی بدەنە ناو ئاوەکەوە، ئەوانیش بردیان، ئینجا وتی: ئەی خوداوەندی من بە هەر شتێك کە خۆت پێت باشا ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوە، ئینجا پاپۆڕەکە قڵپ بووەوە پێیان و غەرق بوون، وە بە رۆیشتن هاتەوە بۆ لای پاشا. پاشاش پێی وت: ئەی ئەوانەی کە لەگەڵتدا بوون چییان کرد؟ وتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە، ئینجا بە پاشاکەی وت: تۆ ناتوانیت من بکوژیت هەتا ئەوە نەکەییت کە خۆم پێت دەڵێم.وتی: ئەو شتە چییە بیکەم؟ وتی: دەبێت خەڵك کۆبکەیتەوە لە یەك شوێنی بەرزدا ،وە هەڵم بواسیت بە کۆتەرە دارێکەوە، پاشان تیرێك لە جوعبەکەی خۆم بەرەو و پاشان تیرەکە بخەرە ناو جەرگەی کەوانەکەوە، پاشان بڵێ: بە ناوی ( الله ) وە پەروەردگاری ئەم کوڕە پاشان پێوەم بنێ، جا ئەگەر وات کرد ئەوا دەمکوژیت. ئەویش خەڵکەکەی هەموو لە یەك شوێنی بەرز کۆکردەوە و کوڕەکەی هەڵواسی بە کۆتەرە دارێکەوە، پاشان تیرێکی لە جوعبەکەی هەڵگرت و پاشان تیرەکەی خستە ناو جەرگەی کەوانەکەوە و پاشان وتی: بە ناوی ( الله ) وە پەروەردگاری ئەم کوڕە، ئینجا تیرەکەی پێوەنا، تیرەکە دای لە لای زوڵفی کوڕەکە و ئینجا دەستی خستە ناو زوڵفی ، لەو شوێنەی کە تیرەکەی لێدابوو ئیتر مرد، ئینجا خەڵکەکە وتیان: باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری ئەو کوڕە، باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری ئەو کوڕە ،باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری ئەو کوڕە، ئینجا پادشا هاتنە لای و پێیان وت،دەبینی ئەمە ئەوە بوو کە لێی دەترسایت؟ جا بە خوا واترسەکەت هاتە دی. وا خەڵك هەموو باوەڕیان هێنا ،ئەویش فەرمانی دا کە چاڵێکی درێژ لە لێواری رێگاکاندا هەڵبکەنرێت. ئینجا هەڵیانکەند و ئاگریان تێدا گڕدا، ئینجا وتی: هەر کەس نەگەڕایەوە لە ئاینەکەی ئەوا لە ئاگرەکەی هەڵبکێشن یان

پێی دەوترا: خۆتی تێ فڕێ بدە.ئەوانیش جێبەجێیان کرد ،هەتا ژنێك هات و کوڕێکی مەلۆتکەی لە باوەشدابوو، کەمێك سستی نواند کە بخرێتە ناوی ،کوڕە مەلۆتکەکەی پێی وت: ئەی دایکە ئارام بگرە تۆ لەسەر حەقیت ).

## ( ١٠ ) ( سوننەتی خوا لە پێغەمبەرەکانیدا )

(١١٠٤) ( حم ) عن أبي ذر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَمْ يَبْعَثْ اللهُ تَعَالَى نَبِيّاً إلاَّ بلُغَةِ قَوْمه ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥١٨٢ ) في صحيح الجامع

ابو ذر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیلا بە زمانی قەومەکەی خۆی نەبێت ).

## ( ١١ ) ( پێغەمبەری خوا ئیبراهیم لەگەڵ زۆردارەکەدا )

(١١٠٥) ( حم ق ) عن أبي هريرة أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ لَمْ يَكْذبْ إبْرَاهيْمُ عَلَيْه السَّلام قَطّ إلاَّ ثَلاثَ كَذَبَات: ثـنْتَيْن في ذات الله، قَوْلُهُ: ﴿ إنِّي سَقيْمٌ ﴾، وَ قَوْلُهُ: ﴿ بَلْ فَعَلَهُ كَبيْرُهُمْ هَذا ﴾، وَ وَاحدَةً في شَأن سَارَةَ، فَإنَّهُ قَدمَ أَرْضَ جَبّار وَمَعَهُ سَارَةُ، وَ كَانَتْ أَحْسَنَ النَّاس، فَقَالَ لَهَا: إنَّ هَذا الْجَبّارَ إنْ يَعْلَمْ إنَّك امْرَأتي يَغْلبْني عَلَيْك فَإنْ سَأَلَك فَأَخْبريْه أَنَّك أُخْتي فَإنّك أُخْتي في الإسْلام،فَإنِّي لاأَعْلَمُ في الأَرْض مُسْلماً غَيْري وَغَيْرك،فَلَمّا دَخَلَ أَرْضَهُ رَآهَا بَعْضُ أَهْل الْجَبّار، أَتَاهُ فَقَالَ لَهُ: لَقَدْ قَدمَ أَرْضَكَ امْرَأَةٌ لايَنْبَغي لَهَا أَنْ تَكُونَ إلاَّ إلَيْك، فَأَرسَلَ إلَيْهَا فَأتىَ بهَا، فَقَامَ إبْراهيْمُ عَلَيْه السَّلامُ إلىَ الصَّلاة فَلَمّا دَخَلَتْ عَلَيْه لَمْ يَتَمالَك أَنْ بَسطَ يَدَهُ إلَيْهَا،فَقُبضَتْ يَدُهُ قَبْضَةً شَديْدَةً، فَقَالَ لَهَا: ادْعي اللهَ أَنْ يُطْلقَ يَدي وَ لا أَضُرّك، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ، فَقُبضَتْ أَشَدَّ منَ الْقَبْضَة الأُولى، فَقَالَ لَهَا مثْلَ ذَلك، فَفَعَلَتْ، فَعادَ فَقُبضَتْ أَشَدَّ منَ الْقَبْضَتَيْن الأوَلَيْن، فَقَالَ: ادْعي الله أَنْ يُطْلقَ يَدي فَلَك الله أَنْ لا أَضُرُك، فَفَعَلَتْ، وَ أُطْلقَتْ يَدُهُ، وَدَعَا الَّذي جَاءَ بهَا فَقَالَ لَهُ: إنّكَ أَتَيْتَني بشَيْطَان وَلَمْ تَأْتني بإنْسان فَأَخْرجْهَا منْ أَرْضي وَ أَعْطها هَاجَرَ، قَالَ: فَأَقْبَلَتْ تَمْشي فَلَمّا رَآهَا إبْراهيْمُ عَلَيْه السَّلاَمُ انْصَرفَ، فَقَالَ: لَهَا مَهْيَم؟ قَالَتْ خَيْراً، كَفَّ الله يَدَ الْفَاجر، وَأَخْدَمَ خَادماً ﴾. و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٢٠٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لەسەر بێت هەرگیز درۆی نەکردووە تەنها سێ درۆیان نەبێت:دوانیان لەبەر خوا بوو کە وتی:من نەخۆشم وە کە وتی: بەڵکو بتە گەورەکەیان بچوکەکانی تری شکاندووە،وە دانەیەکی تریان دەربارەی سارەی خێزانی بوو. ئەویش کاتێك هاتە خاکی زۆردارێکەوە سارەی لەگەڵدا بوو ،وە سارەش لە خەڵکە زۆر جوانەکان بوو. ئیبراهیم پێی وت: ئەم زۆردارە ئەگەر بزانێت تۆ ژنی منی، ئەوا لە پێناو تۆدا دەمکوژێت،جا ئەگەر پرسیاری لێ کردیت پێی بڵێ کەوا تۆ خوشکمیت، جا تۆ هەر خوشکی منیت لە ئیسلامەتیدا ،وە من نازانم کە لە

زەویدا موسڵمان هەبێت لە غەیری من و تۆ ،جا کاتێك کە چووە زەوییەکەوە یەکێك لە دەست و پێوەندی زۆردارەکە بینی، هاتە لای و پێی وت:ئافرەتێك هاتۆتە خاکەکەت شیاو نییە بۆ هیچ کەسێك بێت تەنها بۆ تۆ نەبێت،ئینجا ناردی بە دوایدا و بۆیان هێنا، ئیبراهیمیش سەلامی لەسەر بێت هەستا بۆ نوێژ کردن، جا کاتێك سارە چووە ژوورەوە بۆ لای زۆردارەکە ،لە تاودا خۆی بۆ رانەگیرا و دەستی بۆ راکێشا، کەچی دەستی گیرا گیرانێکی توند، ئەویش بە سارەی وت: داوا لە خوا بکە دەستم بەر بدات و ئیتر هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنم، ئەویش دوعای کرد، کەچی دەستی هێنایەوە ،ئەم جارەیان توندتر لە جارەکەی یەکەم دەستی گوشرایەوە، ئینجا وەك جاری یەکەم پێی وتەوە، ئەویش دوعای کرد، کەچی هەر دەستی بۆ بردەوە، ئەم جارەیان لە هەردوو جارەکەی تر توندتر دەستی نوقێنرا، ئیتر وتی: داوا لە خوا بکە کە دەستم بەر بدات سوێندت بۆ دەخۆم کە زیانت لێ نەدەم، ئەویش داوای لە خوا بۆ کرد و ئینجا دەستی کرایەوە ئینجا ئەو کەسەی بانگ کرد کە ئافرەتەکەی بۆ هێنابوو، پێی وت: تۆ ئەمە شەیتانە بۆ منت هێناوە، ئەمە مرۆڤ نییە بۆت هێناوم، بیبە دەرەوە لە خاکەکەی من و هاجەرەیشی پێ بدە ). فەرمووی: ( ئینجا بە رۆیشتن هاتەوە و دەرکەوت، ئیبراهیمیش کە بینی بەرەو پیری چوو و پێی وت: ها چی بوو؟ سارەش وتی: خێر بوو، خوا دەستی ئەو بەدکارەی لەسەر لاداین و کارەکەرێکشی پێ داین ).

## ( ١٢ ) ( غەرق کردنی فیرعەون )

**(١١٠٦) ( حم ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ لَمَّا أَغْرَقَ اللهُ فِرْعَوْنَ قَالَ: ﴿ آمَنْتُ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُوا إِسْرائِيلَ ﴾، فَقَالَ جِبْرِيلُ: يَا مُحَمَّدُ لَوْ رَأَيْتَنِي وَ أَنَا آخُذُ مِنْ حَالِ الْبَحْرِ وَ أَدُسُّهُ فِي فِيْهِ مَخَافَةَ أَنْ تُدْرِكَهُ الرَّحْمَةُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٢٠٥) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کاتێك کە خوا فیرعەونی غەرق کرد وتی: ﴿باوەڕم هێنا کە هیچ خوایەك نییە جگە لەوەی کە بەنی ئیسرائیل باوەڕیان پێ هێناوە ﴾، ئینجا جبریل وتی: ئەی محمد ئەگەر لەو کاتەدا بتبینیمایە کە چۆن لە لیتەی دەریاکەم دەبرد و دەمخستە ناو دەمیەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا رەحمی خوا بیگرێتەوە ).

**(١١٠٧) ( ت ) عن أبي بكر قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ مَا قَبَضَ اللهُ تَعالىَ نَبِياً إِلاَّ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٦٤٨) في صحيح الجامع**

ابو بکر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا گیانی هیچ پێغەمبەرێکی نەکێشاوە ئیلا لەو شوێنەدا نەبێت کە خۆی حەز دەکات تیایدا ئەسپەردە بکرێت ).

**(١١٠٨) ( م ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ يَا أَعْرَابِيَ إِنَّ اللهَ غَضِبَ عَلَى سِبْطَيْنِ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيْلَ فَمَسَخَهُمْ دَوَابَّ يَدِبُّونَ فِي الأَرْضِ فَلا أَدْرِي لَعَلَّ هَذا مِنْهَا، فَلَسْتُ آكُلُهَا وَلا أَنْهَى عَنْهَا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٤٨) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەی عەرەبە دەشتەکییەکە، خوا غەزەبی لە دوو خێڵ گرت لە بەنی ئیسرائیل و رووی وەرگێران و کردنی بە گیانەوەرانێکی تر کە بە سەر زەویدا دەڕۆن، جا نازانم لەوانەیە ئەوەش لەوان بێت، جا من نە دەخۆم و نە لێشتان قەدەغە دەکەم کە بیخۆن ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

جارێکیان عەرەبێکی دەشتەکی پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە ناوچەیەکدا دەژین کە رێژەیەکی زۆر (بزن مژە)ی تێدایە، وە یەکێکە لە خۆراکە سەرەکییەکانی خێڵەکەمان، جا ئایا خواردنی دروستە یان نا؟ سێ جار ئەو پرسیارەی لێ دووبارە کردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەر وەڵامی نەدایەوە، کابراش هەستا رۆیشت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردەوە و فەرموودەکەی سەرەوەی پێ فەرموو، وە چەندین فەرموودەی تریشی لەسەر هاتووە کە هەموویان ئەوە دەگەیەنن کە پێغەمبەر(ﷺ) گۆشتی (بزن مژە)ی حەرام نەکردووە بەڵام خۆی نەیخواردووە .

## ( ١٤ ) ( چیرۆکی گەرێك و کەچەڵێك و کوێرێك )

(١١٠٩) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ ثَـلاثَةً في بَني إسْرائيْلَ: أبْرَص وَ أقْرَعَ وَ أعْمى، فأراد الله أنْ يَبْتَلِيَهُمْ، فَبعَثَ إلَيْهِمْ مَلَكاً، فَأتَى الأبْرَص فَقَالَ: أيُّ شَيْءٍ أَحبَ إلَيْكَ؟ قَالَ: لَوْنٌ حَسنٌ وَ جِلْدٌ حَسَنٌ وَ يَذْهَبُ عَنِي الَّذِي قَدْ قَذرَني النَّاسُ،قَال: فَمسَحهُ فَذهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ، وَ أُعْطِيَ لَوْناً حَسَناً وَ جِلْداً حَسَناً، قَالَ: فَأيَّ الْمَال أَحبَ إلَيْكَ؟ قَالَ: الإبلُ (أو قَالَ: البَقَرُ، شَكَ إسْحَقَ ) إلاَّ أَنَ الأبْرَص أوْ الأقْرَعَ قَالَ أَحَدُهُمَا: الإبْلُ، وَ قَالَ الآخرُ: البَقَر، فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَراءَ، فَقَال: بَارَكَ الله لَكَ فِيهَا، قَال: فأتَي الأقْرَعَ، فقَالَ: أيُّ شَيْءٍ أَحبَ إلَيْكَ؟ قَالَ: شَعْرٌ حَسَنٌ وَ يَذْهَبُ عَنِي هَذا الَّذي قَذرني النَاسُ، فَمسحهُ فَذهَبَ عَنْهُ، وَ أُعْطِيَ شَعْراً حَسَناً، قَالَ: فَأيَّ الْمَال أَحبَ إلَيْكَ؟ قَالَ: الْبَقَرُ، فَأُعْطِيَ بَقَرةً حَاملاً، فقَالَ: بَارَكَ الله لَكَ فِيهَا، قَالَ: فَأتَى الأعْمى، فَقَال: أيَّ شَيْءٍ أَحبَ إلَيْكَ؟ قَالَ: يَرُدَّ الله إلَيَ بَصَري فَأُبْصرَ بِهِ النَاسُ، فَمَسَحهُ فَردَّ الله إلَيْهِ بَصرَهُ، قَالَ: فَأيَّ الْمَال أَحبَ إلَيْكَ؟ قَالَ: الْغَنَمُ، فَأعْطَاهُ شَاةً وَالداً، فَأُنْتجَ هَذان وَ وَلَدَ هَذا، قَال: فَكَانَ لِهَذا وَاد منَ الإبل، وَ لِهَذا وَاد منَ البَقر، وَ لِهَذا وَاد منَ الْغَنَم، قَال: ثُمَّ إنَّهُ أَتَى الأبْرَص في صُورَته وَ هَيْئَته، فَقَالَ: رَجُلٌ مسْكيْنٌ،قَدْ انْقَطعَتْ بِي الْحِبَالُ في سَفَري، فَلا بَلاغَ لي الْيَوْمُ إلاَّ بِالله ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أعْطَاكَ اللَوْنَ الْحسَنَ وَ الْجِلْدَ الْحسَنَ وَ الْمَالَ، بَعِيراً أتَبَلَغُ عَلَيْهِ فِي سَفَري، فَقَال: إنَ الْحُقُوقَ كَثِيْرَةٌ، فَقَال لَهُ: كَأَني أعْرِفُكَ أَلَمْ تَكُنْ أبْرَص يَقْذَرُكَ النَاسُ؟ فَقيْراً فَأَعْطَاكَ الله؟ فَقَال: إنَّما وُرِثْتُ هَذا الْمَال كَابراً عَنْ كَابرٍ، فَقَالَ: إنْ كُنْتَ كَاذِباً فَصيَرَكَ الله إلَى مَا كُنْتَ، قَال: وَ أتَى الأقْرَعَ

**في صُورَته فَقَالَ لَهُ مثْلَ مَا قَالَ لهَذَا، وَ رَد عَلَيْه مثْلَ مَا رَدَ عَلَيْه هَذَا، فَقَالَ: إنْ كُنْتَ كَاذباً فَصَيَرَكَ اللَه إلىَ مَا كُنْتَ، قَالَ: وَ أَتَىَ الأَعْمىَ في صُوْرَته وَ هَيْئَته، فَقَالَ: رَجُلٌ مسْكيْنٌ وَ ابْنُ سَبيْل، انْقَطَعَتْ بي الحبَالَ في سَفَري فَلا بَلاغ لي الْيَوْم إلاَ بِالله ثُمَ بكَ، أَسْأَلُك بالَذي رَدَ عَلَيْكَ بَصرَكَ، شَاةً أَتَبَلَغُ بها في سَفَري؟ فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أَعْمىَ فَرَدَ اللّه إليَ بَصري، فَخُذْ مَا شئْتَ، وَ دَعْ مَاشئْتَ، فَوالله لا أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ شَيْئاً أَخَذْتَهُ لله، فَقَالَ: أَمْسكْ مَالَكَ، فَإنَما ابْتُليْتُم، فَقَدْ رُضيَ عَنْكَ وَ سُخطَ عَلَى صَاحبَيْكَ ﴾. و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٥٢) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سێ کەس لە بەنی ئیسرائیل ،گەرێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خوای گەورە ویستی تاقیان بکاتەوە، فریشتەیەکی نارد بۆ لایان، هاتە لای گەرەکە و وتی: چ شتێکت زۆر حەز لێیە؟وتی: رەنگێکی جوان و پێستێکی جوان ،وە ئا ئەمەم لە کۆڵ بێتەوە کە خەڵك بە هۆیەوە قێزم لێ دەکەنەوە) فەرمووی:(ئەویش دەستێکی پیا هێنا و هەموو پیسیەکەی لێ بووەوە،وە رەنگێکی جوان و پێستێکی جوانی پێ درا، وتی: ئەی لە ماڵ و ساماندا حەزت لە چییە؟وتی: حوشتر یان مانگا -- إسحق تیایدا بە گومان بوو کە یەکێك لە گێرەوەکانی فەرموودەکەیە – )، فەرمووی: ( ئینجا وشترێکی دایە کە سکی دە مانگ بوو ، وە پێی وت:خوا بەرەکەتت بۆ تێ بخات )، فەرمووی: ( ئینجا هاتە لای کەچەڵەکە و پێی وت: چ شتێکت زۆر حەز لێیە؟ وتی: قژ و پرچێکی جوان، ئەمەم لە کۆڵ بێتەوە کە خەڵك بە هۆیەوە قێزم لێ دەکەنەوە )،فەرمووی: ( ئینجا دەستێکی پیا هێنا و کەچەڵیەکەی نەما ،وە قژێکی جوانی پێ درا و وتی:ئەی چ جۆرە ماڵ و سامانێکت حەز لێیە؟ وتی: مانگا .ئینجا مانگایەکی ئاوسیشی دایە و پێی وت: خوا بەرەکەتت بۆ تێ بخات )، فەرمووی: ( ئینجا هاتە لای کوێرەکە و وتی:چ شتێکت زۆر حەز لێیە؟ وتی: حەزم بەوەیە کە خوا بیناییەکەم بۆ بگێرێتەوە و خەڵکی پێ ببینم ) فەرمووی: ( ئینجا دەستێکی پیا هێنا و خوایش بیناییەکەی بۆ گەراندەوە، وتی: ئەی چ جۆرە ماڵ و سامانێکت حەز پێیە؟ وتی: مەر، ئینجا مەرێکی پێدا کە بزێت ،ئیتر ئەو دوانیان بەرهەمی هێنا و ئەویشیان زا )، فەرمووی: ( ئیتر ئەوەیان پر بە دۆڵێك وشتری هەبوو، وە ئەویشیان دۆڵێك لە مانگا، وە ئەمیشیان دۆڵێك لە مەر )، فەرمووی: ( پاشان فریشتەکە هاتەوە بۆ لای گەرەکە و بە هەمان وێنە و شێوازەکەی پێشوو وتی: پیاوێکی هەژارم، دەستم پچراوە لە هەموو کەس و دۆستەکانم لەم سەفەرەمدا ئیتر هیچ تێشوویەکم نییە ئەمرۆ تەنها بە خوا نەبێت و پاشان بە تۆ ،داوات لێ دەکەم تو ئەو کەسەی کە رەنگی جوان و پێستی جوان و ماڵ و سامانی پێ داویت،وشترێکم بدەیتێ کە سەفەرەکەمی پێ تەواو بکەم. ئەویش وتی:ئەرك و پێداویستیەکان زۆرن وناتوانم، ئەویش پێی وت:دەڵێی دەتناسم ؟ تۆ ئەو گەرە نەبویت کە خەڵك قێز و بێزیان لێ دەکردیتەوە، هەژار بویت و خوا پێی دایت؟ ئەویش وتی:من ئەم ماڵ و سامانەم پشتاو پشت بە میراتی بۆ ماوەتەوە .ئەویش پێی وت:دەی ئەگەر بە درۆت بێت، ئەوا خوای گەورە وەك خۆتت لێ بکاتەوە )، فەرمووی: ( وە هاتە لای کەچەڵەکە هەر وەك وێنەی جارەکەی پێشووی و هەمان شتیشی بەم وت کە بەوی تری وت.ئەمیش بە هەمانشێوەی ئەوی تر وەڵامی دایەوە. ئەمیش پێی وت: ئەگەر درۆت کردبێت، ئەوا خوای گەورە پێشتر چۆن بویت ئاوات لێ

**بکاتەوە )، فەرمووی: ( وە هاتە لای کوێرەکە لەسەر هەمان وێنە و شێوەی پێشوی و وتی: پیاوێکی داماوم و ڕێبوارم، دەستم لە کەس و کارم پچڕاوە، جا ئەمڕۆ هیچ پەنایەکم نییە تەنها بە خوا نەبێت پاشان بە تۆ، داوات لێ دەکەم بەو کەسەی بیناییەکەتی بۆ گەڕانیتەوە ،مەڕێکم بدەیتێ کە بیکەم بە توێشوی سەفەرەکەم، ئەویش وتی:من پێشتر کوێر بووم، خوا بیناییەکەمی بۆ گەڕاندمەوە، جا ئەوەی کە ویستت بیبە و ئەوەشی کە نەتویست لێی گەڕێ، وە سوێند بێت بە خوا ئەمڕۆ من هیچ شتێکت بە زۆر بۆ نازانم کە لەبەر خوا بردبێتت، ئەویش وتی:ماڵی خۆت با بۆ خۆت بێت، ئەوە بەس تەنها تاقی کرانەوە، ئەوا خوا لە تۆ رازی بوو لە دوو هاوڕێکەی تریشت زویر بوو ).**

# ( بەشی : تۆبە کردن )

## ( ١ ) ( داواکردنی لێ بوردن لە خوا )

**(١١١٠) ( حم ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ عَبْداً أصابَ ذَنْباً فقالَ: رَبِّ أذْنَبْتُ فاغْفرْهُ فَقالَ رَبُّهُ: أعَلِمَ عَبْدي أنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ و يأخُذُ بِهِ؟ غَفَرْتُ لِعَبْدي ثُمَّ مَكَثَ ما شاءَ الله ثُمَّ أصابَ ذَنْباً فَقالَ: رَبِّي أذْنَبْتُ آخَرَ فاغْفِرْ لي قالَ: أعَلِمَ عَبْدي أنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَ يَأخُذُ بِهِ؟ غَفَرْتُ لِعَبْدي، ثُمَّ أصابَ ذَنْباً فَقالَ: رَبِّ أذْنَبْتُ آخَرَ فاغْفِرْ لي قالَ: أعَلِمَ عَبْدي أنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَ يَأخُذُ بِهِ؟ قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدي فَلْيَعْمَلْ ما شاءَ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٢١٠٣) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بەندەیەك توشی گوناهێك بوو، ووتی: پەروەردگارم گوناهم کرد لێم ببورە، پەروەردگاریش فەرمووی: بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان دەبورێت و دەشیگرێت لە سەری، ئەوا لە بەندەکەم بورام. پاشان هێندەی کە خوا ویستی مایەوە و پاشان گوناهێکی کردەوە. ئینجا وتی:پەروەردگارم گوناهێکی ترم کردەوە جا لێم ببورە. خوایش فەرمووی: ئەوە بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان دەبورێت و دەشیگرێت لە سەری، ئەوا لەو بەندەیەم بورام. پاشان گوناهێکی کردەوە پاشان وتی: پەروەردگارم گوناهێکی ترم کرد جا لێم ببورە. فەرمووی: بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان دەبورێت و دەشیگرێت لە سەری، ئەوا لە بەندەکەم خۆش بووم با ئیتر چی دەوێت با بیکات ).

## ( ٢ ) ( لێبوردنی خوا لەسەر بەندەکانی )

**(١١١١) ( ت الضياء ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): « قال الله تعالى: يا ابْنَ آدَمَ! إنَّكَ ما دَعَوْتَني وَ رَجَوْتَني غَفَرْتُ لَكَ عَلى ما كانَ مِنْكَ و لا أُبالي، يا ابْنَ آدَمَ! لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنانَ السَّماءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَني غَفَرْتُ لَكَ، يابْنَ آدمَ! لَوْ أنَّكَ أتَيْتَني بقُرابِ الأرْضِ خَطايَا ثُمَّ أتَيْتَني لا تُشْرِكُ بي شَيْئاً لأتَيْتُكَ بقُرابِها مَغْفِرَةً ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٣٧) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە فەرموویەتی:ئەی بەنی ئادەم هەتا تۆ هاوارم بۆ بکەیت و تکام لێ بکەیت، من ئەوەی کە کردوتە لێت دەبوورم و باکم نییە،ئەی بەنی ئادەم ئەگەر تاوانەکانتان بگەنە هەورەکانی ئاسمان و پاشان داوای لێبوردنم لێ بکەیت لێت دەبورم، ئەی بەنی ئادەم ئەگەر پڕ بە پڕی زەوی گوناهم بۆ بهێنیت پاشان بگەڕێیتەوە لام و هیچ شتێکت نەکردبێت بە شەریك و هاوتام، ئەوا منیش پڕ بە پڕی ئەو لێبوردنت بۆ دێنم ).

(١١١٢) ( طب ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالَى: يَاابْنَ آدَمَ! مَهْمَا عَبَدْتَنِي وَ رَجَوْتَنِي وَلَم تُشْرِكْ بِي شَيْئاً غَفَرْتُ لَكَ مَا كَانَ مِنْكَ ،وَ إِنْ اسْتَقْبَلْتَنِي بِمِلْءِ السَّمَاءِ وَ الأَرْضِ خَطايَا وَ ذُنُوباً اسْتَقْبَلْتُكَ بِمِلْئِهِنَّ مِنْ الْمَغْفِرَةِ وَ أَغْفِرُ لَكَ وَ لا أُبالِي ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٤٠) في صحيح الجامع

ابو الدرداء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە فەرموویەتی:ئەی بەنی ئادەم هەر چەندێك تۆ بمپەرستیت و تكام لێ بكەیت و هیچ شتێك بە شەریكم بڕیار نەدەیت ،ئەوا منیش هەرچی كە تۆ كردبێتت لێت دەبورم ،وە ئەگەر بە پڕی ئاسمان و زەوی لە گوناهو تاوان بێیتەوە رووم منیش بە پڕی ئەولە لێبوردن پێشوازیت دەكەم وە لێت دەبورم و هیچ باكیشم نییە ).

## ( ٣ ) ( ئەو كەسەی كە لەسەر شەریك بۆ خوا بڕیاردان بمرێت )

(١١١٣) ( د ) عن أبي الدرداء ( حم ن ك ) عن معاوية قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إِلاَّ مَنْ مَاتَ مُشْرِكَاً أَوْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّدا ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٥٢٢) في صحيح الجامع

ابو الدرداء و معاوية دەڵێن: كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەموو گوناهێك ئومێد هەیە كە خوا لێی ببورێت، تەنها كەسێك نەبێت كە بە موشریكی بمرێت، یان بڕوادارێك بە دەستی ئەنقەست بڕوادارێكی تری كوشتبێت ).

## ( ٤ ) ( پێ خۆش بوونی خوای گەورە بە تۆبەی بەندەی خۆی )

(١١١٤) ( حم م ) عن البراء قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ كَيْفَ تَقُولُونَ بِفَرَحِ رَجُلٍ انْفَلَتَتْ مِنْهُ رَاحِلَتُهُ تَجُرُّ زِمَامَهَا بِأَرْضٍ قَفْرٍ لَيْسَ بِها طَعامٌ وَ لا شَرابٌ وَ عَلَيْهَا لَهُ طَعامٌ وَ شَرابٌ، فَطَلَبَهَا فَلَمْ يَجِدْهَا حَتى شَقَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ مَرَّتْ بِجِذْلِ شَجَرَةٍ فَتَعَلَقَ زِمَامُها، فَوَجَدَها مُتَعَلِّقَةً بِه؟ ﴾، قُلْنا: شَدِيداً، يَارَسُولَ اللهِ(ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ﴿ أَمَا، وَ اللهِ للهُ أَشَدُّ فَرَحاً بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنَ الرَّجُلِ بِرَاحِلَتِه ﴾. و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٥٧٠) في صحيح الجامع

البراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( چی دەڵێن دەربارەی خۆشحاڵی پیاوێك كە وڵاخەكەی لەدەست دەرچێت لغاوەكەی رابكێشێت لە خاكێكی چۆڵدا كە نە خواردن و نە خواردنەوەی تێدا نەبێت، وە خواردن و خواردنەوەكەیشی لەسەر پشتی وڵاخەكەی بێت، ئەمیش هەر شوێنی بكەوێت و هەوڵی گرتنەوەی بدات هەتا تەواو توشی زەحمەت دەبێت، پاشان بە لای قەدە دارێك وڵاخەكەی تێدەپەڕێت و لغاوەكەی پێوە گیر دەبێت، ئەویش دەیدۆزێتەوە و دەبینێت وا بە لقی دارەكەوە گیر بووە؟ )، وتیان: هەر

زۆر خۆشحاڵ دەبێ ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: ( دەی سوێند بە خوا، خۆشیەکەی خوا زیاترە بە تۆبەی بەندەکەی خۆی، لە خۆشی ئەو پیاوە لە هاتنەوەی وڵاخەکەی ).

**(١١١٥) ( حم م ) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ للهُ أَشَدّ فَرحاً بِتَوْبَةِ عَبْدِه مِنْ رَجُلٍ حَمَلَ زَادَهُ وَ مَزَادَهُ عَلى بَعِيْرٍ، ثُمَّ سَارَ حَتّى كَانَ بِفَلاةٍ مِنْ الأَرْضِ، فَأَدْرَكَتْهُ القَائِلَةُ، فَنَزَلَ فَقَالَ تَحْتَ الشَّجرَةِ فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ وَ انْسَلَ بَعِيْرُهُ، فَاسْتَيْقَظَ فَسعَى شَرفاً فَلَمْ يَرَ شَيْئاً، ثُمَّ سَعى شَرفاً ثَانِياً فَلَمْ يَرَ شَيْئاً ثُمّ سَعىَ شَرفاً ثَالِثاً فَلَمْ يَرَ شَيْئاً فَأَقْبَلَ حَتّى أَتَى مَكانَهُ الّذي قَالَ فِيْه فَبَيْنَما هُوَ قَاعِدٌ إِذْ جَاءَهُ بَعِيْرُهُ يَمْشِي حَتّي وَضَعَ خِطَامَهُ فِي يَدِه فَاللهُ أَشَدُّ فَرحاً بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ، مِنْ هَذا حِيْنَ وَجَدَ بَعِيْرَهُ عَلىَ حَالِه ﴾. و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٠٩٦ ) في صحيح الجامع**

نعمان کوڕی بەشیر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پێخۆش بوونی خوا بە تۆبەی بەندەکەی زیاترە لە پیاوێك کە توێشوەکەی و هەرچییەکی هەیە لەسەو وشترێك هەڵیگرتووە، پاشان بەڕێ دەکەوێت هەتا دەگاتە خاکێکی چۆڵەوانی، نیوەڕۆ خەو زۆری بۆ دەهێنێت و، ئەویش لە ژێر سێبەری دارێکدا دادەبەزێت، چاوەکانی خەو دەیباتەوە و، وشترەکەشی دەردەچێت، کە لە خەو هەڵدەسێت بەرەو تەپۆڵکەیەك دەڕوات و دەڕوانێت و هیچ شتێك نابینێت، پاشان رادەکاتە سەر تەپۆڵکەیەکی تر و هەر هیچ شتێك نابینێت، پاشان رادەکات بەرەو تەپۆڵکەی سێهەم و هەر هیچ نابینێت، پاشان دەگەڕێتەوە هەتا دێتە ئەو شوێنەی کە سەرخەوەکەی تێدا شکاند،، جا کاتێك دانیشتبوو ئەوەندەی زانی وشترەکەی هاتەوە بۆ لای، هەتا لغاوەکەی خستە ناو دەستی، جا خۆشیەکەی خوا بە تۆبەکردنی ئەو بەندەیە زیاترە، لەو کابرایە کاتێك کە وشترەکەی لەسەر حاڵەکەی خۆی دۆزیەوە ).

**(١١١٦) ( م ) أبو هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقُولُ الله تَعالىَ: أَنَا عِنْدَ ظَنّ عَبْدِي بِي وَ أَنَا مَعَهُ حِيْنَ يَذْكُرُنِي، إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِه ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَ إِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ هُم خَيْرٌ مِنْهُمْ، وَ إِنْ تَقَرّبَ مِنيَ شِبْراً تَقَرّبْتُ إِلَيْه ذِراعاً، وَ إِنْ تَقَرّبَ إِليَ ذِراعاً تَقَرّبْتُ إِلَيْه بَاعاً وَ إِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨١٣٧ ) في صحيح الجامع**

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە دەفەرموێت: من لە ئاست ئەو گومانەدام کە بەندەکەم پێم دەبات، وە من لەگەڵی دام کاتێك زیکر و یادم دەکات ،ئەگەر لە نەفسی خۆیدا یادی کردم، منیش لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا یاد و باسی کردم، ئەوا منیش لە ناو کۆمەڵێکی کە لەوان باشترن یادی دەکەم و باسی دەکەم،وە ئەگەر بستێك خۆی لێم نزیك کردەوە ،من باڵێك خۆمی لێ نزیك دەکەمەوە، وە ئەگەر باڵێك خۆی لێم نزیك کردەوە، من باوەشێك خۆمی لێم نزیك دەکەمەوە، وە ئەگەر بە رۆیشتن هات بەرەو لای من، من بە راکردن دێم بۆ لای ).

## ( ٥ ) ( هان دان لەسەر تۆبە كردن )

**(١١١٧) ( هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ أَخْطَأْتُمْ حَتَّى تَبْلُغَ خَطَايَاكُمُ السَّمَاءَ ثُمَّ تُبْتُمْ لَتَابَ عَلَيْكُمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٢٣٠) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر خراپەو تاوان بكەن هەتا خراپەكانتان دەگەنە ئاسمان، پاشان تۆبە بكەن، ئەوا تۆبەكەتان وەردەگرێت و لێتان دەبوورێت ).

## ( ٦ ) ( كاریگەری تاوانەكان )

**(١١١٨) ( طس الضياء ) عن البراء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا اخْتَلَجَ عِرْقٌ وَلا عَيْنٌ إِلاَّ بِذَنْبٍ وَ مَايَدْفَعُ اللهُ عَنْهُ أَكْثَرُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٠٩) في صحيح الجامع**

البراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ دەمارێك و هیچ چاوێك نیە كە هەڵچێت و راپەڕێت ئیلا بە هۆی گوناهێكەوەیە، وە ئەوەیشی كە خوا لەسەری لادەبات زیاترە ).

### روونكردنەوەی فەرموودەكە :

مەبەستی فەرموودەكە ئەوەیە كە هەر ئازار و ناخۆشییەك كە بەسەر مرۆڤ دێت بە هۆی گوناهەكانیەوەتی، وە خوای گەورەش بە رەحمی خۆی هێشتا بەشی زۆری شوێنەوار و كاریگەری ئەو تاوان و گوناهانەمان لەسەر لادەبات و تەنها كەمێكی لە دونیا پێمان دەنوێنێت، هەر وەك ئەوەی كە خوا پێمان بڵێت: تۆڵەی كەمێك لەو گوناهانەمان پێ نواندیت هەتا بێدار ببیتەوە و لە غەفڵەت راپەڕیت ،ئەگەر نا سزای گەورەترت لەبەر دەمە.

## ( ٧ ) ( تۆبە كردن لە پێش غەرغەرەی مەرگدا )

**(١١١٩) ( ك ) عن رجل قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَابَ إِلىَ اللهِ قَبْلَ أَنْ يُغَرْغِرَ ، قَبِلَ اللهُ مِنْهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦١٣١) في صحيح الجامع**

لە پیاوێكەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر كەسێك تۆبە بكات و بگەڕێتەوە لای خوا، پێش ئەوەی بگاتە غەرغەرەی مردن، ئەوا خوای گەورە لێی وەردەگرێت ).

## ( ٨ ) ( داخستنی دەرگای تۆبە لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە )

**(١١٢٠) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُع الشمس من مَغْرِبِهَا تَابَ اللهُ عَلَيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦١٣٢) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر كەس تۆبە بكات پێش ئەوەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێت، ئەوا خوا تۆبەكەی لێ قبوڵ دەكات ).

## ( ٩ ) ( ئەگەر مرۆڤەكان گوناهیان نەكردایە )

(١١٢١) ( حم م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ الله بِكُمْ وَ لَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ الله تَعالىَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٧٠٧٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سوێند بەوەی كە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر گوناهتان نەكردایە، ئەوا خوا ئێوەی دەبرد و كۆمەڵێكی دەهێنا گوناه بكەن و داوای لێبوردن لە خوای گەورە بكەن و ئەویش لێیان ببورێت ).

# (( بەشی : سوننەتە گەردونی یەکان ))

## (١) ( پە یمان نامەی فیترەت )

(١١٢٢) ( حم ن ك هق في الأسماء ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ أَخَذَ الْمِيْثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنعْمَانَ يَوْمَ عَرفَةَ، وَ أَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذرَأَهَا فَنَـثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِ ثُـمَّ كَلَّمَهُمْ قُبُلاً قَـالَ: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَـالُوا بَلَى ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٠١) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا پەیمان نامەی وەرگرتووە لە پشتی ئادەم لە نعمان و لە رۆژی عەرەفەدا، وە لە پشتی ئەو هێنایە دەرەوە هەموو نەوەیەك کە دەیخاتەوە ،وە پەرش و بڵاوی کردنەوە لە نێوان هەردوو دەستیدا هەر وەك مێرووڵەی وورد پاشان قسەی پێشتری لەگەڵدا کردن و فەرمووی: ( أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ )واتە ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟، وتیان بەڵێ ).

## (٢) ( سەرسام بوون لە کاری بڕوادار )

(١١٢٣) ( حم حل ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَجَبْتُ لِلْمُؤْمنِ إنَّ اللهَ تعالَى لَمْ يَقْضِ لَهُ قَضَاءً إلاَّ كَانَ خَيْراً لَهُ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٣٩٨١) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سەرسامم لە بڕوادار ،خوای گەورە هەر قەزایەکی لەسەر نوسی بێت هەر خێر بووە بۆی ).

## (٣) ( کوشتنی دو پشك )

(١١٢٤) ( هب ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَعَنَ اللهُ الْعَقْرَبَ مَاتَدَعُ نَبِياً وَ لا غَيْرَهُ إلاَّ لَدَغَتْهُم ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٩٨) في صحيح الجامع

علي دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نەفرەتی خوا لە دوپشك بێت ،نە هیچ پێغەمبەرێك و نە غەیری ئەوانیش نابورێت هەر پێوەیان دەدات ).

## روونکردنەوەی فەرموودەکە :

پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ئەم فەرموودەیەی فەرموو کە دوپشکێك بە پەنجەوەی دابوو، وە جامێك ئاوی هێنا و خوێی تێکرد و پەنجە پێوەدراوەکەی خستە ناوی و (قل هو الله احد و معوذتين)ی دەخوێند بەسەریدا هەتا هێور بووەوە.

## (٤) (نێرینه و مێینه چۆن دروست دەبن)

**(١١٢٥) ( م ن ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ وَ مَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ، فَإِذَا اجْتَمَعَا، فَعَلا مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ، أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللهِ، وَ إِذَا عَلا مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٤٨٢) في صحيح الجامع**

**ثوبان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئاوی پیاو سپی‌یە و ئاوی ئافرەت زەردە، جا ئەگەر پێکەوە کۆبوونەوە ،وە تۆوی پیاوەکە سەر تۆوی ئافرەتەکە کەوت، ئەوا نێرینە پێك دێنن بە ئیزنی خوا، وە ئەگەر تۆوی ئافرەتەکە سەر تۆوی پیاوەکە کەوت، ئەوا مێینە پێك دێنن بە ئیزنی خوا ).**

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

**ئەم فەرموودە پیرۆزەش یەکێکە لە موعجزە دەستەوسان کارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە سەردەمی خۆیدا بەڵکو بە درێژایی سەردەمی مرۆڤایەتیش هەتا ئەم سەدەی دوایی‌یە هیچ زانا و پزیشکێك نەیتوانیوە دەرك بەو ڕاستی‌یە بکات کە لە ڕێگەی چ هۆکارێکەوە ڕەگەزی نێر و مێ دەست نیشان دەکرێت و دروست دەبێت، وە هەر لەبەر ئەوەش کە وەڵامی ئەو پرسیارە لەو سەردەمانەدا لای هیچ کەس دەست نەکەوتووە، هەر بۆیە کۆمەڵێك لە حەبر و زانایانی جولەکە ویستیان پرسیارێکی وا لە پێغەمبەر(ﷺ) بکەن کە وەڵامەکەی لای هیچ کەس دەست نەکەوێت هەتا بە حسابی خۆیان دەستەوسانی بکەن و بیسەلمێنن کە (محمد) نەزانە و پێغەمبەری خوا نییە، حاشای ئەو، بۆیە ئەم پرسیارەیان لێکرد کە ئایا چۆن تۆوی ژن و پیاو کوڕ یان کچ پێك دەهێنن؟ پێغەمبەری نەخوێنەواریش کە نەخوێنەواری بۆ هەموو کەس کەم وکوڕییە، تەنها بۆ ئەو نەبێت پلەی کەمال و بەڵگەی ڕاستی پێغەمبەرایەتییەکەیەتی، بە وەڵامێکی کورت و ئاسان وەڵامی دانەوە کە لەگەڵ کورتی و ئاسانیەکەشیدا چەقی ڕاستی دەپێکێت و وەڵامی تەواوی پرسیارەکەشە بە جۆرێك کە عەقڵیەتی سادەی ئەو کاتە پێی قبوڵ دەکرا، وە لە سەردەمی زانست و تەکنەلۆجیای ئەمڕۆشدا، سەرجەم دۆزراوە زانستی‌یەکان (المستكشفات العلمية) گەواهی ڕاستی وەڵامەکەی پێغەمبەری خوان(ﷺ) ، جا با بزانین زانستی ئەمڕۆ چی لەو بارەوە ئاشکرا کردووە و تا چەند لەگەڵ وەڵامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) یەك دەگرنەوە.**

**زانستی ئەمڕۆ ئاشکرای کردووە کە هەر سپێرمێك لە تۆوی پیاو یەکێك لە دوو کرۆمۆسۆمی لەخۆگرتوە کە ئەویش یان (X)وە یان (Y)یە، بەڵام هێلکەی ئافرەت یەك جۆر کرۆمۆسۆمی لە خۆ گرتووە، ئەویش هەر (X)ە، جا کاتێك کە تۆوی ژن و پیاوەکە هەردووکیان کۆدەبنەوە ئەگەر (X) پیاوەکە لەگەڵ(X)ی ئافرەتەکەدا یەکیان گرت، ئەوا کچ پێك دەهێنن، واتە دەبن بە دوو (X) ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێکهێنەری توخمی ئافرەتەکەیە کە بریتی‌یە لە (X) بە واتایەکی زۆر سادە لەم یەك**

گرتنەوەدا (X)ەکان زاڵبوون و مانەوە و(Y)ەکە نەما، واتە تۆوی ئافرەتەکە زاڵبوو بەسەر پیاوەکەدا و ئاکامەکەیشی دروستبوونی کچ بوو .

بەڵام ئەگەر (X)ێکی ئافرەتەکە لەگەڵ (Y)ێکی پیاوەکە یەکی گرت ئەوا(YX) پێك دەهێنن و منداڵەکە دەبێت بە کوڕ کە(YX) خۆی لە خۆیدا بریتیی‌یە لە توخمی پیاو، واتە لە کۆتایی تیکەڵبوونەکەدا هەر توخمی پیاو دروست بووەوە، بە واتایەکی تری سادە کرۆمۆسۆمی (Y)ی پیاوەکە زاڵبووە بەسەر کرۆمۆسۆمی (X)ی ئافرەتەکەداو توانی نێرینەیەك پێك بهێنێت کە هێماکەی (YX) یە.

پێغەمبەریش(ﷺ) بەر لە چواردە سەدە ئەم راستیی‌یە زانستیی‌یەی درکاندووە بە سادەترین و ساکارترین شێوەو بە ئەندازەی یەك پەنجەش لە راستی لای نەداوە، ئەوەتا لە پێشدا روونی دەکاتەوە کە تۆوی پیاو سپییەو تۆوی ئافرەت زەردە، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ جیاوازی پێکهاتەی هەردووکیان،پاشان دەفەرموێت ئەگەر تۆوی پیاوەکە سەرکەوت بەسەر تۆوی ئافرەتەکەدا ئەوا کوڕ دەبێت ،واتە کرۆمۆسۆمی (Y) کە تەنها لە پیاودا هەیە و هێمایە بۆ پیاوەکە ئەگەر لەگەڵ (X)ی ئافرەتەکەدا یەکی گرت ئەوا زاڵ دەبێت بەسەریدا و منداڵەکە کوڕ دەردەچێت، بەڵام ئەگەر کرۆمۆسۆمی (X)ی پیاوەکە لەگەڵ کرۆمۆسۆمی (X)ی ئافرەتەکەدا یەکیان گرت، کە وەك پێشتر وتمان کە ئافرەت هەر کرۆمۆسۆمی (X)ی هەیە ئەوا (XX) دەردەچێت و رەگەزی مێینەکە زاڵ دەبێت و منداڵەکە کچ دەردەچێت.

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) حەقیقەتێکی تریش دەخاتە پاڵ ئەم راستیە زانستیی‌یە کە بەداخەوە گەلێك لە زاناکان چاوی لە ئاستدا دەنوقێنن و ئینکاری دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەوانە کە پێشتر باسمان کرد هیچیان بە بێ ویست و خواست و رەزامەندی خوای گەورە نابێت، ئەمیش بەڵگەیەکی ترە کە پێغەمبەر(ﷺ) زانیاریەکانی هەمووی لە خواوە وەرگرتووە بۆیە هیچ کاتێك هەڵە قبوڵ ناکەن.

(١١٢٦) ( **ابن سعد** ) عن ابن أبي مليكة مرسلا قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَا تَوَفَّى اللهُ نَبِياً قَطّ إلاَّ دُفِنَ حَيْثُ يَقْبِضُ رُوحَهُ** ﴾. ( **حسن** ) أنظر حيث رقم (٥٦٠٤) في صحيح الجامع

إبن ابي ملكية دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا هەرگیز گیانی پێغەمبەرێکی نەکێشاوە ئیلا لەو شوێنەدا سپەردە کراوە کە گیانی تێدا کێشاوە ).

## ( ٥ ) ( روو وەرگێڕ دراوەکان پاشکۆو نەوەیان نابێت )

(١١٢٧) ( **طب** ) عن أم سلمة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **مَا مَسَخَ اللهُ تَعالىَ مِنْ شَيْءٍ فَكَانَ لَهُ عَقْبٌ وَلاَنَسْلٌ** ﴾. ( **صحيح** ) أنظر حيث رقم (٥٦٦١) في صحيح الجامع

ام سلمة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە هیچ شتێکی مەسخ نەکردووە و لە دواتردا پاشماوە و وەچەی هەبوو بێت ).

## ( ٦ ) ( پشت بەستنی بێ هەوڵ و كار نابێت )

(١١٢٨) ( حم ق ٤ ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إلاَّ وَ قَدْ كَتَبَ اللهُ مَكَانَهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَ النَّارِ وَ إلاَّ وَ قَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيْدَةً، قِيْلَ: أَفَلا نَتَّكِلُ؟ قَالَ: لا ،اعْمَلُوا وَ لا تَتَّكِلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِما خُلِقَ لَهُ أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَ أَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٥٧٩٣) في صحيح الجامع

علی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ نەفسێك نییە کە هەناسە بدات، ئیلا خوا لە پێشتردا شوێنەکەی بۆ نوسیوە لە بەهەشت و ئاگردا ،وە ئیلا پێشتر نوسراوە کە سەرگەردانە یان سەرفرازە). وتیان: ئەی بۆ ئیتر پشت بەوە نەبەستین؟ فەرمووی:(نەخێر کار بکەن و پشت بەوە مەبەستن، چونکە هەریەکە ساز کراوە و ئاسان کاری بۆ کراوە بۆ ئەو شتەی کە بۆی دروست کراوە، جا ئەهلی سەرفرازی ئەوا دەرەخسێنرێن بۆ کاری خەڵکانی سەرفراز، وە ئەهلی سەرگەردانیش ئەوا دەرەخسێنرێن بۆ کاری خەڵکانی سەرگەردان ).

## ( ٧ ) ( چێنراوەکانی خوای گەورە لەم ئاینەدا )

(١١٢٩) ( حم هـ ) عن أبي عنبة الخولاني قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَزَالُ اللهُ يَغْرِسُ فِي هَذا الدِّينُ غَرْساً يَسْتَعْمِلَهُمْ فِيْهِ بِطَاعَتِهِ إلىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٦٨٣) في صحيح الجامع

أبو عنبة الخولاني دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بەردەوام خوا لەم ئاینەدا نەمام دەچێنێت، کە لە تاعەت و گوێڕایەڵی خۆیدا بەکاریان دەهێنێت هەتا رۆژی قیامەت ).

### روون کردنەوەی فەرموودەکە :

واتە خوای گەورە کەسانێکی وا بۆ ئایینەکەی دەرەخسێنێت و پێیان دەگەیەنێت کە بەردەوام لە هەوڵی عیبادەت و تاعەت و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوادان و خزمەتی ئاینەکەی دەکەن، وە خوای گەورە بەردەوام نەمامی ئەو جۆرە کەسانە دەچێنێت و هەتا رۆژی قیامەت نمونەیان هەر دەبێت .

## (٨) (خەڵك دوو جۆرن چاکە کار و بەدکار)

(١١٣٠) ( ت ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إنَّ اللهَ قَدْ أذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِيَّةُ الْجَاهِلِيَّةِ وَ تَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا، فَالنَّاسُ رَجُلانِ: رَجُلٌ بَرٌ تَقِيٌ كَرِيْمٌ عَلىَ اللهِ، وَ فَاجِرٌ شَقِيٌ هَيْنٌ عَلىَ اللهِ وَ النَّاسُ بَنُو آدَمَ وَ خَلَقَ اللهُ آدَمَ مِنْ التُّرَابِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٦٦) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەی خەڵكینە ئەوا خوای گەورە خۆ بەزل گرتنی سەردەمی نەفامی و خۆ هەڵكێشان بە باو باپیرانەوەی لێ لابردوون، جا ئەو خەڵكە یەكێك لە دوو پیاون: پیاوێكی چاكەكاری پارێزكاری بەڕێز لای خوا، وە پیاوێكی بەدكاری سوك و بێ نرخ لای خوا، وە ئەو خەڵكەش نەوەی ئادەمن، وە خوای گەورەش ئادەمی لەو خۆڵە دروست كردووە ).

## ( ٩ ) ( خێر و شەڕ )

**(١١٣١) ( هـ ) عن معاوية قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْخَيْرُ عَادَةٌ وَ الشَّر لَجَاجَةٌ، مَنْ يُرِدِ الله بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٣٣٤ ) في صحيح الجامع**

معاوية دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( چاكە كردن عادەت و راهاتنە، و خراپەش منجڕی و مل لێنانە، وە هەر كەسێك خوا نیازی خێری پێ‌ی هەبێت ئەوا لە ئایینەكەی تێیدەگەیەنێت و شارەزای دەكات ).

## ( ١٠ ) ( بەرزبوونەوە و كەوتن لە دونیادا )

**(١١٣٢)( حم خ د ن ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَانَتِ الْعَضْبَاءُ لاتُسْبَقُ فَجَاءَ أَعْرَابِيَ عَلَى قَعُود لَهُ فَسَابَقَهَا فَسَبَقَهَا الأَعْرَابِيَ فَكَأَنَّ ذَلِكَ شَقَّ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ الله(ﷺ) فَقَالَ: حَقٌّ عَلَى الله أَنْ لايَرْفَعَ شَيْئاً مِنَ الدُّنْيا إِلاَّ وَضَعَهُ ﴾. و اللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٥٧ ) في صحيح الجامع**

انس دەگێڕێتەوە دەڵێ: – العضباء – ووشتری پێغەمبەر(ﷺ) بوو پێش نەدەدرایەوە، هەتا عەرەبێكی دەشتەكی هات بە سوار وشترێكی خۆیەوە پێش كەوتنی لەگەڵ كرد، كەچی عەرەبە دەشتەكیەكە پێشی دایەوە جا دیار بوو كە شتێكی قورس و ناخۆش بوو لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: ( حەقی خۆیەتی كە خوای گەورە هەر شتێك لە دونیا بەرز بكاتەوە ئیلا نزمی بكاتەوە و دایبنێتەوە ).

# ( بەشی : فیتنەکان و نیشانەکانی ڕۆژی دوایی )

تێبینی: بۆ شەرح و تیگەیشتنی زیاتری فەرموودەکانی ئەم بەشە بگەڕێرەوە بۆ کتێبێکی ترمان بە ناوی ( نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی ).

## ( ١ ) ( ئەو شوێنانەی کە لە ئاخرزەماندا موسڵمان فە تحیان دەکەنەوە )

(١١٣٣) ( حم م هـ ) عن نافع بن عتبة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **تَغْزُونَ جَزِيْرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا الله ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا الله ثُمَّ تَغْزُوْنَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا الله ثُمَّ تَغْزُوْنَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ الله** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٩٦٤ ) في صحيح الجامع

نافع ی کوڕی عتبة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( غەزای دورگەی عەرەب دەکەن و خوای گەورە فەتحی دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن و خوای گەورە فەتحی دەکات، وە غەزای دەجال دەکەن و خوای گەورە فەتحی دەکات).

## ( ٢ ) ( فیتنەی دونیا )

(١١٣٤) ( طب ) عن عبدالله بن يزيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **جَعَلَ الله عَذابَ هَذِهِ الأُمَّةَ فِي دُنْيَاهَا** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٠٩٥ ) في صحيح الجامع

عبدالله کوڕی یزید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا عەزاب و ئەشکەنجەی ئەم ئومەتەی خستۆتە دونیاوە ).

## ( ٣ ) ( خەلیفایەتی پاشان پاشایەتی )

(١١٣٥) ( دك ) عن سفينة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **خلافة النبوة ثلاثون سنة ثُمَّ يُؤتِي اللهُ المُلكَ مَن يَشَاءُ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٢٥٥ ) في صحيح الجامع

سفینە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خەلیفایەتی و جێنشینی پێغەمبەرایەتی سی ساڵە ،پاش ئەوەش خوا موڵك دەداتە هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت ).

## ( ٤ ) ( دانەبران لە کۆمەڵی موسڵمانان )

(١١٣٦) ( ن حب ) عن عرفجة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **إِنَّهُ سَيَكُونُ بَعْدِي هَنَاتٌ وَ هَنَاتٌ فَمَنْ رَأَيْتُمُوهُ فارق ،لجَمَاعَةَ أَوْ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ(ﷺ) كَائِناً مَنْ كَانَ فَاقْتُلُوهُ، فَإِنَّ يَدَ**

الله مع الجماعة و إن الشيطان مع من فارق الجماعة يركض ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٦١٣) في صحيح الجامع

عرفجة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە دوای من وەهاو وەها دەبێت، جا هەر کەسێك کە بینیتان لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بووەوە، یان بیەوێت کاری ئومەتی محمد(ﷺ) پەرتەوازە بکات، ئەوا هەر کەسێك بێت بیکوژن، چونکە دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایەو شەیتانیش لەگەڵ ئەو کەسەدا رادەکات کە لە جەماعەت دابڕاوە ).

## ( ٥ ) ( فیتنەی ( خوارج ) ـەکان )

(١١٣٧) ( ق ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): « سيخرج في آخر الزمان قوم أحداث الأسنان سفهاء الأحلام يقولون من خير قول البرية يقرؤن القرآن لا يجاوز حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية فإذا لقيتموهم فاقتلوهم فإن في قتلهم أجراً لمن قتلهم عند الله يوم القيامة ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٦٤٦) في صحيح الجامع

علی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە ئاخر زەماندا کۆمەڵێکی تەمەن منداڵ سەرهەڵدەدەن، خەون و ئاواتەکانیان پوچ و بێ نرخە، لە باشترین قسەکانی خەڵك دەڵێنەوە، قورئان دەخوێنن ،لە گەروویان تێپەڕ ناکات، لە ئاین دەردەچن هەر وەك چۆن تیر نێچیرەکەی دەسمێت و لێی دەردەچێت، جا ئەگەر پێیان گەیشتن ئەوا بیان کوژن، چونکە کوشتنیان خێر و پاداشتی تێدایە بۆ هەر کەسێك کە بیان کوژێت لە لای خوا لە رۆژی قیامەتدا ).

(١١٣٨) ( حم د ) عن عبدالله بن حوالة قال: قال رسول الله(ﷺ). « سيصير الأمر إلى أن تكونوا جنوداً مجندة، جند بالشام و جند باليمن و جند بالعراق ». قال ابن حوالة :خر لي يا رسول الله إن أدركت ذلك. فقال: « عليك بالشام، فإنها خيرة الله من أرضه، يجتبي إليها خيرته من عباده فأما إذا أبيتم فعليكم بيمنكم و اسقوا من غدركم فإن الله قد توكل لي بالشام و أهله ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٦٥٦) في صحيح الجامع

عبد الله کوڕی حواله دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کارەکە وای لێ دێت کە ببن بە لەشکری ساز کراو: لەشکرێك لەشام، وە لەشکرێك لە یەمەن، وە لەشکرێك لە عێراق ) إبن حوالة وتی:دەی بۆم هەڵبژێرە ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر کەوتمە ئەو کاتە، ئەویش فەرمووی: ( ئەوی شام بگرە ،چونکە ئەوان هەڵبژێردراوەکانی خوان لە زەویەکەیدا، وە هەڵبژاردەی بەندەکانی خۆیشی بۆ راکێش دەکات، خۆ ئەگەر هەر لەگەڵ ئەوانیشدا نەبوون، ئەوا خۆ بگەیەننە ئەوەی یەمەنتان و لە حەوزە ئاوەکانیشتان ئاوی خەڵك بدەن، چونکە خوا شام و خەڵکەکەیی بۆ زامن کردووم ).

## ( ٦ ) ( فیتنەی دەجال )

**(١١٣٩) ( خ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ما بُعثَ نَبيٌ إلاَّ قَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الدَجَّالَ أَنْذَرَهُ نُوح وَ النَبِيّونَ منْ بَعْده وَ إنَهُ يَخْرُجُ فيكُمْ فَما خُفِيَ عَلَيْكُمْ منْ شَأنه فَلَيْسَ يَخْفى عَلَيْكُمْ إنَّ رَبّكُمْ تَعَالَى لَيْسَ بَأعور، وَ إنَهُ أَعْوَرُ العَيْنِ الْيُمْنى كَأَنَّ عَيْنَهُ عنَبَةٌ طَافِيَةٌ ،ألا إنَ الله حَرَمَ عَلَيْكُمْ دماءَكُمْ وَ أَمْوالَكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمكُمْ هَذا في بَلَدكُمْ هَذا في شَهْركُمْ هَذا ألا هَلْ بَلَّغْتُ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ ثَلاثاً وَيحَكُمْ! انْظُرُوا لا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْض ﴾.** ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٦٨ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیلا ئومەتەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە لە دەجال، نوح و پێغەمبەرانی تر لە دوای ئەوەوە هەموویان هۆشیاریان داوە، جا ئەم دەجالە هەر لە ناو ئێوەدا سەر هەڵدەدات، جا هەر شتێکی ئەو دەجالە ئەگەر لە ئێوە شاراوە بێت، بەڵام خۆ لاتان شاراوە نابێت کە پەروەردگاری گەورەی ئێوە کوێر نییە، بەڵام ئەو چاوی راستی کوێرە چاوی هەر دەڵێی دەنکە ترێ‌ی سەر ئاو کەوتووە، ئیتر ئەوا خوای گەورە خوێنتان و ماڵتانی حەرام کردووە لەسەرتان هەر وەك حورمەتی ئەم رۆژەتان، لە ئەم شارەتاندا، لە ئەم مانگەتاندا، جا ئیتر ئەوە پێم گەیاندن؟ خوای من بە شایەت بە - سێ جار - واوەیلا بۆ ئێوە لە دوای من نەگەڕێنەوە ببنەوە بێ باوەڕ ، هەندێکتان لە گەردنی هەندێکی ترتان بدات ).

**(١١٤٠) ( حم ق د ت ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا بَعَثَ اللهُ مِنْ نَبِيَ إلاَّ قَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الدَجَّالَ الأعْوَرَ الْكَذَّابَ ألا وَ إنَهُ أَعْوَرُ وَ إنَ رَبّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْه كَافِر ﴾.**
( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٥٧٧ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ پێغەمبەرێك نەنێردراوە ئیلا هەر ئومەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە دەجالە کوێری درۆزن، جا ئەو بێگومان کە کوێرە، ئێوە پەروەردگاری گەورەتان کوێر نییە، وە ئەو لە نێوان هەردوو چاویدا نوسراوە کافر ).

**(١١٤١) ( حم م ت ) عن النواس بن سمعان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُ لى عَلَيْكُمْ إنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فيكُمْ فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسه وَاللَّهُ خَلِيفَتِى عَلَى كُلِّ مُسْلم إنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ عَيْنُهُ قَائِمَةٌ شَبِيهٌ بِعَبْد الْعُزَّى بْن قَطَنٍ فَمَنْ رَآهُ مِنْكُمْ فَلْيَقْرَأْ فَوَاتِحَ سُورَة أَصْحَاب الْكَهْف قَالَ يَخْرُجُ مَا بَيْنَ الشَّام وَالْعرَاقِ فَعَاثٍ يَمِينًا وَشِمَالاً يَا عبَادَ اللَّه اثْبُتُوا ›. قَالَ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّه وَمَا لُبْثُهُ فِى الأَرْضِ قَالَ ‹ أَرْبَعِينَ يَوْمًا يَوْمٌ كَسَنَةٍ وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسَائِرُ أَيَّامهُ كَأَيَّامكُمْ ›. قَالَ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّه أَرَأَيْتَ الْيَوْمَ الَّذِى كَالسَّنَة أَتَكْفِينَا فِيه صَلاَةُ يَوْم قَالَ ‹ لاَ وَلَكن اقْدُرُوا لَهُ ›. قَالَ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّه فَمَا سُرْعَتُهُ فِى الأَرْضِ قَالَ ‹ كَالْغَيْث اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ فَيَأْتِى الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيُكَذِّبُونَهُ وَيَرُدُّونَ عَلَيْه قَوْلَهُ فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ فَتَتْبَعُهُ**

أَمْوالهُمْ فَيُصْبِحُونَ لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ ثُمَّ يَأْتِي الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ وَيُصَدِّقُونَهُ فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطِرَ فَتُمْطِرَ وَيَأْمُرُ الأَرْضَ أَنْ تُنْبِتَ فَتُنْبِتَ فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ كَأَطْوَلِ مَا كَانَتْ ذُرًى وَأَمَدِّهِ خَوَاصِرَ وَأَدَرِّهِ ضُرُوعًا قَالَ ثُمَّ يَأْتِي الْخَرِبَةَ فَيَقُولُ لَهَا أَخْرِجِي كُنُوزَكِ فَيَنْصَرِفُ مِنْهَا فَتَتْبَعُهُ كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ ثُمَّ يَدْعُو رَجُلاً شَابًّا مُمْتَلِئًا شَبَابًا فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جِزْلَتَيْنِ ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ يَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ يَضْحَكُ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ هَبَطَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ بِشَرْقِيِّ دِمَشْقَ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ وَاضِعًا يَدَيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ قَالَ وَلاَ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ يَعْنِي أَحَدٌ إِلاَّ مَاتَ وَرِيحُ نَفَسِهِ مُنْتَهَى بَصَرِهِ قَالَ فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ فَيَقْتُلَهُ قَالَ فَيَلْبَثُ كَذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ. قَالَ ثُمَّ يُوحِي اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ حَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ فَإِنِّي قَدْ أَنْزَلْتُ عِبَادًا لِي لاَ يَدَانِ لأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ . قَالَ وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَهُمْ كَمَا قَالَ اللَّهُ ( مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ ). قَالَ فَيَمُرُّ أَوَّلُهُمْ بِبُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ فَيَشْرَبُ مَا فِيهَا ثُمَّ يَمُرُّ بِهَا آخِرُهُمْ فَيَقُولُ لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ ثُمَّ يَسِيرُونَ حَتَّى يَنْتَهُوا إِلَى جَبَلِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَيَقُولُونَ لَقَدْ قَتَلْنَا مَنْ فِي الأَرْضِ هَلُمَّ فَلْنَقْتُلْ مَنْ فِي السَّمَاءِ. فَيَرْمُونَ بِنُشَّابِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرُدُّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ نُشَّابَهُمْ مُحْمَرًّا دَمًا وَيُحَاصَرُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَأَصْحَابُهُ حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ يَوْمَئِذٍ خَيْرًا لأَحَدِهِمْ مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ الْيَوْمَ. قَالَ فَيَرْغَبُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ إِلَى اللَّهِ وَأَصْحَابُهُ قَالَ فَيُرْسِلُ اللَّهُ إِلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى مَوْتَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ قَالَ وَيَهْبِطُ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ فَلاَ يَجِدُ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلاَّ وَقَدْ مَلأَتْهُ زَهَمَتُهُمْ وَنَتَنُهُمْ وَدِمَاؤُهُمْ قَالَ فَيَرْغَبُ عِيسَى إِلَى اللَّهِ وَأَصْحَابُهُ قَالَ فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ الْبُخْتِ قَالَ فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ بِالْمَهْبِلِ وَيَسْتَوْقِدُ الْمُسْلِمُونَ مِنْ قِسِيِّهِمْ وَنُشَّابِهِمْ وَجِعَابِهِمْ سَبْعَ سِنِينَ قَالَ وَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَطَرًا لاَ يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ وَبَرٍ وَلاَ مَدَرٍ قَالَ فَيَغْسِلُ الأَرْضَ فَيَتْرُكُهَا كَالزَّلَفَةِ قَالَ ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ أَخْرِجِي ثَمَرَتَكِ وَرُدِّي بَرَكَتَكِ. فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ الْعِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ حَتَّى إِنَّ الْفِئَامَ مِنَ النَّاسِ لَيَكْتَفُونَ بِاللَّقْحَةِ مِنَ الإِبِلِ وَإِنَّ الْقَبِيلَةَ لَيَكْتَفُونَ بِاللَّقْحَةِ مِنَ الْبَقَرِ وَإِنَّ الْفَخِذَ لَيَكْتَفُونَ بِاللَّقْحَةِ مِنَ الْغَنَمِ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا فَقَبَضَتْ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَيَبْقَى سَائِرُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ كَمَا تَتَهَارَجُ الْحُمُرُ فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ ﴾. و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤١٦٢) في صحيح الجامع

النواس ی کوڕی سمعان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من لە غەیری دەجال زیاتر ترسم هەیە لەسەرتان ئەگەر ئەو بێت و من لەناوتاندا بم ئەوا من بەربەست و ڕێگری دەبم کە نەتانگاتێ، وە ئەگەر هات و من لەناوتاندا نەبووم، ئەوا با هەر کەسێك پارێزەر و بەرگری کاری نەفسی خۆی بێت، وە خواش خەلیفەمە لەسەر هەموو موسڵمانێك، جا دەجال گەنجێکە قژی زۆر لوولە، چاوی دەرتۆقیوە و کوژاوەیە، شێوەی هەر لە ( عبد العزی ی کوڕی قَطَنْ ) دەچێت، جا هەر کەسێك لە ئێوە بینی با سەرەتاکانی سورەتی (اصحاب الکهف) بخوێنێت ) فەرمووی: ( لە نێوان شام و عێراقدا دەردەچێت، بە ڕاست و چەپدا خراپەکاری دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆتان ڕاگرن ). وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری

خوا ماوەی چەند دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: ( چل ڕۆژ، ڕۆژێکیان وەك ساڵێك، وە ڕۆژێکیان وەك مانگێك، وە ڕۆژێکیان وەك هەفتەیەك ،وە باقی ڕۆژەکانی تری هەر وەك ڕۆژەکانی خۆتان وایە )، دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا باشە ئەو ڕۆژەی کە وەك ساڵێك وایە ئایا نوێژی یەك ڕۆژی تێدا بەسە بۆمان؟ فەرمووی: ( نەخێر، بەڵکو ئەندازەی بۆ بکەن و بیپێون )، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا خێراییەکەی لە زەویدا چەندە؟ فەرمووی: ( وەك هەور وایە کە با پاڵی پێوەبنێت، جا دێتە لای کۆمەڵێك بانگەوازیان دەکات، ئەوانیش بەدرۆی دەخەنەوە و قسەکەی ڕەد دەدەنەوە ، ئەویش بەجێیان دەهێڵێت، کەچی هەچی ماڵو سامانیان هەیە شوێنی دەکەوێت، کە دەبینن هیچیان بەدەستەوە نەماوە. پاشان دێتە لای کۆمەڵێکی تر و بانگەوازیان دەکات، ئەوانیش بەدەمیەوە دەچن و باوەڕ پێدەکەن. ئەویش فەرمان دەکات بە ئاسمان کە ببارێت ئەویش دەبارێت، وە فەرمان دەکات بە زەوی کە سەوز ببێت، ئیتر کە ئاژەڵەکانیان دەگەڕێتەوە لایان لە هەموو کاتێك زیاتر پشتیان پان و بەرزە و ناوقەدیشیان لە هەموو کاتێك زیاتر پانترە لە تێریدا، گوانیشیان لە هەموو کات زیاتر پڕ شیرترە ). فەرمووی: ( پاشان دێتە لای کەلاوە ڕوخاوێك و پێی دەڵێ: کەنز و زێڕەکەت بهێنە دەرەوە، جا بەجێی دەهێڵێت هەرچی گەنجینەی زێڕی تێدا بوو وەك مێش و هەنگ شوێنی دەکەوێت، پاشان پیاوێکی گەنجی پڕ لە چالاکی و گەنجێتی بانگ دەکات و بە شمشێرەکەی لێ ی دەدات و دەیبڕێت و دەیکات بە دوو کەرتەوە. پاشان بانگی دەکاتەوە کەچی کابرا دێتەوە دەموچاوی دەگەشێتەوە و پێ دەکەنێت، جا لە کاتێکدا ئەو ئاوایە ئیتر عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت و لە خۆر هەڵاتی دیمەشق لە لای منارە سپییەکە لە نێوان دوو بەرگە پۆشاکدا کە بە زەعفەران ڕەنگ کراوە، هەردوو دەستی خستۆتە سەر باڵی دوو فریشتە کە سەری دادەنەوێنێت ئاوی لێ دەتکێت و کە بەرزیشی دەکاتەوە هەر وەك دەنکە مرواری پیپایدا شۆڕ دەبێتەوە )، فەرمووی: ( هیچ کەسێکی بێباوەڕنییە کە بۆنی هەناسەکەی بکات ئیلا دەمرێت. وە بۆنی هەناسەکەیشی هەتا چاوی بڕ دەکات دەڕوات )، فەرمووی: ( شوێنی دەجال دەکەوێت هەتا لە لای دەرگای ( لد) دەیگرێت و دەیکوژێت )، فەرمووی: ( ئیتر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە - واتە عیسا - هێندەی کە خوا بیەوێت )، فەرمووی: ( پاشان خوای گەورە وەحی بۆ دەنێرێت کە بەندەکانم سەربخە بۆ کێوی طور چونکە من کۆمەڵە بەندەیەکی خۆمم دابەزاندووە کە هیچ کەس دەسەڵات و توانای شەڕکردنی نیە لەگەڵیاندا )، فەرمووی: ( وە خوای گەورە یأجوج و مأحوج دەنێرێت هەر وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾، ئەوانە لە هەموو بەرزاییەکەوە شۆڕ دەبنەوە )، فەرمووی: ( جا سەرەتاکەیان بە لای دەریاچەی (طبرية) دا تێپەر دەبێت و هەرچیەکی تێدا هەیە دەیخۆنەوە، پاشان کۆتاییەکەبانی پێدا تێپەردەبێت و دەڵێن: جارێکیان ئالێرەدا ئاوی تێدابوو. پاشان دەڕۆن هەتا دەگەنە چیای ( بيت المقدس ) و دەڵێن: ئەوا هەچی لە زەویدا بوو کوشتمان. دەی با ئەوەی لە ئاسمانیشدایە بیکوژین، ئینجا تیرەکانیان دەگرنە ئاسمان خوای گەورەش تیرەکانیان بۆ دەگەڕێنێتەوە بە خوێن سوور بوون، وە عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵەکانیشی گەمارۆ دەدرێن، هەتا وای لێ دێت کە یەك سەر گا باشترە لەو ڕۆژەدا لە سەد دینار بۆ یەکێکیان لەم ڕۆژەدا ) – مەبەست لە

دیناری زێڕی ئەو کاتەیە – فەرمووی: ( ئیتر عیسای کوڕی مەریەم و هاوڕێکانی داوای یارمەتی و کۆمەك لە خوا دەکەن )، فەرمووی: ( خوای گەورەش کرمێك دەنێرێت بۆ ملیان، هەر هەموویان بە جارێك وەك مردنی یەك کەس قڕدەکەن )، فەرمووی: ( ئینجا عیسا و هاوەڵەکانی دێنە خوارەوە و جێگای یەك بستی دەست ناکەوێت ئیلا پڕ بووە لە چەوری و بۆگەنیان و خوێنیان )، فە ووی: ( ئینجا عیساو هاوڕێکانی لە خوا دەپاڕێنەوە )، فەرمووی: ( خوایش باڵندەیەك دەنێرێتە سەریان هەر دەڵێی ملی حوشترن )، فەرمووی: ( ئینجا هەڵیان دەگرێت و فڕێیان دەداتە شوێنی تیاچونیان، وە موسڵمانان حەوت ساڵ بە تیر و کەوان و جوعبەکانیان ئاگردەکەنەوە )، فەرمووی: ( وە خوا بارانێك دەنێرێتە سەریان کە هیچ خانوویەکی دروست کراو نە لە بەرد و نە لە مووی ئاژەڵ ( خێوەت ) ناتوانێت بەری بگرێت )، فەرمووی: ( ئیتر بە جۆرێك زەوی دەشوات هەتا وەك ئاوێنەی لێ دەکات )، فەرمووی: ( پاشان بە زەوی دەوترێ: بەرو بومەکەت بهێنە دەرەوە، وە بەرەکەتەکەی خۆیشت بگێرەرەوە، ئیتر ئەو کات وای لێدێت کە بە کۆمەڵێك یەك هەناریان پێ دەخورێت، وە دەچنە ژێر سێبەری تویکڵەکەی، وە بەرەکەت دەخرێتە شیری ئاژەڵەوە هەتا وای لێدێت کە کۆمەڵێك لە خەڵك یەك وشتری شیردەر بەشیان دەکات، وە هۆزێك مانگایەکی شیردەر بەشیان دەکات، وە خێڵێك یەك مەڕی شیردەر بەشیان دەکات. جا لەو کاتەدا کە ئەوان بەو شێوەیەن، خوای گەورە بایەك دەنێرێت و گیانی هەموو باوەڕدارێك دەکێشێت، ئیتر باقی ئەو خەڵکەی تر کە دەمێننەوە، ئەوانیش سواری یەکتر دەبن هەر وەك چۆن گوێدرێژ سواری یەك دەبن، جا ئیتر قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەسێت ).

(١١٤٢) ( هـ ابن خزيمة ك الضياء )عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿يا أيُّها النّاس إنَّهُ لمْ تكُنْ فتْنَةٌ فى الأرْض مُنْذُ ذرأ اللّهُ ذُرّيّةَ آدم أعْظم من فتْنة الدّجّال وإنَّ اللّهَ لمْ يبْعثْ نبيًّا إلاّ حذّر أُمّتهُ الدّجّالَ وأنا آخرُ الأنْبياء وأنْتُمْ آخرُ الأمم وهُو خارجٌ فيكُمْ لا محالةَ وإنْ يخْرُجْ وأنا بيْن ظهْرانيْكُمْ فأنا حجيجٌ لكُلّ مُسْلم وإنْ يخْرُجْ منْ بعْدى فكُلُّ امْرئٍ حجيجُ نفْسه واللّهُ خليفتى على كُلّ مُسْلم وإنَّهُ يخْرُجُ منْ خلَّة بيْن الشّام والعراق فيعيثُ يمينًا ويعيثُ شمالاً. يا عباد اللّه أيُّها النّاسُ فاثْبُتُوا فإنّى سأصفُهُ لكُمْ صفةً لمْ يصفْها إيّاهُ نبيٌّ قبْلى إنَّهُ يبْدأُ فيقُولُ أنا نبيٌّ ولا نبيَّ بعْدى ثُمَّ يُثنّى فيقُولُ أنا ربُّكُمْ. ولا ترون ربَّكُمْ حتّى تمُوتُوا وإنَّهُ أعْورُ وإنَّ ربَّكُمْ ليْس بأعْور وإنَّهُ مكْتُوبٌ بيْنَ عيْنيْه كافرٌ يقْرؤُهُ كُلُّ مُؤْمن كاتب أوْ غيْر كاتب وإنَّ منْ فتْنته أنَّ معهُ جنَّةً ونارًا فنارُهُ جنَّةٌ وجنَّتُهُ نارٌ فمن ابْتُلى بناره فلْيسْتغثْ باللّه ولْيقْرأْ فواتحَ الْكهْف فتكُون عليْه بردًا وسلامًا كما كانت النّارُ على إبْراهيمَ وإنَّ منْ فتْنته أنْ يقُول لأعْرابىّ أرأيْتَ إنْ بعثْتُ لك أباك وأُمّك أتشْهدُ أنّى ربُّك فيقُولُ نعمْ. فيتمثَّلُ لهُ شيْطانان فى صُورة أبيه وأُمّه فيقُولان يا بُنىَّ اتَّبعْهُ فإنَّهُ ربُّك. وإنَّ منْ فتْنته أنْ يُسلَّط على نفْس واحدة فيقْتُلها وينْشُرها بالْمنْشار حتّى يُلْقى شقَّتيْن ثُمَّ يقُولُ انْظُرُوا إلى عبْدى هذا فإنّى أبْعثُهُ الآن ثُمَّ يزْعُمُ أنَّ لهُ ربًّا غيْرى. فيبْعثُهُ اللّهُ ويقُولُ لهُ الْخبيثُ منْ ربُّك فيقُولُ ربّى اللّهُ وأنْت عدُوُّ اللّه أنْت الدّجّالُ واللّه ما كُنْتُ بعْدُ أشدَّ بصيرة بك منّى الْيوْم ﴾ قال أبُو الحسن

الطَّنَافسىُّ فَحدَّثَنَا الْمُحَارِبِىُّ حدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّه بْنُ الْوَلِيد الْوَصَّافىُّ عَنْ عطيَّةَ عَنْ أَبى سَعِيد قَالَ
قَالَ رَسُولُ اللَّه -صلى الله عليه وسلم- « ذَلكَ الرَّجُلُ أَرْفَعُ أُمَّتى دَرجةً فى الْجَنَّة ». قَالَ قَالَ أَبُو
سَعِيد وَاللَّه مَا كُنَّا نُرَى ذَلكَ الرَّجُلَ إلاَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّاب حَتَّى مَضَى لسَبِيله. قَالَ الْمُحَارِبِىُّ ثُمَّ
رَجَعْنَا إِلَى حَدِيث أَبِى رَافِعٍ قَالَ « وَإِنَّ منْ فتْنَته أَنْ يَأْمُرَ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطرَ فَتُمْطر وَيَأْمُرَ الأَرْضَ أَنْ
تُنْبتَ فَتُنْبتَ وَإِنَّ منْ فتْنَته أَنْ يَمُرَّ بِالْحَىِّ فَيُكَذِّبُونَهُ فَلاَ تَبْقَى لَهُمْ سَائمَةٌ إِلاَّ هَلَكَتْ وَإِنَّ منْ فتْنَته أَنْ
يَمُرَّ بِالْحَىِّ فَيُصَدِّقُونَهُ فَيَأْمُرَ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطرَ فَتُمْطر وَيَأْمُرَ الأَرْضَ أَنْ تُنْبتَ فَتُنْبتَ حَتَّى تَرُوحَ
مَوَاشِيهِمْ منْ يَوْمهِمْ ذَلكَ أَسْمَنَ مَا كَانَتْ وَأَعْظَمَهُ وَأَمَدَّهُ خَوَاصرَ وَأَدَرَّهُ ضُرُوعًا وَإِنَّهُ لاَ يَبْقَى شَىْءٌ منَ
الأَرْض إِلاَّ وَطئَهُ وَظَهَرَ عَلَيْه إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ لاَ يَأْتِيهِمَا منْ نَقْب منْ نِقَابِهِمَا إِلاَّ لَقِيَتْهُ الْمَلاَئكَةُ
بِالسُّيُوف صَلْتَةً حَتَّى يَنْزِلَ عنْدَ الظُّرَيْب الأَحْمَر عنْدَ مُنْقَطَع السَّبَخَة فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلهَا ثَلاَثَ
رَجَفَات فَلاَ يَبْقَى مُنَافقٌ وَلاَ مُنَافقَةٌ إِلاَّ خَرَجَ إِلَيْه فَتَنْفى الْخَبَثَ منْهَا كَمَا يَنْفى الْكِيرُ خَبَثَ الْحَديد
وَيُدْعَى ذَلكَ الْيَوْمُ يَوْمَ الْخَلاَص ». فَقَالَتْ أُمُّ شَرِيك بِنْتُ أَبِى الْعُكَر يَا رَسُولَ اللَّه فَأَيْنَ الْعَرَبُ يَوْمَئذ
قَالَ « هُمْ يَوْمَئذ قَليلٌ وَجُلُّهُمْ بِبَيْت الْمَقْدس وَإِمَامُهُمْ رَجُلٌ صَالحٌ فَبَيْنَمَا إِمَامُهُمْ قَدْ تَقَدَّمَ يُصَلِّى بِهِمُ
الصُّبْحَ إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِمْ عيسَى ابْنُ مَرْيَمَ الصُّبْحَ فَرَجَعَ ذَلكَ الإِمَامُ يَنْكُصُ يَمْشى الْقَهْقَرَى ليَتَقَدَّمَ عيسَى
يُصَلِّى بِالنَّاس فَيَضَعُ عيسَى يَدَهُ بَيْنَ كَتفَيْه ثُمَّ يَقُولُ لَهُ تَقَدَّمْ فَصَلِّ فَإِنَّهَا لَكَ أُقيمَتْ. فَيُصَلِّى بِهِمْ
إِمَامُهُمْ فَإِذَا انْصَرَفَ قَالَ عيسَى عَلَيْه السَّلاَمُ افْتَحُوا الْبَابَ. فَيُفْتَحُ وَوَرَاءَهُ الدَّجَّالُ مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْف
يَهُودى كُلُّهُمْ ذُو سَيْف مُحَلًّى وَسَاج فَإِذَا نَظَرَ إِلَيْه الدَّجَّالُ ذَابَ كَمَا يَذُوبُ الْملْحُ فى الْمَاء وَيَنْطَلقُ
هَارِبًا وَيَقُولُ عيسَى عَلَيْه السَّلاَمُ إِنَّ لى فيكَ ضَرْبَةً لَنْ تَسْبقَنى بِهَا. فَيُدْرِكُهُ عنْدَ بَاب اللُّدِّ الشَّرْقىِّ
فَيَقْتُلُهُ فَيَهْزِمُ اللَّهُ الْيَهُودَ فَلاَ يَبْقَى شَىْءٌ ممَّا خَلَقَ اللَّهُ يَتَوَارَى به يَهُودىٌّ إِلاَّ أَنْطَقَ اللَّهُ ذَلكَ الشَّىْءَ لاَ
حَجَرَ وَلاَ شَجَرَ وَلاَ حَائطَ وَلاَ دَابَّةَ - إِلاَّ الْغَرْقَدَةَ فَإِنَّهَا منْ شَجَرهمْ لاَ تَنْطقُ - إِلاَّ قَالَ يَا عَبْدَ اللَّه
الْمُسْلمَ هَذَا يَهُودىٌّ فَتَعَالَ اقْتُلْهُ ». قَالَ رَسُولُ اللَّه -صلى الله عليه وسلم- « وَإِنَّ أَيَّامَهُ أَرْبَعُونَ سَنَةً
السَّنَةُ كَنصْف السَّنَة وَالسَّنَةُ كَالشَّهْر وَالشَّهْرُ كَالْجُمُعَة وَآخرُ أَيَّامه كَالشَّرَرَة يُصْبِحُ أَحَدُكُمْ عَلَى بَاب
الْمَدِينَة فَلاَ يَبْلُغُ بَابَهَا الآخَرَ حَتَّى يُمْسِىَ ». فَقيلَ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّه كَيْفَ نُصَلِّى فى تلْكَ الأَيَّام
الْقصَار قَالَ « تَقْدُرُونَ فيهَا الصَّلاَةَ كَمَا تَقْدُرُونَهَا فى هَذه الأَيَّام الطِّوَال ثُمَّ صَلُّوا ». قَالَ رَسُولُ
اللَّه -صلى الله عليه وسلم- « فَيَكُونُ عيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْه السَّلاَمُ فى أُمَّتى حَكَمًا عَدْلاً وَإِمَامًا
مُقْسطًا يَدُقُّ الصَّليبَ وَيَذْبَحُ الْخنْزِيرَ وَيَضَعُ الْجزْيَةَ وَيَتْرُكُ الصَّدَقَةَ فَلاَ يُسْعَى عَلَى شَاة وَلاَ بَعير
وَتُرْفَعُ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَتُنْزَعُ حُمَةُ كُلِّ ذَات حُمَة حَتَّى يُدْخلَ الْوَليدُ يَدَهُ فى فى الْحَيَّة فَلاَ تَضُرَّهُ
وَتُفرُّ الْوَليدَةُ الأَسَدَ فَلاَ يَضُرُّهَا وَيَكُونُ الذِّئْبُ فى الْغَنَم كَأَنَّهُ كَلْبُهَا وَتُمْلأُ الأَرْضُ منَ السِّلْم كَمَا يُمْلأُ
الإِنَاءُ منَ الْمَاء وَتَكُونُ الْكَلمَةُ وَاحدَةً فَلاَ يُعْبَدُ إِلاَّ اللَّهُ وَتَضَعُ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا وَتُسْلَبُ قُرَيْشٌ مُلْكَهَا
وَتَكُونُ الأَرْضُ كَفَاثُور الْفضَّة تُنْبتُ نَبَاتَهَا بِعَهْد آدَمَ حَتَّى يَجْتَمعَ النَّفَرُ عَلَى الْقطْف منَ الْعنَب

فَيُشْبِعهُمْ وَيجْتمِعَ النَّفَرُ عَلَى الرُّمَّانَةِ فَتُشْبِعهُمْ وَيكُونَ الثَّوْرُ بِكَذَا وَكَذَا مِنَ الْمَالِ وَتكُونَ الْفَرَسُ بِالدُّرَيْهِمَاتِ ›. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا يُرْخِصُ الفَرَسَ قَالَ ‹ لاَ تُرْكَبُ لِحَرْبٍ أَبَدًا ›. قِيلَ لَهُ فَمَا يُغْلِى الثَّوْرَ قَالَ ‹ تُحْرَثُ الأَرْضُ كُلُّهَا وَإِنَّ قَبْلَ خُرُوجِ الدَّجَّالِ ثَلاَثَ سَنَوَاتٍ شِدَادٍ يُصِيبُ النَّاسَ فِيهَا جُوعٌ شَدِيدٌ يَأْمُرُ اللَّهُ السَّمَاءَ فِى السَّنَةِ الأُولَى أَنْ تَحْبِسَ ثُلُثَ مَطَرِهَا وَيَأْمُرُ الأَرْضَ فَتَحْبِسُ ثُلُثَ نَبَاتِهَا ثُمَّ يَأْمُرُ السَّمَاءَ فِى السَّنَةِ الثَّانِيَةِ فَتَحْبِسُ ثُلُثَىْ مَطَرِهَا وَيَأْمُرُ الأَرْضَ فَتَحْبِسُ ثُلُثَىْ نَبَاتِهَا ثُمَّ يَأْمُرُ اللَّهُ السَّمَاءَ فِى السَّنَةِ الثَّالِثَةِ فَتَحْبِسُ مَطَرَهَا كُلَّهُ فَلاَ تُقْطِرُ قَطْرَةً وَيَأْمُرُ الأَرْضَ فَتَحْبِسُ نَبَاتَهَا كُلَّهُ فَلاَ تُنْبِتُ خَضْرَاءَ فَلاَ تَبْقَى ذَاتُ ظِلْفٍ إِلاَّ هَلَكَتْ إِلاَّ مَا شَاءَ اللَّهُ ›. قِيلَ فَمَا يُعِيشُ النَّاسَ فِى ذَلِكَ الزَّمَانِ قَالَ ‹ التَّهْلِيلُ وَالتَّكْبِيرُ وَالتَّسْبِيحُ وَالتَّحْمِيدُ وَيُجْرَى ذَلِكَ عَلَيْهِمْ مُجْرَى الطَّعَامِ﴾. و اللفظ لأبن ماجة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٨٧٠ ) في صحيح الجامع

أبو امامه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەی خەڵکینە هیچ فیتنەیەك لەسەر زەویدا نەبووە، لەو کاتەوە کە خوا نەوەی ئادەمی لەسەر زەویدا بڵاو کردۆتەوە، گەورەتر بێت لە فیتنەی دەجال، وە خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیلا ئومەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە دەجال، وە من کۆتایی پێغەمبەرانم، وە ئێوەش کۆتای ئومەتەکانن، وە هیچ گومانی تێدا نییە کە لە ناو ئێوەدا سەر هەڵدەدات، جا ئەگەر دەرچوو وە من لەناوتاندابم ئەوا من بەرگریکار و پارێزەرم بۆ هەموو موسڵمانێك، وە ئەگەر لە دوای من دەرچوو ئەوا با هەموو کەسێك بەرگریکار و پارێزەری خۆی بێت، وە خوایش خەلیفەمە لەسەر هەموو موسڵمانێك، وە ئەو لە سەرە رێیەکی نێوان شام و عێراقدا دێتە دەر، بە راست و چەپدا خراپە کاری دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆتان راگرن، جا ئەوا من بۆتان وەسف دەکەم بە وەسفێك کە هیچ پێغەمبەرێك پێش من وەسفی وای نەکردبێت: ئەو لە سەرەتادا کە دەست پێدەکات دەڵێ: من پێغەمبەرم و هیچ پێغەمبەرێك بە دوای مندا نایەت، پاشان لە جاری دووەمدا دەڵێ: من پەروەردگارتانم، بەڵام ئێوە بزانن کە هەتا نەمرن پەروەردگارتان نابینن، وە ئەو کوێریشە، وە پەروەردگاری ئێوە کوێر نییە، وە لە نێوان هەردوو چاویدا نوسراوە: کافر. هەموو باوەڕدارێك دەیخوێنێتەوە، خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار بێت، وە یەکێك لە فیتنەکانی ئەوەیە، کە بەهەشت و ئاگری لەگەڵدایە جا ئاگرەکەی بەهەشتە و بەهەشتەکەشی ئاگرە، جا هەر کەس تاقی کرایەوە بە ئاگرەکەی و تێی خرا با هاواری خوا بکات و سەرەتاکانی سورەتی–الكهف– بخوێنێت ئیتر بۆی دەبێت بە فێنکی و سەلامەتی، هەر وەك چۆن ئاگرەکە بۆ ئیبراهیم وای لێهات، وە یەکێکی تر لە فیتنەکانی ئەوەیە کە بە عەرەبێکی دەشتەکی دەڵێ: ئەگەر بینیت من دایکت و باوکتم بۆ زیندوو کردیتەوە، ئایا شایەتی دەدەیت کە من پەروەردگارتم؟ئەویش دەڵێ: بەڵێ، ئینجا دوو شەیتان خۆیان لە وێنەی دایك و باوکیدا دەنوێنن و دەڵێن: ئەی کوڕی ئازیزمان شوێنی بکەوە چونکە ئەوەیە پەروەردگارت. وە یەکێکی تر لە فیتنەکانی ئەوەیە کە خوا بەسەر یەك نەفسدا زاڵی دەکات و دەیکوژێت و بە مشار دەیبڕێتەوە هەتابە دوو کەرتی فڕێ دەدرێت، پاشان دەڵێ: سەیری ئەو بەندەیەی من بکەن، ئەوا من ئێستا زیندووی دەکەمەوە، کەچی هەر لافی ئەوە لێدەدات کە جگە لە من پەروەردگارێکی تری هەیە،جا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە و

ئەو پیسەش دەڵێ: کێ پەروەردگارتە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگاری من (الله) یە و تۆیش دوژمنی (الله) یت، تۆ دەجالیت، سوێند بە خوا هیچ کاتێك هێندەی ئەمڕۆ من بەرچاورون نەبووم لەسەر تۆ، وە یەکێکی تر لە فیتنەکانی ئەوەیە کە بە لای ئاوەدانیەکدا تێپەر دەبێت و ئەوانیش بەدرۆی دەخەنەوە، کەچی هەرچی مالآت و ئاژەڵیان هەیە هەمووی دەفەوتێت، وە یەکێکی تر لە فیتنەکانی ئەوەیە بە لای ئاوەدانیەکی تردا تێپەر دەبێت و ئەوان باوەڕی پێ دەهێنن، ئەویش فەرمان بە ئاسمان دەکات کە بباریێت ئەویش دەباریێت، وە فەرمان بە زەوی دەکات کە سەرز بێت ئەویش سەوز دەبێت، هەتا ئەو رۆژە مەڕ و ماڵاتەکانیان کە دەگەڕێنەوە لە هەموو کاتێکی تر قەڵەو ترو گەورەترن و، وە ناوقەدیشیان پانترەو گوانیشیان شیری زیاترە، وە هیچ شوێنێك نامێنێت لە زەوی ئیلا پێی تێ دەخات و زاڵ دەبێت بە سەریدا، تەنها مەککە و مەدینە نەبێت، لە هەر دەروازەیەك لە دەروازەکانیەوە کە بۆیان دەچێت فریشتەکان بە شمشێری هەڵکێشراوەوە رووبەڕووی دەبنەوە و هەتا لای تەپۆڵکە بەردینە سورەکە لای دوڕیانی (سبخة)-کە زەویەکی لماویە و لەبەر سوێری گیای لێ سەوز نابێت _ دادەبەزێت، ئینجا شاری مەدینە سێ جار لەرزە بە خەڵکەکەی دەکات و رایان دەوەشێنێت، ئیتر هیچ پیاوێك و ژنێکی دوو رووی تێدا نامێنێت ئیلا دەچێتە دەرەوە بۆ لای، ئیتر چی پیسی هەیە لە خۆی دوور دەخاتەوە هەروەك چۆن کوورە پیسی ئاگر دوور دەخاتەوە، وە ئەو رۆژە ناو دەبرێت بە رۆژی رزگار بوون ) ووتیان: ئەی ئەو رۆژە عەرەب لە کوێن ؟ فەرمووی: ئەوان ئەو رۆژە کەمن وە زۆربەیان لە ( بیت المقدس ) ن وە پێشەواکەشیان پیاوێکی سالح و چاکە، جا لەو کاتەدا کە پێشەواکەیان پێشبان کەوتووە بۆ ئەوەی پێیش نوێژی بەیانیان بۆ بکات، ئالەو بەیانیەدا عیسای کوڕی مریەم دادەبەزێت، ئینجا ئیمامەکەیان پشتاوپشت دێتە دواوەوە بۆ ئەوەی عیسا پێش بکەوێت و پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکات بەڵام عیسا دەست دەخاتە نێو دوو شانییەوە و پاشان پێی دەڵێ: پێشکەوە تۆ پێش نوێژییەکەیان بۆ بکە. چونکە قامەتی نوێژەکە بۆ تۆ کراوە، ئیتر پێشەوەکایان پێش نوێژەکەیان بۆ دەکات، جا کە لە نوێژ بووەوە، عیسا سەلامی لەسەر بێت دەڵێ: دەرگاکە بکەنەوە، ئینجا دەکرێتەوە و دەجالیش لە دواوەیەتی، حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵدایە هەموویان خاوەنی شمشێرێکی رازاوە و قەڵغانن، جا هەر لەگەڵ دەجال سەیری عیسای کرد و بینیئیتر دەتوێتەوە هەر وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، وە هەڵدێت و رادەکات، وە عیسا سەلامی لەسەر بێت دەڵێ: من لێدانێکم بۆ تۆ پێ دراوە لێتی بسرەوێنم، هەر گیز ناتوانیت پێشم بکەویت و خۆتی لێ رزگار بکەیت، ئینجا لەلای دەگای ( لد)ی خۆر هەڵات دەیگرێتەوە و دەیکوژێت، ئینجا خوا جولەکە دەبەزێنێت، ئیتر هیچ شتێك نابینێت کە خوا دروستی کردبێت و جولەکەیەك بتوانێت خۆی لە پەنادا حەشار بدات ، ئیلا خوا ئەو شتە دەهێنێتە زمان، نە بەرد و نەدار و نەدیوار و نەئاژەڵ. تەنها دار توترك نەبێت کە ئەوە هی خۆیانە و قسە ناکات، ئیلا دەڵێ: ئەی بەندەی خوای موسڵمان ئەوە جولەکەیەکە وەرە بیکوژە، ئیتر عیسای کوڕی مریەم سەلامی لەسەر بێت دەبێتە حاکمێکی داد پەروەر و پێشەوایەکی رێك و راست، خاچ دەشکێنێت و بەراز سەر دەبڕێت و لە ناوی دەبات، سەرانە لا دەبات و پارە بەخشین واز لێ دێنێت – ( ئاماژەیە بۆ پارە زۆربوون و دەوڵەمەند بوونی خەڵك ) – دەست لە مەڕ و ماڵات و ووڵاخ هەڵدەگرێت – ( ئەویش ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەوەندە زۆر

دەبێت خەڵك پێویستی پێ نامێنێت ) - وە دوو بەرەکی و رق و قینە هەڵ دەگیرێت، تەنانەت منداڵ دەست دەخاتە ناو دەمی مارەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، وە منداڵ ئازاری شێر دەدات کەچی زیانی پێ ناگەیەنێت، وە گورگ لە ناو رانە مەڕدا وەك سەگی پاسەوانی لێ دێت و زەوی پڕ دەبێت لە ئاشتی و ئارامی، هەروەك چۆن جام پڕ دەبێت لە ئاو، وە خەڵکی هەموو یەك قسە دەبن، و غەیری خوا کەسی تر ناپەرسترێت وە جەنگ و کوشتار کۆتایی پێ دێت و نامێنێت، وە ( قریش ) دەسەڵاتی لێدەستێنرێتەوە، وە زەوی وەك دەفری زیوی لێ دێت، وەکو سەردەمی ئادەم روەکی لێ دەڕوێت، بە جۆرێك کە کۆمەڵە خەڵك لەسەر گۆڵە ترێیەك کۆ دەبنەوە و تێریان دەکات، وە کۆمەڵە خەڵکێك لە سەر هەنارێك کۆدەبنەوە و تێریان دەکات، وە نرخی گایەك بە وەندەو بە وەندە دەبێت وە نرخی ئەسپ دەبێتە چەند درهەمێك ) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەسپ بۆ هەرزان دەبێت ؟ فەرمووی: ( چونکە هەتا هەتایە کەس بۆ شەڕ سواری نابێت ) ووتیان پێی: ئەی گا بۆ گران دەبێت ؟ فەرمووی: ( چونکە زەوی هەمووی دەکێڵدرێت. وە لە پێش هاتنی دەجالدا، سێ ساڵی قورس و زەحمەت دەبن، خەڵك تیایدا گرفتاری برسێتییەکی توند دەبێت، لە ساڵی یەکەمدا خوا فەرمان بە ئاسمان دەکات کە سێیەکی بارانی خۆی راگرێت و نەیبارێنێت. وە فەرمان دەکات بەزەوی کە سێ یەکی رووەکی بگرێتەوە، پاشان لە ساڵی دووەمدا فەرمان بە ئاسمان دەکات دوو لەسەر سێی بارانی دەگرێتەوە وە فەرمانیش بە زەوی دەکات دوو لەسەر سێی دەگرێتەوە. پاشانیش فەرمان بە ئاسمان دەکات لە ساڵی سێیەمدا هەموو بارانی دەگرێتەوە و یەك دڵۆپی لێ نابارێت، وە فەرمانیش بە زەویش دەکات هەموو رووەکی دەگرێتەوە و هیچ سەوزاییەکی لێ ناڕوێت، ئیتر هەرچی ئاژەڵی سمدارە هەمووی لەناو دەچێت، مەگەر ئەوەی کە خوا نەیەوێت لە ناو بچێت ) ووتیان: ئەی خەڵکی لەو زەمانەدا بە چی دەژین ؟ فەرمووی: ووتنی: ( **لا اله الا الله و الله أكبر و سبحان الله و الحمد لله** ) وەکو خۆراك پێی دەژین و شوێنی خۆراکیان بۆ دەگرێتەوە).

**( ١١٤٣ ) ( حم ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « يأتي الدَجالُ وَ هُو مُحرَمٌ عليه أنْ يدخُلَ نقابَ الْمدينَة فينْزل بعْض السَباخ الَتي بالْمدينَة فيَخرُجُ إليْه يوْمئذ رجُلٌ هُو خيْرُ النَاس، أوْ منْ خيْر النَاس فيقُولُ لهُ: أشْهَدُ أنَكَ الدَجَالُ الَذي حَدَثَنا رسُولُ الله (ﷺ) حديثَهُ، فَيقُولُ الدَجَالُ: أرَأيْتُم إنْ قَتلتَ هذا ثُمَ أحييْتَهُ؟ هَل تَشكَونَ في الأمر؟ فَيقُولُونَ: لا، قَال: فيقْتُلُهُ ثُمَ يُحْييه، فيقُولُ حينَ يُحْييه: وَ الله ما كُنْتُ فيك قَطُ أشَدَ بَصيرَةً منّي الآنَ، قَال: فَيريدُ الدَجَالُ أنْ يقْتُلَهُ فلا يُسَلطُ عليه ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٩٨٥) في صحيح الجامع**

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دەجال دێت، وە حەرام کراوە لەسەری کە بچێتە دەروازەکانی مەدینەوە، ئیتر لە یەکێك لەو دەشتە لماوییە سوێرانەی کەلای مەدینە دادەبەزێت، ئینجا لەو رۆژەدا پیاوێك بۆی دێتە دەر کە باشترین کەسە، یان لەکەسە زۆر باشەکانە، وە پێی دەڵێ: شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو دەجالەیت کە پێغەمبەر(ﷺ) باسەکەی تۆی بۆ کردووین، دەجالیش دەڵێ: ئایا ئەگەر ئێوە بینیتان کە من ئەمەم کوشت و پاشان زیندووم کردەوە، ئایا ئیتر هیچ گومانێکتان لە کاری من دەمێنێت ؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر ) فەرمووی: ( ئینجا دەیکوژێت و پاشان زیندووی دەکاتەوە،

ئەویش کاتێك کە زیندووی دەکاتەوە پێی دەڵێ: سوێند بە خوا هیچ کاتێك هێندەی ئێستا من لەسەر تۆ بەر چاو روون نەبووم ) فەرمووی: ( ئینجا دەجال دەیەوێت بیکوژێتەوە بەڵام خوا زاڵی ناکات بەسەریدا

( ١١٤٤ ) ( حم م ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فِى أُمَّتِى فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ - لاَ أَدْرِى أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا أَوْ أَرْبَعِينَ عَامًا - فَيَبْعَثُ اللَّهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سَبْعَ سِنِينَ لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّأْمِ فَلاَ يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ أَحَدٌ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أَوْ إِيمَانٍ إِلاَّ قَبَضَتْهُ حَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ دَخَلَ فِى كَبِدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ حَتَّى تَقْبِضَهُ ›. قَالَ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ ‹ فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ فِى خِفَّةِ الطَّيْرِ وَأَحْلاَمِ السِّبَاعِ لاَ يَعْرِفُونَ مَعْرُوفًا وَلاَ يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا فَيَتَمَثَّلُ لَهُمُ الشَّيْطَانُ فَيَقُولُ أَلاَ تَسْتَجِيبُونَ فَيَقُولُونَ فَمَا تَأْمُرُنَا فَيَأْمُرُهُمْ بِعِبَادَةِ الأَوْثَانِ وَهُمْ فِى ذَلِكَ دَارٌّ رِزْقُهُمْ حَسَنٌ عَيْشُهُمْ ثُمَّ يُنْفَخُ فِى الصُّورِ فَلاَ يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلاَّ أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا - قَالَ - وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ - قَالَ - فَيَصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ - أَوْ قَالَ يُنْزِلُ اللَّهُ - مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ أَوِ الظِّلُّ - نُعْمَانُ الشَّاكُّ - فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ ثُمَّ يُقَالُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ. وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ - قَالَ - ثُمَّ يُقَالُ أَخْرِجُوا بَعْثَ النَّارِ فَيُقَالُ مِنْ كَمْ فَيُقَالُ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ - قَالَ - فَذَاكَ يَوْمَ يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا وَذَلِكَ يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ﴾. و اللفظ لمسلم.

( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٣٧ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دەجال لە ئومەتەکەی مندا دێت و بۆ ماوەی چل لەسەر زەویدا دەمێنێتەوە – جا نازانم چل ڕۆژ یان چل مانگ یان چل ساڵ – ، خوای گەورەش عیسای کوڕی مریەم دەنێرێت هەر دەڵێیت عروەی کوڕی مسعودە و شوێنی دەکەوێت و لە ناوی دەبات، پاشان خەڵك حەوت ساڵ دەمێننەوە، هیچ دوو کەسێك دوژمنایەتی لە نێوانیاندا نابێت، پاشان خوا بایەکی سارد دەنێرێت لە لای شامەوە، ئیتر لەسەر رووی زەویدا هیچ کەسێك نامێنێت، کە لە دڵیدا هێندەی تۆزقاڵە دەنکێك لە خێری تێدا بێت یان لە باوەڕی تێدا بێت ئیلا گیانی دەکێشێت، تەنانەت ئەگەر یەکێکتان بچێتە ناو جەرگەی چیایەکەوە، ئەوا هەر بۆی دەچێتە ژوورەوە، هەتا گیانی دەکێشێت ) وتی: لە پێغەمبەر م(ﷺ) بیستووە، فەرمووی: ( ئیتر هەر خراپەکانی خەڵك دەمێنێتەوە، کە هێندەی باڵندە کێشانە سوکن و خەون و ئاواتەکانیشیان هەروەك دڕندەکانە، نە چاکەیان پێ چاکە و نە خراپەشیان پێ خراپە، ئینجا شەیتان خۆییان بۆ دەنوێنێت و پێیان دەڵێ: ئایا بە قسەم دەکەن ؟ ئەوانیش دەڵێن فەرمانی چیمان پێ دەکەیت ؟ ئەویش فەرمانی بت پەرستێتیان پێ دەکات، وە ئەوان لەسەر ئەوە شەوە هەر رزق و رۆزییان بەسەردا دەرژێت و گوزەرانیان باش و خۆشە، پاشان فوو دەکرێت بە کەڕەناکە دا ئیتر کەس نییە گوێی لێ بێت ئیلا گەردنێك شۆڕ دەکاتەوە و گەردنێك بەرز دەکاتەوە ) فەرمووی: ( وە یەکەم کەس کە دەیبستێت پیاوێکە حەوزە ئاوەکەی سواغ دەدات )

فەرمووی: ( یەکسەر گیانی دەردەچێت و خەڵکەکەش گیان دەردەچێت پاشان خوا بارانێك دەنێرێت – یان فەرمووی: بارانێك دەبارێنێت هەر دەڵێی ئاو پرژێنە یان دەڵێ ی سێبەرە، وە هەموو جەستەی خەڵكانی لێ دەڕوێتەوە، پاشان فوویەکی تری پێدا دەکرێت، ئیتر دەست و برد هەموویان هەستاون و سەیر دەکەن .پاشان دەوترێت: ( ئەی خەڵکینە بڕۆن بۆ لای پەروەردگارتان، وە رایان بوەستێنن ئەوانە دەبێت پرسیاریان لێ بکرێت ). فەرمووی: ( پاشان دەوترێت: ئەوانەی کە بۆ ئاگر دەنێردرێن دەریان بهێنن و جیایان بکەنەوە. ئینجا دەوترێت: لە چەند ؟ ئینجا پێیان دەوترێت: لە هەموو هەزارێك نۆ سەد و نەوەدونۆ ) فەرمووی: ( جا ئیتر ئەوە ئەو رۆژەیە کە لاقی تێدا ئاشکرا دەکرێت و دەردەخرێت ).

## ( ٧ ) ( پەیوەست بوون بە کیتاب و سوننەتەوە )

( ١١٤٥ ) ( حم ك ) عن النواس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ ضَرَبَ اللهُ تَعالىَ مَثَلاً صِرَاطاً مُسْتَقِيْماً وَ عَلىَ جَنْبَتي الصِّرَاطِ سُورانِ فِيْهِمَا أَبْوابٌ مُفَتَّحَةٌ وَ عَلىَ الأَبْوَابِ سُتُورٌ مُرْخَاةٌ وَ عَلىَ بَابِ الصِّراطِ دَاعٍ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! ادْخُلُوا الصِّرَاطَ جَمِيْعاً وَ لا تَتَعَوَجوا وَ دَاعٍ يَدْعُو مِنْ فَوْقِ الصِّرَاطِ فَإذا أَرَادَ الإِنْسَانُ أَنْ يَفْتَحَ شَيْئاً مِنْ تِلْكَ الأَبْوابِ قَالَ: وَيْحَكَ لا تَفْتَحْهُ فَإنَّكَ إِنْ تَفْتَحْهُ تَلِجهُ فَالصِّرَاطُ الإِسْلَامُ وَ السُّورانِ حُدُودُ اللهِ تَعالىَ وَ الأَبْوَابُ المُفَتَّحَةُ مَحارِمُ اللهِ تَعالىَ وَ ذلكَ الدَّاعِي عَلىَ رَأْسِ الصِّرَاطِ كِتَابَ اللهِ وَ الدَّاعِي مِنْ فَوْقِهِ وَاعِظُ اللهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٣٨٨٥ ) في صحيح الجامع

نواس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە نمونەیەکی هێناوەتەوە، رێگایەکی راست، وە لە هەردوو لای رێگاکەدا دوو دیوار هەن دەرگای کراوەیان تێدایە، وە لەسەر دەرگاکانیش پەردە شۆڕ کراونەتەوە، وە لەسەر دەرگای رێگاکەش بانگ دەرێك دەڵێ: ئەی خەڵکینە هەمووتان بچنە ناو رێگا راستەکەوە لامەدەن و خوار مەبن، وە بانگەوازکارێکیش وا بەسەر رێگاکەوە، جا ئەگەر مرۆڤ ویستی یەکێك لەو دەرگایانە بکاتەوە پێی دەڵێ: واوەیلا بۆتۆ نەیکەیتەوە چونکە ئەگەر کردتەوە ئیتر ئەوا رۆ دەچیت و دەکەویتە ناوی، جا رێگاکە ئیسلامە، وە دوو دیوارەکەش سنوورەکانی خوای گەورەن، وە دەرگا کرانەوەکانیش ئەو شتانەن کە خوای گەورە حەرامی کردوون، وە ئەو بانگدەرەش کە لەسەری رێگاکە دایە کتێبەکەی خوایە، وە ئەو بانگەوازکارەش کە لەبەرزایی سەرەوە هاواری لێ دەکات، ئامۆژکارییەکانی خوایە لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا ).

## ( ٨ ) ( گه نجینه‌کانی خێر و شه‌ڕ )

**( ١١٤٦ ) ( طب الضياء ) عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عِنْدَ اللهِ خَزَائِنُ الخَيْرِ وَ الشَّرِّ مَفَاتِيْحُهَا الرجَال فَطوبى لمنْ جعلهُ الله مفْتاحاً للْخَيْرِ مغْلاقاً للشَّرِ وَ وَيْلٌ لمَنْ جَعَلهُ الله مفْتاحاً للشَّرِ مغْلاقاً للخَيْرِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٠٨٥ ) في صحيح الجامع**

سهل ی کوڕی سعد ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( گه‌نجینه‌کانی چاکه و خراپه له‌لای خوان، کلیله‌کانیشیان پیاوانن، جا ئافه‌رین بۆ ئه‌و که‌سه‌ی که خوا کردوویه‌تی به کلیل بۆ چاکه و داخه‌ر بۆ خراپه، وه واوه‌یلاش بۆ ئه‌و که‌سه‌ی که خوا کردوویه‌تی به کلیل بۆ خراپه و داخه‌رو ڕێگریش له‌به‌رده‌م خێر و چاکه‌دا ).

## ( ٩ ) ( ئیمامی مه‌هدی )

**( ١١٤٧ ) ( البزار طب ) عن قرة المزني قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَتُمْلأَنَّ الأَرْض جُوراً و ظُلْماً فإذا مُلِئَتْ جُوراً وَ ظُلْماً يَبْعَثُ الله رجُلاً منّي اسْمُهُ اسْمي وَ اسْمُ أَبِيْه اسْمُ أَبِي فَيَمْلؤُها عَدْلاً و قِسْطاً كَمَا مُلِئَتْ جُوراً وَ ظُلْماً فَلا تَمنعُ السَماءُ شَيْئاً مِنْ قَطْرِهَا وَ لا الأَرْضُ شَيْئاً مِنْ نَبَاتِها ، يَمْكُثُ فِيْكُمْ سَبْعاً أَوْ ثَمَانياً فَإِنْ أَكْثَرَ فَتِسعا ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٠٧٢ ) في صحيح الجامع**

قرة المزني ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( زه‌وی پڕ ده‌بێت له زوڵم و سته‌م کاری، جا که پڕ بوو له زوڵم و سته‌م کاری، خوا پیاوێك ده‌نێرێت له نه‌وه‌ی منه، ناوی ناوی منه ناوی باوکیشی ناوی باوکمه، ئیتر زه‌وی پڕ ده‌کاته‌وه له ڕاستی و داد په‌روه‌ری چۆن پڕ بوو له زوڵم و سته‌م کاری. ئیتر ئاسمان هیچ له بارانی گل ناداته‌وه و زه‌ویش هیچ له ڕووه‌کی گل ناداته‌وه، حه‌وت یان هه‌شت ئه‌گه‌ر زیاتریش ئه‌وا نۆ ساڵ له ناوتاندا ده‌مێنێته‌وه ).

**( ١١٤٨ ) ( د ) عن عوف بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لنْ يَجْمَعَ اللهُ تَعالى عَلى هذهِ الأُمَّةِ سَيْفَيْنِ: سَيْفاً مِنْهَا وَ سَيْفاً مِنْ عدُوِّهَا ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٢١٩ ) في صحيح الجامع**

عوفی کوڕی مالك ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( خوا دوو شمشێر له‌سه‌ر ئه‌م ئوممه‌ته کۆ ناکاته‌وه، شمشێرێك له خۆیی و شمشێرێك له دوژمنه‌که‌ی ).

## ( ١٠ ) ( ڕۆچوون و ڕوو وەرگێڕان )

( ١١٤٩ ) ( هـ حم، طب هب ) عن أبي مالك الأشعري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا، يُعْزَفُ على رُءُوسِهِمْ بِالمعازف و المُغَنِّيَات يَخْسِفُ الله بِهِمُ الأَرْضَ. و يَجْعَلُ مِنْهُمُ القِرَدَة و الخَنَازِيرَ ﴾ و اللفظ لابن ماجة. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٤٢٩) في صحيح الجامع

ابو مالك الاشعري دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کەسانێك لە ئومەتەکەم مەی دەخۆنەوە بە غەیری ناوەکەی خۆی ناوی دەبەن، ئامێرەکانی مۆسیقا ژەندن بە سەریانەوەن و مۆسیقایان بۆ لێ دەدەن و گۆرانی بێژانی ئافرەتیش گۆرانیان بۆ دەڵێن، خوا ڕۆیان دەچێنێت و دەیان بات بەناخی زەویدا، وە دەیانکات بە مەیمون و بەراز ).

## ( ١١ ) ( کەسانێك ئەوەی کە دەیڵێن کاری پێ ناکەن )

( ١١٥٠ ) ( حم م ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مامِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ الله في أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كان لهُ مِنْ أُمَّتِه حَوارِيُّونَ و أصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِه و يَقْتَدُونَ بِأَمْرِه ثُمَّ إنَّها تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَالا يَفْعَلُونَ و يَفْعَلُونَ مالا يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جاهَدَهُمْ بِيَدِه فَهُوَ مُؤْمِنٌ و مَنْ جاهَدَهُمْ بِلِسَانِه فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَ مَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِه فَهُوَ مُؤْمِنٌ لَيْسَ وراءَ ذلكَ مِنَ الإيْمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٧٨٣) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ پێغەمبەرێك نییە لە پێش مندا و کە خوا ناردبێتی بۆ ئومەتەکەی خۆی ئیلا لە ئومەتەکەیدا هاودەمان و هاوەڵانێکی هەیە کە سوونەتەکەی وەردەگرن و پابەند دەبن بە فەرمانەکانییەوە، پاشان وا دەبێت کە لە دوای ئەوانەوە پاشینەیەك دەمێنێتەوە، شتێك دەڵێن کە خۆیان کاری پێ ناکەن، وە کارو کردەوەیەکیش دەکەن کە فەرمانیان پێ نەکراوە بیکەن. جا هەرکەس جیهادیان بکات بەدەستی ئەوە بڕوادارە، وە هەرکەسێك جیهادیان بکات بەزمانی ئەوە بڕوادارە، وە هەر کەس جیهادیان بکات بە دڵی ئەوەش بڕوادارە، وە ئیتر لە دوای ئەوەوە هێندەی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان نامێنێت ).

## ( ١٢ ) ( فیتنەی گۆڕ )

( ١١٥١ ) ( حم ق ٤ ) عن البراء بن عازب أن رسول الله(ﷺ) قال: ﴿ المُسْلِمُ إذا سُئِلَ في القَبْرِ فَشَهِدَ أن لا إله إلاَّ الله و أنَّ مُحَمَّداً رسُول الله فذلكَ قَوْلُه تعالى: ﴿ يُثَبِّتُ الله الَّذِيْنَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ ﴾ و اللفظ لابي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٧٠٧) في صحيح الجامع

براء ی کوڕی عازب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( موسڵمان ئەگەر لە گۆڕدا پرسیاری لێ کرا و ئەویش شایەتی هێنا کە هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله) وە محمدیش پێغەمبەری خوایە ئیتر ئەوە مانای فەرموودەکەی خوای گەورەیە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴾، واتە خوا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە چەسپاوو دامەزراوییان دەکات بەوتەی چەسپاوو دامەزراو ).

## ( ١٣ ) ( ئەو کۆمەڵەی کە خوا سەریان دەخات الطائفة المنصورة )

**( ١١٥٢ ) ( حم م ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَىَ الْحَقِّ ظَاهِرِيْنَ إِلَىَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَيَنْزِلُ عِيسَى بْنُ مَرْيَمَ فَيَقُولُ أَمِيْرُهُمْ: تَعَالَ فَصَلِّ لَنَا فَيَقُولُ: لا إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَىَ بَعْضٍ أُمَرَاءُ، تَكْرِمَةَ الله لِهَذِهِ الأُمَّةَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٢٨٦) في صحيح الجامع**

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بەردەوام کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم لەسەر حەق دەجەنگێن بەسەروەری هەتا رۆژی قیامەت ) فەرمووی: (وە عیسای کوڕی مریەم دێتە خوارەوە و ئینجا ئەمیری کۆمەڵەکە دەڵێت، وەرە پێش نوێژیەکەمان بۆ بکە، ئەویش دەڵێ: نەخێر، ئێوە خۆتان بەسەر خۆتانەوە ئەمیرن، ئەوەش رێزلێنانی خوایە بۆ ئەم ئومەتە ).

## ( ١٤ ) ( گەڕانەوەی بت پەرستێتی )

**( ١١٥٣ ) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَ النَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللاَّتُ وَ الْعُزَّى ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيْحاً طَيِّبَةً فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيْمَانٍ فَيَبْقَى مَنْ لا خَيْرَ فِيْهِ فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِيْنِ آبَائِهِمْ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٦٧٤) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( شەو و رۆژ کۆتایی پێ نایەت هەتا لات و عوزا دەپەرسترێتەوە، پاشان خوا بایەکی پاك دەنێرێت، هەرچی لە دڵیدا هێندەی تۆزقاڵە دەنکە خەرتەلەیەك ئیمانی تێدا بێت دەیمرێنێت، ئیتر هەر ئەوانە دەمێننەوە کە هیچ خێرێکیان تێدا نییە، وە دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی باوو باپیرانیان ).

## ( ١٥ ) ( مانەوە و خۆڕاگرتن لە شاری مەدینەدا )

**( ١١٥٤ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَ قَرِيْبِهِ: هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ وَ الْمَدِيْنَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لايَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا إِلاَّ أَخْلَفَ اللهُ فِيْهَا مَنْ هُوَ خَيْراً مِنْهُ أَلا إِنَّ الْمَدِيْنَةَ**

**كَالْكِيرِ تُخْرِجُ الْخَبِيثَ، لاتَقُومُ السَاعَةُ حَتَى تَنْفِيَ الْمَدِيْنَةُ شِرَارَهَا كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ ﴾.**
**( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٠٠ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( زەمانێك بەسەر خەڵكدا دێت پیاو كوڕە مامەكەی و خزمەكەی بانگ دەكات وەرە بەرەو خۆش گوزەرانی وەرە بۆ خۆش گوزەرانی، وە شاری مەدینە باشترە ئەگەر بیانزانیایە، جا سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، هەر كەسێك لە بێزاریدا لێی بچێتە دەرەوە ئەوا خوا یەكێكی لەو باشتری لە جێگادا دادەنێت، جا شاری مەدینە هەروەك كوورە وایە، پیسی فڕێ دەداتە دەرەوە، وە قیامەت هەڵناسێت هەتا مەدینە هەموو پیسەكانی نەكاتە دەرەوە هەروەك چۆن كوورەی ئاگر پیسی ئاسن لێ دەكاتەوە ).

## ( ١٦ ) ( نەمانی پیاو چاكان )

**( ١١٥٥ ) ( حم خ ) عن مرداس الأسلمي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ وَ يَبْقَى حُفَالَةَ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ أَوْ التَّمْرِ لا يُبَالِيْهِم الله تَعالَى بَالَةً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٧٥ ) في صحيح الجامع**

مرداس الاسلمی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاو چاكان دەڕۆن یەك لە دوای یەك و گەندەڵانێك دەمێننەوە هەروەك گەندەڵانی جۆ یان خورما، خوای گەورە هیچ رێز و گرنگییەكیان پێ نادات ).

## ( ١٦ ) ( كێبڵ بە دەستەكان )

**( ١١٥٦ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُوشِكُ إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ أَنْ تَرىَ قَوْماً فِي أَيْدِيْهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ يَغْدُونَ فِي غَضَبِ الله وَ يَرُوحُونَ فِي سَخَطِ الله ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨١٨٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر ماوەت بۆ درێژ ببێتەوە ئەوا نزیكە كە جۆرە كاسانێك ببینیت شتێكیان بەدەستەوەیە هەر وەك كلكی مانگا وایە، لە غەزەبی خوادا رۆژ دەكەنەوە، وە لە ناو خەشم و قینی خواشدا ئێوارەیان بەسەردا دێت ).

## ( ١٨ ) ( نزیك بوونەوەی قیامەت )

**( ١١٥٧ ) ( ك ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَلا يَزْدَادُ النَّاسُ عَلَى الدُّنْيَا إِلاَّ حِرْصاً وَلا يَزْدَادُونَ مِنَ الله إِلاَّ بُعْداً ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١١٤٦ ) في صحيح الجامع**

ابن مسعود دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( وا قیامەت نزیك بوەوە و خەڵكیش هەر زیاتر باوەش بە دونیادا دەكەن و هەر زیاتریش لە خوا دوور دەكەونەوە ).

## ( ١٩ ) ( فيتنه و پرسیاری ناو گۆڕ )

**( ١١٥٨ ) ( حم ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): « أمَا فتْنَة الدَجَال فإنَهُ لم يكُن نبي إلاَ قَدْ أنْذر أمّتهُ و سأحذّرْكمُوهُ بحديثٍ لمْ يُحذرْهُ نبيٌّ أمّتهُ إنَهُ أعورٌ و إنَ الله ليْس بأعور مكتُوبٌ بيْن عيْنيْه كافرٌ يقرأهُ كُلُ مُؤمن، و أمَا فتْنةُ القبْر فبي تُفتنُون و عنّي تُسألون فإذا كان الرَجلُ الصَالحُ أجْلس في قبْره غيْرَ فزع ثُمَ يُقالُ لهُ: ما هذا الرَجُلُ الذي كان فيكُمْ؟ فيقُولُ: مُحمَدٌ رسُولُ الله جاءنَا بالْبيّنات منْ عنْد الله فصدَقْنَاهُ فيُفرَجُ لهُ فُرجةً قبل النَار فينْظر إليها يُحطم بعْضُها بعْضا فيُقالُ لهُ: انْظُرْ إلى ما وقَاك الله ثُمَ يُفرَجُ لهُ فُرجَةً إلى الجنَة فينْظُر إلى زهْرتها و ما فيها فيُقَالُ لهُ: هذا مقْعدُك منْها و يُقالُ لهُ: على اليقيْن كُنْتَ و عليْه متَ و عليه تُبْعثُ إنْ شاء الله. و إذا كان الرَجُلُ السُوء أجْلس في قبْره فزعاً فيُقالُ لهُ: ما كُنت تقُولُ؟ فيقُولُ: لا أدري فيُقالُ: ماهذا الرَجُلُ الذي كانَ فيْكُمْ؟ فيقُولُ: سمعْتُ النَاس يقُولُون قوْلا فقلْتُ كما قالُوا فيفرجُ لهُ فُرجةً منْ قبل الجنَة فينْظُرَ إلىَ زهْرتهَا و مَا فيْها فيُقالُ لهُ: انْظُر الى ما صرَف الله عنك ثُمَ يُفرَجُ لهُ فُرْجَةً قبلَ النَار فينْظُرُ إليْها يُحطمُ بعْضُها بعْضا و يُقالُ: هذا مقْعدُك منْها على الشَك كُنْتَ و علَيْه متَ و عليْه تُبْعثُ إنْ شاء الله ثُمَ يُعذَب ». ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٣٦١ ) في صحيح الجامع**

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سەبارەت بە فیتنەی دەجال، ئەوە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە ئیلا هەر ئومەتەکەی خۆی لێ ئاگادار کردۆتەوە، وە منیش بە فەرموودەیەك ئاگادار و بێدارتان دەکەمەوە کەهیچ پێغەمبەرێکی تر ئومەتەکەی خۆی لێ ئاگادار نەکردبێت: ئەو دەجالە کوێرە، وە خوا کوێر نییە، لە نێو هەردوو چاویدا نووسراوە کافر، هەموو باوەڕدارێك دەیخوێنێتەوە، وە سەبارەت بە فیتنەی گۆڕ، ئەوا بە من تاقیدەکرێنەوە و پرسیاری منتان لێ دەکرێت ئەگەر کەسەکە پیاوێکی باش بوبێت ئەوا لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێنرێت بە بێ ئەوەی بترسێت، پاشان پێی دەوترێت: ئەو پیاوەی کە هاتبوویە ناوتان چی بوو ؟ ئەویش دەڵێ: محمد پێغەمبەری خوایە و بەڵگەی لە لای خواوە بۆ هێنابووین ئێمەش باوەڕمان پێ کرد، ئینجا دەروازەیەکی بۆ دەکرێتەوە رووەو ئاگر، ئەویش سەیری دەکات دەبینێت ئاگرەکە خۆی خۆی تێك دەشکێنێت جا پێی دەوترێت: سەیری ئەوە بکە کە خوا تۆی لێ پاراستووە، پاشان دەروازەیەکی بۆ دەکرێتەوە بۆ بەهەشت، ئەو سەیری دەکات دەبینێت چەند رازاوەیە و چی تێدایە و پێی دەوترێت: ئائەوە جێگەی تۆیە لە بەهەشتدا و پێشی دەوترێت: لەسەر باوەڕی تەواو ژیاویت و لەسەر ئەوەش مردوویت و انشاءالله لەسەر ئەوەش زیندووو دەکرێیتەوە، وە ئەگەر کابرایەکی خراپەکار بێت ئەوا لە گۆڕەکەیدا بە ترس و تۆقینەوە دادەنیشێنرێت و پێی دەوترێت: تۆ چیت دەووت: ئەویش دەڵێت نازانم، ئینجا دەڵێن: ئەی ئەو پیاوە چی بوو کە لەناوتانا بوو ؟ ئەویش دەڵێ: بیستم ئەو خەڵکە قسەیەکیان دەووت منیش هەر وەك ئەوانم ووت. ئینجا دەروازەیەکی بۆ دەکرێتەوە رووەو بەهەشت سەیر دەکات کە چەند رازاوەیە و چی تێدایە. دەڵێن پێی: سەیری ئەوە بکە کە خوا پێتی نەدا، ئینجا دەروازەیەکی بۆ دەکرێتەوە رووەو ئاگر، ئەویش سەیری دەکات خۆی تێك و

پێك دەكات و دەڵێن: ئائەوە شوێنەكەی تۆیە لەو ئاگرەدا، هەر لەسەر گومان ژیایت و هەر لەسەریشی مردوویت و انشاءالله لەسەر گومانیش زیندوو دەكرێیتەوە، پاشان ئەشكەنجە دەدرێیت ).

( ١١٥٩ ) ( ق د ت ) عنْ ابْنِ عُمَر قَامَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) في النَّاس فَأَثْنَى على الله بما هو أهْلُهُ فذكر الدَّجَال فَقَال: «إنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ - يعني الدَجال - وما من نبَي إلا قد أنْذرهُ قَوْمَهُ و لَقَدْ أنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ و لكن سأقُولُ لكُمْ فيْه قوْلا لم يقُلْهُ نبيّ لقوْمه: تعلمُون أنَهُ اعْورُ و إنَ الله ليْس بأعْور » ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٨٩ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هەستا لەناو خەڵكەكەدا ستایشی خوای كرد بەوەی كە شایەنیەتی، ئینجا باسی دەجالی كرد و فەرمووی: ( من وا ئاگادارتان دەكەمەوە لێی، وە هیچ پێغەمبەرێك نییە ئیلا قەومەكەی خۆی لێ ئاگادار كردۆتەوە، پێشتر نوح قەومەكەی خۆی لێ ئاگادار كردۆتەوە،، بەڵام من قسەیەكتان پێ دەڵێم لەسەر ئەو دەجالە، كە هیچ پێغەمبەرێكی تر بە قەومەكەی خۆی نەووتوە، دەزانن ئەو دەجالە كوێرە، وە خوای گەورەش كوێر نییە ).

## ( ٢٠ ) ( هەتا قیامەت سی كەسی درۆزن لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن )

( ١١٦٠ ) ( حم م د ت هـ ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): «إنَّ اللَّهَ زَوَى لِي الأَرْضَ» أوْ قَال: « إنَّ ربِّي زَوَى لِي الأَرْض فرَأيْتُ مشارِقَها ومغارِبَها وَإنَّ مُلْكَ أُمَّتِي سيبْلُغُ مَا زُوِيَ لِي منْها وأُعْطيتُ الكنزين الأحْمر والأبْيَض وإنِّي سألْتُ رَبِّي لأُمَّتي أنْ لاَ يُهْلِكَها بسَنَةٍ بعامَّةٍ ولاَ يُسَلِّطَ عليْهِمْ عدُوًّا منْ سوى أنْفُسهم فيسْتبيحَ بيْضتَهُمْ وَإنَّ ربِّي قال لي يا مُحَمَّدُ إنِّي إذا قَضَيْتُ قَضاءً فإنَّهُ لا يُرَدُّ ولا أُهْلِكُهُمْ بسنَةٍ بعامَّةٍ وَلا أُسَلِّطُ عليهمْ عَدُوًّا منْ سوى أنْفُسهمْ فيسْتبيح بَيْضَتَهُمْ وَلو اجْتَمعَ عَليْهِمْ منْ بيْن أقْطارِها أوْ قال بأقْطارِها حَتَّى يَكُونَ بعْضُهُمْ يُهْلكُ بعْضًا وَحَتَّى يكُونَ بَعْضُهُمْ يسْبي بَعْضًا وإنَّما أَخافُ على أُمَّتي الأئمَّةَ المُضلِّين وإذا وُضع السَّيْفُ في أُمَّتي لَمْ يُرْفعْ عَنْها إلى يوم القيامَةِ ولاَ تقُومُ السَّاعةُ حتى تلحقَ قبائلُ منْ أُمَّتي بالْمُشْركينَ وَحتَّى تَعْبُدَ قبائلُ منْ أُمَّتي الأَوْثَانَ وَإنَّهُ سيكُونُ في أُمَّتي كذَّابُون ثلاثُون كُلُّهُمْ يزْعُمُ أنَّهُ نَبيٌّ وأنَا خاتَمُ النَّبيِّينَ لا نَبيَّ بَعْدي ولاَ تزَالُ طَائفَةٌ منْ أُمَّتي على الْحَقِّ ›. قَالَ ابْنُ عيسى ‹ ظَاهِرينَ ›. ثُمَّ اتَّفَقَا ‹ لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ». و اللفظ لأبي داود. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٧٣ ) في صحيح الجامع

ثوبان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە زەوی بۆ هێنامەوە یەك )،یان فەرمووی: (پەروەردگارم زەوی بۆ هێنامە یەك و خۆرهەڵاتەكانی و خۆرئاواكانیم نیشان درا، وە موڵكی ئومەتەكەم دەگاتە ئەوەندەی كە بۆم هێنرایەوە یەك، وە هەردوو گەنجینەكەشم پێ درا سورەكەیش و سپیەكەیش، وە من داوام لە پەروەردگاری گەورەم كرد كە بە گرانییەكی سەرتاسەری لەناویان نەبات و هیچ دوژمنێكی غەیری خۆیان زاڵ نەكات بەسەریاندا كە هەتكیان بكات و لەناویان بەرێت، وە پەروەردگارم

پێی فەرمووم: ئەی محمد ئەگەر من قەزایەکم بڕیار دا ئیتر ئەوە ناگەڕێتەوە، وە من بە گرانییەکی سەرتاسەری لە ناویان نابەم، وە هیچ دوژمنێکیش لە غەیری خۆیان زاڵ ناکەم بە سەریاندا کە هەتکیان بکات و لە ناویان بەرێت ئەگەر هەموو مەملەکەتەکانی دونیاش لەسەریان کۆببنەوەو پەلاماریان بدەن. هەتا مەگەر خۆیان خۆیان لە ناو بەرن و خۆیان هەتکی ناموسی یەکتر بکەن، وە بەڕاستی ترسی من لەسەر ئومەتەکەم لەو ئیمام و پێشەوایانەیە کە خەڵك گومڕا دەکەن، وە هەر کات شمشێر لەسەر ئومەتەکەم دانرا ئیتر لەسەری بەرز ناکرێتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت، وە قیامەتیش هەڵناسێت هەتا چەند هۆز گەلێك لە ئومەتەکەم دەچنەوە پاڵ موشریکەکان، وە هەتا هۆز و گەلانێك لە ئومەتەکەم دەست نەکەنەوە بە بت پەرستن، وە لە ئومەتەکەمدا سی کەسی درۆزن سەر هەڵدەدەن، هەموویان لافی ئەوە لێ دەدەن کە پێغەمبەرن، وە من کۆتایی پێغەمبەرانم، پێغەمبەری تر لەدوای من نییە وە بەردەوام کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم لەسەر حەقن، نەیارانیان ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن، هەتا ئەو کاتەی کە فەرمانی خوای گەورە دێت ).

## ( ٢١ ) ( گرتنەوەی زانیاری )

( ١١٦١ ) ( حم ق ت هـ ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعَالَى لا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعاً يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبَادِ وَ لَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَتْرُكْ عَالِماً اتَّخَذَ النَّاسُ رُؤُوساً جُهَّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَ أَضَلُّوا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٥٤ ) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە زانیاری ناگرێتەوە بە لێسەندنێك کە لە خەڵکی بستێنێت، بەڵام زانیاری دەکێشێتەوە بە کێشانەوەی زاناکان ... هەتا کە وای لێ هات هیچ زانایەکی نەهێشتەوە، ئیتر ئەو خەڵکە سەرانێکی هیچ نەزان بۆ خۆیان دادەنێن، پرسیاریان لێ دەکرێت و ئەوانیش بە بێ زانیاری فەتوا دەدەن، جا ئیتر خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن ).

( ١١٦٢ ) ( طس ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ لا يَنْزِعُ الْعِلْمَ مِنْكُمْ بَعْدَمَا أَعْطَاكُمُوهُ انْتِزَاعاً وَ لَكِنْ يَقْبِضُ الْعُلَمَاءَ بِعِلْمِهِمْ وَ يَبْقَى جُهَّالٌ فَيُسْأَلُونَ فَيُفْتُونَ فَيَضِلُّونَ وَ يُضِلُّونَ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٨٦١ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بە لێسەندنەوە زانیاریتان لێ ناسەنێتەوە لە پاش ئەوەی کە پێی داون، بەڵام زاناکان بە زانیاریەکانیانەوە دەکێشێتەوەو کەسانێکی هیچ نەزان دەمێننەوە، جا پرسیاریان لێ دەکرێت و ئەوانیش فەتوا دەدەن، جا ئیتر خۆشیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن ) .

## ( ٢٢ ) ( كێشانی گیانی بڕواداران لە پێش هەستانی قیامەتدا )

( ١١٦٣ ) ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالىَ يَبْعَثُ رِيْحاً مِنَ الْيَمَنِ، أَلْيَنَ مِنَ الْحَرِيْرِ، فَلا تَدَعُ أَحَداً فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ إِيْمانٍ إلاّ قَبَضَتْهُ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٧٣) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بایەك دەنێرێت لە یەمەنەوە، لە ئاوریشم نەرمترە، هیچ کەسێك ناهێڵێتەوە کە هێندەی دەنکە مسقاڵێك لە باوەڕ لە دڵیدا بێت ئیلا گیانی دەکێشێت ) .

## ( ٢٣ ) ( یاجوج و ماجوج )

( ١١٦٤ ) ( حم د ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَأْجُوجَ وَ مَأْجُوجَ يَحْفِرُونَ كُلَّ يَوْمٍ حَتَّى إذا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمُ ارْجِعُوا فَسَنَحْفِرُهُ غَداً، فَيُعِيْدُهُ اللهُ أَشَدَّ مَا كَانَ حَتَّى إذا بَلَغَتْ مُدَّتُهُمْ وَ أَرَادَ اللهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلىَ النَّاسِ، حَفَرُوا حَتَّى إذا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ ارْجِعُوا فَسَنَحْفِرُهُ غَداً إِنْ شَاءَ اللهُ تَعالىَ ﴾. و اللفظ لأبي داود. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٢٧٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( یاجوج و ماجوج هەموو ڕۆژێك هەر هەڵدەکەنن، هەتا کەوەختە تیشکی خۆرەکە ببینن، ئەوەی کە بە سەریانەوەیە دەڵێ بگەڕێنەوە سبەینێ هەڵی دەکەنین، خوای گەورەش لە جارانی توند و قایمتر دەکاتەوە، هەتا ئەگەر گەیشتە ماوەکەی خۆیان، وە خوا ویستی بیانگەڕێنێتەوە سەر خەڵك، هەڵ دەکەنن هەتا کە وەختە تیشکی خۆر ببینن، ئەوەی کە بە سەریانەوەیە دەڵێ: بگەڕێنەوە سبەینێ دەگەڕێینەوە هەڵیدەکەنین - ئەگەر خوای گەورە وویستی - ) .

## ( ٢٤ ) ( کێشانەوە و هەڵگرتنی ئەمانەت )

( ١١٦٥ ) ( الحكيم ) عن زيد بن ثابت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَوَّلُ مَايُرْفَعُ مِنَ النَّاسِ الأَمَانَةَ وَ آخِرَ مَا يَبْقَى مِنْ دِيْنِهِمْ الصَّلاةَ وَ رُبَّ مُصَلٍ لا خَلاقَ لَهُ عِنْدَ اللهِ تَعالىَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٥٧٤) في صحيح الجامع

زیدی کوڕی ثابت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( یەکەم شت کە لە خەڵك هەڵدەگیریت ئەمانەتە، وە ئاخر شتیش کە لە دینەکەیان دەمێنێتەوە نوێژە، وە لەوانەیە کەسێك نوێژ خوێندیش بێت بەڵام لای خوای گەورە هیچ ئەرزشێکی نەبێت ).

## ( ٢٥ ) ( فیتنەی یاجوج و ماجوج )

( ١١٦٦ ) ( حم هـ حب ك ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ تُفْتَحُ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ فيخرجون كَمَا قَالَ اللَّهُ تعالى (وَهُمْ مِنْ كُلِّ حدب ينسلون) فيعُمُّون الأرض وينحاز منهم المسلمون حَتَّى تصير بقيَّةُ المسلمين في مدائنهم وحصونهم وَيَضُمُّون إليهم مواشيهم حتى أنَّهُم لَيَمُرُّون بالنَّهر فيشربونَهُ حَتَّى ما يذرون فيه شيئًا فَيَمُرُّ آخرُهُمْ على أثرهم فَيَقُولُ قائلهم لقد كان بهذا المكان مَرَّةً ماءٌ وَيَظْهرون على الأرض فَيَقُولُ قائلهم هَؤُلاَءِ أَهْلُ الأَرْضِ قد فرغنا منهم وَلَنُنَازِلَنَّ أَهْلَ السَّماء حتى إنَّ أحدَهُمْ لَيهُزُّ حربتَهُ إلى السَّماء فترجعُ مُخَضَّبَةً بالدَّم فَيَقُولُون قد قتلنا أهل السَّماء. فبينما هُمْ كذلك إذْ بعثَ اللَّهُ دوابَّ كَنَغَفِ الجراد فتأخُذُ بأعناقهم فيموتون موت الجراد يركب بعضُهُمْ بعضًا فيصبحُ المُسْلِمُون لا يَسْمَعُون لَهُمْ حسًّا فَيَقُولُونَ مَنْ رَجُلٌ يَشْرِي نَفْسَهُ وَيَنْظُرُ مَا فعلوا فَيَنْزِلُ منهم رَجُلٌ قد وطَّن نفسَهُ على أنْ يقتلُوهُ فَيَجِدُهُمْ مَوْتَى فَيُنَادِيهِمْ ألا أبشروا فقد هلك عَدُوُّكُمْ. فيخرجُ النَّاسُ ويُخْلُون سبيلَ مواشيهم فما يكونُ لَهُمْ رَعْيٌ إلاَّ لُحُومُهُمْ فتشكرُ عليها كأحْسَن ما شَكَرَتْ من نَبَاتٍ أصابَتْهُ قَطُّ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٩٧١) في صحيح الجامع

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( یاجوج و ماجوج دەکرێنەوەو دێنە دەرەوە وە هەر وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ( وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ )، واتە: ئەوانە لە هەموو بەرزاییەکەوە شۆڕ دەبنەوە، ئیتر هەموو زەوی دەگرنەوە، وە موسڵمانەکان خۆیان لێ لا دەدەن، وە باقی موسڵمانەکان دەچنە شار و قەڵاکانیانەوە، و وە مەڕ و ماڵاتیشیان دەخەنە لای خۆیان. تەنانەت ئەوانە بە لای رووباردا تێ دەپەڕن و دەیخۆنەوە هەتا هیچی تێدا ناهێڵن و ئەوانەی دواوەوە بە شوێنی ئەوانەی پێشەوەیان تێدەپەڕن و یەکێکیان دەڵێ: جارێکیان ئا لەم شوێنەدا ئاو هەبوو، وە زاڵ دەبن بەسەر زەویدا، جا یەکێکیان دەڵێ: ئەوانە خەڵکی زەوی بوون وا تەواو بووین لێیان. وە دەبێت لەگەڵ خەڵکی ئاسمانیشدا زۆران بگرین، تەنانەت یەکێکیان رمەکەی رادەوەشێنێت بەرەو ئاسمان. کە چی دەگەڕێتەوە خەڵتانی خوێن بووە، ئیتر دەڵێن: ئەوا خەڵکی ئاسمانیشمان کوشت، جا لە کاتێکدا کە ئەوان بەو جۆرەن، خوا جانەوەرێکیان بۆ دەنێرێت هەر دەڵێی کرمە کوللەیە، ئیتر دەداتە ملیان و پێی دەمرن وەك مردنی کوللە بەسەریەکتردا دەکەون و کەڵەکە دەبن، کە رۆژ دەبێتەوە موسڵمانەکان هیچ هەست و دەنگێکیان لێ نابیستن و دەڵێن: چ پیاوێك خۆی بەخت دەکات سەیرێکیان بکات بزانێت چییان کردووە، جا پیاوێکیان دێتە خوارەوە و دەستی لە خۆی بەرداوە کە دەیکوژن، کە دەبینێت مردوون ئینجا بانگیان دەکات، مژدە بێت لێتان، ئەوا دوژمنەکەتان تێدا چووە و فەوتاوە، ئیتر خەڵك دێنە دەرەوە و ئاژەڵەکانیان بەرەڵا دەکەن ئیتر هیچ لەوەڕێکیان نابێت جگە لە گۆشتی ئەوانە. بە جۆرێك کە تێر و هەڵئاوساو دەبێت لەسەری، هەروەك باشترین جار کە بە رووەك تێر و پڕ بوو بێت ).

## ( ٢٥ ) ( زۆر بوونی جۆرەکانی پۆلیس لە ئاخر زەماندا )

( ١١٦٧ ) ( طب ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ سَيَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ شُرْطَةٌ يَغْدُونَ فِي غَضَبِ اللهِ وَ يَرُوحُونَ فِي سَخَطِ اللهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٦٥٩ ) في صحيح الجامع

ابو امامة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە ئاخر زەماندا جۆرە پۆلیسێك پەیدا دەبن لە غەزەبی خوادا رۆژ دەکەنەوە و وە لە ناو خەشم و قینی خواشدا ئێوارەیان لێ بەسەر دێت ).

## ( ٢٦ ) ( سەرەتای هاتنی مەهدی )

( ١١٦٨ ) ( طب ) عن ام سلمة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُخْسَفُ بِهِمْ يُبْعَثُونَ إِلَى رَجُلٍ فَيَأْتِي مَكَّةَ فَيَمْنَعُهُ اللهُ تَعَالَى وَ يَخْسِفُ بِهِمْ، مَصْرَعُهُمْ وَاحِدٌ وَ مَصَادِرُهُمْ شَتَّى إِنَّ مِنْهُمْ مَنْ يُكْرَهُ فَيَجِيءُ مُكْرَهاً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٨٩٧ ) في صحيح الجامع

ام سلمة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم رۆ دەچن بە زەویدا، دەنێردرێنە سەر پیاوێك کە دێتە مەککە وە خوای گەورە دەیپارێزێت لێ یان و رۆیان دەچێنێت بە ناخی زەویدا، بە یەك مردن دەمرن بەڵام هەر یەکەیان و لە شوێنێکەوە هاتووە، وە تیایاندایە کە زۆری لێ کراوە و بە زۆرە ملێ هاتووە ).

( ١١٦٩ ) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿الْعَجَبُ إِنَّ نَاسًا مِنْ أُمَّتِي يَؤُمُّونَ بِالْبَيْتِ بِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ قَدْ لَجَأَ بِالْبَيْتِ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْبَيْدَاءِ خُسِفَ بِهِمْ ﴾. فقلنا يا رسول الله إِنَّ الطَّرِيقَ قَدْ يَجْمَعُ النَّاسَ. قال ﴿ نَعَمْ فِيهِمُ الْمُسْتَبْصِرُ وَالْمَجْبُورُ وَابْنُ السَّبِيلِ يَهْلِكُونَ مَهْلَكًا وَاحِدًا وَيَصْدُرُونَ مَصَادِرَ شَتَّى يَبْعَثُهُمُ اللهُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ﴾ . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٤١١٨ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ( سەیرە خەڵکانێك لە ئومەتەکەم ئاراستەی ماڵی بەیتیان گرتۆتە بەر بۆ پیاوێك لە قورەیش، کە پەنای بۆ ماڵی بەیت بردووە، هەتا کاتێك دەگەنە بیابانەکە خەسفیان پێ دەکرێت و رۆ دەچن بە ناخی زەویدا، تیایاندایە بە بەرچاوی رۆشنەوە هاتووە و وەتیایاندایە بە زۆر هێنراوە وە تیاشیاندایە رێبوارە، هەمووی بە یەك تیاچوون تیا دەچن، وە هەر یەکەیان بە رێیەکی جیاوازدا دەڕوات، خوا لەسەر نیەتەکانی خۆیان زیندوویان دەکاتەوە ).

( ١١٧٠ ) ( د ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ لَطَوَّلَ اللهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ حَتَّى يَبْعَثَ فِيهِ رَجُلٌ مِنِّي مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِيءُ اسْمُهُ اسْمِي وَ اسْمُ أَبِيهِ اسْمَ أَبِي يَمْلأُ الأَرْضَ قِسْطاً وَ عَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ ظُلْماً وَ جَوراً ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٣٠١ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر هیچ نەمێنێت لە دونیا تەنها رۆژێك نەبێت، ئەوا خوا ئەو رۆژە درێژ دەکاتەوە هەتا پیاوێك دەنێرێت لە منە یان لە ئال وبەیتی منە ناوی وەك ناوی

من دەبێت و ناوی باوکیشی وەك ناوی باوکم دەبێت، زەوی پڕ لە راستی و دادپەروەری دەکات هەر وەك چۆن پێشتر پڕ ببوو لە زوڵم و ستەم ).

( ١١٧١ ) ( حم د ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدَّهْرِ إلاّ يَوْمٌ لَبَعَثَ اللهُ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَمْلَؤُهَا عَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ جَوْراً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٣٠٤) في صحيح الجامع

علی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەگەر هیچ نەمێنێت لە زەمانە تەنها رۆژێك نەبێت، ئەوا خوا هەر پیاوێك دەنێرێت لەئال وبەیتی من ، پڕی دەکات لە دادپەروەری هەروەك پڕ ببوو لە ستەم ).

( ١١٧٢ ) ( حم د ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْمَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلَ الْبَيْتِ، يُصْلِحُهُ اللهُ فِي لَيْلَةٍ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٧٢٨) في صحيح الجامع

علی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( مەهدی لە ئێمەیە، خەڵکی ماڵەکەمانە، خوا لە شەوێکدا دەیسازێنێت ).

( ١١٧٣ ) ( ت ) عن ابن مسعود وأبي هريرة قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَلِي رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إلاّ يَوْمٌ لَطَوَّلَ اللهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ حَتَّى يَلِي ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣١٩) في صحيح الجامع

ابن مسعود و أبو هريرة دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك لێپسراویەتی وەردەگرێت کە لە ئال و بەیتی منە ناوی رێکەوتی ناوی من دەکات، ئەگەر هیچ نەمێنێت لە دونیادا تەنها رۆژێك نەبێت، ئەوا خوا ئەو رۆژە درێژ دەکاتەوە، هەتا ئەو کاری موسڵمانان دەگرێتە دەست).

## ( ٢٧ ) ( دوو دەستە خوا لە ئاگر دەیانپارێزێت )

( ١١٧٤ ) ( حم ن الضياء ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عِصَابَتَانِ مِنْ أُمَّتِي أَحْرَزَهُمَا اللهُ مِنَ النَّارِ عِصَابَةٌ تَغْزُو الْهِنْدَ وَ عِصَابَةٌ تَكُونُ مَعَ عِيسَى بْنَ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَام ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٩٩٥) في صحيح الجامع

ثوبان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دوو دەستە لە ئومەتەکەم خوا لە ئاگر پاراستوونی: دەستەیەك غەزای هیند دەکات، وە دەستەیەك لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا دەبن سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێت ).

## ( ٢٨ ) ( دەرگای تۆبە )

( ١١٧٥ ) ( تخ ) عن صفوان بن عسال قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ فَتَحَ الله بَاباً لِلتَّوْبَةِ مِنَ المَغْرِبِ عَرْضُهُ مَسِيْرَةَ سَبْعِيْنَ عَاماً لا يُغْلَقُ حَتَى تَطلُعَ الشَّمْسُ مِنْ نَحْوِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤١٧١) في صحيح الجامع

صفوانی کوڕی عسال دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوا دەرگایەکی کردۆتەوە بۆ تۆبە لە لای خۆر ئاواوە پانییەکەی حەفتا ساڵە ڕێ یە، داناخرێت هەتا خۆر لە وێوە هەڵ نەیەت ).

## ( ٢٩ ) ( دابەزینی عیسا سەلامی لەسەر بێت )

( ١١٧٦ ) ( د ) عن أبي هريرة عن النبي(ﷺ) قال: ﴿ لَيْسَ بَيْنِي وَ بَيْنَه – يَعني عيسىَ عليه السَّلام – نَبِيّ، وَ إِنَّهُ نَازِلٌ فَإِذا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ، رَجُلٌ مَرْبُوعٌ إِلى الْحُمْرَةِ وَ الْبَيَاضِ بَيْنَ مُمَصَّرَتَيْنِ كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ وَ إِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ، فَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلىَ الإِسْلام فَيَدُقُّ الصَّلِيْبَ وَ يَقْتُلُ الْخِنْزِيْرَ وَ يَضَعُ الْجِزْيَةَ وَ يُهْلِكُ الله فِي زَمانِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا إِلاّ الإِسْلامَ وَ يُهْلِكُ الْمَسِيْحَ الدَّجّالَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِيْنَ سَنَةً ثُمَّ يَتَوفَى فَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٣٧٤) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە نێوان من و ئەودا – واتە عیسا سەلامی لەسەر بێت – پێغەمبەرێکی تر نییە، وە ئەو دێتە خوار، جا ئەگەر بینیتان بیناسنەوە، پیاوێکی چوار شانەیە، بەلای سورو سپی دایە، لە نێوان دوو کاڵاپۆشی بە زەعفەران زەرد کراودایە هەر دەڵێی ئاو لەسەری دەتکێت هەرچەندە تەڕییشی بەر نەکەوتبێت، لەگەڵ خەڵکدا دەجەنگێت لەسەر ئیسلام، وخاچ دەشکێنێت و نەفرەت لە بەراز دەکات و سەرانە و جزیە لا دەبات و لەسەردەمی ئەودا خوا هەموو دینەکانی تر لادەبات تەنها ئیسلام نەبێت، وە مەسیحی دەجالیش لە ناو دەبات، وە چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، پاشان وەفات دەکات و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن ).

## ( ٣٠ ) ( چەند نیشانەیەکی تری قیامەت )

( ١١٧٧ ) ( هـ ) عن أبي هريرة ( م د ن ) عن عمر ( ن ) عن أبي هريرة وأبي ذر معا قالا: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا - يَعْنِي السَّاعَةَ - بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَ لَكِنْ سَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذا وَلَدَتِ الأَمَةُ رَبَّتَهَا فَذلِكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَ إِذا كَانَتِ الْحُفَاةُ الْعُرَاةُ رُؤُوسَ النَّاسِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَ إِذا تَطَاوَلَ رِعَاءُ الْغَنَمِ فِي الْبُنْيَانِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ مِنَ الْغَيْبِ لا يَعْلَمُهُنَّ إِلاّ الله: ﴿ إِنَّ الله عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ﴾، الآية ﴾. و اللفظ لابن ماجة. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٥٤٣) في صحيح الجامع

له ابو هريرة وه له عمر وه له ابو هريرة و ابوذر دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەوەی پسیارەکەی لێ دەکرێت دەربارەی - واتە کاتی هەستانی قیامەت - زیاتر نازانێت لەوەی کە پسیارەکە دەکات، بەڵام من نیشانەکانتی پێ دەڵێم: ئەگەر کەنیزەك خانمی خۆی لێ کەوتەوە، ئەوە لە نیشانەکانیەتی، وە ئەگەر پێ پەتییە روتەکان بوونە سەردارو وگەورەی خەڵك، ئەوە لە نیشانەکانیەتی. وە ئەگەر شوانە مەڕەکان بیناکانیان بە ئاسماندا بەرز کردەوە، ئەوە لە نیشانەکانیەتی، جا کاتی هەستانی قیامەت لەو پێنج شتەیە کە خوا نەبێت کەسی تر نایزانێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾، تا کۆتایی سورەتی لوقمان ).

## ( ٣١ ) ( بارودۆخی سەردەمی حوکی عیسا سەلامی لەسەر بێت )

**( ١١٧٨ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « و الله لينْزِلنَّ ابْنُ مريم حكما عادلا فليكْسرنَّ الصَّلِيب و ليقتُلن الخنْزِير و ليضعنَّ الجزْية و لتتركَنَّ القلاص فلا يسعى عليها و لتذْهبنَّ الشَّحْناءُ و التَّباغُضُ و التَّحاسُدُ و ليدعون إلى المال فلا يقْبَلُهُ أحدٌ ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٠٩٨ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سوێند بە خوا کوڕەکەی مەریەم دادەبەزێت حاکمێکی داد پەروەر دەبێت، خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و نەفرەتی لێ دەکات، و سەرانە لا دەبات و، ووشتریش وازی لێ دەهێنرێت کەس سواری نابێت، وە شەڕەنگێزی و رقە بەرایەتی و حەسوودی بەیەکتر بردن لەناو خەڵکدا نامێنێت، وە بانگ دەکات خەڵکینە وەرن پارەتان بدرێتێ. بەڵام کەس وەری ناگرێت ).

## ( ٣٢ ) ( کێشی دونیا لەچاو قیامەتدا )

**( ١١٧٩ ) ( حم م هـ ) عن المستورد قال: قال رسول الله(ﷺ): « و الله ما الدُّنْيا في الآخرَة إلاَّ مثْل مايَجْعلُ أحَدُكُمْ أصْبعَهُ هذه في اليَمّ فلْينْظُر بم يَرْجع ». ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٠٩٩ ) في صحيح الجامع**

المستورد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سوێند بە خوا دونیا هیچ نییە لە چاو قیامەتدا هەر هێندەی ئەوە نەبێت کە یەکێکتان ئەو پەنجەی لە دەریا بنێت ئینجا سەیری بکات چەندی پێوە دێتە دەر ).

## ( ٣٣ ) ( چ كاتێك قیامەت هەڵدەستێت )

( ١١٨٠ ) ( حم م ت ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): « لاتقومُ السَّاعةُ حتَّى لايُقال في الأرْض الله الله » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٤٠٦ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( قیامەت هەڵناسێت هەتا وای لێ دێت لە زەویدا کەس ناڵێت الله الله ).

## ( ٣٤ ) ( جەنگە جیهانییە گەورەکەی پێش قیامەت )

( ١١٨١ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « لا تقُومُ السَّاعةُ حتَّى ينْزل الرُّومُ بالأعماق أوْ بدابق فيخرجُ إليهم جيْشٌ من المدينة من خيار أهْل الأرض يوْمئذ فإذا تصافُّوا قالت الرُّومُ خلُّوا بيْننا وبيْن الَّذين سبوْا منَّا نُقاتلْهُمْ فيقُولُ المُسْلمُون لا واللَّه لا نُخلِّي بينكُمْ وبيْن إخْواننا فيُقاتلُونهُمْ فينْهزمُ ثُلُثٌ لا يتُوبُ اللَّهُ عليْهمْ أبدا ويُقْتلُ ثُلُثُهُمْ أفْضلُ الشُّهداء عنْد اللَّه ويفْتتحُ الثُّلُثُ لا يُفْتنُون أبدًا فيفْتتحُون قُسْطُنْطينيَّة فبيْنما هُمْ يقْتسمُون الْغنائمَ قدْ علَّقُوا سُيُوفهُمْ بالزَّيْتُون إذْ صاح فيهمُ الشَّيْطانُ إنَّ المسيح قدْ خلفكُمْ فى أهْليكُمْ فيخْرُجُون وذلك باطلٌ فإذا جاءُوا الشَّأم خرج فبيْنما هُمْ يُعدُّون للْقتال يُسوُّون الصُّفُوف إذْ أُقيمت الصَّلاةُ فينْزلُ عيسى ابْنُ مريم فأمَّهُمْ فإذا رآهُ عدُوُّ اللَّه ذاب كما يذُوبُ الْملْحُ فى الْماء فلوْ تركهُ لانْذاب حتَّى يهْلك ولكنْ يقْتُلُهُ اللَّهُ بيده فيُريهمْ دمهُ فى حرْبته » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٤٢٠ ) في صحيح الجامع

ابو هریرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( قیامەت هەڵناسێت هەتا رۆمەکان لە ( اعماق ) یان ( دابق ) دانەبەزن ئینجا لەشکرێکیان بۆ دەردەچێت لە شاری مەدینەوە، لە باشترین و چاکترین خەڵکی زەوین لەو رۆژەدا، جا کاتێك هەردوولا بەرامبەر بە یەکتر ریز دەبن رۆمەکان دەڵێن: دەست مەهێننە رێمان بائەو کەسانەی کە ئەندامانی ئێمەیان سەبی کردووە شەڕیان لەگەڵدا بکەین، موسڵمانەکانیش دەڵێن: نەخێر، سوێند بە خوا هەرگیز رێگەتان پێ نادەین پەلاماری براکانمان بدەن، ئیتر لەگەڵیان دەکەونە جەنگ، ئینجا سێ یەکیان هەڵدێت خوا قەد لێیان نابورێت، وە سێ یەکیشیان دەکوژرێن باشترین شەهیدانن لەلای خوا، وە سێ یەکیشیان زاڵ دەبن و سەردەکەون، هەرگیز جارێکی تر تووشی فیتنە و تاقیکردنەوە نابن، ئینجا قسطنطینیة - ئەستەمبوڵی ئەمڕۆ - ئازاد دەکەن، وە لە کاتێکدا کە سەرقاڵی دابەش کردنی غەنیمەتەکانن و شمشێرەکانیان بە دار زەیتوونەکانەوە هەڵواسیوە، ئا لەو کاتەدا شەیتان دەقیڕێنێت بە ناویاندا: ئەوا دەجال پەلاماری ماڵ و منداڵتانی داوە، ئەوانیش لە ئەستەمبوڵەوە دەردەچن و هەواڵەکەش درۆ بوو، جا کاتێك کە دەگەنە شام ئینجا دەجال دەردەچێت، وە لەو کاتەدا کە ئەوان خۆیان بۆ جەنگ و کوشتار ئامادە دەکەن، ریزەکانیان رێك دەکەن و قامەت بۆ نوێژ دەکەن لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە دەبێتە پێشەوایان، کاتێك کە دوژمنەکەی خوا

بینی، دەتوێتەوە، هەروەك توانەوەی خوێ لە ئاودا، جا ئەگەر وازی لێ بهێنایە هەرتەواو دەتوایەوە هەتا دەمرد، بەڵام خوا لەسەر دەستی ئەو دەیکوژێت، ئینجا خوێنەکەیان پیشان دەدات بە ڕمەکەیەوە ).

## ( ٣٥ ) ( خەڵك دەست لە داگیر کردنی کەعبە هەڵناگرن )

**( ١١٨٢ ) ( حم ت ن هـ ) عن صفية قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لا تَنْتَهِي النَّاسُ عَنْ غَزْوِ هَذَا الْبَيْتِ حَتَّى يَغْزُوَها جَيْشٌ حَتَّى إِذا كَانُوا بِالْبَيْداءِ أَوْ بَبَيْداءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِأَوَّلِهِمْ وَ آخِرِهِمْ، وَ لَمْ يَنْجُ أَوْسَطُهُمْ، قلت يا رسول الله(ﷺ): فَمَنْ كَرِهَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: يَبْعَثُهُمُ الله عَلَىَ مَا فِي أَنْفُسِهِمْ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٧٤٤٣ ) في صحيح الجامع**

صفیە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خەڵك دەست لە هێرش کردنە سەر ئەم ماڵی خوایە هەڵناگرن، هەتا لەشکرێك هێرشی بۆ دەکات، و کاتێك کە دەگەنە بیابانەکە یان کە دەگەنە زەوییەکی بیابان: لەسەرەتاو کۆتاییەکەیان ڕۆ دەچن بەزەویدا، وە ناوەراستەکەیشیان ڕزگاری نابێت ). ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەوانەی کە بە زۆرە ملێ هێنراون؟ )، فەرمووی: خوا هەریەکەیان بە پێی ئەوەی کە لە دڵیدایە زیندووی دەکاتەوە ).

# (( بەشی: ڕووداوەکانی قیامەت ))

## (١) ( ئەو ڕۆژەی کە بەڵێن بە هاتنی دراوە )

**( ١١٨٣ ) ( طب ) عن أبي مالك الأشعري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اليَوْمُ المَوْعُودِ يَوْمُ القِيَامَةِ، وَ الشَّاهِدُ يَوْمُ الجُمُعَةِ، و المَشْهُودُ يَوْمُ عَرَفَةَ، وَ يَوْمُ الجُمُعَةِ ذَخَرَهُ الله لَنا، وَ صَلاةُ الوُسْطَى صَلاةُ العَصْرِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٩٦) في صحيح الجامع**

ابو مالك الاشعري دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەو ڕۆژەی بەڵێن بە هاتنی دراوە ڕۆژی قیامەتە، وە شایەتەکەش ڕۆژی هەینییە، وە شایەتی لەسەر دراوەکەش ڕۆژی عەرەفەیە، وە هەینیش خوای گەورە بۆ ئێمەی هەڵگرتووە، وە نوێژی ناوەڕاستیش نوێژی عەسرە ).

## ڕوون کردنەوەی فەرەرموودەکە :

فەرموودەکە مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە دەکات کە دەفەرموێت: وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ )البروج/٢-٣.

**( ١١٨٤ ) ( ت هق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ اليَوْمُ المَوْعُودِ يَوْمُ القِيَامَةِ وَ اليَوْمُ المَشْهُودِ يَوْمُ عَرَفَةَ، وَ الشَّاهِدُ يَوْمُ الجُمُعَةِ، وَ مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَ لا غَرَبَتْ عَلَى يَوْمٍ أَفْضَلَ مِنْهُ، فِيهِ سَاعَةٌ لايُوافِقُها عَبْدٌ مُؤْمِنٌ يَدْعُو الله بِخَيْرٍ إلاَّ اسْتَجَابَ الله لَهُ وَ لا يَسْتَعِيذُ مِنْ شَيْءٍ إلاَّ أَعَاذَهُ الله مِنْهُ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٨٢٠٠) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( - اليوم الموعود - واتە ڕۆژە بەڵێن پێ دراوەکە ئەوە ڕۆژی قیامەتە، وە ڕۆژە شایەتی لەسەر دراوەکەیش ( و مشهود ) ڕۆژی عەرەفەیە، وە شایەتەکەش ( و شاهد ) ڕۆژی هەینییە )، فەرمووی: ( وە خۆر لەسەر هیچ ڕۆژێك هەڵنەهاتووە و ئاوا نەبووە لە ڕۆژی هەینی باشتر بێت، ساتە وەختێکی تێدایە، هەر بەندەیەکی باوەڕدار ڕێکەوتی بکات بۆ شتێکی باش و چاك لە خوا بپاڕێتەوە، ئیلا خوا پێی دەدات، وە پەناش بە خوا لەهەر شتێك بگرێت ئەوا خوای گەورە پەنای دەدات لێی ).

## ( ٢ ) ( دونیا هەمووی کەمە )

( ١١٨٥ ) ( ك ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَ اللهَ تَعالىَ جَعَلَ الدُنْيَا كُلَها قَليْلاً وَمَا بقِيَ منْهَا إلاَّ القَليْلُ كَالثُّغْبِ شُرب صفوُهُ و بَقِيَ كدرُهُ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٣٢) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە دونیای هەموو بە کەم داناوە. وە ئەوەیشی کە ماوەتەوەلێی کەمترە. هەر وەك كانییەكی کەم ئاو، روونییەکەی خوراوەتەوە و لێڵییەکەی ماوە ).

## ( ٣ ) ( خوا زەوی دەخاتە چنگی خۆیەوە )

( ١١٨٦ ) ( ق ن هـ ) عن أبي هريرة ( خ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَقْبِضُ اللهُ تَبارك وَتَعالىَ الأَرْض يَوْمَ الْقِيَامَةِ و يَطْوِي السَمَواتَ بِيَمِيْنه . ثُمَ يَقُولُ: أَنَا الْملكُ أَيْنَ مُلوكُ الأَرْض؟ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٦٧) في صحيح الجامع

ابو هريره و إبن عمر دەڵێن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای تەبارەك و تعالا زەوی دەخاتە چنگییەوە لە رۆژی قیامەتدا، وە ئاسمانەکانیش بە راستەی خۆی دەپێچێتەوە، پاشان دەفەرموێت: من پادشام کوا پاشاکانی زەوی )

## ( ٤ ) ( چۆنێتی حەشر کردنی خەڵك )

( ١١٨٧ ) ( حم ق ت ن ) عن ابن عباس قال: قام رسُولُ الله(ﷺ) بالمَوْعظَة فَقَال: ﴿ يا أَيُهَا النَّاسُ إنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إلَى الله عُرَاةً غُرلاً ﴾. ثمَ قرأ :(كَمَا بَدأنَا أَوَّل خَلْق نُعيدُهُ وعْدًا علَيْنَا )إلى آخر الآية قال : ﴿أَوَّلُ مَنْ يُكْسَى يوْمَ الْقِيَامَةِ إبْراهِيمُ وَإنَّهُ سيُؤْتى برجَالٍ منْ أُمَتِى فيُؤْخَذُ بهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ فَأَقُولُ رَبِّ أَصْحَابِى. فيُقَالُ إنَّك لاَ تَدْرى مَا أَحْدَثُوا بَعْدَك. فَأقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ (وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنى كُنْتَ أَنْتَ الرَّقِيب عَلَيْهِمْ وَأَنْتَ عَلى كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ إنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ) فيُقَالُ هَؤُلاَءِ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ﴾ و اللفظ للترمذي (حسن) أنظر حيث رقم (٧٨٦٧) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بۆ ئامۆژگاری کردن و فەرمووی: ( ئەی خەڵکینە ئێوە حەشر دەکرێن بۆ لای خوا بە روتی و دەست و پێ سپێتی ). پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾، هەتا کۆتایی ئایەتەکە فەرمووی: ( یەکەم کەس کە بەرگ و پۆشاك دەکرێت بە کاڵایدا رۆژی قیامەت ئیبراهیمە، وە پیاوانێك لە ئومەتەکەم دەهێنرێن و بەرەو لای چەپ دەبرێن، منیش دەڵێم پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵی منن، ئینجا دەوترێت: تۆ نازانیت لە دوای تۆ چییان کردووە، منیش

دەڵێم: هەروەك كە بەندە ساڵحەكە وتی: ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾، واتە: من هەتا لە ناوياندا بووم شايەت بووم بە سەريانەوە، جا كاتێك كە منت بردەوە لای خۆت، ئيتر هەر تۆ چاودێر بوويت بە سەريانەوە. وە تۆش لەسەر هەموو شتێك شايەتيت، ئەگەر ئەشكەنجەيان بدەيت ئەوە هەر بەندەی خۆتن، وە ئەگەر لێشيان ببوريت ئەوە هەر خۆت لێبوردەو خاوەن رەحميت. ئينجا دەوترێت: ئەوانە بەردەوام پاشگەز ببونەوە بە هەڵگەڕاوەيی لەو كاتەوەی كە بەجێت هێشتن )

## ( ٥ ) ( شايەت دانی ئومەتی موحەمەد لەسەر ئومەتەكانی تر )

**( ١١٨٨ ) ( حم خ ت ن هـ ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله ﷺ: ﴿ يجيءُ نوحٌ وَ أُمَّتُهُ فَيَقُولُ الله: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، أَيْ ربِّ! فَيَقُولُ لأُمَّته: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُون: لا مَا جَاءَ لَنَا مِنْ نَبِيٍّ، فَيَقُولُ لنُوحٍ مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَ أُمَّتُهُ. وَ هُوَ قَوْلُهُ تعالى: ﴿ وَ كَذَلكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسطاً لتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاس و يَكُونَ الرَسُولُ عليكُمْ شَهِيْداً ﴾، وَ الْوَسطُ: الْعَدْلُ فَيَدْعُونَ فَيَشْهَدُونَ لَهُ بِالْبَلاغِ ثُمَّ أَشْهَدُ عَلَيْكُمْ ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٣٢) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ( نوح و ئومەتەكەی دێن و خوا دەفەرموێت: ئايا پێت گەياندن و ئاگادارت كردنەوە، ئەويش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، ئينجا دەفەرموێت بە ئومەتەكەی نوح: ئايا ئاگاداری كردنەوە و پێی راگەياندن ؟ ئەوانيش دەڵێن: نەخێر هيچ پێغەمبەرێكمان بۆ نەهات، ئينجا بە نوح دەڵێ: كێ شايەتيت بۆ دەدات ؟ ئەويش دەڵێ: محمد و ئومەتەكەی ! هەر ئەوەيشە مانای فەرمايشتەكەی خوای گەورە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾، واتە: بەو جۆرە ئێوەی كردووە بە ئومەتێكیڕاست وعەدل هەتا بين بە شايەت بەسەر خەڵكەوە، وە پێغەمبەريش ببێت بەشايەت بەسەرتانەوە، وە (وسط) واتە راست و عەدل، جا بانگ دەكرێن و شايەتی بۆ دەدەن كە پەيامەكەی پێ گەياندوون پاشان منيش شايەتی دەدەم لەسەرتان )

## ( ٦ ) ( قەزاوەت كردنی خوا بۆ بەندەكانی لە رۆژی قيامەتدا )

**( ١١٨٩ ) ( ت ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ: ﴿أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ يَنْزِلُ إلى الْعِبادِ لِيَقْضِيَ بَيْنَهُمْ وَكُلُّ أُمَّةٍ جَاثِيَةٌ فَأَوَّلُ مَنْ يَدْعُو بِه رَجُلٌ جَمَعَ الْقُرْآنَ وَرَجُلٌ قُتِلَ فِي سبيل اللّه ورجُلٌ كَثِيرُ الْمَالِ فَيَقُولُ اللَّهُ لِلْقَارِئ أَلَمْ أُعَلِّمْكَ مَا أَنْزَلْتُ عَلَى رَسُولِي قَالَ بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ فَمَاذَا عملتَ فيما عَلِمْتَ قَالَ كُنْتُ أَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ كَذَبْتَ وَتَقُولُ لَهُ الْمَلائِكَةُ كَذَبْتَ وَيَقُولُ اللَّهُ لَه بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ إِنَّ فُلاناً قَارِئٌ فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ. وَيُؤْتَى**

بِصَاحِب الْمَالِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ أَلَمْ أُوسِّعْ عَلَيْكَ حَتَّى لَمْ أَدَعْكَ تَحْتَاجُ إِلَى أَحَد قَالَ بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا آتَيْتُكَ قَالَ كُنْتُ أَصِلُ الرَّحِمَ وَأَتَصَدَّقُ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ كَذَبْتَ وَتَقُولُ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ كَذَبْتَ وَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ فُلاَنٌ جَوَادٌ فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ. وَيُؤْتَى بِالَّذِى قُتِلَ فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ فِى مَاذَا قُتِلْتَ فَيَقُولُ أُمِرْتُ بِالْجِهَادِ فِى سَبِيلِكَ فَقَاتَلْتُ حَتَّى قُتِلْتُ. فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى لَهُ كَذَبْتَ وَتَقُولُ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ كَذَبْتَ وَيَقُولُ اللَّهُ بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ فُلاَنٌ جَرِىءٌ فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ ﴾. ثُمَّ ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) عَلَى رُكْبَتِي فَقَالَ: ﴿ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أُولَئِكَ الثَّلاَثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ اللَّهِ تُسَعَّرُ بِهِمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧١٣) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای تەبارەك و تعالا كە رۆژی قیامەت هات دادەبەزێت بۆ لای بەندەكان بۆ ئەوەی قەزاوەت بكات لە نێوانیاندا، وە هەموو ئومەتێكیش بە چۆكدا كەوتووە، جا یەكەم كەس بانگ دەكرێت پیاوێكە قورئانی كۆكردۆتەوە و لەبەری كردووە، وە پیاوێكیش لە پێناوی خوادا كوژراوە، وە پیاوێكیش ماڵ و سامانی زۆر بووە. جا خوا بە قورئان خوێنەكە دەفەرمووێت: ( باشە ئەوەی كە بۆ سەر پێغەمبەرەكەم ناردووە فێرم نەكردیت ؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارە، فەرمووی: دەی چ كارێكت بەوە كرد كە فێری ببویت و دەتزانی ؟ وتی: شەو و رۆژ دەمخوێندەوە و دەورم دەكردەوە. خوایش پێی دەفەرمووێت: درۆت كرد، وە فریشتەكانیش پێی دەڵێن: درۆت كرد، وە خوایش پێی دەفەرمووێت: بەڵكو ویستت كە بوترێت كە فڵانە كەس قورئان خوێنە، دەی ئەوە واوترا، وە خاوەن ماڵ و سامانەكە دەهێنرێت، خوا دەفەرمووێت: ئایا ئەوەندەم بۆ فراوان نەكردیت هەتا نەم هێشت پێویستیت بە هیچ كەسێك هەبێت؟ ووتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، فەرمووی: دەی چیت كرد لەوەی كە پێم دابوویت ؟ وتی: سیلەی رەحمم پێ گەیاند و خێرم پێ كرد، خوایش پێی دەفەرمووێت: درۆت كرد، وە فریشتەكانیش پێی دەڵێن: درۆت كرد، وە خوای گەورە دەفەرمووێت: بەڵكو ویستت كە بوترێت فڵانەكەس خێرەومەندەو دڵ سەخاوەتە، دەی ئەوا ووتیان، وە ئەوەیشی كە لەپێناوی خوادا كوژرابوو دەهێنرێت، و خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: لە پێناوی چیدا كوژرایت ؟ ئەویش دەڵێ: تۆ فەرمانت كردبوو بە جیهاد كردن لە پێناوتدا منیش شەڕم كرد هەتا كوژرام. خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: درۆت كرد، وە فریشتەكانیش پێی دەڵێن: درۆت كرد، وە خوای گەورە دەفەرمووێت: بەڵكو ویستت كە بوترێت فڵان كەس چاونەترس و ئازایە، دەی ئەوە وا ووترا )، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) كێشای بە ئەژنۆمدا و فەرمووی: ( ئەی ئەبا هریرە ئەوانە یەكەم دروست كراوی خوان كە ئاگریان پێ بڵێسە دەدرێت لە رۆژی قیامەتدا ).

## ( ٧ ) ( یەكەم كەس كە لێ پرسینەوەی لەگەڵدا دەكرێت )

( ١١٩٠ ) ( د ) عن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ مُوسَى قَالَ: يَا رَبِّ أَرِنَا آدَمَ الَّذِي أَخْرَجَنَا وَ نَفْسَهُ مِنَ الجَنَّةِ، فَأَرَاهُ اللهُ آدَمَ فَقَالَ: أَنْتَ أَبُونَا آدَمُ؟ فَقَالَ لَهُ آدَمُ: نَعَمْ، قَالَ أَنْتَ الَّذِي

**نَفَخَ اللهُ فِيْكَ مِنْ رُوحِه وَ عَلَّمَكَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا وَ أَمَرَ الْمَلائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَما حَمَلَكَ عَلى أَنْ أَخْرَجْتَنَا وَ نَفْسَكَ مِنَ الْجَنَّةِ؟ فَقَالَ لَهُ آدَمُ: وَ مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا مُوسى، قَالَ: أَنْتَ نَبِيّ بَنِي إِسْرَائِيْلَ الَّذِي كَلَّمَكَ اللهُ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ لَمْ يَجْعَلْ بَيْنَكَ وَ بَيْنَهُ رَسُولاً مِنْ خَلْقِه؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَفَمَا وَجَدْتَ أَنَّ ذلِكَ كَانَ فِي كِتَابِ اللهِ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَبِمَ تَلُومُنِي فِي شَيْءٍ سَبَقَ مِنَ اللهِ فِيْهِ الْقَضَاءُ قَبْلِي؟﴾ ، قَالَ رَسُولُ الله(ﷺ) عِنْدَ ذلِكَ: ﴿ فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلامُ ﴾.**

**( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٣٨ ) في صحيح الجامع**

عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( موسا وتی: ئەی پەروەردگارم ئەو ئادەمەمان پیشان بدە کە ئێمە و خۆیشی لە بەهەشت بەدەرکردن دا، خوایش ئادەمی پیشان دا، و وتی: ئایا تۆ ئادەمی باوکمانی ؟ ئادەمیش پێی ووت: بەڵێ، وتی: تۆ ئەوە بوویت کە خوا لە ڕۆحی خۆی کرد بەبەرتدا و هەموو ناوەکانی فێر کردیت و فەرمانی بە فریشتەکان کرد و ئەوانیش سوجدەیان بۆ بردیت ؟ ئەویش وتی: بەڵێ، وتی: دەی چی وای لێ کردیت کە ئێمە و خۆیشت بە دەرکردن دا لە بەهەشت ؟ ئادەمیش پێی ووت: ئەی تۆ کێیت ؟ وتی: من موسام، وتی: تۆ پێغەمبەرەکەی بەنی ئیسرائیلیت کە خوا لەپشت پەردەوە قسەی لەگەڵ کردویت و هیچ نێردراوێکی لە دروست کراوەکانی خۆی نەخستۆتە نێوان تۆ و نێوان خۆیەوە ؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی نەتبینیوە کە ئەوەی بەسەر من هات لە کیتابەکەی خوادا باسی هاتووە پێش ئەوەی کە هەر دروستیش بکرێم ؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی لەسەر چی لۆمە و گلەییم لێ دەکەیت، لەسەر شتێك کە هەر لە پێش منەوە قەزای خوای لەسەر بووە ؟ ) ئینجا لەوێدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( ئیتر ئادەم موسای بەڵگە بڕاو کرد، سەلام لەسەر هەردووکیان بێت ).

## ( ٨ ) ( ئادەم موسای بەڵگە بڕ کرد سەلامیان لەسەر بێت )

**( ١١٩١) ( حم ق ت هـ ) عن عدي بن حاتم قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَامِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ سَيُكَلِّمُهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ بَيْنَهُ وَ بَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَيْمَنَ مِنْهُ فَلا يَرَى إِلاَّ مَاقَدَّمَ وَ يَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ فَلا يَرَى إِلاَّ مَاقَدَّمَ وَ يَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْه فَلا يَرَى إِلاَّ النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِه، فَاتَّقُوا النَّارَ وَ لَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ وَ لَوْ بِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ﴾، يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رَبِّه عَزَّوَجَلَّ، حَتَّي يَضَعَ عَلَيْه كَنَفَهُ فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِه، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُ؟ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَعْرِفُ، قَالَ: فَإِنِّي قَدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَإِنِّي أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ، فَيُعْطَى حَسَنَاتِه، فَيُنَادِي بِهِمْ عَلَى رُؤُوسِ الْخَلائِقِ ﴾.** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٧٩٦ ) في صحيح الجامع

عَدي کوڕی حاتم دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ یەکێك لە ئێوە نییە، ئیلا خوای گەورە قسەی لەگەڵ دەکات، هیچ وەرگێڕێکی زمان لە نێوانیاندا نییە، جا سەیری لای ڕاستی خۆی دەکات، هیچ نابینێت جگە لەوەی کە پێشی خستووە، وە سەیری لای چەپی خۆی دەکات، هیچ نابینێت جگە لەوەی کە پێشی خستووە، وە سەیری بەردەمی خۆی دەکات، هیچ نابینێت جگە لە ئاگر کە ڕوو

بەڕوویەتی، جا خۆتان بپارێزن ئەگەر بە کەرتی دەنکە خورمایەکیش بێت، وە ئەگەر بە تەنها ووشەیەکی باشیش بێت).

## (٩) ( پۆشینی تاوانی باوەڕدار لە قیامەتدا )

**( ١١٩٢ ) ( حم ق ن هـ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ اللهَ تعالى يُدْني المؤمنَ فيضعُ عليه كنفَهُ و سَترَهُ منَ الناسِ و يُقرره بذنوبه فيقولُ: أتعْرفُ ذنْبَ كذا؟ أتعْرفُ ذنْبَ كذا؟ فيقُولُ: نَعَمْ، أي ربِّ حتّى إذا قرّرَهُ بذنوبه و رأى في نَفْسه أنَّهُ قد هلك، قال: فإنّي قدْ سترتُها عليكَ في الدُّنيا وَ أنا أغفرُها لكَ اليومَ ثُمَّ يُعطى كتابَ حسناته بيمينه. و أمّا الكافرُ و المُنافقُ فيقُولُ الأشهادُ: هَؤُلاءِ الذين كَذَبُوا على ربِّهِمْ ألا لعنةُ الله على الظّالمين ». (صحيح) أنظر حيث رقم (١٨٩٤) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بڕوادار نزیك دەكاتەوە، ئینجا پەردەو ستری خۆی دەدات بەسەریدا لە خەڵك، وە دانی پێدا دەنێت بە تاوانەكانیدا و دەفەرمووێت: ئائەو تاوانە دەزانیت ؟ ئا ئەو تاوانە دەناسیتەوە ؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، هەتا كاتێك كە دانی پێدا دەنێت بە تاوانەكانیدا، وە وا خۆی دەبینێت كە تیا چووە، دەفەرمووێت: دەی من لە دونیادا بۆم پۆشیویت، وە منیش ئەمڕۆ بۆت دەبورم لێیان، پاشان نامەی چاكەكانی بەدەستی راستی دەدرێتێ، بەڵام بێ باوەڕ و دوو ڕوو، ئەوا هەموو ئامادەبووان دەڵێن: ئەمانە ئەوانە بوون كە درۆیان لەسەر خوا كردووە، دەی نەفرەتی خوا لە ستەم كاران بێت ).

**( ١١٩٣ ) ( حم م ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إن أوّل الناس يقضى يوم القيامة عليه رجل استشهد فأتي به فعرّفه نعمهُ فعرفها قال فما عملت فيها قال قاتلت فيك حتّى استشهدت. قال كذبت ولكنّك قاتلت لأنْ يقال جريءٌ. فقد قيل. ثمّ أمر به فسُحب على وجهه حتّى أُلقي في النّار ورجلٌ تعلّم العلم وعلّمه وقرأ القرآن فأُتي به فعرّفه نعمهُ فعرفها قال فما عملت فيها قال تعلّمتُ العلم وعلّمته وقرأتُ فيك القرآن. قال كذبْتَ ولكنّك تعلمت العلم ليقال عالمٌ. وقرأت القرآن ليقال هو قارئٌ. فقد قيل ثمّ أمر به فسُحب على وجهه حتّى أُلقي في النّار ورجل وسّع اللهُ عليه وأعطاه من أصناف المال كلّه فأُتي به فعرّفه نعمهُ فعرفها قال فما عملتَ فيها قال ما تركت من سبيل تحبُّ أن يُنفق فيها إلاّ أنفقتُ فيها لك قال كذبت ولكنّك فعلت ليقال هو جوادٌ. فقد قيل ثمّ أمر به فسُحب على وجهه ثمّ أُلقي في النّار ». واللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠١٤) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( یەكەم كەس كە ڕۆژی قیامەت حوكمی لەسەر دەدرێت، پیاوێكە شەهید بووە ئینجا دەهێنرێت و هەموو نیعمەتەكانی خۆی پێ دەناسێنێتەوە و ئەویش دەیناسێتەوە، دەفەرمووێت: دەی چ كارێكت بەو نیعمەتانە كرد ؟ دەڵێ: لەسەر تۆ جەنگام هەتا كوژرام، فەرمووی: درۆت كرد، بەڵام تۆ شەڕت كرد بۆ ئەوەی پێت بوترێت ئازایە و چاو نەترسە، دەی ئەوا

ووترا، پاشان فەرمانی لەسەر دەدات و لەسەر دەم و چاوی رادەکێشرێت هەتا فڕێ دەدرێتە ئاگرەوە، وە پیاوێکیش فێری زانیاری بووە و خەڵکی فێرکردووە و قورئانی خوێندووە ئینجا دەهێنرێت، و نیعمەتەکانی کە پێی دابوو وە بیری دەهێنێتەوە و ئەویش دەیان ناسێتەوە، فەرمووی: چ کارێکت پێی کردووە ؟ وتی: فێری زانیاری بووم و خەڵکم فێر کردووە و لەبەر تۆش قورئانم خوێندووە. دەفەرموێت: درۆت کرد، بەڵام تۆ فێری زانیاری بوویت بۆئەوەی بووترێت زانایە، وە قورئانت خوێندووە هەتا بڵێن قورئان خوێنە، دەی وا ووترا، پاشان فەرمانی لەسەر دەکات و رادەکێشرێت لە سەردەم و چاوی هەتا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە ).

## ( ١٠ ) ( مردن لەسەر هەموو کەس واجیبە )

( ١١٩٤ ) ( حم خ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ) لفاطمة رضي الله عنها: ﴿ إنَّهُ قَدْ حَضَرَ مِنْ أَبِيْكِ مَا لَيْسَ اللهُ تَعالَى بِتَارِكٍ مِنْهُ أَحَداً لِمُوافاةِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٣٩٨ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە ( فاطمة )ی فەرموو: ( ئەوا باوکیشت کاتی شتێکی هاتووە کە خوای گەورە، هیچ کەسێکی لێ نابوێرێت و ناپەرێنێت بۆ ئامادە بوونی رۆژی قیامەت ).

## ( ١١ ) ( یەکەم شت کە مرۆڤ پرسیاری دەربارەی دەکرێت )

( ١١٩٥ ) ( حم د هـ ك ) عن تميم الداري قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَلاتُهُ فَإِنْ كَانَ أَتَمَّهَا كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً وَ إِنْ لَمْ يَكُنْ أَتَمَّهَا قَالَ اللهُ لِمَلائِكَتِهِ: انْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَتُكَمِّلُونَ بِهَا فَرِيضَتَهُ؟ ثُمَّ الزَّكَاةَ كَذَلِكَ ثُمَّ تُؤْخَذُ الأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٦٥ ) في صحيح الجامع

تميم الداري دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( یەکەم شت لە رۆژی قیامەتدا کە بەندە پسیاری لە دەربارەی لێ دەکرێت، نوێژەکانییەتی، جا ئەگەر بە تەواوی کردبنی، ئەوا تەواو بۆی دەنووسرێت وە ئەگەر بە تەواویش نەیکردبن، ئەوا بە فریشتەکانی دەفەرموێت، سەیر بکەن بزانن ئەم بەندەیەم هیچ نوێژێکی سوونەتی زیاد لە فەرزەکانی کردووە هەتا فەرزەکانی بۆ پێ تەواو بکەن ؟ پاشانیش زەکات بەهەمان شێوە، پاشانیش کردەوەکانی بەو جۆرە وەردەگیرێن ).

## ( ١٢ ) ( یەکەم کەس لە دروست کراوەکانی خوا کە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێن )

( ١١٩٦ ) ( خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَوَّلُ مَنْ يُدْعَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ: آدَمُ فَتَتَرَاءى لَهُ ذُرِّيَّتُهُ فَيُقَالُ: هَذَا أَبُوكُمْ آدَمُ فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَ سَعْدَيْكَ فَيَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ جَهَنَّمَ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ كَمْ أُخْرِجُ؟ فَيَقُولُ: أَخْرِجْ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةً وَ تِسْعِينَ ﴾، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) إِذَا أُخِذَ مِنَّا مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَ تِسْعُونَ فَمَاذَا يَبْقَى مِنَّا؟ قَالَ: ﴿ إِنَّ أُمَّتِي فِي الْأُمَمِ كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٧٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( یەکەم کەس کە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێت ئادەمە، ئینجا هەموو نەوەکانی خۆی نیشان دەدرێت و دەوترێت: ئەمە ئادەمی باوکتانە، ئەویش دەڵێ: بەڵێ، گوێ ڕایەڵ و ئامادەم، ئەویش پێی دەفەرموێت: ئەوانەی کە دەنێرێن بۆ دۆزەخ لە نەوەکەت دەریان بهێنە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چەند دەربهێنم، ئەویش دەفەرموێت: لە هەموو سەدێک نەوەد و نۆی دەربهێنە ) .ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە هەموو سەد کەسمان نەوەد و نۆمان لێ ببەن، ئەی چی دەمێنێتەوە ؟ فەرموی: ئومەتەکەی من لە ناو ئومەتەکانی تردا وەکو موویەکی سپی وایە لە گایەکی ڕەشدا ) .

## ( ١٤ ) ( شەفاعەت کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئومەتەکەی )

( ١١٩٧ ) ( حم ق ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهَلْ تَدْرُونَ بِمَ ذَاكَ يَجْمَعُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَيُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمُ الْبَصَرُ وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لَا يُطِيقُونَ وَمَا لَا يَحْتَمِلُونَ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ أَلَا تَرَوْنَ مَا أَنْتُمْ فِيهِ أَلَا تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ أَلَا تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ ائْتُوا آدَمَ. فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَأَمَرَ الْمَلَائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ أَلَا تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا فَيَقُولُ آدَمُ إِنَّ رَبِّي غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ نَفْسِي نَفْسِي اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ. فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ يَا نُوحُ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى الْأَرْضِ وَسَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا فَيَقُولُ لَهُمْ إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا عَلَى قَوْمِي نَفْسِي نَفْسِي اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ (ﷺ)فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ أَلَا تَرَى إِلَى

ما قد بلغنا فيقول لهم إبراهيم ان ربى قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله ولا يغضب بعده مثله. وذكر كذباته نفسى نفسى اذهبوا الى غيرى اذهبوا إلى موسى. فيأتون موسى(ﷺ) فيقولون يا موسى أنت رسول الله فضلك الله برسالاته وبتكليمه على الناس اشفع لنا الى ربك ألا ترى الى ما نحن فيه الا ترى ما قد بلغنا فيقول لهم موسى -صلى الله عليه وسلم- إن ربى قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله ولن يغضب بعده مثله وانى قتلت نفسا لم أومر بقتلها نفسى نفسى اذهبوا الى عيسى (ﷺ) فيأتون عيسى فيقولون يا عيسى أنت رسول الله وكلمت الناس فى المهد وكلمة منه ألقاها الى مريم وروح منه فاشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ألا ترى ما قد بلغنا فيقول لهم عيسى (ﷺ) إن ربى قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله ولن يغضب بعده مثله - ولم يذكر له ذنبا - نفسى نفسى اذهبوا إلى غيرى اذهبوا إلى محمد (ﷺ) فيأتونى فيقولون يا محمد أنت رسول الله وخاتم الأنبياء وغفر الله لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ألا ترى ما قد بلغنا فأنطلق فآتى تحت العرش فأقع ساجدا لربى ثم يفتح الله علىّ ويلهمنى من محامده وحسن الثناء عليه شيئا لم يفتحه لأحد قبلى ثم يقال يا محمد ارفع رأسك سل تعطه اشفع تشفع. فأرفع راسى فأقول يا رب أمتى أمتى. فيقال يا محمد ادخل الجنة من أمتك من لا حساب عليه من الباب الأيمن من أبواب الجنة وهم شركاء الناس فيما سوى ذلك من الأبواب والذى نفس محمد بيده إنّ ما بين المصراعين من مصاريع الجنة لكما بين مكة وهجر أو كما بين مكة وبصرى ». (صحيح) أنظر حيث رقم (١٤٦٦) في صحيح الجامع

ابو هريره دەگێڕێتەوە کە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من سەردارو گەورەی خەڵکم لە ڕۆژی قیامەتدا، جا ئایا دەزانن بەچی لەو ڕۆژەدا دەبم بە گەورەی خەڵك ؟ لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لەسەرەتاکانیەوە هەتا کۆتاکانیان کۆدەکاتەوە لەیەك بەرزاییدا. بە جۆرێك کە هەر کەسێك بانگیان لێ بکات دەیبیستن، وە چاویش هەموویان دەبڕێت. وە خۆر نزیك دەبێتەوە، وە خەڵك بە جۆرێك گرفتاری خەم و ناڕەحەتی دەبن کە لە توانایاندا نییە و بەرگەی ناگرن، جا خەڵکەکە بە یەکتر دەڵێن: ئەریّ ئێوە نابینن کە لە چ حاڵێکدا، ئەریّ نابینن هەتا چ ڕادەیەك تینتان بۆ هاتووە ؟ ئەریّ سەیر بکەن یەکێك بدۆزنەوە کە لە لای پەروەردگار شەفاعەتتان بۆ بکات ؟ ئینجا هەندێکی خەڵکەکە بەوانی تریان دەڵێن: بچنە لای ئادەم، ئینجا دەچنە لای ئادەم و دەڵێن: ئەی ئادەم تۆ باوکی مرۆڤایەتیت. خوا بەدەستی خۆی دروستی کردیت وە لە ڕۆحی خۆی کرد بە بەرتدا وە فرمانی کرد بە فریشتەکان وە ئەوانیش سوجدەیان بۆ بردیت، شەفاعەتمان بۆ بکە لە لای پەروەردگارت، ئایا نابینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین ؟ نابینیت هەتا چ ڕادەیەك تینمان بۆ هاتووە ؟ ئادەمیش دەڵێ: پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕە بوونێك تووڕە بووە کە هەرگیز لە پێش ئەمەدا تووڕە بوونی وا تووڕە نەبووە، وە لە مەودواش بەو جۆرە تووڕە نابێتەوە، وەئەو ئەودارەی لە من قەدەغە کرد منیش لەفەرمانی دەرچووم، هەرخۆم هەرخۆم بڕۆن بۆ لای یەکێکی تر، بڕۆن بۆلای نوح، ئەوانیش دێنەلای نوح و دەڵێن: ئەی نوح تۆ یەکەم نێردراوی بۆ زەوی، وە خوا

ناوی ناویت بەندە سوپاس گوزارەکەم، شەفاعەتێکمان بۆ بکە لەلای پەروەردگارەکەت . ئایا نابینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین ؟ نابینیت تا چ رادەیەك تینمان بۆ هاتووە ؟ ئەویش پێیان دەڵێ: بەراستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێك توڕەبووە کە پێشتر بەو جۆرە توڕە نەبووە و لەوەو پاشیش بەو جۆرە توڕە نابێت، وەمن دوعایەکم بۆ هەبوو کە بیکەم، ئەو دوعایەشم لە قەومەکەی خۆم کرد. هەرخۆم هەرخۆم بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم(ﷺ)، ئەوانیش دێنە لای ئیبراهیم و دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خواو خەلیلی هەڵبژێردراوی خوایت لە ناو خەڵکی زەویدا، شەفاعەتێکمان بۆ بکە لە لای پەروەردگارت ئەریٚ نابینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین ؟ ئەریٚ نابینیت هەتا چ رادەیەك تینمان بۆ هاتووە ؟ ئیبراهیمیش پێیان دەڵێ: پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕە بوونێك توڕە بووە کە هەرگیز لە پێش ئەمەدا توڕە بوونی وا تووڕە نەبووە. وە لە مەودواش بەو جۆرە توڕە نابێتەوە، وە باسی درۆکانی ئیبراهیمی کرد. هەر خۆم هەر خۆم، بڕۆن بۆ لای یەکێکی تر بڕۆن بۆلای موسا، ئەوانیش دێنە لای موساو دەڵێن: ئەی موسا تۆ نێردراوی خوایت خوا فەزڵی تۆی داوە بەنامەکەیی و بە قسەکردنی لەگەڵ تۆدا بەسەر خەڵکدا، شەفاعەتمان بۆ بکە لە لای پەروەردگارت، ئەریٚ نابینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین و نابینیت تا چ رادەیەك تینمان بۆ هاتووە؟ موساش(ﷺ) پێیان دەڵێ: پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕە بوونێك توڕە بووە کە هەرگیز لە پێش ئەمەدا توڕە بوونی وا تووڕە نەبووە، وە لە مەودواش بەو جۆرە توڕە نابێتەوە ،وە من کەسێکم کوشتووە کە فەرمانم پیٚ نەکرابوو بیکوژم، هەر خۆم هەر خۆم، بڕۆن بۆ لای عیسا(ﷺ)، ئەوانیش دێن بۆلای عیسا و دەڵێن: ئەی عیسا تۆ نێردراوی خوایت، وە لەسەر لانك قسەت لەگەڵ خەڵکدا کردووە. وە وشەیەکیت لە خواوە خستوویەتیە مەریەمەوە وە رۆحێکت لەلای خواوە، جا شەفاعەتێکمان بۆ بکە لە لای پ روەردگارت، ئایا نابینیت ئێمە لە چی حاڵێکداین ئایا نابینیت ئێمە تا چ رادەیەك تینمان بۆ هاتووە ؟ عیساش(ﷺ) پێیان دەفەرموێت: پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕە بوونێك توڕە بووە کە هەرگیز لە پێش ئەمەدا توڕە بوونی وا تووڕە نەبووە، وە لە مەودەواش بەو جۆرەش توڕە نابێتەوە ،وە هیچ تاوانێکی ئەوی ناو نەبرد – هەرخۆم هەرخۆم بڕۆن بۆ لای یەکێکی تر بڕۆن بۆ لای محمد(ﷺ)، ئینجا دێنە لام و دەڵێن: ئەی محمد تۆ نێردراوی خوایت و کۆتایی پێغەمبەرانیت، خوا لە پێشین و پاشینی گوناهەکانت خۆش بووە. شەفاعەتمان بۆ بکە لە لای پەروەردگارت، ئایا نابینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین و ئایا نابینیت تا چ رادەیەك ئێمە تینمان بۆ هاتووە ؟ منیش هەڵدەستم و دەڕۆم هەتا دەچمە ژێر عەرش و ئینجا بە سوجدەدا دەکەوم بۆ پەروەردگارم، پاشان خوا دەرووم لیٚ دەکاتەوە و شتێکی وا لە سوپاس کردنی خۆی و جوان ستایش کردنی دەخاتە سەر دڵ و زمانم کە هەرگیز دەرووی وا لە کەسێکی تری پێش من نەکردۆتەوە، پاشان دەوترێت: ئەی محمد سەرت بەرز بکەرەوە، داوا بکە پێت بدرێت، شەفاعەت بکە لێت وەردەگیرێت، منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئومەتەکەم ئومەتەکەم، ئەویش پێم دەفەرموێت: ئەی محمد هەر کەسێك کە حیسابی لەسەر نییە لە ئومەتەکەت بیانخەرە بەهەشتەوە لە دەرگاکانی لای راستی بەهەشتەوە، وە ئەوانەی تری ئومەتەکەت هاوبەشی ئەو خەڵکەن لە دەرگاکانی تردا، جا سوێند بەوەی کە نەفسی محمدی بە دەستە نێوان هەردوو لاتەنیشتێك لە لای

تەنیشتی دەرگاکانی بەهەشت – واتە پانی هەر دەرگایەك – هێندەی نێوان مەككەو هجر دەبێت یان هێندە نێوان مەككە و بُصری دەبێت ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەست لە درۆکانی ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێت ئەو سێ درۆیەیە کە لە چیرۆکی ئیبراهیم و زۆردارەکەدا لە فەرموودەی ژمارە ( ١١٠٨ )ی ئەم کتێبەدا باسی لێوە کراوە جا بگەڕێرەوە بۆ ئەوێ. وە (هجر): شارێکە لە وڵاتی یەمەن. وە بُصری: شارێکە لە شام.

( ١١٩٨ ) ( خ ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ النَّاسَ يَصِيْرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُثاً كُلُّ أُمَّةٍ تَتْبَعُ نَبِيَّهَا يَقُولُونَ: يَا فُلانُ اشْفَعْ يَا فُلانُ اشْفَعْ حَتَّى تَنْتَهِي الشَّفَاعَةُ إلى مُحَمَّدٍ(ﷺ) فَذَلِكَ يَوْمَ يَبْعَثُهُ اللهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٩٧٨ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو خەڵکە لە ڕۆژی قیامەت دەبن بە کۆمەڵ، هەر ئومەتێك و شوێن پێغەمبەرەکەی خۆی دەکەوێت، دەڵێن: ئەی فلانە کەس شافاعەت بکە، ئەی فلانە کەس شەفاعەت بکە، هەتا شەفاعەتەکە دێتەوە سەر محمد(ﷺ)، جا ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوا دەیباتە پلەی ( مَقَامُ الْمَحْمُود ) واتە ئەو پلە و مەقامەی کە هەموو خەڵك سوپاسی دەکەن )

( ١١٩٩ ) ( ابن مردويه ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الْوَسِيْلَةَ دَرَجَةٌ عِنْدَ اللهِ لَيْسَ فَوْقَهَا دَرَجَةٌ فَسَلُوا اللهَ أَنْ يُؤْتِيَنِيهَا عَلَى الْخَلْقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ١٩٨٨ ) في صحيح الجامع

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( وەسیلەت پلەیەکە لەلای خوا هیچ پلەیەکی تر لەسەریەوە نییە، جا داوام بۆ بکەن کە خوا بیدات بە من بەسەر ئەو خەڵکەدا لەڕۆژی قیامەتدا ).

( ١٢٠٠ ) ( حم هـ ) عن سلمان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي سَبَبْتُهُ سَبَّةً أَوْ لَعَنْتُهُ لَعْنَةً فِي غَضَبِي فَإِنَّمَا أَنَا مِنْ وَلَدِ آدَمَ أَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُونَ وَ إِنَّمَا بَعَثَنِي رَحْمَةً لِلْعَالَمِيْنَ فَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ صَلاةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٢٦ ) في صحيح الجامع

سلمان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر پیاوێك لە ئومەتەکەم جوێنێکم پێ دابێت یان نەفرەتێکم لێ کردبێت لە تووڕە بوونمدا، ئەوا من هەر یەکێکم لە نەوەی ئادەم، چۆن تووڕە دەبن منیش ئاوا تووڕە دەبم، وە خوا هەر بۆ ئەوە منی ناردووە ببمە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانەکان، جا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەیان بۆ بکە بە دوعاو ڕەحمەت ).

( ١٢٠١ ) ( هناد ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ سَأَلْتُ اللهَ الشَّفَاعَةَ لأُمَّتِي فَقَالَ: لَكَ سَبْعُونَ أَلْفاً يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلا عَذَابٍ قُلْتُ: رَبِّ زِدْنِي فَحَثَا لِي بِيَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ وَ عَنْ يَمِيْنِهِ وَ عَنْ شِمَالِهِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٣٥٧٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريره دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( داوای شەفاعەتم لە خوا کرد بۆ ئومەتەکەم، ئەویش فەرمووی: هەفتا هەزار بۆ تۆ کە بە بێ لێپرسینەوە و ئەشکەنجە دەچنە بەهەشتەوە، ووتم: پەروەردگارم بۆم زیاد بکە، ئەویش بە هەردوو دەستی خۆی دوو جار چنگی بۆ هەڵڕشتم وە بە لای راستیدا و وە بە لای چەپیدا).

( ۱۲۰۲ ) ( حم ق ن هـ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): « يجْمعُ المُؤمنُون يوم الْقيامَة فيَهْتمُّون لذلك فيقُولُونَ: لَو اسْتشْفعْنا على ربِّنا حتّى يُرِيْحنا منْ مكاننا هذا.قال: فيأْتُون آدمَ(ﷺ) فيقُولُونَ: أنْتَ آدمُ أبُو الْخلْق، خلقك الله بيده و نفخ فيْك منْ رُوحه. وامر الملائكة فسجدُوا لك.اشْفعْ لنا عنْد ربِّك حتّى يُريحنا منْ مكاننا هذا. فيقُولُ: لسْتُ هُناكُم. فيذْكر خطيئتَه الّتي أصاب. فيسْتحي ربَّهُ عزّوجلّ منها. ولكن ائْتوا نُوحاً.أوّلَ رسُول بعثهُ الله. قال فيأْتُون نُوحا(ﷺ) فيقُولُ: لسْتُ هُناكُم. فيذْكُر خطيئَةَ الّتي أصاب. فيستحي ربَّهُ منهَا. و لكن ائْتوا إبْراهيمَ(ﷺ) الّذي اتّخَذهُ الله خليلاً. فيأْتُون إبْراهيْم(ﷺ) فيقُولُ: لسْتُ هُناكُم. ويذْكر خطيئَة الّتي أصابَ فيسْتحي ربَّهُ منْها. ولكن ائْتُوا مُوسى(ﷺ) الّذي كلّمهُ الله و أعطاهُ التّوراة. قال: فيأْتُون مُوسى عليه السّلام فيقُولُ: لستُ هُناكم. و يذْكُرُ خطيئَةَ الّذي أصاب فيستحي ربَهُ منها. ولكن ائْتوا عيْسى رُوحُ الله و كلمتهُ. فيأتُون عيسى رُوحُ الله و كلمتهُ فيقُولُ: لسْتُ هُناكم. ولكن ائْتوا مُحمّداً(ﷺ) عبْدا غفر لهُ ما تقدّم من ذنْبه وما تأخّر. قال: قال رسُولُ الله(ﷺ): فيأْتُوني. فأسْتأْذنُ على ربّي فيُؤْذنُ لي. فإذا أنا رأيْتُهُ وقعْتُ ساجدا. فيدعني ما شاء الله فيُقالُ: يامُحمّدُ ارْفعْ رأسكَ. قُلْ تُسْمعْ. سل تُعْطه. اشْفعْ تُشفّعْ. فأرْفعُ رأْسي فأحْمدُ ربّي بتحميد يُعلّمُنيه ربّي. ثُمّ أشْفعُ. فيحُدّ لي حداً فأُخرجُهم من النّار. و أُدْخلُهُم الْجنة. ثُمّ أعُودُ فأقعُ ساجداً. فيدعُني ماشاء الله أنْ يدعني. ثُمّ يُقالُ: ارفعْ رأْسك يا مُحمّدُ قُلْ تُسْمعْ. سلْ تُعْطه. اشْفعْ تُشفّعْ. فأرْفعُ رأْسي فأحْمدُ ربّي بتحْميد يُعلّمُنيه. ثُمّ أشْفعُ. فيحُدّلي حدا فأُخْرجُهمْ من النّار و أُدْخلُهُمْ الْجنّةَ. قال: فلا أدْري في الثّالثة أوفي الرّابعة قالَ فأقُولُ: يارب مابقي إلاّ من حبسهُ الْقُرآنُ فيخْرُجُ من النّار منْ قال: لا إله إلاّ الله. وكان في قلْبه من الْخيْر ما يزنُ شعيرة. ثُمّ يخْرُجُ من النّار منْ قال: لا إله إلاّ الله وكان في قلْبه من الْخيْر ما يزنُ بُرّةً. ثُمّ يخْرُجُ من النّار منْ قال: لا إله إلاّ الله وكان في قلْبه من الخير ما يزنُ ذرة » . واللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (۸۰۰٤) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا لەرۆژی قیامەتدا ئەو خەڵکە کۆدەکاتەوە، وە زۆر بەوە گرفتار دەبن و دەڵێن: ئەگەر یەکێکمان بکردایەتە تکاکار لەلای پەروەردگارمان بەڵکو رزگارمان بکات ئا لەم شوێنەمان، فەرمووی: ئینجا دێنە لای ئادەم و دەڵێن: تۆ ئادەمیت باوکی ئەو خەڵکەیت وە لە رۆحی خۆی کردووە بە بەرتدا، وە فەرمانی بە فریشتەکان کردوەو ئەوانیش سوجدەیان بۆ بردیت، لە لای پەروەردگارت شەفاعەتمان بۆ بکە بەڵکو رزگارمان بکات لەم شوێنەی کە تیایداین، ئەویش دەڵێ: من

لەو ئاستەدا نیم، ئینجا باسی ئەو تاوانە دەكات كە كردویەتی، وە بەهۆیەوە شەرم لە پەروەردگاری دەكات، بەڵام بڕۆنە لای نوح كە یەكەم پێغەمبەرە كە خوا ناردبێتی )، فەرمووی: ( ئینجا دێنە لای نوح(ﷺ) و ئەویش دەڵێ: من لەو ئاستەدا نیم، ئینجا باسی ئەو تاوانە دەكات كە كردویەتی، وە بەهۆیەوە شەرم لە پەروەردگاری دەكات ،بەڵام بچنە لای ئیبراهیم(ﷺ) خوا كردویەتی بە خەلیلی خۆی، ئینجا دێنە لای ئیبراهیم و ئەویش دەڵێ: من لەو ئاستەدا نیم، ئینجا باسی ئەو تاوانە دەكات كە كردویەتی، وە بەهۆیەوە شەرم لە پەروەردگاری دەكات ،بەڵام بچنە لای موسا(ﷺ) ئەو خوا قسەی لەگەڵ كردووە و تەوراتی پێ داوە و فەرمووی: ( ئینجا دێنە لای موسا سەلامی لەسەر بێت، ئەویش دەڵێ: من لەو ئاستەدا نیم، ئینجا باسی ئەو تاوانە دەكات كە كردویەتی، وە بەهۆیەوە شەرم لە پەروەردگاری دەكات ،بەڵام بڕۆنە لای عیسای ڕۆحی خواو ووشەكەی ئەو، ئەویش دەڵێ: من لەو ئاستەدا نیم، بەڵام بڕۆنە لای محمد(ﷺ) بەندەیەكە كە هەرچی پێشینە و پاشینەی تاوانەكانیەتی خوا لێ ی بوراوە ). وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئینجا دێنە لای من و منیش روخسەت لە پەروەردگار وەردەگرم و ئەویش روخسەتم دەدات، جا هەر كە من خوام بینی بە سوجدەدا دەكەوم، ئینجا ئەوەندەی كە خوا بیەوێت وازم لێ دێنێت، ئینجا دەوترێت: ئەی محمد سەرت بەرز بكەرەوە بڵێ با گوێت لێ بگیرێت، داوا بكە با پێت بدرێت، شەفاعەت بكە لێت وەردەگیرێت منیش سەرم بەرز دەكەمەوە، وە سوپاسی پەروەردگارم دەكەم بە سوپاسێك كە پەروەردگارم فێرم دەكات، پاشان شەفاعەت دەكەم، ئینجا سنورێكم بۆ دادەنرێت، منیش لە ئاگر دەریان دەهێنم و دەیانخەمە بەهەشتەوە پاشان دەگەڕێمەوە و بە سوجدەیا دەكەومەوە، ئینجا لێم دەگەڕێت هێندەی كە خوا بیەوێت لێم برگەڕێت، پاشان دەوترێت: سەرت بەرزبكەرەوە ئەی محمد، بڵێ گوێت لێ دەگیرێت، داوابكە پێت دەدرێت، شەفاعەت بكە لێت وەردەگیرێت، ئینجا منیش سەرم بەرز دەكەمەوە و سوپاسی پەروەردگار دەكەم بە سوپاسێك كە خۆی فێرم دەكات، پاشان شەفاعەت دەكەم و سنورێكم بۆ دادەنرێت، منیش لە ئاگر دەریان دەهێنم و دەیان خەمە بەهەشتەوە ). وتی: جا نازانم لە سێیەمدا بوو یان لە چوارەمدا بوو فەرمووی: ( ئینجا دەڵێم ئەی پەروەردگارم هیچ كەسێ نەما تەنها كەسێك نەبێت كە قورئان بەندی كردبێت، ئینجا ئەوەی كە وتبێتی: (لا اله الا الله) و لە دڵیدا هێندەی دەنكە جۆیەك لە خێری تێدا بوو لە ئاگر دێتە دەر، پاشان ئەوەی وتبێتی: (لا اله الا الله)و هێندەی دەنكە گەنمێك لە خێر لە دڵیدا بوو بێت لە ئاگر دێتە دەر، پاشان ئەوەی ووتبێتی (لا اله الا الله)و هێندەی كێشی تۆوێك لە چاكە لە دڵیدا بووبێت دێتە دەر لە ئاگر ).

## روونكردنەوەی فەرموودەكە :

مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك كە دەفەرموێت: ئەی پەروەردگارم تەنها ئەوانە لە دۆزەخدا ماون كە قورئان بەندی كردوون، ئەوەیە كە تەنها ئەو كەسانە لە دۆزەخدا ماون كە خوای گەورە لە قورئاندا بەڵێنی داوە و سوێندی خواردووە كە هەرگیز لە دۆزەخ نایەنە دەر كە ئەوانیش تەنها ئەو بێ باوەڕانەن كە هیچ باوەڕیان بە خوا نەبووە ).

## ( ١٥ ) ( پردی صراط )

( ١٢٠٣ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿يَجْمَعُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى النَّاسَ فَيَقُومُ الْمُؤْمِنُونَ حَتَّى تُزْلَفَ لَهُمُ الْجَنَّةُ فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ يَا أَبَانَا اسْتَفْتِحْ لَنَا الْجَنَّةَ. فَيَقُولُ وَهَلْ أَخْرَجَكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ إِلاَّ خَطِيئَةُ أَبِيكُمْ آدَمَ لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ اذْهَبُوا إِلَى ابْنِى إِبْرَاهِيمَ خَلِيلِ اللَّهِ - قَالَ - فَيَقُولُ إِبْرَاهِيمُ لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ إِنَّمَا كُنْتُ خَلِيلاً مِنْ وَرَاءَ وَرَاءَ اعْمِدُوا إِلَى مُوسَى -صلى الله عليه وسلم- الَّذِى كَلَّمَهُ اللَّهُ تَكْلِيمًا. فَيَأْتُونَ مُوسَى -صلى الله عليه وسلم- فَيَقُولُ لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى كَلِمَةِ اللَّهِ وَرُوحِهِ. فَيَقُولُ عِيسَى -صلى الله عليه وسلم- لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ. فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا -صلى الله عليه وسلم- فَيَقُومُ فَيُؤْذَنُ لَهُ وَتُرْسَلُ الأَمَانَةُ وَالرَّحِمُ فَتَقُومَانِ جَنَبَتَىِ الصِّرَاطِ يَمِينًا وَشِمَالاً فَيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَالْبَرْقِ﴾ قَالَ قُلْتُ بِأَبِى أَنْتَ وَأُمِّى أَىُّ شَىْءٍ كَمَرِّ الْبَرْقِ قَالَ: ﴿أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِى طَرْفَةِ عَيْنٍ ثُمَّ كَمَرِّ الرِّيحِ ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيْرِ وَشَدِّ الرِّجَالِ تَجْرِى بِهِمْ أَعْمَالُهُمْ وَنَبِيُّكُمْ قَائِمٌ عَلَى الصِّرَاطِ يَقُولُ رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ حَتَّى تَعْجِزَ أَعْمَالُ الْعِبَادِ حَتَّى يَجِىءَ الرَّجُلُ فَلاَ يَسْتَطِيعُ السَّيْرَ إِلاَّ زَحْفًا - قَالَ - وَفِى حَافَتَىِ الصِّرَاطِ كَلاَلِيبُ مُعَلَّقَةٌ مَأْمُورَةٌ بِأَخْذِ مَنْ أُمِرَتْ بِهِ فَمَخْدُوشٌ نَاجٍ وَمَكْدُوسٌ فِى النَّارِ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٢٦ ) في صحيح الجامع

ابوهريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای تەبارەك و تەعالا ئەو خەڵكە كۆ دەكاتەوە و ئینجا بڕوا دارەكان هەڵدەستن، هەتا بەهەشتیان بۆ برازێندرێتەوە، ئینجا دێنە لای ئادەم و دەڵێن: ئەی باوەمان داوای كردنەوەی بەهەشتمان بۆ بكە، ئەویش دەڵێ: جا هەر گوناهەكەی باوكە ئادەم نەبوو ئێوەی لە بەهەشت كردە دەرەوە، من خاوەنی ئەو كارە نیم، بڕۆن بۆ لای كوڕەكەم ئیبراهیم خەلیلی خوا ) فەرمووی: ( ئیبراهیمیش دەڵێ: من خاوەنی ئەو كارە نیم بە ڵكو خەلیلێك بووم لە دوای دواوە، بڕۆن بۆ لای موسا(ﷺ) ئەو خوا بە قسەكردن قسەی لەگەڵدا كردووە، ئینجا دێنە لای موسا ئەویش دەڵێ: من خاوەنی ئەو كارە نیم، بڕۆن بۆ لای عیسا ووشەی خوا و ڕۆحی خوا، عیساش(ﷺ) دەڵێ: من خاوەنی ئەو كارە نیم، ئینجا دێنە لای محمد(ﷺ) و ئەویش هەڵدەستێت و ڕوخسەتی پێ دەدرێت، وە ئەمانەت و ڕەحم دەنێردرێت، ئەوانیش لە هەردوو لای ڕاست و چەپی ( صراط)ەوە دەوەستن، ئینجا سەرەتاكانتان وەك بروسكە تێ دەپەڕن ) وتی: ووتم: دایكم و باوكم بە قوربانت بێت چ شتێك وەك تێپەڕ بوونی بروسكەیە ؟ فەرموی: ( ئەی سەیری بروسكەتان نەكردووە كە چۆن لە چاو تروكانێكدا تێ دەپەڕێت و دەگەڕێتەوە ؟ پاشان وەك تێپەڕ بوونی با، پاشان وەك تێپەڕ بوونی باڵندەو وەك پیاوێكی بە هیمەت، كارەكانیان دەیانبات، وە پێغەمبەرەكەشتان ڕاوەستاوە لەسەر ( صراط)ەكەو دەڵێ: پەروەردگارم سەلامەت بكە سەلامەت بكە، هەتا دەگاتە ئەوەی كە ئیتر كار و كردەوەكانی بەندەكان دەستەوسان دەبێت و لە توانایدا نامێنێت، هەتا پیاوی وا دێت كە ناتوانیت بڕوات بە سنگە خشكێ نەبێت ) فەرمووی: ( وە لە هەردوو لێواری (صراط) ەكەدا قولاپی هەڵواسراوی پێوەیە، فرمانیان پێ

کراوە بە گرتنی هەر کەسێك کە فەرمانی پیْ کراوە بیگرێت، جا هەیە دەڕوشێت و رزگاری دەبێت، وە هەیشە لە ئاگرەکە دا کەڵەکە دەبێت ).

## ( ١٦ ) ( فەزڵی شایەتی دان بە لا اله الا الله )

( ١٢٠٤) ( حم ت ك هب ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿إنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلاَئِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلاً كُلُّ سِجِلٍ مِثْلُ مَدِّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَقُولُ أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ فَيَقُولُ لاَ يَا رَبِّ. فَيَقُولُ أَفَلَكَ عُذْرٌ فَيَقُولُ لاَ يَا رَبِّ. فَيَقُولُ بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً فَإِنَّهُ لاَ ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَيَقُولُ احْضُرْ وَزْنَكَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ فَقَالَ إِنَّكَ لاَ تُظْلَمُ. قَالَ فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كِفَّةٍ وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ فَلاَ يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ﴾ و اللفظ للترمذي. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٦ ) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر سەری ئەو هەموو خەڵکەدا پیاوێك لە ئومەتەکەم رزگار دەکات، کە نەوەدو نۆ سجلی بۆ نەشر دەکرێت کە هەر سجلێکیان هێندەی کە چاو کار بکات، پاشان دەفەرموێت: ئایا لە هیچ شتێك لەوانە نکوڵی دەکەیت ؟ ئایا فریشە نوسەر و پارێزەکانم هیچ زوڵمێکیان لیْ کردوویت؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگارم، ئەویش دەفەرموێت: دەی هیچ پاساوێکت هەیە ؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگارم، ئەویش دەفەرموێت: بەڵیْ تۆ لە لای ئێمە چاکەیەکت هەیە چونکە ئەمڕۆ هیچ زوڵمێکت لیْ ناکرێت. جا کارتێك دەردەهێنرێت تیایدایە: ( أشهد أن لا اله الا الله و أشهد أن محمدا رسول الله ) ئینج پێی دەوترێت: وەرە بەردەم کێشانەکەت، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، جا ئەو کارتە چییە لە چاو ئەو هەموو سجلانەدا ؟ ئەویش دەفەرموێت: دەی ئاخر تۆ زوڵمت لیْ ناکرێت ) فەرمووی: ( ئینجا سجلەکان دەخەنە تایەکەوە کارتەکەش دەخرێتە تاکەی ترەوە، ئینج سجلەکان هەڵچوون و کارتەکە قورس بوو، چونکە لەگەل ناوی خوادا هیچ شتێکی تر قورس نابێت ).

( ١٢٠٥ ) ( ق ) عن عتبان بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ تَعالَى قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللهِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٩٣ ) في صحيح الجامع

عتبانی کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەوە خوای گەورە لەسەر ئاگر حەرامی کردووە هەر کەسێك کە بڵێت: لا اله الا الله، مەبەستی بەوە تەنها ڕووی خوا بێت ).

( ١٢٠٦ ) ( حم خ ) عن عثمان بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَنْ يُوافِيَ عَبْدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ: لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ يَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللهِ إِلاَّ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ النَّارَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٢٢٤ ) في صحيح الجامع

عثمانی کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هیچ بەندەیەك نییە لە ڕۆژی قیامەتدا بێت و بڵێت: لا اله الا الله، تەنها مەبەستی پێی ڕووی خوا بوو بێت، ئیلا خوا ئاگری لەسەر حەرام دەکات ).

( ١٢٠٧ ) ( هـ ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): «يُصَاحُ بِرَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ فَيُنْشَرُ لَهُ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ سجلاً كُلُّ سجلٍ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَلْ تُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا فَيَقُولُ لاَ يَا رَبِّ فَيَقُولُ أَظَلَمَتْكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ ثُمَّ يَقُولُ أَلَكَ عُذْرٌ أَلَكَ حَسَنَةٌ فَيُهَابُ الرَّجُلُ فَيَقُولُ لاَ. فَيَقُولُ بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَاتٍ وَإِنَّهُ لاَ ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ فَتُخْرَجُ لَهُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ قَالَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ فَيَقُولُ إِنَّكَ لاَ تُظْلَمُ. فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كِفَّةٍ وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ». و اللفظ لأبن ماجة. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٧٨ ) في صحيح الجامع

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هاوار لە پیاوێك دەکرێت لە ئومەتەکەم لە ڕۆژی قیامەت بەسەر سەری ئەو خەڵکانەدا، وە نەود و نۆ سجلی بۆ نەشر دەکرێت، هەر سجلێکیان هێندەی کە چاو بڕ بکات. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا نکۆڵی لە هیچ شتێك لەمانە دەکەیت ؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگارم. ئەویش دەفەرموێت: ئایا نووسەرە پارێزەکانم هیچ زوڵمێکیان لێ کردوویت ؟ پاشان دەفەرموێت: ئەی لەگەڵ ئەوەدا هیچ چاکەیەکت هەیە ؟ ئینجا کابراش دەترسێت و دەڵێ: نەخێر، ئەویش دەفەرموێت: با هەتە، تۆ لە لای ئێمە چاکەت هەیە وە ئەمڕۆش هیچ زوڵمێکت لێ ناکرێت، ئینجا کارتێکی بۆ دەردێنن تیایدایە: ( أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله ) فەرمووی: ( ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم جا ئەو کارتە چییە لە ئاستی ئەو هەموو سجلەدا، ئەویش دەفەرموێت: تۆ زوڵمت لێ ناکرێت، ئینجا سجلەکان دەکرێنە تایەکەوە و کارتەکەیش دەکرێتە تاکەی ترەوە، ئیتر بە یەك جار سجلەکان هەڵدەچن و کارتەکە قورس دەبێت ).

## ( ١٧ ) ( ئاکامی شەریك بۆ خوا بڕیار دان )

( ١٢٠٨ ) ( حم ت هـ ) عن أبي سعيد بن أبي فضالة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إِذَا جَمَعَ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِيَوْمٍ لاَرَيْبَ فِيهِ، نَادَىٰ مُنَادٍ: مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ لله أَحداً، فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللهِ، فَإِنَّ اللهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ » . ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٤٨٢ ) في صحيح الجامع

ابو سعید ی کوڕی ابو فضالة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر کاتێك خوای گەورە ئەو خەڵکەی لە ڕۆژی قیامەتدا کۆکردەوە بۆ ڕۆژێك کە هیچ گومانی تێدا نییە، بانگ دەرێك بانگ دەکات: هەرکەسێك لە کارێکیدا کە کردبێتی بۆ خوا یەکێکی کردبێتە شەریکی ئەو با داوای پاداشتەکەی لە غەیری خوا بکات، چونکە خوا دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندەکانە و پێویستی بە شەریك نییە ).

## ( ١٧ ) ( ئەو كەسانەی دەچنە ژێر سێبەری خواوە )

**( ١٢٠٩ ) ( حم م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنّ الله تعالى يقُولُ يوم القيامة : أين المتحابون بجلالي، اليوم أُظلُّهمْ في ظلّي يوم لا ظلّ إلاّ ظلّي ». (صحيح) أنظر حيث رقم (١٩١٥) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا لە رۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: كوان ئەوانەی كە تەنها لە رێی شكۆمەندی مندا یەكتریان خۆش ویستوە، ئەمڕۆ سێبەرداریان دەكەم لە سێبەری خۆمدا، لە رۆژێكدا كە هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری من نەبێت ).

**( ١٢١٠ ) ( مالك ت ) عن أبي هريرة وأبي سعيد ( حم ق ن ) عن أبي هريرة ( م ) عن أبي هريرة وأبي سعيد معا قالا: قال رسول الله(ﷺ): « سبْعةٌ يُظلُّهمْ الله في ظلّه يوْم لاظلّ إلاّ ظلّهُ : إمامٌ عادلٌ، و شابٌ نشأ بعبادة الله، و رجُلٌ قلبُهُ مُعلّقٌ بالمسْجد إذا خرج منْهُ حتّى يعُود إليه، و رجُلان تحابّا في الله فاجْتمعا على ذلك و تفرّقا، و رجُلٌ ذكر الله خاليا ففاضتْ عيْناهُ، و رجُلٌ دعتْهُ امْرأةٌ ذاتُ حسب و جمال فقال: إنّي أخافُ الله ربّ العالمين، و رجُلٌ تصدّق بصدقة فأخفاها حتىّ لا تعْلم شمالُهُ ما تُنفقُ يمينُهُ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٥٩٠) في صحيح الجامع**

لە أبو هريرة و أبو سعيد ـە وە،لە أبو هريرة وە ،لە أبو هريرة و ابو سعيد پێكەوە، گێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( حەوت جۆر كەسان خوا سێبەرداریان دەكات لە سێبەری خۆیدا لە رۆژێكدا كە هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری ئەو نەبێت، پێشەوایەكی داد پەروەر، وە لاوێك لە بەندایەتی كردن بۆ خوا پێگەیشتووە، وە پیاوێك كە دڵی پەیوەست بوو بێت بە مزگەوتەوە كە هەر لێی دەچێتە دەرەوە هەتا دەگەڕێتەوە بۆی، وە دوو پیاو لەبەر خوا یەكتریان خۆش ویستووە وە لەسەر ئەوەش كۆبوونەتەوە و جیابوونەتەوە، وە پیاوێك لە چۆڵیدا زیكرو یادی خوای كردووە و فرمێسك لە دوو چاوی هاتۆتە دەر، وە پیاوێكیش ئافرەتێكی خانەدان و جوان بانگی دەكات ئەویش دەڵێ: من لە خوای گەورە دەترسم، وە پیاوێكیش سەدەقەیەكی كردووە، وە شاردوویەتیەوە هەتا دەستی چەپی نەزانێت دەستی راستی چی بەخشیوە ).

**( ١٢١١ ) ( حم ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « منْ أنْظر مُعْسراً أوْ وضع لهُ أظلّهُ الله يوم الْقيامة تحْت ظلّ عرْشه يوْم لا ظلّ إلاّ ظلّهُ ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٦١٠٦) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( هەر كەسێك نەدارێك مۆڵەت بدات یان قەرزەكەی لەسەر لا ببات ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا سێبەرداری دەكات لە ژێر سێبەری عەرشەكەی خۆیدا، لە رۆژێكدا كە هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری ئەو ).

## ( ١٩ ) ( گلەیی خوا لە هەندێك لە بەندەكانی خۆی )

**( ١٢١٢ ) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ الله تَعالى يَقُولُ يَوْمَ القِيامَةِ: يا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي، قالَ: يا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَ أَنْتَ رَبُّ العالَمِيْنَ؟ قالَ: أَما عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلاناً مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ؟ أَما عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْعُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ؟ يا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي، فَقالَ: يا رَبِّ وَ كَيْفَ أُطْعِمُكَ وَ أَنْتَ رَبُّ العالَمِيْنَ؟ قالَ: أَما عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلانٌ فَلَمْ تُطْعِمْهُ؟ أَما عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ لَوَجَدْتَ ذلكَ عِنْدِي؟ يا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي، قالَ: يا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيْكَ وَ أَنْتَ رَبُّ العالَمِيْنَ؟ قالَ: اسْتَسْقاكَ عَبْدِي فُلانٌ فَلَمْ تَسْقِهِ، أَما إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ لَوَجَدْتَ ذلكَ عِنْدِي ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١١٦ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( ڕۆژی قیامەت، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەنی ئادەم نەخۆش كەوتم و بەسەرت نەكردمەوە، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم من چۆن تۆ بەسەر بكەمەوە ؟ و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەكانیت، دەفەرموێت: ئەی نەتدەزانی فلانە كەسی بەندەم نەخۆش كەوت و سەردانت نەكرد، ئەی نەتدەزانی ئەگەر سەردانت بكردایە، منت لە لای ئەو دەبینی ؟ ئەی بەنی ئادەم داوام لێ كردیت كە خۆراكم دەرخوارد بدەیت كە چی دەرخواردت نەدام، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم جا من چۆن خۆراك بدەم بە تۆ ؟ و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەكانیت ؟ دەفەرموێت: ئەی نەتدەزانی كە فلانە كەسی بەندەم داوای خواردنی لێ كردیت و تۆ دەرخواردت نەدا؟ ئەی نەتدەزانی ئەگەر خواردنت بدایە پێی ئەوا ئەوەت لە لای من دەبینیەوە ؟ ئەی بەنی ئادەم داوام لێ كردیت ئاوم بدەیتێ كەچی نەتدامێ ؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگار چۆن ئاو دەرخواردی تۆ بدەم وە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەكانیت ؟ فەرمووی: فلانە كەسی بەندەم داوای ئاوی لێ كردیت كەچی نەتدایە، خۆ ئەگەر ئاوت پێ بدایە، ئێستا ئەوەت لە لای من دەبینییەوە ).

**( ١٢١٣ ) ( ق د ت ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ الله يَوْمَ القِيامَةِ، مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقاءَ فُحْشِهِ ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٠٩٥ ) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خراپترین كەس لەلای خوا لە ڕۆژی قیامەت، كەسێكە كە خەڵك بۆ خۆ پاراستن لە بەدكارییەكەی وازیان لێ هێنابێت ) .

**( ١٢١٤ ) ( م ن هـ ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذاباً يَوْمَ القِيامَةِ الَّذِيْنَ يُشَبِّهُونَ بِخَلْقِ الله ﴾ . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٠٤ ) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( توند ترین ئەشكەنجە بۆ خەڵك لە قیامەتدا ئەوانەن كە دەیانەوێت چاولێكەری خوا بكەن و وێنەی دروست كراوەكانی ئەو دروست بكەن ) .

## ( ٢٠ ) ( مونافیقی دووروو )

**( ١٢١٥ ) ( ت ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ذَاالْوَجْهَيْنِ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٢٢٦ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( لە خراپترینی خەڵکەکان لە لای خوا ڕۆژی قیامەت دوو ڕووە ).

## ( ٢١ ) ( هەندێك لە پیاوە زلەکانی دونیا )

**( ١٢١٦ ) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِيْنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لايَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٠٠ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ڕۆژی قیامەت پیاوی گەورەی قەڵەوی وا دێت، لە لای خـوا کێشی باڵە مێشولەیەکی نییە ).

## ( ٢٢ ) ( ئەوانەی خوا سەیریان ناکات )

**( ١٢١٧ ) ( د ن هـ ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الإِسْبَالُ فِي الإِزَارِ وَ الْقَمِيْصِ وَ الْعِمَامَةِ مَنْ جَرَّ مِنْهَا شَيْئاً خُيَلاءَ لَمْ يَنْظُرِ اللهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٢٧٦٦ ) في صحيح الجامع**

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( شۆڕ کردنەوە لە بەرگەپێ و کراس و مێزەردا، هەر کەسێك شتێکیان لێ ڕابکێشێت بە دوای خۆیدا بۆ فیز و خۆ بە زل گرتن ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا خوا سەیریان ناکات ) .

## ( ٢٣ ) ( هەر کەسێك چاو پۆشی لە نەدارێك بکات )

**( ١٢١٨ ) ( خد ت ك هب ) عن أبي مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ حُوسِبَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مِنَ الْخَيْرِ شَيْءٌ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ رَجُلاً مُوسِراً، وَ كَانَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَ كَانَ يَأْمُرُ غِلْمَانَهُ أَنْ يَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُعْسِرِ، فَقَالَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ لِمَلائِكَتِهِ: نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ تَجَاوَزُوا عَنْهُ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣١٥٢ ) في صحيح الجامع**

ابو مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك لەوانەی کە لە پێش ئێوەدا هەبوون لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرا، هیچ شتێکی نەبوو لە خێر و چاکە، تەنها ئەوە نەبێت کە پیاوێکی دەوڵەمەند

بوو، وه تێکەڵ بە خەڵك دەبوو، وه فەرمانی دەکرد بە کارمەند و بەردەستەکانی کە چاو پۆشی لە نەدار و دەست کورت بکەن، خوای گەورەش فەرمووی: ئێمە لەو لە پێشترین بۆ ئەو لێبوردنە، ئێوەش چاو پۆشی لێ بکەن ).

## ( ٢٤ ) ( ئاکامی فیز و دەعیە )

**( ١٢١٩ ) ( ت ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): « خرج رجلٌ ممّن كان قبلكم في حُلّة لهُ يختالُ فيها فأمر الله الأرض فأخذته، فهو يتجلجلُ فيها إلى يوم القيامة » . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٣٢١٨ ) في صحيح الجامع**

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( پیاوێك لەوانەی کە لە پێش ئێوەدا هەبوون بەکاڵا پۆشەکەی بەریەوە چووە دەرەوە خۆی تیا هەڵدەکێشا، خوایش فەرمانی بە زەوی کرد ئەویش گرتی، جا هەتا رۆژی قیامەت بە ناویدا رۆ دەچێت و سوڕ دەخوات ).

## ( ٢٥ ) ( ئەوانەی لەبەر خوا یەکتریان خۆش وویستوە )

**( ١٢٢٠ ) ( ت ) عن معاذ قال: قال رسول الله(ﷺ): « قال الله تعالى: المتحابُّون في جلالي لَهُمْ منابرُ منْ نُور يغْبطُهُمُ النبيُّون و الشُّهداءُ » . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٤٣١١ ) في صحيح الجامع**

معاذ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە فەرموویەتی: ئەوانەی لە ڕێی شکۆمەندی مندا یەکتریان خۆش دەوێت، مینبەریان پێ دەدرێت لە نور، پێغەمبەرەکان و شەهیدەکان ئاواتیان پێ دەخوازن ).

**( ١٢٢١ ) ( م هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « قال الله تعالى: أنا أغنى الشُّركاء عن الشِّرْك، منْ عملَ عملًا أشْرك فيه معي غيْري، تركْتُهُ وَ شرْكه » . (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٤٣١٢ ) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە فەرموویەتی: من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندەکانم کە پێویستم بە شەریك نییە، هەر کەسێك کارێك بکات و جگە لە خۆم یەکێکی تر بکات بە شەریکم، ئەوا خۆیش و کارەکەیشیم ناوێت وازی لێ دێنم).

## ( ٢٦ ) ( ئەو كەسەی لە دونیادا لە خوا دەترسێت )

( ١٢٢٢ ) ( حل ) عن شداد بن أوس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ قَالَ اللهُ تَعالىَ: وَ عِزّتي وَ جَلالي لأَجْمَعُ لِعَبْدِي أَمْنَيْنِ وَ لا خَوْفَيْنِ، إنْ هُوَ أَمِنَني في الدُّنْيا أَخَفْتُهُ يَوْمَ أَجمعُ عِبادِي وَ إنْ هُوَ خافَنِي فِي الدُّنْيا أَمَنْتُهُ يَوْمَ أَجْمعُ عِبادِي ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٣٣١ ) في صحيح الجامع

شدادی كوڕی اوس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە فەرمویەتی: سوێند بە عیزەت و جەلالی خۆم بەندەی خۆم نە دوو جار نەترسان و بێ خەم بوونی پێ دەدەم و وە نە دوو جاریش دەیترسێنم. جا ئەگەر لە دونیادا نەترسا و بێ خەم بوو لێم ئەوا لەو ڕۆژەدا دەیترسێنم كە هەموو بەندەكانی خۆمی تێدا كۆ دەكەمەوە، وە ئەگەر ئەو لە دونیادا لێم ترسا ئەوا لەو ڕۆژەدا بێ ترس و ئەمینی دەكەم كە هەموو بەندەكانی خۆمی تێدا كۆ دەكەمەوە ).

( ١٢٢٣ ) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كَانَ رَجُلٌ يُدايِنُ النّاسَ فَكانَ يَقُولُ لِفَتاهُ: إذا أَتَيْتَ مُعْسِراً فَتَجاوَزْ عَنْهُ، لَعَلّ اللهَ أَنْ يَتَجاوَزَ عَنّا، فَلَقِيَ اللهَ فَتَجاوَزَ عَنْهُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٤٠٦ ) في صحيح الجامع

أبو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( پیاوێك هەبوو قەرزی دەدا بە خەڵك، جا بە كوڕە گەنجەكەی بەردەستی خۆی ووت: ئەگەر هاتیتە لای نەدارێك ئەوا چاو پۆشی لێ بكە و لێی ببورە، بەڵكو خوایش لە ئێمە ببورێت، جا كە گەڕایەوە لای خوا چاو پۆشی لێ كرد و لێ ی بورا ).

## ( ٢٧ ) ( هەر كەسێك لە چۆڵیدا حەرامەكانی خوا ببەزێنێت )

( ١٢٢٤ ) ( هـ ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لأَعْلَمَنَّ أَقْواماً مِنْ أُمَّتي يأْتُونَ يَوْمَ الْقِيامَةِ بِحَسَناتٍ أَمْثالِ جِبالِ تِهامَةَ، بَيْضاءَ فَيَجْعَلُها اللهُ هَباءً مَنْثُوراً أَما إنَّهُمْ إخْوانُكُمْ وَ مِنْ جِلْدَتِكُمْ وَ يأْخُذُونَ مِنَ اللّيْلِ كَما تأْخُذُونَ وَ لَكِنَّهُمْ قَوْمٌ إذا خَلَوْا بِمَحارِمِ اللهِ، انْتَهَكُوها ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٨٠١ ) في صحيح الجامع

ثوبان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( كۆمەڵانێك لە ئومەتەكەم دەزانم، ڕۆژی قیامەت هێندەی چیاكانی ( تِهامة ) خێر و چاكە لەگەڵ خۆ دەهێنن بە سپێتی، خوای گەورەش دەیكات بە تۆزی با بردوو، جا ئەوانە هەر براشتان بوون و هەر لە پێستەی خۆشتان بوون، وە هێندەی كە ئێوە لە شەوتان بۆ خوا پەرستی تەرخان كردووە ئەوانیش تەرخانیان كردووە، بەڵام ئەوان كەسێك بوون، كە هەركات بە تەنها و لە چۆڵیدا بوونایە لەگەڵ حەرامەكانی خوادا ئەوا هەڵیان دەماڵێ و خۆیان تێ دەنا ).

## ( ٢٨ ) ( ڕەوشتی بەرز )

( ١٢٢٥ ) ( ت ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): « مَا شَيْءٌ أَثْقَلَ فِي مِيْزَانِ الْمُؤْمِنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يَبْغَضُ الْفَاحِشَ الْبَذِيَ » ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦٣٠ ) في صحيح الجامع

ابو الدراء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ شتێك نییە لە ترازوی باوەڕداردا كە لە ڕەوشتی بەرز و جوان قورستر بێت، چونكە خوای گەورە رقی لە دامێن پیسی بەدكار و دەم پیسە )

## ( ٢٩ ) ( وێنە كێشان )

( ١٢٢٦ ) ( حم د ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): « مَنْ صَوَّرَ صُوْرَةً عَذَّبَهُ اللهُ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَنْفُخَ فِيْهَا، وَ لَيْسَ بِنَافِخٍ فِيْهَا، وَ مَنْ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيْثِ قَوْمٍ يَفِرُّونَ بِهِ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٢٦٤ ) في صحيح الجا مع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر كەسێك وێنەیەك بكێشێت. خوا ئەشكەنجەی دەدات هەتا دەیكات بە بەریدا – واتە ڕۆح – وە ناشتوانێت كە ڕۆحی بكات بە بەردا. وە هەر كەسێك گوێ لە قسەی كەسانێك بگرێت كە ئەوان لەبەر ئەوەی ئەم گوێی لێ نەبێت لە دەستی هەڵدێن. ئەوا ڕۆژی قیامەت قوڕقوشمی تواوە دەكرێتە ناو گوێ یەوە ).

( ١٢٢٧ ) ( هـ ) عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): « لاَ أَلْفِيَنَّ أَقْوَاماً مِنْ أُمَّتِي يَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِحَسَنَاتٍ أَمْثَالِ جِبَالِ تِهَامَةَ بَيْضَاءَ، فَيَجْعَلُهَا اللهُ هَبَاءً مَنْثُوراً أَمَا إِنَّهُمْ إِخْوَانُكُمْ وَ مِنْ جِلْدَتِكُمْ، وَ يَأْخُذُونَ مِنَ اللَّيْلِ كَمَا تَأْخُذُونَ وَ لَكِنَّهُمْ أَقْوَامٌ، إِذَا خَلَوْا بِمَحَارِمِ اللهِ انْتَهَكُوهَا » ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧١٦٥ ) في صحيح الجامع

ثوبان دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( كەسانێك لە ئوم تەكەم دەبینم لە ڕۆژی قیامەتدا هێندەی چیاكانی تهامە بە سپێتی خێروچاكە لەگەڵ خۆیان دەهێنن و خوای گەورەش دەیكات بە تۆزی با بردوو، جا ئەوانە هەر براتان بوون و هەر لە پێستەی خۆشتان بوون، وە هێندەی ئێوەش لە شەودا خوا پەرستیان كردووە، بەڵام كەسانێك بوون هەر كات بە تەنها و لە چۆڵەوانیدا بوونایە لەگەڵ حەرامەكانی خوادا ئەوا هەڵیان دەماڵی و خۆیان تێ دەنا ).

## ( ٣٠ ) ( قوربانی موسڵمان لە قیامەتدا )

( ١٢٢٨ ) ( م ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): « لاَيَمُوتُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ أَدْخَلَ اللهُ مَكَانَهُ النَّارَ، يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرَانِيّاً » . ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٧٦٨ ) في صحيح الجامع

ابو موسی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هیچ پیاوێکی موسڵمان نامرێت، ئیلا خوای گەورە جولەکەیەك یان گاورێك دەخاتە شوێنی ئەو لە ئاگردا ).

## ( ٣١ ) ( خراپترین کەس لە پلە و پایەدا )

( ١٢٢٩ ) ( حم ق ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَا عَائِشَةُ! مَتَى عَهِدْتِنِي فَحَاشاً؟ إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٧٩٢٢ ) في صحيح الجامع

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەی عائشە، کەی منت دیوە بەدکار و بەد زمان بم، خراپترین کەس لە لای خوا لە رۆژی قیامەتدا، کەسێکە خەڵك دەست بەرداری بن لە ترسی زمانی بەدی

## ( ٣٢ ) ( سەربڕینی مردن )

( ١٢٣٠ ) ( ت ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَأَنَّهُ كَبْشٌ أَمْلَحُ حَتَّى يُوقَفَ عَلَى السُّورِ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَ النَّارِ فَيُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! فَيَشْرَئِبُّونَ، وَ يُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ! فَيَشْرَئِبُّونَ فَيُقَالُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، هَذَا الْمَوْتُ، فَيُضْجَعُ فَيُذْبَحُ فَلَوْلا أَنَّ اللهَ قَضَى لأَهْلِ الْجَنَّةِ الْحَيَاةَ وَ الْبَقَاءَ لَمَاتُوا فَرَحاً، وَ لَوْلا أَنَّ اللهَ قَضَى لأَهْلِ النَّارِ الْحَيَاةَ فِيهَا لَمَاتُوا تَرَحاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم ( ٧٩٩٢ ) في صحيح الجامع

ابو سعید دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( مردن دەهێنرێت هەر دەڵێی بەرانێکی رەشی بەڵەکە سپی یە، هەتا لەسەر دیوارەکەدا دەوەستێنرێت لە نێوان بەهەشت و ئاگردا، ئینجا دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت. ئەوانیش ملیان قووت دەکەنەوە. وە دەوترێت ئەی خەڵکی ئاگر ئەوانیش هەر ملیان قوت دەکەنەوە ئینجا دەووترێت: ئایا ئەمە دەناسن ؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئەوە مردنە، ئینجا رادەکێشرێت و سەر دەبڕدرێت، جا ئەگەر ئەوە نەبوایە کە خوای گەورە لەسەر خەڵکی بەهەشتی نوسیوە کە هەر دەژین و تیایدا دەمێننەوە ئەوا هەموویان لە خۆشیدا دەمردن. وە ئەگەر ئەوە نەبوایە کە خوا لەسەر ئەهلی ئاگری نووسیوە کە هەر دەبێت بژین و تیایدا بمێننەوە، ئەوا هەر هەموویان لە غەم و حەسرەتدا دەمردن )

## ( ٣٣ ) ( هەڵکێشانی نیعمەت دار ترینی خەڵکی دونیا لە ئاگردا )

( ١٢٣١ ) ( حم م ن هـ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ خَيْراً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ

نَعِيْمٍ قَطّ؟ فَيَقُولُ: لاوَ اللهِ يَا رَبّ، وَ يُؤْتى بِأَشَدّ النّاسِ بُؤْساً فِي الدُّنْيَا، مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ فِي الْجَنَّةِ صَبْغَةً فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَم هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قَطّ؟ هَلْ مَرّ بِكَ شِدّةٌ قَطّ؟ فَيَقُولُ: لاوَ اللهِ يَا رَبّ مَامَرّ بِي بُؤْسٌ قَطّ، وَلا رَأَيْتُ شِدّةً قَطّ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٧٩٩٨ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ڕۆژی قیامەت نیعمەتدار ترینی خەڵکی دونیا لە ئەهلی ئاگر دەهێنرێت، ئینجا یەك تێ هەڵکێشان لە ئاگرەکە هەڵدەکێشرێت، پاشان دەووترێت: ئەی بەنی ئادەم هیچ کات خێر و خۆشیت دیوە ؟ ئایا هیچ کاتێك نیعمەتێکت پیا تێ پەڕیوە ؟ ئەویش دەڵێ: نە سوێند بە تۆ ئەی پەروەردگارم، وە داماو ترین کەس لە دونیادا لە ئەهلی بەهەشت دەهێنرێت و یەك هەڵکێشان لە بەهەشت هەڵدەکێشرێت، ئینجا پێی دەوترێت: ئەی بەنی ئادەم هیچ کاتێك داماوییەك و مەینەتییەکت دیوە ؟ ئایا قەت ناخۆشیت بەسەر هاتووە ؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر سوێند بە تۆ ئەی پەروەردگارم و هەرگیز داماویم بەسەر نەهاتووە و هەرگیز ناخۆشیم نەدیوە ).

## ( ٣٤ ) ( بکوژ و کوژراو لە ڕۆژی قیامەتدا )

( ١٢٣٢ ) ( حم ق ن هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَضْحَكُ اللهُ إِلىَ رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ يَدْخُلانِ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيْلِ اللهِ فَيُقْتَلُ ثُمّ يَتُوبُ اللهُ عَلىَ الْقَاتِلِ فَيُسْلِمُ فَيُقَاتِلُ فِي سَبِيْلِ اللهِ فَيُسْتَشْهَدُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٩٥ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بۆ دوو پیاو پێ دەکەنێت، یەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێت وە هەردووکیشیان دەچنە بەهەشتەوە، ئەمیان لە پێناوی خوادا شەڕ دەکات و دەکوژرێت پاشان خوا لە بکوژەکەش دەبورێت بەوەی کە ئەویش موسڵمان دەبێت و شەڕ دەکات لە پێناوی خوای گەورەدا و شەهید دەبێت ).

( ١٢٣٣ ) ( ن ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَجِيءُ الرّجُلُ آخِذاً بِيَدِ الرّجُلِ فَيَقُولُ: يَا رَبّ هَذَا قَتَلَنِي فَيَقُولُ اللهُ لَهُ: لِمَ قَتَلْتَهُ؟ فَيَقُولُ: قَتَلْتُهُ لِتَكُونَ الْعِزّةُ لَكَ فَيَقُولُ: فَإِنّهَا لِي وَ يَجِيءُ الرّجُلُ آخِذاً بِيَدِ الرّجُلِ فَيَقُولُ: إِنّ هَذَا قَتَلَنِي فَيَقُولُ اللهُ لَهُ: لِمَ قَتَلْتَهُ؟ فَيَقُولُ: لِتَكُونَ الْعِزّةُ لِفُلانٍ فَيَقُولُ: إِنّهَا لَيْسَتْ لِفُلانٍ فَيَبُوءُ بِإِثْمِهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٢٧ ) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( پیاوێك دێت دەستی پیاوێکی گرتووە و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەمە کوشتوومی، خوای گەورەش پێی دەفەرموێت: لەبەر چی کوشتت ؟ ئەویش دەڵێ: کوشتم لە پێناوی ئەوەی عیزەت و شکۆمەندی بۆ تۆ بێت. ئەویش دەفەرموێت: دەی ئەوە هەر بۆ منە. وە پیاوێك دێت دەستی پیاوێکی گرتووە و دەڵێ: ئا ئەمە منی کوشتووە ؟ خوایش پێی دەفەرموێت: لەبەر چی کوشتوتە ؟ ئەویش دەڵێ: لە پێناو ئەوەی فلانە کەس سەر بکەوێت و پایە بەرز بێت. ئەویش دەفەرموێت: دەی ئەو عیزەت و پایە بەرزییە بۆ فلانە کەس نییە. ئیتر تاوانی کوژراوەکەی بە ملدا دەبڕێت ).

( ١٢٣٤ ) ( ن ) عن جندب قال: قال رسول الله(ﷺ): « يجيءُ المقتولُ يوم القيامة مُتعلقا بقاتله فيقولُ الله : فيم قتلت هذا؟ فيقولُ: في مُلك فُلان ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٢٩) في صحيح الجامع

جندب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ڕۆژی قیامەت کوژراو دێت خۆی بە بکوژەکەدا هەڵواسیوە، خوایش دەفەرمووێت: لەسەر چی ئەمەت کوشتووە ؟ ئەویش دەڵێ: لە پێناو موڵك و دەسەڵاتی فلانە کەسدا ).

( ١٢٣٥ ) ( م ) عن أبي موسى قال: قال رسول الله(ﷺ): « يَجيءُ يومَ القيامة نَاسٌ منَ المُسلمين بذُنُوب أمثال الجبال، يَغفرُها الله لهُمْ و يَضَعُها على اليهُود والنَّصارى ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٨٠٣٤) في صحيح الجامع

ابو موسى دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ڕۆژی قیامەت کەسانێك لە موسڵمانان دێن، گوناهیان پێیە هێندەی چیاکان، خوای گەورەش لە گوناهەکانیان دەبورێت و دەیخاتە سەر جولەکەو گاورەکان ).

(١٢٣٦) ( حم ن ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): « يقُولُ الله تعالى: يا آدمُ! فيَقُولُ: لبيك و سَعديك و الخيرُ في يديك! فيقولُ: أخرجْ بعثَ النَّار، قال: وما بعثُ النَّار؟ قال: منْ كُل ألف تسْعمائة و تسْعة و تسْعين. قال: فذلك حين يَشيبُ الصغيرُ: « و تَضَعُ كُل ذات حمْل حمْلَها و ترى النَّاس سُكارى وَ ما هُمْ بسُكارى و لكنَّ عذابَ الله شَديدٌ ». قالُوا: يارسُولَ الله أيُّنا ذلك الرَّجُلُ؟ فقال: أبْشرُوا فإنَّ منْ يأجُوج ومأجُوج ألفاً، و إنَّ منكُمْ رجُلٌ. قال ثُمَّ قالَ: و الَّذي نَفْسي بيده إنّي لأطمعُ أنْ تكُونُوا ثُلُث أهل الجنَّة فحمدْنا الله وكبَّرنا. ثُمَّ قال: والَّذي نفْسي بيده إنّي لأطمعُ أنْ تكونُوا شطر أهْل الجنَّة، إنَّ مثلكُمْ في الأُمم كمثل الشَّعْرة البَيْضاء في جلد الثَّوْر الأسْود أوْ كالرَّقْمة في ذراع الحمار ». (صحيح) أنظر حيث رقم (٨١٤١) في صحيح الجامع

## ( ٣٥ ) ( نێوان ئیبراهیم و باوکی لە قیامەتدا )

( ١٢٣٧ ) ( خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « يَلقى إبْراهيمُ أباهُ آزَر يوْمَ القيامَة و على وَجه آزَر قترةٌ وَ غبرةٌ، فيقُولُ لهُ إبْراهيمُ: ألمْ أقُلْ لكَ لا تعْصني؟ فيقُولُ أبُوهُ: فاليوْمَ لا أعْصيكَ، فيقُولُ إبْراهيمُ: يا ربِّ إنَّكَ وعدْتني أنْ لا تُخْزيني يَومَ يُبْعثُون، فأيُّ خزيٍ أخْزَى منْ أبي الأبْعد؟ فيقُولُ الله : إنّي حرمْتُ الجنَّةَ على الكافرين. ثُمَّ يُقالُ: يا إبْراهيم ماتحْتَ رجْليْكَ فيَنْظُرُ فإذا هُو بذيخٍ مُلتطخ، فيُؤخذُ بقوائمه فيُلْقى في النَّار ». (حسن) أنظر حيث رقم (٨١٤٧) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئیبراهیم رۆژی قیامەت بە ئازەری باوکی دەگات. وە ئازەر رووی لیل و هەڵبزرکاوە. ئیبراهیمیش پێی دەڵێ: ئەی پێم نەوتیت سەر پێچیم مەکە و لە قسەم دەر مەچۆ، باوکیشی دەڵێ: دەی ئەمڕۆ سەرپێچیت ناکەم و لەفەرمانت دەرناچم، ئیبراهیمیش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم تۆ بەڵێنت پێدام کە لە رۆژی زیندوکردنەوەدا توشی رووزەردیم نەکەیت، جا چی رووزەردیەك لەوە رووزەردتره کە من باوکم ئاوا دوور لە رەحمەتت بێت. خوای گەورەش دەفەرموێت: من بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر بێ باوەڕان، پاشان دەفەرموێت ئەی ئیبراهیم ئەوە چییە لە ژێر پێکانتدا ؟، کە سەیر دەکات گورگێك یان نێره کەمتیارێکی پۆخڵ، ئینجا چوار پێی دەگیرێت و فڕێ دەدرێتە ئاگرەوە).

## ( ٣٦ ) ( چ شتێك زیاتر تەرازوو قورس دەكات )

(١٢٣٨) ( هق ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَثْـقَلُ شَيْءٍ فِي مِيْزَانِ الْمُؤْمِنِ خُلُقٌ حَسَنٌ، إِنَّ اللهَ يَبْغَضُ الْفَاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ الْبَذِيءَ ﴾ ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٣٥ ) في صحيح الجامع

ابو الدرداء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (قورسترین شت لە تەرازووی باوەڕداردا رەوشتی جوانە، وە خوا رقیەتی لە بەدی بەدكاری دەم و داوێن پیس).

# ( بەشی : بەهەشت و ئاگر )

## ( ١ ) ( هەر كەسێك سێ جار داوای بەهەشت لە خوا بكات )

(١٢٣٩) ( حم هـ حب ك ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَا سَأَلَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ اللهَ الْجَنَّةَ ثَلاثاً إِلاَّ قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَ لا اسْتَجَارَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ اللهَ مِنَ النَّارِ ثَلاثاً إِلاَّ قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنِّي ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٦١٧ ) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر موسڵمانێك سێ جار داوای بەهەشت لە خوا بكات ئەوا بەهەشت دەڵێ: خودارەندی من بیخەرە بەهەشتەوە، وە هەر پیاوێكی موسڵمان سێجار پەنا بە خوا بگرێت لە ئاگر، ئاگرەكە دەلێ: خوداوەندی من پەنای بدە لە من).

## ( ٢ ) ( لەو كارانەی كە پێی دەچێتە بەهەشت )

( ١٢٤٠) ( د حب ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ نَزَعَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ خَيْراً قَطُّ غُصْنَ شَوْكٍ عَنِ الطَّرِيقِ، إِمَّا كَانَ فِي شَجَرَةٍ فَقَطَعَهُ فَأَلْقَاهُ، وَ إِمَّا كَانَ مَوْضُوعاً فَأَمَاطَهُ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ بِهَا فَأَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٦٧٥٢ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (پیاوێك كە هەرگیز چاكەیەكی نەكردبوو، لقە دڕكێكی لەسەر رێگاكە لابرد، یان بە دارێكەوە بوو بڕی و فڕێی دا، یان دانرابوو ئەویش خستیە ئەولاوە و لای دا، خوایش سوپاسی ئەو كارەی كرد و خستیە بەهەشتەوە ).

## ( ٣ ) ( فەزڵی لاواز و هەژارەكان )

(١٢٤١) ( م ت ) عن أبي هريرة ( م ) عن أبي سعيد ( ابن خزيمة ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ احْتَجَّتِ النَّارُ وَ الْجَنَّةُ، فَقَالَتْ هَذِهِ: يَدْخُلُنِي الْجَبَّارُونَ وَ الْمُتَكَبِّرُونَ، وَقَالَتْ هَذِهِ: يَدخُلُنِي الضُّعَفَاءُ وَ الْمَسَاكِيْنُ، فَقَالَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ لِهَذِهِ: أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ، ( وَ رُبَّمَا قَالَ: أُصِيْبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ )، وَ قَالَ: لِهَذِهِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ، وَ لِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا مِلْؤُهَا ﴾. و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٥ ) في صحيح الجامع

ابوهريرە و ابو سعيد و انس ـە وە دەڵێن: پێغەمبە(ﷺ) فەرموویەتی: (ئاگر و بەهەشت كەوتنە قسە بەرامبەر بە یەكتر، ئاگر وتی: من زۆردارەكان و لووت بەرزەكانم تێ دێت. وە ئەویشیان وتی: من لاواز و هەژارەكانە تێ دێت، خوای گەورەش بەویانی فەرموو : تۆ ئەشكەنجەی منیت و هەر كەسێكم

بوێت به تۆ ئەشكەنجەی دەدەم. یان فەرمووی هەر كەسێكم بوێت دووچار و توشی تۆی دەكەم. وە بەمیشیانی فەرموو: تۆ رەحمەتی منیت و كێم بووێت به تۆ رەحمی پێ دەكەم، وە پڕكردنی هەر یەكەیشتان لەسەر منە ).

## ( ٤ ) ( ئەوەی باوەڕدار نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە )

**(١٢٤٢) ( خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « يا بلالُ! قُمْ فأذِّنْ: لايدخُلُ الجنَّةَ إلاَّ مُؤمنٌ ،و إنَّ الله يُؤَيِّدُ هذا الدِّيْنَ بالرَّجُلِ الفاجرِ » . (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٨٨٧) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی بیلال هەستە بانگ بدە: كە تەنها بڕوادار نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، وە خوای گەورە بە پیاوی خراپكاریش پشتتیوانی لەم ئاینە دەكات ).

## ( ٥ ) ( ئەوەی كە خوای گەورە بۆ بەندە چاكەكانی خۆی ئامادەی كردووە )

**(١٢٤٣) ( حم ق ن هـ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « قال الله تعالى: أعددتُ لعبادي الصَّالحِيْن ما لاعينٌ رأتْ ولا أُذنٌ سمعتْ ولا خطر على قلب بشر » . (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٣٠٦) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە فەرموویەتی: هێندەم بۆ بەندە چاكەكارەكانم ئامادە كردووە كە نە هیچ چاوێك شتی وای دیوە و نە هیچ گوێیەكیش شتی وای بیستووە و نە بە خەتەرەیش بە دڵی هیچ مرۆڤێك داهاتووە ).

## ( ٦ ) ( یەكەم دەستە كە دەچنە بەهەشتەوە )

**(١٢٤٤) ( ق ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): « إنَّ أوَّلَ زُمْرةٍ تدخُلُ الجنَّةَ على صُورةِ القَمرِ ليلَةَ البدْرِ و الَّذيْن على أثرِهِمْ كأشَدِّ كوْكبٍ دُرِّيٍّ في السَّماءِ إضاءةً ، قُلُوبُهُمْ على قلْبِ رجُلٍ واحدٍ لا اختِلافَ بيْنَهُمْ ولا تباغُضَ ولا تحاسُدَ، لكُلِّ امرئٍ منهُمْ زوجتانِ كُلُّ واحدةٍ منْهُما يُرى مُخُّ سُوقِها منْ وراءِ لحْمِها من الحُسْنِ ، يُسبِّحُون الله بُكرةً و عشِيّاً ، لا يسْقَمُونَ ولا يتمخَّطُونَ ولا يبْصُقُون، آنيتُهمُ الذَّهبُ و الفضَّةُ و أمْشاطُهُمُ الذّهبُ، و وقُودُ مجامِرِهِم الألُوَّةُ » . (حسن) أنظر حيث رقم (٢٥٥٧) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (یەكەم دەستە كە دەچنە بەهەشتەوە لەسەر وێنەی مانگ لە شەوی چواردەدا، وە ئەوانەی بە دوایاندا دێن وەك گەشترین ئەستێرەیەكی درەوشاوە لە ئاسماندا كە رووناكی بداتەوە، دڵەكانیان لەسەر دڵی یەك پیاوە، ناكۆكی لە نێوانیاندا نییە ، ڕقەبەرایەتی و حەسودییان لە نێواندا نییە، هەر یەكێك دوو خێزانی هەیە، كە هەریەكەیان ئێسكی لاقی

لەودیو گۆشتیەوە دەبینرێت لە جوانیدا، بەیانی و ئێوارە تەسبیحاتی خوا دەکەن، نە نەخۆش دەکەون و نە بەڵغەم و پیسییان هەیە و نە تف دەکەن، دەفرەکانیان لە ئاڵتون و زیوە و شانەکانیشیان ئاڵتونە و سوتەمەنی پشکۆدانی بخورەکانیشیان داری عودە ).

## ( ٧ ) ( کێ بەهەشتییجیەو کێ دۆزەخیی یە؟ )

(١٢٤٥) ( هـ ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْ مَلأَ اللهُ تَعالىَ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَـنَاءِ النَّاسِ خَيْراً وَ هُوَ يَسْمَعُ، وَ أَهْلُ النَّارِ مَنْ مَلأَ اللهُ تَعالىَ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَـنَاءِ النَّاسِ شَرّاً وَ هُوَ يَسْمَعُ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٤٩٥ ) في صحيح الجامع

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەهلی بەهەشت کەسێکە کە خوای گەورە هەردوو گوێی پڕ کردبێت بە ستایشی خەڵك لەسەری بەچاکە و خۆیشی بیبیستێت، وە ئەهلی ئاگریش کەسێکە کە هەردوو گوێی پڕ بووبێت لە باسکردنی خەڵك بۆی بە خراپە و خۆیشی بیبیستێت ).

(١٢٤٦) ( حم ق ت ن هـ ) عن حارثة بن وهب قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟ كُلُّ ضَعِيْفٍ مُتَضَعَّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلى اللهِ لأَبَرَّهُ، أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلٍ جَوَّاظٍ جعظري مُسْتَكْبِرٍ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٩٤ ) في صحيح الجامع

حارثەی کوڕی وهب دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەرێ پێتان نەڵێم کێ ئەهلی بەهەشتە؟ هەموو لاوازێکی بێ دەسەڵات، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات ئەوا سوێندەکەی ناشکێت و چی داواکردبێت دەیداتێ، ئەرێ پێتان نەڵێم کێ ئەهلی ئاگرە؟ هەموو دڵ ڕەقێکی بەفیز و دەعیەی ستەمکاری لووت بەرز ).

(١٢٤٧) ( الدارقطني في الأفراد طب ) عن كعب بن عجرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَلا أُخْبِرُكُمْ بِرِجَالِكُمْ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ النَّبيّ في الْجَنَّةِ، وَ الشَّهِيْدُ فِي الْجَنَّةِ، وَ الصدِيْقُ فِي الْجَنَّةِ، وَ الْمَوْلُودُ فِي الْجَنَّةِ، وَ الرَّجُلُ يَزُورُ أَخَاهُ فِي نَاحِيةِ الْمِصْرِ فِي اللهِ فِي الْجَنَّةِ، أَلا أُخْبِرُكُمْ بِنِسَائِكُمْ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ الْوَدُودُ الْوَلُودُ الْعَئُودُ الَّتِي إِذا ظَلَمَتْ قَالَتْ: هَذِهِ يَدِي فِي يَدِكَ لا أَذُوقُ غَمْضاً حَتَّى تَرْضَى ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٩٨ ) في صحيح الجامع

کعب ی کوڕی عجرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەرێ پێتان نەڵێم پیاوەکانتان لە ئەهلی بەهەشت کامانەن؟ پێغەمبەر لە بەهەشتدایە، شەهید لە بەهەشتدایە، ڕاستگۆ لە بەهەشت دایە، منداڵ لە بەهەشتدایە، وە پیاو سەردانی براکەی دەکات لە قەراغی شار لەبەر خوا لە بەهەشتدایە، ئەی پێتان نەڵێم ئافرەتەکانتان لە ئەهلی بەهەشت کامانەن؟ ئەوەی کە ڕوو دەدات بە مێردەکەی و خۆی خۆشەویست دەکات لە لای و منداڵی زۆر دەخاتەوە و دڵی مێردەکەی دەهێنێتەوە کە ئەگەر هەڵەیەکی کرد دەڵێ: ئەوە دەستمە لە دەستدا، چاو لێك نانێم هەتا ڕازی دەبیت ).

## ( ٨ ) ( ژورەكانی بەهەشت )

(١٢٤٨) ( حم حب هب ) عن أبي مالك الأشعري ( ت ) عن علي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ في الجنّة غُرفاً تُرى ظُهُورُها مِنْ بُطُونها، وَ بُطُونها مِنْ ظُهُورها أعدّها اللهُ تَعالى لِمَنْ أطْعَمَ الطّعَامَ وَ ألانَ الكَلامَ وَ تَابعَ الصّيَامَ وَ صَلّى بِاللّيْلِ وَ النّاسُ نِيَامٌ ﴾. (حسن) أنظر حيث رقم (٢١٢٣) في صحيح الجامع

ابى مالك الأشعري و على دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لە بەهەشتدا ژووری وای تێدایە، لە ناوەوە دەرەوەی دەبینرێت و ناوەوەیشی لە دەرەوە دەبێنرێت، خوای گەورە دایناوە بۆ هەر كەسێك كە خواردن بدات، و گفت و قسەی نەرم و شیرین بێت ،و بەردەوام بێت لەسەر رۆژوگرتن ،و شەونوێژ بكات كاتێك كە خەڵك خەتوون )

## ( ٩ ) ( بەهەشت سەد پلەیە )

(١٢٤٩) ( حم خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ في الْجَنّة مائةُ دَرَجة أعدّها اللهُ للمُجَاهديْنَ في سَبْيل الله، مَابيْنَ الدرَجَتَيْن كَمَا بَيْنَ السّمَاء وَ الأرْض ،فإذا سَألْتُمُ اللهَ فَسَلُوهُ الفِرْدَوْسَ فَإنّهُ أوْسطُ الْجَنّة وَ أعْلى الْجَنّة وَ فَوْقَهُ عَرْشُ الرّحْمَن وَ مِنْها تُفَجّرُ أنْهارُ الْجَنّة ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢١٢٦) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی. ( لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە كە خوا دایناوە بۆ موجاهیدەكان لە پێناو خوادا، لە نێوان هەر دوو پلەیەكدا هەر وەك نێوانی ئاسمان و زەوی وایە، جا ئەگەر داواتان لە خوا كرد، ئەوا داوای فیردەوسی لێ بكەن. چونكە ئەوە ناوەڕاستی بەهەشتەو لوتكەی بەهەشتیشە، وە لە سەروو ئەوەوە ئیتر عەرشی رەحمانە، وە هەر لەویشەوە رووبارەكانی بەهەشت هەڵدەقوڵێت )

## ( ١٠ ) ( حەوزە ئاوەكەی پێغەمبەر ﷺ لە قیامەتدا )

(١٢٥٠) ( م هـ ) عن حذيفة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ حَوْضي لأبْعَدُ مِنْ أيْلَةَ إلى عَدَنَ، وَ الّذي نَفْسي بيَده لآنيَتُهُ أكْثَرُ مِنْ عَدَد النُّجُوم، وَ لَهُوَ أشَدُّ بَيَاضاً مِنَ اللّبَنِ وَ أحلى مِنَ الْعسَل، وَ الّذي نَفْسي بِيَده إنّي لأذُودُ عَنْهُ الرّجالَ كَمَا يَذُودُ الرّجُلُ الإبلَ الْغَريبَةَ عَنْ حَوْضه قَالُوا: يَا رَسُولَ الله أتَعْرِفُنَا؟ قَالَ: نَعَمْ تَرِدُونَ عَلَيّ غُراً مُحَجّلِيْنَ مِنْ أثَـر الْوُضُوءِ لَيْسَتْ لأحَدٍ غَيْرِكُم ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٥٩) في صحيح الجامع

حذيفة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( حەوزەكەی من دوورترە لە نێوانی ايلة بۆ عدن، وە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، قاپەكانی زیاترە لە ژمارەی ئەستێرەكان. وە ئاوەكەیشی لە شیر

سپی تره، وه لەهەنگوینیش شیرینتره، وه من هەر خەڵکی غەیرەی لێ دوور دەخەمەوە، هەر وەك چۆن پیاو وشتری غەریب له حەوزە ئاوەکەی خۆی دوور دەخاتەوە)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا جا دەماننناسیتەوە؟ فەرمووی: ( بەڵێ که دێنه لام لەسەر ئاوەکە دەست و پێ سپین به هۆی شوێنەواری دەست نوێژەوە، که کەسی تر جگه له ئێوە وا نییه ).

**(١٢٥١) ( خ ت ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ بَيْنَمَا أَنَا أَسِيْرُ فِي الْجَنَّةِ إِذْ عُرِضَ لِي نَهرٌ حَافَتَاهُ قِبابُ اللُّؤْلُؤِ الْمُجَوَّف قُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِي أَعْطَاكَهُ اللهُ، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ إِلىَ طِينَةٍ فَاسْتَخْرَجَ مِسكاً، ثُمَّ رُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَرَأَيْتُ عِنْدَهَا نُوراً عَظِيْماً ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٨٣٦ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( له کاتێکدا که من به بەهەشتدا دەڕۆشتم رووبارێکم لێ دەرکەوت که دوو لێوارەکەی چەتر و گوڵنەی لێ هەڵدرابوو که هەر یەکەیان مرواریيەك بوو ناوەکەی بۆش کرابوو، وتم ئەی جبریل ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەوە ئەو کەوسەرەیە که خوا پێی داویت. پاشان به دەستی کێشای به قوڕێکدا و میسکی لێ هێنایە دەرەوە. پاشان ( سدرة المنتهى ) م بۆ هەڵدرایەوە ئینجا لەوێدا نورێکی زۆر گەورەم بینی ).

**(١٢٥٢) ( حم خ ت ن ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَإِذَا أَنَا بِنَهْرٍ حَافَتَاهُ خِيَامُ اللُّؤْلُؤِ فَضَرَبْتُ بِيَدِي إِلىَ مَا يَجْرِي فِيْهِ الْمَاءُ فَإِذَا مِسْكٌ أَذْفَرٌ فَقُلْتُ: مَا هَذَا يَا جِبْرِيْلُ؟ قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِي أَعْطَاكَهُ اللهُ ﴾. ( حسن ) أنظر حيث رقم ( ٣٣٤٨ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( چومە بەهەشتەوە که سەیر دەکەم رووبارێك هەردوو لێوارەکەی خێوەتی مرواریيە، پاشان دەستم کێشا بەو شوێنەی که ئاوەکەی پێدا دەڕۆیشت که بینیم میسکی بۆن خۆشە، ووتم: ئەمە چییە ئەی جبریل؟ ، وتی: ئەمە ئەو کەوسەرەیە که خوا پێی داویت ).

**(١٢٥٣) ( ك ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ الْكَوْثَرُ نَهْرٌ أَعْطَانِيْهِ اللهُ فِي الْجَنَّةِ تُرابُهُ مِسْكٌ ، أَبْيَضُ مِنَ اللَّبَنِ وَ أَحْلىَ مِنَ الْعَسَلِ ، تَرِدُهُ طائِرٌ أَعْنَاقُها مِثْلُ أَعْنَاقِ الْجُزُرِ ، آكِلُهَا أَنْعَمُ مِنْهَا ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤٦١٢ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( کەوسەر رووبارێکە خوا پێی داوم له بەهەشتدا، گڵەکەی میسکە، له شیر سپیترە و له هەنگوین شیرینترە، هەندێك باڵندە دێنه سەری ملیان وەك ملی حوشتر وایە، ئەو کەسەی که دەیانخوات لەوان خوا پێداوتر و خۆشحاڵترە ).

## ( ١١ ) ( دوو چاو ئاگریان بەر ناکەوێت )

**(١٢٥٤) ( ت ) عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ عَيْنَانِ لا تُصِيبُهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ وَ عَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيْلِ اللهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٤١١١ ) في صحيح الجامع**

إبن عباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دوو چاو ئاگریان بەرناکەوێت و ناسوتێت: چاوێك لە ترسی خوا گریابێت، وە چاوێکیش شەو پاسەوانی لە پێناوی خوادا بکات ).

## ( ١٢ ) ( بازاری بەهەشت )

**(١٢٥٥) ( حم م ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ فِي الْجَنَّةِ لَسُوقاً يَأْتُونَها كُلَّ جُمُعَةٍ، فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمالِ فَتَحْثُوا في وجُوههِمْ وَ ثِيَابِهِمْ، فَيَزْدادُونَ حُسْناً وَ جَمالاً، فَيَرْجِعُونَ إلىَ أَهْلِيهِمْ وَ قَدْ ازْدَادُوا حُسْناً وَ جَمَالاً، فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: وَ اللهِ لَقَدْ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنا حُسْناً وَ جَمالاً فَيَقُولُونَ: وَ أَنْتُمْ وَ اللهِ لَقَدْ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْناً وَ جَمَالاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢١٢٤) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( لە بەهەشتدا بازارێکی تێدایە، هەموو ڕۆژانێکی هەینی سەردانی دەکەن، ئینجا بای باکوریش هەڵدەکات، وە دەیپرژێنێت بە دەم و چاو و جل و بەرگەکانیاندا، و ئەوەندەی تر باش و جوان دەبن، ئینجا دەگەڕێنەوە بۆ لای خێزانەکانیان و لە جاران خاس و جوانتر بوون، خێزانەکانیشیان پێیان دەڵێن: سوێند بە خوا لە دوای ئێمەوە خاسی و جوانییەکەتان زیادی کردووە، ئەوانیش دەڵێن:- ئێوەش سوێند بێت بە خوا لە دوای ئێمەوە باشتر و جوانتر بوون ).

## ( ١٣ ) ( تەنها ئەو کەسەی کە یاخی دەبێت ناچێتە بەهەشت )

**(١٢٥٦) ( طس ك ) عن أبي أمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ كُلُّكُمْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إلاَّ مَنْ شَرَدَ عَلىَ اللهِ شِرَادَ الْبَعِيرِ عَلىَ أَهْلِه ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٤٥٦٨) في صحيح الجامع**

ابو امامە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەمووتان دەچنە بەهەشتەوە تەنها ئەو کەسە نەبێت کە لە خوای گەورە تەرە و یاخی دەبێت، هەر وەك وشتر کە لە خاوەنەکەی تەرە دەبێت ).

**(١٢٥٧) ( ك ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَتَدْخُلُنَّ الْجَنَّةَ إلاَّ مَنْ أَبَى وَ شَرَدَ عَلىَ اللهِ كَشْرَادِ الْبَعِيرِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٥٠٥٥) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بە دڵنیاییەوە دەچنە بەهەشتەوە جگە لەو کەسەی کە لە خوا یاخی بووە و تەرە بووە وەك تەرە بوونی وشتر ).

## ڕوونکردنەوەی فەرموودەکە :

مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیە کە خوا بەرەحمە و بەبەزەییە وە هەموو موسڵمانێك دەچێتە بەهەشتەوە مەگەر کەسێك نەبێت کە هەر تەواو لە خوا یاخی بووە و پشتی هەڵکردووە و هەتا بێت زیاتر مل دەنێت و لە ئیسلامەتی و موسڵمانان دوور دەکەوێتەوە، بە جۆرێك کە هیچ ئامۆژگاری و هەوڵدانێك لەگەڵیدا سودی نییە، هەر وەك ئەو بارگیرەو وشترەی کە لە خاوەنەکەی یاخی دەبێت، ئیتر بە دە کەس

دابین ناکرێت، ئەویش ئاوای لێدێت، بە واتایەکی تر تەنها ئەو کەسە ناچێتە بەهەشت کە خۆی نایەوێت بچێتە بەهەشت و هەر بە دەستی ئەنقەس ملە جێڕێ دەکات و هەتا بێت زیاتر مل لە خراپە دەنێت، کە بە داخەوە ئەمڕۆ ئەو جۆرە کەسانە زۆرن و هەتا بێت هەر لە زیادبوونیشدان، ئەی خوای پەروەردگار داوات لێدەکەین لە مەکر و فیتنەی خۆت پەنای ئێمە و هەموو موسڵمانان بدەیت.

## ( ١٤ ) ( دۆزەخیەکانی بەهەشت )

(١٢٥٨) ( حم خ ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ لَيُصِيبَنَّ نَاساً سَفَعٌ مِنَ النَّارِ عُقُوبَةً بِذُنُوبٍ عَمِلُوهَا ثُمَّ يُدْخِلُهُمُ اللهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ فَيُقَالُ لَهُمْ: الْجَهَنَّمِيُّونَ ﴾. (صحيح) انظر حيث رقم (٥٤٥٤) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( کەسانێك گرفتاری ژاراوێك لە ئاگر دەبن کە پێی دەسوتێنرێن و رەش دەبن، لە سزای ئەو تاوانانەی کە کردوویانە، لە پاش ئەوەدا خوا دەیانخاتە بەهەشتەوە بە فەزڵی رەحمەتی خۆی، ئیتر لەوێ پێیان دەوترێت دۆزەخیەکان ).

## ( ١٥ ) ( دەرگاکانی بەهەشت هەشتن )

(١٢٥٩) ( حم ق ) عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ شَهِدَ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ، وَ أَنَّ عِيسَى عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ وَ ابْنُ أَمَتِهِ وَ كَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَ رُوحٌ مِنْهُ، وَ أَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَ أَنَّ النَّارَ حَقٌ وَ أَنَّ الْبَعْثَ حَقٌّ، أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنْ عَمَلٍ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ شَاءَ ﴾. (صحيح) انظر حيث رقم (٦٣١٩) في صحيح الجامع

عبادەی کوڕی صامت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر کەسێك شایەتی دا کە هیچ خودایەك نییە جگە لە زاتی (الله) نەبێت و تاك و تەنها هەر خۆیەتی و هیچ شەریك و هاوەڵی نییە و ، کە (محمد) یش بەندە و پێغەمبەری نێردراوی ئەوە، وە کە (عیسا)ش بەندە و پێغەمبەری نێردراوی ئەوە و کوڕی کەنیزەکێکی خوایە، وە ئەو وشەیەی خوایە کە ناردیە سەر مەریەم و رۆحی ئەوە، وە کە بەهەشت حەقە و ئاگر و حەقە و کە زیندووبوونەوەش حەقە، ئەوا خوا دەیخاتە بەهەشتەوە بە هەر کردەوەیەکیشەوە کە کردبێتی، وە لە هەر کامێکیش لە هەشت دەرگاکەی بەهەشتەوە کە خۆی بیەوێت ).

## ( ١٦ ) ( پیاوێك لە بەهەشتدا حەزی لە کوشتوکاڵ کردنە )

(١٢٦٠) ( حم خ ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ فِي الزَّرْعِ فَقَالَ لَهُ: أَلَسْتَ فِيمَا شِئْتَ؟ قَالَ: بَلَى وَ لَكِنْ أُحِبُ أَنْ أَزْرَعَ! فَبَذَرَ ، فَبَادَرَ الطَرْفَ نَبَاتُهُ

وَ اسْتِوَاؤُه وَ اسْتِحْصادُهُ فَكَانَ أَمْثَالَ الْجِبَالِ ،فَيَقُولُ الله : دُونَكَ يَا ابْنَ آدمَ! فَإِنَّهُ لا يُشْبِعُكَ شَيء ﴾ (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٠٨٠) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( پیاوێك لە خەڵكی بەهەشت داوای رووخسەتی پەروەردگاری كرد كە كوشتوكاڵ بكات ئەویش پێی فەرموو: ئەی ئەوە نییە تۆ هەرچییەكت بوێت هەت و پێت دراوە؟ وتی: بەڵام من هەر حەزم لە كوشتوكاڵ كردنە، ئینجا كە تۆوەكەی چاند هەر لە چاوتروكانێكدا سەوز بوو پێ گەیشت و دروێنەش كرا و بەرو بوومەكەیشی هێندەی چیاكان دەبوو. خوای گەورەش پێی دەفەرمووێت: ها ئەوەش تۆ و بەرووبومی كوشتوكاڵەكەت ئەی بەنی ئادەم، بەراستی تۆ بە هیچ شتێك تێر نابیت ).

## ( ١٧ ) ( چاندنی دارخورمایەك لە بەهەشتدا )

(١٢٦١) ( ت حب ك ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيْمِ وَ بِحَمْدِهِ ، غُرِسَتْ لَهُ بِهَا نَخْلَةَ فِي الْجَنَّةِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٢٢) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( هەر كەسێك بڵێت – سبحان الله و بحمده – ئەوا دار خورمایەكی لە بەهەشتدا بۆ دەچێنرێت ).

## ( ١٨ ) ( وتنی -لااله الا الله- بە دڵسۆزییەوە )

(١٢٦٢) ( البزار ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ مَنْ قَالَ: لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ مُخْلصاً دَخَلَ الْجَنَّةَ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٦٤٣١) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هەر كەسێك بڵێت -لااله الا الله- بە راستی و دڵسۆزی ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە ).

## ( ١٩ ) ( بینینی خوای گەورە )

(١٢٦٣) ( حم ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿هَلْ تُضَارّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ بِالظَّهِيْرَةِ صَحْواً لَيْسَ مَعَهَا سَحَابٌ؟ وَ هَلْ تُضَارّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ صَحْواً لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ؟﴾ قالُوا: لا يَارَسُولَ الله(ﷺ)! قَالَ: ﴿ مَا تُضَارّونَ فِي رُؤْيَةِ الله يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ كَما تُضَارّونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا . إِذا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ: لِيَتَّبِعْ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ، فَلا يَبْقَى أَحَدٌ كَانَ يَعْبُدُ غَيْرَ اللهِ سُبْحانَهُ مِنَ الأَصْنَامِ وَ الأَنْصَابِ، إِلاَّ يَتَساقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَى إِذا لَمْ يَبْقَ إِلاَّ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللهَ مِنْ بَرّ وَ فَاجِرٍ وَ غُبَّرِ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَيُدْعَى الْيَهُودُ فَيُقَالُ لَهُمْ: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا:

كُنَا نَعْبُدُ عُزَيْر ابْنَ الله، فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ مَااتَّخَذَ الله مِنْ صَاحِبَةٍ وَلا وَلَد، فَمَاذا تَبْغُونَ؟ قَالُوا: عطشْنا، يَا ربَّنَا فَاسْقنَا، فَيُشَارُ إليهِمْ: ألا تَردُونَ؟ فَيُحْشَرُونَ إلىَ النَّار كَأَنَّها سَرابٌ يُحطِّمُ بَعْضُها بَعْضاً، فَيَتَسَاقَطُونَ في النَّار، ثُمَّ يُدْعى النَّصَارَى فَيُقَالُ لَهُمْ: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ المَسيحَ ابْنَ الله، فَيُقَالُ لَهُمْ: كَذَبْتُم، ما اتَّخَذَ اللهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلا وَلَد، فَيُقَالُ لَهُمْ: مَاذا تَبْغُونَ؟ فَيَقُولُونَ: عَطشْنا يا ربَّنَا فاسْقِنَا، فَيُشَارُ إلَيْهِمْ: ألا تَرِدُونَ؟ فَيُحْشَرُونَ إلى جَهَنَّمَ كَأَنَّها سَرابٌ يُحطِّمُ بَعْضُها بَعْضاً، فَيَتَسَاقَطُونَ في النَّار حَتَّى إذا لَمْ يَبْقَ إلاَّ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الله مِنْ بَرٍّ وَ فَاجِر، أتَاهُمْ رَبُّ العَالَمِينَ سُبْحَانَهُ وَتَعالىَ في أدْنَى صُورَةٍ مِنَ الَّتي رَأوْهُ فِيهَا، قَالَ: فَما تَنْتَظِرُونَ؟ تَتْبَعُ كُلَّ أمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ، قَالُوا: يَا رَبَّنَا فَارَقْنَا النَّاسَ في الدُّنْيَا أفْقَرَ مَا كُنَّا إليهِمْ وَ لَمْ نُصَاحِبْهُمْ، فَيَقُولُ: أنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِالله مِنْكَ لا نُشْرِكُ بِالله شَيْئاً ( مَرَّتَيْنِ أوْ ثَلاثاً ) حَتَّى إنَّ بَعْضَهُمْ لَيَكَادُ أنْ يَنْقَلِب، فَيَقُولُ: هَلْ بَيْنَكُمْ وَ بَيْنَهُ آيَةٌ فَتَعْرِفُونَهُ بِهَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُكْشَفُ عَنْ سَاق، فَلا يَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لله مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِه إلاَّ أذِنَ الله لَهُ بِالسُّجُود وَلا يَبْقى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ اتِّقَاءً وَ رِيَاءً إلاَّ جَعَلَ الله ظَهْرَهُ طَبَقَةً وَاحِدَةً كُلَّمَا أرادَ أنْ يَسْجُدَ خَرَّ عَلىَ قَفَاهُ، ثُمَّ يَرْفَعُونَ رُءُوسَهُمْ وَ قَدْ تَحَوَّلَ في الصُّورَةِ الَّتي رَأوْهُ فِيهَا أوَّلَ مَرَّة، فَيَقُولُ: أنَا رَبُّكُم، فَيَقُولُونَ: أنْتَ رَبُّنا، ثُمَّ يُضْرَبُ الجِسْرُ عَلَى جَهَنَّم، وَ تَحِلَّ الشَّفَاعَةُ، وَ يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، قِيلَ: يَا رَسُولَ الله! وَ مَا الجِسْرُ؟ قَالَ: دَحْضٌ مَزِلَّةٌ، فِيْه خَطَاطِيفُ وَ كَلالِيبُ وَ حَسَكٌ . تَكُونُ بِنَجْد فِيهَا شُوَيْكَةٌ يُقَالُ لَها السَّعْدَانُ، فَيَمُرُّ المُؤْمِنُونَ كَطَرْف العَيْن وَ كَالبَرْق وَ كَالرِّيح وَ كَالطَّيْر وَ كَأَجَاوِيد الخَيْل وَ الرِّكَاب، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَ مَخْدُوشٌ مُرسَلٌ، وَ مَكْدُوسٌ في نَار جَهَنَّمَ، حَتىَ إذا خَلصَ المُؤْمِنُونَ مِنْ النَّار فَوالَّذي نَفْسي بِيَدِه مَا مِنْ أحَد مِنْكُمْ بِأشَدَّ مُنَاشَدَةً لله في اسْتِقْصَاء الحَقِّ مِنْ المُؤْمِنِيْنَ لله يَوْمَ القِيَامَةِ لإخْوَانِهِمُ الَّذِيْنَ في النَّار، يَقُولُونَ: رَبَّنا كَانُوا يَصُومُونَ مَعَنا وَ يُصَلُّونَ وَ يَحُجُّونَ، فَيُقَالُ لَهُمْ: أخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ، فَتُحَرَّمُ صُوَرُهُمْ عَلىَ النَّار، فَيُخْرِجُونَ خَلْقاً كَثيراً قَدْ أخَذَتِ النَّارُ إلىَ نِصْفِ سَاقِه وَ إلىَ رُكْبَتَيْه، فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا مَا بَقِيَ فِيهَا أحَدٌ مِمَّنْ أمَرْتَنَا بِه، فَيَقُولُ الله عَزَّوَجَلَ: ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ في قَلْبِه مِثْقَالَ دِيْنَار مِنْ خَيْر فَأَخْرِجُوهُ، فَيُخْرِجُونَ خَلْقاً كَثيراً، ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا أحَداً مِمَّنْ أمَرْتَنَا بِه، ثُمَّ يَقُولُ: ارْجِعُوا فَمَن وَجَدْتُمْ في قَلْبِه مِثْقَالَ نِصْفِ دِيْنَار مِنْ خَيْر فَأَخْرِجُوهُ، فَيُخْرِجُونَ خَلْقاً كَثيراً، ثُمَّ يَقُولُونَ: رَبَّنا لَمْ نَذَرْ فِيهَا مِمَّنْ أمَرْتَنَا أحَداً، ثُمَّ يَقُولُ: ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ في قَلْبِه مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْر فَأَخْرِجُوهُ، فَيُخْرِجُونَ خَلْقاً كَثيراً، ثُمَّ يَقُولُونَ: رَبَّنا لَمْ نَذَرْ فِيْهَا خَيْرا﴾، وَكَانَ أبُو سعيد الخُدْرِيَ يَقُولُ: إنْ لَمْ تُصَدِّقُوني بِهذا الحَديث فَاقْرَأوا إنْ شِئْتُمْ: ﴿ إنَّ اللهَ لايَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّة وَإنْ تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِنْ لَدُنْهُ أجْراً عَظِيماً ﴾، ( النساء الآية: ٤٠)، ﴿ فَيَقُولُ الله عَزَّوَجَلَ: شَفَعَتِ المَلائكَةُ وَ شَفَعَ النَّبِيُّونَ وَ شَفَعَ المُؤْمِنُون، وَ لَمْ يَبْقَ إلاَّ أرْحَمُ الرَّاحِمِينَ فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّار فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْماً لَمْ يَعْمَلُوا خَيْراً قَطّ، قَدْ عَادُوا حُمَماً فَيُلْقِيهِمْ في نَهْر في أفْوَاهِ الجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ نَهْرُ الحَيَاة، فَيَخْرُجُون

كما تخرج الحبة في حميل السيل، ألا ترونها تكون الى الحجر او الى الشجر. ما يكون الى الشمس اصيفر و اخيضر. و ما يكون منها الى الظل يكون ابيض؟ . **فقالوا: يَا رَسُولَ الله(ﷺ)! كَأَنَّكَ تَرْعَى بِالبَادِيَةِ، قَالَ:** فيخرجون كاللؤلؤ في رقابهم الخواتم . يعرفهم اهل الجنة. هؤلاء عتقاء الله الذين أدخلهم الله الجنة بغير عمل عملوه لا خير قدموه. ثم يقول: ادخلوا الجنة فما رأيتموه فهو لكم. فيقولون: ربنا اعطيتنا ما لم تعط احدا من العالمين. فيقول: لكم عندي افضل من هذا. فيقولون: يا ربنا! اي شيء افضل من هذا؟ فيقول: رضاي. فلا أسخط عليكم بعده ابدا . **و اللفظ لمسلم. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٧٠٢٨ ) في صحيح الجامع**

**ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ گومانتان هەیە لە بینینی خۆر لە نیوەڕۆدا کە ئاسمان ساف بێت و هەوری لەگەڵدا نەبێت؟ وە ئایا هیچ گومانێکتان هەیە لە بینینی مانگ لە شەوی چواردەدا کە ئاسمان ساف بێت و هەوری تێدا نەبێت؟)وتیان:نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی:(دەی لە بینینی خوای تەبارەك و تەعالاش بێ گومان بن لە ڕۆژی قیامەتدا هەر وەك چۆن بێ گومانن لە بینینی ئەو دوانەی تر . هەر کاتێك بوو بە ڕۆژی قیامەت بانگدەرێك بانگ دەکات، با هەر ئومەتێك شوێنی ئەوە بکەوێت کە دەیپەرست، ئیتر هیچ کەسێك نامێنێتەوە کە غەیری خوای گەورەی پەرستبێت لە بتەکان و پەیکەرەکان ، ئیلا هەڵدەوەرێنە ناو ئاگرەکەوە و تێی دەکەون ،هەتا کاتێك کە هیچ کەسێك نەما تەنها ئەوانە نەبێت کە خوایان پەرستووە لە چاك و خراپ، و پاشماوەکانی ئەهلی کیتاب، ئینجا جولەکەکان بانگ دەکرێن و پێیان دەوترێت چیتان دەپەرست؟ دەڵێن:عوزەیری کوڕی خوامان دەپەرست، ئینجا دەوترێت:درۆتان کرد، خوا هیچ هاوەڵێك و هیچ کوڕیکی بۆ خۆی بڕیار نەداوە، ئینجا داوای چی دەکەن؟ دەڵێن: تینومان بووە ئەی پەروەردگارمان، ئاومان بدەرێ، ئینجا ئاماژەیان بۆ دەکرێت: کە نەبرێنە سەر ئاو، ئیتر حەشر دەکرێن بەرەو ئاگرەکەی کە دەڵێی سەرابە و خۆی خۆی تێك و پێك دەشکێنێت. ئینجا هەڵدەوەرێنە ناو ئاگرەکەوە، پاشان گاورەکان بانگ دەکرێن و پێیان دەوترێت: ئەی ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: ئێمە مەسیحی کوڕی خوامان دەپەرست. ئینجا پێیان دەوترێت:درۆتان کرد. خوا نە هاوەڵ و نەکوڕی بۆ خۆی بڕیار نەداوە. ئینجا پێیان دەوترێت: ئەی داوای چی دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: تینومان بووە ئەی پەروەردگارمان ئاومان پێ بدە) فەرمووی:(ئینجا ئاماژەیان پێ دەکرێت کەوا نەبرێنە سەرئاو، ئیتر حەشر دەکرێن بۆ دۆزەخ کە دەڵێی سەرابە و خۆی خۆی تێك و پێك دەشکێنێت، ئینجا دەکەونە ناو ئاگرەکەوە، هەتا کاتێك کە هیچ کەس نەما جگە لەوانەی کە خوای گەورەیان دەپەرست لە چاك و خراپ ،ئینجا خوای پەروەردگاری جیهانەکان دێتە لایان لە شێوەیەکی نزمتر لەوەی کە ئەوان تیایدا بینیویانە ،دەفەرمووێت ئەی ئێوە چاوەڕێی چی دەکەن؟ وا هەر ئومەتێك شوێن ئەوە دەکەوێت کە پێشتر پەرستوویەتی، ئەوانیش دەڵێن:ئەی پەروەردگارمان ئێمە لە دونیادا دەستبەرداری ئەو خەڵکە بووین هاوڕێیەتیمان نەکردن لە حاڵێکدا کە ئێمە لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان پێیان بوو. ئەویش دەفەرمووێت: من پەروەردگاری ئێوەم. ئەوانیش دەڵێن پەنا بە خوا دەگرین لە تۆ، هیچ شتێك ناکەین بە شەریکی خوا ( دووجار یان**

سێ جار) تەنانەت هەندێکیان وەختە دڵی بگۆڕێت و هەڵ بگەڕێتەوە، ئەویش پێیان دەفەرموێت: ئایا لە نێوان ئێوە و ئەودا هیچ نیشانەیەکتان هەیە کە بیناسنەوە پێی، ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.ئیتر ئەو کات لاق هەڵدەماڵدرێت،، ئیتر هیچ کەس نامێنێت لەوانەی کە سوجدەیان بۆ خوا بردبێت خۆبەخۆ و بێ ریابازی ئیلا خوای گەورە لەوێدا رێگەی پێ دەدات کە سوجدەی بۆ ببات، وە هیچ کەسێکیش نامێنێت لەوانەی کە بۆ خۆپاراستن و ریابازی سوجدەی دەبرد، ئیلا خوای گەورە لەوێدا پشتی دەکاتە یەك تەبەق ،هەر کە ویستی سوجدە ببات بە پشتدا دەکەوێت، پاشان کە سەریان بەرز دەکەنەوە دەبینن کە خوای گەورە گۆڕاوە لەو شێوەیەی کە یەکەم جار تیایدا بینییان، ئینجا دەفەرموێت من پەروەردگارتانم، ئەوانیش دەڵێن: تۆ پەروەردگارمانیت، پاشان پردەکە لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، و رێگە بە شەفاعەت کردن دەدرێت، و دەڵێن: خوداوەندمان سەلامەتمان بکە سەلامەتمان بکە) ،ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پردە چییە؟ فەرمووی: ( خلیسکە و پێی لێ دەترازێت، پڕی قولاپ و دڕکەزییە، لە بەرزاییەکیدا دڕکێکی تێدایە پێی دەوترێت سەعدان، جا ئیتر بڕوادارەکان تێپەڕ دەبن وەك چاو تروکان و وەك چەخماخە و وەك باو وەك باڵندە و وەك ئەسپی رەسەن و وە بە سواری، جا ئیتر هەیە رزگاری دەبێت و سەلامەت دەبێت، هەیە دەڕووشێت و ڕزگار دەبێت، وە هەشە لە ئاگری دۆزەخدا کەڵەکە دەکرێت،هەتا ئەگەر بڕوادارەکان لە ئاگرەکە رزگاریان بوو ،سوێند بێت بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ یەکێك لە ئێوە تیاتاندا نییە کە بۆ بەدواچوونی حەقی خۆی داوا لە خوا بکات و لێی بپاڕێتەوە هێندەی داواکردن و پاڕانەوەی بڕوادارەکان لە خوا لە رۆژی قیامەتدا بۆ ئەو برایانەیان کە لە ناو ئاگردان، دەڵێن: پەروەردگارمان ئەوانە لەگەڵ ئێمەدا بەڕۆژو دەبون و نوێژیان دەکرد و حەجیان دەکرد، ئینجا پێیان دەوترێت: هەر کەسێکیان لێ دەناسن دەریان بهێنن، ئینجا وێنە و شێوەیان لەسەر ئاگر حەرام دەبێت و ئەوانیش خەڵکێکی زۆر دەهێننە دەرەوە ، تیایاندایە کە ئاگر هەتا نیوەی لاقی بردووە وە هەیانە هەتا هەردوو ئەژنۆی، پاشان دەڵێن: پەروەردگارمان هیچ کەسێکی تێدا نەماوە لەوانەی کە تۆ فەرمانت پێ کردین، پاشان دەفەرموێت:بگەڕێنەوە ،هەر کەسێکتان بینی هێندەی میسقاڵە دینارێك لە خێر لە دڵیدا بوو ئەوا دەری بهێنن، ئیتر خەڵکێکی زۆری تر دەهێننە دەرەوە، پاشان دەڵێن: پەروەرگامان هیچ کەسێکمان تێدا نەهێشت لەوەی کە تۆ فەرمانت پێ کردبووین، پاشان دەفەرموێت: بگەڕێنەوە، هەر کەسێکتان بینی هێندەی مسقاڵی نیو دینار لە خێر لە دڵیدا بوو ئەوا دەری بهێنن ئینجا خەڵکێکی زۆر دەهێننە دەرەوە پاشان دەڵێن: پەروەردگارمان، هیچ کەسێکمان تێدا نەهێشت لەوانەی کە تۆ فەرمانت پێ کردبووین، پاشان دەفەرموێت: بگەڕێنەوە هەر کەسێکتان بینی کە هێندەی تۆزقاڵە زەڕەیەك لە خێر لە دڵیدا بوو ئەوا دەری بهێنن، ئینجا خەڵکێکی زۆری تر دەهێننە دەرەوە ،پاشان دەڵێن: ئەی پەروەردگامان ئەوەی خێر بێت تیاماندا نەهێشت )، جا ابو سعید الخدري دەیووت:ئەگەر باوەڕم پێ ناکەن بەم فەرموودەیە ئەوا ئەگەر حەز دەکەن ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾النساء /٤٠ ، واتە: خوا هێندەی تۆزقاڵە زەڕەیەك زوڵم ناکات، وە ئەگەر چاکەیەك هەبێت ئەوا چەند هێندەی دەکات و لای خۆی پاداشتی

گەورەی لەسەر دەداتەوە -. ( ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێت:ئەوا فریشتەکان شەفاعەتیان کرد و پێغەمبەران شەفاعەتیان کرد و بڕوادارانیش شەفاعەتیان کرد ،وە کەس نەما جگە بەڕەحم ترینی بەڕەحمەکان نەبێت. ئینجا مشتێك لە ئاگر دەگرێت و کۆمەڵێکی لێ دێنێتە دەرەوە کە هەرگیز خێر و چاکەیان نەکردووە، هەموویان بوونەتە خەڵوز، ئینجا فڕێیان دەداتە رووباریکەوە لە دامێنی بەهەشت. پێی دەوترێت رووباری ژیان، ئینجا دەڕوێن و دێنە دەرەوە، هەر وەك چۆن دەنکە تۆوێك کە لافاو هەڵی دەگرێت و دەیهێنێت ئاوا دێتە دەرەوە، نابیینن کە دەکەوێتە پاڵ بەردێك یان دارێك، جا ئەو لایەی رووی لە خۆرەکەیە مەیلەو زەرد و مەیلەو سەوز دەبێت، ئەو لایەشی کە رووی لە سێبەرەکەیە سپی دەبێت؟)وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ هەر دەڵێیت لەو بیابانە شوانیت کردووە !!فەرمووی:(ئیتر وەك مرواری دێنە دەرەوە و گەردنیان مۆری پێوەیە، خەڵکی بەهەشت دەیان ناسن، ئەوانە ئازاد کراوەکانی خوان، کە خوا خستوونیەتیە بەهەشتەوە، بە بێ هیچ کارێك کە کردبێتیان و بە بێ هیچ خێر و چاکەیەك کە پێش خۆیان دابێت، پاشان دەفەرمووێت:بچنە بەهەشتەوە هەر چییەکتان بینی ئەوە بۆ خۆتان. ئەوانیش دەڵێن:پەروەردگارمان ئەوەندەت پێداین کە بە هیچ یەکێکت لە جیهاندا نەدارە، ئەویش دەفەرمووێت:لەوەش باشترم لای خۆم بۆ داناون. ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان جا چ شتێك لەمە باشترە؟ ئەویش دەفەرمووێت:رەزامەندی خۆم، ئیتر لە دوای ئەمە هەرگیز لێتان نارەحەت و توڕە نابم ).

**(١٢٦٤) ( م ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ فِي الظَّهِيرَةِ لَيْسَتْ فِي سَحَابَةٍ؟ قَالُوا: لا، قَالَ: هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ فِي سَحَابَةٍ؟ قَالُوا: لا، قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ عَزَّوَجَلَّ إِلاَّ كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا، قَالَ: فَيَلْقَى الْعَبْدَ فَيَقُولُ: أَيْ فُلْ أَلَمْ أُكْرِمْكَ، وَ أُسَوِّدْكَ، وَ أُزَوِّجْكَ، وَ أُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَ الإِبِلَ، وَ أَذَرْكَ تَرْأَسُ وَ تَرْبَعُ؟ فَيَقُولُ: بَلَى، قَالَ فَيَقُولُ: أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلاقِيَّ؟ فَيَقُولُ: لا، فَيَقُولُ: فَإِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي، ثُمَّ يَلْقَى الثَّانِي فَيَقُولُ لَهُ: أَيْ فُلْ؟ أَلَمْ أُكْرِمْكَ وَ أُسَوِّدْكَ وَ أُزَوِّجْكَ وَ أُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَ الإِبِلَ، وَ أَذَرْكَ تَرْأَس وَ تَرْبَعُ؟ فَيَقُولُ: بَلَى أَيْ رَبِّ فَيَقُولُ: أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلاقِيَّ؟ فَيَقُولُ: لا، فَيَقُولُ: إِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي، ثُمَّ يَلْقَى الثَّالِثَ فَيَقُولُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَيَقُولُ: رَبِّ آمَنْتُ بِكَ وَ بِكِتَابِكَ وَ بِرُسُلِكَ وَ صَلَّيْتُ وَ صُمْتُ وَ تَصَدَّقْتُ وَ يُثْنِي بِخَيْرٍ مَا اسْتَطَاعَ، فَيَقُولُ: هَهُنَا إِذاً، قَالَ ثُمَّ يُقَالُ: الآنَ نَبْعَثُ شَاهِدَنَا عَلَيْكَ، وَ يَتَفَكَّرُ فِي نَفْسِهِ: مَنْ ذَا الَّذِي يَشْهَدُ عَلَيَّ؟ فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ وَ يُقَالُ لِفَخِذِهِ وَلَحْمِهِ وَعِظَامِهِ: انْطِقِي فَتَنْطِقُ فَخِذُهُ وَ لَحْمُهُ وَ عِظَامُهُ بِعَمَلِهِ وَ ذَلِكَ لِيُعْذِرَ مِنْ نَفْسِهِ ، وَ ذَلِكَ الْمُنَافِقُ الَّذِي يَسْخَطُ اللَّهُ عَلَيْهِ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (٧٠٣١) في صحيح الجامع**

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئایا هیچ گومان و ڕێگرێکتان لە بینینی خۆردا هەیە لە نیوەڕۆ دا کە هەور نەبێت؟ )، وتیان: نەخێر. فەرمووی: ( ئەی هیچ گومان و ڕێگرێکتان لە بینینی مانگ هەیە لە شەوی چواردەدا کە هەور نەبێت؟ )، وتیان: نەخێر. فەرمووی: ( دەی سوێند بێت بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، چەند گومان و ریگرتان لە بینینی ئەو دوانەدا هەیە، هەر ئەوەندەش گومان و

ڕێگرتان لە بینینی خوادا دەبێت )، فەرمووی: ( ئینجا کە بە بەندەکەی دەگات پێی دەفەرموویێت: ئەی فلان: ئایا من ڕێزم لێ نەگرتیت و پایەدارم نەکردیت و خێزاندارم نەکردیت و ئەسپ و وشترم بۆ دەستە مۆ نەکردیت و وام لێ نەکردیت ببیتە سەروەر و سەردار؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ )، فەرمووی: ( ئینجا ئەویش دەفەرموویێت: جا ئایا دڵنیا بوویت لەوەی کە دێیتەوە لام و پێم دەگەیتەوە؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر. ئەویش پێی دەفەرمویێت: دەی تۆ چۆن منت لە یاد نەبوو منیش ئاوا تۆ لە بیر دەکەم، ئینجا بە یەکێکی تر دەگات و پێی دەفەرموویێت:ئەی فلان ئەرێ ڕێزم لێ نەگرتیت و پایەدارم نەکردیت، و خێزاندارم نەکردیت وئەسپ و وشترم بۆ دەستەمۆ نەکردیت و وام لێ نەکردیت کە ببیتە سەروەر و سەردار؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، ئەویش دەفەرموویێت: دەی ئایا دڵنیا بوویت لەوەی کە دەگەڕێیتەوە لام و پێم دەگەیتەوە ؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر. ئەویش دەفەرموویێت:دەی تۆ چۆن منت لە بیر کرد منیش ئاوا تۆ لە بیر دەکەم، پاشان بە سێهەم دەگات و هەمان شتی پێ دەفەرموویێت، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگار باوەڕم هێناوە بە خۆت و کیتابەکەت و پێغەمبەرەکانت و نوێژم کرد و بەڕۆژو بووم و خێر و سەدەقەم کرد و، ئیتر ئەوەندەی لە توانایدا بێت باسی چاکەی خۆی دەکات، ئەویش پێی دەفەرموویێت: کەواتە ئالێرەدا)فەرمووی:(ئینجا پێی دەوترێت: ئێستا شایەتێکت لەسەر زیندوو دەکەینەوە، ئەویش لە دڵی خۆیدا بیر دەکاتەوە، ئەبێ کێ بێت ئەوەی کە شایەتیم لەسەر بدات؟ ئینجا مۆر لە دەمی دەدرێت، بە ڕانی و گۆشتی و ئێسکی دەوترێت قسە بکە. ئینجا ڕانی و گۆشتی و ئێسکی قسە دەکەن کە چ کارێکی کردووە، ئەوەیش بۆ ئەوەیە کە هیچ پاساوێك لە نەفسی خۆی نەمێنێت، جا ئەوە موناڧقی و دوو ڕووە، وە ئەوە ئەو کەسەیە کە خوا لێی دەڕەنجێت و غەزەبی لێ دەگرێت ).

## ( ٢٠ ) ( ڕەزامەندی خوای گەورە )

(١٢٦٥) ( ك ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إذا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ يَقُولُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئاً فَأَزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا وَمَا فَوْقَ مَا أَعْطَيْتَنَا؟ فَيَقُولُ: رِضْوانِي أَكْبَرُ ﴾.

( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٥٢٤ ) في صحيح الجامع

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( کاتێك کە خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ئایا حەزتان لە چ شتێك هەیە کە بۆتانی زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن: پەروەردگارمان جا چی تر هەیە لە سەروو ئەوەی کە پێت داوین؟ ئەویش دەفەرموویێت: ڕەزامەندی من گەورە ترە ).

## ( ٢١ ) ( شوێن و پله و پایەی خەڵکی بەهەشت )

(١٢٦٦) ( ن حب ك ) عن فضالة بن عبيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ أَنَا زَعِيمٌ لِمَنْ آمَنَ بِي وَ أَسْلَمَ وَ هَاجَرَ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ وَ بَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ وَ بَيْتٍ فِي أَعْلَى غُرَفِ الْجَنَّةِ، وَ أَنَا زَعِيمٌ لِمَنْ آمَنَ بِي وَ أَسْلَمَ وَ جَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللهِ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ وَ بَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ وَ بَيْتٍ فِي أَعْلَى غُرَفِ الْجَنَّةِ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ لَمْ يَدَعْ لِلْخَيْرِ مَطْلَبًا وَلا مِنَ الشَّرِّ مَهْرَبًا يَمُوتُ حَيْثُ شَاءَ أَنْ يَمُوتَ ﴾.

( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٤٦٥ ) في صحيح الجامع

فضالة ی کوڕی عبيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من بەڵێن دەدەم بۆ هەموو کەسێك کە باوەڕی پێم هێنابێت و موسڵمان بووبێت و کۆچی کردبێت ،بە خانوو و ماڵێك لە دامێنی بەهەشتدا. وە بە خانوو ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشتدا، وە بە خانوو ماڵێك لە بەرزترین ژوورەکانی بەهەشتدا، وە من بەڵێن دەدەم بۆ هەر کەسێك کە باوەڕی پێم هێنابێت و موسڵمان بووبێت و لە پێناوی خودا جیهادی کردبێت بە خانوو ماڵێك لە دامێنی بەهەشتدا، وە بە خانوو ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشتدا، وە بە خانوو ماڵێك لە بەرزترین ژوورەکانی بەهەشتدا، جا هەر کەسێك ئەوەی کرد ئەوا هیچ ڕێگەیەك نەماوە بۆ خێر و چاکە نەیگرتبێتە بەر، وە هیچ ڕێگەیەکیش نەماوە بۆ هەڵهاتن لە خراپە نەیگرێتە بەر، با بمرێت لە هەر شوێنێك کە خۆی حەز دەکات بمرێت ).

## ( ٢٢ ) ( ئەو کەسەی لە دوای هەموو خەڵکەوە دەچێتە بەهەشت )

(١٢٦٧) ( حم م ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً رَجُلٌ صَرَفَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ قِبَلَ الْجَنَّةِ وَ مَثَّلَ لَهُ شَجَرَةً ذَاتَ ظِلٍّ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ قَدِّمْنِي إِلَى هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَأَكُونَ فِي ظِلِّهَا، فَقَالَ اللهُ: هَلْ عَسَيْتَ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ؟ قَالَ: لا وَ عِزَّتِكَ، فَقَدَّمَهُ اللهُ إِلَيْهَا وَ مَثَّلَ لَهُ شَجَرَةً ذَاتَ ظِلٍّ وَ ثَمَرٍ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ قَدِّمْنِي إِلَى هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَأَكُونَ فِي ظِلِّهَا وَ آكُلَ مِنْ ثَمَرِهَا، فَقَالَ اللهُ: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ أَعْطَيْتُكَ ذَلِكَ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لا وَ عِزَّتِكَ، فَيُقَدِّمُهُ اللهُ إِلَيْهَا فَيُمَثِّلَ اللهُ لَهُ شَجَرَةً أُخْرَى ذَاتَ ظِلٍّ وَ ثَمَرٍ وَ مَاءٍ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ قَدِّمْنِي إِلَى هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَأَكُونَ فِي ظِلِّهَا وَ آكُلَ مِنْ ثَمَرِهَا وَ أَشْرَبَ مِنْ مَائِهَا، فَيَقُولُ لَهُ: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فَعَلْتُ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ؟ فَيَقُولُ: لا وَ عِزَّتِكَ لا أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، فَيُقَدِّمُهُ اللهُ إِلَيْهَا فَيَبْرُزُ لَهُ بَابُ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ قَدِّمْنِي إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَأَكُونَ تَحْتَ سِجَافِ الْجَنَّةِ فَأَرَى أَهْلَهَا، فَيُقَدِّمُهُ اللهُ إِلَيْهَا فَيَرَى الْجَنَّةَ وَ مَا فِيهَا، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ فَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ فَإِذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، قَالَ: هَذَا لِي؟ فَيَقُولُ اللهُ لَهُ: تَمَنَّ ،فَيَتَمَنَّى وَ يُذَكِّرُهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ : سَلْ مِنْ كَذَا وَ كَذَا، حَتَّى إِذَا انْقَطَعَتْ بِهِ الأَمَانِيُّ قَالَ اللهُ: هُوَ لَكَ وَ عَشَرَةُ أَمْثَالِهِ ثُمَّ يُدْخِلُهُ اللهُ الْجَنَّةَ فَيَدْخُلُ عَلَيْهِ زَوْجَتَاهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ فَيَقُولانِ: الْحَمْدُ للهِ

الَّذِي أَحْيَاكَ لَنَا وَ أَحْيَانَا لَكَ فَيَقُولُ: مَا أُعْطِيَ أَحَدٌ مِثْلَ مَا أُعْطِيتُ ، وَ أَدْنَى أَهْلُ النَّارِ عَذَاباً يُنَعَّلُ مِنْ نَارٍ بِنَعْلَيْنِ يَغْلِي دَمَاغُهُ مِنْ حَرَارَةِ نَعْلَيْهِ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٥٥٧ ) في صحيح الجامع

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( نزمترین خەڵکی بەهەشت لە پلەدا پیاوێکە خوای گەورە رووی ئەو پیاوەی لە ئاگر وەرگێراوە بەرەو بەهەشت و دارێکی سێبەری دەخاتە بەر چاو، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بمبە لای ئەو دارە با بچمە ژێر سێبەرەکەی، خوایش پێی دەفەرمووێت:ئەی ئیتر جگە لەوە داوای شتی ترم لێناکەیت؟ دەڵێ: نە سوێند بە عزەتی تۆ ئینجا خوا دەیخاتە ئەوێ. ئەم جارە دارێکی سێبەردارو بەرداری دێنێتە بەر چاو، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بمبە لای ئەو دارە، هەتا لە سێبەرەکەیدا بم و لە بەرەکەیشی بخۆم ،خوایش دەفەرمووێت:جا کێ دەڵێ ئەگەر ئەوەیشم پێ دایت ئیتر داوای هیچی تر ناکەیت؟ ئەویش دەڵێ: نە سوێند بە عزەتی تۆ. خوایش دەیباتە ئەوێ، ئینجا دارێکی تری دێتە بەر چاو کە سێبەردار و بەردار و ئاویشی هەیە، ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگار بمبە لای ئەو دارە هەتا لە سێبەرەکەیدا بم و لە بەرەکەی بخۆم و و لە ئاوەکەیشی بخۆمەوە، ئەویش پێی دەفەرمووێت: جا کێ دەڵێ ئەگەر ئەوەیشم بۆ کردیت داوای شتی ترم لێ ناکەیت؟ئەویش دەڵێ نە بە عزەتی تۆ داوای هیچ شتێکی ترت لێ ناکەم. خوای گەورەش دەیباتە ئەوێش. ئینجا دەرگای بەهەشتی لێ دەردەکەوێت و دەڵێ ئەی پەروەردگارم بمبە لای دەرگای بەهەشت هەتا لە ژێر درزە پەردەی بەهەشتەوە بم و خەڵکەکەی ببینم، خوای گەورەش دەیباتە ئەوێ، ئینجا بەهەشت و ئەوەیشی کە تیایدایە دەیبینێت. ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەدگارم بمخەرە بەهەشتەوە. ئەویش دەیخاتە بەهەشتەوە.جا کاتێك کە چووە بەهەشتەوە دەڵێ: ئەوە بۆ من ؟خوای گەورەش پێی دەفەرمووێت:ئاوات بخوازە، ئەویش دەست دەکات بە حەز و ئاوات خواستن، وە خوای گەورەش خۆی بیری هەندێك شتی دەخاتەوە و دەفەرمووێت:داوای ئەوە و ئەوەیش بکە، هەتا وای لێ دێت کە هەموو هیوا و ئاواتەکانی دەڵێ و تەواو دەبێت ،خوای گەورە دەفەرمووێت:ئەوەندە بۆ تۆ وە دە هێندەی ئەوەیشی کە داوات کردووە، پاشان خوا دەیخاتە بەهەشتەوە، ئینجا دوو خێزانەکەی لە حۆری عەین دەکاتە ژوورەوە بۆ لای و دەڵێن:سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی زیندوو کردەوە بۆ ئێمە و ئێمەیشی زیندوو کردەوە بۆ تۆ. ئەویش دەڵێ: هیچ کەسێك هێندەی نەدراوەتی کە بە من دراوە . وە کەمترین خەڵکی ئاگریش لە ئەشکەنجەدا دوو نەعلی ئاگری لە پێ دەکرێت مێشکی دێتە کوڵ لەگەرمی دوو نەعلەکەی ).

## ( ٢٣ ) ( خەڵکی بەهەشت و خەڵکی ئاگر )

(١٢٦٨) ( حم ك ) عن عبدالرحمن بن قتادة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ ثُمَّ أَخَذَ الْخَلْقَ مِنْ ظَهْرِهِ فَقَالَ: هَؤُلاءِ فِي الْجَنَّةِ وَلا أُبَالِي وَ هَؤُلاءِ فِي النَّارِ وَلا أُبَالِي ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٧٥٨ ) في صحيح الجامع

عبدالرحمان كوڕی قتادة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوا ئادەمی دروست كردووە و پاشان ئەو خەڵكەی لە پشتی دەرهێناوە و فەرمووی: ئەوانە بۆ بەهەشت و هیچ باكم لێی نییە، وە ئەوانەش بۆ ئاگر و هیچ باكم لێی نییە ).

**(١٢٦٩) ( م ) عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىٰ خَلَقَ الْجَنَّةَ وَ خَلَقَ النَّارَ فَخَلَقَ لِهَذِهِ أَهْلاً، وَ لِهَذِهِ أَهْلاً ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٦٠) في صحيح الجامع**

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە بەهەشتی دروست كردووە و ئاگریشی دروست كردووە، وە بۆ ئەمیان خەڵكێكی دروست كردووە وە بۆ ئەویشیان خەڵكێك ).

**(١٢٧٠) ( حم ت ك ) عن ابن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىٰ خَلَقَ خَلْقَهُ فِي ظُلْمَةٍ، فَأَلْقىٰ عَلَيْهِمْ مِنْ نُورِه، فَمَنْ أَصَابَهُ مِنْ ذَلِكَ النُّورِ اهْتَدىٰ، وَ مَنْ أَخْطَأَهُ ضَلَّ ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٦٤) في صحيح الجامع**

إبن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە دروست كراوەكانی خۆی دروست كردووە لە تاریكاییەكدا، جا لە نورەكەی خۆی داوە بە سەریاندا، جا هەر كەسێك لەو نوورەی بەر كەوتبێت ئەوا ڕێنومایی كراوە، ئەوەیش كە بەری نەكەوتبێت ئەوا گومڕا بووە ).

**(١٢٧١) ( ع ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ قَبَضَ قَبْضَةً فَقَالَ: هَذِهِ إِلىَ الْجَنَّةِ بِرَحْمَتِي وَ قَبَضَ قَبْضَةً فَقَالَ: هَذِهِ إِلىَ النَّارِ وَلا أُبَالِي ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٧٨٤) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە مشتێكی گرتووە و فەرموویەتی: ئەمە بۆ بەهەشت بە ڕەحمەتی خۆم، وە مشتێكی گرتووە و فەرموویەتی: ئەمەش بۆ ئاگر و باكم لێی نییە ).

## ( ٢٤ ) ( ڕەزامەندی خوای گەورە لە خەڵكی بەهەشت )

**(١٢٧٢) ( حم ق ت ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنَّ اللهَ تَعالىٰ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَ سَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لانَرْضىَ وَ قَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، فَيَقُولُونَ: يَا رَبِّ وَ أَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوانِي فَلا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ أَبَداً ﴾. و اللفظ للترمذي. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٩١١) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە بە خەڵكی بەهەشت دەفەرموێت:ئەی خەڵكی بەهەشت. ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، خزمەتكار و گوێڕایەڵی فەرمانتین ئەی پەروەردگار. ئەویش دەفەرموێت:ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی جا بۆ ڕازی نابین كە هێندەت پێ داوین كە بە هیچ یەكێك لە دروست كراوەكانی خۆتت نەداوە. ئەویش دەفەرموێت: من لەوەیش باشترتان دەدەمێ.

وتیان: جا چ شتێك لەوە باشترە؟ فەرمووی:ڕەزامەندی خۆمتان پێ ڕەوا دەبینم ئیتر هەرگیز جارێکی تر لێتان ناڕەنجێم و توڕە نابم ).

## ( ٢٥ ) ( هەندێك لەو کەسانەی لە ئاگر دەهێنرێنە دەرەوە و دەوخرێنە بەهەشتەوە )

**(١٢٧٣) ( حم ق ) عن جابر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُخرِجُ الله قَوْماً مِنْ أهْلِ النّارِ فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٤٧ ) في صحيح الجامع**

جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە کۆمەڵێك لە خەڵکی ئاگر دەهێنێتە دەرەوە و دەیانخاتە بەهەشتەوە ).

**(١٢٧٤) ( م ) عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَخرُجُ مِنَ النّارِ أرْبَعَةٌ فَيُعْرَضُونَ عَلىَ الله، فَيَلْتَفِتُ أحَدُهُمْ فَيَقُولُ: أيْ رَبِّ إذا أخْرَجْتَنِي مِنْهَا فَلا تُعِدْنِي فِيْهَا، فَيُنْجِيْهِ الله مِنْها ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٥٢ ) في صحيح الجامع**

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( چوار کەس لە ئاگر دەهێنرێنە دەرەوە و دەهێنرێنە لای خوای گەورە، ئینجا یەکێکیان ئاوڕ دەداتەوە و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم وەك هێناوتمە دەرەوە لێی ئیتر مەمگێڕەرەوە ناوی. ئیتر خوای گەورەش ڕزگاری دەکات لێی ).

**(١٢٧٥) ( ق ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يَدْخُلُ أهْلُ الْجَنَةِ الْجَنَةَ و أهْلُ النّارِ النّارَ ثُمَّ يَقُولُ الله عَزَّوَجَلَ: أخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِه مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إيْمَانٍ فَيُخْرُجُونَ مِنْهَا قَدْ اسْوَدُوا، فَيُلْقَونَ فِي نَهْرِ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحَبَةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ،ألَمْ تَرَ أنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءُ مُلتَوِيَة ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٦٦ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە و خەڵکی ئاگر دەچنە ئاگرەوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:هەر کەس هێندەی دەنکە خەرتەلەیەك لە باوەڕ لە دڵیدا هەبووە بیهێننە دەرەوە، ئینجا دەهێنرێنە دەرەوە لێی و هەموویان ڕەش بوون، ئینجا دەخرێنە ناو ڕووباری ژیانەوە، ئینجا دەڕوێنەوە هەر وەك چۆن تۆو لە لێواری لافاودا دەڕوێت، ئەوە نییە کە دەیبینن دێتە دەرەوە زەردە و لولی خواردووە ).

**(١٢٧٦) ( عبد بن حميد ) عن أبي سعيد قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ إنّ الله يُخْرِجُ أقْواماً مِنَ النّارِ بَعْدَما لا يَبْقَى مِنْهُمْ فِيْهَا إلاَّ الْوُجُوهُ فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ١٨٩٣ ) في صحيح الجامع**

ابو سعيد دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە کۆمەڵێك لە ئاگر دەهێنێتە دەرەوە پاش ئەوەی کە هیچ شوێنێکیان نەماوە تیایدا جگە لە دەم و چاویان نەبێت، ئینجا دەیانخاتە بەهەشتەوە ).

## ( ٢٦ ) ( كۆتـایین كەسی خەڵكی ئاگر كە لێی دێتە دەر )

(١٢٧٧) ( حم ق ت هـ ) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجاً مِنْهَا، وَ آخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حَبْواً فَيَقُولُ اللهُ لَهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى، فَيَقُولُ اللهُ لَهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَ عَشَرَةَ أَمْثَالِهَا،أَوْ إِنَّ لَكَ عَشَرَةَ أَمْثَالِ الدُّنْيَا، قَالَ فَيَقُولُ: أَتَسْخَرُ بِي وَ أَنْتَ الْمَلِكُ؟** ﴾. و اللفظ لمسلم. (صحيح) أنظر حيث رقم (٢٤٨٢) في صحيح الجامع

ابن مسعود دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من باش دەزانم كۆتایین خەڵكی ئاگر كە لێی دێتە دەر، وە كۆتایین خەڵكی بەهەشت كە تێی دەچێت. پیاوێكە لە ئاگر دەهێنرێتە دەرەوە بە چنگە خشكێ. خوای تەبارەك و تەعالاش پێی دەفەرمووێت: برۆ بچۆرە بەهەشتەوە. ئەویش دێتە لای بە خەیاڵی خۆی وادەزانێت كە پڕ بووە، ئینجا دەگەڕێتەوە و دەڵێ:ئەی پەروەردگارم بینیم پڕ بووە. خوای تەبارەك و تەعالاش پێی دەفەرمووێت: برۆ بچۆرە ناو بەهەشتەوە، دەڵێ: ئینجا دێتەوە لای و بە خەیاڵی خۆی وا تێدەگات كە پڕ بووە، ئینجا دەگەڕێتەوە و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بینیم پڕ بووە.خوای گەورەش پێی دەفەرمووێت: ( برۆ بچۆرە بەهەشتەوە، ئەوا ئەوەندەی دونیا و دە هێندەی بەرامبەریشی بۆ تۆیە ). یان ( ئەوا دە هێندەی دونیا بۆ تۆیە )، فەرمووی: ( ئەوە گاڵتەم پێ دەكەیت؟ تۆ هەر خۆت پادشایت ).

## ( ٢٧ ) ( سەرزەنشتی خوای گەورە بۆ خەڵكی ئاگر )

(١٢٧٨) ( ق ) عن أنس قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿ **يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: لأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً: لَوْ كَانَتْ لَكَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، أَكُنْتَ مُفْتَدِياً بِهَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ.فَيَقُولُ: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ: أَنْ لا تُشْرِكَ وَلا أُدْخِلَكَ النَّارَ فَأَبَيْتَ إِلاَّ الشِّرْكَ!** ﴾. (صحيح) أنظر حيث رقم (١٩١٢) في صحيح الجامع

انس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( خوای تەبارەك و تەعالا بە كەمترین ئەشكەنجە دراوی خەڵكی ئاگر دەفەرمووێت: ئەگەر دونیا و هەر چیەكی تێدا بوایە هی تۆ بوایە، ئایا دەتكردە قوربانی خۆت؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ .ئەویش پێی دەفەرمووێت: دەی من زۆر لەوە كەمترم لێ داوا كردیت كە هێشتا تۆ لە پشتی ئادەمدا بوویت، كە شەریكم بۆ بڕیار نەدەیت و منیش نەتخەمە ئاگرەوە. بەڵام تۆ هەر رازی نەبوویت تەنها بەوە نەبێت كە شەریكم بۆ بڕیار بدەیت ).

## ( ٢٨ ) ( خەڵكی ئاگر كێن )

(١٢٧٩) ( **طب** ) عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **ألا أُخْبِرُكَ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ جعظَرِي جوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ جماعٍ منوعٍ، ألا أخبِرُكَ بِأهْلِ الجَنَّةِ؟ كُلُّ مِسكِينٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلىَ الله تَعالىَ لأبَرَّهُ** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٥٨٧ ) في صحيح الجامع

ابو الدرداء دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئایا پێت نەڵێم كێن خەڵكی ئاگر؟ هەموو خۆ بە زلزانێكی ستەمكاری لووت بەرزی ماڵ كۆكەرەوەی دەست نوقاوە. ئەی پێت نەڵێم كێن خەڵكی بەهەشت؟ هەموو نەدارێكی بێ دەسەلات، ئەگەر سوێند لەسەر خوای گەورە بخوات ئەوا بێ دڵی ناكات و هەرچی بوێت دەیداتێ ).

## ( ٢٩ ) ( گفت و گۆی بەهەشت و ئاگر )

( ١٢٨٠ ) ( **حم ق** ) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ **تَحَاجَّتِ النَّارُ وَ الجَنَّةُ فَقَالَتِ النَّارُ: أوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِيْنَ وَ الْمُتَجَبِّرِيْنَ، وَ قَالَتِ الجَنَّةُ: فَمالي لا يَدْخُلُني إلاَّ ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَ سَقَطُهُمْ وَ عَجزُهُمْ، فَقَالَ الله عَزَّوَجَلَّ لِلجَنَّةِ: إنَّما أنْتَ رَحْمَتي أرْحَمُ بِكَ مَنْ أشاءَ مِنْ عِبادي، وَ قَالَ للنَّارِ: إنَّما أنْتَ عَذابِي أُعَذِّبُ بِكَ مَنْ أشاءَ مِنْ عِبادي وَ لِكُلِّ واحِدَةٍ مِنْكُما مِلْؤُها، فَأَمَّا النَّارُ فَلا تَمْتَلئُ، فَيَضَعُ الله قَدَمَهُ عَلَيْهَا فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلئُ وَ تُنْزَوِي بَعْضُهَا إِلىَ بَعْضٍ، فَلا يَظْلِمُ الله مِنْ خَلْقِه أحَداً ، وَ أَمَّا الجَنَّةَ فَإِنَّ الله يُنْشئُ لَهَا خَلْقاً** ﴾. ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٢٩١٦ ) في صحيح الجامع

ابو هريرة دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئاگر و بەهەشت گفت و گۆیان كرد، و ئاگر وتی: من تایبەت كراوم بە لووت بەرز و زۆر دارەكان، وە بەهەشت وتی: ئەی بۆ من جگە لە لاوازەكانی خەڵك و كەوتەو بێ دەسەلاتەكانیان نەبێت كەسی ترم نایەتە ناو، ئینجا خوایش بە بەهەشتی فەرموو: تۆ رەحمەتی منی. بە تۆ رەحم دەكەم بە هەر كەسێك كە بمەوێت لە بەندەكانم، وە بە ئاگریشی فەرموو: تۆ ئەشكەنجەی منی، بە تۆ ئەشكەنجەی هەر كەسێك دەدەم كە بمەوێت لە بەندەكانم، وە بۆ هەر یەكەیشتان پڕ كردنی لەسەر منە. جا ئاگرەكە ئەوە هەر پڕ نابێت هەتا خوا خۆی پێی خۆی دەخاتە سەری و ئینجا دەڵێ: قط ..قط، ئینجا لەوێدا پڕ دەبێت، وە لەسەر یەكتر دەنیشێت، وە خوا زوڵم لە یەك كەس ناكات لە دروست كراوەكانی، ئەمما بەهەشت ئەوا خوای گەورە خەڵكانێكی تری بۆ دادەمەزرێنێت هەتا پڕی بكاتەوە ).

## ( ٣٠ ) ( چەند وێنەیەك لە ئەشكەنجەی دۆزەخ خوا پەنامان بدات )

( ١٢٨١ ) ( حم ق ) عن سمرة بن جندب – رضي الله عنه – قال: كَانَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) مِمَّا يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ لأصْحَابِهِ: ﴿ هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْ رُؤْيَا؟﴾. قَالَ : فَيَقُصُّ عَلَيْهِ مَنْ شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُصَّ، وَإِنَّهُ قَالَ ذَاتَ غَدَاةٍ : ﴿إِنَّهُ أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ، وَ إِنَّهُمَا ابْتَعَثَانِي، وَإِنَّهُمَا قَالا لِي انْطَلِقْ، وَإِنِّي انْطَلَقْتُ مَعَهُمَا، وَ إِنَّا أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ، وَ إِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِصَخْرَةٍ، وَإِذَا هُوَ يَهْوِي بِالصَّخْرَةِ لِرَأْسِهِ، فَيَثْلَغُ رَأْسَهُ فَيَتَهَدْهَدُ الْحَجَرُ هَاهُنَا، فَيَتْبَعُ الْحَجَرَ فَيَأْخُذُهُ، فَلا يَرْجِعُ إِلَيْهِ حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كَمَا كَانَ، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ الْمَرَّةَ الأُولَى. قَالَ قُلْتُ لَهُمَا سُبْحَانَ اللهِ مَا هَذَانِ. قَالَ: قَالا انْطَلِقْ – قَالَ – فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُسْتَلْقٍ لِقَفَاهُ، وَ إِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِكَلُّوبٍ مِنْ حَدِيدٍ، وَ إِذَا هُوَ يَأْتِي أَحَدَ شِقَّيْ وَجْهِهِ فَيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إِلَى قَفَاهُ، وَ مَنْخِرَهُ إِلَى قَفَاهُ وَعَيْنَيْهِ إِلَى قَفَاهُ ﴾– قَالَ وَرُبَّمَا قَالَ أبو رجاء فَيَشُقُّ – قَالَ:﴿ ثُمَّ يَتَحَوَّلُ إِلَى الْجَانِبِ الآخَرِ، فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ بِالْجَانِبِ الأَوَّلِ، فَمَا يَفْرُغُ مِنْ ذَلِكَ الْجَانِبِ حَتَّى يَصِحَّ ذَلِكَ الْجَانِبُ كَمَا كَانَ، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ مِثْلَ مَا فَعَلَ الْمَرَّةَ الأُولَى. قَالَ: قُلْتُ سُبْحَانَ اللهِ مَا هَذَانِ قَالَ: قَالا لِي انْطَلِقْ. فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى مِثْلِ التَّنُّورِ﴾ قَالَ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ :﴿ فَإِذَا فِيهِ لَغَطٌ وَ أَصْوَاتٌ – قَالَ – فَاطَّلَعْنَا فِيهِ فَإِذَا فِيهِ رِجَالٌ وَ نِسَاءٌ عُرَاةٌ، وَ إِذَا هُمْ يَأْتِيهِمْ لَهَبٌ مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ، فَإِذَاأَتَاهُمْ ذَلِكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوْا – قَالَ – قُلْتُ لَهُمَا مَا هَؤُلاءِ قَالَ : قَالا لِي انْطَلِقْ انْطَلِقْ، قَالَ فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ﴾ حسبت أنه كان يقول :﴿أَحْمَرَ مِثْلِ الدَّمِ، وَ إِذَا فِي النَّهَرِ رَجُلٌ سَابِحٌ يَسْبَحُ، وَ إِذَا عَلَى شَطِّ النَّهَرِ رَجُلٌ قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ حِجَارَةً كَثِيرَةً، وَ إِذَا ذَلِكَ السَّابِحُ يَسْبَحُ مَا يَسْبَحُ، ثُمَّ يَأْتِي ذَلِكَ الَّذِي قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ الْحِجَارَةَ فَيَفْغَرُ لَهُ فَاهُ فَيُلْقِمُهُ حَجَراً فَيَنْطَلِقُ يَسْبَحُ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَيْهِ، كُلَّمَا رَجَعَ إِلَيْهِ فَغَرَ لَهُ فَاهُ فَأَلْقَمَهُ حَجَراً – قَالَ – قُلْتُ لَهُمَا مَا هَذَانِ قَالَ قَالا لِي انْطَلِقْ انْطَلِقْ، قَالَ فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ كَرِيهِ الْمَرْآةِ كَأَكْرَهِ مَا أَنْتَ رَاءٍ رَجُلاً مَرْآةً، وَ إِذَا عِنْدَهُ نَاراً يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا – قَالَ – قُلْتُ لَهُمَا مَا هَذَا قَالَ قَالا لِي انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَوْضَةٍ مُعْتَمَّةٍ فِيهَا مِنْ كُلِّ نُورِ الرَّبِيعِ، وَ إِذَا بَيْنَ ظَهْرَيِ الرَّوْضَةِ رَجُلٌ طَوِيلٌ لا أَكَادُ أَرَى رَأْسَهُ طُولاً فِي السَّمَاءِ وَ إِذَا حَوْلَ الرَّجُلِ مِنْ أَكْثَرِ وِلْدَانٍ رَأَيْتُهُمْ قَطُّ – قَالَ - قُلْتُ لَهُمَا مَا هَذَا مَاهَؤُلاءِ قَالَ قَالا لِي انْطَلِقْ انْطَلِقْ، - قَال - فَانْطَلَقْنَا فَانْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ عَظِيمَةٍ لَمْ أَرَ رَوْضَةً قَطُّ أَعْظَمَ مِنْهَا وَلا أَحْسَنَ، - قَالَ – قَالا لِي ارْقَ فِيهَا، قَالَ فَارْتَقَيْنَا فِيهَا فَانْتَهَيْنَا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ، فَأَتَيْنَا بَابَ الْمَدِينَةِ فَاسْتَفْتَحْنَا فَفُتِحَ لَنَا، فَدَخَلْنَاهَا فَتَلَقَّانَا فِيهَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ، وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ – قَالَ- قَالا لَهُمْ اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهَرِ، قَالَ وَإِذَا نَهَرٌ مُعْتَرِضٌ يَجْرِي كَأَنَّ مَاءَهُ الْمَحْضُ فِي الْبَيَاضِ، فَذَهَبُوا فَوَقَعُوا فِيهِ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ، فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ – قَالَ – قَالا لِي هَذِهِ

**جَنَّةُ عَدْنٍ، وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ، قَالَ فَسَمَا بَصَرِي صُعُداً، فَإِذَا قَصرٌ مِثْلُ الرَّبَابَةِ الْبَيْضَاءِ – قَالَ – قَالا هَذَاكَ مَنْزِلُكَ قَالَ قُلْتُ لَهُمَا بَارَكَ اللهُ فِيكُمَا، ذَرَانِي فَأَدْخُلَهُ، قَالا أَمَا الآنَ فَلا، وَأَنْتَ دَاخِلُهُ، قَالَ قُلْتُ لَهُمَا فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ مُنْذُ اللَّيْلَةِ عَجَباً، فَمَا هَذَا الَّذِي رَأَيْتُ؟ قَالَ قَالا لِي أَمَا إِنَّا سَنُخْبِرُكَ ،أَمَا الرَّجُلُ الأَوَّلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُثْلَغُ رَأْسُهُ بِالْحَجَرِ،فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَأْخُذُ الْقُرْآنَ فَيَرْفُضُهُ وَ يَنَامُ عَنِ الصَّلاةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُشَرْشَرُ شِدْقُهُ إِلَى قَفَاهُ وَ مَنْخِرُهُ إِلَى قَفَاهُ، وَ عَيْنُهُ إِلَى قَفَاهُ،فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَغْدُو مِنْ بَيْتِهِ فَيَكْذِبُ الْكِذْبَةَ تَبْلُغُ الآفَاقَ، وَأَمَّا الرِّجَالُ وَ النِّسَاءُ الْعُرَاةُ الَّذِينَ فِي مِثْلِ بِنَاءِ التَّنُّورِ فَإِنَّهُمْ الزُّنَاةُ وَ الزَّوَانِي، وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يَسْبَحُ فِي النَّهْرِ وَ يُلْقَمُ الْحَجَرَ فَإِنَّهُ آكِلُ الرِّبَا، وَ أَمَّا الرَّجُلُ الْكَرِيهُ الْمَرْآةِ الَّذِي عِنْدَ النَّارِ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا، فَإِنَّهُ مَالِكٌ خَازِنُ جَهَنَّمَ، وَ أَمَّا الرَّجُلُ الطَّوِيلُ الَّذِي فِي الرَّوْضَةِ فَإِنَّهُ إِبْرَاهِيمُ(ﷺ)، وَ أَمَّا الْوِلْدَانُ الَّذِينَ حَوْلَهُ فَكُلُّ مَوْلُودٍ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ ﴾.** (صحيح) أنظر حيث رقم (٣٤١٥) في صحيح الجامع

**سمرەی کوڕی جندب ڕەزای خوای لیّ بیّت دەڵیّ: زۆربەی کات پیّغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵەکانی دەفەرموو: ( ئایا هیچ یەکیّك لە ئیّوە خەونیّکی نە بینیوە ؟). وتی: ئیتر هەر یەکیّکیان کە خوا بیویستایە بیگەڕیّنیّتەوە بۆی ئەوا بۆی دەگیّڕایەوە، وە سەر لە بەیانییەکیان خۆی فەرمووی: ( ئەمشەو دوان هاتنە لام، وە ئەو دوانە هەڵیانساندم و پیّیان ووتم: بەڕیّ کەوە، منیش لەگەڵیاندا بەڕیّ کەوتم، وە هاتینە سەر پیاویّك ڕاکشابوو، وە یەکیّکی تریش بە بەردیّکەوە لەسەر سەری وەستا بوو، وە لەو کاتەدا بەردەکەی دا بەسەریدا و سەری قاش کرد و ئینجا بەردەکە گلیّر بوەوە ئا لیّرەوە. ئەویش شویّن بەردەکە کەوت هەڵیبگریّتەوە، وە هیّشتا نەدەگەڕایەوە لای ئەو سەری وەك جاران چاك دەبوەوە، ئەویش دەگەڕایەوە سەری و لە جاری یەکەمدا چی لیّ کرد هەمان کاری دووبارە دەکردەوە، منیش بە دوانەکەم ووت: سبحان الله ئەم دوانە چین ؟ فەرموی: ووتیان: تۆ بە ڕیّ بکەوە فەرمووی: ئینجا بە ڕیّ کەوتین و هاتینە سەر پیاویّك لەسەر پشت ڕاکشابوو، وە یەکیّکی تریش لەسەر سەری وەستا بوو بە قولاپیّکی ئاسنەوە، وە دەهات بۆ لایەکی دەم و چاوی ئینجا دەمی هەڵدەتلیشان هەتا دواوەی وە لوتیشی بۆ دواوەی وە چاویشی هەتا دواوەی. فەرمووی: پاشان دەیگۆڕی سەر لاکەی تری وە هەمان کاری کە بە لای یەکەمی دەکرد بە لاکەی دووەمیشی دەکرد، جا هەر لە لایەکی نەدەبوەوە هەتا لاکەی تری وەك خۆی چاك دەبوەوە، ئەویش دەگەڕایەوە سەری و لە جاری یەکەمدا چی لیّ کرد هەمان کاری لەگەڵ دووبارە دەکردەوە. فەرمووی: ووتم سبحان الله ئەی ئەم دوانە چین. وتیان پیّم: تۆ بەڕیّ کەوە. ئینجا بەڕیّ کەوتین و هاتینە سەر شتیّك وەك تەنور وا بوو ) – گیّڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵیّ: پیّم وابیّت فەرموی تەنوورەکە غەڵبە غەڵب و دەنگە دەنگی تیّدا بوو – ( فەرمووی: کە ڕوانیمانە ناوی دەبینین لە ناویدا پیاو و ژنی ڕوتی تیّدایە، وە لە خوارەوە بڵیّسەی ئاگریان بۆ دەهات، جا هەر کە ئەو بڵیّسەیەیان بۆ دەهات دەیانکرد بە هاوار و دەنگە دەنگ، فەرمووی: پیّم وتن ئەمانە چین ؟ فەرمووی: ووتیان پیّم: بەڕیّ بکەوە بەڕیّ بکەوە، ئینجا بە ڕیّ کەوتین و هاتینە سەر ڕووباریّك ) – پیّم وابیّت فەرمووی کە ڕوبارەکە وەك خویّن سور بوو ( وە لە ناو ڕووبارەکەدا پیاویّکی مەلەوانی تیّدا بوو مەلەی دەکرد، وە**

لەسەر لێواری رووبارەکە، پیاوێکی لێ بوو بەردێکی زۆری لای خۆی کۆ کردبووەوە. ئینجا مەلەوانەکە ئەوەندەی کە مەلەی بکردایە مەلەی دەکرد ئینجا دەهاتە لای ئەوەی کە بەردەکەی لای خۆی کۆ کردبووەوە و دەمی بۆ دەکردەوە، ئەویش بەردێکی دەگردە ناو دەمی، ئەویش دەڕۆشتەوە مەلەی دەکردەوە، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای و و هەر جارێك دەگەڕایەوە دەمی بۆ دەکردەوە ئەویش بەردێکی بۆ تێ فڕێ دەدا. فەرمووی: پێم ووتن: ئەی ئەم دوانە چین ؟ فەرمووی پێیان ووتم: بەڕێ کەوە بەڕێ کەوە. فەرمووی: ئینجا بەڕێ کەوتین و هاتینە سەر پیاوێك روخسارێکی هێندە ناشرینی هەبوو لە ناشرین ترین ئەو روخسارانەی کە تۆ پیاوێکت تێدا بینیبێت. وە ئاگرێکی لە لا بوو خۆشی دەکرد و بە دەوریدا دەخولایەوە، فەرمووی: پێم ووتن: ئەی ئەمە چییە. فەرمووی: پێیان ووتم: بەڕێ کەوە بەڕێ کەوە، ئینجا بە ڕێ کەوتین و هاتینە سەر باخچەیەکی دار زەیتوون کە لە هەموو گوڵێکی بەهاری تێدا بوو، وە لەناو باخچەکەدا پیاوێکی درێژی تێدا بوو کە وەختە بوو سەری نەبینم لە ئاسماندا لە درێژیدا، وە کە دەبینم لە دەوری ئەو پیاوە زۆرترین منداڵی لێ بوو کە من بینیبێتم. فەرمووی: پێم ووتن: ئەی ئەمە چییە و ئەوانە چین ؟ فەرمووی پێیان ووتم: بەڕێ کەوە بەڕێ کەوە. فەرمووی: ئینجا بەڕێ کەوتین هەتا گەیشتینە باخچەیەکی زۆر گەورە کە هەرگیز لەو باخچەیە گەورەترو جوان ترم نەبینیبوو. فەرمووی: دوانەکە پێیان ووتم: سەر بکەوە تیایدا، فەرمووی: ئینجا سەر کەوتین و هەڵکشاین تیایدا. ئینجا هاتینە دەرگای شارەکە و داوای کردنەوەییمان کرد و بۆمان کرایەوە، ئینجا چووینە ناوییەوە پیاوانێك بە پیرمانەوە هاتن ، لایەکی پێکهاتەی جەستەیان لە جوانترین پێکهاتە بوو کە تۆ بینیبێتت، وە لاکەی تریشیان وەك ناشرین ترین شت وابوو کە تۆ بینیبێتت، فەرمووی: دوانەکە پێیان ووتن بڕۆن خۆتان فڕێ بدەنە ناو ئەو رووبارەوە، فەرمووی: کە بینیم رووبارێکی بەربەستە و دەڕوات ، ئاوەکەی هەر دەڵێیت شیرە لە سپێتیدا، ئەوانیش رۆشتن خۆیان فڕێ دایە ناوی، پاشان گەڕانەوە بۆ لامان ئیتر خراپییەکەو ناشرینییەکەیان پێوە نەمابوو، وە چوو بوونەوە جوانترین شێوە و روخسارەوە. فەرمووی: ئینجا پێیان ووتم: ئەمە بەهەشتی عەدەنە، وە ئا ئەوەیش ماڵەکەی تۆیە فەرمووی: منیش چاوم بەرەو ژوور بەرز کردەوە کۆشکێکم بینی هەر وەك هەوری سپی. فەرمووی: ووتیان: ئا ئەوە ماڵەکەتە. فەرمووی: منیش پێم ووتن: خوای گەورە بەرەکەت بڕژێنێت بەسەر هەردووکتاندا ، بهێڵن با بچمە ناوی. ووتیان: ئێستا نا، بەڵام تۆ هەر دەچیتە ناوی، فەرمووی: منیش پێم ووتن دەی من لەسەرەتای ئەم شەوەوە شتی سەرسوڕهێنەرم بینی، ئەوانە چی بوون کە بینیمن؟ فەرمووی: پێ یان ووتم: بەڵێ ئێمە پێت دەڵێین. ئەو پیاوەی یەکەم کە چوویتە سەری و بە بەرد سەریان قاش کرد ئەوە پیاوێکە قورئان وەردەگرێت و رەفزی دەکات و لەسەر نوێژی فەرز دەنوێت، وە ئەو پیاوەی چوویتە سەری دەمیان هەڵدە قڵیشان هەتا پاشوی وە لوتی هەتا پاشوی، وە چاوی هەتا پاشوی، ئەوە پیاوێکە بەیانیان دەچێتە دەرەوە درۆیەکی وا دەکات کە دەگاتە ئاسۆ، وە ئەو پیاو و ژنە رووتانەیش کە لەو بینایەدا بوون وەك تەنوور وابوو ئەوانە ژن و پیاوی زینا کارن، وە ئەو پیاوەش کە هاتیتە سەری و لە رووبارەکەدا مەلەی دەکرد و بەردەکە فڕێ دەدرایە ناو دەمی،ئەوە سوو خۆرە، وە ئەو پیاوە ناشرینەی کە لای ئاگرەکە بوو خۆشی دەکرد و بە دەوریدا دەهات و دەچوو، ئەوە مالیکە، خەزنەداری دۆزەخە. وە ئەو پیاوە درێژەش

که له باخچەکەدا بوو ئەوە ئیبراهیمە( علیه السلام) وە منداڵەکانیش که له دەوری بوون، هەموو منداڵێکی له دایك بووە، که لەسەر فیترەت مرد بێت ).

**( ٣١ ) ( نەمردن و هەتا هەتایی مانەوە له بەهەشتدا یان له ئاگردا )**

**( ١٢٨٢ ) ( ق ) عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿ يُدْخِلُ اللهُ أَهْلَ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَ يُدْخِلُ أَهْلَ النَّارِ النَّارَ ، ثُمَّ يَقُومُ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ فَيَقُولُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لا مَوْتَ وَ يَا أَهْلَ النَّارِ لا مَوْتَ ، كُلٌّ خَالِدٌ فِيمَا هُوَ فِيهِ ﴾.** ( صحيح ) أنظر حيث رقم ( ٨٠٧٣ ) في صحيح الجامع

إبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە خەڵکی بەهەشت دەخاتە بەهەشتەوە وە خەڵکی ئاگریش دەخاتە ئاگرەوە، پاشان بانگ دەرێك هەڵدەستێت له نێوانیاندا و دەڵێ: ئەی خەڵکی بەهەشت ئیتر مردن نەما، وە ئەی خەڵکی ئاگر ئیتر مردن نەما، هەریەکە لەوەی که تیایدایە بە هەتا هەتایی و بە بێ مردن دەمێنێتەوە ).

## روون کردنەوەی فەرموودەکانی بەهەشت و دۆزەخ:

بەڕاستی قسە کردن له رووداوەکانی رۆژی قیامەت و نیعمەتەکانی ناو بەهەشت و ئەشکەنجەکانی ناو دۆزەخ خۆی بۆ خۆی له هەموو مەسەلەکانی تر روونکردنەوە و شەرحی زیاتر هەڵدەگرێت چونکە بە راستی هەموو مەسەلە و باسەکانی تر له پێناو بە دەست هێنانی ئەو بەهەشتەو رزگار بوون لەو دۆزەخە بوون.

وە ئەگەر خوای گەورە یارمەتی دەرمان بێت ئەوا له داهاتوودا له کتێبێکی تایبەتدا زیاتر ئەو ئایەت و فەرموودانەی تایبەت بە قیامەت و بەهەشت و دۆزەخەوە کۆ دەکەینەوە و روون کردنەوە قسە و باسیان لەسەر دەکەین. بەڵام ئەوەی که بە پێویستی دەزانم لێرەدا له روون کردنەوەی فەرموودەکانی بەهەشت و دۆزەخدا ئاماژەی پێ بدەم. وتەیەکی ئیمام غەزالییە رەحمەتی خوای لێ بێت که دەفەرموێت: خوای گەورە هەموو خۆشی و نیعمەتەکانی بەهەشتی له یەك ئایەتدا کۆ کردۆتەوە که ئەویش( لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ واتە هەرچی حەزی لێ بکەن و بیانەوێت تیایدایە و دەیاندرێتێ و زیاتریشمان لایە که رەزامەندی خواو بینینی خوایە، وە هەر چی ناخۆشی و ئەشکەنجەی دۆزەخیش هەیە خوای گەورە له ئایەتێکدا کۆی کردۆتەوە که ئەویش: وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ ) واتە هەرچی ئەوان حەزیان لێی بێت و ئارەزوویان لێ بێت نایان درێتێ، جا داواکارین له خوای گەورە بە هەموو ناوە پیرۆزەکانی خۆی و بە رووی پیرۆزی خۆی له فیردەوسی ئەعلادا بە بینینی رووی پیرۆزی خۆی شادمانمان بکات و له سزاو ئەشکەنجەی ئاگر و دۆزەخی خۆیشی بمانپارێزێت و بە دوورمان بکات. ئەگەر شایەنی ئەوەیش نین داوای لێ دەکەین که بە رەحمی خۆی وامان لێ بکات که شایەنی ئەو نیعمەتەی خۆی بین .

(وصلى الله على محمد النبي الأمي الكريم وعلى آله و

صحابته و أمته أجمعين)

(و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين) .

٢٥ /جمادى الاول / ١٤٢٦

عەسرى شەممە ١/ ١ / ٢٠٠٥

# فەرمودە قودسیەکان

فەرمودە قودسیەکان
لە( صحیح الجامع الصغیر ) دا

ئامادەکردنی
مرکز دراسات عربیە لتحقیق النصوص

لێکۆڵینەوەی فەرمودەکان
محمد ناصرالدین الالبانی

وەرگێڕان و لێکدانەوەی فەرمودەکان
هاوڕێ محمد ئەمین

ژمارەی سپاردنی ( 2495 )ی ساڵی 2008ی پێدراوە